# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نووسینی:

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی (پێنجەم)

جزمی (١٣، ١٤، ١٥)

بسم الله الرحمن الرحيم

- ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان
- نوسینی: مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ( ٢١٤٠ )ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.
- چاپ و دیزاین: ( سامان محمد أمین ).
- لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لە چاپ دراوەو مافی چاپکردنەوەی پارێزراوە بۆ کتێبخانەی ناوبراو.

## سورەتی یوسف

﴿ ۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ ﴾

ئـەم ئایەتـە تەواوکـەری ئاخـاوتنی ژنـی عـەزیزی میـصرەو پەیوەنـدە بەئایەتەکانی پێشەوە،، وەکوو دەڵێن: (مەقوولی قالت)ە!! واتـە: زولـەیخا وتـی: ئـەم دان پیانانەمو راستی وتنەم بۆ ئەوەیـە، یوسـف بزانـێ مـن لەپاشملـە خییانـەتم لـێ نەکردوە، ئەو کاتانـەی لەبەندینخانـەدا بـوە تـاوانم پـاڵ نـەداوە، یـان بـا مێردەکـەم بزانێ من بەکردەوە خیانەتم لێ نەکردوە، تاوانی زیناو داوێن پیسیم لەگەڵ یوسف ئەنجام نەداوە، جگە لەهەوڵدان بۆ رامکردنی‌و موغازەلەیەکی سەرەتایی هیچی ترم لەگـەڵدا ئـەنجام نـەداوە، ئـەویش هیـچی لـێ شـین نـەبوو، چـونکە یوسـف بەقـسەی نەکردمو نەهاتە دەست، بەڵکوو کە تینی بۆ هات پەنای بۆ راکردن بردو هەڵات،

﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالـسُّوءِ﴾ هەڵبەتـە مـن پاکانـە بـۆ نەفسی خۆم ناکەم، مـن نـاڵێم هەڵـەی نـەکردوەو نەخلیسکاوە، چـونکە نـەفس بەسروشـت ئارەزۆی شەهوەتو خۆش رابواردنی هەیەو فەرمان دەکا بەخراپەو داخـوازی کـاری ناشـیرینە، ﴿إِلاَّ مَـا رَحِـمَ رَبِّـي﴾ جگـە لەکەسانێك کـە خـودا رەحمـی پـێ کـردونو لەخراپەکاری‌و مەیل بـۆ تـاوانکردن پاراسـتوونی، وەکـوو یوسـفـو هـاو وێنـەکانی،،! بەڵام من لەرەحمەتی خـودا ناهومێـد نـیمو نـابم چـونکە ﴿إِنَّ رَبِّـي غَفُـورٌ رَحِـيمٌ﴾ خودای من زۆر لێبوردو لێخۆشبووە بەزەیی بەبەندەکانی‌دا دێتەوە،

هەندێ لە راڤەکەران دەڵێن: ئەم ئایەتە لەئاخاوتنی یوسفە، واتـە: بـا عـەزیز (مێردی زولەیخا) بزانێ: کە من خیانەتم لێ نەکردوەو، لەکاتێکدا کە لەماڵ نـەبوە من هیچ داوێنپیسییەکم لەگەڵ خێزانی‌دا ئـەنجام نـەداوە، کـە ئـەو بتمانـەی بـەمن

كـردو بـەكوڕی خـۆی حـسێب كـردم مـن ئـەو بتمانەیـەم لەدەسـت نـەداوە، وە مـن پاكانە بۆ نەفسی ئادەمیزادیم ناكەم، چونكە هەموو نەفسێك بەسروشت ئارەزۆی رابواردنو خۆشی هەیە، مەگەر نەفسێك كە خودا لەتاوان بیپارێزێ، ئەویش نەفسی پێغەمبەرانو صالحانە، بێگومان خودای من زۆر لێخۆشبوو لێبوردوە بۆ تاوانی تاوانكاران، رەحمیان پێ دەكا ئەگەر روبكەنە تۆبەو ئیستیغفارو پاڕانەوە لەخودا بۆ ئەوەی شوێنەواری تاوانیان بەسەرەوە نەهێڵێ و نەفسیان پاك بكاتەوە،

## بەشی نۆیەم لەچیرۆكی یوسف:

### یوسف دەبێتە كاربەدەستی بەرزو ئەمینداریەتی دارایی‌و گەنجینە وەردەگرێ

﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾

دوای ئـەوەی پاشـا لێکۆڵینـەوەی لەگـەڵ ژنـەکان کـردو داوێنپـاکی یوسـف دەرکـەوت، پاشا فـەرمانی کـرد: کـە یوسـف لەبەندینخانـە رزگـار بکـەن‌و بیهێننـە لای، بۆ ئەوەی بیکاتە هەڵبژاردەی خۆی، بەتایبەتی کـە مانـای خەونەکـەی تەفسیر کرد زۆر سەرنجی راکێش کـردو رێـزی لـێ گـرت‌و پلـەو پایـەی باشـی دایـەو کـردی بەئەمینـداری هـەموو مـاڵ‌و سامانێك‌و هـەموو کاروبـاری سیاسـی‌و مـاڵی هـەموو وەلاتی میصر، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي﴾ پاشا فـەرمانی داو وتی: ئەو پیـاوە دانـاو زانایـە لەبەندینخانـەوە بگەیەننـە لام، دەیکـەم بـەپیاوی تایبەتی خۆم‌و راوێژی پێ دەکـەم‌و دەیکەمـە جێگـای بتمانـەی خـۆم، پیـاوانی پاشا دەس بـەجێ‌و بەهەڵەداوان چوون یوسـفیان لەبەندینخانـە دەرهێنـاو گەیاندیانـە لای پاشا، جا ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾ کـە قسەی لەگـەڵدا کـردو زانیاری‌و ئەدەب‌و رەوشـتی یوسـفی بـۆ دەرکـەوت، وتـی: بێگومـان ئـەتۆ ئـەمڕۆ لای ئێمـە بـوی بـەجێگای بتمانـەو بـڕوا پێکراومـان‌و هـەموو کاروبـارێکی وڵات عائیـد بەتۆیـەو بـەگوێرەی عـەقڵ‌و مـەدارای خـۆت وڵات بـەڕێوە بـەرە!! دەی بـابزانین هەڵوێستی یوسف چیەو چۆنە؟

ئێـستا وا یوسـف دڵنیایـە: کـە لەبەندینخانـە رزگـاری بـووەو لای پاشـا رێـزو قەدری دراوەتێ، ئێستا یوسف ئەو کـوڕە عیبرانییـە نیـە وەکـوو کۆیلـە حیـسابی بـۆ بکرێ، بەڵکوو خاوەنی پلەو پایەیەو کراوە بەکاربەدەست‌و فـەرمانڕەوا، ئـەو کـوڕە کۆیلــە تۆمــەتبارە نــەماوە کــە هەرشــەی بەنــد کردنــی لــێ بکــرێ‌و بخرێتــە بەندینخانەوەو کەس نەبێ پرسیاری لێ بکا، بـەڵکوو ئەمینـداری پاشـایەو هـەموو صەلاحییەتێکی دراوەتێ بۆ بەڕێوە بردنی کارو باری وڵات،

لەبەرامبەر ئەم رزگـار کـردن‌و رێزلێنـان‌و پلـەو پایەپێدانـەدا یوسف نـەهات وەکوو پیـاوانی دەربـارو کورسـی پەرسـت‌و ماسـتاو چـی بـۆ پاشـاو ملهوڕان سـوژدە بەرێ‌و خۆی پچووك بکاتەوەو بڵێ من بەنـدەی فەرمانبـەرداری بـەرێزتانم‌و سـەرم

لەرێتاندایەو خزمەتکاری دەست لەسەر سنگم، نەخەیر هیچ قسەیەکی لەم بارەوە نەکرد، بەڵکوو داوای شتێکی کرد: کە پێی وا بوو: دەتوانێ بەڕێوەی بەرێ، داوای کرد: کە ئەرکێکی بخرێتە سەرشانو بتوانێ هاوکاری بکا لەسووککردنی ئەو تەنگو چەڵەمانەی کە بەگوێرەی خەونی پاشا تووشی ئەو وڵاتە دەبێ؛ پێی وا بوو دەتوانێ وڵات لەئازاری برسیایەتی رزگار بکا، گیانی هاووڵاتیان لەمردن بپارێزێ، بەرگری لەقاتو قڕیو وڵات وێرانیو لەبرسا مردن بکا، بەخۆی رادەپەرموو دەیزانی دەتوانێ ئەو ئەرکە قورسە بخاتە سەرشانی خۆیو بەلێزانیو لێهاتوویی ئەنجامی بدا بۆیە ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الأَرْضِ﴾ وتی: پاشا بمکە بەلێپرسراوی عەمباری دەغڵو دان، ئەو عەمبارو سایلۆیانەی کە لەحەوت ساڵە هاتەکانی داهاتوودا دانەوێڵەیان تێدا خەزن دەکرێ، پێش هاتنی حەوت ساڵە گرانییەکە، حەوت ساڵی هاتو پڕ پیتو بەرەکەتن، پێویستە بەشێوەیەکی لێزانانەو کارامانە ئەو کشتو کاڵە وەبەرهەم بهێندرێو بەشی پێویست بۆ خواردنی ساڵانەی لێ پاك بکرێو ئەوی تری وەلا بنرێو خەزن بکرێو هەڵبگیرێ بۆ ساڵە قاتو قڕیەکان، ئەمەش پێویستی بەلێزانیو بەتوانایی سەروبەرکردنو سەرۆکاریکردن هەیە، حەزرەتی یوسف ئەو تواناو لێزانییەی لەخۆیدا دەبینیو دەیزانی دەتوانێ بەوپەڕی لێهاتووییەوە ئەو ئەرکە ئەنجام بدا، بۆیە فەرمووی ﴿إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ ئەمن ئەمیندارێکی لەبارمو خاوەن ئەزموونو زانیاریم بۆ بەڕێوە بردنی ئەو کارە لەخۆم رادەبینم بەتەواوی ئەنجامی بدەم!!

بێگومان حەزرەتی یوسف بەم داواکاریەی داوای دەستکەوتێکی تایبەتی بۆ خۆی نەکردوە، بەڵکوو بارگرانیو ئەرکێك بوو خستیە سەرشانی خۆیو مەسئوولییەتێکی قورسو گران بوو خۆی بەرداو پێی هەڵسا!

خۆی کردە بەرپرسیاری خواردەمەنی وڵاتێکی فراوانو نەتەوەو گەلێکی زۆرو زەبەندە بۆ ماوەی حەوت ساڵ؛ حەوت ساڵی قاتو قڕیو بێ بارانیو بێ

کشتو کاڵ، دەی ئەمە کەی بەدەستکەوتی تایبەتی دەژمێـردرێ؟ بەرپرسـیاریەتیو بەرعۆدە بوونی نەتەوەیەکی برسیو هەوڵدان بۆ تێرکردنی ئەرکێکە هەموو کەس ناوێرێ بیخاتە سەرشانی خۆی!! کەوابوو حەزرەتی یوسف لەم بەرپرسیاریەتیەیدا چ دەستکەوتێکی تایبەتی بۆ خۆی داوا نەکردوە!! ئێستا رەخنەیەك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە: دەڵێن: لەم داخوازییەی حەزرەتی یوسفدا کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ دوو شتی دژ بەئایینی ئیسلامی تێدایە:

١- داوا کردنـی ویلایـەتو بەرپرسـیارییەتیە ئەمـەش بـەدەقی فـەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: (والله لانولى هذا العمل أحداً سأله (أي حرص عليـه) [1]، یاساغە،

٢- خۆ هەڵنانەوەو تەزکییە کردنی نەفس ئەمەش بەدەقی ئایەتی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ﴾ یاساغە،

بۆ رەواندنەوەی ئەو رەخنەیە، دەگوترێ: ئـەم قەواعیـدو یاسایانە لـەئایینی ئیسلامدا چەسپاونو پێغەمبـەری ئیسلام هێنـاونیو لەرۆژگاری یوسـفدا ﷺ بـاو نەبوون، مەسائیلی رێکخستنو فروعییاتی ئایینو هەڵسوڕانی کارو بـار مـەرج نیـە لەهـەموو ئایینـەکاندا وەکـوو یـەکبن، وێدەچـێ لـەئایینی حـەزرەتی یوسـفدا ئـەو شتانە یاساغ نەبووبن، چونکە مەسائیلی تەنظیمو فروعیـاتی دیـن وەکوو بنـەمای عەقیدە نین پێویست بێ لەهەموو ئایینێکدا چوون یەك بنو هەموو پێغەمبەرێك پابەند بێ پێوەی،

لەلایەکی ترەوە داوا کردنی پلەو پایـە پێـدانو خـۆ دەرخـستنو هەوڵـدان بـۆ وەرگرتنی کورسیو مەنصەب دروستە ئەگەر ئەو شەخصە بتمانەی بەخۆی هەبوو دەیزانی لەبارەی ئایینو زانیارییەوە شیاوی ئەو کارەیەو دەتـوانێ بـەڕێوەی بـەرێ:

---

[1] متفق علیه.

پێناسینو بانگەوازیو خۆدەرخستنەکەشی بۆیە بوو خەڵکی پێیان نەدەزانی، ئاگایان لەحاڵو وەزعی نەبوو، ئا لەم کاتەدا دروستە وەختە بڵێین: پێویستە خۆی دەرخاو داوا بکا،

پێغەمبەر ﷺ کە بەعەبدورەحمانی کوڕی سەمرەی فەرموو: (لا تسأل الأمارة، أنا والله لانولی هذا العمل أحدا سأله أء حرص علیه)[٢] ئەم جڵەو گیرییە بۆ کەسێکە کە بتمانەی بەخۆی نەبێ کە دەتوانێ کارەکە بەڕێوە بەرێ، یان بۆ دەستکەوتی شەخصی بێ،

هەروەها ئایەتەکە: کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ﴾النجم/٣٢، ئەمە بۆ کەسێکە تەزکییەی نەفسی خۆی بکاو بشزانێ وا نیە،،

دەی هیچ کامێ لەم دوو شتە یاساغە لەحەزرەتی یوسفو ئەمثالی ئەودا نایەتەدی، چونکە لەم کاتانەدا پێویستە لەسەر ئەو جۆرە کەسانە بەگوێرەی توانا بەرژەوەندی گەلو وڵات بپارێزن، چونکە هەوڵدان بۆ گەیاندنی سوودو قازانج بۆ ئاتاجانو دوور خستنەوەی زەرەرو زیان لێیان کارێکی باشەو عەقڵ پەسندی دەکا، حەزرەتی (یوسف)یش بۆ خۆی دەیزانی کەس نیە لەو کۆمەڵگایەدا بتوانێ وەکوو ئەو کاروبار بەڕێوەبەرێو بەعەدالەت هەر کەسەو مافی خۆی بداتێ، بۆیە پێی وا بوو خۆ دەرخستنو داوا کردن بۆ ئەو وەزیفەیە فەرزی عەینەو پێویستە پێی هەڵسێ!

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾ وەکوو ئەو نیعمەتو فەضلەی بەسەر یوسفمان دارشت؛ کە خستمانە بەردڵی پاشاو لەبەندینخانە رزگارمان کرد، هەر بەو شێوە لەخاکی میصردا جێگیرمان کرد، واتە: تواناو هێزمان پێدا بۆ هەڵسوڕانی ئەو کاروبارانەی ویستی ئەنجامیان بدا، پلەو

---

([٢]) متفق علیه،

پایەیـــەکی بـــەرزو پیرۆزمـــان لـــەخاکی میـــصردا پـــێ بەخـــشی، لەبەندایـــەتیو کۆیلایەتییەوە کردمانـە پاشـاو فـەرمانڕەوا، دەسـەڵاتی وەرگـرت، قـسەی دەڕۆیـشت، بـووە پێـشەواو کاربەدەسـت، چـونکە خـۆگر بـوو، داوێنپـاك بـوو، خـاوەن ڕەوشـتی بەرزو هەڵوێستی مەردانە بوو، خـۆی لەداوێنپیـسی پاراسـتو خـۆڕاگر بـوو لەسـەر بەڵاو موصیبەت، بۆیە خودا یارمەتی داو پشتگیری لێ کـرد، پلـەو پایـەی عـەزیزی میصری وەرگرت، بەڵکوو پلەی بەرزتریشی دەستکەوت،

موجاهید دەفەرموێ: پاشا لەسەر دەستی یوسف موسوڵمان بـوو! پـەروەردگار پاداشتی یوسفی بەفیڕۆ نـەداو ڕەحمـی پـێ کـردو پاراسـتی، ﴿نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَنْ نَشَاءُ﴾ دەبەخشین ڕەحمەتی خۆمان بـۆ کەسـێك بمانـەوێ تووشـی ڕەحـمو بـەزەیی ئێمە ببێ،

﴿وَلا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ پاداشی چاکەکاران بەفیڕۆ نادەین، هەر لـەدونیادا چـاکەیان دەدەینـــەوە، خۆشـــبەختیو پلـــەو پایـــەو ڕێـــزو حورمـــەتیان دەدەیـــنێ، لەقیامـەتیشدا دەیانخەینـە بەهەشـتەوەو ژیـانی بەختـەوەری هـەتا هـەتاییان پـێ دەبەخشین ﴿وَلأَجْرُ الآخِرَةِ خَيْرٌ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ بێگومان پاداشی قیامەت زۆر پیرۆزترو باشترو گەورەترە، دەدرێ بەئەو خودا ناسانەی بیرو باوەڕیان تەواوو بێ خەوشەو تەقواکارو لەخودا ترسو خۆپارێزن، پاداشەکەشیان لـەزەتو خۆشـی بەهەشتو ڕابواردنی نەبڕاوەیە، کە زۆر لەخێرو خۆشـی دونیـاو هەرچـی تێیدایـە، لەپلەو پایە لـەماڵو سـامان لەشـانو شـکۆ بەفـەڕترو چاکترە، بـەڵێ ئـا بـەو جـۆرە پـەروەردگار پاداشـی یوسـف دەداتـەوە، پاداشـی صـەبرو خـۆڕاگرتن لەسـەر بـەڵاو موصیبەتی جۆراو جۆر، لـەدونیادا ئـەو پلـەو پایـەو دەسـەڵاتو فەرمانڕەواییـەی پێـدا، ئـەوەش مزگێنـی بەختـەوەری قیامـەتی، پاداشـێکی پـڕاو پـڕە لەسـەر بـڕوا پتەویو خۆڕاگریو چاکەکاریی.

## بەشی دەیەم لەچیرۆکی یوسف:

### کوڕەکانی یەعقووب دێن بۆ میسرو دانەوێڵە لەحەزرەتی یوسف دەکڕنو داوای هێنانی برا بچکۆلەکەیان لێ دەکا

﴿ وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ۝٥٨ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ۝٥٩ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ۝٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ۝٦١ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ۝٦٢ ﴾

بەڵێ ڕەوڕەوەی ڕۆژگار تێوەرسووڕایەوە، ڕۆژگار هاتنو ڕۆیشتن، ساڵانی پڕپیتو بەرەکەت هاتنو تێپەڕین، بەڵام سیاقی قورئان ئەم باسانەی پێچاونەوە، باسی ئەوە ناکا چۆن ساڵە هاتەکان هاتن، خەڵکی چۆن زەراعەتیان کردو یوسف چۆن جیهازی دەوڵەتی بەڕیوە برد، چۆن دانەوێڵەی پەزمەندە دەکردو هەڵی دەگرتو چۆنی تاقەت دەکرد،،هتد، ئەمانە هەموویان بەرستەی ﴿إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ ئاماژەی پێکردوە، هەروەها باسی هاتنی ساڵە گرانییەکان ناکا، باسی ئەوە ناکا خەڵکی چۆن بەرەو پیری گرانی چوونو چۆن خواردەمەنی کەم بوو، چۆن دەست

کرا بەدابەشکردنی خۆراك بەسەر دانیشتواندا ئەمانە هەموویان لەخەونی پاشادا بەدی دەکرێن‌و مانا لێدانەوەکەی یوسف ئاماژەیان پێ دەکا!

سیاقی قورئانەکە ئیتر باسی پاشا ناکا هەروەها باسی پیاوەکانیشی ناکا، هەر دەڵێی کاروبارەکان وا رەخساون هەموو شتێك کەوتۆتە ژێر دەستی یوسف، وا دیارە بەشێوەیەکی سەرەکی هەر حەزرەتی یوسف بەکارەکان هەڵساوەو سەروکاری کردوون، لەو ئەزمەو تەنگ‌و چەڵەمەیەدا خۆی بەرپرسیارو فەرمانڕەواو قسە رۆیشتوو بووە، چونکە لێرە بەولاوە تەنیا یوسف لەسەر مەسرەحی رووداوەکان دیارەو لەبەرچاوە، هەموو تیشکەکان ئاراستەی ئەو کراون‌و کەسی تر بەرچاو ناکەوێ، بەڵام کاریگەری گرانی‌و قات‌و قڕیەکە لەپانۆڕامای هاتنی براکانی یوسفدا دەردەکەوێ، سیاقەکە بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە براکانی یوسف لەخاکی کەنعانەوە دەکەونەڕێ بۆ خاکی میسرو داوای خواردەمەنی دەکەن، لەمەوە هەست بەبلاوبوونەوەی بازنەی برسیایەتی دەکەین‌و دەزانین کە پانتاییەکی فراوانی گرتۆتەوە، هەروەها ئەوەش دەزانین: کە چۆن میسر بەهۆی تەگبیرو پلان‌و نەخشەی حەزرەتی یوسفەوە بووەتە مەخزەنی خواردەمەنی‌و بژێوی ئەو وڵاتانەی دەورو بەریش!

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: سوددی‌و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق‌و موفەسسیری تریش وتوویانە ئەو هۆکارانەی پاڵیان بەبراکانی یوسفەوە نا: کە لەوڵاتی کەنعانەوە بێن بۆ میسر ئەوە بوو: کە حەزرەتی یوسف پۆستی وەزارەتی وەرگرت‌و دەست بەکار بوو حەوتساڵی هات‌و پڕ پیت تێپەڕین‌و حەوت ساڵی گرانی هاتن، قات‌و قڕی وڵاتی میسری گرتەوەو وڵاتی کەنعانیش کە نیشتەمەنی یەعقووب‌و کوڕەکانی بوو گرانی تێدا کەوتەوە، حەزرەتی یوسفیش لەوەپێش دانەوێڵەیەکی زۆری کۆکردبوەوە پەزمەندەی کردبوو، ئیتر لەهەموو لایەکەوە خەڵك روویان لەمیسر کرد بۆ کڕینی دانەوێڵە بۆ خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان، هەر کەسێك بهاتایە

بۆ ماوەی ساڵێك باری حوشترێکی دەدایە، بۆ خۆی تێری نەدەخوارد، خۆی‌و پاشاو کاربەدەستان رۆژی جارێك لەکاتی نیوەڕۆدا نانیان دەخوارد، دەیانەویست ئەو خواردنەی عەمبار کراوە بەشی خەڵکەکە بکا لەماوەی ساڵە گرانییەکاندا، بەکورتی حەزرەتی یوسف رەحمەتێك بوو خودا ناردی بۆ دانیشتوانی میصر!!

جا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ﴾ براکانی حەزرەتی یوسف لەخاکی کەنعانەوە (کە فەلەستینی ئێستایە) هاتن بۆ میصر بۆ گەنم کڕین، چونکە گرانی وڵاتی فەلەستین‌و شامیشی گرتبووەوە، ئەوەشیان بیستبووەوە کە عەزیزی میصر خواردەمەنی بەنرخی خۆی دەفرۆشێ‌و زیادە وەرناگرێ، ﴿فَدَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ چوونە خزمەت یوسف‌و مواجەهەیان کرد، ﴿فَعَرَفَهُمْ﴾ کە سەیری کردن ناسینیەوە، چونکە شێوەو روخساری ئادەمیزادی گەورەو بەتەمەن کەمتر گۆڕانکاری تێدا روودەدا، ﴿وَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾ بەڵام ئەوان نەیانناسیەوە، چونکە ئەو بەمنداڵی لێیان جیا ببووەوە شێوەو روخساری منداڵیش کە گەورە دەبێ زۆر دەگۆڕێ، هەروەها چونکە ئەوان وایان دانابوو: کە یوسف لەژیاندا نەماوە، هەرگیز بەخەیاڵیاندا نەدەهات ئەو بگاتە ئەو پلەو پایەیە!

وا پێدەچێ حەزرەتی یوسف رێزی لێ گرتوون‌و گرنگییەکی تایبەتی پێداون‌و قسەو گفت‌و گۆی زۆری لەگەڵ کردوون، تەنانەت وەزعی ماڵ‌و کەس‌و کاریشی لێ پرسیون‌و وەڵامیان داوەتەوە، زۆر پرسیاری ئاڕاستە کردوون‌و گوێی بۆ وەڵامەکەیان راگرتووە، جا ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ﴾ کە جەواڵەکانی بۆ پڕ کردن‌و بۆ هەریەکەیان باری حوشترێکی دانەوێڵە پێدان، هەندێ شتی زیادەشی بەدیاری پێشکەش کردن‌و بارەکانیان بۆ بارکردن ﴿قَالَ ائْتُونِي بِأَخٍ لَكُمْ مِنْ أَبِيكُمْ﴾ حەزرەتی یوسف پێی فەرموون: ئەمجارە کە هاتنەوە برا باوکییەکەتان لەگەڵ خۆتان بێنن، وا دیارە لەناوەندی گفت‌و گۆکردنیان لەگەڵ یوسفدا بەتەواوی پێکهاتەی بنەماڵەی خۆیانیان بۆ یوسف روونکردۆتەوە، دیارە گوتویانە: باوکمان پیرەمێردێکی

کۆنەساڵو پەککەوتەیە، برایەکی ترمان هەیە دایکی جیایە برا پـچوکمانە باوکمان ئەوەندەی خۆش دەوێ دڵی نایە لێی جیا بێتەوە، ئەوانیش پێویستیان بەخواردنو خۆراك هەیـە، ئـیتر حـەزرەتی یوسف فـەرمانی کـردوە بـۆ ئـەوانیش دوو بـاری حوشترداگرنو بۆیان بەرن، ئەمجار پێی گوتوون: کە هاتنەوە ئەو برایەتان بێنن بـا بی بینم، ﴿أَلا تَرَوْنَ أَنِّي أُوفِي الْكَيْلَ وَأَنَا خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾ نـابینن مـن چۆن دانەوێڵە بۆ کڕیاران پێوانە دەکەمو هـەر کەسـە مـافی خـۆی بەتـەواوی دەدەمـێ؟ دیتـان مـن چۆن ڕێزی میوان دەگرمو پێشوازییان لێ دەکەم، ئەمجار کە هاتنەوە لەگەڵ خۆتـان بیهێننو ترستان لێی نەبێ، دڵنیابن: چۆن ڕێزم لـەئێوە گـرتو هەرمیەکـەتان بـاری حوشترێکم دانەوێڵە داوەتێ، بۆ ئەویش هەمان هەڵوێستم دەبێ.

ئەمجار هەڕەشەی ئازووقە لـێ بڕینـی لـێ کـردنو پێـی فـەرموون: ﴿فَإِنْ لَمْ تَأْتُونِي بِهِ فَلا كَيْلَ لَكُمْ عِنْدِي وَلا تَقْرَبُونِ﴾ ئەگـەر ئـەمجارە هاتنـەوەو ئـەو بـرا پچوکەتانم بۆ نەهێنن، ئەوە ئێوە لای من ئازووقەتان نیەو هیچ خواردەمەنیـەکتان نادرێتێو بەهیچ شێوەیەك توخن ئەم دەڤەرە مەکەونەوە،

جا چونکە دەیانزانی باوکییـان بونیـامینی زۆر خـۆش دەوێو زەحمەتـە دڵـی بڕوا بدا لەگەڵیاندا بنێرێ، بەتایبەتی پاش دوور کەوتنەوەی یوسـف لێـی، ئـەوەیان درکاند: کە ئەو ئەرکە کارێکی وا ئاسان نیەو زۆر کۆسـپو تەگـەرە هـەن لەبـەردەم هێنانیـدا ﴿قَالُوا سَنُرَاوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَاعِلُونَ﴾ وتیـان: هـەوڵ دەدەیـنو هـەموو توانای خۆمان دەخەینە گەڕ بۆ ڕازیکردنی باوکمان بەڵکوو بتوانین لەگـەڵ خۆمـان برا پچوکەکەمان بهێنینو دڵی تۆمان لێ نەڕەنجێ!

﴿وَقَالَ لِفِتْيَانِهِ اجْعَلُوا بِضَاعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَا إِذَا انقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ ئەمجار حەزرەتی یوسف فەرمانی بەدەستو پێوەندەکانی کرد: کە ئەو بیضاعەی هێناویانە گەنمی پێ بکڕن، بۆیان بخەنەوە نـاو بارەکانیانـەوە بـەبێ ئەوەی ئاگایان لێ بێ، بەڵکوو کە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیانو بارەکانیـان کردنـەوە

بیناسنەوەو بزانن: ئێمە چەند رێزمان لێ گرتوون، لەمەوە تەماعیان لێ غاڵب بێ جارێکی تر بێنەوەو برا پچوکەکەیان لەگەڵ خۆیان بهێنن.

## بەشی یازدەهەم لەچیرۆکی حەزرەتی یوسف:

### گفتوگۆی نێوان براکانی یوسف لەگەڵ باوکیاندا دەربارەی ناردنی بنیامین لەگەڵیان بۆ میصر

﴿ فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ۖ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ ۖ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى ۖ هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا ۖ وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ۖ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ ۖ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ ﴾

ئەم ئایەتانەش پەیوەندییەکی پتەویان بەئایەتەکانی پێشووەوە هەیە،، دوای ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا باسی داوا کردنی یوسف لەبراکانی کرا دەربارەی هێنانی بنیامین لەگەڵ خۆیاندا، لێرەدا باسی گفتو گۆی براکانی یوسف دەکا لەگەڵ باوکیاندا، بۆ ئەوەی رازی بکەنو رێگە بدا بنیامین لەگەڵ خۆیاندا بەرن، ئەویش دەترسا لەوەی ئەمیش وەکوو یوسف سەرنگوون بێ، دەبا ئێستا یوسف لەمیصر بەجێ بێڵینو بچینە ئاخی کەنعانو بزانین: گفتو گۆی نێوان یەعقوبو کورەکانی چۆنەو چییە؟

دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَجِعُوا إِلَى أَبِيهِمْ قَالُواْ يَا أَبَانَا مُنِعَ مِنَّا الْكَيْلُ﴾ واتە: کاتێك کورەکانی حەزرەتی یەعقووب گەڕانەوە بۆ لای باوکییان، پێش ئەوەی بارەکانیان بکەنەوەو خۆراكو گەنمو جۆیەکی هێناویانە دەری بکەن، چوونە لای باوکیانو وتیان: باوە گیان! بەداخەوە عەزیزی میصر لەمەدوا خواردەمەنی لێ بڕیوین، بڕیاری دا کە ئیتر گەنمو جۆمان پێ نەدەن، ئەگەر ئەمجارە چوینەوە بونیامینی برامان لەگەڵ خۆمان نەبەین، بۆیە داوات لێ دەکەین: کە لەم بارەوە گوێمان لێ بگرێو بەرژەوەندی بنەماڵەکەمان لەبەر چاو بگرێ ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا أَخَانَا نَكْتَلْ﴾ ئەمجار کە چووینەوە بۆ میصر بونیامینمان لەگەڵ دا بنێرە، بۆ ئەوەی بەئەندازەی ژمارەمان بارە گەنمو جۆ وەربگرین، چونکە ئێمە چەند کەس بین ئەوەندە بارە دانەوێڵەمان دەدەنێ، ﴿وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ ئێمە بەوپەڕی دڵسۆزیو وریاییەوە لەچونو هاتنەوەماندا پارێزگاری دەکەینو ناهێڵین هیچی بەسەر بێ، هیچ مەترسە بەساغو سەلیمی دەیهێنینەوە!

ئیتر حەزرەتی یەعقووب کۆنەبرینی کولانەوەو سەر لەنوێ یوسفی بیر کەوتەوە، ﴿قَالَ هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلاَّ كَمَا أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ مِن قَبْلُ﴾ فەرمووی: من ئەگەر ئەمەتان بەقسە بکەم شتێکی سەیرە، دڵنیابن حاڵو وەزعی من ئەو کاتەی لێتان ئەمین دەبم دەربارەی براکەتان وەکوو ئەو حاڵو وەزعەم وایە: کە کاتی

خۆی دەربارەی یوسف لێتان ئەمین بووم بردتان‌و ئێوارە گەڕانەوە وتتان: گورک خواردویەتی!! دەی چۆن ئێستا دەربارەی بونیامین لێتان ئەمین بم؟!

وازم لێ بێنن وادەو بەڵێنی خۆتان بۆ خۆتان، پارێزگاریکردنی خۆتان بۆ خۆتان، من ئەگەر داوای پاراستنی کوڕەکەم بکەم‌و هیوای رەحم‌و بەزەییم هەبێ ئەوە ﴿فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا﴾ من خودام بەسە بۆ پارێزگاری کوڕەکەم! ئەو باشترین پارێزەرو چاودێری کارە، ﴿وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ خودا لەهەموو کەس بەرەحم ترە، سۆزو بەزەیی زۆر لەوە فراوانترە کە پاش ئەو ناخۆشییەی بەهۆی یوسفەوە توشم بوو، تووشی ناخۆشییەکی تری لەو جۆرەم بکاتەوە، من تەواوی بتمانەم بەخودای خۆمەو پشت‌و پەنام هەر ئەوەو کاری خۆم بەئەو دەسپێرم! هەر ئەو بەزەیی بەجەرگی هەڵقرچاوم دادێ‌و رەحمم پێ دەکاو بەسەلامەتی بۆم دێنێتەوە! ئەمە نیشانەی ئەوەیە: کە حەزرەتی یەعقووب لەبەر ناعیلاجی‌و پێویستیان بەخواردەمەنی رازی بوو بەناردنی بونیامین لەگەڵیاندا، بەتایبەتی کە هیچ دیاردەو نیشانەیەکی وای هەست پێ نەکرد براکان رق‌و کینەیان لەگەڵ بونیامیندا هەبێ!

براکانی حەزرەتی یوسف ئەوەیان نەزانیبوو کە یوسف بیضاعەکەیانی بۆ خستوونەوە ناو بارەکانیان،،، جا ﴿وَلَمَّا فَتَحُوا مَتَاعَهُمْ﴾ کە ماندویان حەسایەوەو بارەکانیان کردنەوە بۆ ئەوەی دانەوێڵەکەی هێنابوویان بیکەنە عەمباری خۆیانەوە ﴿وَجَدُوا بِضَاعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ﴾ ئەو بەهایەی بردبوویان بۆ گەنم کڕین بۆیان گەڕێندرابووەوە، ئیتر وەندەی تر بۆیان دەرکەوت کە یوسف چەند پیاوەتی لەگەڵ کردبوون، ئەمەشیان کردە هۆکارێك بۆ زێدە دڵنیا بوونی باوکیان‌و ئیقناعی بکەن بۆ ئەوەی((بونیامین)) یان لەگەڵدا بنێرێ، بەزمانێکی شیرین‌و پڕ لەرێزو ئیحتیرام ﴿قَالُوا يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي هَذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾ وتیان: باوە گیان! چی ترمان لەمە جوانتر بوێ، چاوەڕوانی چی لەمە زیاتر بکەین! ئەمە ماڵ‌و

سامانەکەمانە کە برد بوومان بۆ دانەوێڵە کڕین بۆمان گێڕدراوەتەوە، هیچیان لێ گل نەداوەتەوە، وەکوو خۆی بۆیان گێڕاوینەوە!

خودا یاربێ لەگەڵ بونیامینی براچوکەماندا سەفەردەکەین ﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾ تێشوو بژیو بۆ خاوو خێزان دەهێنین ﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا﴾ باری حوشترێك زیاد دەکەین، واتە بەدڵسۆزییەو چاوەدێری براکەمان دەکەین، وەکوو چاوی خۆمان دەیپارێزین، ﴿وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ﴾ باری حوشترێکمان گەنم زیاتر دەداتێ، چونکە هەر کەسەو باری حوشترێکی دانەوێڵە دەدرێتێ، عەزیز بۆ خۆشی بەڵێنی ئەوەی پێداوین کە بونیامین بەرین بارێکمان بۆ زیاد بکا، ﴿ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ ئەو بارە زیادەی دەمانداتێ کارێکی ئاسانو ئاساییە، بۆ پیاوێکی ئاوا سەخی رەوشتو خاوەن رەحمو بەزەیی چ گرانیەکی تێدا نیە،

کوڕەکانی حەزرەتی یەعقووب لەهەوڵەکانیاندا سەرکەوتوو بوون، توانییان دڵی باوکیان رازی بکەن، وایان لێ کرد لەبڕیاری خۆی بێتە خوارێو بەڵێنی ئەوەی پێدان کە لەگەڵیاندا بونیامین بنێرێ بۆ میصر، بەلام هێشتا پێویستی زیاتر بەدڵنیا بوون بوو، ویستی زیاتر بەڵێنی جەخت لەسەر کراویان لێ وەربگرێ کە پارێزگاری لێ بکەنو وەکوو یوسفی لێ بەسەر نەیە؟ بۆیە روی تێ کردنو ﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِي مَوْثِقاً مِنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلاَّ أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ﴾ پێی فەرموون: ئەمن بونیامینتان لەگەڵدا نانێرم هەتا عەهدو بەڵێنێکی سوێند لەسەر خوراوم نەدەنێ، دەبێ وەعدێکی مەردانەم بدەنێ کە بەسەلامەتی بۆم دەهێننەوە، دەبێ بەڵێنێکی وام بدەنێ کە مەگەر خۆتان لەناو بچن ئەگینا هەر بۆم دەگێڕنەوەو هیچی بەسەر نایە!

ئەوانیش بەڵێنی سوێند لەسەر خوراویان پێدا وادەو بەڵێنی مەردانەیان دایە، جا ﴿فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ﴾ کە وەعدو پەیمانەکەیان دایە، دڵنیایان کرد: کە

پارێزگاری دەکەن‌و وەکوو چاوی خۆیان دەیپارێزن، ئەو کاتە: ﴿قَالَ اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ وتی: خودا شایەد بێ لەسەر وەعدو پەیمانی نێوان من‌و ئێوە، خودا ئاگادارە بەم گوفت‌و گۆیەمان‌و من ئیشی خۆم بەخودا دەسپێرم‌و کاری خۆم حەواڵەی ئەو دەکەم، ئیتر بەناعیلاجی‌و لەژێر زەختی قورسایی قاتوقڕیدا رازی بوو بەناردنی بونیامین لەگەڵیاندا!!

تێبینی ئەوە دەکرێ: کە حەزرەتی یەعقووب، کاتی خۆی بۆ ناردنی یوسف لەگەڵ کوڕەکانیدا ئەوەندە گیر نەبوو، هەرزوو رازی بوو بەوە: کە یوسفیان لەگەڵدا بنێرێ بۆ سەیران، کەچی ئەمجارە بۆ ناردنی بونیامین لەگەڵیاندا زۆر گیرەو زۆر وادەو بەڵێنی لێ وەرگرتن.

## بەشی دوازدەهەم لەچیرۆکی حەزرەتی یوسف:

### راسپاردەی حەزرەتی یەعقووب بۆ کوڕەکانی لەکاتی چوونە ناو شاری میصرەوە

﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ

ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾

حەزرەتی یەعقووب بتمانەی بەوادەو بەڵێنی کوڕەکانی کردو رەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ ناردنی بونیامینی کوڕی لەگەڵیاندا، ئەمجار سۆزی باوکایەتی پاڵی پێوەنا کە ئامۆژگاری کوڕەکانی بکا لەکاتی چوونە ژوورەوەیان بۆ ناو شاری میصر لەچەند دەرگایەکەوە بچنە ژوورەوە بۆ ئەوەی بزانن چۆن پێشوازییان لێ دەکرێ: کە بونیامین دەبینن یان بۆ ئەوەی چاوەزار کاریان لێ نەکاو، خەڵکی حەسوودییان پێ نەبەن، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ يَا بَنِي لا تَدْخُلُوا مِنْ بَابٍ وَاحِدٍ وَادْخُلُوا مِنْ أَبْوَابٍ مُتَفَرِّقَةٍ﴾ حەزرەتی یەعقووب لەکاتی بەڕێکردنی کوڕەکانیدا فەرمانی پێ کردن‌و پێی فەرموون: ئەی کوڕە خۆشەویستەکانم! هەمووتان بەکۆمەڵ لەدەرگایەکەوە مەچنە ژوورەوە، بەڵکوو لەدەرگای جیا جیا بچنە ژوورەوە! چونکە ترسی شتێکی هەبوو بەسەریان بێ، جا شتەکە چی بوە چ نەبوە نازاندرێ دەقەکە دانی پیا نەناوە،

زوربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە: حەزرەتی یەعقووب لەم ئامۆژگارییەی مەبەستی ئەوە بوو کوڕەکانی بەچاوەوە نەبن، چاوەزار: شتێکی حەقەو راستە، واتە: هۆکارێکە حەقیقییە وا دەبێ سەردەکێشێ بۆ زیان گەیاندن بەو کەسەی بەچاو دەنگیودرێ بەڵام بەئیزن‌و رەزامەندی‌و ویستی خودا، یان مەبەستی ئەوە بووە: کە کوڕەکانی جوداوازی نێوان پێشوازی لێ کردنی جاری پێشوویان‌و ئەمجارەیان بۆ دەربکەوێ، جاری یەکەم کە هەر خۆیان بوون‌و ئەمجارە کە بونیامینیان لەگەڵدایە، ئەمجار وتی: رۆڵەکانم! ئەوەش بزانن: کە من ئامۆژگاریتان دەکەم، ﴿وَمَا أُغْنِي عَنكُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ من بەم ئامۆژگارییانەم

هیچ شتێك لەقەزاو قەدەری خودا ناگێڕمەوە، ئەوی خودا نەخشەی بۆ کێشابێ‌و ویستی لەسەر بوونی هەبێ هەر دەبێ ببێ‌و گەڕانەوەی نیە، واتە: خۆپاراستن لەقەدەری خودا نابێ، چونکە خودا: کە ئیرادەی پەیدابوونی شتێکی کرد نەهاتنەدی مەحاڵە، وەلێ ئێمە فەرمانمان پێ کراوە: کە هۆکاری خۆپاراستن پەیڕەو بکەین وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾النساء/١٠٢، واتە: پێویستە ئێمە هۆکاری رواڵەتی لەبەر چاو بگرین، هەرچەندە ئەو هۆکارانە بەبێ ئیزنی خودا هیچ کاریگەریەکیان نیە بەڵکوو پشت بەستن بەخودایە بەشێوەیەکی تایبەتی‌و هەلآتن لەخودایە بۆ لای خودا، کەوابوو هەوڵدان بۆ خۆپاراستن رەتکردنەوەی قەزاو قەدەر نیە، بەربەرەکانی بڕیاری یەزدان نیە، ئادەمیزاد بۆ خۆی هیچی بەدەست نیە، کەوابوو ئەی رۆڵەکانم! باش بزانن هەرچی شتێك خودا بڕیاری دابێ تووشی ئێوە بێ گەڕانەوەی نیە، ئەم ئامۆژگاریيانەی من ئاڕاستەم کردن نابێتە بەرگری لەقەزاو قەدەری خودا! هەرچی خودا بڕیاری دابێ تووشتان بێ تووشتان دێ‌و گەڕانەوەی نیە، ﴿إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾ جێ بەجێ کردنی نەخشەی بوونەر بەهەموو شتێکەوە بەدەست خودایەو، هەموو بڕیارێك بەدەست خودا خۆیەتی، کەسی تر هیچی بەدەست نیە، ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ من هەر بەخودا پشت دەبەستم‌و هومێدم هەر بەئەوە، بتمانەم بەخودایەو بەس، ئیشی خۆم بەزاتی پاکی دەسپێرم‌و بتمانە بەکەسی تر ناکەم، ﴿وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ خاوەن تەوەککولەکان هەر لەسەر خودا تەوەککولیان هەیە، پشت هەر بەئەو دەبەستن!

﴿وَلَمَّا دَخَلُوا مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُمْ﴾ جا کاتێك کوڕەکانی یەعقووب چوونە ناو شارەوە بەو شێوەیەی باوکیان فەرمانی پێ کردبوون، لەو شوێنەوە کە نەخشەی بۆ کێشابوون، ﴿مَا كَانَ يُغْنِي عَنْهُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ جا وەنەبێ رای یەعقووب‌و چوونە ناو شاریان بەو شێوەیەی باوکیان فەرمانی پێ کردبوون

ناخۆشییان لێ دوور بخاتەوە، چونکە هەرچەندە بەگوێی باوکیان کردبوو جوێ جوێ چوونە ناو شارەوە لەدەروازی جیا جیا چوونە ژوورەوە، کەچی تووشی ئەو هەموو دەردی سەرییە بوونو تۆمەتی دزی درایە پاڵیانو بونیامینی برایان کرایە بارمتە، چونکە ربەکە لەباری ئەودا دۆزرایەوە، ئەمجار پەرێشانی باوکیانو غەمبار بوونو پەرۆشی بۆ یوسفو بونیامین سەربار!

حەزرەتی یەعقووب کە ئەو فەرمانەی پێ کردن شتێك نەبوو زیانیان لێ دوور بخاتەوە ﴿إِلاَّ حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَاهَا﴾ بەڵكوو مەبەستێك بوو لەدڵی یەعقووب خۆیدا ئەنجامی دا، شتێك بوو لەدڵی داو دركاندی، سۆزی باوكایەتی پاڵی پێوە نا كە ئەو ئامۆژگارییەیان بكا، ﴿وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِمَا عَلَّمْنَاهُ﴾ بێگومان یەعقووب دەیزانی: كە ویستی خودا دەبێ بێتە جێ، خودا ئەوەی فێر كردبوو، ئەویش باش فێری ببوو، دەیزانی: حەذەر قەدەر ناگێڕێتەوە چونكە بەنیگاو سروش ئەوەمان فێر كردبوو!

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زوربەی خەڵك: كە موشریكو كافرن وەكوو یەعقووب ئاگادارنین، یان زوربەی خەڵك نازانن: كە یەعقووب ئەو ئاگادارییەی هەیە، چونكە نازانن: خودا چۆن خۆشەویستانی خۆی فێری زانیاری بەسوود بۆ دونیاو قیامەتیان دەكا، بڕێكیش لەو زانیارییە بەسوودانە دەستەبەر كردنی هۆكارە ڕواڵەتیەكانەو ئەمجار كارسپاردن بەخودا!!

## تێبینی :

حەزرەتی یەعقووب كە بەكوڕەكانی فەرمووی: ﴿لاَ تَدْخُلُواْ مِن بَابٍ وَاحِدٍ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە: كە پێویستە خۆپاراستن لەچاوی پیس، چاوەزار حەقو راستەو هۆكارێكی ڕواڵەتییە بۆ زیانگەیاندنو هەنگاوتن، فاعیلی حەقیقیش پەروەردگارە،

ئیمـامی ئەحمــەد فەرموودەیــەکی ریوایــەت کــردوە دەڵــێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتی (العین حق) واتە: چاو کاریگەرەو چاوەزار راستە، هـەروەها قسەیەکی مەشـهوور هەیـە زانایـانی ئیـسلام گێڕاویانەتـەوە دەڵـێن: (چـاوەزار پیـاو دەخاتـە گۆڕەوە، وشـتر دەخاتـە نـاو مەنجەڵەوە)واتـە: پیـاو سـاغو بـێ دەردە چـاوەزار دەی پێکێو دەیکوژێو دەیخەنە گۆڕەوە، وشتریش ساغو سـەلیمە چاوەزار دەیهـەنگێوێو نـەخۆش دەکـەوێو سـەری دەبـڕنو دەیخەنـە نـاو مەنجـەڵو دیـزەوە دەیکـوڵێننو دەیخۆن.

پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆپاراستن لەچاوی پیس ئـەم دوعایـەی دەخوێنـد: (أعـوذ بکلمات الله التامة من کل شیطان وهامـة، ومـن کل عـین لامـة) زۆر ئـەم دوعایـەی بەسەر حەسەنو حوسەیندا دەخوێندو دەیفەرموو: حەزرەتی ئیبراهیم بـەم شێوە دوعای پارێزگاریو خۆپاراستن لەچاوەزاری بەسـەر ئیسماعیلو ئیسحاقی کوڕی دا دەخوێند.

عوبادەی کوڕی صامیت دەفـەرموێ: بـەیانی چـوومە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ دیم ئازاری زۆر بوو، لەئێوارەدا چـوومەوە خزمـەتی دیـم چـاك ببـوەوە، فـەرمووی: جوبرائیل هاتە لام ئەم دوعایەی بۆ خوێندم (بسم الله أرقیك من کل شـيء یؤذیـك، ومــن کــل عــین وحاســد، الله یــشفیك) ئیمــام ئەحمــەد لەعائیــشەو عوبــادەوە گێڕاویەتیەوە، پێویستە هەر موسـوڵمانێك شـتێکی بینـیو سـەرنجی راکێـشا دوعـای بەرەکەتی بۆ بخوێنێ، چونکە دوعای بەرەکەت کاریگەریەکەی قەڵاچۆ دەکا، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەعامیری فەرموو: (ألا برّکت) ئەوە بۆ تەبریکت نەکرد؟ بۆ نەتگوت: (تبارك الله أحسن الخالقین، اللهم بارك فیه)، هەروا دەگوترێ: چاوەزار کار لەمنـداڵ زیـاتر دەکـا تـا لـەپیر، بینـەری چاوپیس ئەگـەر شـتێکی بینـیو سـەرنجی راکێـشاو تەکبیری نەکرد، فەرمانی پێ دەکرێ کە خۆبشوا، ئەگەر خۆی نەدەشت بەزۆرە ملێ

پێی دەکرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەحەدیثەکەی ئەبو ئومامەدا کە بەچاو شتێکی هەنگاوتبوو فەرمانی بەکابرای پێکراو کرد خۆی بشواو دوعاش بخوێنێ!

کەسێك چاوی پیس بوو نابێ زۆر تێکەڵاوی خەڵك بکا، بۆ ئەوەی زیان بەخەڵك نەگەیەنێ!

کە دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ يُغْنِي عَنْهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە خۆپاراستن لەقەزاو قەدەر ناکرێ.

## بەشی سێزدەهەم لەچیرۆکی یوسف:

### ناسینەوەی بونیامین لەلایەن حەزرەتی یوسفەوە، نەخشە دانان بۆ گلدانەوەی

﴿وَلَمَّا دَخَلُوا عَلَىٰ يُوسُفَ آوَىٰ إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ إِنِّي أَنَا أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا وَأَقْبَلُوا عَلَيْهِمْ مَاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا تَاللَّهِ

لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾

**پەیوەندی نێوان ئەم کۆمەڵە ئایەتە لەگەڵ هی پێشەوە ئاشکرایە، چونکە ئەمانیش بەشێکی چیرۆکەکە نمایش دەکەن، جا با ئێستا ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی یەعقووبو رووداوی گەشتەکە بپێچنەوە وەکوو چۆن سیاقەکە پێچاویەتیەوە، بزانین: کاتی بەیەکگەیشتنی یوسف بەبراکانی چی رودەدا،؟؟**

**دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَخَاهُ﴾ جا کە کوڕەکانی حەزرەتی یەعقووب گەیشتنە میصرو چوونە مەجلیسی حەزرەتی یوسفەوە، بونیامینی براشیان لەگەڵدا بوو، رێزی لێ گرتنو شوێنی تایبەتی بۆ دابین کرد بونیامینی برای بردە پەنا خۆیەوە، ﴿قَالَ إِنِّي أَنَا أَخُوكَ﴾ وتی: من یوسفی براتم، ﴿فَلا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ خەم لەوە مەخۆ کە کاتی خۆی خراپەیان دەربارەی من کردوە، ئەمجار ئامۆژگاری کرد: کە براکانی بەم حاڵە نەزانن و ئەوەیان پێ**

نەڵێ: کە ئەمە یوسفەو یەکترمان ناسیوەتەوە، ئەمجار لەگەڵیدا تەگبیری ئەوەشی کرد: کە چۆن گلی بداتەوە،

ریوایەتکراوە: دەڵێن: کە کوڕەکانی حەزرەتی یەعقووب چوونە لای یوسف عەرزیان کرد: ئەمە بونیامینی برامانە بۆمان هێناوی، ئەویش پێی گوتن کارێکی باشتان کردووەو پاداشتان دەدەمەوە، شوێنی حەوانەوەی بۆ دیاری کردن‌و ڕێزی لێ گرتن‌و لەسەر سفرەو خوان داینیشاندن‌و هەر دوو دوو لەسەر سفرەیەك دانیشتن بونیامین بەتەنیا مایەوە حەزرەتی یوسف بردیە پەنا خۆی لەسەر سفرەی خۆی داینا‌و پێکەوە نانیان خوارد، ئەمجار حەزرەتی یوسف فەرمانی دا هەردوو دوو بردیاننە ھۆدەیەکەوە بۆ پشوودان‌و نووستن‌و بونیامین بەتەنیا مایەوە بردیە لای خۆی‌و پێی گوت من یوسفی براتم‌و خەفەت بەو کارە نامەردانەی براکانت مەخۆ: کە کاتی خۆی لەگەڵ مندا ئەنجامیان دا، بێگومان خودا ئەم کارەی بەباش گێڕاوە، لەسەر خێرو خۆشی کۆی کردوینەوە، ئەوەی پێم گوتی بەبراکانتی مەڵێ با ئەوان بەوە نەزانن،

﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ﴾ دوای ڕێز لێ گرتن‌و پێشوازیکردنی جوان‌و ڕێك‌و پێك، فەرمانی دا بۆ هەریەکەیان باری وشترێك دانەوێڵە دابگرن، جا کە تەجهیزی کردن‌و خۆیان ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە، حەزرەتی یوسف فەرمانی بەپیاوەکانی کرد: کە ﴿جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ﴾ کە ئامێری پێوانەکە (ربە، قسناغ، مود، تەنەکە) وا دیارە زێڕ یان زیو بووە یان شتێکی بەنرخ بووە بیخەنە باری بونیامینەوە، بەبێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن!

﴿ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ﴾ پاشان کە باریان بار کردو ویستیان لەشار دەربچن بانگدەرێك بانگی هێشتن‌و هاواری لێ کردن وتی: ئەی کاروانیەکان! ئێوە قافلەیەکی دزن، ربەی پاشا دزراوە، ئێوە دزیوتانە! ڕاوەستن دەتانپشکنین! ئەوانیش سەریان سوڕما پەشۆکان، جۆش دامان نەیاندەزانی چییان بەسەر هاتووە،

چی بکەن باشە، چۆن بەرەنگاری ئەم مەوقیفە ببنەوە، ئەوان کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاق‌و ئەم تاوانە (کوجا مەرحەبا) ناچار بەرێگادا گەڕانەوە بۆ ئەوەی بزانن چی رودەدا، ﴿قَالُوا وَأَقْبَلُوا عَلَيْهِمْ﴾ بەرەو رووی کابرای بانگبێژ هاتن‌و رویان تێکردو وتیان: ﴿مَاذَا تَفْقِدُونَ؟﴾ ج باسەو چیتان لێ دزراوە؟ لەچی دەگەڕێن؟ ﴿قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ﴾ وتیان: جامی ئاو خواردنەوەی پاشامان لێ هون بووە، یان ئەو ربەیەی پاشا: کە گەنمی پێ پێوانە دەکەین لێمان دزراوە، هەندێك دەڵێن: ئامێرەکە لەزێڕ بووە، بۆ ئاو خواردنەوە بەکار هێنراوە، لەهەمان کاتدا دانەوێڵەشیان پێ پێوانە کردوە، ئەمجار بەکوڕەکانی حەزرەتی یەعقووبیان گوت: ئەو ئامێرە دیار نیەو دزراوە ﴿وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ﴾ هەر کەسێك بێ ئەوەی بی پشکنین بۆ خۆی بۆمان بێنێتەوە ﴿حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ باری حوشترێکی دانەوێڵەی دەدەمێ‌و من بەرعودەی ئەوە دەبم کە ئەو خەڵاتە لەپاشا وەردەگرێ.

بەڵام کوڕەکانی حەزرەتی یەعقووب دڵنیان: کە دزییان نەکردوەو لەو تاوانە بەرین، ربەیان نەدزیوەو ئاگاشیان لێ نیە، بۆ دزی نەهاتوون‌و بەتەما دزیکردنیش نین‌و نەبوون، ئەوان نەهاتوون فەسادی دزیکردن ئەنجام بدەن، بتمانەی خۆیان بدۆڕێنن! بۆیە بەو پەڕی لەخۆڕادیوی‌و بتمانە بەخۆبوونەوە ﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُمْ مَا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الأَرْضِ﴾ وتیان: سوێندمان بەخودا، ئێوە بۆ خۆتان دەزانن‌و جاری یەکەم تاقیتان کردوینەوە، لەو کاتەوە ئێمەتان ناسیوەو هەڵس‌و کەوتی ئێمەتان بینیوە، رەگەزو بنەماڵەی ئێمەتان ناسیوە، بۆتان دەرکەوتووە کە ئێمە نەهاتووین بۆ دزی کردن‌و فەساد بلاو کردنەوە، لەکەنعانەوە نەهاتووین بۆ میصر بۆ ئەوەی کاری ناشیرین ئەنجام بدەین!

﴿وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ﴾ ئێمە دزنین‌و رۆژێك لەرۆژان دزیمان لێ واقیع نەبووەو دزیکردن‌و کاری ناشیرین رەوشتی ئێمە نیە،

﴿قَالُوا فَمَا جَـزَاؤُهُ إِنْ كُنتُمْ كَـاذِبِينَ﴾ وتیـان: سـزای ئـەو کەسـە چیـە ئەگـەر درۆتان کردو ئێوە ربەکەتان دزی بوو؟

لێـرەدا لایـەنێکی ئـەو پـلانو نەخـشەیەی خـودا خـستبویە دڵـی حـەزرەتی یوسفەوە دەردەکـەوێ، بێگومـان دابو نـەریتی ئـایینی حـەزرەتی یـەعقووب وابـوو: هـەر کەسـێك دزی لەسـەر بـچەسپایە، بـۆ خـۆی دەکرایـە کۆیلـەو بارمتـە لەسـزای تاوانەکەیدا، جا چونکە براکانی حەزرەتی یوسف لەبێ تاوانی خۆیـان دڵنیـا بـوون، بۆیە رازی بوون کە بەشەریعەتی حەزرەتی یەعقووب حوکمیان لەگەڵ بکرێ، بۆیە یەکسەر ﴿قَالُوا جَزَاؤُهُ مَنْ وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُـوَ جَـزَاؤُهُ﴾ وتیـان: سـزای ئـەو کەسـەی ربەکەی پاشای دزی بـوو لەبارەکەیدا دۆزرایـەوە بـۆ خـۆی ببێتـە بارمتـەو نرخـی دزییەکەی ئەوەیە بگیرێ ﴿كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ ئێمە بەشەریعەتی خۆمـان ئـاوا سزای دزو ستەمکاران دەدەینەوە!!

هەموو ئـەم حیـوارو گفتـو گۆیـە لـەپێش چاوی یوسـفو بـەئاگاداری ئـەو ئەنجام درا، ئیتر فەرمانی دا بەتەفتیش کردنو پشکنینی بارەکانیان ﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْـلَ وِعَـاءِ أَخِيـهِ﴾ بەشـێوەیەکی ژیرانـەو عـاقڵ مەنـدی سـەرەتا دەسـتی کـرد بەپـشکنینی بـاری زڕبراکـانی، هەڵبەتـە ئـەو فـەرمانی کـردو پیاوەکـانی کارەکـەیان ئەنجام دا یەکە یەکە بارەکانیان پشکنین تـا سـەرە گەیـیشتە سـەر بـاری بونیـامینی بـرای ﴿ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِنْ وِعَاءِ أَخِيـهِ﴾ پاشـان کـە بـاری حوشـتری بونیـامین پـشکنرا ربەکەی پاشایان لێ دەرهێنا! لەباری ئەودا دۆزرایەوە، بەمـەش پـلانو نەخـشەکەی یوسف بۆ گلدانـەوەی براکـەی سـەرکەوتو بـەگوێرەی شـەریعەتێ: کـە خۆیـان پێـی رازی بـوون رێگـای بـۆ خـۆش بـوو: کـە بونیـامین گـل بداتـەوە، لـەم لاشـەوە بـیر لەمەوقیفی براکانی یوسف بکەرەوە چەند شـەرمیان بـەخۆیاندا هاتۆتـەوەو چـەند تەریق بوونەوە، پاش ئەو هەموو سوێندو جەخت کردنەوە دزییان لەسەر چەسپاو تاوانبار کران؛ ﴿كَذَلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ﴾ ئاوا بەو شێوە وردو لێزانیە ئـەو پیلانـەمان

بۆ یوسف ڕێك خست، نیگامان بۆ کرد: کە بەو شێوە نەخشەکە جێ بەجێ بکا، هەڵبەتە ئەمە فێڵ‌و پلانێکی پەسندو خودا ویستە، حیکمەت‌و بەرژەوەندی پێویستی تێدایە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە دروستە هۆکاری وا پەیرەو بکەی کە بەرواڵەت وەکوو فرت‌و فێڵ وا بێ بۆ گەیشتن بەمەبەستێکی مەشرووع‌و پەسند! بەمەرجێ ئەو فێڵە دژایەتی لەگەڵ دەقێکی شەرعی‌و حوکمێکی چەسپاو نەکا، ئەم پلانەی حەزرەتی یوسف نەخشەی بۆ کێشاو ئەنجامی دا پیلانێکی مەشروع و دروست بوو، چونکە خێرو مەسڵەحەتی بەدواوە بوو زەرەرو زیانی بەکەس نەگەیاند، بونیامینیش بۆ خۆی دڵنیا بوو لەبێ تاوانی خۆی، چونکە لەوەپێش لەگەڵ حەزرەتی یوسفدا ڕێك کەوتبوون، بۆیەش یوسفمان فێری ئەم پلانە کرد تا بتوانێ بونیامین گل بداتەوە ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾ ئەگەر بەگوێرەی شەریعەتی یەعقووب هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ نەکردنایە، نەیدەتوانی بەگوێرەی یاسای پاشای میصر بونیامین بەبارمتەو سزای دزی گل بداتەوەو بیکاتە کۆیلە، چونکە لەیاسای باوی ئەو سەردەمەی پاشای میصر ڕێگای ئەوە نەبوو دز بکرێتە کۆیلەو بەند بکرێ! بەڵام خودا بارو دۆخێکی بۆ هەڵسوڕاند براکانی بەدەمی خۆیان خۆیان پابەندی یاسایەك کرد: کە لەبەرژەوەندی حەزرەتی یوسف بوو، بۆ پلانی گل دانەوەی بونیامین گونجاو بوو! حەزرەتی یوسف بۆ خۆیشی دەیزانی کە شەریعەتی ئەوان ئەوەی تێدایە: کە دز دەکرێتە کۆیلەو دەگیرێ، بەڵێ ئەگەر حەزرەتی یوسف بەشەریعەتی یەعقووب مامەڵەی لەگەڵ نەکردنایە، نەیدەتوانی براکەی گل بداتەوە ﴿إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ مەگەر خودا ویستی لەسەر بوایە، بێگومان خوداش ویستی لەسەر بوو، بۆیە ئەو پلانەمان بۆ دانا‌و تەوفیقمان دا بۆ ئەوەی هۆکارەکان ڕێك بخاو بەهێدی‌و هێمنی نەخشەکە ئەنجام بدا، واتە: ئەو پلانە خودا فێری کردو فەرمانی پێ کرد تاوا ئەنجامی بدا، نەك لەداهێنان‌و پیلانی یوسف خۆی بێ!

ئەمەش فەضلو بەخششی خودایە، کەسێك خودا بیەوێ بەرزی بکاتەوە، زانیاریو نەخشەی سەرکەوتووی فێر بکا فێری دەکا، ﴿نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ﴾ کەسێك بمانەوێ چەند پلەیەك بەرزی دەکەینەوە، زانستو زانیاری پێ دەبەخشین، ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ لەژوور هەموو خاوەن زانیاریو زانایەکەوە زاناترێك هەیە، لەژوور هەموو زانایەکەوە کەسێك هەیە لەو زاناترە، تا دەگاتە کەسێك: کە زانیاری ئەو هەموو شتێك دەگرێتەوە ئەویش پەروەردگاری بوونەوەرە ئیتر عیلمو زانیاری ئەو سنووری نیە، رەهاو فراوانە زاتی پاکی لەژوور هەموو خاوەن زانیارییەکەوەیە، ﴿إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ ئیستیثنایە لەهەموو حاڵەکانی واتە: لەهیچ حاڵێك لەحاڵەکانیدا نەیدەتوانی براکەی گل بداتەوە مەگەر لەحاڵەتێکدا خودا ویستی لەسەر بوایە، واتە: یوسف ئەو پلانەی بەئیزنو نیگای خودایی ئەنجام دا!

**تێبینی :**

بێگومان ئەم ئایەتە قوڕ بەدەمی ئەوانەدا دەدا کە دەڵێن: ئایین بریتییە لەبیرو باوەڕو خودا پەرستیو بەس! بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ بۆڕدانی ئەو نەفامانەی کە پێیان وایە: ئایین بریتییە لەپەیوەندی نێوان بەندەو خوداو چ دەخڵێکی بەسەر یاساو نیظامی بەڕێوەبردنەوە نیە!

ئەوەتا ئەم ئایەتە زۆر بەوردی وشەی (دین) سنوور دار دەکا، پێناسەیەکی دین رادەنوێنێ، بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کە دین وێڕای بیرو باوەڕو عیبادەت یاساو نیظامو شەریعەتی بەڕێوەبردنیش دەگرێتەوە، بەئاشکرا لەشوێنی یاساو شەریعەت وشەی (دین)ی بەکار هێناوە، کەوابێ دین یانی عەقیدەو بیرو باوەڕ، یانی عیبادەتو خودا پەرستی، یانی یاساو شەریعەتی بەڕێوەبردنی ئیشو کار، یانی یاسای قیصاصو تۆڵەستاندنو تەمێ کردنو مامەڵەو خێزان دروست کردن کۆمەڵ دامەزراندنو رێكو پێك کردنی نێوان تاکەکانی کۆمەڵو یاسای پێکەوە ژیانیان!

**بەشی چواردەهەم لەچیرۆکی یوسف:**

**دانوسانێکی توندو تیژ لەنێوان کوڕەکانی حەزرەتی یەعقووب لەگەڵ حەزرەتی یوسفدا**

﴿ ۞ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ وَلَمۡ يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ٧٧ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٧٨ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ٧٩ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ خَلَصُواْ نَجِيّٗاۖ قَالَ كَبِيرُهُمۡ أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمۡ قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم مَّوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبۡلُ مَا فَرَّطتُمۡ فِي يُوسُفَۖ فَلَنۡ أَبۡرَحَ ٱلۡأَرۡضَ حَتَّىٰ يَأۡذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوۡ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨٠ ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ

فَقُولُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَـٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَـٰبَنِىَّ ٱذْهَبُوا۟ فَتَحَسَّسُوا۟ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَا۟يْـَٔسُوا۟ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَا۟يْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾

ئـەو شـەرمەزارییەی تووشـی کورەکـانی حـەزرەتی یـەعقووب بـوو بـەهۆی دۆزینـەوەی ربـەی پاشا لـەباری بونیـامیندا لەناخـەوە هەژانـدنی، ئـەو هەڵوێـستە حەریجەی ئەوانی تێکەوت رقی شاردراوەیان دژی بونیـامین و بـۆ حـەزرەتی یوسـف لەوەپێش، جارێکی تـر سـەر رێـژی کـردو دژایـەتی خۆیـان بـۆ یوسـف و بونیـامینی بەتۆمـەتگیراو درکانـد، هـەوڵی ئـەوەیان دا لەکـەی دزی لـەخۆیان دوور بخەنـەوە بیخەنە سەر یوسف و بونیامینی بـرای کـە لـەدایکێك بـوون، ﴿قَـالُوا إِنْ يَـسْرِقْ فَقَـدْ سَرَقَ أَخٌ لَهُ مِنْ قَبْلُ﴾ وتیان: شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە کە ئەم برا باوکییەمان دزی بکـا چـونکە دایکـی جودایـە، جـا ئەگـەر ئـەمڕۆ ئـەم دزی کردبـێ و دزی بکـا ئـەوە عەجایەب نیە چونکە لـەوەپێش برایـەکی تـری هـەبوو ئـەویش هـەر وا دزی کـرد، ئەم سروشتەیان لەدایکییانەوە بۆ ماوەتەوە.

وەپاڵـدانی دزی بـۆ لای حـەزرەتی یوسـف لەهـەرە ریوایەتـە راسـتەکاندا ئـەو فەرموودەیەیە: کە ئیبنو مەردەوەیهی لەئیبنو عەبباسەوە بەمـەرفووعی ریوایـەتی کردوە دەفەرموێ: یوسف بتێکی لەزێڕ دروستکراوی لەباوکی دایکی دزی و شکاندی و فڕێی دایە سەر رێگا، گوایە براکانی یوسف بەئەمە عەیبداری دەکەن!

ریوایـەتێکی تـر هەیـە ئیبنـو ئیـسحاق و ئیبنـو جـەریرو ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لەموجاهیدەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: یەکەم بـەڵاو ناخۆشـی: کە تووشـی یوسـف هات ئـەوە بـوو پـوری خوشـکی بـاوکی: کە کچە گـەورەی حـەزرەتی ئیـسحاق بـوو، پـشتێنەکەی حـەزرەتی ئیـسحاقی کەوتـە لا چـونکە گـەورەترین منـداڵی حـەزرەتی ئیسحاق بوو، جا کە یوسف لەدایك بوو ئەم پوورەی بۆ پەروەردە کردن بردییە لای خۆی، زۆر خۆشەویستی یوسف چووە دڵیەوە، کـەس هێنـدەی ئـەم پیرێژنـە یوسـفی خـۆش نەویـستووە، بـەم جۆرە یوسـف لای ئـەم پـورەی مایـەوە هـەتا خڕەکـە بـوو پێگەیشت، حەزرەتی یەعقووب ویستی بیباتەوە لای خۆی و داوای لێ کرد بیداتەوە، پورەکـەی وتـی: مـن بـێ یوسـف هەڵناکـەم و نـاتوانم سـاتە وەختێـك لـێم دوور

بکەویتەوە، پاشان وتی: با چەند رۆژێکی تر لام بمێنێتەوە بۆ ئەوەی تێر سەیری بکەمو تەسەللام پێ بێ!

جا کە یەعقووب رۆیشتەوە بۆ مالی خۆیان پیرێژن هەستا پشتێنەکەی ئیسحاقی لەژێرەوە لەپشتی یوسف بەست، ئەمجار وتی: پشتێنەکەم لێ دزراوە بزانن لای کێیە؟ دەستیان کرد بەپشکنینو گەڕان، دوایی لای یوسف دۆزرایەوە، کە حەزرەتی یەعقووب بەم هەواڵەی زانی هات بۆ لای خوشکە گەورەی‌و وتی: ئەگەر یوسف شتی وای کردبێ ئەوە بابۆخۆی بارمتەبێ لات هەرئەوەندە دەتوانم، ئیتر تا پیرێژن مرد یوسف لای مایەوە، ئەم روداوەیە: کە براکانی یوسف نیسبەتی دزییان بۆ لا داو وتیان: ﴿إِنْ يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَهُ مِنْ قَبْلُ﴾ ئەگەر ئەمڕۆ بونیامین دزی کردبێ ئەوە شتێکی سەیر نیە چونکە برایەکی تریشی هەبوو لەوەپێش دزی لێ رودرا، ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ﴾ حەزرەتی یوسف وەڵامی ئەم قسە ناشیرینەی نەدانەوە، لێیانی نەگرت‌و پێناخۆشبوونی خۆی بەرامبەر دەرنەبڕی‌و بەدرۆی نەخستنەوە، لەکاتێکدا لێی مەعلووم بوو کە خۆیشی‌و بونیامینی براشی لەتاوانی دزی دوورن، ئەوان بوختانیان پێ دەکەن، بەڵکوو لەدڵی خۆیدا ﴿قَالَ أَنْتُمْ شَرٌّ مَكَاناً﴾ بەڵکوو ئێوە بەم درۆهەڵبەستن‌و بوختانکردنەتان لای خودا پلەو پایەی خراپتان هەیە، بوختانکەر زۆر لەبوختان پێکراو خراپترە، ئێوە خۆشەویسترین جگەر گۆشەتان لەباوکتان دزی‌و بەمەبەستی لەناو بردنی خستتانە بیری کەنعانەوە، ئەمجار درۆی ئەوەتان هەڵبەست گوایە گورک خواردویەتی، ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾ خودا لەهەموو کەس زانا ترە بەو تاوانەی بەناحەق وەپاڵی من‌و بونیامینی برامی دەدەن!

ئەمجار براکانی یوسف بەخۆیاندا چوونەوەو ویتسیان هەر چۆنێك بێ بونیامین ئازاد بکرێ، عەهدو پەیمانی باوکیان بیر کەوتەوە کە وتی: ﴿لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلاَّ أَن يُحَاطَ بِكُمْ﴾ ئیتر دەستیان کرد بەپاڕانەوەو هەوڵیان دا حەزرەتی یوسف بەزەیی

پێیاندا بێتەوە، ﴿قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ! إِنَّ لَهُ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا﴾ وتیان: ئەی پاشا! ئەی عەزیزی میصر! ئەم کوڕەی کەوا تۆ گرتوتە باوکێکی پیرو کەنەفتی هەیە، باوکێکی بەساڵاچوو کەفتەکاری هەیە، بێتو ئێمە بچێنەوەو ئەومان لەگەڵ نەبێ بەتەواوی تێك دەچێ، کاتی خۆی کوڕێکی خۆشەویستی هەبوو فەوتاوە بیرۆشی ئەو کوڕەی بەئەم دێ، بۆیە پێویستە ریعایەتی ئەو باوکە پیرەمان بکەی بەزەییت پێمانا بێتەوە ﴿فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ﴾ یەکێك لەئێمە بگرەو بیخەرە شوێنی بونیامین ﴿إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە دەبینین جەنابت زۆر لەگەڵ ئێمەدا چاکەکاریو پیاوەتیت بەسەرمانەوەیە، کە ئازوقەو بەشەخواردنمان پێ دەدەی زیادەمان دەدەیەو پیاوەتیمان لەگەڵ دەکەی، میوانداریمان دەکەی، بەرێزو قەدرەوە مامەڵەمان لەگەڵ دەکەی، کەوابێ چاکەکاریو پیاوەتی خۆتمان لەسەر تەواو بکە، وەکوو گوتراوە (الإحسان بالتمام)، دەی کەوایە: ئەم پیاوەتییەشمان لەگەڵ بکە، خۆرەوشتی تۆ هەر چاکەو پیاوەتییە، بەگوێرەی سروشتو رەوشتی خۆتمان لەگەڵ دا بکە، ئێمە شیاوترین کەسین کە ئاتاجی ئەو چاکەکارییەتین!

بەڵام یوسف دەیەویست دەرسێکی پەروەردەییان داداو براکانیو باوکی ئامادە بکا بۆ روبەڕوبوونەوەی موفاجەئەیەك کە لەوە بەولاوە دێتە پێشەوە!

﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ نَأْخُذَ إِلاَّ مَنْ وَجَدْنَا مَتَاعَنَا عِنْدَهُ﴾ حەزرەتی یوسف فەرمووی: پەنا دەگرین بەخودا کە ئێمە کاری ناڕەوا بکەین، پەنا دەگرین بەخودا کە ئێمە کەسێك بگرین ربەکەی لەباردا نەدۆزرابێتەوە، ئێمە کەسێك گل دەدەینەوە کە ربەکەمان لەبارەکەیدا دۆزیوەتەوە، کەسی تر لەباتی ئەو گل نادەینەوە، ﴿إِنَّا إِذاً لَظَالِمُونَ﴾ ئێمە کە جگە لەئەو کەسێکی تر گل بدەینەوە ئەوە بەگوێرەی شەریعەتی خۆشتان ستەمکارییەو ئێمە دەچینە پێڕی ستەمکارانەوە، دەی چۆن داوای ئەوە دەکەن ئێمە ستەمکاری بکەین لەجیاتی تۆمەتبارێك بێ تاوانێك بگرین؟ بەکورتی مەبەستی ئەوەیە: دەفەرموێ: من نیگام بۆکراوە

بونیامین گل بدەمەوە، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکی تایبەتی هەیە بێتە جێ، ئەگەر بەپێچەوانەی ئەو نیگایە هەڵسو کەوت بکەم ستەمکارم! ئەمن هەرگیز شتی وا ناکەم، ئیتر براکانی حەزرەتی یوسف لەوە نائومێد بوون برا پچکۆلەیان بۆ رزگار بکرێ، کۆڕو مەجلیسی یوسفیان بەجێ هێشتو بۆخۆیان کۆبونەوەیەکیان ئەنجام دا، سیاقی قورئانەکە گفتو گۆی کۆبوونەوەکە دیاری ناکا بەڵکوو ئاکامی کۆبوونەوەکە باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا اسْتَيْئَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيّاً﴾ کە براکانی یوسف ناهومێد بوون لەرزگار کردنی براکەیان، لەمەجلیسەکە چوونە دەرەوە لەناو خۆیان دەستیان کرد بەراوێژو گفتو گۆ: ﴿قَالَ كَبِيرُهُمْ:﴾ برا گەورەکەیان بەتەمەن یان بەعەقڵو هۆش وتی: ئەمە کارێکی گەورەیەو نابێ وا بەئاسانی سەیری بکەین: ﴿أَلَمْ تَعْلَمُوا أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُمْ مَوْثِقاً مِنَ اللَّهِ﴾ ئەوە نازانن و بیرتان نایەتەوە: کە باوکتان وادەو بەڵێنی لێ وەرگرتین: کە دەبێ بەسەلامەتی ئەم کورەی بۆ بەرینەوە مەگەر سەرمان تێدابچێو هیچمان نەمێنین! ﴿وَمِنْ قَبْلُ مَا فَرَّطْتُمْ فِي يُوسُفَ﴾ ئەی ئەوەتان وەبیر نایەتەوە لەرابردوودا چیتان لەگەڵ یوسف کرد؟ چۆن بەو شێوە نامەردانەیە لەبەر چاوی باوکمان هونتان کردو ئاوا بوو بەهۆی غەمو خەفەت بۆیو چاوەکانی کوێر بونو ئاوا تووشی ئەو حاڵەتە ناخۆشە بوو!!

دەسا وەڵڵاهی ﴿فَلَنْ أَبْرَحَ الأَرْضَ حَتَّى يَأْذَنَ لِي أَبِي﴾ ئەمن ئەم خاکی میسرە بەجێ ناهێڵمو بونیامینی تێدا بمێنێتەوە، هەتا باوکم بۆ خۆی ئیزنی گەڕانەوەم نەدا، ﴿أَوْ يَحْكُمَ اللَّهُ لِي﴾ یان خودا بڕیارێك بدا دەربارەی منو براکەم بەجۆرێك بتوانم براکەم رزگار بکەم، یان فەرمانی دەرچوونم لەخاکی میسر دەر بکا ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ خودا باشترین دادوەرە، هەر حوکمێکی بیدا حەقو عەدالەتە، پێویستە پابەندبم پێیەوە، ئەمە بڕیاری شەخصی خۆمەو بەنیسبەت خودی خۆمەوە ئەمە هەڵوێستمە، بەڵام براکانی تر کە بڕیاریان وابوو بگەڕێنەوە بۆ

کەنعان دەربارەی ئەوانیش رای خۆی دەربڕی‌و وتی: ﴿ارْجِعُوا إِلَى أَبِيكُمْ فَقُولُوا يَا أَبَانَا إِنَّ ابْنَكَ سَرَقَ!﴾ ئێوەش بڕۆنەوە بۆ لای باوکتان‌و بڵێن: بابە گیان بونیامینی کوڕت ربەی پاشای دزی‌و عەزیزی میصر لەتۆڵەی ئەو تاوانەدا، کردی بەکۆیلەو گلی دایەوە، ئەم حوکمەشی لەسەر رۆشنایی شەریعەتی باوی ئێمە دەرکردو، ئێمە بۆ خۆمان پێمان گوت: سزای دزی لەشەریعەتی ئێمەدا ئاوایە ﴿وَمَا شَهِدْنَا إِلاَّ بِمَا عَلِمْنَا﴾ ئێمە ئاگادار نەبووین بەدزییەکە جگە لەوەی: کە زانیمان‌و بەچاوی خۆمان دیمان ربەکەی پاشایان لەباری ئەو دەرهێناو بەئاشکرا دزییەکەی لەسەر چەسپا! ئێمە ئەو کاتەی کە وادەو بەڵێنمان پێدای گوتمان: بەسەلامەتی دەیهێنینەوە چوزانین ئەوەمان بەسەر دێ ئەگینا نەبونیامینمان دەبردو نەوادەو بەڵێنی ئاوا جەخت لەسەر کراویشمان بەجەنابت دەدا ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَافِظِينَ﴾ ئێمە خۆئاگاداری زانیاری پەنامەکی نین، کەی دەمانزانی: کە بونیامین دزی دەکاو دەگیرێ‌و دەکرێتە کۆیلە؟ ئێمە چوزانین ئەمیش توشی کارەساتێکی ئاوا دەبێ‌و بۆ تۆ دەبێتە غەم‌و نارەحەتیەکی تر؟!

بەکورتی حەقیقەتی حاڵەکە نازانین چۆنە چونکە هەر خودا غەیب زانەو کەسی تر شتی پەنامەکی نازانێ، ئێمە ئەوەی دیمان ئەوەبوو، جا ئەگەر لەپاش ئەم رودawەوە شتێکی تر هەبێ ئەوە ئێمە بێ ئاگاین‌و ئاگاداری عیلمی غەیب نین، جا ئەگەر تۆ شك‌و گومانت لەم قسانەی ئێمەدا هەیە ئەوە ﴿وَاسْأَلْ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا﴾ دەتوانی یەکێك بنێری بۆ شاری میصرو شایەدی دانیشتوانی شاری میصرت بۆ بێنێ، بنێرە پرسیار لەخەڵکی ئەو شارە بکە کە ئێمە لێی بوین‌و ئەو روداوەمان تێیدا بەسەرهات، چونکە دەنگ‌و باسی دزییەکە بەناو شاردا بڵاوەی کردوو هەموو پێی زانی، ﴿وَالْعِيرَ الَّتِي أَقْبَلْنَا فِيهَا﴾ بۆ خۆت پرسیار لەو کاروانچییانە بکە: کە لەگەڵمان بون‌و شایەدی روداوەکە بوون، ئەمە هەموو پاکانەیە بۆ خۆیانی دەکەن‌و دەیانەوێ تۆمەت لەخۆیان دوور بخەنەوە، چونکە گومانیان لێ دەکرێ‌و لەروداوی

یوسفدا تۆمەتبارن! ئەمجار جەختیان لەسەر راستگۆیی خۆیان کردەوە وتیان: ﴿وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ بێگومان راستگۆین لەو هەواڵانەی پێمان دای‌و درۆمان لەگەڵ نەکردووی! ئەمە راسپاردەی برا گەورەکەیان بوو: کە لەمیصر بۆ خۆی مابوەوەو بڕیاری دابوو تا باوکی ئیزنی نەدا میصر بەجێ نەهێڵێ.

جا کاتێ براکانی یوسف گەڕانەوە بۆ کەنعان‌و ئەم هەواڵە ناخۆشەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە باوەڕی پێ نەکردن ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْراً﴾ فەرمووی: نەخێر ئەمەشتان فرت‌و فێڵێکی ترەو بۆ خۆتان ربەکەتان خستۆتە ناو باری بونیامینەوە بۆ ئەوەی بەگرتی بدەن، بەڵکوو ئەمەش پیلانێکە لەنەفس‌و دەروونتاندا داتانڕشتووە بۆ ئەوەی بونیامینیش وەکوو یوسف لەناوبەرن‌و خۆتانی لێ رزگار بکەن، ئەگەر بۆ خۆتان بەدەمی خۆتان فتوا نەدەن بۆ عەزیزی میصر: کە هەر کەسێك ربەکەی لەبارەکەیدا دۆزرایەوە دەگیرێ‌و دەکرێتە کۆیلە، عەزیزی میصر کوڕی منی نەدەگرت‌و گلی نەدەدایەوە برا گەورەکەشتان لەمیصر هەڵەوگیر نەدەبوو!

دەی هەڵوێستی من لەئاست ئەم بەڵاو بەتاقیکردنەوانەدا رازی بوون بە قەزاو قەدەرە ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾ حاڵ‌و وەزعی من لەئاکامی ئەم موصیبەتانەدا خۆگری‌و دان بەخۆدا گرتنە، نە ئاخ‌و ئۆف دەکەم، نەشکایەت‌و سکاڵام بۆ لای کەس دەبەم! رازیم بەقەزاو قەدەری پەروەردگار، سکاڵام بەس بۆ بارەگای خودا دەبەم، هەر ئەو ئەو کەسی بێکەسانە، هەر ئەو پەنای بۆ دەبرێ‌و هاواری لێ دەکرێ، هەرگیز لەرەحمەتی خودا نائومێد نابم ﴿عَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعاً﴾ هومێدەوارم خودا هەرسێك کوڕەکانم بۆ بگێڕێتەوە (یوسف‌و بونیامین‌و روبیل) چاوەڕوانی بڕیاری خودا دەکەم دەربارەیان، ئاواتە خوازم خودا هەرسێك کوڕەکانم بۆ بنێرێتەوە (بەئیلهام ئەوەی دەزانی کە یوسف نەمردوە).

﴿إِنَّـهُ هُـوَ الْعَلِـيمُ الْحَكِـيمُ﴾ بێگومـان خـودا بۆخـۆی زانـاو ئاگاداره بـەحاڵی تـەنیایی مـنو فـەوتانی کوڕەکـانمو غـەمو نارەحـەتی مـن بۆیـان، دانـاو کارامایـە لەکردەوەکانیدا، هەرچی دەیکا، ئەنجامی بێ هۆو حیکمەت نیە، بەندەکانی بـەتاقی دەکاتەوە، بەڵاو موصیبەتیان تووش دەکا، پاشان بەگوێرەی حیکمەتو لێزانی خۆی بەگوێرەی دابو نەرێتی خـۆی لەبوونـەوەردا ئـەو بـەڵاو ناخۆشییانە هەڵدەگرێو پاش ناخۆشی خۆشی دێنێتـە کایـەوە، هـەموو کارێـك؛ خۆشی بـێ یـا ناخۆشـی بـێ لـەکاتی گونجـاوی خـۆیدا ئـەنجامی دەداو رێکـی دەخـاو، زانایـە بەهـەموو ئـێشو ئازارێ، خاوەن حیکمەتە لەهەموو کارێکی دا.

ئەمجار ﴿وَتَـوَلَّى عَـنْهُمْ﴾ پـشتی لـەکوڕەکانی هـەڵکردو پێـی ناخۆشـبوو ئـەو هەواڵە ناخۆشەیان پێـدا، بـەدڵی غـەمبارەوە رۆیـشتە کەنارێکەوە، سـەرباری غـەمو خەفـەتی نەهاتنـەوەی بونیـامینو کـوڕە گەورەکەیـشی بـیری رۆژگـاری رابـردوی کردەوە، برینی ونبوونی یوسفی کولانەوە، بەئاهو حەسرەتەوە هەستی بـەوە کـرد: کـەس هاوبەشـی غـەمی نیـە، سـەرباری پـیریو کـوێریو کەفتـەکاری، کوڕەکانیـشی لـەدەس چـوونو دەوروبـەریش هەسـت بەناسـۆری پـڕ جـەخاری ناکـەن، بەتـەنیا لەکوڵبەی ئـەحزاندا مـاتو غـەمبارە ﴿وَقَـالَ يَـا أَسَـفَى عَلَـى يُوسُـفَ!﴾ وتـی: ئـەی ئەسەفو خەسار بۆ تۆ ئەی یوسف! ئای چۆن لێم ونبوویو لەدەستم چووی؟!

﴿وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ﴾ هەردوو چاوی کوێر بوبوونو سپی هەڵگەڕابوون لەبەر غەمو نارەحـەتیو فرمێـسك رژانـدن، ﴿فَهُـوَ كَظِـيمٌ﴾ بەراسـتی دڵو سـینەی پڕبوبـوو لـەئازارو ناسـۆر، تێپـەڕبوونی ئـەو هـەموو ساڵو رۆژگـارە دورو درێـژە نەیانتوانی یوسف لەبیر پیرەمێـردی کۆنـە سـاڵ بەرنـەوە هـەواڵی گیرانـی بونیـامین قەتماغەی لەسەر برینی ناو جەرگی باوکی دڵسۆز هـەڵگرتو ناسـۆری لەدەستدانی یوسـفی کولاندنـەوە، ئـاخو ئـۆفی زیـادو لەسـنوور بـەدەر دیاردەیـەکی ئینـسانییە لەکاتی بەڵاو موصیبەتی کاریگەردا، دڵتەنگیو غەمو پەژارە ئەگەر صەبرو خۆگری

لەگەڵدا بێ‌و کۆنترۆڵی نەفسی خۆی بکا شەرع پەسندی دەکاو کارێکی بێ شەرعی نیە.

## پێغەمبەر ﷺ لەکاتی مردنی ئیبراهیمی کوڕی دا گریا:

هەردوو پیری فەرمووده بوخاری‌و موسلیم ریوایەتیان کردوە: کە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان العین لتدمع، وان القلب لیخشع، ولا نقول الا مایرضی ربنا، وانا بفراقك یاابراهیم لمحزونون) چاو فرمێسکی لێ دەڕژێتە خوار، دڵ دەترسێ‌و دەلەرزێ، شتێك نالێین خودا پێی رازی نەبێ، ئێمە بەلەدونیا دەرچوونت ئەی ئیبراهیم غەمبارین!،

ئاخ‌و ئۆفی ناشەرعی ئەوەیە: کە نەفام‌و نەزان لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا دەست دەکەن بەهات‌و هاوارو لەخۆدان‌و یەخە دادڕین‌و لەسنگ دان‌و قوڕ لەخۆگرتن؛ خۆ لەقوڕوەردان، ئەگینا گریانی لەسەرەخۆو بەکوڵ شتێکی رەوایە، ریوایەت کراوە: کە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی گیان دەرچوونی منداڵی یەکێ لەکچەکانیدا گریانی هات، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە تۆش دەگری لەکاتێکدا جڵەوگیری گریانت لێ دەکردین؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مانهیتکم عن البکاء، وانما نهیتکم عن صوتین أحمقین: صوت عند الفرح، وصوت عند الترح) من جڵەوگیری گریانم لێ نەکردون، بەڵکوو من جڵەوگیریم لەدوو دەنگی قێزەون لێ کردن پێکەنینی قاقای کاتی خۆشی، قیژەو گریانی بەدەنگی بەرز کاتی موصیبەت.

رۆژگار هاتن‌و رۆیشتن، حەزرەتی یەعقووب جەرگ سوتاوو کوێرو پیرەمێردی کۆنە ساڵ بەئاخ‌و ئۆفەوە دەتلایەوە رۆژ دوای رۆژ دەردی جەرگ سوتانی لێ گرانتر دەبوو، سۆزی لەدەسچوونی رۆڵە ونبوەکانی تەنگی پێ هەڵدەچنی، کارگەیشتە ئەوە کوڕەکانی ترسی ئەوەیان لێ پەیدا کرد لەپەل‌و پۆ

بکەویٚو بەتەواوی شەپرێو بیٚ! ئیتر کەوتنە سەرزەنشتکردنیو ویستیان لەو هەڵوێستەی ژێوان بکەنەوە، ﴿قَالُوا تَاللَّهِ تَفْتَأُ تَذْكُرُ يُوسُفَ﴾ وتیان: سوێندمان بەخودا تۆ خراپت لیٚ قەوماوە ماڵ خرانەبوو! ئەوە تۆ چیتە کەس بەشت نازانی یوسف نەبیٚ، تاکەی تۆ هەر باسی یوسف دەکەی! ئێستا تۆ دوو کوڕت دیارنینو تووشی ئەو تەنگو چەڵەمەیە بوون، کەچی باسی ئەوان ناکەیو ڕێگا چارەیەك بۆ ئەو ڕوداوە نابارە نادۆزیتەوە، ئەم دادو فیغانەت لیٚ بووە بەخۆو لێی دەسبەردار نابی ﴿حَتَّى تَكُونَ حَرَضاً﴾ هەتا بەتەواوی نەخۆش دەکەویو نیوە مردو دەبیو لەدەستو دوو دەکەویو دەتوێیەوە ﴿أَوْ تَكُونَ مِنَ الْهَالِكِينَ﴾ یان هەر بەیەکجاری دەمریو لەناو دەچی! بۆ بەزەییت بەخۆتدا نایەو تاکەی ئەم ئاخو ئۆفە؟! یوسف مردو بڕایەوە! تۆ تازە بەتەمای یوسفی بێتەوە؟!

پیرەمێردی کۆنە ساڵی جەرگ بڕاو ڕەددی دانەوەو ﴿قَالَ:﴾ پێیانی فەرموو: ئێوە حەقتان چیە بەسەرمەوە، خۆمن داوا لەئێوە ناکەم هەندیٚ غەمو پەژارەم لەگەڵ هەڵبگرن؟ نامەویٚ ئێوە باری گرانم لیٚ سووك بکەن! نەڕۆییشتووم لەناو خەڵکدا هاتو هاوار بکەم، ئێوە پێی لەکەدار بن، لێم گەڕێن ﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾ من کە سکاڵاو شکاتی خۆم دەکەم، تەنیا بۆ لای پەروەردگاری خۆم بۆ لای (الله) هانا دەبەم، داوای لابردنی غەمو پەژارەی پڕ ئازارم هەر لەخودا دەکەم، دوعاو پاڕانەوەم هەر ئاڕاستەی ئەو دەکەم، وازم لیٚ بێنن خۆمو خودای خۆم!! ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ ئەوەی کە من دەربارەی خودا دەیزانم ئێوە پەی پیٚ نابەن! من هیوا بڕاونیمو ناهومێد نەبووم، چونکە من دەزانم: ڕەحمەتو فەضلو بەخششی خودا چەند زۆرو زەبەندەیە، چەند دەریای ئیحسانو چاکەکاری فراوانو بیٚ سنوورە، بڕوام وایە: خودا ڕۆژێك لەڕۆژان بەکوڕەکانم شاد دەکاتەوە، ئەو غەمو پەژارەیەم لەدڵ دەردەهاویٚ! هیوادارم بەم گریانو پاڕانەوەیە خودا بەزەیی پێماندا بێتەوەو لەم مەینەتە ڕزگارمان بکا.

ئـەمجار تـەوجیهی کوڕەکـانی دەکـاو فـەرمانیان پـێ دەکـا کەبـە سـۆراغی کوڕەکانیەوە بچنەوە بۆ میصرو دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي اذْهَبُـوا فَتَحَسَّـسُوا مِـنْ يُوسُـفَ وَأَخِيــهِ﴾ ئـەی کـوڕە خۆشەویـستەکانم! بـچنەوە بـۆ وڵاتـی میـصرو لەگـەڵ بـرا گەورەکەتان یەکدی بگرنەوە، بەهێـدیو هێمنـی بـەوردیو کارامایییـەوە لەیوسفـو بونیامینی برای بگەڕێنو هەوڵی دۆزینەوەو رزگـار کردنیـان بـدەن، مـەهێڵن کـەس پێتان بزانێ، بەشێوەیەکی نهێنیو لەسەرەخۆیی سۆراغیان بکـەن ﴿وَلَا تَيْئَـسُوا مِـنْ رَوْحِ اللَّهِ﴾ لەدەرو لێکردنـەوەی خـودا ناهومێـد مـەبن، هەمیـشە گەشبینو دڵ پـڕ هیوا بن، بەتەمای رەحمەتو یارمەتی خودا بن، هیوا بڕاو مەبن ﴿إِنَّهُ لَا يَيْـئَسُ مِـنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ بێگومان شەئنو حاڵ وایە: کەس لەدەرو لێکردنـەوەو بەهانا هاتنی خودا ناهومێد نابێ مەگەر کەسانێك کە لەگرۆهو تاقمی بـێ بڕوایـان بن، جگە لەزیانکارانو سەرپێچیکاران کەسی تر لەرەحمەتی خودا هیوا بڕاو نابێ.

خـاوەن بـاوەڕان هەمیـشە دڵیـان بـەخودای خۆیانـەوە پەیوەسـتە، گیانیـان بـەناونگی رەحمـەتی لەگەشـەو نەشـەدایە، هەسـت دەکـەن بەنەسـیمی پـاش بـارانی رەحمـەتی، هـەرگیز لەدەرولێکردنـەوەی پـەروەردگاریان نائومێـد نـابن، تەنانـەت ئەگەر لەهەموو لایەکەوە غەمو پەژارە دەوریان بداو تەنگانە تەنگیان پێ هەڵچنێ، ئەوان چاوەڕوانی دەرووی رەحمەتنو بتمانەیان بەهاتنی یارمەتی خودا لەرزەی پێ ناکەوێ، لـەو کاتـەدا کـە لـەو پـەڕی تەنگانـەو ناڕەحـەتیدان گەشـبین تـرو دڵ پـڕ هیواو بتمانەیان بەخودا زیاترەو بەرچاو رونن!

**بەشی پانزەهەم لەچیرۆکی یوسف:**

**ناسینەوەی کوڕەکانی یەعقووب بۆ یوسف و داننانیان بەهەڵەی خۆیان!**

﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾

وەکوو زانیمان حەزرەتی یەعقووب فەرمانی بەکوڕەکانی کرد: کە بچنەوە بۆ شاری میصرو هەوڵی دۆزینەوەی یوسفو رزگارکردنی بنیامینی برای بدەن، ئەوانیش لەسەر فەرمانی باوکیان بۆ جاری سێیەم گەڕانەوە بۆ میصر بەمەبەستی سۆراغکردنی یوسفو بونیامینی برای، بەڵام بەدڵێکی پڕ لەهیواو بەشێوەیەکی جیدیو لێبڕانەوە، جا کە بەخزمەت عەزیزی میصر گەیشتنەوە دڵی پێیان سوتاو خۆی پێ ناساندنو وتی: من یوسفمو ئەمە بونیامینی برامە، دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَيْهِ﴾ کە کوڕەکانی یەعقووب بۆ جاری سێیەم چوونەوە بۆ میصرو هەوڵیاندا بچنە لای عەزیزی میصر، جا کە چوونە لای عەزیز ﴿قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ! مَسَّنَا وَأَهْلَنَا الضُّرُّ﴾ وتیان: ئەی خاوەن شکۆ، ئەی عەزیزی میصر! تەنگو چەڵەمەیەکی ئێجگار کاریگەر تووشی خۆمانو خاوو خێزانو بنەماڵەکەمان بووە! قاتو قڕیو گرانی تەنگی پێ هەڵچنیوین، ئازارو بێزاری، بێ نانیو بێ گوزەرانیو برسیایەتی بەتەواوی تینی بۆ هێناوینو شەپرزەی کردوین،

﴿وَجِئْنَا بِبِضَاعَةٍ مُزْجَاةٍ فَأَوْفِ لَنَا الْكَيْلَ﴾ هاتووینەوە بۆ بارەگای بەڕێزتان بەکاڵایەکی بێ نرخو کەم بەها، بە ئەندازەیەکی کەمو ناڕەواجەوە، بازرگان مامەڵەی پێوە ناکەنو لەبازاڕدا رەواجی نیە، بەچاکەو پیاوەتی خۆت وەکوو جارەکانی پێشوو بارەکانمان بۆ داگرەو دانەوێڵەی تەواومان بدەرێ، ﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَا﴾ بەخشندەیی خۆت بنوێنە بەسەرماندا، پارەی ناڕەواجی ئەندازەکەمو کەم نرخمان لەباتی دانەوێڵە لێ وەربگرە، چاوپۆشی لەماڵی کەمو خراپمان بکە! یان بەخشندەیی خۆت بنوێنە بەسەرمانداو چاوپۆشی بکە لەتاوانمانو براکەمان بۆ بەربدە!

﴿إِنَّ اللَّهَ يَجْزِي الْمُتَصَدِّقِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار پاداشی چاکەکاران دەداتەوە بەباشترین پاداش، چی دەبەخشن بۆیان پڕ دەکاتەوە، پاداشیان دوچەندانەو چەند چەندانە دەداتەوە، پاداشی ئەوانە بەفیڕۆ نادا کە دەستی

داماوان دەگرن، بەهاناى لێقەماوانەوە دەچن، لەتاوانى تاوانباران چاوپۆشى دەكەن، بەزەييان بەدڵ بيماراندا دێتەوە،

ئيتر كە حەزرەتى يوسف گوێى لەم سكالاَّيانەيان بوو، زانى حاڵو وەزعيان گەييشتۆتە ئەم ئاستە تەنگو چەلەمەيەو بەم جۆرە تينيان بۆ هاتووە، نەيتوانى چى تر لەبەرامبەرياندا خۆ بەعەزيزى ميصر بزانىٚو دەورى پاشايەتييان لەگەڵدا بەكار بێنىٚ، چى تر نەيتوانى كەسايەتى خۆييان لىٚ بشارێتەوە، خۆيان لىٚ ئاشكرا نەكا! بۆى دەركەوت وانەكان تەواو بوونو تاقيكردنەوەكان بەئاكام گەييشتوون، ئێستا كاتى موفاجەئەيەو وەختى ئەوە هاتووە خۆيان پىٚ بناسێنىو هەواڵێكى چاوەڕوان نەكراوو بەخەياڵدا نەهاتوويان پىٚ بدا!!

سۆزى برايانەى جوڵاو چاوپۆشى لەخراپەى رابورديان بوو بەبڕيارێكو لەدەروونى يوسفدا بنجى بەستو كەوتە ئاخاوتن لەگەڵياندا‌و دەستى كرد بەخۆئاشكرا كردن لێيانو بەشێوەيەكى نەرمو نيانو هونەرمەندانە ﴿قَالَ هَلْ عَلِمْتُمْ مَا فَعَلْتُمْ بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنْتُمْ جَاهِلُونَ ؟﴾ وتى: ئايا دەزانن كاتى خۆى چ كارێكى نامەردانەتان بەرامبەر يوسفو بونيامينى براى كرد؟ لەيادتانە چۆن فڕێتان دايە بيرەكەوەو ويستتان لەناوى بەرن، لەبونيامينى براتان جيا كردەوە، براتان لەبرا دوور خستەوە؟؟ چەند بەتوندو تيژى هەڵسو كەوتتان لەگەڵ يوسفو بونيامينى برايدا كرد، ئەوتان خستە بيرەوە، بەشێوەيەكى توندو رەقيش هەڵسو كەوتتان لەگەڵ بونياميندا ئەنجامدا؟ ئێوە ئەو كارە ناشيرينانەتان ئەنجام دان كاتێك نەتاندەزانى چەند كردەوەكەتان ناشيرينە!! نەزيەتدانى باوكو دايك، پچڕاندنى خۆشەويست لەخۆشەويست!! ئاى كە كارێكى ناشيرينتان ئەنجام دا!! وەى كە دڵڕەقو بىٚ ويژدان بوون!! چۆنتان پركێشى ئەو كارە كردو چۆنتان ئەنجامدا؟!

براكانى حەزرەتى يوسفو ئەم دەنگە گلەيى ئامێزە پرسۆزەيان بەرگوێچكە كەوتو بيرێكيان لەنيشانەى سيماى يوسفى برايان كردەوەو سەرنجيان داو،

روخساری یوسفی رابوردوو عەزیزی میصری ئێستایان پێك گرتو بۆیان دەرکەوت کە ئەم وەزیرە خاوەن شکۆیە یوسفەو هەستو شعوریان یوسفی منداڵی خراوە ناو بیریان لەجەستەی ئەو پیاوە گەورە بەدەسەڵاتە خاوەن شکۆیەدا ناسییەوە ﴿قَالُوا أَئِنَّكَ لأَنْتَ يُوسُفُ؟﴾ ئەرێ بەراستی تۆ یوسفی کوڕی یەعقووبی؟!

حەزرەتی یوسفی دڵسۆزو دڵ گەورەو لێبوردو ﴿قَالَ أَنَا يُوسُفُ﴾ فەرمووی: بەڵێ بزانن و دڵنیابن من یوسفم ﴿وَهَذَا أَخِي﴾ ئەم کوڕەش کە لام دانیشتووە بونیامینی برامە، ﴿قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا﴾ بێگومان خودا نیعمەتو فەضلی خۆی بەسەردا باراندوین بەوە کە دوای لێك دابڕان و پەرتەوازە بوون یەکترمان گرتەوە، بووینەوە بەیەك خێزان و یەکتریمان ناسییەوە، پەروەردگار کەرەمو بەخششێکی وای لەگەڵ کردین ناتوانم بەیانی بکەم!

﴿إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ شەئن و حاڵ وایە: هەر کەسێك تەقوای خودا بکاو خۆبپارێزێ لەنافەرمانی پەروەردگارو پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی بێ، بەردەوام بێ لەسەر طاعەتکردن و خۆگربێ لەبەرامبەر بەڵاو موصیبەتی رۆژگاردا، ئەوە بێگومان خودا بەسیەتی و بەهانایەوە دێ و لەهەموو ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەیەك دەیپارێزێ و هەرگیز خودا پاداشی چاکەکاران فەرامۆش ناکا!

ئەمە شایەتیدانی پەروەردگارە بەوە: کە یوسف تەقواکارو خۆڕاگرو چاکەکار بووە!!

بەراستی ئەمە هەواڵێکی لەنکاوو چاوەڕوان نەکراوو موفاجەئەیەکی عەجایەیب بوو حەزرەتی یوسف رایگەیاندو بەکورتی و لەسەرەخۆ فلیمی هەڵوێستو کرداری براکانی بەرامبەر خۆی و بونیامینی برای رانواندو بەبێ ئەوەی هەڕەشەیان لێ بکاو بڕیاری تۆڵەساندنەومیان بەرامبەر بدا، سوپاسی خودا دەکا کە

کۆی کردونــەوەو بەیــەکی شــاد کردونــەوە، باییــسی ئــەم نیعمەتــە بەپاداشــی تــەقواکاری‌و خــۆڕاگری دەهێنێتــەوە! بــەڵام براکــانی شــێوەی کــردارو هەڵوێــستی رابوردوویان کە بەرامبەر یوسف ئەنجامیان داو نواندیان لەبەرچاویان (تەمەثوول) دەکاو ئارەقی شەرمەزاری‌و خەجاڵەتی دەردەدەن‌و خۆیان دەبینن لەبەرامبەر چاکە کارێکدا دانیشتوون: کە ئەوان خەراپەیان لەگەڵ کــردوە، ئاخــاوتن لەگــەڵ پیــاوێکی دڵ گەورەو خــاوەن کــەرەم‌و حــیلمدا دەکــەن کــە ئــەوان بەرامبــەر بەئەو ئەوپــەڕی کاری نامەردییان ئەنجام دا، بەناحــەق خــستیانە بــیرەوە، لــەباوکیان دابــڕی، لــەبرای پچوکیان دوور خستەوە،

بۆیە هیچکەیان پێ نەکرا جگە لەعوزر هێنانەوەو ئیعلانی پەشیمانی ﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِنْ كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾ وتیــان: ســوێندمان بــەخودا پــەروەردگار تــۆی بەســەر ئێمــەدا بــەرز کــردەوە: زانیــاری‌و حــیلم‌و رەوشــتی جــوان‌و دەســەڵات‌و فەرمانڕەوایی‌و پێغەمبەرایەتی پێ بەخــشی، دان بەهەڵــەی خۆمــاندا دەنــێین ئێمــە تاوانبارین، ئێمە نەزان‌و بێ ویژدان بووین بەرامبەرت، حەسوودی‌و نەزانی وای لــێ کردین رەفتاری ناڵەبارت دەرحەق بکــەین، ئــەگینا تــۆ پیــاوێکی هەڵکــەوتوو خــاوەن جەماڵ‌و شان‌و شەوکەت‌و بەوەفاو ئەمەك پاك بــووی! ئێمــە هەڵــەمان کــردو لێمــان ببوورە،

حەزرەتی یوسف کە لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا بەصەبرو خۆڕاگر بووە، لــەکاتی خۆشی‌و دەســت رۆیــشتوییشدا خــاوەن صــەبرو خــۆڕاگرە، بۆیــە جوانمــەردی خــۆی راگەیانــدو پیــاوەتی‌و لێبــوردویی خــۆی دووپــات کــردەوەو ﴿قَـالَ لا تَثْرِيـبَ عَلَـيْكُمْ الْيَـوْمَ﴾ فــەرمووی: هــیچ جــۆرە لۆمــەو سەرزەنــشتێکتان لەســەر نیــە، مــن هــیچ رەخنەیەکم لێتان نیەو هیچم لەدڵدا نیــە بەرامبــەر ئیــوە! ﴿يَغْفِـرُ اللَّـهُ لَكُـمْ وَهُـوَ أَرْحَـمُ الـرَّاحِمِينَ﴾ خــودا لێتــان خۆشــبێ‌و لــەتاوان‌و ســتەمکاریتان ببــورێ: خــودا

لەهەموو کەس بەرحم ترو لێبوردوو ترە بۆ کەسانێك تۆبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای و ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن!

ئەمجار مەوجی ناخاوتنەکە بەبارێکی تردا وەردەگێڕیێو هەواڵی باوکی کۆنەساڵی لەبراکانی دەپرسێ، ئەو باوکەی لەتاوی یوسف روناکایی چاوەکانی لەکیس چووە، ئەوانیش لەوەڵامدا راستی روداویان عەرز کردو پێیان گوت: کە بەهۆی زۆر گریانەوە چاوەکانی لەدەست داوە!

پاشان دەفەرموێ: کە مەسەلەکان هەموویان روون بوونەوە ئیتر پێویست بەوە ناکا بارەکانتان بۆ بار بکەین‌و خواردەمەنی ببەنەوە بۆ کەنعان‌و (بونیامین)یش بنێرمەوە ﴿اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَذَا فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيراً﴾ ئەم کراسەم ببەنەوە بۆ خزمەت باوکم با بەسەر دەمو چاوی خۆیدا بهێنێ، چاوەکانی چاك دەبنەوە، دڵنیا دەبێ لەساغو سەلامەتی منو دڵی خۆشی تێدەکەوێو جەستەی گەشەی تێ دەکەوێتەوە، ﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ هەمووتان بەخاوو خێزانەوە کەنعان جێ بێڵن‌و باربکەن بۆ ئێرە، وەرن بۆ شاری میصر بۆ لای خۆم.

هەڵبەتە ئەمە موعجیزەی حەزرەتی یوسف بوو! پەروەردگار بەنیگا پێی راگەیاند: کە بەو شێوە چاوەکانی حەزرەتی یەعقووب چاك دەبنەوە.

راڤەکەرانی قورئان لەبارەی چۆنیەتی ئەم کراسەوە زۆر راوو بۆچونیان دەربڕیوە، هەندێکیان دەچنە چوارچێوەی هەواڵی ئیسرائیلیاتەوەو پشتیان پێ نابەسترێ، ئەوەی: کە وەگێرمان دەکەوێو بەباشی دەزانین لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەو ریوایەتەیە کە ئیمامی قوشەیری ریوایەتێکی لەئەنەسەوە بەمەرفووعی گێڕاوەتەوە: دەفەرموێ: ئەو کراسە کراسی حەزرەتی ئیبراهیم بووەو لەئاوریشمی بەهەشت بووە، کاتێ ئیبراهیم خرایە نێو ئاگرەکەوە پەروەردگار بەخەڵات بۆی ناردو لەبەری کرد، دوایی حەزرەتی ئیسحاق لەبەری کردوە، ئەمجار ئەویش لەبەر

یەعقووبی کرد دوای حەزرەتی یەعقووب بۆ دەفعی چاوەزار کردیە ملی حەزرەتی یوسف، جاکاتێ حەزرەتی یوسف، براکانی دەناردنەوە حەزرەتی جوبرائیل فەرمانی پێکرد کە ئەو کراسە بنێرێتەوە بۆ باوکی؛ چونکە بۆنی بەهەشتی لێ دەهات، بۆنی بەهەشتیش بەسەر هەر نەخۆش و دەردەدارێکدا رابرێ چاك دەبێتەوە، واتە بەنیگا خودا ئەمەی بەیوسف راگەیاند!!

هەندێك دەڵێن: کراسەکە هەر هی خودی یوسف بووە کە لەبەر خۆی دایکەندوە، دوایی کە بەسەر دەم و چاوی باوکیدا هاتووە دڵی پێی گەشاوەتەوەو خۆشی و کامەرانیەکی زۆر چووەتە دڵی یەعقووبەوە، کەیفخۆشی ئاواش گیان بەهێز دەکاو زەبوونی لەهێزی هەستەکان لادەباو چاوو دڵ روون دەبنەوەو ئەوپەردە تاریکییەی بەسەریاندا هاتووە لادەچێ و روناکی و بیناییان تێدەگەرێتەوە، زانستی پزیشکی ئێستا پشگیری ئەم جۆرە دیاردانە دەکا!!

**تێبینی :**

ئەو لێبوردنەی حەزرەتی یوسف: کە لەبراکانی خۆش بوو فەرمووی ﴿لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ ...الآية﴾ نموونەیەکی هەرە بەرزە لەسەماحەت و چاوپۆشیدا؛ عەفوو کردنێکە لەناخی دڵەوە هەڵقوڵاو بێ گلەیی و سەرزەنشت کردن، لێبوردنە لەکاتی هێزو تواناد، سەرباری چاوپۆشی و لێخۆشبوون دوعاو نزاشی بۆ کردن کە خودا لێیان خۆشبێ و لەتاوانیان ببورێ،

بێگومان پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەکاتی رزگار کردنی مەککەدا هەمان هەڵوێستی حەزرەتی یوسفی نواندو لێبوردنی خۆی لەقورەیشییەکان راگەیاند:

ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباس و بەیهەقی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە:کە پێغەمبەر ﷺ رۆژی رزگار کردنی مەککە دەستی بەلاشیبانی دەرگای کەعبە گرت (لەو کاتەدا دانیشتوان هەریەکەیان چوبوە ماڵی خۆی و خۆیان

لەترسان حەشار دابوو) فەرمووی: (الحمد لله الذي صدق وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده، ثم قال: ماذا تظنون يا معشر قريش؟ قالوا: خيراً، أخ كريم، وابن كريم، وقد قدرت، قال: وأنا أقول: كما قال اخي يوسف: ﴿لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ﴾.

ئیتر دانیشتوانی مەککە هەموویان لەماڵ هاتنە دەر دەتگوت لەگۆڕ رادەبن بۆ حەشر!

## بەشی شانزەهەم لەچیرۆکی یوسف:

### هەواڵدانی یەعقووب بەبۆنکردنی یوسف و پشتگیری کردنی ئەم بۆنکردنە بەهۆی کابرای موژدە دەرەوە!

﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّى لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ ۖ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ۖ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا

خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ ﴾

وەکوو زانیمان خۆشیو کامەرانی کەوتە ناو دڵو دەروونی کوڕەکانی یەعقووبەوە لەمیصر بەهۆی یەکتر ناسینەوەو بەیەك گەیشتنەوە ئەم کامەرانیو خۆشییە گوێزرایەوە بۆ وڵاتی کەنعان بەهۆی گەڕانەوەی کاروانەکە بەو موژدە خۆشە! پەروەردگار موعجیزەی لەسەر دەستی یەعقووب دەرخست؛ بەوە کە لەدوورەوە بۆنی یوسفی کرد، پەروەردگار پشتگیری ئەو بۆنکردنەی کرد بەموژدەدانی کوڕە گەورەکەی کە لەمیصر مابووەوەو مانی گرتبوو وتبووی تا باوکم ئیزنم نەدا ناگەڕێمەوە! هاتەوەو کراسی یوسفی بەسەر دەمو چاوی باوکیدا هێناو چاوی چاکبوونەوە!،

دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا فَصَلَتْ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلا أَنْ تُفَنِّدُونِ﴾ هەر لەگەڵ کاروانی کوڕەکانی یەعقووب لەسنووری شاری میصر دەرچوون بەرەو ئاخی کەنعان گەڕانەوە، حەزرەتی یەعقووب هەواڵێکی سەرسوڕهێنەری راگەیاند! هەواڵێك بەخەیاڵی کەسدا نەدەهات؛! هەواڵێك پەیوەندی بەحەزرەتی یوسفەوە هەیە، حەزرەتی یەعقووب؛ پیری کفتەکارو کوێرو بێ روناکایی بەڵام دڵ پڕ لەنووری ئیمان، بەنەوەو خزمو کەسو کارەکانی دەوروبەری فەرموو: ئەمن بۆنی یوسف دەکەم ئەگەر پێم نەڵێن: خەرەفاوەو عەقڵی تێك چووە؟! بەشێتم مەزانن ئەمن ئێستا بۆنی یوسفو کراسەکەی دەکەم!

سەیرە لەو کۆڕو مەجلیسەدا هەموو شتێك بەخەیاڵدا دێ جگە لەمەوزوعی یوسف، کەس بەخەیاڵیدا نەدەهات دوای ئەو هەموو ماوە دورو درێژە یوسف

لەژیاندا مابێ! کەس بڕوای نەدەکرد یوسف بۆنی هەبێو ئەم پیرە کۆنە ساڵە کوێرە کەفتەکارە بۆنی بکا!!

ئیبنو عەبباس ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: کە کاروانەکە لەسنووری میصر تێپەڕی بایەکی هەڵکرد بۆنی یوسفی گەیاندە حەزرەتی یەعقووبو فەرمووی: ﴿إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلا أَنْ تُفَنِّدُونِ﴾ هەشت رۆژە رێگا دوور بوو کە بۆنی کرد!

ئیمامی رازی دەفەرموێ: قسەی راست ئەوەیە: پەروەردگار بۆنی یوسفو کراسەکەی بەشێوەیەکی موعجیزە گەیاندە حەزرەتی یەعقووب چونکە بۆنکردن لەو مەسافە دورو درێژەیە شتێکە پێچەوانەی عادەتە، کەوابێ ئەوە موعجیزەی یەعقووب بووە،

﴿قَالُوا تَاللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلالِكَ الْقَدِيمِ﴾ وتیان: سوێندمان بەخودا، تۆ هەر لەگومڕاییە کۆنەکەی خۆت دای، هەر بەتەمای یوسفیو چاوەڕوانی هاتنەوەی ئەوی، تازە یوسفی چیو بۆنی چی؟ تاکەی تۆ لەم هەڵوێستە هەڵەیەی خۆت نایەیە خوارێ؟! تاکەی یوسفت لەیاد ناچێو بڕوی نانێی؟

قەتادە دەڵێ: بەراستی قسەیەکی گەورەو ناخۆشیان بەو پیرەمێردە دڵسوتاوە گوت، نەدەبوو قسەی ئاوا رەقو ناخۆش بەو بابە گەورەیەیان بڵێن، چۆن دەبێ قسەی ئاوا رەق ناڕاستەی پێغەمبەرێکی ئاوا بکرێ!!!

﴿فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيراً﴾ جا کە کاروانەکە گەیيشت مزگێنی دەر: کە کوڕە گەورەی یەعقووبەو یەهوزای ناوە هاتە لای باوکیو کراسی یوسفی بەسەر دەمو چاوی باوکیدا هێنا یەکسەر چاوەکانی لەخۆشیا روناکاییيان تێکەوتەوەو موفاجەئەی چاوەڕوان نەکراو پەیدا بوو، موفاجەئەی کراس! کە نیشانەی مانی حەزرەتی یوسفەو بەم زوانە بەیەکتر شاد دەبنەوە موفاجەئەی

چاکبوونەوەی چاوە کوێر بووەکانی حەزرەتی یەعقووب کە چەند ساڵ بوو سپی هەڵگەڕابوون،

ئیمامی سوودی دەفەرموێ: بۆیە یەهوزا؛ کوڕە گەورەی یەعقووب، کراسەکەی یوسفی جاری دووەم بۆ هێناو مزگێنی گەیاند؛ چونکە هەر ئەو جاری یەکەم کراسە خوێناوییەکەی بۆ باوکی هێنایەوە ویستی ئەو هەواڵە ناخۆشە بەئەم هەواڵە خۆشە داپۆشێ!! ئەو خراپەیە بەم چاکەیە بشواتەوە، تەنانەت ریوایەت کراوە نەك هەر چاوەکانی چاکبوونەوەو بەس، بەڵکوو هێزو توانای ئەندامەکانی تریشی تازە بوونەوە، ئیتر لێرەدا حەزرەتی یەعقووب راستییەك دەدرکێنێ: کە لای ئەو نمایانەو لەدەوروبەرەکەی پەنهانە، لەوەپێش پێی گوتن ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن، ئێستاش هەمان راستی دووبارە کردەوە ﴿قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنْ اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ حەزرەتی یەعقووب بەکوڕو نەوەو کەسو کارەکانی فەرموو: ئەی ئەوە نەبوو کاتی خۆی پێم گوتن لەرەحمەتی خودا نائومێد مەبن، بچنەوە بۆ میصر سۆراغی یوسفو بونیامینی برای بکەنو لەرەحمەتو بەهانا هاتنی خودا نائومێد مەبن، من بەهۆی نیگاو سروشەوە دەربارەی سونەنو دابو نەرێتی خودا شتی وا دەزانم کە ئێوە نایزانن! ئیتر لەو کاتەدا کوڕەکان تێکڕا دەستەو دامانی باوکیان بوونو ﴿قَالُوا: يَا أَبَانَا اسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا إِنَّا كُنَّا خَاطِئِينَ﴾ وتیان: بابە گیان! داوای لێ خۆشبونمان بۆ بکە، ئێمە پەشیمانین لەکردەوەکانمان، بەرامبەر جەنابتو یوسفی برامانو بونیامینی برابچوکمان هەڵەمان کردوەو چاوپۆشیمان لێ بکە، سەد تاوانو یەك تۆبە!

لێرەدا سیاقی قورئان ئاماژە بەشتێك دەکا کە دیارە لەدڵی یەعقووبی دڵسوتاودا پەنگی خواردۆتەوە، دیارە جۆرە گلەییەکی لەکوڕەکانی هەیەو وا دیارە هێشتا دڵی نەچۆتەوە شوێنی خۆیو برینی هەناوی سارێژ نەبوون بۆیە خێرا چاوپۆشی خۆی رانەگەیاند! وەکوو حەزرەتی یوسف خێرا نەیفەرموو ﴿لا تَثْرِيبَ

عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ﴾ بەڵكوو ﴿قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيَ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ فەرمووی: لەوە دوا داوای لێخۆشبوونتان بۆ لەخودای خۆم دەکەم لێی دەپاڕێمەوە کە لێتان خۆشبێ بێگومان پەروەردگاری من لەتاوان خۆش دەبێو بەسۆزو بەزەییە بۆ بەندەکانی،

## بەشی حەڤدەهەم لەچیرۆکی یوسف:

## بەیەکگەیشتنەوەی خێزانی یەعقووب لەشاری میصر

﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی کە حەزرەتی یوسف ﷺ داوای لەبراکانی کرد: کە بچنەوە بۆ وڵاتی کەنعانو بەخاوو خێزانەوە بگوێزنەوە بۆ میصر، لێرەدا ئایەتەکان ئەوەمان

بـۆ رون دەکەنـەوە: کـە بنەماڵـەی یـەعقووب هـەموویان وڵاتـی کـەنعانیان بـەجێ هێـشتو هـاتن بـۆ میـصر، حـەزرەتی یوسـفو کاربەدەسـتانی وڵات پێـشوازییان لـێ کـردنو لەشـاری میـصردا نیـشتەجێ بـوون، خێزانـی پەرتـەوازە بـوو لێـك دابـڕاو یەکدیگیر بوونەوە، خەونی یوسف هاتـە جێو یـانزە براکـەیو بـاوكو دایکـی، یـان پووری، سوجدەی ڕێزیان بۆ برد! ریوایەتکراوە دەڵێن: حـەزرەتی یوسف دوو سـەد وڵاغـی نـارد بـۆ کـەنعان بەمەبەسـتی گواسـتنەوەی بنەماڵـەی حـەزرەتی یـەعقووب دوایـی کـە نزیـك شـاری میـصر بوونـەوە خـۆیو پاشـاو چـوار هـەزار کـەس لەکاربەدەستو پیاو ماقوڵان پێشوازییان لەحەزرەتی یەعقووب کرد،

دەڵێن: ژمـارەی بنەماڵـەی حـەزرەتی یـەعقووب لـەکاتی چونیان بـۆ میـصر حەفتاو دوو کەس بوون بەپیاوو ژنەوە، ئەو کاتـەش کە لەگـەڵ حـەزرەتی موسـادا لەمیصر دەرچوون شەش صەد هەزاروپێنج سەدو حەفتاو ئەوەندە پیاوی شـەڕکەر بوون، جگە لەمنداڵو ئافرەتو پیرو کەفتەکار،

وەکوو ریوایەت کراوە حـەزرەتی یـەعقووب لـەلای حـەزرەتی یوسـف بیـستو چوار ساڵ یان حەڤدە ساڵ مایەوە، دوایی کە کۆچی دوایـی کـرد لەسـەر راسپاردەی خۆی حەزرەتی یوسف بردیـەوە بـۆ وڵاتـی کـەنعانو لـەنزیك ئیـسحاقی باوکییـەوە بەخاکی سپارد!

بەهـەر حـاڵ سـیاقی قورئـان زەمـانو مـەکان دەپێـچێتـەوەو دیمـەنی کۆتـایی چیرۆکەکە نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْـهِ أَبَوَيْـهِ﴾ جا کاتێـك خیزانـی یـەعقووب گەیـشتنە سـنووری میـصرو حـەزرەتی یوسـف بەنزیکبوونەوەیانی زانی پێشوازی لێ کردن، بەفـەرمانی پاشا کاربەدەستو گـەورە پیاوانی میصر هاوبەشی پێشوازییەکەیان کرد، حەزرەتی یەعقووب بەخۆیو خـاوو خێزانیەوە گەیشتنە میصر حـەزرەتی یوسـف دەسـتی لـەملی بـاوکیو دایکـی کـردو ماچو مۆچ ئەنجام دراو ئەمجار فەرمانی بەهەموو خێزانەکە کردو ﴿وَقَـالَ ادْخُلُـوا

مِـصْرَ إِنْ شَــاءَ اللَّــهُ آمِــنِينَ﴾ فـەرمووی: هـەمووتان بـچنە نـاو شـاری میـصرەوە بەپشتیوانی خودا ئەمین دەبن لەگیانو ماڵی خۆتانو هیچ ترسو بیمێکتان لەسـەر نیە،

﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ﴾ باوكو دایكی بردنە لای خۆیـەوەو لەسـەر كورسـی فەرمانڕەوایی لەپەناخۆیەوە دای نیشاندن بۆ ڕێز گرتنو گرنگی پێدان ﴿وَخَرُّوا لَهُ سُجَّداً﴾ باوكو دایكو هەر یازدە براكانی لەئاست یوسفدا سەری خۆیـان دانەوانـد، چونكە دابو نەریتی ئەو ڕۆژگارە وا بوو بەو جۆرە سەردانەواندنە نیمچە شـوژدە بردنە ڕێزیان لەپاشاو گەورە پیاوان دەگرت،

تێبینـی ئـەوە دەكرێ: لەئایەتەكـەدا بـۆ مەبەسـتی تایبـەتیو بـەلاغی پـاشو پێش كراوە، ئەوەتا ڕستەی ﴿إِنْ شَاءَ اللَّهُ﴾ پێش ﴿آمِنِينَ﴾ خراوە، چونكە مـەبەست ئەوەیــە: چــوونە ژوورەوەكــە لەهــەموو كاتەكانیــدا بەســەلامەتو دڵنیــاییو سەركەوتوانە بێ،

ڕستەی ﴿وَرَفَـعَ أَبَوَيْـهِ عَلَـى الْعَـرْشِ﴾ پـێش ﴿وَخَـرُّوا لَـهُ سُـجَّداً﴾ خـراوە تـا ئاماژەبێ بۆ ئەوە: كە یوسف ڕێـزی لـەباوكو دایكـی گـرتو گرنگـی پێدان، ئـەگینا ئـەوان پـێش ئـەوەی سـەربكەونە سەركورسـی پاشـایانەو لـەلای یوسـف دابنیـشن سوژدەكەیان بردوە، ئەوەشمان لەیاد نەچێ سوژدە بـۆ خـۆی عیبـادەت نیـە، كاتێـك دەبێتە عیبادەت كە نییەتی تایبەتیو صیفەتە شەرعییەكەی تێدا بێ،

جا كە حەزرەتی یوسف سوژدە بردنەكەی باوكو دایكو براكانی بینـی، یـادی ئەو كاتەی كردەوە كە بەمنداڵی لەخەونەكەیدا بینی مانگو خۆرو یانزە ئەستێرە سوژدەیان بۆ برد! ڕووی كردە باوكی ﴿وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ﴾ وتـی: ئەی باوكی خۆشەویستم! ئەمە ئاكامو مانـای خەونەكـەی سـەردەمی منداڵیمـە كە

بۆم گێڕایەوەو وتم: بابـە: ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَـرَ رَأَيْـتُهُمْ لِـي سَاجِدِينَ﴾ ئەتۆش وتت: ئەم خەونەت بۆ کەسی مەگێڕەوە با کەس بەمە نەزانێ،

﴿قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّاً﴾ بێگومان خودا خەونەکەمی بەراست گێراو هێنایە دی،

﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنْ السِّجْنِ﴾ بێگومان پەروەردگار چاکەی لەگەڵ کردم، بەشێك نیعمەتو فەضلی خۆی بەسەردا رشتم: کە لەبەندینخانـە رزگاری کــردم، فـــەرمانڕەوایی‌و دەســـەڵاتی پــێ بەخـــشیوم کردومـــی بەکاربەدەســـتی قسەرۆیشتوو ﴿وَجَاءَ بِكُمْ مِنْ الْبَدْوِ مِـنْ بَعْـدِ أَنْ نَـزَغَ الـشَّيْطَانُ بَيْنِـي وَبَـيْنَ إِخْـوَتِي﴾ ئێوەی لەلادێوە هێنایە نـاو شـارو لـەژیانی لادێ نـشینی‌و کولەمـەرگی‌و ئاژەڵـداری‌و وەرزێـری رزگـاری کـردن، هـەموو ئـەم نیعمەتانـەم بەسـەردا رژاون، پـاش ئـەوەی شەیتان نێوان من‌و براکانمی تێك داو، سۆزی برایـەتی‌و خۆشەویـستی لـەنێوانمانـدا نەهێشت‌و حەسوودی‌و دژایەتی خستە ناومانەوە،

﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ﴾ بێگومان خودای من زاناو ئاگادارە بەوردو درشـتی هەموو کاروبارێك، بەلوطف‌و مەرحەمەتە بەرامبەر بەندەکانی، هەر کـاتێ ویـستی شـتێ بکـاو کارێـك ئـەنجام بـدا، هۆکارەکـانی بـۆ دەرەخـسێنێ‌و وەکـوو پێویـست دەیهێنێتـە دی! بەخـەیاڵی کێـدا دەهـات بەشـوێن خـستنە نـاوبیردا بەندایـەتی‌و بەشوێن کۆیلایەتیدا فیتنەی عیشق‌و دڵداری‌و لەسەر مل نەدانی بۆ داخوازییەکانی زولـەیخا بخرێتـە کـونجی بەندینخانـەوەو لـەوێوە بـۆ سـەر کورسـی دەسـەڵات‌و فەرمانڕەوایی!!

﴿إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ بێگومـان خـودا زانایـە بەبەرژەوەنـدی بەنـدەکانی سەرەتاو ئاکامی هیچ شتێکی لێ هون نیە، داناو حەکیمـە هەرچی دەیکا لەشـوێنی خۆیدایـەو بـۆ بەرژەونـدی بەندەکانیـەتی پاداشـی چـاکەکاران بەچـاکە دەداتـەوە، سەرەنجام بۆ خوداپەرستانە هەر ئەوان سەرفرازو سەرکەوتوو دەبن!!

ڕاڤەکەرانی قورئان کۆکن لەسەر ئەوە: کە سوژدە بردنی خێزانی حەزرەتی یەعقووب سوژدەی سڵاوو ڕێزگرتن بووە، سوژدەی تەقدیسو عیبادەت نەبوە، سەریان دانەواندوە نەك بیخەنە سەر زەوی، لەشەریعەتی ئەواندا سەردانەواندن دروست بووە، بەڵام لەشەریعەتی ئیسلامدا نەسخ بۆتەوە،

جا هەرچەندە سەردانەواندن لەسەلامکردندا لەئایینی ئیسلامدا سڕاوەتەوەو هەڵگیراوە، کەچی بەداخەوە هەندێ لەموسوڵمانانان ئاگاداری ئەوە نین‌و لەکاتی سەلامکردندا خۆیان دەچۆمێننەوەو لاسایی ڕۆژ ئاواییەکان دەکەنەوە!

ئیبنو عەبدولبەر لە(التمهید)دا لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەت دەکا: دەفەرموێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێمە کە بەیەکگەییشتین بەمەبەستی ڕێز لێك گرتن سەردانەوێنین؟ فەرمووی: نەخەیر! وتمان: قوربان! ئایا دەست لەملی یەکتری بکەین؟ فەرمووی: نەخەیر! وتمان: ئایا دەست بخەینە ناو دەستی یەکترەوە؟ فەرمووی: بەڵێ،

بەڵام هەڵسان لەبەر کەسێك کە دێ بۆ لای کۆمەڵێك ئەوە دروستە، چونکە فەرموودەیەکی صەحیح هەیە ئەبو داوود لەئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتی کردوە: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەتاقمی ئەوس کرد فەرمووی: (قوموا الى سيدكم وخيركم) هەستن بۆ ڕێزگرتنی گەورەکەتان‌و پیاوماقوڵەکەتان،

بەکورتی هەڵسان بۆ ڕێزنان لەمیوان بەمەرجێ پێی لەخۆبایی نەبێ، ئەگەر لەبەر هەڵسان وای لەکابرا دەکرد لەخۆی بایی بێ‌و خۆی بەشیاوو موستەحەق زانی بۆلەبەر هەڵسان ئەوە دروست نیە چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (من سره أن يتمثل له الناس قياماً فليتبوأ معقده من النار) کەسێك پێی خۆشبێ خەڵك لەبەری هەڵسن، با جێگای خۆی لەناو ئاگردا ئامادە بکا.

دروسته ئاماژه کردن بەدەست بۆ سەلامکردن بۆ دوور نەك بۆ نزیك، ئەگەر سەلامیشی کرد سەر نەوی نەکاو پشتی خۆی نەچەمێنێتەوە، چونکە خۆکۆمکرنەوە بەمەبەستی تەواضوعو ڕێزگرتن لەبەرامبەر بۆ خودا نەبێ بۆ کەسی تر ئەنجام نادرێ، دەست ماچکردنیش باش نیە بەکرداری ناشیرین دەژمێردرێو دەڵێن: (انه من فعل الأعاجم!).

وەلێ دەگوترێ دروسته ئینسان دەستی باوكو دایكی خۆی ماچ بکا، دەستی مامۆستاو پیاوچاکان ماچ بکا،

## بەشی هەژدەهەم لەچیرۆکی یوسف :

## پاڕانەوەیەکی گشتی

﴿ ۞ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾

دوای ئەوەی حەزرەتی یوسف سوپاسو ستایشی پەروەردگاری کرد بەباوكو دایكی خۆی شادمانی کردەوە، لەگەڵ خێزانو کەسو کارەکانیدا یەکتریان گرتەوە، لەزوور هەموو نیعمەتەکانیشەوە نیعمەتی پێغەمبەرایەتیو فەرمانڕەواییە: کە خودا پێی بەخشیوە، ئەمجار لێرەدا ئەم دوعایە دەکاو داوا لەپەروەردگاری خۆی دەکا وەکوو چۆن لەجیهاندا نیعمەتی جۆراو جۆری بەسەردا ڕشتووە، لەقیامەتیشدا بیخاتە ژێر فەضلو کەرەمی خۆیەوەو نیعمەتی بەسەردا برێژێو بەموسوڵمانی بیکوژێو بیخاتە ریزی صاڵحانەوە، دەفەرموێ: ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنْ

ـمنْتِ﴾ پەروەردگارا! فەرمانڕەوایی‌و دەست ڕۆیشتووی بێ بەرهەڵستت پێ دام، کەس نیە دەست بەردەستم بێنێ، کەس نیە بەرێزەوە سەیرم نەکا، هەرچی گەنج‌و خەزێنەی وڵاتی میصر هەیە هەمووی کەوتە ژێر دەستم، پلەو پایەی بەرزم دەست کەوت، شان‌و شکۆمەندێ تەواوم پێ درا لەهیچم کەم نیە، ئەمانە نازو نیعمەتی دونیایین،

﴿وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ﴾ فێری تەعبیری خەون‌و ئاکامەکانی خەونت کردم: ئەمەشیان نیعمەتی عیلم‌و زانستە، خودایە نیعمەتەکانت دەژمێرم یەکە یەکە، باسیان دەکەم بەدڵ شوکرو سوپاست دەکەم!

﴿فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوی! کە بەقودرەتی خۆت دروستت کردون‌و کارو باریان بەدەست خۆتە، دەسەڵات‌و توانات بەسەریان‌داو بەسەر دانیشتوەکانی‌دا هەیە، ﴿أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ هەر تۆ یارمەتدەرو پشتیوان‌و چاودێرو خاوەنمی، هەموو شتێکم بەدەست تۆیەو تۆ خاوەنمی لەدونیاو قیامەت!

خودایە ئەوە نیعمەت‌و ئەوە دەسەڵات‌و تواناتە! خودایە! من ئێستا داوای دەسەڵات‌و لەشساغی‌و ماڵ‌و جاهت لێ ناکەم، خودایە داوای شتێکت لێ دەکەم لەوانە پایەدارترو گرنگترە، خودایە! داوات لێ دەکەم ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ بەموسوڵمانی بمرێنەو بمخەرە پێری صالحانەوە.

ئا بەم جۆرە جاهو دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایی دیمەنیان لای حەزرەتی یوسف دادەپۆشرێن، خۆشی‌و شادی بەیەك گەییشتنەوەو کۆبونەوەی خاوو خێزان‌و خزم‌و کەس‌و کار هیچی لەگۆڕێ نامێنێ، دیمەنی کۆتایی دیمەنی بەندەیەکی ڕوت لەهەموو جاهو جەلالێك، دیمەنی بەندەیەك لەخودای خۆی دەپاڕێتەوەو داوای لێ

دەکا ئاییینی سەلامەت بێو لەسەر ئیسلامەتی بمرێو بگات بەپیاوچاکان کە باوكو باپیرانی پێغەمبەرنی دروودی خودا لەسەر پێغەمبەری ئێمەو ئەوانیش بێ.

ئەمەش سەرکەوتنێکی موطلەقەو دەرچوونە لەتاقیکردنەوەی کۆتایی،، ئیتر پەروەردگار بەپاكو خاوێنی لەدونیا کۆچی پێ کردو لەناو صندوقێکی روخامدا لەولاتی میصر بەخاك سپێردرا، پاش چوار سەد ساڵ حەزرەتی موسا لەوێوە تابوتەکەی گواستەوە بۆ بەیتولمەقدیسو لەوێ لەنزیك باوكو باپیرانیدا نێژرا!.

شایانی باسە کە لەشەریعەتی ئیسلامدا ئاوات خواستنی مردن دروست نیە، لەصەحیحەین دا فەرموودەیەك هەیە ئیمامی ئەحمەد لەئەنەسەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لايتمنين أحدكم الموت لضر نزل به، فان كان لابدَ متمنياً، فيقل: اللهم أحيني ما كانت الحياة خيراً لي، وتوفني اذا كانت الوفاة خيراً لي).

لەئەبو هورەیرەشەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايتمنى أحدكم الموت، ولايدع به من قبل أن يأتيه، انه اذا مات أحدكم انقطع عمله، وانه لايزيد المؤمن عمره الا خيراً).

## بەشی نۆزدەهەم لەچیرۆکی یوسف :

## چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۚ إِنْ هُوَ

إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار سەرگوروشتەی یوسفی گێڕایەوە، ئەمجار دەیەوێ لەرێگەی ئەم چیرۆکەوە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد بچەسپێنێ، لەم رووەوە: کە چیرۆکی حەزرەتی یوسف هەواڵی غەیبە، هەواڵی غەیبیش تەنها خودا دەیزانێ، دەی خۆ موحەممەد ﷺ ئاگاداری ئەم چیرۆکە نەبوە، گەلو هۆزەکەشی هیچیان لێ نەزانیوە، جا کە پێغەمبەر ﷺ ئەو سەرگوروشتەی ئاوا بەرێكو پێکی گێڕایەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە: کە قورئان کەلامی خودایەو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیش حەقو راستە،

ئەمجار رەخنەی لەهەڵوێستی موشریکەکان گرتو باسی ئەوەی کرد: کە زۆر نیشانەو ئایەت هەن تاکو تەنهایی خودا دەگەیەنن وەلێ ئەو موشریکانە ئاوڕی لێ نادەنەوەو پشتی لێ هەڵدەکەن، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە رێبازی بانگەوازی پێغەمبەری ئیسلام بریتییە لەبانگەوازی بۆ یەکتاپەرستیو رەتکردنەوەی هەموو جۆرە شیركو هاوەڵ پەیدا کردنێك،

دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ﴾ ئەوەی باسکرا لەچیرۆکی یوسف، هەر لەو رۆژەوە کە خەونەکەی بینیو دوایی خرایە بیرەکەوە تا ئەو رۆژەی بووە فەرمانڕەوای دەست رۆیشتووی میصر، هەروا هەڵوێستی براکانی بەرامبەری، حاڵو وەزعی باوکی ئەمانە هەموویان هەواڵی پەنامەکینو پێش نازڵبوونی قورئان پێغەمبەرﷺ ئاگاداریان نەبوە، هەروەها گەلو هۆزەکەشی ئاگاداری نەبوون! خیطابەکە بۆ پێغەمبەرە ﷺ ئەم چیرۆکە نیگای خودایە بۆ پێغەمبەر، بۆ ئەوەی زیاتر دڵی دامەزرێ، خۆگر بێ لەبەرامبەر ئەزیەتدانی گەلەکەیو رو وەرگێڕانیان لەبانگەوازییەکەی!

مەبەست ئەوەیە: هەواڵدان لەشتی غەیبی نیشانەی ئەوەیە: کە قورئان موعجیزەیە؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ لەوەپێش لەکتێبانی نەڕوانیوە قوتابی کەس نەبوە، هاوچەرخی یوسفو براکانی نەبوە، دەی هەواڵدانی پێغەمبەر ﷺ بەم چیرۆکە دورو درێژە بەبێ گۆڕانکاریو هەڵە نیشانەی ئیعجازو سەرئاسایی قورئانە،

﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾ ئەی موحەممەد! ئەتۆ لەلای براکانی یوسف نەبووی، ئاگاداری پیلانو نەخشەیان نەبووی، ئەو کاتەی بڕیاریان دا: کە یوسف بخەنە بیرەکەوە، فێڵیان لەیوسفو باوکیشی کرد، بەڵام ئێمە بەنیگا ئەو سەرگوروشتەیەمان فێر کردیو بەسروش بۆمان ناردی،

لەقورئانی پیرۆزدا لەم جۆرە هەواڵە غەیبییانە زۆرن وەکوو لەسەرگوروشتەی خاتو مەریەمدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُون أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ﴾آل‌عمران/٤٤، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ﴾ تا دەگاتە ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا﴾القصص/٤٦، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ ثَاوِياً فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾القصص/٤٥،

بێگومـان دەبوایـە پـاش چەسـپاندنی نیگـاو هـاتنی ئـەم جـۆرە چـیرۆكانەو راگەیاندنی ئەم هەواڵە غەیبییانە كە هەستو شعوور دەهەژێنن، دەبوایـە هـەموو كەس بڕوایان بەم قورئانە بكردایـە، بەتایبـەتی ئـەوان بـۆ خۆیـان بەچاوی خۆیـان پێغەمبەریان دەدی، حاڵو وەزعیان دەزانی، ئایـەتی قورئانیـان لـێ دەبیـست كەچـی بڕوایان پێ نەدەكرد، سەرباری ئایەتەكانی قورئان، نیـشانەی تـری بوونـەوەر هـەن، چەندەها بەڵگەی جۆراو جۆر لەسەر ڕووبەری بوونەوەر بڵاوكراونەوە، بەڵام ئـەوان تێی ناگەن لەماناكانی حاڵی نابن،

لەگەڵ هەبوونی ئەم هەموو هەواڵە نهێنییانـەی قورئـان ئاماژەیـان پـێ دەكا، لەگەڵ هەبوونی ئەم هـەموو بەڵگـەو دەلیلانـەی لەسـەر ڕووبـەری بوونـەوەر لێـرەو لەوێ بڵاو بوونەوە كە هەموویان پەندو ئامۆژگارینو ڕێبازی ڕاستی ژیـانی دونیـاو قیامـەت نیـشانی ئـادەمیزاد دەدەن، كەچـی وێـڕای هـەبوونی ئـەو هـەموو بەڵگـەو نیشانانە زوربەی زۆری ئادەمیزادان ئیمان ناهێنن، وەكوو دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا أَكْثَـرُ النَّــاسِ وَلَــوْ حَرَصْــتَ بِمُــؤْمِنِينَ﴾ زوربــەی زۆری ئــەو ئادەمیزادانــە بــڕوا بەبانگەوازییەكـەت ناكـەنو شـوێن پەیامەكـەت ناكـەون، تەنانـەت ئەگـەر زۆریـش خۆت ماندوبكەی‌و هەوڵو تەقەلا بدەی ئیمـان بهێـنن، بـڕوات پـێ ناكـەن، چـونكە ئەوان سوورن لەسەر كوفرو سەر ڕەقی خۆیان،

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتـە بەئایەتـەكانی پێـشەوە لـەم ڕووەوەیـە: كـە بـەگوێرەی قسەی ئیبنو عەبباس هەندێك لەكافرەكانی قوڕەیش بەشێوەی تەعـەننوت داوایـان لەپێغەمبەر ﷺ كرد ئـەم چیرۆكەیان بـۆ بگێڕێتـەوە پێغەمبـەریش ﷺ پێـی وابـوو ئەگەر بۆیان بگێڕێتەوە لەوانەیە ئیمانی پێ بهێنن، جا كە بۆی خوێندنـەوە ئـەوان هەر سوور بوون لەسەر كوفرو بێدینی خۆیان ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، وەكوو ئەوە بڵێی ئاماژە بێ بۆ ئایـەتی ﴿إِنَّكَ لَا تَهْـدِي مَـنْ أَحْبَبْـتَ وَلَكِـنَّ اللَّـهَ يَهْـدِي مَـن يَشَاءُ﴾القصص/٥٦،

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەو کافرانە هیچ عوزریان نیە لەوەدا کە بڕوا بەپەیامەکەت ناکەن، دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسْأَلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ تۆ ئەی موحەممەد! داوای کرێو موچە لەو کافرە سەررەقانە ناکەی لەسەر بانگهێشتنیان بۆ خوداپەرستی، بەڵکوو لەپێناو ئایینی خوداداو بۆخاتری رەزامەندی خودا ئەو کارە ئەنجام دەدەی، ئەتۆ مەبەستت جێ بەجێ کردنی ئەرکی سەرشانی خۆتەو پاداشت لێیان ناوێ! دەی دەبوایە ئەوانیش بەبێ سێو دوو ئیمانیان بهێنایەو بەپیر بانگەوازییەکەتەوە بهاتنایە!!

﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ﴾ نیە ئەو قورئانەی تۆی پێ نێردراوەو بۆ تۆ بەنیگا هاتووەو پەیڕەوو پرۆگرامی ئایینی ئیسلامە، ئیللا کە هەیە یادخەرەوەو ئامۆژگاریو شارەزاییکەری هەموو عالەمە، ئەگەر پەیڕەوی بکەنو شوێنی بکەون لەدونیاو قیامەتدا سەرفراز دەبن.

ئەم ئایەتە یەکێکە لەو ئایەتانەی کە راستییەتی پەیامی پێغەمبەر دووپات دەکەنەوە.

هۆکاری ئەوە: کە زوربەی خەڵك ئیمان ناهێنن ئەوەیە: کە ئەوانە لەبەڵگەکانی هەبونی خودایەکی بەدیهێنەر بێ ئاگانو تێنافکرنو لەبوونەوەر ورد نابنەوە، بەروداوەکانی رابوردوو پەندئامێز نابن!

دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ چەندان لەنیشانە جۆراو جۆرەکانی ئاسمانەکانو زەوی: کە تاكو تەنهایی خودا دەچەسپێننو نیشانەی کەماڵی زانستو دەسەڵاتی پەروەردگارن، هەر لەئەستێرە گەرۆكو راوەستاوەکانەوە تا دەگاتە کێوو چۆمو دەریاو گژو گیاو دارو درەختو ئاژەڵو مردوو زیندو، هەروا بەروبومو تامو بۆنو بەرامو رەنگو روخساری میوەهات، شیناوەردو ئاوو هەواو هەورو بارانو بەفرو تەرزەو

چەندەهاو ملیونەها شتی تر کە ئەو ئادەمیزادانە بەسەریدا رادەبرنو دێنە بەرچاویانو بەسەریاندا تێپەڕ دەکاو دەیان بینن کەچی لێیان بێ ئاگانو تێیان نافکرنو پەندیان لێ وەرناگرن هەمووشیان گەواهی هەبوونی خودایەکی تاكو تەنیاو خاوەن دەسەلاتی رەها دەدەن،

بەکورتی هەموو شتێکی بوونەوەر نیشانەی تاكو تەنهایی خودایە، ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلاَّ وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾ زوربەی زۆری ئەو خەڵکە وێڕای هەبوونی ئەو هەموو نیشانە جۆێ جوێیانە دان بەوجودی خودادا نانێن مەگەر شەریکی بۆ دادەنێن، دەزانن خودا هەیە بەلام هاوەڵی بۆ بەرەوا دەزانن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾لقمان/٢٥، دان بەوەدا دەنێن کە خودا بەدیهێنەری بوونەوەرە کەچی یەکتاپەرستی ناکەن، هاوەڵی بۆ دادەنێن بتو صەنەم، فریشتەو مانگو خۆر دەپەرستن، هاوار دەکەنە غەیری خودا بۆ لابردنی زیانو هێنانی خێر، هەریەکە بەجۆرێك موشریکە، هەر عیبادەتێك خاڵص بۆ خودا نەبوو بەشیرك دەژمێردرێ، عیبادەتەکەی پوچەڵەو نیی وەرناگیرێ!

ئیمامی موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودا دەفەرموێ: من لەهاوەڵ بێ ئاتاجم کەس هێندەی من بێ ئاتاج نیە لەشەریك، جا کەسێك کارێکی کرد بۆ منو شتی تریشی کردە شەریکم، بەخۆیو ئەو کەسەی کردویەتی بەهاوەڵم دەستیان لێ بەردەدەم!

ئیمام ئەحمەد لەئەبوسەعیدی کوڕی فوضالەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (کە رۆژی قیامەت پەروەردگار هەموو ئادەمیزادانی کۆکردەوە، بانگکەرێك بانگ دەکا دەڵێ: کەسێك لەکردەوەیەکدا کە بۆ خودای ئەنجام داوە کەسێکی تری کردبێتە هاوبەشی خودا، باداوای پاداش

لەغەیری خودا بکا، چونکە خودا لەهەموو کەس بێ ئاتاج ترە لەهاوەڵو هیچ پێویستی بەشەریك نیە)

ئیمامی ئەحمەد لەمەحموودی کوڕی لەبیدەوە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە من بۆ ئێوە لێی دەترسم شیرکی بچووکە، هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! شیرکی ئەصغەر چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ریبایە، رۆژی قیامەت کە خەڵك پاداشی وەرگرتەوە، پەروەردگار بەریبابازان دەفەرموێ: بچن بۆ لای ئەوانەی لەدونیادا ریبابازیتان بۆ دەکردن بزانن ئاخۆ پاداشیان هەیە بتاندەنێ.

ئیمام ئەحمەد لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ریوایەت دەکا: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئادەمیزادینە! خۆتان لەو شیرکە کە ریبایە بپارێزن، چونکە لەخشەی مێروله نهێنی ترە، پاشان فێری کردن چۆن خۆیان لەو شیرکی بچووك نهێنییە دەپارێزن، فەرمووی: بڵێن: (اللهم انا نعوذبك من أن نشرك بك شيئا نعلمه، ونستغفرك لما لانعلمه).

ئەمانە شیرکی نهێنینو پێویستە زۆر بەوریایی خۆمانی لێ بپارێزین بۆ ئەوەی ئیمانەکەمان پاڵفتەو رێكو پێك بێ.

شیرکی ئاشکراو عەیانیش هەیە: کە بریتییە لەگەردنکەچ کردن بۆ غەیری خودا لەکارو بارێکی ژیاندا، وەکوو گەردنکەچکردن بۆ یاساو قانوونێك کە هی خودا نەبێ، گەردنکەچکردن بۆ دابو نەرێتێك کە لەگەڵ شەریعەتی خودادا یەك نەگرێتەوە، بۆ نموونە پابەند بوون بەبەرگو پۆشاکێکەوە کە لەگەڵ یاسای پۆشاکی ئیسلامیدا ناگونجێ، بەم جۆرە عەورەت دانەپۆشێ، یان جۆنیەتی عەورەت بەدەربخا، ئەمانە شیرکی ئاشکرانو پێویستە موسوڵمانان زۆر وریایانە هەوڵی قەلاچۆکردنو خۆپاراستنو تێگەیاندنی لەخەڵکانی تر بدەن!

روتی ئافرەت ئەمڕۆ بەو شێوە فراوانە کە دەبینرێ‌و بانگەشە بۆ کردنی
ەلایەن نۆکەرانی جولەکەو ماسۆنیەوە، شیرکێکی ئاشکراو عەیانە، پیلانێکی
ەڕێـژراوی کـوفری جیهانییـە دژی موسـوڵمانان، چـەکێکی کوشـندەیە بەدەسـت
ـگێرکەران‌و چڵکاوخۆرانی کوفری عالەمییـەوە بـۆ روخانـدنی رەوشتی ئیسلامی‌و
ڕیشەکێشکردنی داب‌و نەرێتی باوک‌و باپیرانی خوداپەرستمان!

مام حاجی بۆ خۆی کەشیدەی پشتی باوەشێك دەبیێ‌و حاجی ژنی خێزانی
ەپۆشراوو عابا بەسەر کەچی کچەکەیان نیوەی جەستەی بەدەرەوەیە!

مامۆستاو شێخ‌و خەلیفەو سۆفییەکانمان بۆ خۆیان کونجی مزگەوت دەگرن‌و
ڕیش بەشانەکراوو تەسبیح بەدەست‌و سیواك لەدەم رادراو دەم بەویردو سەلاوات
کەچی کچەکانیان نەوەکانیان قول‌و قاچ رووت‌و سەرو مل قوت‌و بەرەڵلا! لەهەموو
ـتێك دەچن جگە لەبەچکەی موسوڵمان نەبێ،

هەڵبەتـە ئـەو مامۆسـتاو شـێخ‌و خەلیفـەو سـۆفییانە نوێـژ دەکـەن بـەڵام
نوێژەکەیان لەفەحشاو مونکەر نایانگێڕێتەوە، بۆخۆیان موسوڵمانی ساغ نـین بۆیـە
خـاوو خێزانیـان لـەهی موسـوڵمانان ناچـن، بـۆ خۆیـان بـەدەم موسـوڵمانن بـەڵام
کردەوەکانیان بەدرۆیان دەخەنەوە، بۆخۆیان هەر چەند بەرواڵەت موسوڵمانن وەلێ
ەراستیدا پشتیان لەئایین هەڵکردوە، پابەنـدی فەرمان‌و جڵەوگیرییـەکانی خـودا
نین!!

دەی ئەوانە بەتەما چین؟ چاوڕوانی چ دەکەن؟

﴿أَفَأَمِنُوا أَنْ تَأْتِيَهُمْ غَاشِيَةٌ مِنْ عَذَابِ اللَّهِ﴾ ئایا ئـەو موشـریکانە ئـەو بـەناو
موسوڵمان‌و بـەکردەوە کافرانـە دڵنیـان لـەوەی: کـە خـودا عـەزابێکی ئیقلیم گیرو
ـاگرندەیان بۆ بێنێ، هەموانیان بگرێتەوەو تێکیانـەوە بپێچێ!؟ ﴿أَوْ تَـأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ

بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ یان له‌وه دڵنیان‌و ناترسن که به‌ناگه‌هان قیامه‌ت رابیێ‌و تایه‌خه‌یان نه‌گرێ به‌خۆیان نه‌زانن؟!

بێگومان غه‌یب بۆ ئاده‌میزاد نهێنیی‌و ده‌رگای له‌سه‌ر پێوه‌دراوه، چاو نایبینێ‌و گوێچکه نایبیستێ، کێ ده‌زانێ پاش تاوێکی تر چ ده‌بێ‌و چ ده‌قه‌ومێ؟

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار پاش ئه‌و هه‌ڕه‌شه کردن‌و به‌ڵگه هێنانه‌وانه، مه‌به‌ستی په‌یامی پێغه‌مبه‌ر ﷺ رون ده‌کاته‌وه‌و بتمانه‌ی پێغه‌مبه‌ر به‌په‌یامه‌که‌ی دیاری ده‌کاو ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي﴾ ئه‌ی موحه‌ممه‌د! به‌ئاده‌میزادو جنۆکه بڵێ: ئه‌مه ئه‌و رێگایه‌یه که من بانگه‌وازی بۆ ده‌که‌م، بانگه‌وازی ده‌که‌م بۆ ئه‌وه‌ی شایه‌تی بده‌ن که هیچ خودا نین جگه له‌خودا، ئه‌من به‌و بانگه‌وازییه‌م ﴿أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنْ اتَّبَعَنِي﴾ خه‌ڵك بانگ ده‌که‌م بۆ په‌یڕه‌ویکردنی ئایینی خودا به‌یه‌قین‌و بڕوایه‌کی ته‌واوه‌وه، به‌به‌ڵگه‌و نیشانه‌ی ئاشکراوه، ئه‌من بۆخۆم بانگه‌وازی ده‌که‌م بۆ ئایینی خوداو هه‌موو ئه‌وانه‌ش که شوێنم که‌وتوون‌و بڕوایان به‌په‌یامی من کردوه بانگه‌وازی ده‌که‌ن بۆ ئایینی خودا، ﴿وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئه‌من خودا له‌هه‌موو عه‌یب‌و نه‌نگییه‌ك به‌دوور ده‌گرم به‌پیرۆزی ده‌زانم ته‌قدیسی ده‌که‌م، ئه‌من هه‌رگیز شه‌ریکی بۆ دانانێم هاوه‌ڵ‌و منداڵ‌و خێزانی نیه، وه‌زیرو راوێژكاری نین‌و پێویستی به‌هیچ نیه، هه‌موو که‌س موحتاجی ئه‌وه‌و ئه‌و موحتاجی به‌که‌س نیه وه‌کوو له‌شوێنێکی تردا ده‌فه‌رموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾الأسراء/٤٤،

هه‌موو ئاسمانه‌کان‌و زه‌وی‌و ئه‌وه‌ی تیاندایه هه‌ریه‌که‌و به‌زوبانی خۆی ته‌سبیحاتی خودا ده‌کا، هیچ شتێك نیه ته‌سبیحاتی خودا نه‌کا، به‌ڵام ئێوه ته‌سبیحاته‌که‌یان نابیسن، بێگومان خودا حه‌لیم‌و لێخۆشبووه داوای لێخۆشبوونی لێ بکه‌ن، تۆبه بکه‌ن با لێتان خۆش بێ.

**بەشی بیستەم لەچیرۆکی یوسف:**

## پەند وەرگرتن لەچیرۆکەکانی قورئان

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِيٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓۗ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۗ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾

پاش ئەوەی قورئانی پیرۆز لەئایەتەکانی پێشوودا پێغەمبەرایەتی موحەممەدی ﷺ چەسپاند لەم رووەوە کە هەواڵی غەیبی رادەگەیەنێ، ئەمجار پەروەردگار رەدی ئەوانە دەداتەوە کە برِوایان بەپێغەمبەرایەتی نیە: برێك لەشوبهەی ئەوانەی نینکاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەکەن ئەوەیە:

دەڵێن: ئەگەر خودا بیویستایە پێغەمبەری بناردایە فریشتەی دەنارد وەکوو قورئان لەشوێنێکی تردا لەزمانی کافرەکانەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿لَوْ شَاءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾فصلت/١٤،

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی لەکافرەکانی قوڕەیش‌و هاوێنەکانیان کرد بەناردنی عەزاب بۆ سەریان ئەگەر ئیمان نەهێنن، چونکە سوننەتی خودا دەربارەی بەندەکانی نەگۆڕە، داب‌و نەرێتی وا هاتووە هەر گەڵ‌و نەتەوەیەك ئیمان نەهێنن سزایان دەدا، ئەمجار کۆتایی سورەتەکە بەوە دەهێنێ: کە چیرۆکی یوسف‌و باوکی‌و براکانی پەندو عیبرەتی تێدایە بۆ خاوەن عەقڵ‌و فامان،

دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى﴾ ئەی موحەممەد! ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان جگە لەپیاوان نەناردوە، نەفریشتەمان کردوە بەپێغەمبەرو نەئافرەتیشمان کردوە بەپێغەمبەر! بەڵکوو تەنها پیاومان کردون بەپێغەمبەرو رەوانەمان کردون هەمووشیان لەئەهلی شاربوون دانیشتووی لادێ‌و ساراو دەوارنشین نەبوون! نیگاو سروشمان بۆ ناردوون شەریعەت‌و یاسامان فێر کردون، ئەم ئایەتە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کە پەروەردگار پێغەمبەرانی لەپیاو رەوانە کردوون نەك لەئافرەتان، هیچ کاتێ ئافرەت پێغەمبەرو رەوانە کراو نەبوون، داب‌و نەرێتی خودا واش هاتووە کە ئەو پێغەمبەرانە دانیشتووی شار بن، هەرگیز خودا لەدانیشتوانی لادێ‌و دەوارنشین پێغەمبەری رەوانە نەکردوە، چونکە بەسروشت لادێ‌و دەوار نشین تەبیات ترش‌و دڵڕەق‌و وشکە تەبیعەتن! دانیشتوی شارەکان تەبیعەتیان هێدی‌و پشوو درێژن!

ئەوەتا قورئان لەشوێنێکی تردا دەرحەق بەلادێ‌و دەوار نشینەکان دەفەرموێ: ﴿الأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْراً وَنِفَاقاً﴾التوبة/٩٧،

پێغەمبەرێتی تۆ بەگوێرەی داب‌و نەرێتی خودایەو لەو داب‌و نەرێتە لەو یاساو نیظامە بەدەر نیە، ئێمە پێغەمبەرمان هەر لەرەگەزی پیاوان ناردوە،

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: هەندێك پێیان وایە: سارا خاتون خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم‌و دایکی حەزرەتی موسا، خاتو مەریەمی کچی عیمران دایکی عیسا ئەمانە پێغەمبەر بوون، بەلگەی بەوە هێناوەتەوە: کە فریشتە موژدەی بەسارا خاتون داوە بەوە کە کوڕێکی دەبێ، ناوی ئیسحاق دەبێ، دوا ئەویش یەعقووبی دەبێ، بۆ دایکی موساش بەلگەیان ئەم ئایەتەیە: کە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾القصص/٧، بەنیسبەت خاتو مەریەمەوە ئەوەتا فریشتە هاتووە بۆ لای‌و مزگێنی پێ داوە کە کوڕێکی دەبێ ناوی عیسایە، هەروەها بەم ئایەتەش کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ! إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ، يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾آل‌عمران/٤٢-٤٣،

جا هەرچەندە ئەم خاتوونانە ئەم جۆرە نیگایەیان بۆ کراوە بەلاَم ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوان پێغەمبەر بوبن،[٢]

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توندو تیژ ئاڕاستەی موشریکەکان دەکا لەسەر ئەوە کە پێغەمبەریان بەدرۆ خستەوە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ئەوە بۆ ئەو موشریکە بەدرۆخەرەوانەی کە پەیامی تۆ بەدرۆ دەزانن بەناوزەویدا گەشت‌و گوزار ناکەن! بۆ ئەوەی سەرەنجامی ئەو گەل‌و نەتەوانە ببینن کە پێغەمبەری خۆیان بەدرۆ خستنەوە چییان بەسەر هاتوو خودا چۆن لەناوی بردن، بۆ لەشوێنەواری قەومی نوح‌و هودو صالح‌و لوط وردنابنەوە؟ بزانن ئەوانە بەهۆی کوفرو سەرپێچی پەیامی پێغەمبەرەکانیانەوە چییان بەسەر هاتووە؟ چۆن ریشەکێش کراون‌و لەناو بران! دەبوایە پەندیان

(٢) تەفسیری ئیبن‌و کەثیر ج٢/٤٩٦.

وەربگرتایە بترسانایە لەوەی کە ئەو عەزابەی ئەو گەل‌و نەتەوانەی پێ لەناو برا دێتە سەر ئەوانیش!

پێویستە بزانن: سەرەنجامی کافرەکان لەناوچوون‌و فەوتانە سەرەنجامی خوداپەرستان سەرفرازی‌و رزگار بوونە.

دەی کەوایە هەوڵ بدەن بۆ قیامەت‌و خۆتان بۆ تاقیکردنەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوەی ئەو رۆژە ئامادە بکەن، خۆتان لەکردارو گوفتارو هەڵوێستی خاپوورکەر بپارێزن ﴿وَلَدَارُ الآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ اتَّقَواْ﴾ بێگومان پاداشی قیامەت زۆر باشترە بۆ ئەو کەسانەی لەخودا دەترسن‌و هاوەڵی بۆ دانانێن، خۆشگوزەرانی قیامەت زۆر باشترە لەپاداش‌و بەروبومی ئەم جیهانەی کە موشریکەکان پێغەمبەرانی تێدا بەدرۆ دەخەنەوە، جا وەکوو چۆن لەدونیادا خودا پەرستانمان سەرفراز کردون‌و رزگارمان کردون، هەر بەو جۆرە لەقیامەتیشدا سەرفرازی‌و رزگاربوونمان بۆ دەست نیشان کردووە، بێگومان قیامەت بۆ ئەوان زۆر لەدونیا باشترە، چونکە نیعمەتی دونیا تەمەن کورت‌و رو لەنەمانە، بەڵام نیعمەتی قیامەت تەواوو بەردەوام هەتا هەتاییە!!

﴿أَفَلا تَعْقِلُونَ﴾ ئایا عەقڵتان پێ ناشکێ، عەقڵ‌و هۆشتان نەماوە!؟ بۆ تێنافکرن‌و بیر لەداهاتووی خۆتان ناکەنەوە؟؟ خۆ ئێوە ئەگەر تێفکرین‌و وردبوونەوەتان هەبوایە ئیمانتان دەهێنا!!

ئەمجار پەروەردگار مزگێنی دەدا بەپێغەمبەری خۆی‌و هەواڵی ئەوەی پێ رادەگەیەنێ: (کە یارمەتی خۆی دەنێرێتە سەر پێغەمبەرانی‌و لەکاتی تەنگانەدا فریایان دەکەوێ، لەناسکترین کات‌و لەتەنگ‌و چەڵەمەو ئەزمەدا خودا بەهانای بەندە موخلیصەکانی خۆیەوە دێ! دەفەرموێ: ئێمە لەپێش تۆ جگە لەرەگەزی پیاو کەسی ترمان نەکردوە بەپێغەمبەر)) جا ئەو پێغەمبەرانە هاتوونە سەر گەلەکانیان‌و پەیامی خۆیان پێ گەیاندون‌و بانگەوازییان کردون بۆ یەکتاپەرستی‌و

دڵسۆزی لەعیبادەتکردن بۆ پەروەردگار ئیتر گەلو نەتەوەکانیان بەدرۆیان خستوونەوە، زێدە رەوییان کرد لەکوفرو سەرکەشیو گومراییدا، پێغەمبەرانیش هەڕەشەی هاتنی عەزابی خودایان لێ کردنو بەتەما کۆمەگیو یارمەتی خودا بونو یارمەتییەکە دواکەوت ﴿حَتَّى إِذَا اسْتَيْئَسَ الرُّسُلُ﴾ هەتا کار گەییشتە ئەوە پێغەمبەران نائومێد بوون لەئیمانهێنانی گەلەکانیان، یا لەسەر کەوتن بەسەریاندا؛ چونکە ئەوان بەتەواوی لەکوفرو بێدینیدا رۆچووبوون، ﴿وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا﴾ گەلو نەتەوەکان دڵنیا بوون لەوە؛ کە پێغەمبەرەکانیان درۆیان لەگەڵ کراوە، ئەوەی لەخوداوە وادەیان پێدراوە نایەتەدی، ئالەم ساتو کاتە حەریجانەدا کە پێغەمبەرەکان گەییشتوونە ئەوپەڕی نارەحەتیو تەنگانە، بەرەنگاری کوفرو گومرایی دەکەن، رۆژگار دێنو دەڕۆن پێغەمبەران دەپاڕێنەوەو دوعا دەکەن کەمێك نەبێ وەڵامیان نادرێتەوە، ساڵ تێوەر دەسووڕێنەوەو کوفرو بەتاڵ لەهێزو توانای خۆییاندانو شوێنکەوتوویان زۆرو موسوڵمانان کەمو بێ هێز!

بەراستی کاتو ساتی ناسكو حەریجنو تەنگانەن، پێغەمبەر چاوەڕوانی هاتنی کۆمەکییەو نایەتەدی، کافرەکان پێیان وایە درۆیان لەگەڵ کراوە، ئا لەم کاتەدا کە تەنگانە دەگاتە ئەوپەڕیو پێغەمبەران تەنگەتاو دەبنو لەپەلو پۆ دەکەونو هێزی بەرگریو بەرەنگارییان پێ نامێنێ، ئا لەم کاتە حەریجەدا ﴿جَاءَهُمْ نَصْرُنَا﴾ لەنکاوێك یارمەتیو کۆمەگی خودا هات بۆیانو فریایان کەوت ﴿فَنُجِّيَ مَنْ نَشَاءُ﴾ ئەوانەی مەیلمان لێ بوو رزگاریان بێ، رزگار کران ئەوانیش پێغەمبەرو موسوڵمانەکان بوون، سزاو تۆڵەمان دابەزییە سەر بەدرۆخەرەوەکان ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾ عەزابو تۆڵەی خودا لەتاوانباران ناگێڕدرێتەوە، ئەو تاوانبارانەی کافرن بەخوداو پێغەمبەریش بەدرۆ دەخەنەوە.

نموونەی ئەم ئایەتە لەقورئاندا زۆرو زەبەندەن؛ وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾غافر/٥١، یان ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا

وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾المجادلة/٢١، یان دەفەرموێ: ﴿وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ﴾البقرة/٢١٤.

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ﴾ بێگومان لەچیرۆکی حەزرەتی یوسفو براکانیو باوکیدا پەندو عیبرەت هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن عەقڵو فامن، لەرووداو ورد دەبنەوەو سەیری سەرەتاو ئاکامی رووداوەکان دەکەنو پەندیان لێ وەردەگرن!

وەلێ غافڵو نەفامەکان: کە عەقڵی خۆیان بەکار ناهێننو تێنافکرن نەصیحەتو ئامۆژگاری کاریان تێ ناکا سوود لەچیرۆكو سەرگوزشتە وەرناگرن.

﴿مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى﴾ ئەم قورئانە کە بەنیگا بۆ تۆمان ناردوە ئەی پێغەمبەر! قسەو باسێکی هەڵبەستراو نیە، چیرۆكو سەرگوزشتەی دروستکراو نیە، چونکە کەلامێکی موعجیزەیەو لەتوانای ئادەمیزاددا نیە کتێبێکی ئاوا سەرئاسا بخاتە ڕو، چیرۆك گێڕەوەو حیکایەتخوان کەی توانای ئەوەیان هەیە کەلامی ئاوا رەوانو شیرینو صافو لووس دابنێن؟! بەتایبەتی کە ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە رادەگەیەندرێ کە خۆی خوێندەوار نیە، هاموشۆی زانایانی نەکردوە، کەوابوو ئەمە گەورەترین بەڵگەیە کە قورئان کەلامی خودایەو بەرێگەی نیگاو سروش بۆ موحەممەد رەوانە کراوەو چیرۆکی دەست هەڵبەست نیە ﴿وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بەڵكوو پشتگیری کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەکا: کە خودا بۆ پێغەمبەرانی پێشووی ناردوون، وەکوو تەوراتو ئینجیلو زەبوور،، ئەوەی: کە تێیاندایەو حەقەو دەستی لێ نەدراوەو نەگۆڕاوە قورئان پشتگیری دەکاو بەراستی لەقەڵەم دەدا.

﴿وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ هەموو شتێکی پێویست بۆ ئایین تێیدا شی کراوەتەوە، هەرچی پێویست بێ بۆ کاروباری ئایینی وەکوو فەرمانو جڵەوگیرییەکانی

پەروەردگار، مزگێنیو هەڕەشەی رونکردنەوەی صیفاتو ناوەجوانەکانی، چیرۆكو سەرگوروشـتەی پێغەمبـەران لـە گـەلو نەتـەوەکانیاندا، لـەم قورئانـەدا رون کراوەتەوە!!

بـەکورتیو پـوختی لـەقورئاندا شـیکرنەوەو رونکردنـەوەی هـەموو شـتێکی تێدایە کە پێویستە بۆ دین، لەشـوێنکا پێویـستی بەدرێژەکردنـەوە هـەبێ بەدرێـژی دواوە لەهـەر شـوێنێکا کـورتبڕی پێویـست بـووبێ کـورتبڕی بـەکار هێنـاوە، حـەقو راسـتی بـیرو بـاوەڕی رون کردۆتـەوە، بەڵگـەو دەلیلـی زۆرو زەبەنـدەی هێناونـەوە، ئەخلاقو رەوشتی جوانو بنەمای شەریعەتو ئەحکامی شـی کردونـەوە، بـەجۆرێك ئەگـەر پـەیڕەوییان بکـرێ بەختـەوەری دونیـاو قیامـەت بـۆ ئـادەمیزاد دەسـتەبەر دەبێ، کاروباری کۆمەڵانی خەڵك بەئەوپەڕی رێكو پێکی بەڕێوە دەچێ.

﴿وَهُدًى﴾ قورئان هێدایەتـدەرە بـۆ کەسـێك تێـی بفکـرێو لێـی ورد بێتـەوە، بـەجوانی سـەیری بکـاو بیخوێنێتـەوە، شـارەزاییکەری رێگـای راسـتو صـەلاحە لەهەموو بوارێکی ژیـاندا، ﴿وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ رەحمـەتو بەخششێکی گشتییە بـۆ ئـەو موسـوڵمانانەی ئـەحکامی قورئانیـان لـەناودا جێبـەجێ دەکـرێ، ئەوانـەی موسـوڵمانیش نـین لـەژێر سـایەی حـوکمی قورئـاندا لەسـەرومەتو سـامانی خۆیـان دڵنیـان، نـاموسو گیـانو بـیرو بـاوەڕو شـوێنی عیبادەتیـان پـارێزراوە، وەکـوو موسوڵمانان مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێو لەکۆمەڵگایـەکی خـاڵی لەفەسـادو فاحیـشەو تاوان ژیان بەسەردەبن!

**بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی یوسف تەواو بوو خودا پشتیوانمان بێ بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر...**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الرعد)

ئـەم سـورەتە نـاونراوە بەسـورەتی (الرعـد) چـونکە باسـی هـەورو بروسـکەو بارینی باران لەهەورەوەی تێدایە وەکوو دەفـەرمووێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفـاً وَطَمَعاً وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ، وَيُسَبِّحُ الرَّعْـدُ بِحَمْـدِهِ وَالْمَلائِكَـةُ مِـنْ خِيفَتِـهِ وَيُرْسِـلُ الصَّوَاعِقَ﴾الرعد/١٢-١٣.

باران هۆی ژیانە بۆ هەموو گیانلەبـەرێكو بـۆ هـەموو روەكو گـژو گیایـەك، صـاعیقە جـاری وا دەبـێ دەبێتــە هــۆی فــەوتانو وێــران بــوونی ولاّت، ئەمــەش پێچەوانەی سوودو قازانجی ئاوە کە هۆکاری ژیانـە، کۆکردنـەوە لـەنێوان دوو شـتی دژبەیەکدا جێگای سەرسوڕمانە!

ریوایەت و رای جیا جیا هەن دەربارەی ئـەم سـورەتە ئـاخۆ مەککەییـیە یـان مەدینەییـیە!

موجاهید لەئیبنو عەبباسو عەلی کوڕی ئـەبو طەلحەوە ریوایـەت دەکا: کـە مەککەییـیە، هەمان را لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەت کراوە.

سـەعیدی کـوڕی مەنــصوور لەسـونەنەکەیدا دەڵـێ: ئـەبو عەزانـە لەئـەبو بیشرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پرسـیارم لەسـەعیدی کوڕی جوبـەیر کـرد دەربـارەی فەرموودەی پەروەردگار: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ عِندَهُ عِلْـمُ الْكِتَـابِ﴾ ئایـا مەبەسـتی عەبدوڵلای کوڕی سەلامە؟ لەوەڵام دا فەرمووی: ئەمە چـی بەسـەر چییەوە هەیـە؟ ئەم سورەتە مەککییەو چ پەیوەندییەکی بەعەبدوڵلای کوڕی سەلامەوە هەیە؟

لەلایەکی تــرەوە هــەر موجاهیــد لــەئیبنو زوبــەیرو مــەردەویهی لــەرێگای (العوفی) یەوە لەئیبنو عەبباسەوە، هەروەها لەرێگەی ئیبنو جورەیجو عوسمانــەوە لەعــەطاوە لــەئیبنو عەبباســەوە، هــەروەها ئــەبو شــشەیخ لەقــەتادەوە ریوایــەتیان کردوە: کە ئەم سورەتە مەدەنییە، تەنها لەریوایەتی ئەخیردا ئەوە چەرت کراوە کە ئایەتی ﴿وَلاَ يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ،،الآية﴾ مەدینەیییەو ئەوی تری مەککییە،[٤]

چەند موناسەبەو پێکەوە گونجانێك هەیە لەنێوان ئەم سورەتەو سورەتی یوســفدا، هــەردوکیان باســەکانیان چــیرۆکی پێغەمبــەران لەگــەڵ گەلــەکانیانو چۆنیەتی رزگارکردنی موسوڵمانانو لەناوبردنی کافرانیـان لـەخۆگرتووە، هـەردوو ســورەتەکەش مەبەســتەکانیان لێـك دەچـن ئـەوەتا هـەردوکیان مەبەسـتی تـاكو تەنهایی خوداو بوونی خودایان لەخۆگرتووە،

لەسورەتی یوسفدا دەفـەرموێ: ﴿أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ؟﴾ لەسـورەتی (الرعـد)یـشدا دەفـەرموێ: ﴿اللّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾/٢، یـان دەفـەرموێ: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ؟ قُلِ اللّهُ﴾(١٦) هەروەها لەچەند ئایەتی تریشدا لێك دەچن!!

لەلایــەکی تــرەوە هــەردوو ســورەتەکە وەصــفی قورئانیــان تێدایــە: ئــەوەتا سورەتی یوسف بەوەصفی قورئان کۆتایی هاتووەو دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ حَدِيثاً يُفْتَرَى وَلَـكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾،

سورەتی (الرعد)یش بەوەصفی قورئان دەستی پێ کـراوە، دەفـەرموێ: ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَالَّذِيَ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾،

---

(٤) الأساس في التفسير ج٥/٢٧١٩،

سورەتەکە بەبەڵگە هێنانـەوە لەسـەر هـەبوونی خـوداو تـاکو تـەنهایی زاتـی پاکی دەست پێ دەکا، بەڵگەو نیشانەی خودایەتیو بەدیهێنانی ئاسمانـەکانو زەویو مانگو خۆرو شەوو رۆژو کێوو دۆڵو دەشـت دەریـا، میـوەو بـەروبومو تـامو بـۆنو رەنگو شێوەو روخساری جۆراو جۆر رادەنوێنێ، ئەوە دەچەسپێنێ: کـە هـەر خـودا خۆی بەدیهێنـەرە، خـەڵقو ئیجاد ژیـان پێـدانو مرانـدن، سـوود پێگەیانـدنو زیـان لێخستن هەر بەدەست خودایە،

ئەمجار باسی زیندوبوونەوەو پاداشو سزای رۆژی قیامـەت دەکـاو بەبەڵگـەو دەلیل دەیانچەسپێنێ!

هەواڵ دەدا لەهەبوونی فریشتەو چۆنیەتی چاودێری کردنیـان بـۆ ئـادەمیزاد بەفەرمانی خودا،

نموونــەی حــەقو بــەتاڵ دێنێتــەوە، ئەوانــەی خــودا دەپەرســتن دەیانکاتــە نموونەی حەقو ئەوانەی بت دەپەرستن بەنموونەی بەتاڵو پوچ حلێبیان دەکا،

مزگێنی دەدا بەتەقواکاران بەبەهەشتو هەڕەشە بەسزای دۆزەخ لەوانە دەکا: کە پابەندی وادەو پەیمانی خۆیان نین،

چــۆنیەتی پێغەمبــەرانو ئــەرکی سەرشــانیان: کــە بانگەوازیکردنــە بــۆ یەکتاپەرستیو جڵەوگیری لەبتپەرستییە دەست نیشان دەکا،

ئەوە دەچەسپێنێ: کە پێغەمبەران هەموویان ئادەمیزادنو خێـزانو منـداڵو نـەوەیان هەیـە، مـوعجیزە بەدەسـت ئـەوان نیـەو بەدەسـت خودایـە، ئـەرکی ئـەوان راگەیاندنو موژدەدانو ترساندنە،

گـەلێ مەبەسـتی تریـشی لـەخۆگرتوونو ئاماژەیـان بـۆ دەکـا: خـودا یـار بـێ لەکاتی راڤەکردنی ئایەتەکاندا رونیان دەکەینەوە،

کۆتایی سورەتەکەش بەوە هاتووە: کە پەروەردگار شایەتی پێغەمبەرایەتیو نبووەت بۆ حەزرەتی موحەممەد دەداو شایەتیدانی خودا پەرستانی ئەهلی کیتاب بەوەی: کە نیشانەی پێغەمبەری ئیسلام لەنامە ئاسمانییەکانی ئەواندا هەیە، رادەگەیەنێ،

بەراستی ئەم سورەتە یەکێکە لەسورەتە سەرسوڕهێنەرەکانی قورئان، کە لەسەرەتاوە تا کۆتایی یەك شێوەو یەك تامو بۆنو بەرامی هەیە، دڵو دەروون ئاو دەداو دیمەنو وێنەی جۆراو جۆر نیشان دەدا، لەهەمموو لایەکەوە وێنەو دیمەنی جیا جیا کۆ دەکاتەوە، هەر دەڵێی فیستیڤاڵی دیمەنی جۆراو جۆری هەست هەژێنە، دڵ زەنوێر دەکەنەوە،

سورەتەکە نمایشگایەکە بۆ دیمەنە سروشتیەکان: هەر لەزەویو ئاسمانو مانگو خۆرو شەوو رۆژەوە تا دەگاتە تارمایيو سێبەرو تاریکیو روناکی، لەم سورەتەدا دەتوانی دیمەنی کێوی راوەستاوو چەقیوو لەگەڵ چۆمو جۆباری رەوان، کەفو خڵتە دەرواو ئاوی بەسوود دەمێنێتەوە، دیمەنی پارچە زەوی جۆراو جۆری بەتەك یەکەوە، داری بەرداری دو پەلو یەك پەل!، هەورەبروسکەو بارانو ژیان، روانو چکەرەکردنو رسکان،،، ئەم جۆرە دیاردە سروشتیانە بەشێوەیەکی چڕوپڕ نمایش دەکرێن، فلیمی بوونەوەرە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی یەزدانی رادەنوێندرێن.

دەی بابچینە خزمەت سورەتەکەو دەست بکەین بەراڤەکردنی یەکە یەکەی ئایەتەکانیو بەوردی سەرەنجی فلیمەکە بدەین!!.

## قورئانی پیرۆز حەق‌و راستە

﴿ الٓمٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ۗ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ﴾

لەوەپێش لەکۆتایی سورەتی یوسفدا پەروەردگار پێنج صیفەتی قورئانی بەیان کرد، لێرەشدا صیفەتێکی تری خستە پاڵ ئەو صیفەتانە، کە ئەویش بریتییە لەوە کە ئەو قورئانە کەلامی خودایەو بەحەقیقەت لای خوداوە هاتووە.

﴿المر﴾ لەوەپێش ئاماژەمان پێ کرد: کە ئەو پیتانە لەسەرەتای هەندێ سورەتدا هەن ئامێری ئاگادار کردنەوەن‌و دەبێ گرنگی بدرێ بەو پەیام‌و ئەحکامانەی بەدوا ئەو پیتانەدا دێن، شێوەی خوێندنەوەشیان دەبێ بەشێوەی لێک دابڕان بخوێندرێتەوە واتە: دەبێ بخوێندرێتەوە: (الف، لام، میم، را) هەر سورەتێک بەم جۆرە پیتانە دەست پێ بکا بەمەبەستی تەحەددا کردنی قورئانە بۆ کافرەکان‌و بۆڕدانیانە، هەروەها ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە نازڵبوونی قورئان لەلایەن خوداوەیەو گومانی تێدا نیە.

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ﴾ ئایەتەکانی ئەم سورەتە بریتین لەئایاتی قورئانی پیرۆز: کە گەیشتوونە سەر ترۆپکی کەماڵ‌و بێ عەیبی، شیاوی ئەوەن بەناوی ﴿الْكِتَابِ﴾ ناوببرێن،

﴿وَالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ﴾ هەموو ئەو قورئانەی بۆ تۆ نازلکراوە ئەی موحەممەد! لەخوداوە بۆت نێردراوەو شک‌و گومانی تێدا نیە.

واتە: دوای ئەوەی پەروەردگار پلەو نرخی سورەتەکەی راگەیاندو کەماڵو بێ عەیبی بۆ چەسپاند، ئەمجار ئەم حوکمەی گشتی کردو بۆ هەموو قورئانی چەسپاند،

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يُؤْمِنُونَ﴾ وەلێ زوربەی ئەو ئادەمیزادانە بڕوایان بەوە نیە کە ئەم قورئانە لەخوداوە بۆ تۆ نێردراوە،،، دان بەوەدا نانێن کە ئەم قورئانە شەریعەتو یاسای تا بڵێی رێكو پێکەو گونجاوە بۆ هەموو رۆژگارو سەردەمێك؛ نازانن ئەگەر ئادەمیزادان پەیڕەوی حوکمو یاساکانی بکەن لەدونیاو قیامەتدا سەرفرازو ئاسودە دەبن! موسوڵمانانی پێشوو لەچاخە زێڕینەکانیاندا چونکە پەیڕەوی ئەم قورئانەیان کردو بەگوێرەی یاساو حوکمەکانی هەڵسو کەوتیان کرد، بوونە باشترین گەلو نەتەوەی سەر زەوی، زوربەی زۆری دونیایان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، عەرشی کیسراو رۆمانیان ژێرو زەبەر کرد، سەریان بەفارسو رۆم دانەواندو دوژمن پێش دۆست شایەتی عەداڵەتکاریو ئاشتیخوازی بۆ داون.

ئەگەر ئەمرۆ سەرنج بدەینە واقیعی ئادەمیزاد دەبینین زوربەی زۆری دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بڕوایان بەقورئان نیە، رێژەی موسوڵمانان بەنیسبەت هەموو جیهانەوە (٥/١) پێنج یەکە، ئەمەش بەموعجیزەیەکی گەورە دەژمێردرێ بۆ قورئان: کە لەوەپێش هەواڵی داوە کە زۆرینەی خەڵك ئیمان ناهێنن، بەدرێژایی مێژووی ئیسلامیش وا هاتووە کە موسوڵمانان زۆرینەی سەر زەوی نەبنو ئێستاشو لەداهاتووشدا هەر وا دەبێ.

## بڕێ دیاردەی دەسەڵاتو بەتوانایی خودا لەئاسمانەکانو زەویدا

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کە زۆربەی ئادەمیزاد بڕوا بەقورئان ناکەن، بەشوێن ئەوەدا بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر تاکو تەنهایی خوداو زیندو بوونەوە، حاڵو چۆنیەتی ئاسمانەکانو مانگو خۆرو زەوی بەکێوو شیوو دۆڵو چۆمو دەریایەوە هەروەها حاڵو چۆنیەتی گژو گیاو کشتو کاڵو دارو

درەختی بەمیوەو بێ میوە بە بۆن‌و رەنگ‌و روخساریانەوە، هەموان ئاراستە دەکاو دحیانکاتە بەڵگە لەسەر بەتواناییو بەدەسەڵاتی خودا،

بەکورتی پاش ئەوەی کە پەروەردگار ئەوەی بەیانکرد: کە قورئان کەلامێکی حەق‌و راستە، ئەمجا رئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەو کەسەی قورئانی نازڵ کردوە توانای تەواوو دەسەڵاتی رەهای هەیە، دە ئەوەتا سەیری دروستکراوەکانی بکەن ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئاسمانەکانی دروستکردون‌و بەرزی کردوونەوەو بەبێ کۆڵەکە رایگرتوون، بەچاو دەبینن ئەو ئاسمانەیان‌و بەرینانە کە ئەم سەرەو سەریان نازانرێ، بەبێ کۆڵەکە وەستاون، جگە لەقودرەت‌و دەسەڵاتی خودا هیچی تر راینەگرتوون، ئێوە هەمیشە ئاسمانەکان دەبینن بەبێ کۆڵەکە وەستاون‌و هیچیان لەژێردا نیە، تەنانەت ئەگەر بشگوترێ: راوەستانەکەیان بەهۆی تەرازوو کێشی جاذیبییەتی نێوان ئەستێرەکان‌و قەبارە زەبەلاحەکانی ناو بۆشاییە! بێگومان ئەوەش هەر بەقودرەت‌و دەسەڵاتی خودایەو بەس!

﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ پاشان ئەو خودایەی کە ئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکەو پایە راگرتوون، کۆنترۆڵی عەرشی کرد، دەسەڵاتی بەسەریا هەیە، کردویەتی بەمەرکەزی فرمانڕەوایی خۆی، ئەم کۆنترۆڵکردن‌و داگیرکردنە بەشێوەیەکە: کە شیاوی زاتی پاکی بێ، ئێمە نازانین ئیستیواکە چۆنەو چۆن نیە عەرش: شتێکی دروستکراوە، خودا بەقودرەتی خۆی بەدیهێناوە، قورئان چۆن باسی دەکا ئاوا بڕوامان پێیەتی، لەهەموو ئاسمانەکان‌و زەوی گەورەترە!! لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە کە دەفەرموێ: (ماالسموات السبع ومافيهن في الكرسي الا كحلقة ملقاة بأرض فلاة، والكرسي في العرش المجيد كتلك الحلقة في تلك الفلاة) لەریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (والعرش لايقدر قدره الا الله عز وجل)،

لەئایەتەکەدا پەروەردگار سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ تێفکرین لەئاسمانەکان: کە بینراوێکی بەرزو پانو پۆڕو بێ سەرو بنن.

ئەمجار سەرنجمان رادەکێشێ بۆ شتێکی غەیبی زۆر فراوانتر کە عەرشی پەروەردگارە، گەورەیی‌و فراوانی عەرش هەر باس ناکرێ‌و هەستو عەقڵ پەی پێ نابەن! جا ئەگەر ئاسمانەکان بەرزبن ئەوە عەرش بەرز ترە، ئەگەر ئاسمانەکان گەورەو فراوان بن، ئەوە عەرش زۆر لەوان گەورەترو فراوان ترە، پەروەردگار بەقودرەتی خۆی ئەم جیهانە فراوانە؛ کە عەرشە کۆنترۆڵی کرد؛ کۆنترۆڵکردنێکی رەهاو موطلەق، قورئان وێنەی کۆنترۆڵکردنەکە دەکێشێ بەشێوەیەك کە ئەو عالەمە رەهاو موطلەقە لەهەستی ئادەمیزاد نزیك بکاتەوە!!

﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ خۆرو مانگی رام کردون، وای لێ کردون فەرمانبەردار بن بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی لەئەستۆیانەو سودی هەیە بۆ ئادەمیزادو ئاژەڵو روەكو درەخت، هەر یەکێ لەخۆرو لەمانگ بەرێ‌و شوێنی خۆیدا تا کاتی دیاریکراو هاتو چۆ دەکا، هەر یەکەو لەجەمسەری خۆیدا هەڵدەسوڕێ، روناکایی‌و گەرمایی دەبەخشن بەزەوی هۆکاری ژیان دەستەبەر دەکەن.

نەك هەر خۆرو مانگ، بەڵکوو هەموو ئەستێرە گەڕۆکەکانی تریش لەهاتوچۆدانو هەریەکە لەتەوەرەی خۆیداو بەرێ‌و شوێنی خۆیدا دێ‌و دەڕوا تا کاتی دیاریکراو: کە کۆتایی هاتنی دونیایەو هاتنی قیامەتە، یان تا کاتێکی دیاریکراو کە هەریەکەیان دەورەی خۆی تەواو دەکا، خۆر بەساڵێك تێوەرسوڕانەوەی خۆی تەواو دەکا بەڵام مانگ لەماوەی (٢٩) رۆژ یان (٣٠) رۆژدا خولی خۆی ئەنجام دەدا.

هەر یەکێ لەم ئەستێرە گەڕۆکانە بەگوێرەی یاسای بۆ دیاریکراویانو تا ئەو ئەندازەی بۆیان دانراوە لەهاتوچۆو هەڵسوڕاندان، دەورەی رۆژانەو مانگانەو

سالانەی خۆیان ئەنجام دەدەنو لەجەمسەرو تەوەرەی خۆیان لانادەنو ڕێگەیان لێ هەڵە نابێ، ئامێرەکانیان ناسوێنو ساتەوەختێك لەکار نەکەوتوونو پاشو پێشیان نەکردووەو نایکەن، چونکە خودایەکی بەدەسەڵاتو باڵا دەستو حەکیمو لێزان هەڵیان دەسوڕێنێو دەیانهێنێو دەیانبا!!!

﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ﴾ پەروەردگار کاروباری بونەوەر نەخشەکێش دەکاو بەوپەڕی ڕێكو پێکییەوە بەگوێرەی ویستو داخوازی حیکمەتو دانایی خۆی، بونەوەر هەڵدەسوڕێنێ گۆڕانکاری تێدا دەکا، دەژیێنێو دەمرێنێ، هەندێ کەس بەرز دەکاتەوە هەندێك نەوێ، هەندێك بێ هێز دەکا هەندێك قەوی، بڕێك دەوڵەمەند دەکاو تاقمێك هەژار، ئەم جوان دەکاو ئەو ناشیرین، ئەم کورتو ئەو درێژ،،، هۆکار دەڕەخسێنێ بۆ بەدیهێنانی ئاکام، هەموو شتێك لەبوونەوەردا یاساو قانوونێکی تایبەتی بۆ داناوەو تایبەتمەندی خۆی هەیەو حیکمەتی خودا داخوازی ئەوە بووە کە بەو جۆرە بێ، چۆن عالەمی ئەجسام بەڕێوە دەباو نەخشەو پلانی تێدا ئەنجام دەدا هەر بەو شێوەش عالەمی ئەرواح سەرپەرشتی دەکاو ویستو ئیرادەی خۆی تێدا ئەنجام دەدا، چۆن چاودێری مەجەرە دەکا ئاواش ئاگاداری زەڕەیە، چاو دێریکردنی ئەمیان لەسەرپەرشتی کردنی ئەویان غافڵی ناکا، هیچ ئیشێك لەئیشێکی تری بێ ئاگا ناکا!

﴿يُفَصِّلُ الآيَاتِ﴾ نیشانەکانی دەسەڵاتو بەتوانایی خۆی ڕون دەکاتەوە، بەڵگە لەسەر خودایەتیو تاكو تەنهاییو زانایيو دانایی خۆی دەهێنێتەوە، ئەم بوونەوەرە بەگوێرەی یاسایەکی ورد هەڵدەسوڕێنێ، پەیوەندی لەنێوان ئەندامانی بوونەوەردا خولقاندووەو پێکەوە گونجاندونی، بۆ نموونە کۆمەڵەی خۆریی (المجموعة الشمسية) بەخۆرو مانگو ئەستێرەکانی ترەوە، هەموویان لەنێوان خۆیاندا پەیوەندییەکی تەواویا هەیە، هەموویان بەگوێرەی یاساو نیظامێك هەڵدەسوڕێن، هیچیان ڕێ بەهیچیان ناگرنو هیچ کامێکیان لەڕێبازی خۆی لانادا،

هەریەکەیان لەشوێنی خۆی دەردەکەوێو بەرێبازی خۆیدا دەڕواو لەتەوەرەی خۆیدا دەخولێتەوەو ئەرکی خۆی ئەنجام دەدا!

پەروەردگار ئەم کەونەی ئاوا بەدیهێناوەو بەو شێوە هەڵیدەسوڕێنێو نیشانەی دەسەڵاتو بەتواناییی خۆی نیشان دەدا ﴿لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە بڕوای تەواو پەیدا بکەن بەهاتنی قیامەتو زیندو بوونەوە، بزانن: کەسێك ئەوە تواناو دەسەڵاتی بێ، ئەوەندە داناو لێزان بێ، دەتوانێ جارێکی تر ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تریش سەر لەنوێ زیندو بکاتەوە، کەسێك بتوانێ لەنەبوو ئەم بونەوەرە بەدی بهێنێ دەتوانێ جارێکی تر ئێوەی ئادەمیزاد پاش مردن زیندو بکاتەوەو سزاو پاداشیان لەسەر کردەوەکانتان بداتەوە، کەسێك بتوانێ ئاسمانەکانو زەوی بەدی بهێنێو ئاوا بەو شێوە بوونەوەر ئیدارە بداو چاودێری بکا، دەتوانێ پاش مردن جارێکی تر سەرلەنوێ گیانەکان بگەڕێنێتەوە بۆ جەستەکانو حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکاو بەگوێرەی کرداری دونیایان سزاو پاداشیان بداتەوە!!

پاش ئەوەی بەڵگە ئاسمانییەکانی ڕانواندنو کردنی بەنیشانەی خودایەتیو تاكو تەنهاییو بەدەسەڵاتی خۆی، ئەمجار بەڵگەکانی زەوی ڕادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە زەوی فراوان کردوە، لەباری درێژیو لەباری پانی درێژی کردۆتەوە، وا دێتە پێش چاو دەڵێی بەڕەیە ڕاخراوە، بڵاوی کردۆتەوە بۆ ئەوەی قاچی ئادەمیزادو ئاژەڵی لەسەر بچەسپێ، بتوانن بەسەریدا هاتوو چۆ بکەن، سود لەخێرو خێراتی وەربگرن لەبەروبوومی دارو درەختی بخۆن، بەشیوو دۆڵو پێدەشتو لاپاڵی دا بگەڕێن، هەوڵی بەدەستهێنانی نیعمەتی خودا بدەن! بێگومان زەوی لەبەر گەورەیی ڕوبەرەکەی وادێتە پێش چاو کە ڕاخراوەو درێژ بۆتەوە، ئەمەش لەگەڵ شێوە هیلکەیی زەویدا دژایەتی نابێ، چونکە قورئان ئاماژە بۆ شێوە هیلکەیی زەوی دەکاو دەفەرموێ: ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى

النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾الزمر/٥، وەلێ لەبەر گەورەیی‌و فراوانی بەشێوەی ڕاخراو دێتە پێش چاو،

﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ﴾ پەروەردگار لەزەویدا کێوی چەقاندون بۆ ئەوەی جم‌و جۆڵ نەکا سەنتەری خۆی تێك نەداو لەنگەری خۆی رابگرێ، ﴿وَأَنْهَاراً﴾ چۆمی لەزەوی دروست کردون، ئەم چۆم‌و جۆگەو جۆبارانە بەناو زەویدا دەکشێن سود بەئادەمیزادو ئاژەڵ‌و دارو درەخت‌و روەك دەگەیەنن زەوی تینوو ئاو دەدەن، کشت‌و کاڵ‌و بەروبوم بەهۆی ئاوی ئەو چۆمانە وەبەرهەم دێن،

﴿وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ پەروەردگار لەهەموو جۆرە میوەیەکدا نێرو مێی داناوە، روەك‌و درەخت بەروبوم‌و میوەیان لێ پەیدا نابێ ئەگەر نێرو مێیان تێدا نەبن! زانستی تازەش ئەوەی سەلماندوە: کە دارو درەخت‌و ڕوەك، میوەو دانەوێڵەیان -بەبێ هەبوونی نێرو مێ- لێ پەیدا نابێ، جا ئەندامە نێرەکە جاری وا دەبێ لەتەك ئەندامە مێینەکەدایە، جاری وایش دەبێ لەدرەختێکی تردایە، وەکوو دارخورما، نێرەکە لەگەڵیدا نیە، بەڵکوو لەدارێکی تردایە، وەکی پەمۆ (لۆکە) نێرو مێیەکە پێکەوە لەگوڵوکەکەیدان، وەکی کولەکە نێرو مێیەکە هەردوکیان لەهەمان روەکدان بەڵام گوڵەکانیان جوداوازە، هەڵبەتە ئەمڕۆ زانیاری کشت‌و کاڵی‌و روەکناسی‌و درەخت ناسی پێشکەوتووەو زۆر شت لەم بارەوە زانراوەو کتێبە تایبەتییەکان ئامازەیان پێ کردوە،

هەروەها پەروەردگار لەهەموو میوەیەکدا دوو جۆری رەخساندوە، لەبارەی تامەوە وەکوو شیرین‌و مزر، شیرین‌و تاڵ، ترش‌و سوێر،،، لەبارەی رەنگەوە وەکوو سپی‌و رەش، سوورو شین،،،، لەبارەی سروشتەوە وەکوو ساردو گەرم،،،،هتد

﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ﴾ پەروەردگار بەتاریکی شەو روناکایی رۆژ دادەپۆشێ، دەبینی دەمەو ئێوارە خۆرئاوا دەبێ، تاریکی باڵی رەشی خۆی بەسەر بوونەوەردا

دەكێشێ‌و بەرگێكی رەشی قەترانی بەبەر تەبیعەتدا دەكاو دونیا دەبێتە ئەنگوستەچاو، ئیتر وردە وردە شەو رادەبرێ‌و دەگاتە دەمەو بەیان، ئەمجار شەو پۆشاكی رۆژ لەبەر خۆی دەكاو دونیا روناك دەبێتەوە ئەم گۆرانكاریكردنە لەبوونەوەردا بۆ ئەوەیە بەرژەوەندی ئادەمیزادەكان دەستەبەر ببێ بەشەو ئارام بگرن‌و ماندویان بحەسێتەوە، بەرۆژ هەوڵی بژێوی خۆیان بدەن‌و پێداویستی ژیان دابین بكەن، وەكوو لەشوێنی تردا ئاماژە بەمە دەكاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً﴾النمل/٨٦، یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ﴾الروم/٢٣.

دوا ئەوەی: كە ئەم بەڵگە بینراوە سروشتیانەی رانواندن: كە هەموو بەیانی‌و ئێوارەیەك ئادەمیزاد بەچاوی خۆیان دەیان بینن، بەڵكوو لەهەموو ئان‌و ساتێكدا ئەم گۆرانە بەدی دەكرێ، باسی ئەوە دەكا: كە ئەم بەڵگانە هەرچەندە زۆر روون‌و ئاشكران، گەلێ گرنگ‌و جێگای سەرنجن، كەچی كەس لایان لێ ناكاتەوەو تێیان نافكرن‌و عەقڵی خۆیانیان تێدا خەرج ناكەن، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان لەدروستكراوانی خوداداو لەدیاردە سەرسوڕهێنەرەكانی دروستكراوەكانی‌دا كە نیشانەی بەتوانایی‌و دەسەڵاتی رەهای زاتی حەقن، بەڵگەی جۆراو جۆر هەن بۆ كەسانێك لێیان ورد ببنەوەو پەندیان لێ وەربگرن، ئەگەر تێیان بفكرن دەزانن: كە بەدیهێنەری ئەم شتانە بەهەموو دیاردەیەكیانەوە خودای باڵادەست‌و خاوەن ویست‌و ئیرادەی رەهاو خاوەن دەسەڵاتی بێ سنوورە، هیچ شتێكی لەبەر عاسی نابێ، هەرچی بیەوێ لەناوی دەبا، هەر كاتێكیش بیەوێ لەناوچووەكە دێنێتەوە گۆرەپانی بوونەوە، هەر چییەكیشی بوێ لەنەبوو دروستی بكا بەبێ ماندوبوون بەدی دێنێ!! كەوابێ بەندایەتیكردنی ئێوەی ئادەمیزاد جگە لەزاتی پەروەردگار بۆ كەسی تر دروست نیە، گەرندكەچی هەر بۆ ئەو دەكرێ،

هاوارو پاڕانەوە هەر لەخودا دەکرێ، پەنا هەر بۆ ئەو دەبرێ! بۆ کەسی تر نابێ ئەنجام بدرێن،

هەر لەو بەڵگە سروشتییانەی کە بەچاو لەسەر زەوی دەبینـدرێن جوداوازی نێوان پارچەکانی زەوی خۆیەتی، دەفەرموێ: ﴿وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ﴾ لەزەویدا چەند پارچە زەوییەك لەپەنا یەکەوە هەن، ئەم پارچە هاوسێی ئەو پارچەیەو ئەو پارچەیە لەتەك ئەم پارچەیەدایە، کەچی وێڕای هاوسێیی و لەپەنا یەکبوونیانەوە بەسروشتو بەماهییەت لێکدی جیانو هەر یەکەیان بۆخۆی سروشتێکی تایبەتی هەیە، هەیە خاکێکی نەرمانی پڕ پیتو بەرەکەت، خاوەن بەرو بوومو سوود بەخش بۆ ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تر، هەیە گونجاوە بۆ دارستانو باخ، هەیە بۆ کشتو کاڵ گونجاوەو دارستانی پێ ناکەوێ، بەشی وەهاشی هەیە رەقەنو چەقەنو روتەن نەبەکاری کشتو کاڵ دێو نەدارو درەختی لێ وەبەر دێ، هەیە زیخەڵانو لبەلانە، هەیە کوێستانەو هەیە گەرمیانە هەیە ئاوەدانو هەیە وێرانە، هەیە ئاودارو هەیە بێرونە، هەیە هەواسازو هەیە دەرداوی! ئەمیان خاکی رەشو ئەویان سورە خاکە، ئەمیان گڵە سوورە ئەویان گڵە زەردە!!...هتد،

﴿وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ﴾ لەزەویدا هەیە باخو رەزی ترێی جۆراو جۆر ﴿وَزَرْعٌ﴾ هەروا کشتو کاڵی جۆراو جۆر کە بەروبوومیان خۆراكو بژێوی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترە، ﴿وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ﴾ هەروەها لەزەویدا هەیە دار خورما، هەیە یەك بنکی هەیە لەسەر ئەو بنکە چەند قەدێك هەڵچوون وەکوو داری هەنارو دار هەنجیرو هەندێك دار خورما، داری وایش هەیە یەك بنكو یەك قەدی هەیە وەکوو باقی درەختەکانی تر،

﴿يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ﴾ ئەمانە هەموویان بەیەك ئاو ئاو دەدرێن، زەوییەكەیان یەك زەوییە، یەك هەوایان هەیە، كەچی شێوەو روخسارو قەبارەو تامو بەرامیان جوداوازە،

﴿وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ﴾ هەندێكیانمان لەهەندێكیان باشترو بەسوود تر كردوە لەخواردنو تامو چێژدا، لەبۆنو بەرامو ڤیتامیناتا، لەشیرینیو مزریدا!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان لەم جوداوازییەی نێوان دارو درەختو روەكو بەروبومو دانەوێڵەو شتی تریشدا نیشانەی جۆراو جۆرو بەهێز هەن لەسەر هەبوونی خودایەكی بالا دەستی بەتواناو زاناو كارساز، بەڵگەی بەهێزیان تێدان لەسەر تاكو تەنهایی خودا بۆ كەسانێك بیر بكەنەوەو لەشتەكان وردببنەوە، خاوەن عەقڵو فام بن! ئەوەتا: ئەو هەموو جوداوازییە لەخودی میوەو دانەوێڵەكاندا هەیە، شێوەو روخسارو رەنگو تامو بۆنو بەرامیان جودایە، ئەو شیرینو ئەم تاڵ، ئەو مزرو ئەم تاڵو تفت، ئەم یەكرەنگو ئەو رەنگاو رەنگ، هەروا جوداوازی لقو پۆپو گەڵاو گوڵو گوڵوكیان، جوداوازی بۆنو بەرامیان، لەكاتێكدا هەموویان خاكو ئاوو هەوایان یەكە، بەراستی ئەمانە هەموو نیشانەی ئەوەن: كە خودا بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایەو هیچی لێ عاسی نابێ، كەسێك بتوانێ سەرەتا ئەم شتانە بەدی بێنێ، ئەگەر فەوتان دەتوانی جارێكی تر بەدییان بێنێتەوە، بەڵكوو ئاسانتریشە!

## بڕوانەکردنی کافرەکان بەهاتنی ڕۆژی قیامەتو بەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ

﴿ ۞ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَـٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٥﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَـٰتُ ۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۗ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ ﴾

وەکوو زانیمان پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا بەڵگەی جۆراو جۆری (ئاسمانیی و ئەرزیی) لەسەر تواناو دەسەڵاتی خۆی هێنایەوە! بۆ ئەوەی ئادەمیزادان بسەلمێنێ: کە کەسێك ئەوە تواناو دەسەڵاتی بێ، چۆن ناتوانێ دوای مردن ئادەمیزاد زیندو بکاتەوە، چونکە کەسێك توانای بەسەر شتی گەورەو تەواودا هەبێ بەسەر شتی پچووکدا باشتر توانای هەیە، وەکوو لەشوێنێکی تردا

دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ الأحقاف/٣٣.

ئەمجار باسی ئینکاریکردنی موشریکەکان بۆ زیندو بوونەوەو هاتنی قیامەت دەکا، هەروەها باسی نەفامییەکی تریان دەکا؛ ئەویش بریتییە لەپەلە کردنیان بۆ نازڵبوونی عەزاب بۆ سەریان! دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَئِذَا كُنَّا تُرَاباً أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ سەرت سوڕبمێنێ لەهەڵوێستی موشریکەکان بەرامبەر بەتۆ: کە بەدرۆت دەخەنەوە، یان تۆ سەرسام ببی لەوەی کە عیبادەتی شتی وا دەکەن نەزیان دەگەیەنن نەسوود، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو بەڵگە کەونییانە دەبینن کە نیشانەی هەبوونی خودایەکی خاوەن دەسەڵاتو زاناو دانایە، دانیش بەوەدا دەنێن: کە هەر ئەو خودایە لەنەبوو شتەکانی وەدی هێناوە، جا ئەگەر تۆ ئەی موحەممەد! لەم هەڵوێستو بیرو باوەڕەیان سەرت سوڕبمێنێ، ئەوە سەرسوڕهێنەر تر لەوە بڕوا نەکردنیانە بەزیندو بوونەوە، بەدرۆ خستنەوەیانە بۆ هاتنی ڕۆژی قیامەت، وتنی ئەو قسەیانە کە دەڵێن: ئەرێ ئێمە کە مردینو بووینەوە بەخاكو خۆڵ جارێکی دیکە چۆن زیندو دەکرێینەوە؟!

سەیرە ئاڕاستە کردنی ئەم پرسیارە ئینکار ئامێزە یازدەجار لەچوار چێوەی نۆ سوورەتدا دووبارە بۆتەوە! واتە: لەسورەتی (الرعد، الأسراء، المؤمنون، النحل، العنکبوت، السجدة، الصافات، الواقعة، النازعات)دا دووبارە بۆتەوە،

لەکاتێکدا هەموو هۆشمەندێکی زانا دەزانێ: کە دروستکردنو بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی زۆر لەدروستکردنی ئادەمیزاد گرنگترن، کەسێك بتوانێ سەرەتا ئەو شتانە دروست بکا ئیعادە کردنەوەیان ئاسانترە بۆی! وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾الأحقاف/٣٣.

ئـەم ئایەتـە کـەمێك پـێش ئەمـە هـاتووە خودایـەك بتـوانێ ئـەم بوونـەوەرە گەورەو فراوانە بەدی بێنێو بـەڕێوەی بـەرێو بـەو شـیوە رایبگـرێ دەتـوانێ پـاش مـردن ئادەمیزادەکان سـەرلەنوێ زینـدو بکاتـەوە، دەی ئەوانـەی بـڕوا بـەم راسـتیە ناکەن ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ كَفَـرُوا بِـرَبِّهِمْ﴾ ئەوانـە ئـەو کەسـانەن کـە بڕوایـان بـەخودای خۆیـان نیـە؛ ئـەو خودایـە لەسـەرەتاوە دروسـتی کـردون پـەروەردەیان دەکـا چاودێرییان دەکـا رزقو رۆزییـان دەداتـێ ئـەوان پێـی کـافرنو نایناسـن، نایانـەوێ بیناسن!! ﴿وَأُوْلَئِكَ الأَغْلالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ﴾ ئەوانە وێڕای ئـەوەی کـە دەسـتو قاچیـان پێوەند کراون کۆتو زنجیریشیان لەملدایە، ئەوانە رۆژی قیامەت زیـنجیر دەکرێتـە ملیانو کێش دەکرێن بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە،

﴿وَأُوْلَئِكَ أَصْـحَابُ النَّـارِ هُـمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ﴾ ئەوانـە تـاقمو پێـڕی دۆزەخـن دەخرێنە نـاوی، شـیاوی ئـەو جیگـا نـاخۆشو پـڕ ئـازارەن، بـۆ هـەتا هـەتایێ تێیـدا دەمێننەوەو لێی دەرناچن!

جا وەنەبێ ئەو کافرانە بەدرۆخستنەوەکەیان هەر بـۆ عـەزابی قیامـەت بـێو بەس! بەڵکوو ئینکاری عەزابی دونیاش دەکەن، هەر کە پێغەمبەر هەڕەشەی هاتنی عەزابیان لێ دەکا، ئەوان دەڵێن: دە بـا بـێ؛ بـۆ نایـە؟ ئەوانـە لـەجیاتی ئـەوە داوای رەحمەتو هیدایەتی خودا بکەن کەچی ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ﴾ واتـە: ئەو کافرە بەدرۆ خەرەوانە پەلە لەهاتنی عەزاب دەکەن، بەگاڵتەپێکردنەوە دەڵێن: دەبا ئەو سزایەی تۆ هەڕەشەمان پێ لێ دەکەی با بۆمـان بـێو دوانەکـەوێ! ئەوانـە ئەوەنـدە نـەفامن داوای هـاتنی عـەزاب دەکـەن لـەپێش ئـەوەدا داوای رەحمـەتو نیعمەتی خودا بکەن!

﴿وَقَدْ خَلَـتْ مِـنْ قَـبْلِهِمْ الْمَـثُلاتُ﴾ وەلحـال لـەپێش ئەوانـدا چـەندەها سـزاو عەزابی ریشەکێشمان ناردە سەر گەلو نەتـەوە بـەدرۆ خـەرەوەکان، سـزای تونـدمان نـازڵ کـردوە بـۆ سـەر گـەلو نەتـەوە پێـشینەکانو کردمـانن بەپەنـدو عیـبرەت بـۆ

کەسانێك پەند وەربگرن! دیارە ئەوانە بێ ئاگان لەئاکامو سەرەنجامی گەلو نەتەوە رابوردوەکان کە ریشەکێشمان کردنو بوونە پەندو عیبرەتی رۆژگار،

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! خاوەنی لێخۆشبونو داپۆشینە بۆ تاوانی بەندەکانی هەرچەندە بەندەکانی ستەمکارنو شەوو رۆژ خەریکی ئەنجامدانی تاوانو سەرپێچیکردنی فەرمانی پەروەردگارن، ئەگەر حیلمو عەفووی بەرفراوانی نەبێ لەگەڵ ئەنجامدانی تاوان یەکسەر عەزابی بۆ نازڵ دەکردنو لەناوی دەبردن؛ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ﴾فاطر/٤٥، یان دەفەرموێ: ﴿وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِ مَوْئِلاً﴾الكهف/٥٨.

پەروەردگار لەگەڵ بەندەکانی بەرەحمو سۆزە، تەنانەت ئەگەر ماوەیەکیش ستەمکاری بکەن دەرگای لێخۆشبونیان بۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی تۆبە بکەنو واز لەخراپەکاری بێنن! بەڵام ئەگەر هەر سوور بون لەسەر سەرپێچیکردن ئەوە سزای توندیان دەدا ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ بێگومان خودای تۆ سزای توندو بەئێشی هەیە بۆ ئەوانەی تاوانکارن، بۆ یاخی بوان!

پوختەی قسە ئەوەیە: خودا لەبەندەکانی خۆش دەبێ لەگەڵ ئەوەشدا کە ستەم لەخودی خۆیان دەکەن بەوەی تاوان ئەنجام دەدەن، ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەقورئاندا هیچ ئایەتێك لەم ئایەتە زیاتر جێگای هومێد نیە،

تێبینی ئەوەش دەکرێ پەروەردگار لەبەرامبەر بڕیاری لێخۆشبوونو رەحمەتدا ئەوەشی راگەیاند کە عەزابیشی بەئێشە، ئەمەش عادەتی قورئانە کە باسی قیامەتی کرد باسی دونیاش دەهێنێ، کە باسی نیعمەتو خۆشی بەهەشتی کرد باسی سزای دۆزەخو نارەحەتیش دەکا، بۆیە لێرەشدا کە باسی (مغفرة)و

(رحمة)ی پەروەردگاری کرد، باسی ئەوەشی کرد کە (شدید العقاب)ە، ئەمەش بۆ ئەوەی خەوف و رەجا هاوتەرازو بن، ئادەمیزاد هەمیشە بەتەما رەحمەتی خودا بێ و لەسزاو تۆڵەشی بترسێ! وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَإن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُهُ عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾الأنعام/١٤٧، یان دەفەرموێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، وَ أَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمَ﴾الحجر/٤٩-٥٠، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾الأعراف/١٦٧.

ئەمجار پەروەردگار باسی ئەو داخوازییەی موشریکەکان دەکا: کە پێکیشییان لەپێغەمبەر ﷺ دەکرد: کە موعجیزەی مادیو حیسسییان بۆ بنوێنێ بەم داوایەشیان مەبەستیان بۆڕدانی پێغەمبەر بوو، دەیانویست سوور بن لەسەر کوفرو بێدینیو تانەدان لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو گومان خستنە سەر پەیامەکەی دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ﴾ ئەو کافرو موشریکە نەفامانە لەروی رقەبەریو ئینکاریکردنەوە دەڵێن: ئەوە بۆچی موحەممەد موعجیزەیەکی وەکوو عەصای موساو وشترەکەی حەزرەتی صالح پێغەمبەرمان بۆ نانوێنێ، بۆ کێوی (الصفا)مان بۆ ناکا بەزێڕو زیو، یان بۆچی کێوەکانی دەورو بەری مەککەمان بۆ لاناباو لەشوێنەکانیان باخو باخاتو جۆگەو جۆبارمان بۆ ناخولقێنێ؟ جا کافرەکان کە ئەم جۆرە پێشنیارانەیان دەخستنە پێش چاو پێیان وا بوو قورئان بۆخۆی موعجیزە نیە!

هەڵبەتە پەروەردگار لەئایەتێکی تردا وەڵامی ئەو شوبهەیانی داوەتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَن نُّرْسِلَ بِالآيَاتِ إِلاَّ أَن كَذَّبَ بِهَا الأَوَّلُونَ﴾الأسراء/٥٩، نامانەوێ سزاو عیقابی خۆمان بەسەر بەدرۆخەرەوەکاندا تەطبیق بکەین، چونکە دابو نەریتی ئێمە وەهایە کەسێك بڕوا بەموعجیزەی داواکراو نەکا بەهیلاکی دەبەین! ئەگەر کەسێك داوای موعجیزەی کردو موعجیزەکە هاتە دیو ئیمانی پێ نەهێنا ئێمە ریشەکێشی دەکەین، بەڵام لێرەدا وازی لەوەڵامدانەوەی قسەی

موشریکەکان هێناوە بەڵکوو ئەرکی سەرەکی پێغەمبەر بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ﴾ ئەی موحەممەد! ئەتۆ پێغەمبەری، ئەرکی سەرشانی تۆ گەیاندنی پەیامی پەروەردگارە، کاری تۆ ئەوەیە: ئەو کافرانە بترسێنی لەئاکامی ئەو سەرپێچیو خراپەکارییەی ئەنجامی دەدەن، بەدیهێنانی ئەو موعجیزەو ئایاتانەی داوایان دەکەن ئیشی تۆ نیە، ئەوە عائید بەخودایە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾البقرة/٢٧٢.

﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾ بۆ هەمو گەلو نەتەوەیەك داعیو بانگەوازیکەرێك هەیە، بانگیان دەکا بۆ لای ئایینی خودا، بۆ رێبازی خێرو چاکە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾فاطر/٢٤.

کافرەکان: کە تانەو تەشەریان لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەدا لەم رووەوە بوو دەیانگوت: قورئان موعجیزەنیە، دەیانگوت: ئەمە کتێبێکە وەکوو کتێبەکانی ترو هێنانی کتێبێکی دیاریکراو لەهیچ رویەکەوە موعجیزە نیە، موعجیزە دەبێ وەکوو موعجیزەی موساو عیسا وابێ، دەریا شەق ببێ، عەصا ببێتە ئەژدیها!! جا وەنەبێ ئەم ئایەتە نیشانەی ئەوەبێ کە پێغەمبەر ﷺ جگە لەقورئان موعجیزەی تری نەنواندونو نەیبوون، وێ دەچێ کافرەکان ئەمەیان کاتێك گوتبێ کە هێشتا موعجیزەی تریان لەپێغەمبەر نەبینیبن، یان داوای غەیری ئەو موعجیزانەیان کردبن کە لەپێغەمبەریان بینیون: وەکوو ناڵەی بنکە دارخوماو لەتبوونی مانگو هەڵقوڵانی ئاو لەناو پەنجەکانیو تێر خواردنی خەڵکێکی زۆر لەخواردەمەنیەکی کەم! بەمانە رازی نەبوون داوای موعجیزەی تریان کردوە!

بەهەر حاڵ قورئان بەهەرە موعجیزەی گەورەو گرنگی پێغەمبەر ﷺ دەژمێردرێ! قورئان موعجیزەیەکی گونجاوو لەبار بوو بۆ رۆژگاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد!

لەو رۆژگاری حەزرەتی موسادا سیحرو جادوبازی باوبوو، بۆیە موعجیزەکەی شتێك بوو کە لەگەڵ زانیاری سیحری گەلەکەیدا گونجاو بوو، لەسەردەمی حەزرەتی عیسادا زانیاری پزیشکی باوبوو بۆیە موعجیزەی حەزرەتی عیسا شتێك بوو کە لەگەڵ ئەو زانیارییەدا گونجاو بوو؛ کە بریتی بوو لەزیندوکردنەوەی مردوو چاك کردنەوەی بەڵەك‌و کوێر!

لەرۆژگاری پێغەمبەری ئیسلامیشدا رەوانبێژیو زمانڕەوانیو خۆشخوانی باوبوو بۆیە موعجیزەی هەرە گرنگی پێغەمبەر ﷺ قورئانی پیرۆزە، کە گەیشتۆتە سەر تروپکی بەلاغەت‌و فەصاحەت!

### برێ دیاردەی زانیاری خودا: کە هەموو شتێك دەگرێتەوە

﴿ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٞ مِّنكُم مَّنۡ أَسَرَّ ٱلۡقَوۡلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنۡ هُوَ مُسۡتَخۡفِۭ بِٱلَّيۡلِ وَسَارِبُۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٞ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ

﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾﴾

دوای ئەوەی پـەروەردگار باسـی ئینکـاریکردنی موشـریکەکانی کـرد دەربـارەی هاتنی ڕۆژی قیامەت، ئەمجار هەندێ بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر بەدەسەڵاتی خـوداو هەبوونی زانیاری تەواوی بەسەر هەموو شتێکدا!

زاتی پاکی پەروەردگار زانایە بەکۆرپەلە لەناو منداڵدانی مێیینـەدا، ئاشـکراو نهێنی دەزانێ، زۆر لەوەش نهێنی ترو پەنامەکی تر دەزانێ، دەفـەرموێ: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَـى﴾ پـەروەردگار زانیـاری تـەواوی هەیـە دەربـارەی ئـەو کۆرپەلـەی لەسکی مێیینەدا هەیـە، نێـرە یـان مێیـە، یەکێکـە یـان زیـاتر، سـاغە یـان ناتـەواوە، جوانــە یــان ناشــیرینە، چ ڕەوشــتو سروشــتێکی تێـدا هەیـە، تەمـەنی کورتـە یـان درێژە...هتد، وەکوو لەئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿هُـوَ أَعْلَـمُ بِكُـمْ إِذْ أَنـشَأَكُم مِّـنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾الـنجم/٣٢، یـان دەفـەرموێ: ﴿يَخْلُقُكُـمْ فِـي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾الزمر/٦.

جا ئەگەر ئەمڕۆ بـەئامێری سـۆنەرو ڕێبـازی زانـستی جۆراو جـۆر کۆرپەلـە لەناو منداڵدانی دایکیدا بزاندرێ ئاخۆ مێیە یان نێرە، ئەوە نابێتە دژی ئایەتەکەو پێچەوانەی ناوەستێ! چونکە زانیاری خودا تەنیا پەیوەست نیە بەلایەنی مێیینەیی یان نێرینەیی کۆرپەلە، بەڵکوو زانیاری خودا هەموو لایەنێکی دەگرێتەوە، هـەموو ڕەوشتو سروشتێکی بەئەوپەڕی وردی‌و لەناخەوە دەزانێ،

﴿وَمَـا تَغِـيضُ الأَرْحَـامُ وَمَـا تَـزْدَادُ﴾ هـەروەها پـەروەردگار دەزانـێ ئـەوەی منداڵدانی مێیینە کەمی دەکا یان زۆری دەکا، دەزانـێ یەکـە یـان زیـاترە، جەسـتەی

کۆرپەلەکە کەمو کورِی هەیە یان تەواوو کامڵە، ماوەی مانەوەی منداڵەکە لەسکی ـیکی دا کەمتر لەنۆمانگە، یان زیاترە، یان نۆ مانگی تەواوە،

بەگوێرەی لێکۆڵینەوەو ئاماری بڕوا پێکراوی خەستەخانەکانی لەندەنو ـەرلین کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا لە(٣٠٥) رۆژ یان (٣٠٨) رۆژ زیاتر نامێنێتەوە،،

بۆیە ئێستا دادگای شەرعی رێگە نادا کە عیددەی ئافرەتی تەڵاقدراو زیاد ـساڵێکی قەمەری بێ: واتە نابێ لە(٣٥٤) رۆژ تێپەڕ بکا،

﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ هەموو شتێك لای پەروەردگار کاتی دیاریکراوی هەیەو ئەجەلی خۆی بۆ دیاری کراوە، زیادو کەم ناکا، وەکوو لەشوێنێکی تردا ـەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾القمر/٤٩.

لەفەرموودەی راستو رەواندا هاتووە کۆمەڵێك لەنوسامەی کورِی زەیدەوە، ـیوایەتیان کردوە: کە یەکێك لەکچەکانی پێغەمبەر ﷺ کورِێکی لەگیانەڵاودا بوو ـردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە پێی خۆشە لەکاتی گیان دەرچوونیدا تەشریفی ـمادەبێ، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی بۆ کچەکەی ناردەوە فەرمووی: (ان لله ما آخذ، وله ماأعطى، وكل شيء عنده بأجل مسمى فمروها فلتصبر ولتحتسب) بۆ خودایە هەرچی وەری دگرێتەوە، هەرچی دەیبەخشێ، هەموو شتێك لای خودا بەکاتو وەختی دیاریکراوە، پێی بڵێن: با بەئارام بێو داوای پاداش لەخودا بکا،

﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ زانایە بەو شتانەی ئێوەی ئادەمیزاد نایبینن‌و چاوتان دەرکی ناکا، ئەوەتا ئەمرۆ زانستی تازە ئەوەی دەرخستووە کە چەندەها عالەم هەن بەچاو نابیندرێن بەڵکوو بەئامێری دووربینو وردبین (تەلیسکۆب) ـەبیندرێن وەکوو میکرۆبی شێرپەنجەو سیلو زەهریو ئاوەڵەو خرِوێلکەو دەیانو ـەدان میکرۆبی تر، ئەمانە هیچیان بەچاو نابیندرێن بەڵکوو بەئامێری وردبینو ـێشکەوتوو دەرك دەکرێن، هەروەها زاناو ئاگادارە بەسەر شتی پەنامەکیو ئاشکرا

لەوردو گەورە، هەر لەزەرە تا مەجەرە هیچی لێ هون نیە، ئاگاداری هەموو شتێکە لەبوونەوەردا!

﴿الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ﴾ خودایەکی وەهایە لەهەموو شتێك گەورەترە، هەموو شتێك بەنیسبەت خوداوە پچوكو بێ نمودە، بەسەر هەموو شتێکدا بالآدەستە، زانیاری رەهاو بەرفراوانی هەموو شتێکی کۆنترۆڵ کردوە، هەموو شتێکی ملکەچ کردوە، بەخۆشیو ناخۆشی پابەندی فەرمانی بوون!

تێبینی ئەوە دەکرێ: کە ئایەتەکە زانیاری خودای شی کردۆتەوە لەسەرتای ئایەتەکەدا ئەوەی راگەیاند: کە پەروەردگار زانایە بەهەموو جوزئیاتو موفرەدات، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە زانایە بەئەندازەی هەموو شتێك بەسنووری هەموو شتێك، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە پەروەردگار زانایە بەشتە پەنامەکیو نهێنییەکان، زانایە بەو شتانەی کە لەجیهانی غەیبدانو غەیری خۆی کەسی تر هیچیان لێ نازانێ، یان ئەو شتانەی بەخودی هەستەکان هەستیان پێ ناکرێو بەئامێری پێشکەوتوو شتێکیان لێ دەزاندرێ! هەروەها زاناو ئاگادارە بەسەر شتە ئاشکراو نومایانەکاندا، بەکورتی زانایە بەهەموو شتێك، ئاشکراو نهێنی لای ئەو یەکسانە هەموو نهێنیو غەیبێك لای ئەو نومایانە!

دەفەرموێ: ﴿سَوَاءٌ مِنْكُمْ مَنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَنْ جَهَرَ بِهِ﴾ یەکسانە لای پەروەردگار کەسێك قسە بشارێتەوەو نەیدرکێنێ یان بیڵێو ئاشکرای بکا، بەهەر شێوەیەکیان بێ خودا دەیبیسێو ئاگای لێیەتی وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾طه/٧، یان دەفەرموێ: ﴿وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾النمل/٢٥.

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پاكو مونەززەهی بۆ خودایە: کە هەموو دەنگێك دەبیسێ، سوێند بەخودا ئەو ئافرەتەی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ

حەولەی ناو بوو شیکایەتی لەمێردەکەی کرد کە ظیهاری لێ کردبوو، مـن لەپـەنا ـیواری ماڵەوە بـووم قـسەی ئافرەتەکـەم نەدەبیـستن، پـاش ماوەیـەك پـەروەردگار ـیەتی ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تحاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾المجادلة/١ ناردە خوارێ.

ئەمە گفتوگۆیەك بووە لەنێوان خەولەو پێغەمبەردا بووە خودا بیـستویەتی، بێگومان خودا زۆر قسەی پەنامەکیو پەنهانی تر دەبیسێ، ئاگای لەخەتەرەی دڵەو خیانەتی چاو دەزانـێ!! نـەك هـەر ئـەوە بـەڵکوو بەهـەموو نهێنـیو پەنامەکییـەك ئاگادارە ﴿وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ﴾ هەروەها خودا ئاگادارە بەسەر ئەو شـتانەدا کـە ـەکونو کەلەبـەردا لـەتاریکی شـەودا خۆیـان حەشـار داوە، لەهـەر شـوێنێکدا بـن، بەهـەر شـێوەیەك خۆیـان بـشارنەوەو پێیـان وابـێ کـەس نایـانبینێ، خـودا ئاگـای ـێیانەو چاودێریانە.

﴿وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾ هەروەها ئاگادارە بەسەر ئەو شتانەدا: کە بـەروناکایی رۆژ هاتوچوویانە، ئـەوەی لـەتاریکایی شـەودا خۆحەشـار دەداو ئـەوەی بـەروناکایی رۆژ ـەڕو دەچـێ لای خـودا وەکوویـەك ئاشـکران! وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً ـذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾یونس/٦١.

ئەمجار پەروەردگار برێ وەسیلەی چەسپاندنی زانیاری خۆی هەندێ زانـستی گەنجینەی زانیاری خۆی رادەنوێنێ بۆ ئەوەی زیاتر ئادەمیزاد بەخۆیاندا بـچنەوەو بـزانن: کـە هـەموو کاتێـك لـەژێر موراقەبـەی پـەروەردگاردانو نـاتوانن خۆیـانی لێ بشێرنەوە دەفـەرموێ: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ﴾ هەمیـشە بـۆ ئـادەمیزاد چەند فریشتەیەك هەن، کە بەنۆرە چاودێری دەکەن، فریشتەی چاودێری شەوانەی دێنە شوێنی فریـشتەی چـاودێری رۆژانـەی، کـە فریـشتەی رۆژ کاریـان تـەواو بـوو

فریشتەی شەو جێگایان دەگرنەوە، ئەم فریشتانە کردارو گوفتاری ئادەمیزاد بەچاك و خراپەوە تۆمار دەکەن و هەڵی دەگرن؛ چی دەکاو چی دەڵێ خێرا دەیقۆزنەوەو لەسەری تۆمار دەکەن،

ئیمامی بوخاری فەرموودەیەکی پێغەمبەری ریوایەت کردوە، دەفەرموێ: (فریشتەی شەوو رۆژ بۆ چاودێری ئێوە لەناو خۆیاندا نۆرە دەکەن، هەردوو وەجبەکە لەکاتی نوێژی بەیانیو نوێژی عەصردا یەکدەگرنەوە، جا کە دەچنەوە بۆ لای خودای گەورە لێیان دەپرسێ (هەرچەندە خۆی زۆر لەوان ئاگادار ترە بەحاڵی ئێوە) دەفەرموێ: بەچ شێوەیەك بەندەکانی منتان بەجێ هێشت؟ فریشتەکانیش دەڵێن: کە چووینە لایان نوێژیان دەکرد، کە بەجێمان هێشتن خەریکی نوێژ کردن بوون)،

جاوەکوو لەکتێبە تەفسیرە بڕواپێکراوەکاندا هاتووە: ئەم فریشتانە ئەرکی پارێزگاریکردنی ئادەمیزادیان پێ سپێردراوە بەفەرمان و ئیزنی خودا چاودێرییان دەکەن، فریشتەیەك لەپێشەوەو یەکی تر لەدواوەیەتی، دوو فریشتەی تر یەکیان لەلای راستی چاکەکانی دەنوسێ و یەکیان لەلای چەپیەوەیەتی خراپەکانی دەنووسێ، کەوابوو هەموو ئادەمیزادێك بەرۆژ چوار فریشتەی لەگەڵدایەو کۆنترۆڵی هەموو کارو پیشەیەکی دەکەن، ئەمجار لەکاتی نوێژی عەصردا ئەمان بەجێیان دێڵن و چوار فریشتەی تر بۆ شەو دێنە شوێنی فریشتەی رۆژ، ئەمجار لەکاتی نوێژی بەیانیدا نۆرەیان دەگۆڕنەوەو هەر بەو جۆرە نۆرەو ئەرکی خۆیان ئەنجام دەدەن،

لەفەرموودەیەکی تری پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (إن معكم من لايفارقكم الا عند الخلاء، وعند الجماع، فاستحيوهم وأكرموهم).

جا هەر کاتێ ئادەمیزاد زانی: کە فریشتە کردارو گوفتاری تۆمار دەکەن، خۆ لەتاوانکردن دەگرێتەوە، شەرم دەکا پەلاماری شتی حەرام بدا، هەروەکوو چۆن جاری وا دەبێ حەیا لەئادەمیزاد دەکاو لەبەرچاوی ئەوان پێکێشی لەتاوان ناکا،

هەڵبەتە ئایین ئەوەی چەسپاندوە کە فریشتە هەموو کردارو گوفتارێکی ئادەمیزاد تۆمار دەکەن‌و دەینووسن عەقڵیش ئەم کۆنترۆڵکردنە بەدوور نازانێ، بەتایبەتی کە ئەمڕۆ زانست گەیشتۆتە ئاستێك زوربەی کردارو خەرجی ئادەمیزاد بەئامێری پێشکەوتوو کۆنترۆڵ دەکرێ، ئەوەتا: لەشارو شارۆچکەکاندا زۆر بەوردی بەهۆی ئامێری ژمێریارەوە (العدادات) دەزاندرێ هەموو خێزانێك چەند لیتر ئاوو چەند میگەواط کارەبای خەرج کردوە، ئامێری وا هەیە کۆنترۆڵی ئەو مەسافانە دەکا کە بەئوتومبێل‌و فڕۆکەو کەشتی ئاسمانی‌و دەریایی تەی دەکرێ، ئامێری وا هەیە سەر ژمێری شەپۆلی ئاوو هەوا دەکا؛ زۆر بەوردی‌و زانستانە لەم بارەوە زانیاری دەخەنە ڕوو!! تەنانەت ئێستا لەوڵاتە پێشکەوتووەکاندا زۆر بەوردی‌و زانستانە زۆر هەڵس‌و کەوتی ئادەمیزاد سەرژمێری دەکرێ‌و لەکۆمپیوتەردا خەزن دەکرێ‌و کۆنترۆڵ دەکرێ!

هەتا زانست‌و زانیاری پێش بکەوێ، داخوازی بڕواکردن بەتیوری ئایینی بەهێز دەبێ، بیرو بۆچونی عەلمانی‌و مادییەکان جیگایان پێ لەق دەبێ‌و ڕووەو تڕێڵبوون هەنگاو دەنێن!

بەراستی جوانیان گوتووە کە گوتویانە: (ئایین‌و عەقڵ لەئیسلامدا دوو هاورکیفی یەکترین‌و لێك جیا نابنەوە، دوو دۆستی یەکترین‌و کێشەیان تێناکەوێ!!)،

﴿يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ ئەو فریشتانەی کە خودا کردونی بەچاودێرو موراقیب بەسەر ئادەمیزادەوە، ئادەمیزاد دەپارێزن بەفەرمان‌و ئیزنی خودا، هەر

کاتێ ئادەمیزاد تاوانێکی کردو دوعای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن، داوا دەکەن خودا مۆڵەتی بداو خێرا سزای نەدا، بەڵکوو تۆبە بکا.

پەروەردگار بەگوێرەی حیکمەتی خۆی بۆ هەموو شتێکی مەحسووس هۆکاری داناوەو ئاکامی پێوە پەیوەست کردوە، پێڵوی بۆ چاو داناوە بۆ ئەوەی پارێزگاری چاو بکاو شتی وای تێنەچێ زیانی پێ بگەیەنێ! هەر بەو جۆرەش بۆ شتی نادیار (غیر محسوس) هۆکاری داناوە، فریشتەی کردون بەهۆکاری پاراستنی ئادەمیزاد، ئیشی خوداش بێ حیکمەت نین، هەروەها فریشتەی رێزداری کردون بەتۆمارکاری کردەوەی ئێمەی ئادەمیزاد هەرچەندە ئێمە نازانین نووسینەکەیان چیەو چۆنە، پێنوس و مەرەکەبیان چ شێوەیەکە، لەکوێی ئادەمیزادەوەن و حیکمەت لەم نووسینە چیە، لەکاتێکدا خودا بۆ خۆی بەبێ نووسینی فریشتەو موراقەبە کردنیان باش باش دەزانێ ئادەمیزاد چی دەکەن و چ دەڵێن، ئەمە بۆخۆی کارێکی غەیبییەو پێویست ناکا ئێمە هەوڵی زانینی ئەم جۆرە شتانە بدەین، چونکە قورئان لێی بێدەنگ بووە، چاك وایە ئێمەش بەبێ رۆشنایی (نەص) خۆمانی پێوە خەریك نەکەین!

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ پەروەردگار هیچ کاتێك نیعمەت و بەخششی خۆی کە بەگەل و نەتەوەیەکی بەخشیوە ناگرێتەوەو لێیان مەنع ناکا هەتا ئەو گەل و نەتەوە رەوتی خۆیان نەگۆڕن، زوڵم و ستەم لەیەکتری نەکەن، ئاشووب و ئاژاوە بەرپانەکەن، شیرازەی کۆمەڵگای خۆیان تێك نەدەن، هەر کاتێ گەل و نەتەوەکە داب و نەریتی خۆیان گۆڕی و وازیان لەشوکرو سوپاسی خودا هێنا، خوداش نازو نیعمەتی خۆی کە پێی بەخشیون لێیان دەگرێتەوەو تووشی قات و قڕی و تەنگ و چەڵەمەیان دەکاو ئەمن و ئاسایشیان لەناودا هەڵدەگرێ، پشێوی و ئاژاوە دەکەوێتە ناویان.

ئەبو داوودو تیرمیذیو ئیبنو ماجە لەئەبو بەکری صدیقەوە ﷺ ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الناس اذا رأوا الظالم، فلم یأخذوا علی یدیە یوشك أن یعمهم الله بعقاب) هەر کاتێ ئادەمیزاد ستەمکاریان بینی ستەمی دەکردو دەستیان نەگرتو بەرەنگاری نەبوونەوە، لەوانەیە خودا هەموانیان سزا بدا!

ئەم فەرموودەیە مانای ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾الأنفال/٢٥. دەکا

پێداچوونەوەیەکی سەرپێی بەمێژووی ئیسلامیدا لەسەدەکانی رابوردودا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە: کە پەروەردگار وەزعو حاڵی موسوڵمانانی نەگۆڕی لەشکۆمەندیو سەرفرازیو پێشکەوتوویی لەزانیاریو رامیاریو ئابووریو کۆمەڵایەتیدا بۆ ژیانی ژێر دەستەییو بێ هێزیو نەدارایی مەگەر پاش ئەوەی بۆ خۆیان پشتیان لەقورئان هەڵکردو لەکاریان خستو وازیان لەئایینی ئیسلام هێنا، لاسایی بێگانەیان کردەوە، یاسای دەسکردو نەگونجاوی فەرەنسیو رۆمانییان کردە دەستوورو یاسای خۆیان، ئەخلاقو رەوشتی ئیسلامییان روخاو پەیوەندی کۆمەڵایەتیو گیانی هاریکاریو یارمەتیدانی یەکتریان تێدا کزبوو، سەریان لێ شێوا، وڵاتیان داگیر کران، بۆخۆیان بوونە ژێر دەستەو خزمەتکاری داگیرکەران، ئیتر کەڵکی ئەوەیان پێوە نەما: کە ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەوییان بخرێتە ئەستۆ! بۆخۆیان لەخۆیان تێك دا، صیفەتی صاڵحیو راستاڵییان لەخۆیان دارنی خوداش سەروەریو شکۆمەندی لێ ستاندنەوە چونکە خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾الأنبياء/١٠٥، هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الأَرْضَ لِلّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾الأعراف/١٢٨، هەر کاتێ ئادەمیزاد لایەنی تەقواکارییان پاشگوێ خست ئیتر کەڵکی ئەوەیان نامێنێ زەوی ئاوەدان بکەنەوە.

ئەمجار پەروەردگار باسی دەسەڵاتی رەهای خۆی دەکا، هەر کاتێ بیەوێ گەلو نەتەوەیەك سزا بدا هیچ لەمپەرێك نیە بتوانێ بەربەستی عەزابەکە بکا، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءاً فَلا مَرَدَّ لَهُ﴾ هەروەها کاتێ خودا ویستی گەلو نەتەوەیەك تووشی گێرمەو کێشە بکا، قاتو قڕیو نەخۆشیو ئاژاوەو دووبەرەکی بخاتە ناویانەوە، ژێر دەستەییو دەستکورتیو نەهامەتییان بەسەر بێنێ، کەس نیە بتوانێ نەهێڵێ ویستی خودا بێتەدی! کەس نیە جگە لەخودا بتوانێ زیانیان لێ دوور بخاتەوەو سوودو قازانجیان بۆ دەستەبەر بکا، ئەو خودا درۆزنانە، شیاوی خودایەتی نین چونکە هیچیان پێ ناکرێ!

﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ﴾ جگە لەخوا کەسی تر نیە سەروکاری بەرژەوندی ئادەمیزاد بکا، کەس نیە بتوانێ خێرو خۆشییان بۆ بێنێو زەرەرو زیانیان لێ دوور بخاتەوە.

## دیاردەی خودایەتی پەروەردگارو نیشانەکانی دەسەڵاتی

﴿ هُوَ ٱلَّذِی یُرِیكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفࣰا وَطَمَعࣰا وَیُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَیُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَـٰۤىِٕكَةُ مِنۡ خِیفَتِهِۦ وَیُرۡسِلُ ٱلصَّوَ ٰعِقَ فَیُصِیبُ بِهَا مَن یَشَاۤءُ وَهُمۡ یُجَـٰدِلُونَ فِی ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِیدُ ٱلۡمِحَالِ ﴿١٣﴾ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِینَ یَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا یَسۡتَجِیبُونَ لَهُم بِشَیۡءٍ إِلَّا

كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ۩ ﴿١٥﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار بەندەکانی خۆی ترساندن بەوەی هەر کاتێ بیەوێ گەلو نەتەوەیەك تووشی تەنگانەو ناخۆشی بکا کەس نیە بتوانێ ببێتە لەمپەڕو نەهێڵێ ویستەکەی بێتە دی، ئەمجار لێرەدا چەند نیشانەیەك لەسەر باڵادەستی‌و بەتوانایی خۆی رادەنوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ خودایەکی وەهایە هەورەبروسکەتان نیشان دەدا، هەورە بروسکە رامەدەکاو ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دەدا، رێبوارو کاروانچی لێی دەترسێن، خاوەن خەڵەو خەرمان ترسی زیان لێ کەوتن‌و تەڕبوونی دانەوێڵەو توتن‌و مشتاغیان لێ پەیدا دەبێ، ترسی چاوکوێر بوون بەشوعلەی بروسکەکەیان لێ پەیدا دەبێ، ترسی لافاوو زریانیان لێ غاڵب دەبێ! لەهەمان کاتدا ئەوانەی پێویستیان بەباران هەیە بۆ کشت‌و کاڵەکەیان، بۆ پاککردنەوەی کەش‌و هەوای ولاتیان، بۆ تەقینی کانیاوو بیریان خۆشی خۆشییانەو تەماعی خێرو بەرەکەتیان بۆ پەیدا دەبێ، خوا خوایانە هەور بگرمێنێ‌و بروسکە چەخماخە بداو باران دابکا ئیقلیمگیر ببارێ ئەمە حاڵی ئادەمیزادانە بەرامبەر هەموو دیاردەیەکی گشتی دونیایی! بارانبارین سوود بەخشە بۆ ئەوانەی پێویستیان پێیەتی‌و زیانبەخشە بۆ هەندێکی تر عەرەب گوتەنی: (مصائب قوم عند قوم فوائد) کوردیش کە نموونەی یەکێك بهێننەوە کە بەرژەوەندی پارێزراو بێ دەڵێن: (فلان کەس باران ببارێ ئاشی دەگەڕێ، باران نەبارێ جوتی دەگەڕێ!)

﴿وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە هەوری ئاوسی پڕ باران بەدی دێنێ؛ هەورێك کەلەبەر قورسایی بارانی کە تێیدایە لەزەوی نزیك بۆتەوە،

موجاهید دەڵێ: ﴿السَّحَابَ الثِّقَالَ﴾ ئەو هەورەیە: کە بارانی پێیە!

﴿وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ﴾ واتە: هەور کە دەگوڵێنێو دەشریخێنێ بەزمانی حاڵ تەسبیحاتی خودا دەکا، پەروەردگار بەدوور دەگرێ لەهاوەڵو منداڵو خێزانو بێ توانایی، گەردنکەچی خۆی بۆ خودا رادەگەیەنێو ئاماژە بەدەسەڵاتو قودرەتی خودای باڵادەستو زاناو دانا دەکا، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾الأسراء/٤٤.

ئیمام ئەحمەدو بوخاریو تیرمیذیو نەسائیو هی تریش لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکەن: دەفەرموێ: (کان رسول الله ﷺ اذا سمع صوت الرعد والصواعق یقول: اللهم لاتقتلنا بغضبك ولا تهلكنا بعذابك وعافنا قبل ذلك)،

ئیبنو مەردەویهی لەئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە با هەڵی دەکرد، یان دەنگی هەوری دەبیست، رەنگی دەمو چاوی دەگۆڕا، ئەمجار بەهەورەکەی دەفەرموو: پاكو مونەزەهە ئەو خودایەی کە تۆ تەسبیحاتی بۆ دەکەی، دەربارەی بایەکەش دەیفەرموو: خودایە بیکە بەمایەی رەحمەت بۆمان، مەیکەرە مایەی عەزاب!

﴿وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ﴾ فریشتەکان تەسبیحاتی خودا دەکەن لەبەر هەیبەتو جەلالی، بەدووری دەگرن لەوەی هاوەڵو خێزانو منداڵی هەبێ،

﴿وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَنْ يَشَاءُ﴾ خودایەکی وەهایە هەورە بروسکە دەنێرێ، لەو شتانە دەکەوێ کە دەیەوێ لێی بداو بەهیلاکی بەرێ،

﴿وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللّهِ﴾ ئەوانە وێڕای ئەو هەموو بەڵگەو دەلیلانە لەسەر بەتوانایی‌و زانایی‌و دانایی خودا، کەچی کێشەو جیدال دەکەن دەربارەی تاک‌و تەنهایی‌و خودایەتی خودا، ئەمەش دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ چونکە لەوەپێش سەرزەنشتی کافرەکانی مەککەی کرد لەسەر ئەوە: کە داوای موعجیزەو ئایاتی جۆراو جۆریان لەپێغەمبەر کرد: وتیان دەبێ موعجیزەی وەکوو موعجیزەی موساو عیسامان بۆ بێنێ، پێغەمبەریش بەم پەلپانە دڵ ناخۆش بوو، ئیتر پەروەردگار تەسەللای دایەوەو فەرموی: وەنەبێ ئینکاری ئەوانە هەر دەربارەی پێغەمبەرایەتی تۆ بێ‌و بەس! بەڵکوو ئینکاریکردنەکەیان سەری کێشاوە بۆ کێشەو جەدەل دەربارەی خودایەتی پەروەردگار، ئەوەتا لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو بەڵگەو دەلیلانە دەربارەی تاک‌و تەنهایی‌و بەتوانایی‌و زانایی‌و دانایی خودا کەچی کێشە دەخەنەوە لەوەدا کە خودا هاوەڵی هەیەو خێزانی بۆ بەڕەوا دەزانن‌و منداڵی وەپاڵ دەدەن! ئینکاری زیندوبوونەوەو هاتنی قیامەت دەکەن! کەوابێ ئەی پێغەمبەر! تۆ دڵت بەخۆ نەمێنێ‌و خەفەتیان بۆ مەخۆ!

﴿وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ پەروەردگار هەڵمەتی توندو تیژە بۆ دوژمنانی بە خۆیان نازانن تێکیانەوە دەپێچێ، خودا بە تواناو دەسەڵاتە کە سزایان بۆ بنێری‌و نەتوانن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن، بەڵام مۆڵەتیان دەدا تا کاتی خۆی دێ‌و بە گوێرەی حیکمەتی خۆی سزایان دەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان ربك لا يهمل ولكن يمهل) خودای تۆ شت پاشگوێ ناخاو لەبیری ناچێتەوە بەڵام مۆڵەت دەدا بۆ ماوەیەك!

﴿لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ﴾ بانگ کردن‌و پاڕانەوە هەر لەخودا دەکرێ، هەر خودا بەتاك‌و تەنها بزانن بەندایەتیکردن‌و طاعەت هەر بۆ خودا بکەن، هاوار مەکەنە بت‌و صەنەم‌و فریشتەو ئادەمیزاد، هاوار هەر لەخودا بکەن، هەر ئەو هاواری لێ دەکرێ، لەمەشدا جۆرە هەڕەشەیەك لەکافرەکان دەکا: دەفەرموێ: سەرپێچی

فەرمانی پێغەمبەر مەکەن، ئەوەندە تورەی مەکەن دوعاتان لێ بکا، ئەگەر دوعاتان لێ بکا دوعاکەی گیرا دەبێ!

﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ لا يَسْتَجِيبُونَ لَهُمْ بِشَيْءٍ إِلاَّ كَبَاسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى الْمَاءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَالِغِهِ﴾ ئەو خودا درۆزنانەی کافرەکان لەجیاتی خودا دەیانپەرستن و دوعاو نزایان ئاراستە دەکەن، بەهومێدی ئەوەن وەڵامیان بدەنەوە، با چاك بزانن کە وەڵامیان نادەنەوە، دوعایان لێ وەرناگرن بانگیان نابیسن، سودو قازانجیان بۆ ناهێنن، زەرەرو زیانیان لێ دوور ناخەنەوە، بەهیچ جۆرێو بەهیچ شتێك جوابیان نادەنەوە! مەگەر وەکوو وەڵامدانەوەی ئاو بۆ کەسێك کە تینووی بێو دەست رادێرێ بۆ لای ئاو داوای لێ بکا ئاوەکە بێتە ناو مشتیەوەو ئەمجار بگاتە دەمی، خۆ ئاو بێ هەستو شعوورەو ئاگای لەدەست پانکردنەوەی کابرای تینوو نیە، ئیتر چۆن وەڵامی دەداتەوە هەر بەو جۆرەش خودا درۆزنەکانیان هیچ وەڵامێکیان نادەنەوە ئەمە نموونەیەکە خودا هێناویەتەوە بۆ ناهومێدی ئەوانەی جگە لەخودا شتی تر دەپەرستن و دوعاو نزایان ئاراستە دەکەن، چۆن کەسێك دو دەستی پان بکاتەوە بۆ ئاو لەدوورەوەو داوا لەئاوەکە بکا بێتە ناو مشتییەوە بیخواتەوە ئیشەکەی بیهودەیەو رەنج بەخەسارە، ئەوانەش کە عیبادەتی غەیری خودا دەکەن رەنج بەخەسارن و هەر دوعاو پاڕانەوەیەکی ئاراستەیان بکەن نایبیسن و بێ سوودە!

﴿وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلاَّ فِي ضَلالٍ﴾ عیبادەتکردن و پاڕانەوەی کافرەکان بۆ بتەکانیان جگە لەگومڕایی و سەرلێ شێوان و کات بەفیڕۆدان هیچی تری لێ شین نابێ و رەنج بەخەساروماڵوێران خۆیانن، چونکە ئەوانە ئەگەر هاوار لەخودا بکەن وەڵامیان ناداتەوە ئەگەر هاوار لەبتەکانیان بکەن ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە!

ئەمجار پەروەردگار بەیانی عەظەمەت و گەورەیی خۆی دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً﴾ هەر بۆ خودا گەردنکەچ و

سوژدەبەرە هەرچی لەئاسمانەکان‌و زەویدا هەیە؛ فریشتەو موسوڵمانان لەحاڵی خۆشی‌و ناخۆشیدا بەویست‌و هەوەسی خۆیان سوژدە بۆ پەروەردگار دەبەن، کافرو خودا نەناس لەکاتی تەنگانەداو بەناعیلاجی گەردنکەچی خودا دەبن؛ بەڵکوو هەرچی مەخلووقات هەیە لەبوونەوەردا بەئادەمیزادو ئاژەڵ‌و روەك‌و جەماداتەوە گەردنکەچن بۆ ئەو خودایەی بەدیهێناون!

﴿وَظِلالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ﴾ هەروەها سێبەری ئەوانەی سێبەریان هەیە بەیانی‌و ئێوارە سوژدە بۆ زاتی پاکی دەبەن، بەتایبەتی باسی بەیانی‌و ئێوارەی کرد: چونکە لەم دووکاتەدا درێژ بوونەوەو کورت بوونەوەی سێبەری شت ئاشکراو نمایانە، یان مەبەستی ئەوەیە بفەرموێ: هەموو کاتێك ئەم شتانە سوجدە دەبەن‌و گەردنکەچییەکەیان بۆ خودا هەمیشەییە!

هەندێك پێیان وایە سوجدە بردنی سێبەری شتەکان بریتییە لەهەڵکشان‌و داکشانی سێبەرەکان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، کە گۆڕانکارییان تێدا پەیدا دەبێ لەکورتی‌و درێژی بەهۆی بەرز بوونەوەی خۆرو شۆڕبوونەوەی خۆر، ئەمانە هەموو چ ئادەمیزادو چ فریشتەو دارو درەخت‌و جەمادات‌و هەموو شتێکی تر بەخۆیان‌و سێبەریانەوە ملکەچی‌و بەندەیی خۆیان رادەگەیەنن.

## تاك‌و تەنهایی خوداو نموونەی موسوڵمان‌و موشریکەکان لەبەرامبەر تاك‌و تەنهایی خودادا

﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى

ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی بەیان کرد: کە هەرچی لەئاسمانو زەویدا هەیە سوجدە بۆ خودا دەبەن، گەردنکەچی قودرەتو گەورەیی پەروەردگارن، ئەمجار دێتە سەر ڕەتدانەوەی بتپەرستەکان، تاکو تەنهایی خودا دەچەسپێنێ؛ تاکو تەنهایی لەئولوهییەتدا، لەربوبییەتدا، بۆ ئەوەی بیانوویان نەمێنێو دان بەخودایەتی خودادابنێن!

دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ ؟﴾ ئەی پێغەمبەر! بەموشریکەکان بڵێ: کێ بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە؟ کێ خاوەنو هەڵسوڕێنەرییانە؟ کێ ڕایگرتوون؟ ئەم پرسیارە بۆ ئەوە نیە وەڵامی بدەنەوە چونکە سیاقی قورئانەکە لەوەپێش وەڵامی داوەتەوە، بەڵکوو بۆ ئەوەیە: وەڵامەکە بەگوێچکەی خۆیان ببیسن پاش ئەوەی واقیعە کە بەچاوی خۆیان دەبینن، دەبوایە پاش بیستنی ئەم پرسیارە دەمو دەست بڵێن: خودا بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەریانە، جا ئەگەر لەبەر عەنادیو سەررەقییان بێدەنگ بوون، تۆ ئەی پێغەمبەر! بۆخۆت وەڵامەکە بدەرەوە ﴿قُلِ اللَّهُ﴾ بڵێ: بەدیهێنەرو خاوەنو هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکانو زەوی خودای تاکو تەنهایە، چونکە وەڵامەکە ئاشکرایەو هەر ئەو وەڵامەی هەیە، چار ناچارە، بۆخۆشیان ئەگەر لەبەر سەررەقی نەبێ دانی پێدا دەنێن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ؟ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾لقمان/٢٥، ئەمجار پرسیاریان لێ بکە: ﴿قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ

أَوْلِيَاءَ﴾ بڵێ: ئەدی بۆچی جگە لەخودا چەند پەرستراوێکتان بۆ خۆتان بڕیار داوەو لەجیاتی خودا بەندایەتیان بۆ دەکەن؟! بۆچیو بەچ عەقڵێك عیبادەت بۆ خودا ناکەنو خودا ناپەرستن لەجیاتی خودای مەزن چەند خودا درۆزنەیەکتان بڕیار داوەو دەیانپەرستن، لەکاتێکدا ئەو خودا درۆزنانە ﴿لا يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعاً وَلا ضَرّاً﴾ توانای ئەوەیان نیە سوود بەخودی خۆیان بگەیەنن، زیان لەخۆیان دوور بخەنەوە، ئەدی چۆن ئێوە هیواتان پێیانە سوودتان پێ بگەیەننو زیانتان لێ دوور بخەنەوە؟ جا کە ئەوانە توانای هیچ شتێکیان نەبێ دیارە عیبادەت کردنی ئێوە بۆیان ئەوپەڕی نەفامییە، کەسێك عەقڵی هەبێ شتی وا ناکا، کەسێك تۆزێك لێوردبوونەوەی هەبێ، کاری ئاوا ڕەچاو ناکا، پرسیاریان لێ بکە، مەسەلەکە ئاشکراو نومایانە، جوداوازی نێوان حەقو بەتاڵ رونو ئاشکرایە، هەر تۆزێك بیر بکەنەوە، کەمێك وردببنەوە ڕاستییان بۆ دەردەکەوێ، چونکە شتێکی ئاشکرایە ئەوانەی عیبادەت بۆ ئەو خودا درۆزنانە دەکەن وەکوو ئەوانە نین کە عیبادەت بۆ خودای تاكو تەنها دەکەن!؟ ئاشکرایە ئەوانەی خودای تاكو تەنها دەپەرستن بەرچاو روونو هیدایەت دراونو بەنووری خودا هەڵسو کەوت دەکەن!

ئەمجار ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ ؟﴾ پێیان بڵێ: کوێرو بینا وەکوو یەك وان؟؟ کەسێك کوێرو سەرلێ شێواوو بتپەرست بێ وەکوو موسوڵمانی خودا پەرست وایە؟ حاشا حاشا هەرگیز ئەم دووانە وەکوو یەك نینو ناخرێنە تای تەرازوی یەکترەوە! ﴿أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ؟﴾ یان ئایا تاریکیەکانو روناکی وەکوو یەکتر وان؟ نەخەیر هەرگیز ئەمانە وەکوو یەکتر نینو نابن!

مەبەست ئەوەیە: پرسیاری ئەوە بکا ئایا کەسێك هەیە بڕیاری ئەوە بدا: کە کافرو موسوڵمان چون یەکن؟ کوفرو ئیمان وەکوو یەك وان؟ کافر وەکوو کوێر وایە، کوفر تاریکییە، موسوڵمان وەکوو ئادەمیزادی چاو ساغ وایە، ئیمانو باوەڕ نورو روناکییە! ﴿أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ؟﴾ بەڵکوو

گێڕاویانە بۆ خودا چەند هاوەڵێك کە وەکوو خودا مەخلووقاتیان بەدیهێناوە، جا ئەو کاتە دروستکراوی ئەوانو دروستکراوی خودایان لێ تێکەڵاو بوونو بۆیان لێك جیا ناکرێنەوە؟؟ جا: کە چەند هاوەڵێکیان بۆ خودا بڕیارداو صیفاتی خودایان بۆ بەرەوا زانین، وەکوو خودا توانای دروست کردنو بەدیهێنانیان پێدان، ئیتر لێیان تێکچوو وتیان: مادام ئەم بتانەیش شت دروست دەکەن وەکوو خودا، ئەمانیش شیاوی خودایەتینو عیبادەتیان بۆ دەکرێ، کەوابێ ئەوانە عوزریان هەیە!!

ئەمە شێوە گاڵتەپێکردنێکە بەو کافرانە، مەبەستەکەی ئەوەیە: دەفەرموێ: ئەوەی کە ئەوان بۆی چوون بۆچوونێکی هەڵەو بێ بناغەیە! خودا زاتێکە بەدیهێنەرو راگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، کەس لەخودا ناچێ، خودا لەزاتو صیفاتدا بێ وێنەو هاوەڵە، بێ خێزانو ماڵو منداڵە، ئەو موشریکانە چەند بتێك دەپەرستنو کردویانن بەخودا کە هیچیان لەبارا نیە، هیچیان پێ ناکرێ، کافرەکان بۆخۆشیان دان بەوەدا دەنێن: کە ئەو بتانەش مەخلووقاتی خودانو بۆیە دەیانپەرستن تا لەخودایان نزیك بکەنەوە! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾الزمر/٣، کە تەوافی کەعبەشیان دەکرد دەیانگوت: (لبیك لاشریك لك الا شریكاً هو لك، تملكه ومامَلك)،

ئەمجار کە بیرو باوەڕی بەهەڵە حسێب کردنو ئەوەی ڕون کردەوە: کە هیچ بیانوێك نیە بۆ ئەوان کە هاوەڵ بۆ خودا دابنێن ئیتر بڕیاری کۆتایی دەداو دەفەرموێ: ﴿قُلْ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ!﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئێوەشو بتەکانتانو هەموو مەخلووقاتێکی تریشی بەدیهێناوە، ئەگەر تۆزێك جوان بیر بکەنەوە بۆتان دەردەکەوێ: کە خودا تاکو تەنهایە لەئولوهییەتو ربوبییەتدا، هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ کردنە، هەر ئەو شیاوی خودایەتییە، هەر خۆی باڵادەستو خاوەن دەسەڵاتە بەسەر هەموو

شتێکدا، ئیتر ئێوە بەچ عەقڵێك چەند بت و صەنەمێك دەپەرستن کە دارای سوودو زیانیان بۆ خۆیان نیە چ جایی بۆ ئێوە!

بەکورتی پەروەردگار بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەوابێ پێویستە هەموو شتێك گەردنکەچی ئەوبێ، پەروەردگار پێش هەموو شتێك تاك و تەنیاو بێ هاوەڵ و یارمەتیدەرە، بالادەستە بەسەر هەموو شتێکدا، هەرچی بیەوێ دەیکا، هیچ شتێك نیە بتوانێ ببێتە کۆسپ و لەمپەڕ لەبەردەم ویستی خودادا، دەی کەوابێ چۆن ئەو خودایە شەریکی هەیە، چۆن ئەو بتانە شیاوی ئەوەن بکرێن بەشەریکی خودا، هیچ شتێك رایەی ناکەوێ ببێتە هاوەڵی خودا!

زانایانی ئیسلام (ئەهلی سوننەو جەماعەت) ئەم ئایەتەیان کردوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە کە خودا بەدیهێنەری کرداری بەندەکانیەتی و بەندەکان بۆخۆیان بەدیهێنەری کرداری خۆیان نین، چونکە ئەفعالی عیباد جۆرێکە لە(شيء) ئایەتەکەش دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾، ئادەمیزاد تەنها کەسب و ئیختیاری هەیە،

موعتەزیلە دەڵێن: ئادەمیزاد بەدیهێنەری کردەوەی خۆیەتی، وەلێ بەدیهێنانەکەی وەکوو بەدیهێنانی خودا نیە.

## نموونەی حەق و بەتاڵ و سەرەنجامی بەختیاران و بەدبەختەکان

﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًاۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ

فَيَذْهَبُ جُفَآءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾ ۞ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار دوو جۆر بانگەوازی بەیان کردن؛ بانگەوازی حەقو بانگەوازی بەتاڵ، بانگەوازی خودا حەقو راستە، بانگەوازیکردن لەو خودا درۆزنانەی کافرەکان دەیانپەرستن بانگەوازی بەتاڵو پووچە، ئەمجار تەشبیهی موسوڵمانو کافرو بڕواو کوفری کرد بەبیناو کوێرو روناکیو تاریکییەکان، بەشوێن ئەوەدا نموونەیەکی تر دەهێنێتەوە بۆ ئیمانو کوفر! نموونەیەك دەهێنێتەوە بۆ حەقو حەقخوازان، نموونەیەکیش بۆ بەتاڵو هەوا خواهانی، نموونەی حەقو حەقخوازانی لەبەر دەوامیو بەسوودیدا بەئاو هێنایەوە کە لەبەرزاییییەوە دەبارێو سوود بەزەویو ئادەمیزادو ئاژەڵو روەك دەگەیەنێ!

هەروەها شوبهاندی بەکانو مەعدەن کە سودی لێ وەردەگیرێ بۆ خشڵو ئامێری جۆراو جۆر، لەو کانو کانزایانە شتی بەقیمەتو بەهای گران دەردەهێندرێنو ئادەمیزاد کەڵکیان لێ وەردەگرن!

نموونـەی بـەتاڵیش لـەخێرا فـەوتانو بـێ سـوودیدا دەشـوبهێنێ بەوکـەفو خشتو خاڵەی کەبەسەر لافاوەکەوەیە! یـان بـەو کـەفو خـشتو خاڵەی دەکەوێتـە سەر بۆتەو مەنجەڵی کانزا توانەوە لەکاتی توانەوەو لەبۆتـەدانی کـانزا بەنرخـەکان دا.

دەفەرموێ: ﴿أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا﴾ واتـە: پـەروەردگار لەهـەورەوە بـاران دەبـارێنێ، هـەموو شـیوو دۆڵێـك بەئەنـدازەی خـۆی لافـاوی تێـدا هەڵدەستێ، بەگوێرەی کەمو زۆری ئاوی هەر شیوێك لافاو دێ!

جا ﴿فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَابِياً﴾ ئـەو لافـاوە بـەگوێرەی ئـەو شـوێنەی پێیـدا تێدەپەڕێ خەوشو چیلکەو چەوێڵو کەفو خشتو خـاڵ رادەداو بەسـەر خۆیـەوە هەڵی دەگرێو بەسەر ئاوەکەوە بەرز دەبێتەوە،

ئەمە نموونـەی ئەوەیـە: کـە ئەصـڵێك هەیـە وەکـوو بارانەکـە کـە بەهـەزاران جۆر سـوودی هەیـە بـۆ ژینگـەو ئـادەمیزادو ئـاژەڵ، فـەرعێکیش هەیـە: کـە کـەفو خـشتو خـاڵو چـیلکەو چـەوێڵەکەیە لەئـەملاو ئـەولای شـیوەکەدا بەزایـە دەڕواو بەکاری هیچ نایەو دەفەوتێ،

باران لەئاسمانەوە دەبارێو لافاو هەڵدەستێو لەرێگـەی خۆیـدا هـەر خـشتو خاڵێکی وەبەربێ رایـدەداو دەیخاتـە سـەر خـۆی، لەشـێوەی کـەفو خـشتو خـاڵێکی فشەڵدا خۆی دەنوێنێ، تەنانـەت جـاری وا دەبـێ ئـەو کـەفو خـشتو خاڵـە ئاوەکـە دادەپۆشێ، ئاوەکـە لەژێریـەوە دەڕواو سـەرەو ژێـر دەکـشێ، بـەلام ئـەم ئـاوە خێـرو بەرەکەتی پێیەو مایەی ژیانە!

﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ﴾ هـەروەها نموونـەی حەقو ئیمان وەکوو کانزای بەسوودو بەنرخ وەکوو هـی زێـڕو زیـوو ئاسـنو مـسو ئەو جۆرە شتانە وەهایە کە دەخرێنە بۆتـەو مەنجـەڵو کورەوە بـۆ ئـەوەی پاڵفتـە

بکرێن‌و خشت‌و خۆڵ‌و چڵك‌و ژەنگیان پێوە نەمێنێ زێڕو زیوێکی پاڵفتەکراوی بێ خەوشیان لێ جیابکرێتەوە بۆ خشڵ‌و پیاڵەو پەرداخ، یان ئامێری پێداویستی بۆ کاروباری ژیانیان لێ بەرهەم بێنرێ لەئاسن‌و مس‌و فافۆن‌و ئەو جۆرە شتانە، چونکە بەهۆی ئاگرەکەوە چڵك‌و پیسییەکە جیا دەبێتەوەو مادەکە بەپاکی‌و پاڵفتە کراوی دەمێنێتەوە، جا لەکاتی توانەوەو لەبۆتەداندا ژەنگ‌و خشت‌و خۆڵ‌و پیسایی سەردەکەوێ‌و مادەکە دادەپۆشن، ئەمەش نموونەی شتی بەتاڵ‌و پووچە، شتە ئەصڵەکە دەشارێتەوەو دایدەپۆشێ بەڵام بەرقەرار نابێ‌و زوو وەلا دەخرێ‌و فڕێ دەدرێ! مادە ئەصڵەکەش دەهێڵدرێتەوەو سوودی لێ دەبینندرێ! تەنانەت جاری وا دەبێ وا گومان دەبرێ: کە مادە ئەصڵییەکە هەر نەماوەو فەوتاوەو ڕۆچووە، بەڵام لەڕاستیدا باقییەو هەر ئەو سوود دەبەخشێ وەکوو ئەو ئاوەی مایەی ژیانە بۆ زەوی‌و بۆ گیانلەبەران، یان وەکوو ئەو کانزایەی سوود دەبەخشێ بەئادەمیزاد!

﴿كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ﴾ ئاواو بەو جۆرە خودای زاناو دانا پەندو نموونە دەهێنێتەوە، نموونەی حەق‌و بەتاڵ دەخاتە ڕو، حەق‌و ڕاستی لەجێگیر بوون‌و سوود بەخشیدا وەکوو ئاو وایە کە بەناخی زەویدا دەڕواتە خوارێ‌و کانیاوو جۆگەو جۆبار پێك دێنی‌و دەبێتە مایەی زیندوبوونەوەی تەبیعەت‌و هۆی ژیانی گیانلەبەران، یان وەکوو مەعدەنێکی پاڵفتە کراوی بێ خەوش وایە: کە ئادەمیزاد سوودی لێ دەبینن،

بەتاڵیش لەزوو بەسەر چون‌و بێ سوودیدا وەکوو ئەو چڵك‌و کەف‌و خشت‌و خاڵە وەهایە کە لافاو بەم لاو بەولای خۆیدا دەیپرژێنێ، هەروەها وەکوو چڵك‌و ژەنگ‌و خەوشە وەهایە کە لەکاتی لەبۆتەدانی کانزادا سەردەکەوێ‌و مادە ئەصڵەکە دادەپۆشێ، کەوابێ بەتاڵ لەبەردەم حەقدا خۆناگرێ‌و بەردەوام نابێ!

هەر بەو شێوە ئاکامی بانگەوازیی‌و ئاکامی بیرو باوەڕو ئاکامی کردارو گوفتار دیاری دەکا، بانگەوازی حەق‌و باوەڕی ڕاست‌و کردارو گوفتاری باش

دەمێننەوەو سوود بەخش دەبن، بانگەشە بۆ بیرو باوەڕی بەتاڵو ناحەقو کرداری خراپو گوفتاری ناشیرین بڵقی سەر ئاوەو پایەدار نیەو زوو دەفەوتێو شکست دێنێ! ئەو کاتەی بەردەوامیشە بێ سوودو زیانبەخشە!

جا ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً﴾ ئەو کەفو خشتو خۆڵەی وا بەسەر ئاوەکەوەیە یان کانزاکەی داپۆشیوە ئەوە دەپوکێتەوەو بەم لاو بەولای ڕاڕەوی لافاوەکەدا دەپرژێو لەناودەچێ، بادەیبا، کونو کەلەبەر دەیانگرنەوە! ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ﴾ ئەوەی سوود دەگەیەنێ بەئادەمیزاد لەئاوو کانزاکە ئەوە دەمێننەوە؛ ئاوەکە بەکار دەهێندرێ بۆ خواردنەوەو پێداویستی تری گیانلەبەران، کشتو کاڵی پێ ئاو دەدرێ ئاشی پێ وەگەڕ دەکەوێ، کارەبای لێ دروست دەکرێ...هتد، کانزاکەش سوودی لێ وەردەگیرێ یا دەکرێتە خشڵو ئامێری جوانیو خۆڕازاندنەوە، یان ئامێری پێداویستی بۆ ژیانی لێ دروست دەکرێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾الحديد/۲۵.

زججاج دەفەرموێ: نموونەی موسوڵمانو بیروباوەڕیو سوودی ئیمانی بۆ خۆی وەکوو ئاوێك وایە کە سوودی هەیە بۆ گژو گیاو ژیانی هەموو شتێك، هەروەها وەکوو سوودی زێڕو زیوو باقی کانزا بەنرخەکان وایە سوودیان بۆ ئادەمیزاد هەیە! نموونەی کافرو کوفرەکەی وەکوو کەفو خشتو خۆڵو چیلکەو چەوێڵی سەر لافاو وایە سوودی بۆ کەس نیە، یان وەکوو ژەنگی ئاسنو چڵکو خشتو خۆڵی تێکەڵاو بەکانزاکان وایە کە هیچ سودێکیان لێ وەرناگیرێ!

﴿كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ﴾ وەکوو چۆن ئەم نموونەو پەندانەمان هێنانەوە، کە ئەو شتانەی ئادەمیزاد لێیان چەواشە بووە بۆیان روون دەکەینەوە، جوداوازی نێوان حەقو بەتاڵیان بۆ دەکەین، ئیمانو کوفریان بۆ لێك جیا دەکەینەوە، هەر بەو شێوە لەهەموو بوارو لایەنێکەوە نموونە بۆ ئادەمیزاد

دەهێنینەوە هەتا رێگەی هیدایەتیان بۆ رون بێتەوەو پێیدا برۆن، رێگەی چەوت‌و بەتاڵ بناسن‌و لێی دوور بکەونەوە، بۆ ئەوەی بەختەوەری دونیاو قیامەت بەدەست بێنن، موسوڵمانان ببنە ئەو تاقم‌و دارو دەستەیەی خۆشی‌و کامەرانی بۆ ئادەمیزاد دەستەبەر دەکەن! وەکوو لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ ئێوە باشترین گەل‌و نەوەیەکن هێندراونە گۆڕەپانی ژیانەوە، رەوشتتان وایە فەرمان دەکەن بەچاکەو نەهی دەکەن لەخراپە.

لەصەحیحی بوخاری‌و موسلیم فەرموودەیەك هەیە ئەبو موسای ئەلئەشعەری ریوایەتی کردوە؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نموونەی ئەو ئایین‌و پەیامەی منی پێ رەوانەکراوە لەهیدایەت‌و زانیاری وەکوو بارانێك وایە: کە لەزەوییەك دەبارێ، هەندێ لەو زەوییە سوود لەبارانەکە دەبینێ‌و گیاو گژ وەبەرهەم دێنێ، هەندێکیشی روتەن‌و چەقەنە گیای لێ ناروێ ئاوەکە عەمبار دەکاو کانی‌و کارێزی لێ هەڵدەقوڵێن، بۆ خواردنەوەو ئاودێری پێویستی تری ژیان ئادەمیزاد سوودی لێ دەبینن، هەندێکی تر لەبارانەکە لەخاڵێك دەبارێ دەشتێکی لبەلان‌و روتەنە نە ئاوەکە لەخۆ دەگرێ، نەگیاو گژی لێ شین دەبێ، ئەمە نموونەی ئەو کەسانەیە لەئایین حاڵی بوون‌و خودا سودمەندی کردون بەم پەیامەی من‌و بۆخۆیان لەئایین حاڵی بون‌و خەڵکی تریش فێر دەکەن، هەروا نموونەی کەسانێکیشە کە ئایین کاری تێ نەکردوون هیدایەتی یەزدانییان وەرنەگرت‌و سوودییان لەپەیامی من وەرنەگرتووە).

ئەمجار پاش ئەوەی پەروەردگار حەق‌و بەتاڵی روون کردەوە دەست دەکا بەرونکردنەوەی سەرەنجامی حەقخوازان‌و بەتاڵدۆستان، بەمەبەستی هەڵنان‌و تەرغیب کردنیان بۆ کاری چاکەو ترساندنیان لەخراپەکاری، بۆ بانگەوازیکردنیان بۆ رێبازی خێرو حەق‌و راستی‌و دوورخستنەوەیان لەرێبازی گومڕایی‌و بەتاڵ! دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمُ الْحُسْنَىٰ﴾ هەیە بۆ ئەوانەی فەرمانبەرداری

فەرمانی خوداو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی دەکەون، بڕوا بەناییینەکەی دەکەن، پاداشتی بەهەشتیان دەدرێتێ، پاداشی بەختەوەری و دوور لەهەموو ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەیەك پاداشی بەهەشتی رازاوەو بەردەوام و نەبڕاوە، وەکوو لەشوێنێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْراً﴾الكهف/٨٨، ئەمە سەرەنجامی حەقخوازان بوو،

ئەمجار دێتە سەر باسی بەتاڵ دۆستان و دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً وَمِثْلَهُ مَعَهُ لافْتَدَوْا بِهِ﴾ ئەوانەی فەرمانبەرداری خودا نابن پابەندی فەرمان و نەهیەکانی نین، شوێن پەیامی پێغەمبەر ناکەون ئەگەر ئەوەی لەجیهان دایە رۆژی قیامەت ملکی ئەوان بێ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێ دەیکەنە فیدیەو بەدەڵی سزای قیامەت، بەڵام هیچ سودیان پێ ناگاو کەڵکی لێ وەرناگرن و لێیان وەرناگیرێ واتە: بۆیان ناکرێ و ناگونجێ لەرۆژی قیامەت دا پڕ بەزەوی و وەندەی تریشی لەگەڵدا بێ لەزێڕو زیو بیکەن بەفیدیە، ئەگەر ئەوەندەیان ملك و ماڵ هەبێ دەیدەن بەفیدیە، بەڵام نەهەیانەو نەدەیانبێ لەهەرزێکدا ئەگەر بشیان بێ لێیان وەرناگیرێ.

﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ﴾ ئەوانەی: کە ئیطاعەی خودایان نەکردووەو وەڵامی پەیامی پێغەمبەریان نەداتەوە، لەقیامەتدا سزای سەختیان دەدرێ و لەسەر هەموو خراپەیەکیان کەم بێ یا زۆر حیسابیان لەگەڵ دەکرێ، لەهیچ شتێکیان خۆشبوون نیە، کەسێکیش موناقەشەی لەگەڵ بکرێ و لێخۆشبونی خودا نەیگرێتەوە، سزا دەدرێ! پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (من نوقش الحساب عذب)،

﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ سەرەنجامیان سزای ئاگری دۆزەخە، دۆزەخیش خراپترین جێگەیە بۆ حەوانەوە، ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تیژە، ترساندنێکی سامناکە بۆ ئەوانەی بێ ئاگان لەفەرمان و نەهیەکانی خودا، شوێن پەیامی پێغەمبەر نەکەوتوون،

ئەمجار پەروەردگار بەراوردێك لەنێوان دوو تاقمدا ئەنجام دەدا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى﴾ واتە ئایا كەسێك بزانێ و بڕوای وا بێ ئەو پەیامەی بۆ تۆ نازڵ كراوە لەلایەن خودای خۆتەوە حەق و ڕاستەو گومانی تێدا نیە چەواشەكاری تێدا نیە، هەمووی حەق و ڕاستە، هەندێكی پشتگیری هەندێكی تری دەكا، هەواڵەكانی هەمووی حەقن، فەرمان و نەهیەكانی دادپەروەرانەیە، ئایا كەسێك ئەوە بڕواو هەڵوێستی بێ وەكوو كەسێك وایە كە شارەزای خێر نەبێ و تێی نەگا تەنانەت ئەگەر تێشی بگا گەردنكەچی نابێ و تێی ناگاو شوێنی ناكەوێ ئایا ئەم كەسە وەكوو ئەوی تر وایە؟!

ئیستیفهامەكە ئینكار ئامێزە: واتە: بەڕاستی شتێكی خراپ و ناشیرینە دوای ئەم هەموو بەڵگەو دەلیلانە، دوای هێنانەوەی ئەم هەموو پەندو مەثەلانە، سەرباری هیدایەتی قورئان كەچی شك و گومان هەبێ لەڕاستی پەیامی موحەممەددا! بێگومان هۆی ئەمە كوێریی چاوی دڵە كە حەق نابینن و ڕاست نابیسن!

﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾ ئەوەكوو پەندئامێز دەبێ و عیبرەت وەردەگرێ و بیر دەكاتەوە مەگەر كەسانێك: كە خاوەنی عەقڵی ساغ و بیری وردو تێفكرینی ڕاستن؛ ئەوانەی ژیرانە بیر دەكەنەوەو دانایانەو زانایانە هەڵس و كەوت دەكەن، چونكە كەسێك عەقڵی نەبێ بیر ناكاتەوە تێنافكرێ، كەسێكیش بیر نەكاتەوە ئەوە چاوی دڵی كوێرەو بەسەر لێشیواوی لەناو تاریكایی نەفامی و نەزانیدا دەمێنێتەوە گومڕاو بەدبەختە!!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی حەمزەی كوڕی عەبدولموطەلیب و ئەبو جەهل هاتۆتە خوارێ!

حـەمزە ﷺ نموونـەی خـاوەن بـاوەڕی تـەواوە بـەوەی کـە ئـەو قورئانـەی لەخوداوە بۆ پێغەمبەر هاتووە حەق‌و راستە بەپێی ئەو پەیامـەش هـەڵس‌و کـەوت دەکا، چاوی دڵی روون‌و بینایە، تێگەییشتوو عاقڵ‌و هۆشیارە!

ئەبو جەهلیش نموونەی کافرێکی سەرلێ شێواوی نەزانـە چاوی دڵـی کوێرو نابینایە، گومڕاو بەدبەختـە، هەرچی دەیکا زیانبەخشە بۆخۆی‌و گەل‌و وڵاتـی!!! ئـەم وەصـفانەی کـە لەکۆمەڵـە ئایـەتی داهـاتوودا دێـن وەصـفی خـاوەن عـەقڵ‌و ژیرەکانە پێناسەیان دەکاو پاداشیان رادەگەیەنێ!

## رەوشتی خاوەن عەقڵ‌و فامەکان، بەختەوەرو کامەرانەکان‌و پاداشیان

﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾

ئەم ئایەتانە پەیوەندییان بەئایەتەکانی پێشەوە نومایانە، چونکە رەوشتە جوانەکانی (ألوا الالباب) دەستنیشان دەکا، یان رەوشتی ئەو کەسانە شی دەکاتەوە: کە لەئایەتی پێشوودا بە ﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ﴾ ئاماژەی بۆ کردن، ئەو رەوشتانە دیاری دەکا: هەر کەسێك خۆیان پێ ئاراییش بدا بەختەوەریی دونیاو قیامەت بەدەست دێنێ!

دەفەرموێ: خاوەن عەقڵو فام، تاقمی سەرفرازو حەقخوازو خاوەن باوەڕو شوێنکەوتووی پەیامی پێغەمبەر ئەم کەسانەن کە ئەمە رەوشتو هەڵسو کەوتیانە:

١- ﴿الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ﴾ ئەو کەسانەی پابەندی وادەو بەڵێنی خۆیانن؛ ئەو وادەو بەڵێنانەی خۆیان پێوە پابەند کردوە، کە داننانە بەخودایەتی پەروەردگارو تاکو تەنهایی ئەو زاتە، ئەو بەڵێنو پەیمانەی لەگەڵ خودا بەستوویانە لەعالەمی ئەرواحدا، ئەو پەیمانەی لەگەڵ بەندەکانی خودادا بەستوویانە لەکاروباری ژیانیانداپێوەی پابەندن،

﴿عهد الله﴾ بریتییە لەهەر شتێك بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی ئەو شتەی تێدابێ، واتە هەر شتێك خودا چەسپاندبێتی؛ جا فەرمانو نەهی بێ وەصیەتو ئامۆژگاری بێ، بەکورتی ﴿عهد الله﴾ بریتییە لەپابەند بوون بەهەموو شتێك کە خودا فەرمانی بەئادەمیزاد کردبێ بەکردنی، خۆپاراستن لەهەر شتێك خودا نەهی لێ کردبێ!!

٢- ﴿وَلَا يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ﴾ میثاقو پەیمانی خۆیان هەڵناوەشێننەوە پەیمانی باوەڕ کە لەگەڵ خودا بەستوویانە هەڵی ناوەشێننەوە، ئەو پەیمانو وادەی لەگەڵ ئادەمیزاددا بەستوویانە دەربارەی کڕینو فرۆشتنو بەکرێدانو باقی بوارەکانی ژیان، پووچی ناکەنەوەو پابەندی دەبن،

وەكوو دووڕوو كافرەكان نین كە پەیمانیان دا پابەنـدی نـەبن، ئەگـەر لەگـەڵ یەكێكدا كێشەیان بوو زمان پیس‌و جنێوفرۆش بن، ئەگەر قسەیان كرد درۆ بكەن، كە سپاردەیان لادانرا خیانەتی تێدا بكەن!

لەراسـتی‌دا ئـەم دوو خاڵـە هـەردوكیان یـەك واتایـان هەیـەو دوو چـەمكی هاوتـەریبی یـەكترین هەرچـەند یـەكیان ئیثبـاتـەو ئـەویتریان نەفیـە، كـەوابوو دەتوانین بڵێین: پەیمان هەڵنەوەشاندنەوە تەئكیدە بۆ پابەندبوون بـەوادەو بـەڵێن، یان بڵێین: ﴿وَلا يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ﴾ تەئكیدو دووبارەكردنەوەیە بۆ خاڵی یەكەم: كە ﴿الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ﴾ یە،

قەتادە دەفەرموێ: پەروەردگار باسی پابەند بوون بەوادەو بەڵێنی لەبیـستو ئەوەنـدە شـوێنی قورئـاندا تۆمـار كـردوە، ئەمـەش نیـشانەی ئەوەیـە: كـە وەفـا بەعەهدو پەیمان پابەندبوون بەوادەو بەڵێن رەوشتێكی زۆر پەسندو گرنگە!

٣- ﴿وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾ ئەوانەی هەرچی خـودا فـەرمانی كـردوە بەپەیوەسـتبوون پێیـەوەو نـەی كـردوە لـەدابڕینی ئـەنجامی دەدەن؛ وەكـوو یارمەتیدانی ئایینی خوداو پـشتگیریكردن لەپێغەمبـەر ﷺ لـەجیهادو بانگەوازی‌دا، هەوڵـدان بـۆ بڵاوكردنـەوەو شـیكردنەوەی ئـایینی ئیـسلام، هـەروەها ئەنجامـدانی صیلەی رەحم‌و هاتوچۆی خزم‌و كەس‌و كارو هەواڵپرسییان،

لەصـەحیحی موسـلیم‌و بوخـاری‌دا فەرموودەیـەك هەیـە ئەنـەس ریوایـەتی كردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أحب ان يبسط له في رزقه، وينسأ لـه في أثره، فليصل رحمه) كەسێك پێی خۆشە رزق‌و رۆژیـی گوشادبێ‌و تەمـەنی درێـژ بێ باصیلەی رەحم بەجێ بێنێ،

هەروەها چاكە كردن لەگەڵ هەژارو ئاتاجان، فریاكەوتنی لێقـەومان دەچێتە چوارچێوەی صیلەی رەحمەوە،

٤- ﴿وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ﴾ ترسی سزای خودای خۆیان هەیە، هەرچی دەیکەن‌و دەیڵێن لایەنی خودای تێدا ڕەچاو دەکەن، دان دەنێن بەگەورەیی خوداو تاک‌و تەنهایی زاتی پێچوونی دا، چونکە ئەوان خودا ناسن دەزانن خودا دەبێ چۆن بێ، دیاریشە هەتا ئادەمیزاد زاناتر بێ دەبێ لەخودا ترس تر بێ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾فاطر/٢٨.

٥- ﴿وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ﴾ دەترسن لەچەندو چون لەگەڵدا کردنی حیسابی قیامەت، دەترسن لەموناقەشەی کاتی لێکۆڵینەوەی ڕۆژی ڕەستاخیز، چونکە وەکوو لەمەوپێش وتمان: کەسێك لەحیساب لەگەڵ کردندا موناقەشەی لەگەڵ بکرێ سزا دەدرێ، بۆیە ئەو خاوەن عەقڵ‌و فامانە خۆیان موحاسەبەی خۆیان دەکەن پێش ئەوەی حیسابیان لەگەڵ بکرێ، کەسێکیش بترسێ لەحیساب لەگەڵ کردن ڕوو دەکاتە خوداپەرستی‌و خۆی لەتاوان دەپارێزێ،

٦- ﴿وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ﴾ ئەوانەی خۆڕاگرن لەکاتی بەڵاو تەنگ‌و چەڵەمەدا، بەردەوامن لەسەر طاعەت‌و خوداپەرستی، دوورە پەرێزن لەتاوان‌و تاوانکاری، هەرچی تاعەت‌و خودا پەرستییە ئەنجامی دەدەن، خۆ دەپارێزن لەهەر شتێك نافەرمانی خودای تێدا بێ، ڕازین بەقەزاو قەدەری خودا، خۆڕاگرییان لەبەرامبەر بەڵاو موصیبەتدا لەبەر خاتری ڕەزامەندی خودایە، بۆ بەدەست هێنانی پاداشی باشی پەروەردگارە، بۆ ڕیبابازی‌و ناوو شۆرەت نیە،

٧- ﴿وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾ ئەوانەی نوێژەکانیان بەرێك‌و پێکی ئەنجام دەدەن، بەئاگاداری دڵ‌و ترسی خوداوە نوێژەکانیان دەکەن،

٨- ﴿وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ لە بڕێ لەو ڕزق‌و ڕۆزییەی پێمان داون بەگوێرەی پێویست بەئاشکراو بەنهێنی دەبەخشن! جا هەر چەند ئەم خاڵە دەچێتە چوارچێوەی خاڵی سێیەمەوەو بەشێکە لە ﴿مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾ وەلێ

کەبە خاڵێکی سەربەخۆ راینواندو دەست نیشانی کرد لەم رووەوە: کە ماڵبەخشین پەیوەندی نێوان بەندەکان پتەو دەکا، لەبەر خاتری خودا یەکیەتیو تەباییان لەنێودا بلاو دەکاتەوە، دڵو دەروونی ماڵبەخش لەرزیلیو رژدی پاڵفتە دەکا، دڵو دەروونی ماڵ پێ بەخشراو لەبەخیلیو حەسوودی پاك دەکاتەوە، کۆمەڵگایەکی پوختو خاوێنو هەم ئاهەنگو هاریکار پێك دەهێنن،

٩- ﴿وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ﴾ بەچاکە خراپە رەت دەکەنەوە لەهەڵسو کەوتی رۆژانەیاندا (نەك لەئاییینی خودادا) بەچاکە بەرەنگاری خراپە دەبنەوە، بەحیلمو لەسەرەخۆیی روبەرووی نەفامی دەبنەوە، بەصەبرو خۆڕاگریی بەرەنگاری ئەزیەتدانی خراپەکان دەکەن! وەکوولەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً﴾الفرقان/٦٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَاماً﴾الفرقان/٧٢.

ئیمام ئەحمەد لەئەبو زەڕەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اذا عملت سيئة فاعمل بجنبها حسنة تمحها) ئەگەر خراپەت لێ رودرا تاوانێکت ئەنجامدا خێرا بەشوێنیدا چاکەیەك بکە دەیسڕێتەوە،

لەریوایەتێکی تردا ئەحمەدو تیرمیذیو بەیهەقیو حاکم لەئەبو زەڕەوە ریوایەت دەکەن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (واتبع السيئة الحسنة تمحها، وخالق الناس بخلق الحسن) بەشوێن خراپەدا چاکە بکە دەیسڕێتەوە، لەگەڵ ئادەمیزاداندا رەوشتت جوان بە، بەرەوشتی جوانو شیرین تێکەڵاوی خەڵك بکەو هەڵسو کەوتیان لەگەڵ بنوێنە!

ئەوەی ئاشکراو چەسپاوە مامەڵەکردنی باش لەگەڵ خراپەکار بەرەنگاریکردنی خراپە بەچاکە بەسوودترەو کاریگەر ترەو سەرەنجامی سەلامەت ترەو رقو کینە دەپوکێنێتەوە،

هەڵبەتە بەرەنگاریکردنی خراپە بەچاکە کاتێك پەسندە، کە خراپە پووچەڵ بکاتەوەو خراپەکەر بەخۆیدا بشکێتەوە، نەك لەخۆی بایی بێ‌و پێی لێ هەڵبڕێ، ئەگینا کاتێك خراپە پێویستی بەریشەکێش کردن بوو پێویست بوو رەت بکرێتەوە نابێ بەچاکە بەرامبەری بکرێ، دەبێ بەگژیدا بچیەوەو قەلاچۆی بکەی، بۆ ئەوەی خراپەکار لەخۆی بایی نەبێ‌و بەرز بێتەوە بەرەورووبوونەوەی خراپە بەچاکە زوربەی کات کە پەسندە لەبواری مامەڵەکردنی دوو کەس دایە لەکاروباری دونیاییدا بەلام لەبواری ئایینی خودادا نابێ بەرەنگاری لوتبەرزو خراپەکاران بەچاکە ئەنجام بدرێ، چونکە ملهورو سەررەق‌و نەفام دەمکوتانەوەیان پێویستە، قەلاچۆکردنیان گەرەکە، ئاشوبگێران، فیتنە جۆیان هەڵس‌و کەوتی چاکە ئامێز لەگەڵیاندا سوودی نیە، دەبێ بەدەستی پۆلایین لێیان بدرێ کورد وتەنی (شەرحی ماری بەداری) تەوجیهی قورئان لێرەدا کەوا بەموطلەقی هاتووە، تەحدیدی ئەوەی نەکردوە کەی خراپە بەچاکە پاساو دەدرێتەوەو کەی خراپەکار دەمکوت دەکرێ‌و ریشەکێش دەکرێ، بەڵکوو ئەمەی هێشتۆتەوە ئادەمیزادەکان بۆخۆیان لەهەڵوێستەکان وردببنەوە، عەقڵی خۆیان بخەنە گەڕو تەصەروف بکەن بەجۆرێك کە خێرو خۆشی کۆمەڵگای تێدا بێ‌و خێرو صەواب بێ.

دوای ئەوە پەروەردگار وەصفی موسوڵمانە عاقڵ مەندەکانی بەو نۆ صیفەتانە کرد: کە باسمان کردن، ئەمجار دێ پاداشی دونیاو قیامەتیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ ئەوانەی ئەوە رەوشتیانەو ئاوا هەڵس‌و کەوت دەکەن سەرەنجامی باشیان هەیە، خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان دەست دەکەوێ؛ لەدونیادا زاڵیان دەکەین بەسەر دوژمنداو لەقیامەتیشدا بەهەشتیان بەخەلات دەدەینێ، ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەو سەرەنجامە باشە بریتییە لەچەند باخ‌و باخاتێك کە شوێنی مانەوەی هەتا هەتاییانەو هەرگیز لێی دەرناچن، خۆیان دەچنە ئەو بەهەشتەوەو ﴿وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ﴾ هەروەها

باوكو باپیره صالحهكانیانو خیزانو نهوهیان؛ ئهوانهی لهدونیادا كردار باشو خاوهن باوهرو رهفتار پهسهند بوون بهمهش زیاتر كهیفیان خۆش دهبیو مالو خیزانیان یهكدیگیر دهبنهوهو بهبینینی یهكتری دل شادیو بهختهوهرییان زیاد دهكا، ئیتر دهست دهكهن بهیادكردنهوهی ژیانی دونیایانو حالو وهزعی رابوردوویان شوكرو سوپاسی خودا دهكهن كه لهو وهزعه رزگاریان بووه لهژیانی زهحمهتهوه كهوتوونه ناو ژیانی رهحمهتهوه،

ئایهتهكه ئاماژهی ئهوهی تیدایه: كه بنهمالهو نهسهبو رهچهلهك بهبی كردهوهی چاك چ نرخیكیان نیه، باوكو دایكو كچو كورو نهوه بهكردهوهی خۆیان نهبی ناچنه بهههشتهوه وهكوو قورئان لهشوینیكی تردا دهفهرموی: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ، إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾الشعراء/٨٨-٨٩، سهرباری خۆشی بهههشتو كۆبوونهوهی خیزانو خزمو كهسو كار ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ﴾ لهههموو لایهكهوه فریشته دیدهنییان دهكهنو پیرۆزبایی چوونه ناو بهههشتو مانهوهی ههتا ههتایی لهتهك راستگۆیانو پیغهمبهراندا لهو بهههشته رازاوهیهدا، جا فریشتهكان پییان دهلین: ﴿سَلَامٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ﴾ ئاشتیو دلنیایی لهرزگار بوون لهسهر ئیوه بی، بههۆی ئهوهی لهدونیادا خۆراگربوون، بهردهوام بوون لهسهر طاعهتو خوداپهرستی، بهلاو موصیبهتو تهنگو چهلهمه كاری لهخۆگری ئیوه نهكرد،

﴿فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ بهراستی ئهم بهههشته پاداشو سهرهنجامیكی فرهخاسهو پیرۆزتان بیو شوینیكی زۆر باشه بۆ حهوانهوهو ژیان تیدا بهسهر بردن،

ئیبنو جهریر دهلی: پیغهمبهر ﷺ ههموو سهری سالیك دیدهنی گۆری شههیدانی دهكردو دیفهرموو: (سلام علیكم بما صبرتم فنعم عقبى الدار) دوا پیغهمبهریش ئهبو بهكرو عومهرو عوسمانیش ئهم سهردانهیان دهكرد.

## ڕەوشتی بەدبەختەکانی ڕۆژی قیامەتو سزادانیان

﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ڕەوشتی بەختەوەرەکانو پاداشی نەبڕاوەی بەهەشتی بۆ دیاریکردن، ئەمجار حاڵی بەدبەختەکانی ڕۆژی قیامەتو ئەو سزایەی بۆیان دانراوە بەیان دەکا، واتە: بەشوێن وادەو بەڵێندا هەڕەشە دەکاو بەشوێن پاداشدا باسی سزا دەکا، ئەمەش دابو نەریتی قورئانە هەر کاتێ باسی دونیای کرد باسی قیامەتیش دێنێ، کە باسی موسوڵمانی کرد باسی کافرانیش دەکا،،هتد، بۆ ئەوەی بەیانو ڕونکردنەوەکانی باشتر کاریگەربنو زیاتر هەڵنەربن بۆ پابەندبوون بەفەرمانو نەهیەکانییەوە،

**لەم ئایەتەدا پەروەردگار وەصفی بەدبەختەکان بەسێ صیفەت دەکا، دەفەرموێ:**

١- ﴿وَالَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ﴾ ئەوانەی پەیمانی خودا هەڵدەوەشێننەوە، ئەو عەهدو پەیمانەی خودا فەرمانی پێ کردوون پابەندی بن کە بریتییە لەئیمان بەخوداو بڕوا بەقودرەتو باقی صیفەتەکانی، هەروا ئیمان بەپێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانییەکانو ئەو پەیمانو بەڵێنانەی کە لەگەڵ ئادەمیزاددا دەیانبەستنو خۆیانی پێوە پابەند دەکەن، کەچی دوایی لێیان پاشگەزدەبنەوە پابەندیان نابن!

هەڵوەشاندنەوەی عەهدو پەیمان ئەوەیە: لەو بەڵگانە وردنەبێتەوە: کە هەبوونی خوداو تاك‌و تەنهایی خودا دەچەسپێنن، یان تێیان دەفکرێ‌و دەزانێ بەڵگەکان حەق‌و راستن بەڵام سەررەقی دەنوێنێ‌و ئینکەبەری دەکاو بەگوێرەی زانیاری خۆی کار ناکا، یان شوبهەو گومان راست دەکاتەوەو پێچەوانەی حەق‌و راستی هەنگاو هەڵدەنێ، کە دەفەرموێ: ﴿مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ﴾ واتە: دوای ئەوەی دان دەنێ بەراستی پەیمانەکەو خۆی پێوە پابەند دەکا، ئەمجار دژی دەوەستێ.

٢- ﴿وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ﴾ هەرچی خودا فەرمانی کردوە بەئەنجامدانی ئەوان نایکەن، هەرچی خودا نەی لێ کردوە ئەوان دەیکەن ، بەکورتی دژی فەرمان‌و نەهیەکانی خودا دەجوڵێنەوە بڕوا بەخودا ناکەن شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی ناکەون، صیلەی رەحم بەجێ ناهێنن، لەگەڵ موسوڵماناندا هاریکارو هەم ئاهەنگ نین، یارمەتییان نادەن‌و پشتگیرییان ناکەن.

٣- ﴿وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾ فەسادو ئاشووب لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوە، کردەوەی پیس‌و ناشرین ئەنجام دەدەن، ستەم لەخۆشیان‌و خەڵکی تریش دەکەن، بانگەوازی بۆ غەیری بەرنامەی خودا دەکەن، ستەمکاری دەرحەق بەگیان‌و ماڵی ئادەمیزادان ئەنجام دەدەن، هەر شتێك ببێتە هۆی وێرانبوونی وڵات ئەوان هەوڵی بۆ دەدەن‌و بانگەشەی بۆ دەکەن، فیتنە جۆو شەڕانی‌و شووم ویست‌و خراپەکارن ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ﴾ ئەوانە نەفرینی خوداو پێغەمبەران‌و فریشتەیان لەسەرە، شیاوی نەفرین لێکردنن، لەرەحمەت‌و سۆزی خودا دوور دەخرێنەوە، لەخێرو خۆشی دونیاو قیامەت بێ بەش دەکرێن.

﴿وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾ ئەوانە سەرەنجامی خراپیان هەیە، دوا رۆژیان سامناکەو شوێنی حەوانەیان دۆزەخە، هەرچی تووشیان دێ خراپەو سزاو تۆڵەیە،، وەکوو لەوەپێش لەئایەتی ژمارە (١٨)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾.

ئەوانـە بـەژیانی دونیـا دڵخۆشـن و باوەشـیان بـەدونیای بـێ بـەقادا کـردوە، هەوڵیان بۆ دەستەبەر کردنی کامەرانی قیامەت و ژیانی بەردەوامی نەداوە، ئەوەیان لەبیر چۆتەوە؛ کە هەر خودا رزق و رۆزیی دەدا، حەزی لێ بێ رزق و رۆزیی بۆ فلان زیاد دەکاو بـۆ فیـساری تـەنگ دەکا، ئـەوە نـازانن یـان دەیـزانن و خۆیـانی لـێ گێـل دەکـەن: کـە هـەموو شـتێك بەدەسـت خودایـە لـەدونیاو قیامـەتدا، ئەگـەر ئـەوان هەوڵیان بۆ قیامەت بدایە بێگومان خودا لە لەززەتی دونیا بێ بەشی نەدەکردن.

## رزق و رۆزیی بەدەست خودایە، هیدایەت لەخوداوەیە بۆ کەسێك ئیمان بەخودا بهێنێ

﴿ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ﴿٢٩﴾ ﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار سـەرەنجامی موسـوڵمانو موشـریکی دیـاری کـرد، ئەمجار ئەوە روون دەکاتـەوە: کە هـەر خـودا رزقو رۆزی دەداو ئەنـدازەداری دەکا، دونیا خانووی تاقی کردنەوەیە، رژانـدنی رزقو رۆزی زۆر بەسـەر کافردا نیـشانەی رێز لێنان نیە، هەروەکوو تـەنگ کردنـەوەی رزقو رۆزی لەسـەر موسـوڵمان نابێتـە بەڵگەی بەکەمزانینی، رزقو رۆزی چ پەیوەندییـەکی بـەکوفرو ئیمانـەوە نیـە، زۆر جـار وا دەبـێ رزقو رۆزی زۆرو فـراوان دەدرێ بـەکافر بـۆ لەخـشتەبردنی، موسوڵمانانیش دەست کورتو ژیانی کولەمەرگی دەدرێتێ بۆ زێدە پاداشو ئەوابی چاك،

ئەمجار باسی پەڵپو بیانووی کافرەکانی قورەیش دەکا: کە لەپێغەمبـەریان دەگرت، پاشـان حـاڵو وەزعـی موسـوڵمانە لـەخودا ترسـەکانو پاداشـیان لای خـوداو سەرەنجامی کافرو موسوڵمانەکان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ﴾ پەروەردگار رزقو رۆزیی دەرێـژێ بەسـەر کەسانێکدا کە مـەیلی لێیـە بیانـداتێ، بـۆ هەنـدێ کەسـیش کـەمی دەکاتـەوە، ئەمـەش حیکمـەتو دادپـەروەریی یەزدانـە، چ پەیوەندییـەکی بـەکوفرو ئیمـانی ئادەمیزادەکەوە نیـە، جـاری وا دەبـێ خـودا رزقو رۆزیـی لەسـەر موسـوڵمان کـەم دەکاتـەوە بـۆ بەتاقیکردنەوەو ئـەجرو ئـەوابی زۆر، بەسـەر کـافریشدا رزقو رۆزی دەرژێـنێ بـۆ لەخـشتەبردنیو کێـشکردنیو بـێ بەشـکردنی لـەرزقو رۆزی بەهەشـت، ئەمـە عەدالەتی یەزدانییە، زۆری رزقو رۆزی بـۆ کـافر نیـشانەی خۆشەویـستیو لـێ رازی بوون نیە، لەهـەمان کاتدا تەنگدەستیو کەمدەرامـەتی موسـوڵمان نیـشانەی ئـەوە نیە خودا ناخۆشی دەوێو سوکایەتی پێ دەکا، وەکوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ، نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾المؤمنون/٥٥ – ٥٦، یان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ﴾الأعراف/١٨٢.

ئـەمجار هـەڵسوکـەوتی موشـریکەکانی مەککـە دیـاری دەکـا: کـە لـەکاتی دەوڵەمەندیو ژیانخۆشییاندا لـەخۆیان بـایی دەبـن، دەفـەرموێ: ﴿وَفَرِحُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ واتە: موشریکەکانی مەککە بەژیانی دونیا کەیف خۆشو تـەردەماخ بـوونو پێیەوە پەیوەست بوونو وا دەزانـن جگـە لـەژیانی دونیـاو لەززەتـەکانی هیـچی تـر نیە، پێیان وایە: ژیان هەر ژیانی دونیایەو بـەس! ﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مَتَاعٌ﴾ بەڵام لەراستیدا خۆشیو ژیـانی دونیـا لەبەرامبـەر ژیـانی قیامـەتدا وەکـوو مەتاعێکی بێ بەقاو کەم بایەخ وایە، شتێکی کەمو هیچو پووچو خێراتواوەیە،

ئیمام ئەحمەدو موسلیمو تیرمیذی لـە(المستورد)ەوە: کـە بـرای بـەنی فیهـرە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ماالدنيا في الآخرة الا كما يجعل أحدكم أصبعه هـذه في أليم، فلينظر بم ترجع، واشار بالسبابة)،

تیرمیـذی لـەئیبنو مەسـعوودەوە ریوایـەت دەکـا، دەڵێ: پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر کوتە حەصیرێك نووستبوو، کە هەستا دیاربوو حەصیرەکە شوێنکەی لەلاپەراسووی پێغەمبەر کردبوو، عەرزیان کرد ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەگـەر رێگـەت بدایـایـە جیگایـەکی نـەرمو نۆڵمـان بـۆ رێـك بخـستیتایە! پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (مـالي وللدنيا، مأنا في الدنيا الا كراكب استظل تحت شجرة، ثـم راح وتركها)، ئـەمن چـم بەسەر دونیاوە هەیـە؟! لەراسـتیدا مـن لـەجیهاندا خـۆم وادەبیـنم وەکـوو سـوارێك لـەرێگا لای دایـە ژێـر سـێبەری درەختێكو تۆزێـك مانـدووی حەسـایەوەو دووایـی بەرێ کەوتو سێبەرەکەی جێ هێشت،

جـا کـە ئـەوەی روون کـردەوە: کـە موشـریکەکانی مەککـە بـەژیانو لـەززەتی دونیا لەخۆبایی بوونو مادە هەستو شـعووری داپۆشـیون، ئەمـەش وای لـێ کـردن: کە داوا لەپێغەمبەر ﷺ بکەن موعجیزەی مادی وایان بۆ بێنێ کە بەڵگە بـێ لەسـەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی، چونکە گەلو نەتەوەیەکی مادە پەرستو نـەفام بـوون

بڕوایان وانەبوو قورئان موعجیزەیە بەڵگەی بەهێزە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد، گەل‌و نەتەوەیەکی ماددی نەزان بوون، مێشك پوتی دڵ داخراوی سەرڕەق‌و بێ گوێی هەڵخەڵەتاو، هێندە لەخۆیان بایی بووبوون پەلپ‌و بیانووی جۆراو جۆریان لەپێغەمبەر ﷺ گرت، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ ؟﴾ واتە: کافرەکانی قورەیش هی وەك عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی‌و هاوەڵانی دەڵێن: ئەوە بۆچی موعجیزەیەکی وەکوو مەعجیزەی پێغەمبەرەکانی پێشوو دانابەزێ بۆ سەر موحەممەد!؟ بۆ پارچەیەك لەئاسمان بەرنابێتەوە بۆ سەرمان؟ بۆچی کێوی صەفا ناکا بەزێڕ؟ بۆچی کێوەکانی دەورو بەری مەککە ڕانامالێ‌و شوێنەکەیان ببێتە باخ‌و باخات‌و شوێنی سەیرانگاو کانیاوی لێ هەڵقوڵێن‌و جۆگەو جۆباریی تێدا بکشێن، دەڵێن: بۆچی موعجیزەی وەکوو حەزرەتی موساو حەزرەتی عیسامان بۆ ناهێنێ؟ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ﴾الأنبياء/٥.

وەکوو ئەوە بڵێی: ئەو کافرانە لەبەر ئینکەبەری‌و خۆبەزلزانی‌و نەفامییان، ئیدیعای ئەوەیان دەکرد: کە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ بەقورئانیشەوە ناچنە ئاستی موعجیزەیەکی وەهاوە شیاوی ئەوەبن ئەوان بڕوای پێ بکەن‌و بەموعجیزەیان دانێن، بۆیە پەلپی موعجیزەی تریان دەگرت،

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە ئەوەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە نازڵکردنی ئایات‌و موعجیزە چ دەخڵێکی بەهیدایەت‌و گومڕابوونەوە نیە بەڵکوو هەموویان بەدەست خودان!

دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ﴾ واتە: چ سوودێك لەموعجیزە هاتنە خوارەوەدا نیە بۆ ئێوە ئەگەر خودا ئیرادەی هیدایەتدانی ئێوەی نەکردبێ، هەر کەسێك وەکوو ئێوە سەرڕەق‌و ئینکار بێ، لەکوفرو گومڕاییدا ڕۆچو بێ، ئەگەر موعجیزەی تریشی بۆ بێنن هەر ئیمان

ناهێنێ، چونکە هیدایەت‌و گومڕایی بەدەست خودایە، بۆیە پێویستە ئێوە لەجیاتی داوا کردنی موعجیزەی تر، لەخودا بپاڕێنەوە هانای بۆ بەرن، دەستی دوعا بەرز بکەنەوەو بنووزێنەوە داوای لێ بکەن هیدایەتتان بدا، چونکە خودا کەسێك مەیلی لێ بێ گومڕای دەکا، وەکوو چۆن ئێوەی گومڕا کرد دوای ئەوەی موعجیزەی وەکوو قورئانی بۆ ناردن، ئەگەر موعجیزەی تریشتان بۆ بنێرێ هەر لەگومڕایی خۆتان دەرناچن، هەروەها کەسێك هیدایەت دەدا کە بۆلای خودا بگەڕێتەوەو هانای بۆ بەرێ، واز لەسەر رەقی خۆی بێنێ‌و روبکاتە ئیسلام‌و گەردنکەچی فەرمان‌و نەهیەکانی خودابێ،

بەکورتی قورئان بۆ خۆی موعجیزەیەکی تەواوو بێ کەم‌و کوڕییە کەسێك قورئانی بۆ بێ بەموعجیزە ئیتر پێویستی بەموعجیزەی تر نیە، جا ئەگەر خودا ئیرادەی هیدایەتدانی ئێوەی بکردایە، وای لێ دەکردن ئیختیاری رێبازی هیدایەتتان بگرتایە بەرو هۆکارەکانی هیدایەتتان دەستەبەر بکردنایە ئیتر ئەو کاتە قورئان دەبوە باشترین مورشیدو هیدایەتدار بۆ ئێوە، بەلام خودا ئێوەی رۆچواندوە لەگومڕاییدا واتان لێ هاتووە ئاوڕ لەهیچ شتێکی تر نادەنەوە، هیچ ئامۆژگاری‌و نەصیحەتێك کارتان تێ ناکا، چونکە بۆخۆتان ئامادەباشی ئیمان هێنانتان تێدا نیە، سەررەق‌و لوتبەرزو گوێ نەبیستن، جا کەسێك ئەمە حالی بێ چۆن رێگای هیدایەت دەگرێتەبەر با هەرچی موعجیزە هەن بۆی بنێردرێن!!

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلآئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللّهُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾الأنعام/١١١، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ﴾يونس/١٠١، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ جَاءتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾يونس/٩٦-٩٧، بەلام کەسانێك روبکەنە خوداو لەبەلگەو نیشانە ئاشکراکانی خودایەتی ئەو وردببنەوە، رێبازی

ڕاستو حەق بگرنەبەر، ئەوە خودا بەرچاویان ڕۆشن دەکاتەوە، دڵیان گۆشادو نورانی دەکاو هیدایەتیان دەدا، ئەوانە حەتمەن بەئاوات دەگەنو خۆشبەختی دونیاو قیامەت بەدەست دەهێنن! وەکوو لەم ئایەتەدا ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەتاکو تەنهایی خودا هەیەو شوێن پەیامی پێغەمبەر کەوتوون، دڵیان ئارامی گرتووەو دڵنیان لەتاکو تەنهایی پەروەردگارو هاتنی وادەو بەڵێنەکانی، پشتیان بەخودا بەهێزەو هەمیشە چاوەڕوانی ڕەحمەتی بەرفراوانی یەزدانن، ئەگەر شكو گومانێکیان بۆ پەیدابێ، خێرا بەبەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆر گومانەکەیان دەرەوێننەوە، لەنیشانەو دیاردەکانی کائینات ورد دەبنەوە، دان بەخودایەتی خوداو تاکو تەنهاییدا دەنێن، بەیارمەتیدەرو چاودێری خۆیانی دەزانن ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ ئاگادار ببنەوە هەمیشە بەیادی خوداو خۆ تەسلیم کردنیو پابەند بوون بەفەرمانو نەهیەکانی دڵەکان ئارام دەگرنو ختوکەو قەلەقو ڕاڕاییو چەواشەییان تێدا نامێنێ، ڕاڕاییو غەمو ناڕەحەتی لەو دڵانەدا جێگایان نابێتەوە کە پەیوەستن بەذیکری خوداوە، هەر کاتێ موسوڵمانی ڕاستاڵ وادەو بەڵێنی خودای خۆی یاد بکاتەوە، پاداشو ڕەحمەتی خودا بێنێتە ناو دڵو دەروونی خۆیەوە ئارامییەکی یەزدانی ناو دڵو دەروونی ئاوەدان دەکاتەوەو دڵی ئارام دەگرێ! بەرچاو ڕوونو ڕەفتار باشو کردار پەسند دەبێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾الزمر/٢٣، موسوڵمانی ساغ هەر کاتێ سزاو تۆڵەی خودای بیر کەوتەوە ترسی خودای لێ پەیدا دەبێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾الأنفال/٢.

ئەمجار پەروەردگار پاداشی موسوڵمانە دڵ بەئارامەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ طُوبَى لَهُمْ وَحُسْنُ مَآبٍ﴾ ئەوانەی

بڕوایـان بـەخودا کـردوەو شـوێن پـەیامی پێغەمبـەر کـەوتوون، کـردەوەی چـاکو پەسندیان ئەنجام داوە، ئەوانە کەیفخۆشیو تەڕدەماخیو چاو فێنکیـان لای خـودا بۆ تەرخان کراوە، ژیانی خۆشو نازو نیعمەتو پاداشی باشو سەرەنجامی چاکیان دەست دەکەوێ،

## بەکورتی:

ئـەهلی بەهەشـت (بـەئافرەتو پیاوییانـەوە) لەلـەززەتو خۆشـی دان هەرچـی حەزیان لێ بێ بۆیان حازرو بەیدەستە، هەرچی بیانەوێ دەیاندرێتێ.

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: (طـوبی) واتـە: بەهەشـت، ریوایـەتێکی تـری لـێ دەگێڕنەوە: فەرموویەتی: (طوبی) درەختێکە لەبەهەشتـدا،

قورطـوبی دەفـەرموێ: راسـت وایـە کـە (طـوبی) درەختێـك بـێ لەبەهەشـتدا، ئاماژە بەفەرموودەیەکی مەرفووع کە دەفەرموێ: (نعم شجرة تدعى طوبى)

فەرموودەیـەکی تـری مـەرفووع هەیـە ئیمـام ئەحمـەد لەئـەبو سـەعیدی خودرییەوە ریوایـەت دەکا دەفـەرموێ: (طوبى: شـجرة في الجنـة، مـسيرة مـأة سـنة، ثياب أهل الجنة تخرج من اكمامها)

ئیمامی موسلیمو بوخاری فەرموودەیەکی تر ریوایەت دەکەن لەسەهلی کوڕی سەعیدەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (انَ في الجنة شجرة يـسير الراكب في ظلها مئة عام لايقطعها) ئەمەش بۆ فـەضلو گـەورەیی خـودا شـتێکی ئاسایییە، چونکە بەهەشـت هـەمووی شـتی عـەجائیبو سەرسوڕهێنەرە وەکوو لـەو حـەدیثـەدا کـە لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: (فيهـا مـالا عـين رأت، ولا أذن سمعـت، ولا خطر على قلب بشر) واتە: لەبەهەشتـدا شتی وا هەیە هەرگیز چاو نـەیبینیوە، گوێـچکە نەیبیـستووە، بەخـەیاڵیش بەسـەر دڵـی ئـادەمیزاددا رانـەبوردوە،،!!

**حەزرەتی موحەممەد ﷺ شتێکی نائاسایی نیە لەناو پێغەمبەراندا، ئەویش وەکوو پێغەمبەرەکانی تر ئادەمیزاد بووەو نیگای بۆ کراوە**

﴿ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَـٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَـٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۗ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ ۚ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم

بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ۗ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا۟ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٣١) طەبەرانیو هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: قورەیشییەکان بەپێغەمبەریان گوت ﷺ: ئەگەر ئەوەی دەیڵێی راستە دە پیاو ماقوڵە مردووەکانمان نیشان بدە با قسەیان لەگەڵ بکەین، ئەم کێوانەی دەوروبەری مەککەمان بۆ رامالە باوڵاتمان بۆ ببێتە دەشتاییو کشتو کاڵی لێ بکەینو ئاومان بۆ لێ هەڵقوڵێنە، ئیتر ئایەتی ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ﴾ نازڵ بوو!

لەریوایەتێکی تردا: کە لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ: قورەیشییەکان بەپێغەمبەریان گوت: (سیر بالقرآن الجبال، قطع بالقرآن الأرض، أخرج به موتانا) ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو،

ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو مەردەویهی لە(عطیه العوفي)یەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: بەپێغەمبەریان گوت: (ئەگەر کێوەکانی دەوروبەری مەککەمان بۆ لابەری تا وڵاتمان ببێتە شوێنی کشتو کاڵو فەلاحەتی تێدا دەکەین، یان رێگای دوورمان بۆ نزیك بکەیتەوە وەکوو چۆن سولەیمان بەهۆی تەختەکەیەوە کە (با) هەڵی دەگرت بەیانیان مانگەرێیەك دەڕۆییو ئیواران مانگەرێیەك دەگەڕایەوە، یان مردوومان بۆ زیندو بکەرەوە وەکوو چۆن عیسا مردووی زیندو دەکردنەوە!!) ئیتر ئایەتی ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ.........الآية﴾ نازڵ بوو،

ئیبنو ئەبی شەیبەو ئیبنولموننذیرو هی تریش ریوایەتیان کردوە لە(الشعبي)یەوە دەڵێ: قورەیشییەکان بەپێغەمبەریان گوت، ئەگەر تۆ راست دەکەی پێغەمبەری، دە ئەم دوو کێوەی دەوری مەککەمان بۆ لێك دوور بخەرەوە، مەسافەی چوار رۆژ یان پێنج رۆژە رێ لێکیان دوور بخەرەوە، چونکە زۆر لێك نزیکن، نێوانەکەیان ببێتە زەوی‌و زارو دێبەر، کشت‌و کاڵی تێدا دەکەین، ئاژەڵی لێ دەلەوەرێنین، باوك‌و باپیرە مردووەکانمان بۆ زیندو بکەرەوە قسەیان لەگەڵ بکەین‌و هەواڵمان بدەنێ: کە تۆ پێغەمبەری، یان بەهۆی شتێکەوە بمانگەیەنە شام یان وەڵاتی یەمەن یان خاکی حیرە، بەشەوێك بمانبەو بمانهێنەوە! ئەی ئەوە نیە تۆ بۆخۆت لافی ئەوە لێ دەدەی گوایە بەشەوێك چویتە بەیتولمەقدیس‌و ئاسمانەکان‌و گەڕاویتەوە! ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو،

پەیوەندی ئەم ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: دوای ئەوەی پەروەردگار پەڵپ‌و بیانووی موشریکەکانی بۆ گێڕاینەوە، ئەوەی بەیان کرد: کە موحەممەد ﷺ وەکوو باقی پێغەمبەرەکانی تر وایە بانگەوازی یەکتاپەرستی دەکا، جا گەڵ‌و نەتەوە پێشینەکان داوای موعجیزەو نیشانەی جۆراو جۆریان لەپێغەمبەرەکانیان کردوە، خوداش داخوازییەکەی بۆ هێنانەدی، بەڵام ئەوان ئیمانیان پێ نەهێناون، ئیتر خودا بەسزای ریشەکێش‌کەر لەبێخی دەرهێناون،،

جا گەل‌و نەتەوەکەی تۆش ئەی پێغەمبەر! ئەگەر داوای موعجیزە دەکەن، ئەوە قورئانمان بۆ ناردووی، بۆیان دەخوێنیەوە، پەروەردگار دەتوانێ هەموو شتێك بکا، ئەو موعجیزەو نیشانانەی ئەوان داوای دەکەن خودا دەتوانێ بیانهێنێتەدی،،،، بەڵام هێنانەدی ئەو موعجیزانە سوودی نابێ، ئەمجار هەڕەشەیان لێ دەکاو دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو، دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ أَرْسَلْنَاكَ فِي أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهَا أُمَمٌ لِتَتْلُوَ عَلَيْهِمْ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ وەکوو پێغەمبەرمان ناردوون بۆ سەر گەل‌و نەتەوە پێشینەکان‌و بەدرۆیان خستوونەوەو پەڵپ‌و بیانوویان بێ گرتوون، تۆشمان

کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەمان کردوی بۆ سەر ئەم گەلو نەتەوەیە بۆ ئەوەی پەیامی خودایان پێ بگەیەنیو ئیمانت پێ بهێنن،

جا وەکوو چۆن سزاو تۆڵەو عەزابی خۆمان نارده سەر ئەو گەلو نەتەوانە، با کافرەکانی مەککەش بترسن لەوەی هەمان سزاو عەزاب بێتە سەر ئەوانیش، لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تَاللّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ﴾النحل/٦٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَى مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا وَلاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ وَلَقدْ جَاءكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ﴾الأنعام/٣٤.

## بەکورتی:

ئەی موحەممەد! ئێمە تۆمان ناردوە بەنامەیەکی پیرۆزەوە بۆ ئەوەی بەئادەمیزادانی رابگەیەنیو بەسەریاندا بیخوێنیەوە، وەکوو چۆن لەوەپێش پێغەمبەری ترمان رەوانە کردوون بۆ سەر گەلە پێشینەکان، جا کاتێ کە پێغەمبەرەکان بەدرۆ خرانەوە، بڕوانە چۆن سەرمان خستنو یارمەتیمان دانو سەرئەنجامی سەروەری هەر بۆ ئەوانو شوێنکەوتوانیان بوو لەدونیاو قیامەتدا،

﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِالرَّحْمَنِ﴾ وەلحاڵ ئەم هۆزەی تۆمان بۆسەر ناردوون ئەی موحەممەد! بڕوایان بەخودا نیە، ئەو پەروەردگارە رەحمانە ناناسن کە رەحمەتو فەضلی بەشی هەموو شتێك دەکا، دان بەخودایەتی ئەودا نانێن، بڕوایان بەبێ هاوەڵی خودا نیە، سوپاسی نیعمەتەکانی ناکەن، دەڵێن: هاوەڵی هەیە، کوڕو کچی هەن!

﴿قُلْ هُوَ رَبِّي لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ﴾ ئەی فروستادەی خۆشەویست! بەوکافرانە بڵێ: ئەو (رەحمانە)ی ئێوە بڕواتان پێی نیە، من بڕوای تەواوم پێیەتی، ئەو بەدیهێنەری منە، چاودێرو پارێزەرمە، هەر ئەو خودامە خودای ترم نین، هیچ خودای تر نین شیاوی پەرستن بن!

﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ﴾ لەهەموو ئیش‌و کارێکمدا پشت بەئەو دەبەستم‌و کارەکانم حەواڵەی ئەو دەکەم‌و بتمانەم هەر بەخودایە!

﴿وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ گەڕانەوەم هەر بۆ لای خودایە، تۆبە هەر بۆ لای ئەو دەکەم، کەسی تر شیاوی ئەوە نیە من بۆ لای بگەڕێمەوە، ئەم ئایەتە فەضل‌و گەورەیی تۆبە دیاری دەکاو هەڵنانی کافرەکانە بۆ واز هێنان لەکردارو هەڵوێستیان بەناسکترین شێوە، چونکە فەرمان بەپێغەمبەر کراوە بەتۆبە کردن، لەکاتێکدا ئەو دوورە لەتاوانکردن، کەوابێ تۆبەکردنی کافرەکان: کە سوورن لەسەر کوفرو بێدینی زۆر پێویست ترە! ئەمە وەکوو مانای ئایەتی ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ﴾غافر/٥٥ وایە.

ئەمجار گرنگی‌و گەورەیی قورئان دیاری دەکاو، ئەوە دەچەسپێنێ، دەفەرموێ: ئێمە تۆمان کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەمان کردوی بۆ ئەوەی کە ئەم قورئانەیان بەسەردا بخوێنیەوە، ئەم قورئانە عەجیب‌و سەرسوڕهێنەرەی کە لەهەموو رویەکەوە موعجیزەیەو لەتوانای ئادەمیزاددا نیە وێنەی بهێنێ!

تەنانەت ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ﴾ ئەگەر بچەسپێ کە کتێبێك هەبوە بەخوێندنەوەی کێو وەگەڕکەوتووەو شوێنی خۆی بەجێ هێشتووە، وەکوو ئەو جم‌و جووڵەی کە بەسەر کێوی طور هات لەئاکامی ئەو داوایەی موسا: کە فەرمووی ﴿رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ﴾ خودایە خۆتم نیشان بدە باسەیرت بکەم،

﴿أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الأَرْضُ﴾ یان زەوی بەهۆیەوە شەق بکرێ وەکوو ئەوەی کە موسا لەبەردەکەی داو دوانزە سەرچاوەی لێ هەڵقوڵا،،

﴿أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى﴾ یان بەهۆیەوە قسە لەگەڵ مردو بکرێ بەم شێوە مردو بەهۆی قورئان بەسەرا خوێندنەوە بکەوێتە قسە، وەکوو بۆ عیسا هاتە دی،

بـەڵێ ئەگـەر شـتێك لەمانــە بـۆ نامەیـەكی ئاسمـانی دەسـتەبەر بـووبێو دەستەبەربوایە، ئەوە بەتەئكید بۆ قورئـان دەهاتـە دی ئـەو قورئانـەی: كە بـەهیچ جۆرێك بەتاڵی تێدا نیەو هەمووی حەقو بێ خەوشە،

بەڵێ ئەگەر شتێك لەوانە بـۆ نامەیـەك لەنامـە ئاسمانییـەكان بهاتایـەدی، بـۆ قورئـان دەهاتــە دی، چـونكە هـیچ نامەیـەكی تـر جگـە لـەقورئان ئەوەنـدە ئایـاتی كـەونی لـەخۆ نـەگرتوون، ئـەو ئایەتانـەی: كـە نیـشانەی دەسـترەنگینیو ئیبـداعی پەروەردگارن بۆخودی ئادەمیزادەكانو لەبوونەوەردا، ئەو هەموو ئەحكامەی لـەخۆ گرتوون: كە پەیڕەوی كردنیان مایەی خۆشبەختی ئادەمیزادە لـەدونیاو قیامـەتدا، ئەو هەموو پەندو ئامۆژگاریو یاسای ئاوەدانكردنـەوەو ڕێنومـایی پێكـەوە ژیانـەی تێدا هەن: كە پابەنـد بـوون پێومیـان دەبێتـە مایـەی خێـرو خۆشـی بـۆ ئـادەمیزاد، كۆمەڵگایەكی بەختەوەر دێتە كایەوە!

بەكورتی ئەگەر هێنانەدی ئەو ئایاتو موعجیزانەی كافرەكان داوایان دەكەن حیكمەتو دانایی خـودا داخوازیـان بوایـەو بەرژەونـدی ئـادەمیزادی تێـدا هەبوایـە، ئەوە بێگومان لەقورئاندا ڕەنگی دەدایەوە: ئەو قورئانەی كـە ئـەوان بـەموعجیزەی نازانن‌و پەڵپی نیشانەو موعجیزەی تر دەگرن،

ئەی ئەوە نیە لەشوێنێكی تردا دەفـەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُـرْآنَ عَلَـى جَبَـلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾الحشر/٢١.

دەتوانین بڵێین: مانای ئایـەتی ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِـهِ الْجِبَـالُ أَوْ قُطِّعَـتْ بِـهِ الأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى ،،،﴾ بەم جۆرەیە: ئەگەر كتێبێك هەبوایە ئـەو مـوعجیزە گەورانەی پێ ئەنجام بدرانایەو بەهۆی خوێندنەوەی بەسەر بوونەوەرو ئادەمیزاددا كێوی بڕویاندنایەو زەوی شەق بكردایە، مردووی بهێنانایە قسە، ئەوانـە ئیمانیـان پـێ نـەدەهێنا، لەبـەر سـەررەقیو لوتبـەرزیو عـەنادییان! وەكوو لەشـوێنێكی تـردا

دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلآئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ إِلاَّ أَن يَشَاءَ﴾الأنعام/١١١.

مامۆستا سەيید لێرەدا دەفەرموێ: (بێگومان ئەم قورئانە کاریگەریەکی سەرسورهێنەری لەدڵو دەروونی ئەوانەدا بەدی هێناوە کە پێشوازییان لێ کردووەو بەراستی وەریان گرتووە، کاریگەریەکە زۆر گرنگترە لەگرنگی رۆیاندنی کێوو شەقکردنی زەوی‌و زیندو کردنەوەی مردو، قورئان لەو دڵو دەروونانەدا موعجیزەو خارقەی گەورەترو کاریگەرتری دروستکردون، کارگەریەکەی لەشێوەو روخساری زەویشدا رەنگی داوەتەوە، بڕوانە موسوڵمانان وێڕای گۆڕانی رەوڕەوەی مێژوو چۆن رووی زەویشیان گۆڕیوە؟،،،،،

ئەوانەی پێشوازییان لەقورئان کردو بڕوایان پێ کردو پێوەی پابەند بوون، گەورە تریان لەکێو رۆیاندوە: کە مێژووی گەل‌و نەتەوەکانە، لەزەوی قاییمتریان شەق کردوە کە فکری جامیدو داب‌و نەرێتی جامیدە، لەمردوویان مردوتر زیندو کردۆتەوە کە دڵو دەروونی ئەو گەل‌و نەتەوانەیە: طوغیان‌و بوغرایی‌و خەیاڵی پووچ‌و بێ جێیان گیانی لەناوبردبوون،،، ئەو گۆڕانکارییەی لەدڵو دەروونی نەتەوەی عەرەبدا هێنایە دی‌و ئەو بازە مێژووییەی پێیدان‌و ئەو گواستنەوە گرنگ‌و گەورەیەی لەژیانی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا بەگشتی‌و هی عەرەب بەتایبەتی ئەنجامدا هۆکارە بینراوەکانی جگە لەقورئان هیچی تر نابینرێ! پەیڕەوو پرۆگرامی قورئان‌و کاریگەرییان لەدڵو دەروونی ئادەمیزاددا زۆر گەورەترە لەجوڵاندنی کێوی چەقیو، لەشەقکردنی زەوی بێ گیان، لەزیندو کردنەوەی مردوو!!)

﴿بَلْ لِلَّهِ الأَمْرُ جَمِيعاً﴾ بەڵکوو جەمسەری هەموو کاروبارێک، سەرەنجامی هەموو شتێك، بەدەست خودایەو لەلای خودایە، هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ، ئەوی نەیەوێ ببێ نابێ! کەسێك خودا هیدایەتی نەدا کەس نیە بتوانێ هیدایەتی بداو

بیگەیەنێتە مەبەست، پەروەردگار بۆخۆی خاوەنی ئیرادەو فەرمانە دەربارەی نازڵکردنی ئایاتو موعجیزە، دەسەڵاتو توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێو هیچ شتێك نیە لێی عاسی بێ! جا ئەگەر داخوازی کافرەکانی قورەیش حیکمەتێکی تێدا بوایەو بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا بەدی بکرایە، خودای باڵادەست داخوازییەکانیانی دەهێنانە دی، وەلێ قورئان بۆخۆی بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدو ویستی خوداش وانەبوە موعجیزەیەکی تر بخاتە روو چونکە خودا بۆ خۆی دەزانێ؛ هیچ سوودو فائیدەیەك لەوەدا نیە پەڵپو بیانوەکانیان ببڕێن، زانایە بەوەی کە دڵیان لەبەرد رەقترەو ئەگەر بەقورئان هیدایەت نەدرێن بەموعجیزەی تریش موسوڵمان نابن،

**بەکورتی:**

هیدایەتدانو گومڕاکردن پەیوەستن بەیاسای سەبەبییەتەوە: واتە: پەروەردگار لەقورئاندا ئایاتی هیدایەتو رەهنومایی نازڵ کردوون هەر کەسێك پابەندیان بێو بەگوێرەیان هەڵسو کەوت بکا هیدایەت دراوە، هەر کەسێك پشتیان لێ هەڵکا گومڕاو سەر لێ شێواوە، کەوابێ گوێ نەدان بەقورئانو ئامۆژگارییەکانی هۆکارە بۆ گومڕابوونو سەرلێ شێوان! جا کە مەوزوع ئەوەبێ با موسوڵمانان بەلایانەوە سەیر نەبێ کە کافرەکان ئیمان ناهێنن!!

﴿أَفَلَمْ يَيْئَسِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنْ لَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعاً ؟﴾ ئایا موسوڵمانان نەیانزانیوەو نازاننو تا ئێستا بۆیان ئاشکرا نەبوە: ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئادەمیزادی دەخستنە سەر رێبازی هیدایەتو دەیگەیاندنە مەبەست!؟

بێگومان بەڵگەو موعجیزە لەقورئان گەورەترو کاریگەرتر نابن، هیچ شتێکی تر بەئەندازەی قورئان کاریگەری لەسەر دڵو دەروون نیە، جا کە ئەوان بەقورئان هیدایەت نەدرێنو بەئەو پەندو عیبرەت وەرنەگرن ئاشکرایە بەهیچی تر نایەنە سەر رێگای هیدایەت،

لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مامن نبيَ الا وقد أوتي ما آمن على مثله البشر، وانما كان الذي أوتيتـه وحيـاً أوحـاه الله اليّ فـأرجو أن أكون أكثرهم تابعاً يوم القيامة) مەبەست ئەومیە: دەفەرموێ: موعجیزەی هەموو پێغەمبەرێك بەلەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرەکە کۆتایی هاتووە، وەلێ قورئـان بەلگەیەکی هەتا هەتایی‌و بەردەوامە، عەجایەبەکانی نابڕێنەوە، کۆن نابێ، زانایان لێـی تێـر نـابن، جوداکـەرەوەی حـەق‌و بەتاڵـەو گاڵتـەجاڕ نیـە، کەسێك لەبـەر لوتبەرزی وازی لێ بێنێ خودا تێکی دەشکێنێ، کەسێك هیدایـەت لەغـەیری قورئـان وەربگرێ خودا گومڕای دەکا،

﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا تُصِيبُهُمْ بِمَا صَنَعُوا قَارِعَةٌ﴾ بەردەوام‌و بەشێوەیەکی گشتی بەلاو موصیبەتی جۆراو جۆر تووشی ئەو کافرانە دەبێ کە ئیمان بەپەیامی تۆ ناکەن، کوژران‌و دیلی‌و تالان‌و برۆو نەخۆشی‌و دلتەنگی‌و دلەڕاوکێ‌و تەنگ‌و چەلەمە باڵی رەشیان بەسەر ئەواندا دەکێشن، چونکە پەیامی تۆ رەتدەکەنەوەو تۆیان لەزێدو نیشتمانی خۆت وەدەرناوە..

﴿أَوْ تَحُلُّ قَرِيباً مِنْ دَارِهِمْ﴾ یان ئەو بەلاو نەخۆشی‌و بوومەلەرزەو (قاریعانە) لەدەوروبەریان پەیدا دەبن‌و پریشك‌و سەلبیاتی ئەو روداوانە لەسەر ئەوانیش کاریگەر دەبن، هەواڵی روداوەکان دەبیسن، بەچاوی خۆیان دەیانبینن بۆ ئەوەی پەندی لێ وەربگرن‌و لەهەڵوێستی نادروستی خۆیان پەشیمان ببنەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا ئایەت و موعجیزەیەکی بەردەوامە بۆ کەسانێك خاوەن عەقڵ‌و فام بن! دەی کەوابێ بۆچی پەلپ‌و بیانووی موعجیزەی تر دەگرن!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَى وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾الأحقاف/٢٧.

بەردەوام خودا قاریعەی جۆراو جۆر بۆ سەر کافرەکان نازڵ دەکاو بەڵاکوتیان دەکا ﴿حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ﴾ هەتا خودا ئەو وادەو بەڵێنەی پێ داوی دەیانهێنێتە جێو ئەتۆو موسوڵمانانیان بەسەردا زاڵ دەکاو ئەوان بەناچاری دێنە ژێر رکێفی ئێوەوەو گەردنکەچو فەرمانبەردار دەبن، بەزەبری شمشێر سەریان پێ شۆڕ دەکەی! وەکوو لەرۆژی رزگار کردنی مەککەدا هاتە دی...

ئیبنو عەبباس و هی تریش دەفەرموون: مانای ﴿حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللَّهِ﴾ هەتا ئەم بوونەوەرە کۆتایی پێ دێو رۆژی قیامەت بەرپا دەبێ،

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ بێگومان پەروەردگار وادەو بەڵێنی خۆی بەجێ دێنێو لێیان پەشیمان نابێتەوە، ئەو وادەو بەڵێنانەی بەپێغەمبەرانی خۆی داون، دەیانهێنێتە جێو پێغەمبەرو موسوڵمانان زاڵ دەکا بەسەر کافرەکاندا لەدونیاو قیامەت، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ﴾ابراهيم/٤٧.

ئەمجار پەروەردگار بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر لەناکامی ئەو پەڵپ و بیانوانەی کافرەکان بەشێوەی لاقرتێو گاڵتەوە لەپێغەمبەریان دەگرت، ئەم ئایەتەی نازڵ کردو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر ئەو کافرو موشریکانەی گەل و هۆزەکەت گاڵتەو لاقرتێت پێ دەکەن و داوای موعجیزەی سەیرو سەمەرە دەکەن و پەڵپ و بیانووت پێ دەگرن و بەدرۆت دەخەنەوە، ئەوە تۆ خۆگربەو صەبرو ئارامت هەبێو بەردەوام بە لەسەر ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانت، چونکە بێگومان هەمان گاڵتەو لاقرتێ بەپێغەمبەرانی پێش تۆ کراوەو، لەلایەن گەل و نەتەوەکانیان پەیامەکەیان بەدرۆ خراوەتەوە، ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ مۆڵەتی ئەوانەم دا کە کافرو موشریکن بۆ ماوەیەک و ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ ئەمجار کە زێدەرەوییان لەگومڕاییو بێدینی دا کرد، عەزابی سەختی

خۆمانمان بەسەردا دانو تێکمانەوە پێچان، دەی وردبەرەوەو بڕوانە: چۆن تۆڵەم لێ ستاندنو چۆن عەزابی سەختم بەسەردا دان، ئایا عەزابی بەئێشم پێ نەچەژتنو نەمکردنە پەندی زەمانە؟! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾الحج/٤٨.

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمیشدا هاتووە: پێغەمبەر فەرموویەتی: (ان الله لیملي للظالم حتی اذا أخذه لم یفلته) پەروەردگار ستەمکار مۆڵەت دەدا هەتا کاتێك کە دەیگرێ ئیتر رزگاری نابێو لەدەستی دەرناچێ! ئەمجار پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ هود/١٠٢

## بەکورتی:

پەروەردگار لەم ئایەتەی ئێرەدا دەفەرموێ: من تۆڵە لەو کافرو موشریکانە دەستێنم، وەکوو چۆن لەوەپێش تۆڵەم لەکافرو ستەمکارانی گەلەپێشینەکان ستاند، بێگومان پەروەردگار وادەی خۆی بەجێ هێناو پێغەمبەرو موسوڵمانانی بەسەر دوژمنەکانیاندا زاڵ کردنو ئەوانەی هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە هاتن، ئەوانەی پشتیشیان هەڵکرد کوژرانو لەناوچوون، هەموو جیهانی عەرەب بەخۆشیو ناخۆشی ملیان کەچ کردو لەژێر ئاڵای ئیسلامدا خۆیان بینیەوە، وادەی پەروەردگار هاتە جێو بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا!

ئەمجار پەروەردگار سەرزەنشتی کافرەکان دەکاو ئەوە بەیان دەکا: کە هەڵسو کەوتیان جێگای سەرسوڕمانەو بێ عەقڵیو نەفامییان گەیشتۆتە ئاستێك ئادەمیزادی ژیرو هۆشیار بۆی قبووڵ ناکرێو ناتوانێ لێیان بێ دەنگ بێ، فەرمووی: ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَائِمٌ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ﴾ ئایا خودایەك ئاگادارو چاودێرو بەرپرسی هەموو رزقو رۆژی گیانلەبەرێك بێ، کاروباریان هەڵسوڕێنێ

ئاگاداری هەڵس‌و کەوتیان بێ، هەرچی دەیکەن لەکاری خێرو کاری خراپە لەسەریان تۆمار بکا، هەر لەزەرە تا مەجەرە هیچی لێ گوم نەبێ؛ وەکوو کەسێك وایە کە ئەو رەوشتانەی تێدا نەبن؟ وەکوو بتەکانی ئێوە کە تەنانەت بێ گیان‌و بێ هەستن نەدەبیستن نەدەبینن!! نەلەخۆیان‌و نەلەغەیری خۆیان زیان دوور ناخەنەوەو ناتوانن هیچ شتێك ئەنجام بدەن، کەمترین خێرو خۆشییان بۆ دەستەبەر ناکرێ نەبۆ خۆیان نەبۆ غەیری خۆیان!!

بەکورتی ئەوە جێگای سەرسوڕمان نیە: کە ئەوانە ئینکاری ئایەت‌و موعجیزەو نیشانەکانی تۆ دەکەن، هەرچەندە نیشانەی پێغەمبەرایەتی تۆ وەکوو رۆژی روناك عەیان‌و نمایانە، بەڵکوو ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە: ئەو خودایەی خاوەن دەسەڵاتەو دەتوانێ بەڵاو قاریعەی جیا بنێرێتە سەر ئادەمیزادو بۆخۆیان بەچاوی خۆیان دیاردەی دەسەڵات‌و بەتوانایی خودا دەبینن کەچی ئەو خودا خاوەن دەسەڵاتە دەبەنە ریزی خودا درۆزنەو بت‌و صەنەمێك کە هیچیان لەدەست نایە، نەزیانیان پێ لەکەس دوور دەخرێتەوە نەدەتوانن سوود بەکەس بگەیەنن،

ئەمجار جەخت لەسەر ئەو بتپەرستییەیان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ﴾ ئەوانە هاوەڵ‌و شەریکیان بۆ خودا داناوە، لەتەك پەروەردگاردا چەند بت‌و صەنەمێکیان قوت کردۆتەوەو بەندایەتییان بۆ دەکەن، هاواریان لێ دەکەن، هانایان بۆ دەبەن،

﴿قُلْ سَمُّوهُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەو خودایانەم بۆ پیناسە بکەن، پێم بڵێن: ئەو هاوەڵانەی بۆ پەروەردگارتان دیاری کردون کامانەن‌و چین‌و کێن بابزاندرێن، چونکە ئەوانە هیچ بنەمایەکیان نیە، شیاوی بەندایەتی بۆ کردن نین، چونکە ناتوانن زیان لەکەس دوور بخەنەوە، ناتوانن خێرو خۆشی بۆ کەس بێنن!

﴿أَمْ تُنَبِّئُونَهُ بِمَا لا يَعْلَمُ فِي الأَرْضِ﴾ یان هەواڵ دەدەن بەپەروەردگار بەوەی چەند هاوەڵو شەریکێکی هەیە: کە وجوودیان نیەو خودا پێیان نازانێ لەکوێن؟ چونکە ئەگەر وجوودیان هەبوایە پێی دەزانینو دەیناسینو چونکە خودا هیچ شتێکی لا پەنهان نیە،،

﴿أَمْ بِظَاهِرٍ مِنْ الْقَوْلِ﴾ یان هەر بەهەوانتەو بەقسە ناوی خودایان لێ دەنێنو بەقسە دەیانکەنە هاوەڵی خوداو پێتان وایە: سوودو زیانیان بەدەستە؟ بەبێ ئەوە هیچ حەقیقەتێك بۆ ئەم بۆچونەتان هەبێ، ئای لەو بێ عەقڵیو نەفامییە ناوێکی گەورەو پیرۆز بدەیە شتێك کە وجوودی نیە، بەهەوانتەو بێ بەڵگە صیفەتی خودایەتی بدەیە شتێکی نەبوو، ئەمجار مامەڵەی ئەوەی لەگەڵ بکەی کە حەقیقەتە!؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَى﴾النجم/٢٣.

بەکورتیو پوختی ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەو کافرانە لەم هاوەڵ دانانەیاندا هیچ بەڵگەیەکی نەقڵیو عەقڵییان بەدەستەوە نیە، ئەوە بوو پاش ئەوەی قاعیدەی هاوەڵدانانی بۆ خودا هەڵوەشاندەوە بەوە کە فەرمووی: ﴿أَفَمَنْ هُوَ قَائِمٌ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ﴾ ئەمجار زیاتر مەوزوعەکە روون دەکاتەوە دەفەرموێ: خۆزگە ئەوانە کە هاوەڵ دادەنێن بۆ خودایەکی وەها کە نابێ هاوەڵی هەبێ، کەسێکیان بکردایە بەهاوەڵی کە حەقیقەتو ئیتعیبارێکی هەبوایە، نەك شتێك بکەن بەهاوەڵی کە نەناوی هەیەو نەخودی خۆشی هەیە، بەڵکوو لەئاسمانەکانو زەویدا ئەو شتە هەبوونی نیە!!!

یان دەیانەوێ هەواڵێك بەخودای زاناو ئاگادار بەسەر هەموو نهێنیو پەنامەکییەکدا بدەن: بەشتێك کە نایزانێ؟ جا شت هەیە خودا پێی نەزانێ؟!

ئـەمجار پـەروەردگار جـەخت لەسـەر نـەفامىو تێنەگەيـشتوييان دەكاتـەوەو دەفەرموێ: ئەو شتەى ئەوان ناوى خودايان لێناوە هيچ نـاولێنراوێكى نيـە (ئيـسمى بێ موسسەمايە) دەنگێكى بێ ناوەرۆكى وشەزۆرى بێ مانايە!!

سەيرە! ئايا قەضييەى ئولوهييەت ئەوەندە سادەو گاڵتـەجارە بـەجۆرێك كـە بشێ ئەوانە بەقسەى بۆش‌و بێ مانا دەمى تێوەدەن؟؟

﴿بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ وَصُدُّوا عَنْ السَّبِيلِ﴾ كێشەو دان‌و سان لەگـەڵ ئـەوان بخـەرە لاوە، مانـدو بـوون لەگـەڵياندا بێهودەيـە، بـەڵكوو ئـەوان گـەڵ‌و نەتەوەيەكن كوفرو فرت‌و فێڵيان رێگاى گومڕابوونى بـۆ جوان كـردون‌و لـەرێبازى حەق لادراون! كەوابێ مەسەلەكە ئەوەيە: ئەوانە كافرن، بەڵگەو نيشانەى ئيمانيـان داپۆشـيوە، نەفـسى خۆيـان لەبەڵگـەى هيدايـەت لاداوە، ئيـدى سـوننەتى خودايـان بەسەردا چەسپاوە! نەفسيان واى نيشان داون كە لەسەر رێبازى حەقن، فرت‌و فێڵ‌و پيلانيان دژى بانگەوازى ئيسلامييە، ئـيتر ئـەم هەڵوێـست‌و كردەوانـەيان لـەرێبازى راستى خودا پەسند لاى داون،

﴿وَمَنْ يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ كەسێك خـودا گـومڕاى بكـا لەبـەر بـيرو باوەڕى چەواشەيى‌و كردەوەى خراپ‌و تاوانكردن‌و لادان لەرێبازى حەق، كـەس نيـە بتـوانێ هيدايـەتى بـداو تـۆفيقى بـۆ برەخـسێنێ بـۆ رزگـاربون‌و گەيـشتن بەبەختەوەرى! وەكوو لەئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً﴾المائدة/٤١، يـان ﴿إِن تَحْرِصْ عَلَى هُدَاهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾النحل/٣٧.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامى سروشتى ئەو گرۆهو تاقمە گومڕايانە بـەيان دەكاو دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ عَذَابٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ئەوانە لـەدونيادا سـزاى سـەختيان دەدرێ بەكوشـتن‌و بـەديل گـرتن‌و بـاقى ئـەو بـەڵاو موصيبەتانەى تووشـيان دێـن.

﴿وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَشَقُّ﴾ بێگومان سزای قیامەت زۆر بەئێش ترو سامناکترە...

لەصەحیحی موسلیمدا فەرمووده‌یەکی پێغەمبەر ﷺ لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان عذاب الدنیا أهون من عذاب الآخرة) چونکە سزای دونیا کاتییە، سزای قیامەت بۆ هەتا هەتاییە، ئاگری دۆزەخ حەفتا هێندەی ئاگری دونیا گەرمە،

﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ اللَّهِ مِنْ وَاقٍ﴾ نیە بۆ ئەو کافرانە لەمپەرێك بیانپارێزێو لەسزای دۆزەخ رزگارییان بکا، بەبێ ئیزنی خودا کەس ناتوانێ شەفاعەت بۆ کەس بکا.

## چۆنیەتی بەهەشتو هەڵوێستی ئەهلی کیتابو شوبهەی موشریکەکان بەرامبەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ

﴿ ۞ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا ۖ وَّعُقْبَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ۖ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ۚ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ۚ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَـٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ

أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾

دوای ئـەوە پـەروەردگار باسـی سـزای کافرەکـانی کـرد لـەدونیاو قیامـەتدا، بەشوێن ئەوەدا باسی پاداشی تـەقواکاران دەکا، لـەرزەت و نیعمەتـەکانی رادەنـوێنێ، ئەمـەش وەکـوو چـەند جـاری تـر دووبارەمـان کردۆتـەوە، کـە قورئـانی پـیرۆز ئوسلوبێکی تایبەتی هەیـە، هـەر کـاتێ باسـی دونیـای کـرد، باسـی قیامـەتیش دەکـا، باسی دۆزەخ بکا، باسی بەهەشتیش دێنێ.

ئەمجار کەیفخۆشی برێ ئەهلی کیتاب باس دەکا کە دڵخۆشـن بـەوەی قورئـان لەگەڵ نامەکانی ئەواندا یەکدەگرێتەوەو هەندێکیشان ئینکاری دەکەن،

پاشـان دێتــە سەرباسـکردنی هەنـدێ شـوبهەو گومـانی موشـریکەکان: کـە ئاڕاستـەی پێغەمبـەری دەکـەن! وەکـوو ئەوانـەی تانـەی لـێ دەدەن: کە ژنـی زۆرن، نـاتوانێ مـوعجیزەو داخـوازی قوڕەیـشییەکان بخاتـەڕو، ئـیتر پـەروەردگار ڕەدیـان دەداتـەوەو پێیـان دەفـەرموێ: موحەممـەد وەکـوو بـاقی پێغەمبـەرانی تـر خێـزان و منداڵی هەیە، مەوزوعی پەڵپ و بیـانووی مـوعجیزەش ئـەوە عائیـد بەخودایـەو بـۆ

کەس نیە دەمی تێوەدا، نازلکردنی عەزابیش کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە، هەموو روداوێك لەکاتی خۆیدا رودەدا،

دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ﴾ لەوەی لەمەبەولاوە بۆت دەخوێنینەوە صیفەتو چۆنیەتی ئەو بەهەشتەیە: کە پەروەردگار وادەی بەتەقواکاران داوە لەپاداشی خواپەرستیو تۆبە کردنیانو هانابردنیان بۆ خوداو دڵسۆزییان بۆ ئایین، ئەو بەهەشتە بەهەشتێکی وەهایە ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ جۆگەو جۆبار لەژێریەوە جاری دەبن! لەهەموو لایەکیەوە جۆگاو چۆم دەکشێن، دانیشتوان چۆنیان بوێ ئاوا جۆگاکان دەڕۆن جا وەنەبێ هەر جۆگەی ئاو هەبێو بەس بەڵکوو جۆگای شیرو هەنگوینو مەی هەر شتێکی حەزیان لێ بێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاء حَمِيماً فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ﴾محمد/١٥.

ئەو بەهەشتە شتێکی کاتی نیە بەڵکوو ﴿أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا﴾ میوەو خۆراكو خواردنەوەکانی بەردەوامو هەمیشەییە نابڕێتەوەو کۆتایی نایە، هەروەها سێبەرەکەشی بەردەوامو نەبڕاوەیە، خۆری تێدا نیەو دانیشتوانی سەرماو گەرما نابینن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْساً وَلَا زَمْهَرِيراً﴾الإنسان/١٣.

لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرموودەیەك هەیە ئیبنو عەبباس ریوایەتی کردوە لەباسی نوێژی خۆرگیراندا هاتووە، گوایە هاوەڵان عەرزی پێغەمبەر ﷺ دەکەن دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە تۆمان بینی لەم شوێنەی خۆتدا وەکوو دەست بۆ شتێك بەری وابوو، پاشان بینیمانی کشایتەوە، پێغەمبەر

ﷺ فەرمووی: (اني رأيت الجنة، فتناولت منها عنقوداً ولو أخذته لأكلتم منه ما بقيت الدنيا)،

ئەمجار دوا بەدوای وەصف کردنی بەهەشت بەو سێ صیفەتانە سەرەنجامی تەقواکاران دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوا﴾ ئەو بەهەشتە جوانو رازاوەیە عاقیبەتو سەرەنجامی ئەو کەسانەی تەقوای خودا دەکەن، وازیان لەکوفرو بێدینی هێناوە، تاوان ئەنجام نادەن، ستەمکاری ناکەن، ملیان بۆ خودای مەزن کەچ کردوە، دەترسن لەرۆژێك مندالْ پیر دەکا، لەو رۆژەدا خەلْکی دەبینی وەکوو سەرخۆش وەهان لەراستیدا سەرخۆش نین بەلْکوو سزای خودا بەئێشەو توندو تیژە،

﴿وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ﴾ ئاکامو سەرەنجامی کافرانیش دۆزەخە بەهۆی ئەو تاوانو ستەمکارییەی لەخۆیانو خەلْکیشیان کردوە،

ئایەتەکە دەرگای تەماعو هیوای بۆ خوداپەرستان خستۆتە سەرپشتو کافرەکانیشی نائومێد کردوون،

ئەمجار پەروەردگار ئەوە بەیان دەکا: کە ئەهلی کیتاب (جولەکەو گاوور) دوو تاقمن: تاقمێکیان دلْخۆشن بەنازلْبوونی قورئانو کۆمەلْێکیشیان ئینکاری قورئانیان کردوەو بڕوای پێ ناکەن،

دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَفْرَحُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ ئەوانەی نامەی ئاسمانیمان داونێ لەجولەکەو نەصرانییەکان: دوو بەشن، ئەوانەی بەگوێرەی نامەکانیان هەلْسو کەوتیان کردوە ئیمانیان بەپەیامی پێغەمبەری خۆیان هێناوە، دلْیان خۆشە بەو سروشەی بۆ لای تۆ نێردراوە: کە قورئانی پیرۆزە، چونکە لەکتێبەکانی خۆیاندا نیشانەو بەلْگە هەن لەسەر راستی پەیامی تۆ، رەوشتو نیشانەکانی تۆ لەنامەکانی ئەواندا دیاری کراوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا

دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاَوَتِهِ أُوْلَـئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾البقرة/١٢١، ئەمانــە کۆمــەڵێك جوولەکــە بــوون وەکــوو عەبــدوڵڵای کــوڕی ســەلامو هــاوەڵانی، کۆمەڵێکیش نەصرانی بوون کە ژمارەیان هەشتا کەس بوو لەدانیشتوانی حەبەشەو یەمەنو نەجران بوون!

﴿وَمِنَ الأَحْزَابِ مَنْ يُنكِرُ بَعْضَهُ﴾ لەتاقمو کۆمەڵی ئەهلی کیتاب هەندێك هەن: کە ئینکاری بڕێ لەقورئان دەکەن، حیزبو پارتیان پێك هێناوە دژی پێغەمبەر ﷺ ئەمثالی کەعبی کوڕی ئەشرەفی یەهوودیو (السد)و (القاعب) کە دوو کەشیشی نەجران بونو شوێنکەوتوانیان، ئەمانە ئینکاری هەندێ لەقورئان دەکەن، واتە: ئەو شوێنانەی کە لەگەڵ تەوراتە گۆڕاوەکەی ئەواندا یەك ناگرێتەوە،

جا لەبەرامبەر ئەم راجیاییەی کەوتۆتە نێوان ئەهلی کیتابەوە دەربارەی قورئانی پیرۆز، پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ﴿إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ وَلا أُشْرِكَ بِهِ﴾ من تەنها فەرمانم پێکراوە: کە عیبادەتی خودا بکەمو بەتاكو تەنهای بناسمو یەکتاپەرستی بکەمو هاوەڵ بۆ خودا دانەنێم، هەروەکوو چۆن پێغەمبەرانی پێش منیش هەمان بانگەوازییان کردووەو هەمان هەڵوێستو بیرو باوەڕیان بووە، ئەمنیش وەکوو پێغەمبەرانی پێش خۆم بانگەوازی خەڵك دەکەم بۆ ڕێبازی خوداپەرستیو یەکتاپەرستی! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾آل‌عمران/٦٤.

ئەمن فروستادەمو ئەرکی بانگەوازیم خراوەتە سەر شانو ﴿إِلَيْهِ أَدْعُو﴾ بۆ ڕێبازی خوداپەرستیو دڵسۆزی لەعیبادەتدا ئادەمیزادان بانگ دەکەم،

﴿وَإِلَيْهِ مَآبِ﴾ هەر بۆلای خودایە گەڕانـەوەو حیـساب‌و لێکۆڵینـەوە، پـاداش‌و سزا هەر بەدەست ئەوە، ئێمەو ئێوە لەمەدا ناکۆکیمـان نیـە، سـەیر ئەوەیە: ئێوە ئینکاری شتێك بکەن کەهەمووومان لەسەری کۆکین، راجیایی دروست بکەن لەشتێك دا کە جێگای خیلاف نیە،

ئایەتەکە ئاماژە دەکا بۆ مەبـدەئی یەکتاپەرستی‌و رەتکردنـەوەی هاوەڵدانان بـۆ خـودا، مەبـدەئی پێغەمبەرایـەتی، هـەروەکوو چـۆن ئامـاژە دەکـا بـۆ مەبـدەئی زیندوبوونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوەو هاتنی رۆژی قیامەت،

ئـەمجار فـەرمان بەپێغەمبـەر ﷺ دەکـا کـە مەنهـەجی خـۆی رابگەیـەنێ‌و بەرامبـەر بەوانـەی ئینکـاری هەنـدێ لـەقورئان دەکـەن، ئـەوە رابگەیـەنێ: کـە ئـەو بەتـەواوی پابەنـدی هـەموو قورئانـەو هـەمووی بـەلاوە راست‌و حەقـە، جـا ئـەهلی کیتـاب بەهـەمووی دڵخـۆش بـن، یـان هەنـدێکیان هەنـدێکی رەت بکەنـەوە، ئـەوە رابگەیەنـە کـە ئـەو قورئانـەی بـۆ تـۆ هـاتووە دوا ئـەحکام‌و یاسـای خوداوەنـدە بـۆ ئادەمیزاد، پێیان بڵێ پەروەردگار بـەزمانی عـەرەبی نـازڵی کـردوەو بەتـەواوی لێـی تێدەگەم‌و بۆ هەموو شتێك دەگەڕێمەوە بۆ قورئان‌و هەر ئەو دەکەم بەسەرچاوەی یاسای ژیانم،

دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْماً عَرَبِيّاً﴾ وەکوو لەپێش تـۆوە پێغەمبـەرمان ناردوون‌و نامەمان بۆ سەر نازڵ کردون، نازڵمان کردوە بۆ سەر تـۆ قورئـانی پـیرۆز: کـە رێـك‌و پێـك‌و بـێ عـەیب‌و بـێ کـەم‌و کوڕیـیـە، یاسـایەکە بـەزوبانی عـەرەبی‌و بەزمانی گەل‌و نەتەوەکەت هاتۆتە خوارێ بۆ ئەوەی لێی حاڵی بن‌و تێی بگەن،

قورئانی ناو ناوە (حوکم) واتە: جوداکەرەوەی حەق لەبەتاڵ چونکە حـەڵاڵ‌و حەرام لەیەك جیادەکاتـەوە، نموونـەی ئـەم ئایەتـە ئایـەتێکی تـرە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا أَرْسَـلْنَا مِـن رَّسُـولٍ إِلاَّ بِلِسَـانِ قَوْمِـهِ لِيُبَيِّنَ لَهُـمْ﴾ابـراهیم/٤، جـا هەرچـەندە

پێغەمبەر بەزمانی عەرەبی سروشی بۆ هاتووە، بەڵام ئایینەکەی گشتییەو بۆ هەموو کەسە وەکوو لەچەند ئایەتێکی تردا قورئان ئاماژەی پێ دەکا،

﴿وَلَئِنْ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنْ الْعِلْمِ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ شوێن هەواو ئارەزووبازی ئەوانە بکەوی کە ئینکاری هەندێ لەقورئان دەکەن‌و موجامەلەیان بکەی، وەکوو ئەوە روبکەیتە بەیتولمەقدیس پاش قیبلە گۆڕان، یان بەگوێرەی بیرو باوەڕی ئەوان هەڵس‌و کەوت بکەی، ئەوە دڵنیابە ﴿مَا لَكَ مِنْ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا وَاقٍ﴾ نیە بۆ تۆ لەغەیری خودا بەولاوە هیچ وەلی‌و یارمەتیدەرێك، کەس نیە بتوانێ تۆ لەعەزابی خودا بپارێزێ، کەوابێ بترسە لەوەی شوێن بیرو باوەڕی ئەوان بکەوی، وەکوو ئەوان هەڵس‌و کەوت بکەی!

بێگومان ئەم جۆرە ئوسلووبانە لەسەر شێوەی پەندی مەشهوورو بەناوبانگ (اياك أعني واسمعي ياجاره) یان کوردی وتەنی (بوکێ لەگەڵ تۆمەو خەسوو گوێت لێ بێ) مەبەستی بێ هیواکردنی کافرەکانە کە دڵنیابن پێغەمبەر هیچیان بەقسە ناکا، هەروەها هەڵنانی موسوڵمانانە لەسەر بەردەوام بوون‌و پابەند بوون بەفەرمانی ئایینەکەیانەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی گەیشتۆتە پلەو پایەیەك لەبیرو باوەڕدا پێویستی بەهەڵنان‌و هەڕەشە لێ کردن نیە، ئەو گەیشتۆتە (حەقولیەقین‌و عەینولیەقین) واتە: خیطابەکە بۆ پێغەمبەرەو مەبەست گەلەکەیەتی، لەهەمان کاتدا هەڕەشەیەکی توندو تیژە لەزانایان کە نابێ بەهیچ شێوەیەك دوای ئەوەی کە ئایینی حەقیان زانی‌و ناسی رێبازی گومڕایان بگرنەبەر،

کولەبی دەڵێ: جولەکەکان پێغەمبەریان بەوە عەیبدار دەکردو دەیانگوت: ئێمە نابینین ئەم پیاوە جگە لەژن مارەکردن هیچ هیوایەکی تری هەبێ! ئەگەر وەکوو دەڵێ: پێغەمبەر بێ، دەبوایە ئەرکی پێغەمبەرایەتی ئافرەتی لەبیر بردایەوە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِنْ قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجاً

وَذُرِّيَّةً﴾ واتە: ئەی موحەممەد! وەکوو چۆن تۆمان کردوە بەپێغەمبەرو ئادەمیزادمان کردون بەپێغەمبەر، هەموویان خواردن‌و خواردنەومیان هەبوە بەناو بازاڕدا رۆیشتوون، خێزانیان هەبوون، منداڵ‌و نەومیان لێ کەوتوونەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى﴾الكهف/١١٠.

لەصەحیحی بوخاری‌و موسلیم دا فەرموودەیەك هاتووە: ئەنەس ریوایەتی دەکا دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (وەلێ من وادەبێ بەرۆژوو دەبم‌و وادەبێ بەرۆژوو نابم، شەونوێژ دەکەم‌و دەشخەوم، گۆشت دەخۆم، ئافرەتیش مارە دەکەم، جا کەسێك ڕێبازی من پەسند نەکا ئەوە لەئوممەتی من نیە)،

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذی لەئەبو ئەیوبەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (أربع من سنن المرسلين: التعطر، النكاح، والسواك، والحناء)،

لەهەمان کاتدا فرەژنی پێغەمبەر ﷺ دوای تەمەنی (٥٤) ساڵی بوو، ئەمەش تەمەنێکە بەعادەت هێزی پیاوەتی تێدا کز دەبێ، کەوابێ فرەژنی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەرژەوەندی بانگەوازی ئیسلامی بووە، بۆ خزمایەتی دروستکردن لەنێوان موسوڵمانان‌و هۆزە عەرەبەکاندا بووە، مارەکردنی هەندێ لەخێزانەکانی بۆ قەرەبوو کردنەوەی مێردەکانیان بووە، مێردەکانیان لەرێگای ئیسلامدا شەهید بوون‌و بێ مێرد کەوتوونەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە بۆیان مارەی کردونەوە!!!

جا وەکوو ریوایەتکراوە موشریکەکان تانەو تەشەریان لەپێغەمبەر دەدان لەسەر ئەوە: کە موعجیزەو ئایاتی پێشنیارکراوی ئەوان ناخاتە ڕو، ئیتر پەروەردگار رەددی دانەوەو فەرموو: ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ ناگونجێ‌و لەتوانای هیچ پێغەمبەرێك دا نیە: کە موعجیزەو ئایاتی داوالێکراو لەلایەن گەل‌و نەتەوەکانیان بخەنەڕو، مەگەر خودا مەیلی لێ بێ‌و بزانێ: کە

لەهێنانی ئەو موعجیزانەدا حیكمەتی خودایی هەیەو بەرژەوەندی ئادەمیزادانی تێدا بەرچاو بگیرێ!

ئەی ئادەمیزادینە: بێگومان موعجیزەیەكی واتان بۆ هاتووە كە قورئانە، هیچ كەمو كوڕی تێدا نیە، كەسێك بیەوێ پەندو عیبرەتی لێ وەربگرێ كیفایەتە، ئەگەر لێی ورد ببنەوە پێویستیان بەموعجیزەی تر نیە، موعجیزەیەكی بەردەوامو نەمرە هەتا دونیا دونیایە، بەڵام ئەو گومڕاو سەرلێ شێواوانە لەبەر زێدە ڕۆچوونیان لەگومڕایی‌و كوفرو بێدینیدا بەم موعجیزە گەورە پەند ئامێز نابن‌و پەلپو بیانووی موعجیزەی تر دەگرن،

ئایاتو موعجیزەی پێشنیاریكراو بەگوێرەی داخوازی حیكمەتی پەروەردگار نەبێ نایەن، لەكاتێكدا دێن: كە هەر خودا دەزانێ‌و كەسی تر دەخڵی تێدا نین، لەهەموو ڕۆژگارێكدا ئەحكامو یاسای وا دادەنێ كە ببنە مایەی خێر بۆ ئادەمیزاد، دەی هیچ حیكمەتو مەصڵەحەتێك لەهێنانی ئەو موعجیزانەدا نیە كە ئەوان داوایان دەكەن ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ بۆ هەموو ڕوداوو فەرمانێك كە خودا نووسیونی تەمەن‌و كاتی دیاریكراو هەیە، هیچ موعجیزەو ئایەتێك پێش وەخت نایە، هیچ عەزابو سزایەك لەكاتی خۆی پێش ناكەوێ،

شەریعەتو یاسا بەرژەوەندی ئادەمیزادیان تێدایە، بەگوێرەی كاتو شوێن دەگۆڕێن، شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشوو وەكوو حەزرەتی موساو حەزرەتی عیسا، پاشان شەریعەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەگوێرەی ڕۆژگارەكانیان هاتوون، تەمەن‌و ڕزق‌و ڕۆژی‌و كردارو زانیاری‌و زانستی هەموو گەل‌و نەتەوەیەك كاتو ئەندازەی دیاریكراوی هەیە، پاش‌و پێش ناكەن‌و كەمو زیادییان بەسەردا نایە!

﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ﴾ پەروەردگار ئەوەی بیەوێ دەیفەوتێنێ‌و ئەوەی بیەوێ دەیهێڵێتەوە، ئەو شەریعەتو یاسایەی بیەوێ بیسڕێتەوە دەیسڕێتەوە، هەر

یاساو شەریعەتێکیش حیکمەتی خودا داخوازی بێو بەرژەوەندی ئادەمیزادانی تێدا بێ دەیچەسپێنێو نەسخی ناکاتەوە!

حەسەن دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە ئەوەیە: هەر کەسێکو هەر شتێك ئەجەلی هات دەیمرێنێ، کەسێکیش ئەجەلی نەهاتبێ دەیهێڵێتەوە.

نموونەی دونیا بەئەستێرەو مانگو خۆرو زەویو ئاوو هەوایەوە وەکوو کارگەیەك وایە هەموو ئامێرو ئیشو کارو کارمەندی رێك خرابن، ئیشو کاریان لەنێودا دابەش کرابێ، بەیاساو نیظامێکی تایبەتی بخرێتە گەڕو کاری پێ بکرێ، ئیتر دەیانبینی ئەمانە هەریەکەی کاری خۆی ئەنجام دەداو هەڵدەسوڕێ، کارمەندانی دێنو دەچن ئامێرەکانی هەڵدەخولێنو رۆژانە ئەم کارو پیشەیەی کارمەندو ئامێرەکان دووبارە دەبێتەوەو گۆڕانکاری تێدا نابێ! جیهانیش پەروەردگار بەگوێرەی زانیاری خۆی یاساو نیظامێکی بۆ داناوەو هەڵیدەسوڕێنێ، بەگوێرەی ئەم یاساو نیظامە مانگو خۆرو ئەستێرەکان لەگەڕدانو هەڵدەسوڕێنو دێنو دەچن، گیاو گژو دارو درەختو ئاژەڵو ئادەمیزاد دێنە گۆڕەپانی ژیانەوە، مردنو ژیانیان تێدا ئەنجام دەدرێ، ئەستێرەیەك هەڵدێ یەکێکی تر ئاوا دەبێ، گیایەك شین دەبێ یەکی تر دەپەڕێو دەبێتە پوشو پەڵاش، پێغەمبەرێك دەمرێ یەکێکی تر راست دەبێتەوە ئایینێك بڵاو دەبێتەوەو ئاینێکی تر دەپوکێنێتەوە، هەر بەم جۆرە چین لەدوای چین گەلو نەتەوەو هۆزو بنەماڵەو ئایینو حیزبو پارتو یاساو نیظام دێنو بەسەر دەچن، ئەمانە هەموویان بەگوێرەی مەنهەجێکی نەخشە بۆ کێشراو ئەنجام دەدرێن، هەر بەم جۆرەش ئایەتی قورئان نەسخ دەکرێتەوەو ئایەتێکی تر دێتە شوێنی ئەوەتا: شەو دەخاتە شوێنی رۆژو گەلو نەتەوەیەك لەجێگا گەلو نەتەوەیەکی تر جێگیر دەبێ، ئایینی پێغەمبەرێك دێتە شوێنی ئایینی پێغەمبەرێکی تر، وەکوو چۆن ئایینی نووحی بەئایینی ئیبراهیم نەسخ کردەوە ئایینی ئیبراهیمی بەتەوراتو تەورات بەئینجیلو ئینجیل بەقورئان

نەسخ کردەوە،، هەر کتێبێ، هەر یاساو نیظامێك خودا بیەوێ دەوامی پێ بدا دەوامی پێ دەداو پایەداری دەکا، ئەوەتا بڕیاری داوە قورئان یاسای بەردەوامی ئادەمیزادبێ تا ڕۆژی قیامەت نەسخ نەبێتەوە، ئەمە دەربارەی ڕەفتاری ئادەمیزاد، دەربارەی پەروەردگاریش بۆخۆی ئەوە ﴿وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾ بنەماو سەرچاوەی هەموو کتێبەکانی لایە: کە (لەوحولەحفووظە) هەموو شتێکی تێدا تۆمار کراوە،

یان مانای ﴿وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾ لای خودایە ئەو کتێبەی: کە هیچ گۆڕانکارییەك ڕووی تێ ناکا، یان مەبەست: زانستی خودایە واتە: هەرچی ڕوو دەداو لەدەفتەری فریشتەکاندا دەنووسرێ دەبێ مووافیقی ئەوە بێ کە لەزانستی خودادایە،، چونکە زانیاری پەروەردگار، کانو سەرچاوەی هەموو شتێکە ئیبنو عومەر دەڵێ: لەدەمی پێغەمبەرم ﷺ ژنەوت دەیفەرمو: ﴿یمحوا الله ما یشاء ویثبت الا السعادة والشقاوة والموت﴾ ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پەروەردگار ئەوەی بیەوێ لایدەبا، ئەوەی بیەوێ دەیچەسپێنێ جگە لەچەند شتێك: دروستکردن، ڕەوشت، ئەجەل، ڕزقو ڕۆژی، بەختەوەریو بەدبەختی،،

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە ئەوەیە: پەروەردگار لەقەزاو قەدەر چی بوێ لای دەباو چی بوێ دەیچەسپێنێ، فەرموودەیەك هەیە ئیمام ئەحمەدو نەسائیو ئیبنو ماجە لەثەوبانەوە ڕیوایەتی دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (ان الرجل لیحرم الرزق بالذنب یصیبه، ولا یرد القضاء الا الدعاء، ولایزید في العمر الا البر)،[٥]

لەریوایەتی حاکمدا بەم شێوە هاتووە دەفەرموێ: (الدعاء یرد القضاء، وان البر یزید في الرزق، وان العبد لیحرم الرزق بالذنب یصیبه) دوعا قەزا ڕەت دەکاتەوە، چاکە ڕزقو ڕۆژی زیاد دەکا، بەندە لەرزقو ڕۆژی بەهۆی تاوانەوە بێ بەش دەبێ،

(٥) تەفسیری المنیر ج ١٣/ ١٨٦.

لەفـەرموودەی صـەحیحدا هـاتووە دەفـەرموێ: بـەجێهێنانی صـیلەی رەحـم تەمەن درێژ دەکا،

## بەکورتی:

ئایەتەکە گشتییەو هەموو شتێك دەگرێتەوە، هەموو شتێك ئاڵو گۆڕکردنو لابـردنو چەسـپاندن رویـان تێـدەکا، بـەڵام ئەصـلی لەوحولـەحفوظ گـۆڕانی تێـدا ناکرێ،

دەتـوانین بڵـێین: مانـای ﴿يَمْحُـوا اللَّـهُ مَـا يَـشَاءُ وَيُثْبِـتُ﴾ بـەم جۆرەیـە: موشریکەکانی مەککە پێیان ناخۆشە کە تۆ بویتە رەهبەری گشت ئـادەمیزادو پلـەو پایەی پێغەمبەریت پێ دراوە، بێ ئاگان لەوەی پەروەردگار بەویستو ئیرادەی خۆی هەرچی بوێ دەیکا، لەبوونەوەردا شتێك لادەباو شـتێکی تـری دەخاتـە شوێن، شـەو لادەبـاو رۆژ دەخاتـە شـوێنی، گرانـی دەگـۆڕێ بەهـەرزانی شـەڕو جـەنگ دەگـۆڕێ بەئاشتیو ئارامی، نەخۆشی لادەبا تەندروستی بڵاو دەکاتـەوە، عـەزیز زەلیـل دەکا، نەوی بڵند دەکاو نـەزان زانـا دەکا، بـێ بـڕوا دەگـۆڕێ بەئیمانـداری راسـتاڵ، هـەروا بەپێـچەوانەشەوە ئـەم روداوانـە هـەموویان یەکـە یەکـە لەلەوحولـەحفوظـدا چەسـپێندراون، هۆکـاری مـەحوو کردنـەوەی فلان شـتو چەسـپاندنی فیـسار شـت لەلەوحی مەحفوظدا نوسراون، لای خودایش زانیاری ئەزەلی هەیـە پێـی دەگـوترێ: (أم الكتـاب) زانیـاری (ام الكتـاب) گۆڕانکـاری بەسـەردا نایـەو ثابیـتو چەسـپاوە.

## ئەركی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ گەیاندنی شەریعەتە پاداش‌و سزا بەدەست خودایە

﴿ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا ۖ يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی ئەوەی کرد: کە کافرەکان پەڵپ‌و بیانوویان بەپێغەمبەر گرت‌و داوایان لێ کرد زوو ئەو عەزابەی هەڕەشەی پێ لێ کردون بۆیان بێنێ،

ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر گەیاندنی پەیامەکەیەتی‌و بەس! ئاماژە بەئەوەش دەکا: کە پەیدا بوونی ئەو عەزابە هەڕەشە پێ لێ کراوەو نیشانەکانی پەیدا بوون‌و خودی عەزابەکەش نزیکە،

ئـەمجار ئـەوە روون دەکاتـەوە: کـە فـرتو فێڵـی ئـەو موشـریکانە زیـان بـە موسـوڵمانان ناگەیـەنێ، سـەرکەوتنو سـەروەری هـەر بـۆ خوداپەرسـتانە، تێـشکانو ریسوایی بۆ تاوانبارانە، رەدی بیرو بۆچونی جولەکەکانیش دەداتـەوە کـە دەیـانگوت موحەممەد پێغەمبەر نیە بـەوە: کـە خـودا شـایەتی راسـتی پێغەمبەرایەتیـەتی بـۆ دەدا، شایەتیدانی خوداو ئەوانەی ئیمانیان پێ هیناوە لەخاوەن نامـەکان بەسـیەتی، دەفـەرموێ: ﴿وَإِنْ مَا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْـكَ الْـبَلاغُ وَعَلَيْنَـا الْحِسَابُ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر لەماوەی ژیانـتدا برێ لەو هەڕەشەو گوڕەشـانەی لەدوژمنانەکانتمان کردوە بیانهێنینە دیو پیشانت بدەین چۆن کافرو موشریکەکان ریسوا دەکەینو سزایان دەدەینو لەناویان دەبەین، یان پێش ئەوەی ئەوەیان بەسەر بێنین ئەتۆ بمرێنین هەر لایەکمان برِیار دابێ، ئەوەی لەسـەر تۆ پێویستە ئـەنجامی بدەی راگەیاندنو بڵاوکرنـەوەی پـەیامی ئیـسلامە، ئێمـە تۆمـان نـاردوە بـۆ ئـەوەی پەیامی پەروەردگار بگەیەنیو ئەنجامیشت داوە!

ئیتر لەوە زیاتر ئەتۆ بەرپرس نی، حیـسابو لێکۆڵینـەوە لەگـەڵیانو پـاداشو سزادانەوەیان بەچاکەو بەخراپە ئیشی ئێمەیەو تایبەتە بەئێمەوە،

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم ئایەتـە مەککییـەو پـێش واجـب بـوونی جیهاد هاتۆتە خوارێ، نموونەی ئەم ئایەتە ئایـەتێکی تـرە کـە دەفـەرموێ: ﴿فَـذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ، إِلَّا مَن تَوَلَّى وَكَفَرَ، فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَـذَابَ الْـأَكْبَرَ، إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾الغاشية/٢١-٢٦.

## بەکورتی:

بانگـەوازخوازانی رێبـازی ئیـسلام تـەنیا ئـەوەیان لەسـەرە ئـەرکی سەرشـانی خۆیان لەبواری بانگـەوازیدا بـەجێ بێـنن، تـەنیا ئـەوەیان لەسـەر پێویـستە ئـەوەی

خـودا پێـی خۆشـه بـڵاوی بكەنـەوە، نـابێ هەست بەتێـشكانی خۆیـان بكـەن، دەبـێ هەمیشه ورەیان بەرز بێ،

بێگومان دەستی قودرەتی خـودا بەدەوروبەریانـەوە دیـاره چەند شـارو گونـد لەدەوروبــەریان هــەن شــوێنەواریان مــاوە كــاتی خــۆی لەســەر سەرپێــچی كــردن‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەكانیان وێران كراون‌و دانیشتوانەكانیان لەناوبراون!

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ ئایـا ئـەو موشـریكانەی شـاری مەككـه لـەبیریان چـۆتەوە؟ یـان گومانیـان هەیـە؟ نـابینن ئێمـه هـەر كـاتێ گـەل‌و نەتەوە لەخۆیان بایی بوون‌و كافر بـوون، ئێمـه لـەهێزو توانایـان كـەم دەكەینـەوە، ژیارو دەسەڵاتیان كەم دەكەینەوە، لەروبەرێكی تەسـكی زەویـدا خرپـان دەكەینـەوە، بەپێـچەوانەی حـاڵ‌و وەزعـی پێـشوویان كـه خـاوەن دەسـەڵات‌و هێـزو توانـا بـوون، دەسەڵاتیان بەسەر روبەرێكی فراوانی زەویدا هەبوو،

یان ئایا نابینن ئێمه رۆژ بەرۆژ پارچـه زەوییـەكان رزگـار دەكـەین، وڵات دوا وڵات لەكافران دەستێنینەوەو دەیخەینه سەر وڵاتی ئیسلام‌و خەڵكی پۆل پۆل دێنـه سـەر ئـایینی ئیـسلام‌و موسـوڵمان دەبـن، ئـەوەی قبـووڵی ئـایین ناكـا بەكوشـتن‌و بەئەسـیر كـردن‌و دەركـردن زەوییـان لـێ پـاك دەكەینـەوە، ئایـا ئەمـه پێـشەنگ‌و رۆخۆشكەرە نیـه بـۆ هـاتنی ئـەو سـزاو عەزابـەی هەڕەشـەمان پـێ لێ كـردوون؟ ئایـا ئەمه ترساندنی ئەوان‌و هی تریش نیه لەعەزاب‌و ناڕەحەتی‌و چەرمەسەری جۆراو جۆر كه لەدونیاو قیامەتدا دێته رێیان؟ وەكوو لەشوێنێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ ؟﴾الأنبياء/٤٤.

﴿وَاللَّهُ يَحْكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِـهِ﴾ خـودای بـاڵا دەسـت بڕیـار دەداو كـەس نیـه بڕیاری ئەو هەڵوەشێنێتەوە،

بێگومـان دابو نـەرێتی خـودا وا هـاتووەو وا جـاری بـووە: کـە زەوی لەلایـەن بەندە راستاڵاکانیەوە ئاوەدان بکرێتەوە، بەعەداڵەتکاری هەڵسو کەوتی تێدا بکەن، بڕیاری سەروەریو شکۆمەندیی بۆ موسوڵمانان داوە بەمـەرجێ بـەگوێرەی پـەیامی خودا هەڵسو کەوت بکەن، بەدبەختیو سەرشۆڕیشی بڕیار داوە بۆ ستەمکاران!

﴿وَهُـوَ سَـرِيعُ الْحِـسَابِ﴾ پـەروەردگار بـەم زوانـە لەقیامـەتدا حیـسابو لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ بەنـدەکانیدا دەکا، تۆڵەی تـاوانو، ستەمکارییان لـێ دەسـتێنێ، عەزابو سزای خودا دێو گومان لەهاتنیدا نیـە، ئـەی پێغەمبـەر پەلـە لەعـەزابیان مەکـە، بێگومـان خـودا وێـڕای ئـەوەی لـەدونیادا بەسـزای کوشـتنو بـەدیل گـرتنو ریـسواکردن سـزایان دەدا، لەقیامـەتیش دا عـەزابی سـەختی بـۆ ئامـادە کـردونو بـا چاوەڕان بن ئەو عەزابە دێو هەموو هاتوێکیش نزیکە!!

ئەمجار پەروەردگار دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ دەکاوئەوەی پێ رادەگەیەنێ: کە گەلەکـەی ئـەو یەکـەم کـەس نـین لەبەدرۆخـستنەوەی پێغەمبەرەکـەیاندا، لەوەپێشیش گەلو نەتەوەکانی تر ئەزیەتی پێغەمبەرەکانی خۆیان داوە، بـەدرۆیان خستونەوە، ئیتر پەروەردگار بەعەزاب گرتنیو تێکیەوە پێچانو دەفەرموێ: ﴿وَقَـدْ مَكَـرَ الَّـذِينَ مِـنْ قَـبْلِهِمْ﴾ زۆر لـەکافرەکانی گەلـە پێـشینەکان فـرتو فێڵیـان لەپێغەمبەرەکانیان کرد، بەدرۆیان خستنەوە ئەزیەتیان دان، لەوڵات دەریان کـردن؛ وەکوو ئـەوەی نـەمروود لەگـەڵ حـەزرەتی ئیبراهیمـی کـرد، یـا فیرعـەون دەرحـەق بەحـەزرەتی موسـای کـرد، یـان جولەکـەکان بەحـەزرەتی عیـسایان کـرد، یـان عـادو ثەموودو گەلی لووط،،هتد، جا کە وەختـی خـۆی هـات خـودا یەکـە یەکـە گرتنـیو لەناوی بردن، زاڵمو موفسیدەکانی قەلاچۆ کردن،

﴿فَلِلَّهِ الْمَكْرُ جَمِيعاً﴾ پیلانی پیلانگێڕان بـەبێ ئیزنـی خـودا چ رۆڵێکـی نیـە، بەگوێرەی قـەزاو قـەدەری خـودا نـەبێ مـەکری کافرەکـان هـیچ کاریگـەریـەکی نیـە،

کەوابێ پێویستە هەر لەخودا بترسن، چونکە هەموو شتێك؛ هەموو مەکرو پیلانێك بەدەست خودایە، هەرچی ئەو بڕیاری بوونی نەدا نابێ.

لەقورئاندا زۆر جار مەکر وەپاڵ خودا دراوە، هەڵبەتە مەکری خودا لەجۆری مەکری ئادەمیزاد نیە، وەکوو چۆن زانیاری‌و شنەوایی‌و بیستنی خودا وەکوو هی ئادەمیزاد نیە، هەروا دیتن‌و زیندویی‌و بەدیهێنان‌و دانایی...،هتد.

نموونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللّهُ وَاللّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ الأنفال/ ٣٠، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُوا مَكْراً وَمَكَرْنَا مَكْراً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ، فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَاهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ، فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا﴾النمل/ ٥٠-٥٢.

بەم جۆرە پەروەردگار پێغەمبەری خۆی لەکاریگەری مەکری کافرەکان دڵنیا دەکاتەوەو بەڵێنی ئەوەشی دەداتێ: کە لەئاکامدا سەرکەوتن هەر بۆ خوداپەرستانەو هەر ئەوان سەرفرازو شکۆمەندن!!

﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ خودا دەزانێ هەموو ئادەمیزادێك چ دەکاو چی کردوە، خۆشەویستانی خۆی پاریزگاری دەکاو پیلانگێڕان سزا دەدا، هەر کەسە بەئەندازەی کردەوەکانی پاداش‌و سزا وەردەگرێتەوە.

﴿وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ!﴾ لەوەبەولاوە رۆژی قیامەت کە کافرەکان حیساب‌و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دا کرا، پێغەمبەرو موسوڵمانان چونە بەهەشتەوەو کافرەکان بۆ دۆزەخ بەرێ کران: ئەو کاتە دەزانن کێ سەرەنجام‌و ئاکامی پیرۆزەو بەختەوەری‌و سەرفرازی کێ وەدەستی دەهێنێ.

ئەمجار پەروەردگار رەدی ئەوانە دەداتەوە کە ئینکاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەکەن‌و دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلاً﴾

ئەوانـەی کـافرن دەڵێن: ئـەتۆ رەوانـەکراوی خـودا نیـت، ئـەتۆ پێغەمبـەرێك نیـت لـەخوداوە نێردرابـی بـۆ ئـەوەی ئـادەمیزاد بـانگ بکـەی بـۆ خـودا پەرسـتیو یەکتاپەرسـتی، کەسـێك نـی ئـەرکی رزگـار کردنـی ئـادەمیزاد خرابێتـە ئەسـتۆت لەتاریکی کوفرو بێدینی رزگاریان بکەی بۆ روناکی ئیمانو باوەڕ،

ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: ئاخوندێکی نەصرانی لەیەمەنەوە هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ، پێغەمبـەر لێـی پرسـی: ئـەرێ لەئنجیلدا بـاسو خواسـی پێغەمبـەری ئاخرزەمـان هەیـە؟! وتـی: نەخـەیر، ئـیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلاً ...الآية﴾ ی نارده خوارێ،

﴿قُلْ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیـان بڵـێ: مـن خـودام بەسە بۆ ئەوەی شایەدیم بۆ بدا کە من پێغەمبەرمو پشتگیریم بکا! ئەوەتا پـەیامی بۆ ناردووم، سروشم بـۆ دەکا، ئـەم قورئانـە سەرئاسـایەی بـۆ نـازڵ کـردوم، هـەموو ئادەمیزادو جندۆکە ناتوانن وێنەی سـورەتێکی وەکـوو ئـەو بخەنـە رو، جـا کـە مـن ئـەو خـودا زانـاو بەدەسـەڵاتە پـشتگیریم بکـا ئـیتر چ حەوێجـەم بـەئێوە هەیـە، بەپێغەمبەرم بناسن؟!

﴿وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ﴾ هـەروەها ئەوانـەی خـاوەن نامـەنو بڕوایـان پـێم کـردوە، وەکـوو عەبـدوڵای کـوڕی سـەلامو هـاوەڵانیو تـەمیمی (الـداری)و سـەلمانی فارسـیو هاوەڵانیـان، واتـە: وێـڕای شـایەتیدانی خـودا، شـایەتیدانی ئەمانیش، کە شایەتی پێغەمبەرایەتیم بۆ دەدەن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی ابراهیم

ناونانی ئەم سورەتە بەناوی (ابراهیم) لەم روەوەیە: کە بەشێك لەچیرۆکی ئەو زاتە پایە بەرزەی لەخۆ گرتووە، بەشێك لەژیانی حەزرەتی ئیبراهیم لەمەککەو پەیوەندیکردنی بەعەرەبەکان، هاتنە دونیای ئیسماعیلی کوڕی، پاشان دروستکردنی کەعبە لەلایەن ئیبراهیم‌و ئیسماعیلەوە،،،

سورەتی ئیبراهیم سورەتێکی مەککییە: واتە: لەمەککە نازڵ بووە، باسە سەرەکییەکانی ئەم سورەتەش وەکوو زوربەی سورەتە مەکییەکانی تر: بریتین لەباسی عەقیدەو یەکتاپەرستی‌و سروش‌و زیندوبوونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوەی رۆژی قیامەت!

بێگومان ئەم سورەتە کۆمەڵێك حەقائیقی سەرەکی دەربارەی عەقیدە لەخۆگرتووە، وەلێ دوو حەقیقەتی گەورە لەسەر لەبەری سورەتەکەدا خۆیان دەنوێنن، ئەو دوو حەقیقەتە لەگەڵ سێبەری باسی ئیبراهیم لەسورەتەکەدا پێکەوە گونجاون، یەکەمیان حەقیقەتی‌یەکیەتی پێغەمبەرایەتی‌و یەکیەتی بانگەوازو پەیامەکەیان‌و روبەڕو بوونەوەیان لەبەرامبەر کۆمەڵگا نەفام‌و بەدرۆخەرەوەکاندا،

حەقیقەتی دووەم نازو نیعمەتی خودایە بەسەر ئادەمیزادداو زیادبوونی نیعمەتی خودایە لەسەریان بەهۆی شوکرو سوپاسگوزاری بەندەکانەوە، هەرچەندە بەداخەوە زوربەی ئادەمیزاد لەئاست نازو نیعمەتی پەروەردگاردا سپڵەو پێ نەزان‌و کافرو بێ بڕوان‌و سوپاسگوزار نین.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوە :**

سورەتی ئیبراهیم درێژەپێدەری سورەتی (الرعد)ە ئەوەی لەوێدا بەمەجمەلی هاتووە لێرەدا شی دەکاتەوە، هەردوو سورەتەکان باسی قورئان دەکەن، لەسورەتی (الرعد)دا پەروەردگار فەرمووی: قورئانمان نازڵ کردوە نامەیەکی موحکەمو پتەوو بێ عەیبو بێ کەمو کورپیە بەزمانی عەرەبییە، فەرمووی: ﴿وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْماً عَرَبِيّاً﴾الرعد/٣٧، لێرەشدا یەکەم ئایەت باسی حیکمەتی ناردنی قورئان دەکا: کە بریتییە لەرزگار کردنی ئادەمیزاد لەتاریکی گومڕاییەوە بۆ روناکی ئیمان،

لەهەردوو سورەتەکاندا ئەوە دەچەسپێنێ: کە نازڵکردنی ئایاتی کەونی تەنها بەدەست خودایەو کەسی تر دەسەڵاتی ئەوەی نیە، ئەوەتا: لەسورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾الرعد/٣٨، لێرەشدا لەسەر زوبانی پێغەمبەران دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ابراهیم/١١.

لەهەردوو سورەتەکاندا ئایاتی کەونی دیاری کراون، وەکوو راگرتنو بەرز کردنەوەی ئاسمان بەبێ کۆڵەکە، راخستنی زەوی، رامکردنو هێنانو بردنی مانگو خۆر، چەقاندنی کێوەکان لەزەویدا، دروستکردنی میوەو بەروبوومی جۆراو جۆرو خاوەن تامو رەنگی جیا جیا،

لەهەردوو سورەتەکان دا باسی زیندوبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت کراوە، نموونەی حەقو بەتاڵ هێندراوەتەوە، باسی فرتو فێڵی کافرو بێدینەکان کراوە، فەرمان بەتەوەککولو پشت بەخودا بەستنیان تێدا دووبارە کراوەتەوە،

**سورەتی ئیبراهیم بەگشتی باس لەم شتانە دەکا :**

١- چەسپاندنی بنەمای عەقیدە، وەکوو ئیمان بەخوداو بەپێغەمبەرانو بەزیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوە، هەروەها دانانی بەتاکو تەنهایی خوداو

ناسـينى پـەروەردگار، بەديهێنـەرى ئاسمانـەكانو زەوىو مەبەسـت لـەنازڵكردنى قورئان: كە رزگاركردنى ئادەميزادە لەگومڕايى يەوە بۆ روناكى ئيمان، هەروەها يەكيەتى مەبەستى پێغەمبەرانو بانگەوازييان بۆ بنـەما سـەرەكييەكانى عەقيـدەو رەوشتە بەرزەكانو خواپەرستىو دووركەوتنەوە لەرێبازى شەيتان،

٢- بەڵێنو هەڕەشە: سەرزەنشتكردنى كافرەكانو هەڕەشە لێكردنيـان لەسـەر كوفرو ترساندنيان بەعەزابى بەئێش، هەڵنانى موسوڵمانان بۆ چاكەكردنو مـوژدە پێدانيان بەبەهەشت،

٣- باسى ناردنى پێغەمبـەران بـۆ سـەر گەلو نەتـەوەكانيان هـەر پێغەمبـەرە بـەزمانى گەلەكەى نێـردراوە بـۆ ئـەوەى زوو لـەزمانى حـاڵى ببنو لەبەرنامەكەى بگەن!

٤- دڵدانەوەى پێغەمبەر ﷺ بەرونكردنەوەى ئەو ناخۆشىو دەردى سـەريـيەى بەسەر پێغەمبەرەكان هاتووە لەگەڵ گەلو نەتەوەكانياندا،

٥- دوعاو نزاى حەزرەتى ئيبراهيم ﷺ دواى تەواو كردنى بيناى كەعبە، بـۆ دانيـشتوانى شـارى مەككـە كـە لەئاسـايشو ئـارامىدا بـژين، خـودا رزقو رۆزييـان بەسـەردا برێـژێ، دڵـى ئـادەميزادان بەودەڤـەرەوە پەيوەسـت بـێ، هـەروەها دوعـاى ئـەوەش كـە نـەوەو وەچـەكانى لەبتپەرسـتى بپـارێزێ، هـەروەها شـوكرو سوپاسـى ئيبراهيم بۆ خودا: كە بـەپيرى منـداڵى پـێ داوە، تـۆفيقى خـۆىو نـەوەكانى بـدا بـۆ ئەنجامدانى نوێژەكانيانو ئەمجار داواكردنى لێخۆشبوون بـۆ بـاوكو دايكـى،، هـەروا گــەلێ شــتى تــر كــە لــەكاتى راڤــەكردنى ئايەتــەكاندا شــى دەكرێنــەوە!

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ ﴾

﴿الر﴾ الف، لام، را [٦] ﴿كتاب أنزلناه اليك﴾ ئەم نامە پیرۆزە کە پێك هاتووە لەم پیتانە، نامەیەکی ئاسمانییە نازڵمان کردوە بۆ سەر تۆ، ئەتۆ بۆخۆت هەڵت

(٦) دەربارەی مانای ئەم پیتە (مقطعانە)هەمان ماناو راو بۆچون: کەلەسەرەتای سورەتی (البقرة) دەربارەی (الم) ئاماژەمان پێ کردن لێرەدا بەرچاو دەگیرێن،

نەبەستووە، ئێمە بۆمان ناردووی بۆ مەبەستێك: ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بەگشتی لەتاریکی گومڕایی رزگار بکەی؛ تاریکی خەیاڵاتو وەهم، تاریکی دابو نەرێت، تاریکی سەرگەردانیو فرە خودایی‌و بتپەرستی، سەرگەردانی لەبیرو بۆچوونی پڕوپووچو پێوەرو تەرازوی لاسەنگی ئادەمیزاد، تۆمان کردوە بەپێغەمبەرو قورئانمان بۆ ناردووی بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لەم هەموو تاریکیانە رزگار بکا! دڵو دەروون رۆشن بکاتەوە، بیر بۆچون روناك بکاتەوە واقیعی ژیانو دابو نەریتەکان بگۆڕێ!

ئیمان بەخودا روناکاییەکە لەدڵو دەروونەدا هەڵدێو ئەو گیانو جەستەیەی ئادەمیزاد: کە پێك هاتووە لەگڵو گیان روناك دەکاتەوە، هەر کاتێ ئەو جەستەیە نووری ئیمانی تێدا نەبێ مشتەخۆڵێکی تاریکستانە، خوێنو ئێسقانو گۆشتە چ جوداوازیەکی لەگەڵ ئاژەڵدا نیە، بڕوا بەخودا روناکییەکە نەفسو گیان روناك دەکاتەوە، رێبازی راستی ژیان دەدۆزێتەوەو حەق دەناسێ، هەرکاتێ ئادەمیزاد رێبازی حەقی دۆزییەوە لەسەر هیدایەتو بەپێی بەرنامەی حەق هەنگاو هەڵدەنێو سەرگەردان نابێ!

﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ قورئانمان بۆ ناردووی بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لەگومڕایی رزگار بکەی بۆ روناکایی ئیمان بەهۆی تەوفیقی خودایی بەهۆی لوطفو بەخششی خودای خۆیان، بەهۆی ناردنی نووری هیدایەت بۆ ناو دڵو دەروونیان، کەوابوو توانای پێغەمبەر تەنها راگەیاندنە، ئەرکی سەرشانی ئامۆژگاریو رونکردنەوەیە، ترساندنو موژدە پێدانە، بەڵام دەرهێنانی ئادەمیزاد لەگومڕاییەوە بۆ نوور ئەوە تەنها بەئیزنی خودا دێتە جێ، بەگوێرەی سوننەتی خوداو ویستو ئیرادەی زاتی پاکی دەستەبەر دەبن، پێغەمبەر تەنها پێغەمبەرە،

﴿إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ قورئانمان بۆ ناردووی بۆ ئەوەی ئادەمیزادان شارەزا بکەی بۆ رێبازی راست، رێبازی خودایەکی وەها کە باڵادەستی هەموو کەسە،

هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتی خۆیدایە، لەسەر هەموو کردارو گوفتارێکی سوپاسکراوە، هەموو کارێکی پڕحیکمەتو عەدالەتە، هەموو هەواڵێکی راستو دروستە،

﴿اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ پەروەردگارێکی وەهایە؛ هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە: بەدروسکردنو خاوەنیەتیو هەڵسوڕاندنو ئاڵو گۆڕتێداکردن هەمووی بەدەست پەروەردگارەو هی ئەوە! هەر ئەو خاوەنی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیاندایە، حەوێجەی بەکەس نیە، باڵادەستو خاوەن دەسەڵاتە بەسەر بوونەوەرو ئەوەی تێیدایە،

ئەم صیفەتە زۆر جار لەقورئاندا دووبارە بۆتەوە، بۆ ئەوەی سەرەنجی ئادەمیزاد رابکێشێ بۆ گەورەیی پەروەردگارو بۆ بەکارخستنی فکرو هۆش لەتێڕوانینی مەخلووقاتو سوود وەرگرتن لەتێفکرین،

جا کەسێك هیدایەتی دراو بڕوای پێ کردی ئەوە باشەو بەختەوەرە، هەڵبەتە سیاقەکە هیچ باسی ئەم تاقمە ناکا، بەڵکوو هەڕەشە لەکافرەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَوَيْلٌ لِلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ شیوی دۆزەخ، یان سزای بەئێش لەرۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانەیە کە بڕوا بەپەیامی تۆ ناکەنو ئینکاری تاكو تەنهایی خودا دەکەن!

**ئەمجار پەروەردگار پێناسەی کافرەکان دەکا بەسێ صیفەت، سێ رەوشتیان بۆ دیاری دەکا:**

١- ﴿الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ﴾ ئەوانەی ژیانی دونیا هەڵدەبژێرن بەسەر قیامەتدا، گرنگی بەژیانی دونیا دەدەنو پێش ژیانی قیامەتی دەخەن، کار بۆ جیهان دەکەنو وازیان لەکارکردن بۆ قیامەت هێناوە،

٢- ﴿وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ مەنعی ئەوانە دەکەن: کە دەیانەوێ روبکەنە خوداو ئیمان بەپێغەمبەر بهێنن، کۆسپو لەمپەڕ دروست دەکەن لەبەردەم ئەوانەدا کە خەریکن بێنەسەر ڕێبازی راستو خوداپەسند، هەر کەسێ روبکاتە ئیسلام ئەوان ژیوانی دەکەنەوە،

٣- ﴿وَيَبْغُونَهَا عِوَجاً﴾ پێیان خۆشە ڕێبازی خودا خوارو خێچ بێ، دەیانەوێ ڕێبازی ئادەمیزادان دوور لەحەق بێ، بۆ ئەوەی لەگەڵ هەواو مەبەستی ئەواندا بگونجێ،

زومەخشەری دەفەرموێ: ئەصلی کەلامەکە بەم جۆرەیە؛ ﴿وَيَبْغُونَهَا عِوَجاً﴾ هەوڵ دەدەن خوارو خێچی بخەنە ناویانەوە، ڕێبازی خوارو خێچ بەرێبازی خودا لەقەڵەم بدەن، ئەگینا ڕێبازی خودا راستو دروستەو لادان لەحەقی تێدا نیە،

هەر لەم روانگەیەوەیە: کە ئەمڕۆ هەندێك لەبەناو موسوڵمانەکان لاسایی کافرەکانی سەردەم دەکەنەوەو دەڵێن: یاساکانی ئایین لەبواری حودود جینایاتدا زۆر توندرەوی تێدایە، زۆر رەقو توندو تیژەو بەکاری ئەم رۆژگارە نایە، دەڵێن: یاساکانی ئیسلام بۆ ئەو عەرەبە دەشتەکییانەی ئەو سەردەمە کۆنە گونجاو بووە، بەڵام هەرگیز شیاوی ئەوە نیە بکرێتە یاسای گەلێکی پێشکەوتوو یان نیمچە پێشکەوتووی ئەم رۆژگارە، بەراستی چەواشەکارییەکی بێ عەقڵانەیەو بیرو بۆچونێکی بۆشو بێ بایەخەو درۆیەکی شاخدارە بۆیە پەروەردگار لەشوێنێکی تردا دەرحەق بەئەوانو هەموو دوڕوو چەواشەکارێك دەفەرموێ: ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِباً﴾الكهف/٥.

کارنەکردن بەو حوکمە ئیسلامیانەو پاشگوێ خستنیان سەری کێشا بۆ زۆر بوونی تاوانو ستەمو ئەوەتا: بەردەوامو لەهەموو ئەو شوێنانەی حوکمی ئیسلامی تێدا کار پێ ناکرێ تاوانی کوشتنو دزیو رفاندنو تاڵانو برۆ،،هتد رۆژ لەدوای

رۆژ لەزیادبوون دایە، ئەوەتا بەگوێرەی ئاماری رەسمیو حكوومی لەوڵاتێكی وەكوو بەریتانیادا لەهەر چركەیەكدا پانزە هەزار تاوان ئەنجام دەدەرێ، هەڵبەتە لەئەمریكادا رێژەكە زۆر زۆرترە،

ئەو مولحیدو لاساكەرەوانە یان نازانن، یان خۆیان نەزان دەكەن: كە شەریعەتی ئیسلام شەریعەتو یاسایەكە هەرگەلو نەتەوەیەك پابەندی بێ بەختەوەرە ئەوەتا عەرەبەكان ئەو ماوەیەی پابەندی بوون رووی جیهانیان گۆڕی، ماوەیەكی زۆر فەرمانڕەوایی جیهانیان كرد، نموونەی عەدالەتكاریو ئاوەدانكردنەوەو زانستخوازی بوون، ستەمو ستەمكارانیان قەلاچۆ كرد، تەختو كورسی كیسراكانو قەیصەرەكانیان ژێرو زەبەر كردن، وڵاتیان خستە ژێر ركێفی خۆیانەوەو بەوپەڕی لێهاتوویی‌و لێزانیەوە فەرمانڕەوایی جیهانیان كرد، هەتا وردە وردە گیانی ئایینیان كزبوو، فەرمانو جڵەوگیرییەكانی قورئانیان پاشگوێ خستن، ئیتر بەو هۆیەوە خودا زەلیلی بەسەردا هێنانو سەروەری لێ كردن بەزەلیلیو، خۆشیو ئازادی لێكردن بەنەگبەتیو نەهامەتی، ئەمە دابو نەریتی خودایە، زەوی دەبەخشێ بەكەسانێك راستاڵ بنو بزانن رەدامی بێنن، بەخۆیان بچارێن، بەگوێرەی زانستو یاسای ژیان هەڵسو كەوت بكەن، هەر كاتێ لەو یاساو نیظامە لایان داو بەگوێرەی ئەسباب هەڵسو كەوتیان نەكردو گوێ بیسی فەرمانو نەهیەكانی خودا نەبوون ئەوە حاڵیان بەو حاڵە دەگا كە ئێستا موسوڵمانان تێی كەوتوون، رۆژێك ئەنفال دەكرێن، رۆژێك دەربەدەرو رۆژێك كیمیابارانو رۆژێك جینوسایدیان دەرحەق بەكار دەهێنرێ چاوگێڕانێك بەحاڵو وەزعی فەلەستینیەكانو كوردەكانو كشمیرییەكانو كۆسۆڤۆییەكان،،، هتد كە بەناو موسوڵمانو پێناسەی موسوڵمانییان هەیە، ئەم راستیەمان زیاتر بۆ ئاشكرا دەكەن، هەركاتێ موسوڵمانان بەخۆیاندا چوونەوەو سەرلەنوێ خۆیان رێك خستەوەو رابوونەوەو بەگوێرەی بەرنامەی خودا هەڵسو كەوتیان كردەوە، قورئان دەستوورو

یاسایان بوو (لا الـه الا الله محمـد رسـول الله) دروشمیان بوو، بێگومان هەمان سەروەری‌و نگین‌و فەرمانڕەواییەیان بۆ دەگەڕێتەوە، سەرلەنوێ دەبنەوە بەخاوەن دەسەڵات‌و فەرمانڕەوا لەسەر زەوی وەکوو پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾الانبیاء/١٠٥.

ئەمجار بێینەوە سەر سیاقی ئایەتەکە: کە دوای باسکردنی سێ رەوشتەکانی کافرەکان دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ ئەو کافرو موشریکانەی ئەوە رەوشتیانە لەگومڕاییەکی دوور لەحەقدان، لەنەزانی‌و نەفامیدا دەژین، هومێدی ئەوەیان لێ ناکرێ بێنە سەر رێگای راست‌و پەسند!

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار مەبەستەکانی قورئانی باسکردن‌و کاریگەری قورئانی لەبواری هیدایەتدا شی کردەوە، ئەوە رون دەکاتەوە: کە قورئان هۆکارێکی ئاسان‌و بەدەستە بۆ هیدایەتدان، چونکە بەزمانی قورەیش: کەسەرەتا بانگەوازیی ئەوان کراوەو زمانی زگماکی پێغەمبەر نێردراوە، ئەمەش نیعمەتێکی گشتییە بۆ ئادەمیزادو هەموو پێغەمبەرێك بەزمانی گەلەکەی شەریعەت‌و یاسای بۆ نێردراوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەرەکە بتوانێ خەڵکەکە حاڵی بکاو رزگاریان بکا،

بێگومان حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەزوبانی گەلەکەی رەوانە کراوە (هەرچەندە پێغەمبەری هەموو ئادەمیزادە) چونکە تەقدیری خودا وەهابووە: کە گەل‌و نەتەوەکەی سەرەتا موسوڵمان ببن‌و ئەوان پەیامی ئیسلام بڵاو بکەنەوەو ببنە هەڵگری ئەو ئایینەو بانگەوازی ئیسلام بۆ هەموو گەل‌و نەتەوەکانی سەر زەوی،

وەکوو ئاشکرایە تەمەنی پێغەمبەر ﷺ تەمەنێکی مام ناوەندی بوو، لەلایەن پەروەردگارەوە فەرمانی پێ کرابوو کە سەرەتا بانگەوازی گەل‌و نەتەوەکەی بکا، نیوە دوورگەی عەرەب لەکوفرو شیرك پاك بکاتەوە، ئەو ناوچەیە بکاتە لانەی

ئیسلامو لەوێوە ئایین بەناو وڵاتاندا پەخش ببێتەوە، لەو مەڵبەندەوە بانگخوازانی ئیسلام دەربچنو بەناو دونیا بلاو ببنەوە،

ئەوەی بەفیعلی رویدا ئەوەبوو قەزاو قەدەری خودا وای هێنا کاتێك نیوەدوورگەی عەرەب لەکوفرو بێدینی پاك کرایەوە، پێغەمبەر ﷺ گیانی پاکی سپاردو بۆ لای پەروەردگار گەڕایەوە!!

سوبحانەڵڵا! لەشکری ئیسلام لەلایەن پێغەمبەرەوە بەسەرۆکایەتی ئوسامەی کوڕی زەید رێك خرابوو بۆ پەلاماردانی دەوروبەری نیوەدوورگەی عەرەب، هێشتا سوپا بەڕێ نەکەوت پێغەمبەر ﷺ گیانی سپارد،

هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ پێش لەدونیا دەرچوونی بەنامە بانگەوازی ئاڕاستەی هەندێ گەلو نەتەوە کرد لەدەرەوەی نیوەدوورگە بۆ موسوڵمان بوونو چەسپاندنی ئەو راستییە: کە پەیامەکەی گشتییەو بۆ هەموو کەسەو پێغەمبەری سەرجەم ئادەمیزادەو خاتەمی پێغەمبەرانە!

ئەوەی کە خودا تەقدیری کردبوو، ئەوەی: کە لەگەڵ سروشتی تەمەنی ئادەمیزاددا دەگونجێو گونجا، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ گەلو نەتەوەکەی خۆی بەزمانی خۆیان تەبلیغ کردنو ئەو ئەمانەتەی خستە سەرشانی هاوەڵانیو بۆ ئەوەی ئەوان بەناو دونیادا بلاوی بکەنەوە،

کەوابێ چ دژایەتیەك نیە لەنێوان ئەوەدا: کە پێغەمبەرایەتیەکەی گشتییەو بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد نێردراوەو پەیامەکەشی بەزوبانی گەلو هۆزەکەیەتی!!

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر ﷺ کە نێردراوە بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی، کۆمەڵگای ئادەمیزاد جۆرەها گەلو نەتەوەن بەصەدان زوبان ئاخاوتن ئەنجام دەدەن، ئەمانە زمانیان جیایەو زۆر گەلو نەتەوەی وا هەیە بەچەند زوبان قسە دەکەن، ئەم کۆمەڵ لەئەو کۆمەڵ ئاگا، زمانی ئەم بەشە لەگەڵ زمانی

بەشەكەى تر جوداوازە، دەى كەوابێ ناردنى پێغەمبەر ﷺ بەزمانى زگماكى خۆى بەزمانى نەتەوەكەى زۆر باشترە لەوەى كە بەزمانێكى تر بنێردرايە، چونكە گەلو نەتەوەكەى لێى حاڵى دەبنو پەيامەكەى وەردەگرن بۆ خاوەن زمانەكانى دى شى دەكەنەوەو تێيان دەگەيەنن وەكوو چۆن بۆخۆيان تێى دەگەن!

ئەگەر قورئان بەزمانى ئەوان نازڵ نەكرايە كەسەرەتا قورئانيان بۆ نێردراوەو يەكەمجار خيطابيان ئاراستەكراوە،بەڵكوو بۆ هەموو گەلو نەتەوەيەك بەزمانى خۆيان قورئان بنێردرايە، ئەوە دەبوە جێگاى ئيختيلافو دووبەرەكىو دەرگاى كێشەو نيزاعى دەكردەوە، چونكە ئەو كاتە هەر گەلو نەتەوەيەك ئيديعاى ماناى وايان بۆ قورئان دەكرد: كە ئەويتريان تێى نەگا، تەحريفو تەصحيفى واى تێدا پەيدا دەبوو بەهۆى داواى پڕوپووچى رەگەزپەرستانى هەر گەلو نەتەوەيەك كە بەهيچ شێوەيەك لەقورئان نەچێو هيچى بەسەر هيچەوە نەبێ،،

دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ واتە: ئێمە هيچ پێغەمبەرێكمان لەپێغەمبەران نەناردوە ئيللا كە ناردومانە بەزمانى نەتەوەكەى خۆى ناردومانەو پەيامەكەى بەزوبانى ئەوان بووە، بۆ ئەوەى تێبگەنو بزانن چييان پێ دەگوترێ: لەفەرمانو نەهىو ئامۆژگارييەكانى حاڵى ببنو بەڵگەيان بەدەستەوە نەمێنێ، رۆژى قيامەت نەڵێن: لێى حاڵى نەبووينو نەمانزانيوە!

ئەمجار دواى ئەوەى پەروەردگار ئەوەى رونكردەوە: كە ئادەميزاد بيانووى ئەوەيان نيە: بڵێن: ئێمە لەشەريعەتەكە حاڵى نەبووين، باسى ئەوە دەكا: كە هيدايەتو گومڕايى بەدەست خودا خۆيەتى: ﴿فَيُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ واتە: دواى گەياندنى پێغەمبەر بۆ پەيامەكەى ئادەميزاد دەبنە دوو تاقم، بەشێكيان خودا هيدايەتيان دەداو دڵيان بەنوورى ئيسلام رۆشن دەكاو شوێن حەق دەكەونو رێبازى راست دەدۆزنەوە: كۆمەڵێكيشيان بەهۆى تاوانو بێدينى دڵيان

بەپەردەی گومڕایی دادەپۆشرێو حەق ناناسن، ئەمانە هەموویان بەقەزاو قەدەری خودا دێنەجێو هەرچی خودا بڕیاری لەسەردابێ گەڕانەوەی نیە،

﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ پەروەردگار بالادەستەو هیچ شتێك نیە بتوانێ بەرەنگاری ویستی خودا بكا، داناو لێزانە لەكارەكانیدا، شتێك ناكا بێ حیكمەت بێ پێچەوانەی یاساو سونەنی خودا بێ لەبوونەوەردا، چونكە خودا لەبوونەوەردا یاساو نیظامی خۆی هەیەو هەموو كاتێك بەگوێرەی سونەنی خۆی كار دەكا،

ئەم ئایەتە ﴿فَيُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ رەتدانەوەی كۆمەڵی قەدەرییەكانە دەربارەی كاریگەری مەشیئەت، هەواڵدانە بەوە: كە گومڕابوونو هیدایەت لەخوداوەن، واتە: خودا بەویستی خۆی كەسێكی بۆێ گومڕای بكا گومڕای دەكا، كەسێكیشی بوێ هیدایەتی بدا هیدایەتی دەدا، بەگوێرەی ئامادەباشی ئادەمیزاد بۆ گومڕابوون یان بۆ هیدایەت وەرگرتن، ئەوەی لەسەر پێغەمبەر پێویستە گەیاندنی پەیامەكەیەتیو شیكردنەوەیەتی بۆ خەڵكەكە، ئەركی هیدایەتدانی لەسەر نیە، هیدایەتدان بەدەست خودایە بەگوێرەی قەزاو قەدەری خۆی!

زومەخشەری دەڵێ: مەبەست بە(ئیضلال) گومڕاكردن: ئەوەیە: خودا وازی لێ بێنێو لوطفو كەرەمی لەگەڵ نەبێ، مەبەست بەهیدایەتدان: تۆفیقدانو لوطفو كەرەمیەتی، لەگەڵ بەندەكانیدا،

ریوایەتكراوە رۆژێك لەرۆژان، ئەبو بەكرو عومەر لەگەڵ كۆمەڵێك لەهاوەڵان ﷺ بەرەو ماڵی پێغەمبەر ﷺ رۆییشتن دەنگیان بەرز كردبووەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەم دەنگە دەنگە چیە؟ هەندێك لەهاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە ئەبو بەكرە دەڵێ كرداری چاكەمان لەخوداوەیەو خراپەكان لەخۆمانەوەیە، عومەریش دەڵێ: چاكەو خراپە هەردوكیان لەخوداوەن،

پێغەمبەر ﷺ لەرایەکەی ئەبو بەکر حاڵی بوو رووی وەرگێڕا بەجۆرێك لەدەم و چاویدا رووەرگێڕانەکە دیاربوو، ئەمجار رووی کردە عومەرو لەهەڵوێستی ئەویش حاڵی بوو، پێخۆشبوون بەروخساری موبارەکیەوە دیار بوو! پاشان فەرمووی: ئێستا ناوانتان دەکەم بەو شێوەیەی ئیسرافیل لەنێوان جوبرائیل و میکائیلدا ناوانی کرد: ئەی عومەر! جوبرائیل وەکوو تۆی گوت، میکائیلیش وەکوو قسەی تۆی گوت: ئەی ئەبو بەکر، ئیسرافیل وای حوکم لەنێواندا کردن: کە قەزاو قەدەر خێرو چاکەو شەرو نەگبەتی هەمووی لەخوداوەیە، ئەمەش ناوبژی کردنی منە لەنێوانتاندا،

ئیمام فەخرەدینی رازی پاش ئەوەی کە دەڵێ: ناگونجێ وای مانا بکەین بڵێین: مانای وایە: خودا کوفر لەئادەمیزاددا دەخولقێنێ،، سێ تەئویل بۆ ئایەتەکە ئاراستە دەکا:

١- مەبەست بە(ئیضلال) گومڕا کردن، حوکمدانە بەوەی کە فلان گومڕایە نەك گومڕا کردن،

٢- مەبەست بە(ئیضلال) بریتی بێ لەلادانیان لەرێگەی بەهەشت و روتێکردنیان بۆ رێبازی دۆزەخ، هیدایەتیش بریتی بێ لەشارەزایی کردنیان بۆ رێبازی بەهەشت،

٣- پەروەردگار: کە بەندەی گومڕابووی واز لێ هێنا وەکوو ئەوە وایە گومڕای کردبێ، هیدایەتدراویش کە بەلوطفی خۆی یارمەتی داوە وەکوو ئەوە وایە هیدایەتی دابێ،

بەکورتی پەروەردگار زۆرە ملێ لەبەندەکانی ناکا بۆ ئیمان و کوفر، ئادەمیزاد بەکافری دروست ناکا، قەت کوفرو بێدینی لەئادەمیزاددا دروست ناکا، کەوابێ مەبەست بە(ئیضلال) و (هیدایەت) رونکردنەوەی رێبازی شەڕو رێبازی خێرە.

## ئەركی سەرشانی حەزرەتی موسا بەرامبەر گەلەكەیی و ئامۆژگاریكردنی بۆیان

﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٥﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ أَنجَىٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٦﴾ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی بەیانكرد: كە موحەممەدی كردوە بەپێغەمبەرو رەوانەی كردوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لەتاریكی گومڕایی رزگار بكا بۆ

روناكايى ئيسلامو رەوانە كردنەكەى خێرو پيرۆزييە بۆ گەلەكەى، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا سەرگورشتەى موسا دەگێڕێتەوە، هەروەها چيرۆكى پێغەمبەرانى تريش دەگێڕێتەوە لەگەڵ گەلەكانياندا بۆ ئامازە كردن لەسەر ئەوە: كە مەبەست لەناردنى پێغەمبەران يەكێكەو هەموو پێغەمبەران بۆ يەك ئامانج نێردراون: ئەويش رزگار كردنى ئادەميزادە لەگومڕايى بۆ روناكايىو هەروەها دڵدانەوەى پێغەمبەرەو ورەپێدانيەتى بۆ خۆڕاگرتن لەسەر ئەزيەتدانى گەلەكەىو رێنمونى كردنيەتى بۆ هەڵسو كەوتكردن لەگەڵياندا بەشێوەيەكى گونجاو، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ واتە: وەكوو چۆن تۆمان رەوانە كردوە ئەى موحەممەد! نامەمان بۆ ناردوى بۆ ئەوەى خەڵك لەگومڕايى رزگار بكەى بۆ روناكايى! هەر بەو شێوەيە موسامان كردە پێغەمبەرو رەوانەمان كرد بۆ سەر گەلى جولەكەو نۆ موعجيزەمان پێداو فەرمانمان پێ كردو پێمان گوت: كە گەلەكەت لەتاريكى گومڕاييیەوە رزگار بكە بۆ روناكى، واتە: بانگيان بكە بۆ رێبازى خێرو چاكە، بۆ ئەوەى لەو گومڕايىو سەرلێ شێواوييەدا نەمێننەوە، بكەونە سەر رێبازى خواپەرستىو هيدايەتو روناكايى ئيمانو باوەڕ بەپەيامى خودا!

﴿وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾ ئامۆژگارييان بكە بەو روداوانەى لەرۆژانى خودا هاتوونە جێ، هەموو رۆژێك رۆژى خودان، وەلێ لێرەدا مەبەست ئەوەيە: ئامۆژگارييان بكا بەو رۆژانەى كە بەنيسبەت ئادەميزادەوە يان بەنيسبەت هەندێكيشانەوە رۆژى تايبەتين: لەم رووەوە كە روداوى گەورەو ناوازەيان تێدا رودراوە، ئەو روداوە سەرنج راكێشانەى بەسەر گەلو نەتەوەكانو پێغەمبەرەكانياندا تێپەڕيوە، جا روداوەكان نيعمەتو خۆشى بووبوون يان نيقمەتو عەزابو نەگبەتى بووبن،

یان (أيام الله) بەمانا نیعمەتەکانی خودایە، واتـە: نیعمەتـەکانی خودایـان بیر بهێنەوە کە بەسەریدا رشتن، لەژێر چنگی فیرعـون رزگاری کـردن لەچـنگ زەبـرو زەنگو ستەمی ئەو ملهورە دەری هێنان، دەریای بـۆ شـەق کـردن، دوژمنـی ملهوڕی خنکاندن، هەوری بۆ کردن بەسێبەر، مەنو سەلوای بۆ ناردنە خواریٚ،،،هتد،

بێگومـان حـەزرەتی موسـا بەدڵسۆزی لـێ بـڕا بـۆ ئامۆژگـاریکردنی گـەلو نەتەوەکەی بەرۆژانی گرنگ کە بەسەر خۆیـاندا تێپـەڕی، هـەروا ئـەم رۆژانـەی کـە بەسەر گەلو نەتەوەکانی تـردا تێپـەڕبوون؛ رۆژانـی گـەلی نـووحو گـەلی عـادو گـەلی ثەموودو ئەوانەی لەدوا ئەوانەوە هاتن هەمووی وەبیر هێنانەوەو بۆی باسکردن،

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بێگومـان لـەم یادخـستنەوەو وەبیر هێنانـەوەدا بەڵگەی زۆرو زەبەنـدە هـەن لەسـەر تـاكو تـەنهایی خـوداو دەسـەڵاتو توانـایبێ سـنووری بـۆ کەسـانێك لـەکاتی بـەڵاو ناخۆشـیدا خـۆگرو پـشوو درێـژن، لەکاتی نیعمەتو خۆشیدا سوپاسگوزارو شوکرانەژمێرن،

لەصەحیحی بوخاریدا هـاتووە: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: (ان أمـر المـؤمن کلە عجب، لایقضی الله له قضاءً الا کان خیراً له ان أصابته ضراء صبر فکان خیراً لـه، وان أصـابته سـرّاء شـکر، فکـان خـیراً لـه) بێگومـان ئیـشی موسـوڵمان هـەمووی سەرسوڕهێنەرە، هەر قەزاو قەدەرێك خودا بـۆی بڕیاربـدا بۆ ئـەو خێـرە؛ چونکە ئەگەر ناخۆشی تووش بوو صەبر دەگریٚو بۆی دەبێتە خێر، ئەگەر خۆشی تـووش هات، سوپاسگوزار دەبیٚو بۆی دەبێتە مایەی خێر،

قەتادە دەفەرمویٚ، چاك بەندەیەکە ئەو کەسـەی کـە تووشی بـەڵا دەبیٚ خـۆ دەگریٚو کە دەکەوێتە خۆشییەوە سوپاسگوزارە، کەوابیٚ پێویستە موسوڵمان خـاوەن صەبرو خاوەن شوکر بیٚ، لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا صـەبر بگـریٚو لـەکاتی خۆشـیدا شوکرانە ژمێر بیٚ،

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەوە بۆ گەل‌و نەتەوەکەت بگێڕەوە: کاتێك موسا بەگەلەکەی خۆی وت: ئەی نەتەوەکەم! یادی ئەو نیعمەتەی خودا بکەنەوە بەسەر خۆتاندا؛ کە لەفیرعەون‌و دارو دەستەکەی رزگاری کردن، یادی ئەو رۆژگارە بکەنەوە کە فیرعەون ئەوپەڕی سزاو عەزابی پێ دەچێژتن، ئەرکی قورس‌و کاری لەتوانادا نەبووی لێ داوا دەکردن، نێرینەکانی سەردەبڕین، مێینەکانتانی بۆ دەهێشتنەوە، ئەمەش سزادانێکی بەئێش‌و تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو خودا رزگاری کردن لەدەستی ئەو ستەمکارە ملهوڕە!

﴿وَفِي ذَلِكُمْ بَلاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ لەوەی بۆتان باسکراو خوێندرایەوە تاقیکردنەوەیەکی خودایی بوو؛ چ لەحاڵی ناخۆشی‌و تەنگانەداو چ لەحاڵی نیعمەت‌و خۆشیدا، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بزانێ ئاخۆ شوکرانە ژمێرە یان کوفران دەکا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾الأنبیاء/٣٥، یان دەفەرموێ: ﴿وَبَلَوْنَاهُمْ بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾الأعراف/١٦٨.

## بەکورتی :

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە پێویستە ئادەمیزاد لەژیانی دونیایدا لەنێوان دوو حاڵدا بێ، یان صابیرو خۆڕاگر بێ، یان شوکرانە ژمێرو سوپاسگوزار بێ، چونکە ئادەمیزاد لەژیاندا یان لەتەنگانەو ناخۆشیدایە، دەبێ خۆڕاگر بێ، یان لەخۆشیدایە، دەبێ سوپاسگوزار بێ،

كات لەم ژیانە لەزێڕ بەنرخ ترە، هەر كاتێ ماوەیەكی ژیانمان بەبێ هودە بڕوا خزمەتێكی ئایینو نیشتمانو كۆمەڵگای تێدا نەكەین، مانای وایە كوفرانی نیعمەتمان كردوەو هەلمان لەكیس خۆداوە، پەندمان لەرابوردوو وەرنەگرتووە!!!

﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ﴾ ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! یادی ئەو رۆژە بكەنەوە كە خودا پێی راگەیاندنو فەرمووی: ﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ﴾ ئەگەر شوكرانەژمێری نیعمەتەكانم بن، سوپاسم بكەن، زیاتر نیعمەتی خۆمتان بەسەردا دەڕژێنم، ئیمامی بوخاری لەئەنەسەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەكا دەفەرموێ: (ومن ألهم الشكر لم يحرم الزيادة) كەسێك شوكرانە ژمێر بێ خودا بەرۆژ نیعمەتەكانی بۆ زیاد دەكا.

﴿وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ﴾ خۆ ئەگەر كوفرانی نیعمەتەكانم بكەن، سپڵەیی دەربڕن لەجیاتی شوكر، ﴿إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ سزای من زۆر بەئێشو ئازارە؛ لەدونیادا بەلێ ستاندنەوەی نیعمەتەكانو لەقیامەتدا بەئازاردانی توندو تیژ لەسەر سپڵەییەكەیان، وەكوو لەفەرموودەیەكی چەسپاودا هاتووە حاكم لەثەوبانەوە ریوایەتی كردوە دەفەرموێ: (ان العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه).

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەكاتەوە: كە سوودی شوكرانە ژمێریو زیانی سپڵەییو كوفران دەگەڕێتەوە بۆ سوپاسگوزارەكە یان بۆ سپڵە پێنە زانەكە، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى إِنْ تَكْفُرُوا أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الأَرْضِ جَمِيعاً فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ جا كاتێك حەزرەتی موسا دیاردەی كوفرو عینادی لەگەلەكەی بینی، مەبدەئێكی بنەڕەتی لەئایینەدا راگەیاندو وتی: ئەگەر ئێوە ئینكاری نیعمەتەكانی خودا بكەن تەنانەت ئێوەشو هەرچی لەزەویدا هەیە بەئادەمیزادو جندۆكەوە كوفرانی نیعمەتەكانی خودا بكەن، ئەوە بێگومان ج زیانێك بەخودا ناگەیەنن، چونكە خودا بێ ئیحتیاجە لەسوپاسی بەندەكانی، خودا بۆخۆی سوپاسكراوە با خەڵكان كافرو سپڵە بن، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ

عَنكُمْ﴾الزمر/٧، یان دەفەرموێ: ﴿فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾التغابن/٦.

ئیمامی موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەبو زەڕەوە فەرمودەیەکی قودسی ریوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لەپەروەردگارەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم! ئەگەر بەرودواتان، ئادەمیزادو جندۆکەتان هەمووتان لەسەر شێوەی بەتەقواترین دڵی پیاوێك بن، هیچ لەخودایەتیو خاوەنیەتیم زیاد ناکا، ئەی بەندەکانم! ئەگەر بەرودوواتان، ئادەمیزادو جندۆکەتان لەسەر شێوەی گوناهبارترین دڵی پیاوێك بن، هیچ خودایەتیو خاوەنیەتیم کەم ناکا، ئەی بەندەکانم! ئەگەر بەرودووتان؛ ئادەمیزادو جندۆکەتان لەدەشتێکدا راوەستن داوام لێ بکەنو پێویستی هەموانتان دابین بکەم لەخەزێنەم هیچ کەم نابێتەوە مەگەر بەئەندازەی ئەوەی دەرزییەك بخەیە ناو دەریاوەو دەری بێنیەوە چەند لەو دەریایە کەم دەبێتەوە هەر ئەوەندەش لەخەزێنەی من کەم دەبێتەوە.

## بڕێ هەواڵو سەرگورشتەی پێغەمبەرانی پێشوو لەگەڵ گەلەکانیاندا

﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ

إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتە بیرخستنەوەیە بەو رۆژگارانەی کە خودا تێیاندا تۆڵەی لەنەتەوە سەررەقو بەدرۆخەرەوەکان ستاندوە، واتە: دوای ئەوەی پەروەردگار باسی ئەوەی کرد: کە موسا داوای لەقەومی خۆی کرد: کە یادی نیعمەتو بەخششی خودا بکەنەوە بەسەریاندا؛ ئەو هەموو ناخۆشیو بەڵایانەی لەسەر لابردن، ئەو هەموو

خێرو بێرەی بەسەردا رژاندن، بەڵێنی پێ دان ئەگەر شوکرانە ژمێر بن بۆیان زیاد بکا، ئەگەر سپڵەو پێ نەزان بن سزایان بدا، ئەمجار سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ گفتو گۆی نێوان پێغەمبەرانی پێشوو گەلەکانیان روداوو بەسەرهاتی گەلەرابووردوەکانیان وەبیر دێنێتەوە،

دەربارەی خیطابی ئایەتەکانی ئێرە ئایا ئاراستەی کێ کراون و کێی مەبەستە؟ چەند رایەك هەیە:

ئیبنو جەریری طەبەری دەفەرموێ: ئەم ئایەتانە لەتەواوکەری قسەکانی حەزرەتی موسان و خیطابی ئەوە بۆ نەتەوەکەی تا بیانترسێنێ لەوەی تووشی ئاکامی بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان نەبن،

دەشگونجێ خیطابێکی تازەی خودا بێ بۆ نەتەوەی موساو نەتەوەکانی تر بۆ ئەوەی بەسەرهاتی گەلەپێشینەکانیان وەبیر بخاتەوە، مەبەستیش پەندو عیبرەت وەرگرتن بێ،

ئیمامی رازی دەفەرموێ: خیطابەکە بۆ ئۆممەتی پێغەمبەری ئیسلامەو مەبەست پەندو عیبرەت وەرگرتنە، ئیبنو کەثیریش رایەکی لەم جۆرەی هەیەو دەفەرموێ: وادیارە خیطابەکە بۆ ئوممەتی ئیسلامە چونکە گوتراوە: چیرۆکی گەلی عادو ئەموود لەتەوراتدا نین، جا ئەگەر ئەم ئایەتانەی ئێرە تەواوکەری کەلامی حەزرەتی موسا بوونایە بۆ گەلەکەی دەبوایە: ئەم دوو چیرۆکە لەتەوراتدا بوونایە،

﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ اللَّهُ﴾ ئایا بۆتان نەهاتووە هەواڵ و سەرگورشتەی ئەو گەل و نەتەوانەی لەپێش ئێوەدا هاتوونە گۆڕەپانی ژیانەوە: کە ئەوانیش گەلی نوح و عادو ئەموودو

هی تریش بوون لەو نەتەوانەی پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، خودا نەبێ کەس نازانێ ژمارەیان چەندە؟

جا ئەو گەلو نەتەوانە ﴿جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ﴾ پێغەمبەرەکانیان هاتوونە ناویان بەموعجیزەو بەڵگەی جۆراو جۆرەوە، موعجیزەی ئاشکراو سەرنج راکێشیان نیشانی گەلو نەتەوەکانیان داوە، موعجیزەی وا کە راستی پێغەمبەرایەتیەکەیان بچەسپێنێ، هەموو پێغەمبەرێك رێگای حەقو راستی بۆ نەتەوەکەی روون کردۆتەوە هەوڵی داوە لەگومڕایی کوفرو بێدینی رزگاریان بکا بۆ روناکی ئیمانو باوەڕ،

﴿فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ﴾ بەڵام ئەو گەلو نەتەوانە، پەنجەی رقو کینەیان لێ گەستن، دژایەتیان کردن، بەپەندو ناموژگارییەکانیان پەست بوون، وەکوو چۆن موشریکەکانی عەرەب دژایەتی پێغەمبەریان کردو پەیامی ئیسلامیان رەت کردەوەو پەنجەی رقو کینەیان لێ گەستن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿عَضُّواْ عَلَيْكُمُ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ ،،،الآية﴾آل‌عمران/١١٩، مەبەست ئەوەیە: ئەو گەلو نەتەوانە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە، گاڵتەیان پێ کردن، ئیمانیان پێ نەهێنان،

ئەبو عوبەیدەو ئەخفەش دەڵێن: عەرەب هەر کاتێ کابرایەك وەڵامی کەسێکی نەدایەوەو بێدەنگ بوو پێی دەڵێن: (قد رده یده في فیه)!! واتە: بەدرۆی خستەوەو قەشمەری پێ کرد،

﴿وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ﴾ بە پێغەمبەرەکانیان گوت: ئێمە بڕوا بەپەیامەکەتان ناکەین، پێمان وا نیە ئەو موعجیزاتانەی نیشانی دەدەن بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی ئێوە بێ،

﴿وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ ئێمە شكو گومانمان هەیە دەربارەی ئەو پەیامەی بانگەوازیمان دەکەن بۆ لای: کە ئیمان بەخودایە، بڕوا بەتاكو تەنهایی پەروەردگارە، شوێنکەوتنی ئەو شەریعەتو یاسایەی هێناوتانە! هەرچەند بیر دەکەینەوە ناتوانین دەس بەرداری بیرو باوەڕی خۆمان بینو شوێن ئایینی ئێوە بکەوین،

## بەکورتی :

ئەوانە ئینکاری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکانیان دەکەنو دڵنیان کە پەیامەکەیان راست نیە، چونکە ئەو یاساو شەریعەتەی هێناویانە جێگای گومانە،

ئەمجار پێغەمبەرەکانیان رەدیان دانەوەو سەریان سوڕما لەو وتارو هەڵوێستە ئەحمەقیانەیانو دەفەرموێ: ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ ؟﴾ پێغەمبەرەکانیان پێیان گوتن: ئایا ئێوە لەهەبوونی خودادا گومانتان هەیە! سەیرە ئێوە چۆن گومانتان لەهەبوونی خودادا هەیە، خۆ فیطرەتی ئادەمیزاد خۆی شایەتە لەسەر بوونی خودا، دان بەهەبوونی خودادا دەنێ هەرکەسێك تۆزێك عەقڵو فامی هەبێ دان بەهەبوونی خودادا دەنێ، زوربەی گەلو نەتەوەکان ئیعتیراف بەهەبوونی خودا دەکەن، وەلێ لەگەڵ خودادا شتی تر دەپەرستن پێیان وایە: بەندایەتیکردن بۆ ئەو خودا درۆزنانە لەخودای گەورەو باڵا دەستیان نزیك دەکاتەوە،

### بەڵگەی فیطرەتو بەدیهێنان هەیە لەسەر وجوودی خودا :

١- بەڵگەی فیطرەت بەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ چەسپاوە، ئیبنو عودەیو بەرائیو بەیهەقی لەئەسوەدی کوڕی سەریعەوە ریوایەت دەکەن: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کل مولود یولد علی فطرة فابواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه) هەموو زارۆکێك کە لەدایك دەبێ بەسروشت خودا پەرستە، پاشان باوكو دایکی دەیکەنە جولەکە یان فەلە یان ئاگر پەرست،

٢- بەلگەی خەلّق‌و بەدیهێنان: ئەوە شتێکی هەست پێکراوو ئاشکرایە، دەفەرموێ: ﴿فَاطِرِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ خودای مەزن بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوییە، واتە: ئێوە چۆن گومانتان لەوجودی خودادا هەیە؟ لەکاتێکدا ئەو زاتە بەدیهینەری ئاسمانەکان‌و زەوییە، لەنەبووە ئەم بوونەوەرەی بەو شێوە رێك‌و پێکییە هێناوەتە دی، پەروەردگار وێڕای ئەوەی بەدیهێنەرو خاوەن دەسەلاّتە، تەواوی سۆزو بەزەییشی هەیەبۆ بەندەکانی، هەر لەروانگەی ئەو رەحمەت‌و میهرەبانییەوەیەتی: کە ﴿يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ﴾ بانگەوازی ئێوەی ئادەمیزاد دەکا ئیمانی پێ بهێنن شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی بکەون، بۆ ئەوەی لەقیامەتدا لەبری تاوانتان خۆش بێ، ئەو تاوانانەی پەیوەندی بەخوداوە هەیە، نەك ئەو تاوانانەی پەیوەندییان بەمافی ئادەمیزادانی ترەوە هەیە،

تێبینی ئەوە دەکرێ: لەقورئاندا هەر کاتێ: باسەکە باسی لێخۆشبوونی تاوانی کافرەکان بێ وشەی(مِن) کە بۆ تەبعیضە بەکار دەهێنرێ، لەهەر شوێنێکداباسەکە باسی لێخۆشبوونی تاوانی موسوڵمانان بێ وشەی (مِن) ناهێندرێ،

نموونەی یەکەم وەکوو ﴿وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ، يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾ نوح/٣-٤، یان دەفەرموێ: ﴿يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾الأحقاف/٣١، چونکە دەربارەی ئیمان لەگەڵیان دەدوێ،

نموونەی دووەم وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾آل‌عمران/٣١، یان دەفەرموێ: ﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾الصف/١١-١٢، چونکە لێرەدا لێخۆشبوونەکە رودەکاتە تاوانەکان،

﴿وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ دواتان دەخا بۆ کاتێکی دیاریکراو واتە: بانگەوازیتان دەکا کە ئیمانی پێ بهێنن، بۆ ئەوەی لەبرێ تاوانتان خۆش بێ کە

لەپێش ئیمانهێنانتـان ئـەنجامتان داون هـەروەها دواتـان بخا بـۆ کـاتێکی دیـاریکراو لەزانیاری خۆی دا کە کۆتایی هاتنی تەمەنتانـە ئەگـەر ئیمـانی پـێ بهێـنن، ئـەگینا خێرا بەهیلاکتان دەباو سزاتان دەدا، کەوابێ ئیمانهێنـان دوو نیعمـەتی لێوەدەسـت دێن: یەکێکیان لێخۆشبوونی تاوانە یەکیشیان مۆڵەتدانە تا کۆتایی تەمەن،

**ئـــە مجار پـــەروەردگار باســـی رەتدانـــەوەی گـــەل و نەتـــەوەکان دەکـــا بـــۆ پێغەمبەرەکانیان بەسێ جۆر:**

١- ﴿قَالُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا تُرِيدُونَ أَنْ تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ وتیـان: چـۆن هـەروا بەهەوانتــە شـوێنتان بکـەوین، هێـشتا ئێمـە موعجیزەیـەکمان لـێ نـەبینیون، ئێـوەش وەکـوو ئێمـە ئـادەمیزادن، چ زێـدە فـەضل و رێزێکتـان بەسـەر ئێمەوە نیە، ئـەدی چۆن ئێـوە بوونـە فروستادەی خوداو ئێمـە نـەبووین؟! ئەگـەر خودا پێغەمبـەری بـۆ سـەر ئێمـەی ئـادەمیزاد بناردایـە لەرەگـەزێکی تـری دەنـاردو دەبوایە ئەو پێغەمبەرە پێویستی بەخەوو خواردن و خواردنەوە نەبوایە،

٢- ﴿فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ دە بەڵگەو موعجیزەی ئاشکرامان بۆ بێنن، راستی داواکەتان بچەسپێنێ! ئێمە بەشتی حیسسی نەبێ بڕوا ناکەین!

دروستکردنی ئاسمانـەکان و زەوی و نـەو شـتە عەجایەبانـەی تێیـاندایـە ئـەوە ئێمە بەبەڵگەیان دانانێین و نازانین چۆنن نابنە بەڵگە لەسەر راستی پەیامەکەتان!!

ئەمجار پەروەردگار دوا بەدوای ئاڕاستە کردنی شوبهەی کافرەکان کە تانـەیان لەپێغەمبەرایـەتی پێغەمبــەرەکان دا لـەزمانی پێغەمبەرەکانــەوە رەدی شـوبهەکان دەداتەوەو دەفـەرموێ: ﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِنْ نَحْنُ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَـادِهِ﴾ پێغەمبـەرەکان بەگەل و نەتـەوەکانیان فـەرموو: راسـتە ئێمـە ئـادەمیزادێکین وەکـوو ئێـوە دەخـۆین و دەخۆینـەوە، دەخـەوین و دێـین و دەڕۆیـن بەبازاڕدا، هـەوڵی رزق و رۆژی ژیـان دەدەیـن، بـەڵام خـودا فـەضل و نیعمـەتی خـۆی

دەرژێنێ بەسەر کەسانێکدا کە مەیلی لێ بێ رێزی پێغەمبەرایەتی بداتێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾الأنعام/١٢٤.

شوێنکەوتن‌و لاسایی کردنەوەتان بۆ باوك‌و باپیرانتان ئەمە کارێکە عەقڵ وەری ناگرێ‌و هیچی بەسەر هیچەوە نیە، پەلپ‌و بیانوتان داوا کردنی موعجیزەو بورهان بۆ چەسپاندنی راستی پێغەمبەرایەتی ئێمەو بەگوێرەی داواکاری ئێوە، ئەوەعائید بەخودایەو ﴿وَمَا كَانَ لَنَا أَنْ نَأْتِيَكُمْ بِسُلْطَانٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان لەهێنانی ئەو جۆرە موعجیزانەدا نیە، هەر موعجزەو نیشانەیەکی داوامان لێ دەکەن ئەگەر بەویست‌و ئیرادەی خودا نەبێ نایەتە جێ! ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ﴾ با هەر لەسەر خودابێ تەوەککولی خاوەن باوەران، پێویستە هەموو موسوڵمانێك پشت بەخودا ببەستێ، لەهەموو کارو کردەوەیەکیدا هانا بۆ ئەو بەرێ!

ئەمجار جەختیان لەسەر پشت بەستنی خۆیان لەسەر خودا کردەوەو وتیان: ﴿وَمَا لَنَا أَلاَّ نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا﴾ چۆن ئێمە پشت بەخودا نابەستین وەلحال ئێمەی هیدایەت داوە بۆ رێبازی زانست‌و زانیاری، لەسەر پێویست کردوین: کە رێبازی راستی ئەو بگرینە بەر، رێبازی سەرفرازی‌و رزگار بوونی نیشان داوین، کەسێکیش خودا نیعمەتی خۆی بەسەردا رشت پێویستە بەگوفتارو کردار سوپاسگوزاری بێ،

﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا﴾ دڵنیابن ئێمە لەبەرامبەر سەررەقی‌و پەلپ‌و بیانووی جۆراو جۆرتان خۆراگرو پشوو درێژ دەبین، بەردەوام دەبین لەسەر بانگەوازی کردنتان!

﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ با خاوەن تەوەككولەكان بەردەوام بن لەسەر پشت بەستن لەسەر خودا، با بتمانەیان هەر بەخودا بێ، لەپێناو ئایینی خودا هەموو ناڕەحەتیو ناخۆشیەك بچێژنو تەحەمولی بکەن!

دووجار فەرمان بەتەوەككول دووبارە بۆتەوە، سوودی دووبارە بوونەوەی فەرمانەكە ئەوەیە: سەرەتا فەرمانی بە پێغەمبەرەكان كردوە پاشان فەرمانی بەشوێنكەوتووەكانیان كردوە، ئەمەش ئاماژەیە بەوە: كە ئەو كەسەی فەرمان بەكاری چاكە دەكا دەبێ بۆ خۆی سەرەتا لەخودی خۆیدا تەنفیذی بكا، ئەگینا كاریگەر نابێ.

## هەڕەشە كردنی كافرەكان لەپێغەمبەرانو بەڵێنی پەروەردگار بەخودا پەرستان: كە ستەمكاران لەناودەبا

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُواْ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ

وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَيْءٍ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَٰلُ الْبَعِيدُ ﴿١٨﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار پێغەمبـەرانی ڕێنومـایی کـرد بـۆ پـشت بەسـتن بـەخوداو تـەوەککول لەسـەر پاراسـتن‌و چاودێری زاتـی پـاکی، لەهـەموو بـوارێکی ژیـانـدا، باسـی هەڵوێـستی کافرەکـان دەکـا کـە لەوپـەڕی نـەفامی‌و ئەحمـەقی‌دا خۆدەنـوێنن: کـە لـەجیاتی ئـەوەی گـوێ بیـسی ئامۆژگـاری پێغەمبـەرەکان بـن، هەڕەشەیان لێ کردن، دوو ڕێبازیان خستنە بەردەم: کە یـان لـەوەڵاتیان دەردەکـەن، یان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی بتپەرستی‌و داب‌و نەرێتی باوك‌و باپیرانیان!!

ئەمـە پیـشەی ملهوڕان‌و خـاوەن بـیرو بـاوەڕی پـڕو پووچـە، هـەموو کاتێـك لـەجیاتی زمـانی حیـوارو عـەقڵ‌و مـەنطیـق پـەنا بـۆ هەڕەشـەو گوڕەشـە دەبـەن، ئیستیغلالی بێ هێزی‌و کەمدەرامەتی‌و ئاشـتیخوازی ئـەهلی حـەق‌و خـودا پەرسـتان دەکەن!

ئەوە نازانن: کە دەسەڵاتی پەروەردگار لەژوور هەموو هێزو دەسەڵاتێکەوەیە، سەرەنجام هەر خـاوەن بـاوەڕانی حـەق دەیبەنـەوە، سـەروەری‌و پـیرۆزی کۆتـایی بـۆ خودا پەرستان‌و تێشکان بۆ کافرانە، ئەمە سوننەتی خودایـە لەبوونـەوەردا، لەگـەڵ هەموو نەتەوەو پێغەمبەرێکدا،

ئەمجار پەروەردگار کردەوەی کافرەکان بەتەپو تۆزی بابردو دەشوبهێنێ، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوا بوونو گوێ بیسی ئامۆژگاری پێغەمبەرەکانیان نەبوون، پەنایان بۆ هەڕەشە کردن بردو وتیان: ئەگەر واز لەهەڵوێستو بانگەوازی خۆتان نەهێنن، لەزێدو نیشتمانی خۆمان دەرتان دەکەین، ناهێڵێین ئاوا بەئاسوودەیی دانیشن یان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی بتپەرستیو بەمیرات بۆ بەجێماومان،

بەڵێ بەدرێژایی مێژوو ئەمە سەرەنجامو ئاکامی سروشتی حیوارو کێ بڕکێی نێوان پێغەمبەران گەلو نەتەوە کافرو سەررەقەکان بووە، هەر لەگەڵ مایە پوچ بونیان لەگۆڕەپانی موناقەشەو حیواردا، لەپاش بۆڕخواردنیانو تێشکانیان لەبەرامبەر نیشانەو موعجیزەی پێغەمبەرەکانیان هیچکەیان بەدەستەوە نەماوە جگە لەوە کە پەنایان بردۆتە بەر هەڕەشەو هێزو دەست درێژیکردن؛ هەڕەشەیان لەپێغەمبەرەکانیان کردوە بەیەکێ لەم دوو شێوە هەڕەشەیە:

١- دەرکردن لەوڵاتو ئاوارە کردنیان بۆ هەندەران،

٢- یان گەڕانەوە بۆ سەر ئایینی باوكو باپیرانیان کە بەمیرات بۆیان بەجێ ماوە،

ئەومتا گەلی شوعەیب بەشوعەیبو شوێنکەواتوانی شوعەیبیان گوت: ﴿لَنُخْرِجَنَّكَ يَا شُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا﴾الأعراف/٨٨.

هەروا پەروەردگار لەبارەی هەڵوێستی موشریکەکانی قورەیش لەئاستی پێغەمبەردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الأَرْضِ لِيُخْرِجوكَ مِنْهَا وَإِذاً لاَّ يَلْبَثُونَ خِلافَكَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾الأسراء/٧٦، هۆکاری ئەم هەڕەشەو گوڕەشانە لەخۆبایی بوونی کافرەکانە بەهێزو توانای خۆیانو کەمی ژمارەی موسوڵمانانو بێ هێزیو لاوازییانە،

بەڵێ جەمسەری ناکۆکی نێوان خودا پەرستانو کافرەکان لەوەوە دەست پێ دەکا: کە بتپەرستەکان ئامادەی حیوارو موناقەشە نین، بەڵکوو پەنا دەبەن بۆ هێزو هەڕەشەکردن!

لێرەدا حەقیقەتی جەنگی نێوان ئیسلامو کۆمەڵگای نەفامان دەردەکەوێو سەرهەڵدەدا، کۆمەڵگای نەفامی رازی نابێ ئایینی ئیسلام کیانو کەسایەتی خۆی هەبێ، ناتوانێ لەگەڵیدا هەڵبکا، تەنانەت ئەگەر ئیسلامخوازان دەستی ئاشتیو برایەتیش دریژ بکەن، هێزی کوفرو بێدینان ئامادەی ئەوە نین پابەندی ئاشتی بنو دەستی ئاشتیو برایەتییان بۆ درێژ بکەن،

کەوابێ ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە لێ بڕینو هەوڵو تەقەللا بدەن بۆ دروست کردنی کیانێکی خودا پەسندا دەبێ تێبکۆشن خۆیان لەچوارچێوەی کۆمەڵگایەکی جەمو جوڵکارو سەر بەخودا بدۆزنەوە، قیادەیەکی سەربەخۆو لایەنگیرییەکی سەربەخۆیان هەبێ، دڵنیاش بن: کە کۆمەڵگای نەفامان هەبوونی کۆمەڵێکی ئاوا تێکۆشەری پێ هەزم ناکرێو ناتوانێ لەگەڵ گرۆهێکی ئیسلامخوازی ئاوەهادا هەڵبکا! بەدرێژایی مێژووش وەها بووەو هەروایش دەبێ! بۆیە گەلو نەتەوە کافرەکان هەر بەوەندە رازی نەبوون کە پێغەمبەرەکان واز لەبانگەوازییەکەیان بهێنن، بەڵکوو داوایان لێ کردون کە بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی باوكو باپیری ئەوانو لەکۆمەڵگای نەفامی ئەواندا بتوێنەوەو کیانی سەربەخۆو خاوەن کەسایەتییان نەمێنێ، هەڵبەتە پێغەمبەران ئەمەیان پێ قبووڵ ناکرێو سروشتی ئایینی خودا بەشتی وا رازی نابێ، نابێ هیچ موسوڵمانێك ئامادەباشی ئەوەی تێدا بێ، ئیتر بەرامبەریو بەرەنگاری دروست دەبێو دژایەتی نێوان کۆمەڵی موسوڵمانو کۆمەڵی کافران دەگاتە ئاستی بەگژیەکاچوونو هەوڵدان بۆ قەلاچۆکردنی یەکتری!

ئالێرەدا هێزی گەورەو بەزەبری یەزدانی دێتە مەیدانو گورزی خۆی وەکار دەخاو زەبری بێ رەزای خۆی دەوەشێنێ، ئاشکراشە زەبری خودا کاریگەرەو هیچ شتێك خۆی بۆ ناگرێو دەفەرموێ: ﴿فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار نیگای بۆ پێغەمبەرانی کردو پێیانی فەرمو: دڵنیابن ئێمە ستەمکارو موشریکەکان لەناو دەبەین، خاكو وڵاتی ئەوان دەخەینە ژێر دەستی ئێوە، پاش بەهیلاکبردنی ئەوان ئێوە لەشوێنی ئەواندا جێگیر دەکەین، لەتۆڵەی هەڕەشەو گورەشەی ئەوان بۆ ئێوە بەدەرکردنتان لەخاكو نیشتمانی ئێمە خاكو نیشتمانی ئەوان دخەینە ژێر دەسەڵاتی ئێوە،،،

ئەمە هەڕەشەی پەروەردگارە لەو کافرو ستەمکارانە، لەبەرامبەر هەڕەشەی کافرەکان لەپێغەمبەرەکان، بەڵام نێوان هەڕەشەی پەروەردگارو ئەوان عاسمان رێسمانە! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ، إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ، وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾الصافات/١٧٠-١٧٣، یان دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾المجادلة/٢١، یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾الأنبياء/١٠٥، هەروا لەم بارەوە زۆر ئایەتی تر هەن،

﴿وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الأَرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي﴾ ئەم نیگا کردنە بەلەناوبردنی ستەمکارانو نیشتەجێ کردنی موسوڵمانان لەشوێنی ئەوان، ئەم کارە حەقو راستە بۆ کەسێك لەحیسابو لێکۆڵینەوەی من بترسێ، هەوڵی بەدەستهێنانی رەزامەندی من بدا ﴿وَخَافَ وَعِيدِ﴾ بترسێ لەهەڕەشەو عەزابو تۆڵەستاندنەوەم لێیان، بترسێ لەرۆژی روبەڕوبونەوە لەگەڵ مندا، بەباشی بەندایەتیم بکاو خۆبپارێزێ لەغەزەبو رق هەڵسانم، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سەروەریو پیرۆزیو سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا،

﴿وَاسْتَفْتَحُوا﴾ پێغەمبەران داوای یارمەتیو کۆمەکییان لەخودا کرد بۆ سەرکەوتن بەسەر گەلو نەتەوە ستەمکارەکانیاندا، واتە: داوای سەرکەوتنو پیرۆزییان لەخودا کرد بەسەر دوژمنەکانیاندا یان دادگایی کردنو یەکالا کردنەوەی نێوان ئەوانو دوژمنەکانیان، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ﴾الأعراف/٨٩، ئەمە ئەگەر راناوی (استفتحوا) بۆ پێغەمبەرەکان بگەڕێتەوە،

وێ دەچێ راناوەکە بۆ کافرەکان بگەڕێتەوە ئەو کاتە مانای ﴿وَاسْتَفْتَحُوا﴾ واتە: کافرەکان داوای سەرکەوتن لەخودا دەکەن بەسەر پێغەمبەرەکان دا، لەم روەوە کە پێیان وایە خۆیان لەسەر حەقنو پێغەمبەرەکان لەسەر بەتاڵن،

هەندێك پێیان وایە: راناوەکە بۆ هەردوو گرۆهەکان دەگەڕێتەوە، چونکە هەردولایان داوای ئەوەیان لەخودا کرد: کە کامیان لەسەر حەقن ئەوەیان سەرخا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەربارەی داوای سەرکەوتنی حەق بەسەر ناحەقدا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾الأنفال/٣٢.

ئەمجار سەرەنجامو ناکامی موشریکەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ ناکامی ئەم کێ برکێیە ئەوە بوو: سەرکەوتنو پیرۆزی بۆ تەقواکاران بوو، خەسارەتمەندیو لەناوچوون بۆ موشریکەکان بوو، خەسارەتمەندو گۆڕ بەگۆڕ بوون هەموو ئەوانەی لەخۆیان بایی بوونو لوتبەرزییان نواند، رویان لەخوداپەرستی وەرگێڕا، دژایەتی حەقو راستییان کرد، لەرێبازی خودا پەسەند لایان دا،

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ، مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ، الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾ق/٢٤-٢٦.

مەشهەدەکە تا بڵێی ترسناكو سەرنج راکێشە، مەینەتیو چەرمەسەری ئەو لوتبەرزو سەر رەقانە برانەوەی نیە، ﴿مِنْ وَرَائِهِ جَهَنَّمُ﴾ بەڵکوو لە پێش ئەم لوتبەرزە سەر رەقانەدا عەزابی دۆزەخ هەیە، ئاگری دۆزەخ بۆیان لەبۆسەدایەو چاوەڕێیانە بۆ ئەوەی لەناویدا بمێننەوە بۆ هەتا هەتایێ،

ئەمجار شێوەی خواردنەوەی دۆزەخییەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ﴾ ئاوی خواردنەومیان بریتییە لەکێمو زوخاوی هەڵچۆڕاوی پێستو گۆشتی دۆزەخییەکان، ئەو کێمو زوخاوەی لەجەستەی ئەهلی دۆزەخ دەچۆڕێتەوە دەکرێتە ئاوی خواردنەومیان، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ، وَآخَرُ مِن شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ﴾ص/٥٧-٥٨، ئەم حەمیمەی لێرەدا ناوی هاتووە تا بڵێی گەرمە، غەسساقیش تا بڵێی ساردو بۆگەنە، نەحەمیم نەغەساق هیچیان ناخورێنەوەو تەبیات وەری ناگرێ، بەڵام بەزۆرە ملێ دەرخواردیان دەدرێ ﴿يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ﴾ بەنابەدڵی قوم قوم قوتی دەدا، بەڵام ئەوەندە تامی ناخۆشە ئەوەندە بۆنی ناخۆشە ئەوەندە رەنگی ناشیرینە، خەریکە نەیخواتەوە، بەڵام بەزۆر دەرخواردی دەدرێو ئەوپەڕی ئازاری پێ دەگا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَسُقُوا مَاءً حَمِيماً فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ﴾محمد/١٥، یان دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءتْ مُرْتَفَقاً﴾الكهف/٢٩، ئەمجار باسی ئەهوالو نارەحەتی تریان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾ لەهەموو لایەکەوە هۆکاری مردن دەوریان دەداو تەنگیان پێ هەڵدەچنێ، جۆرەها عەزابو ئێشو ئازار لێیان کۆدەبێتەوە، هەر جۆرە سزایەکیان بگرێ، کوشندەیە، ئەگەر بواری مردنیان ببوایە دەمردن، بەڵام بڕیاری پەروەردگارە

نابێ بمرن! ئەم هەموو جۆرە عەزابانە دەچێژن‌و نامرن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾فاطر/٣٦.

سەرباری ئەوەش ﴿وَمِنْ وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ هەیە بۆ ئەو ستەمکارو لوتبەرزانەی دونیا سزایەکی تری بەئێش تر؛ زۆر لەسزاو عەزابەکانی پێشوو بەئازارترە، بەردەوام‌و نەبڕاوەیە دەربارەی ئەم عەزابە توندو تیژە قورئان چەند جارێك ئاماژەیان بۆ دەکا، وەکوو دەربارەی داری زەقنەموت دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ، طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ، فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِؤُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ، ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْباً مِّنْ حَمِيمٍ، ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ﴾الصافات/٦٤-٦٨.

یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ، طَعَامُ الْأَثِيمِ، كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ، كَغَلْيِ الْحَمِيمِ، خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَى سَوَاءِ الْجَحِيمِ، ثُمَّ صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ، ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ، إِنَّ هَذَا مَا كُنتُم بِهِ تَمْتَرُونَ﴾الدخان/٤٣-٥٠.

یان دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ، فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ، وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ، لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾الواقعة/٤١-٤٤، هەروەها دەفەرموێ: ﴿هَذَا وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ، جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ، هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ، وَآخَرُ مِنْ شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ﴾ص/٥٥-٥٨.

ئەمجار لەژێر رۆشنایی ئەم ئاکامە ترسناکەی تووشی لوتبەرزو لەخۆبایی بووەکان دەبێ، دیمەنێکی تری سەرنج راکێش نمایش دەکاو پەشیمانی‌و مایە پووچی کافرەکان دەخاتە روو دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ﴾ واتە: نموونەی کردەوە باشەکانی کافرەکان کە بریتییە لەماڵبەخشین بەئاتاجان‌و بەجێهێنانی صیلەی رەحم‌و چاکە کردن لەگەڵ باوك‌و دایك،،، ئەم کردەوە باشانەیان رۆژی قیامەت کە داوای پاداشەکانیان لەخودا

دەكەن‌و پێیان وایە سوودیان لێ دەبینن وەكوو تەپ‌و تۆزێك وایە رەشەبا هەڵی بگرێ‌و كەس نەزانێ بۆ كوێی دەباو كەس نەتوانێ سوودی لێ وەربگرێ‌و هیچی وەگیر بكەوێ، ئەوانە ناتوانن هیچ سودێك لەكردەوە باشەكانی جیهانیان وەربگرن وەكوو چۆن ناتوانن ئەو تەپ‌و تۆزە كۆبكەنەوەو سوودی لێ وەربگرن، ﴿لا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَى شَيْءٍ ذَلِكَ هُوَ الضَّلالُ الْبَعِيدُ﴾ هەوڵ‌و تێكۆشانی ئەوانە، كرداری باش‌و ماڵبەخشینیان لەسەر بیرو باوەڕی ناراست‌و بێ بناغە، نوغرۆبوونەو لەگومراییەكدا كە زۆر لەحەق‌و راستی دوورە، چونكە ئیمانیان نیە هیچیان لێ وەرناگیرێ، كارەكانیان بێ سوودو بێ بایەخە،

وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً﴾الفرقان/٢٣، یان دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هِـذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ وَمَا ظَلَمَهُمُ اللّهُ وَلَـكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾آل‌عمران/١١٧.

كەوابێ گومڕایی دوور لەحەق‌و خەسارەتمەندی راستی ئەوەیە: كابرا كردەوەی باش ئەنجام بدا، ماڵی خۆی ببەخشێ، صیلەی رەحم بەجێ بێنێ یارمەتی ئاتاجان بدا، بەهیوابێ رۆژی قیامەت سودیان لێ ببینێ‌و ئەم كردەوە باشانەی جێی بۆ بگرن، كەچی كاتێك بەخۆی دەزانێ كەڵكی هیچی بۆ ناگرن، چونكە ئیمان‌و باوەڕی پەسندیان لەگەڵ نیە، مایە پووچ دەبێ!!.

**بەڵگەی تاك و تەنهایی خوداو تواناو دەسەڵاتی بەسەر لەناوبردنی ئێوەداو هێنانی کەسانی دیکە بۆ شوێنی ئێوە**

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا ئەوەی روون کردەوە: کە کردەوەی کافرەکان لەرۆژی قیامەت کەڵکی هیچیان لێ وەرناگیرێ، ئەوەشی روون کردەوە کە مایە پوچی و کەڵك وەرنەگرتنیان لەکردەوەکانیان سوچی خۆیانە، باوەڕیان نیەو کردەوەی بێ باوەڕان لەرۆژی قیامەتدا سودی لێ وەرناگیرێ، ئەگینا پەروەردگار کردەوەی بەندە موخلیصەکانی پوچ ناکاتەوە،

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ ئایا نازانی ئەی بیسەر! کە پەروەردگار ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناون بەشێوەیەکی رێك و پێك و حەق و راست؟ بەو شێوەی پێویستە ئاوا بەدی هێناون و رەخساندونی، جا کەسێك بتوانێ ئاسمانەکان و زەوی دروست بکاو ئاوا بەو شێوە بەدیعە بەدییان بێنێ ئایا ناتوانێ ئێوە زیندو بکاتەوە؟ بێگومان دەتوانێ و هیچ پێی ماندوو نابێ،

﴿إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ خۆ ئەگەر مەیلی لێ بێ ئێوە لەناو دەباو گەل و نەتەوەیەکی دی دروست دەکاو لەشوێنی ئێوە نیشتەجێیان دەکا، ﴿وَمَا ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ ئەو کارە بۆ خودا هیچ ئەرکێکی تێدا نیەو پێوەی ماندو نابێ، بەڵکوو زۆر لای ئاسانەو هەر کاتێ بیەوێ و چۆنی بوێ ئاوا دێتە جێ!!

نموونــەی ئەمــە لــەقورئاندا زۆرە نموونەیــەك لــەم نموونانــە ئەوەیــە: كــە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾الأحقاف/٣٣، یان سەیری سورەتی (یس) ئایەتی (٧٧-٨٣) بكە.

## دەمە دەمێی نێوان بەدبەختەكانی رۆژی قیامەتو گفتو گۆی نێوان شەیتانو شوێنكەوتوانیو بەمرازگەیشتنی موسوڵمانان بەبەهەشت

﴿ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَـٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَـٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ

أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾

پاش ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا باسی سزا جۆراو جۆرەکانی کافرانی کرد لەرۆژی قیامەتداو مایە پووچیانی نواند، ئەمجار ئەو شەرمەزاریو ریسواییەی بەسەریان دێ لەو رۆژەدا دەیخاتە روو نمایشی دەکا، نمایشەکە تا بڵێی سەرنج راکێشو سەرسورهێنەرە، دیمەنێکە لەدیمەنە هەرە عەجایەبەکانی رۆژی قیامەت، پڕە لەجمو جۆڵو دانو سانو کێ برکێو بێنەو بەرە لەنێوان ملهوڕو لوتبەرزو شەیتانەکانی ئادەمیزادو هەڵخەڵەتاوە شوێنکەوتووەکانیان لەلایەکو لەنێوان ئەوانو شەیتاندا لەلایەکی ترەوە، حیوارە لەنێوان چەوساوەکانو ملهوڕەکاندا لەنێوان ئەوان هەموویانو شەیتاندا!!!

ئەمجار باسی پاداشی خودا پێداوان دەکا کە بەمرازگەیشتنیانە بەبەهەشتی بەرینو دەفەرموێ: ﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعاً﴾ هەموو ئادەمیزاد بەچاکو خراپیانەوە، بەموسوڵمانو کافریانەوە لەسارای مەحشەردا دەردەکەون! ئەوان هەموو کاتێ لەخوداوەدیارن، خودا هەموو ئانو ساتێك ئاگای لێیانە، بەڵام بۆ خۆیان ئەو کاتە هەست دەکەن: کە لەخودا دیارنو هیچ پەردەو داپۆشەرێك نیە لەخودایان نەدیو بکا، دەردەکەون، سارای مەحشەر پڕ دەکەن، هەموویان دەزانن: کە خودا دەیانبینێ، بەپێچەوانەی حاڵی دنیایان: کە کافرو یاخی بووان وا دەزانن خودا ئاگای لەهەڵسو

کەوتیان نیە، پەردە هەڵدەدرێتەوەو حیوار دەست پێ دەکا، دەبێتە دەمە دەمێ‌و موناقەشەو جیدال ﴿فَقَالَ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعاً فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ ؟﴾ ژێردەستەو شوێنکەوتوو ڕەشە خەڵکەکە ڕو دەکەنە ملهوڕو دەرەبەگەکانی دونیایان‌و پێیان دەڵێن: ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین‌و بەگوێی ئێوەمان کردوەو پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی ئێوە بووین، بەقسەی ئێوە بڕوامان بەخودا نەکردو پێغەمبەرانمان بەدرۆ خستنەوە، ئایا ئێوە ئەمڕۆ دەتوانن بڕێ سزای خودامان لێ دوور بخەنەوە؟ وەکوو بەڵێنتان پێ دابووین‌و هەڵتان خەڵەتاندین، دە ئەمڕۆ بەرگریمان لێ بکەن‌و مەهێڵن ئاگری دۆزەخ بمانسوتێنێ!

ئەمجار سەرۆك‌و فەرمانڕەواو ملهوڕەکان وڵامیان دەدەنەوە، خۆیان لەئەرکی بەرگریکردن لێیان دەدزنەوە ﴿قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ﴾ دەڵێن: ئەگەر خودا ئێمەی هیدایەت بدایا بۆ ئایینی خۆی‌و تەوفیقی بداینایە بۆ پابەند بوون بەئایینی حەقەوە، شارەزای بکردیناییە بۆ خێر، ﴿لَهَدَيْنَاكُمْ﴾ ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان دەدا، شارەزامان دەکردن بۆ ڕێبازی حەق‌و ڕاست! بەڵام بڵێین چی، خودا ئێمەی هیدایەت نەداوە، ئیتر بڕیاری سزادان چەسپا لەسەر بێ بڕوایان،

ئەمجار نائومێدی خۆیان لەڕزگار بوون ڕادەگەیەنن‌و دەڵێن: ﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ﴾ هیچ چارمان نیە، ڕێگای ڕزگار بوونمان دەست ناکەوێ، هات‌و هاوار بکەین یان خۆڕاگربین وەکوو یەك وایە، لەچنگ عەزابی خودا ڕزگاریمان نابێ!

ئێوە لەسەر چی سەرکۆنەمان دەکەن، ئێمەو ئێوە یەك ئاکاممان هەیە، خۆ ئێمە بۆ خۆمان هیدایەتدراو نین‌و ئێوەمان گومڕا کردبێ، ئەگەر خۆمان هیدایەتدراو بووینایە ئێوەمان بۆ ڕێبازی حەق کێش دەکرد، بەڵام بۆ خۆمان

گومڕا بوین‌و ئێوەشمان بۆ گومڕایی ڕاکێشا، خودا هیدایەتی نەداین‌و گومڕا بووین‌و ئێوەشمان گومڕا کرد!

بەڵێ ئێستا دان دەنێن بەدەسەڵاتی خودادا، لەوەپێش ئینکاریان دەکرد، خۆیان بەسەر مسکین‌و هەژارەکاندا ڕادەوشاندو هیچ حیسابێکیان بۆ دەسەڵاتی خودای باڵا دەست نەدەکرد، ئێستا خۆیان لەتاوانی گومڕا کردنی شوێنکەوتووەکانیان دەدزنەوە، گومڕا کردنەکە پاڵ خودا دەدەن‌و، ئاشکراشە خودا فەرمان بەگومرا بوون ناکا ﴿ان الله لا يأمر بالفحشاء﴾.

ئەمجار بەدزکەو درکە شوێنکەوتووەکانیان ناهومێد دەکەن‌و ئەوەیان پێ ڕادەگەیەنن: کە هات‌و هاوارو دادو فیغان چ سودێکی نیە، هەروەکوو چۆن خۆڕاگری‌و دان بەخۆدا گرتن بێ سوودە، عەزاب بڕیاردراوەو گەڕانەوەی نیە، تازە کار لەکار ترازاوەو حیسابمان بیتی بوو! هەموو شتێك تەواو بوو کەلێنی ڕەحمەت‌و هیوا نیەو بەهومێدی ڕزگار بوون مەبن.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: وا پێدەچێ ئەم دەمە دەمێ‌و موناقەشەیەی نێوان دەسەڵاتدارانی دونیاو هەژارو ژێر دەستەکان لەناو دۆزەخدا ئەنجام دەدرێ؛ واتە: پاش ئەوەی هەموویان دەخرێنە ناو دۆزەخەوە ئەم حیوارو پێداچوونەوەیە ئەنجام دەدەن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاء لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعاً فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيباً مِّنَ النَّارِ؟ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ﴾غافر/٤٧-٤٨.

بەڵێ: هەموو شت تەواو بوو، کێشە کۆتایی پێ هات حیوار نەما! ئێستا لێرەدا لەنمایشگای مەسرەحەکەوە شتێکی سەرسوڕهێنەر دەبینین، دەبینین شەیتانی نەفرین لێکراو: کە بۆخۆی ماکی گومڕاییە، بانگەوازیکەری سەرەکی بۆ گومڕابوون خۆیەتی، دەبینین ئەم نەگریسە گورگەو چۆتە پێستی مەڕەوە، پۆشاکی

رەبەنو پیاوماقولی دۆزەخیەکانو بەئارەزوی خۆی قسان دەژمیری و شەکر دەشکینی خۆی بەبێ تاوانو بەری لەقەڵەم دەداو، گاڵتە بەملهورو دەرەبەگو شوێنکەوتوانیان دەکاو برینەکانیان دەکولێنێتەوە تەنانەت قسەکانی شەیتانیان زۆر لەعەزابەکە بەلاوە گرانترە ﴿وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ﴾ واتە: پاش ئەوەی پەروەردگار حوکمو بڕیاری عادڵانەی خۆی لەنێو ئادەمیزاداندا ئەنجام دا، موسوڵمانان چوونە ناو بەهەشتەوەو کافرەکان خزێندرانە بنکڵی دۆزەخەوە، شەیتان رودەکاتە دۆزەخییەکانو پێیان دەڵێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ﴾ پەروەردگار لەسەر زوبانی پێغەمبەرانی وادەو بەڵێنی حەقو راستی پێدان، ئەوەی پێ راگەیاندن: کە زیندو بوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوە هەیە، وادەو بەڵێنەکانی پەروەردگار راستنو هاتنە جێ، ﴿وَوَعَدْتُكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾ منیش وادەم پێدان: کە زیندو بوونەوە نیەو حیسابو لێکۆڵینەوە درۆیەو نابێ، ئەمن درۆم لەگەڵ کردنو هەڵم خەڵەتاندن، هەرچی پێم گوتن درۆ بوو، وەکوو لەشوێنێکی تردا خودا دەفەرموێ: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً﴾النساء/١٢٠، من تاوانم چیە ئێوە بۆخۆتان وادەو بەڵێنی خوداتان پاشگوێ خستو شوێن پڕوپاگەندەی پووچی من کەوتن!!

﴿وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ﴾ ئەمن لەبانگەشە کردنەکەم بۆتان هیچ بەڵگەو نیشانەم بەدەستەوە نەبوو، زۆرەملێو زەختو زۆریم لێ نەکردون، ﴿إِلاَّ أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي﴾ بەڵکوو هەر لەگەڵ بانگم لێ کردنو رێگای بەتاڵم لەپێش چاو جوان کردنو، وەسوەسە رەهنومایيم کردن، خێرا بێ سێو دوو بەپیرمەوە هاتنو شوێن شەهوەتو ئارەزۆبازی خۆتان کەوتنو پابەندی فەرمانەکانم بونو رێبازی تیداچوونتان گرتە بەر!

﴿فَلا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ ئەمرۆ رەخنەو سەرزەنشتم ئاراستە مەکەن! چونکە من تەنها بانگەوازیم کردونو وەسوەسەم خستۆتە دڵتانەوە، ئێوە بەویستو

ئیرادەی خۆتان بەبێ ئەوەی من بەڵگەو دەلیلێکم پێ بێ، ئامادەباشی خۆتان نیشان داو شوێنم کەوتن، خراپەم لەدڵ شیرین کردن، ڕێبازی لارو لوێرم لەپێش چاو جوان کردن، بێ سێو دو ملتان لێنا، بانگەوازی پەروەردگارتان پشت گوێ خست، هەرچەن بانگەوازییەکەی خودا ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە بەهێزانەی لەتەك دابوون، بۆ خۆتان بەخۆتان کرد!

دڵنیابن ﴿مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ﴾ من ناتوانم رزگارتان بکەمو هیچ کۆمەکییەکی ئێوەم پێ ناکرێ، سزای دۆزەخم لەسەر ئێوە بۆ سوك ناکرێ، ئێوەش ناتوانن هیچ یارمەتیەکی من بدەنو بۆتان ناکرێ عەزابم لەسەر سوك بکەن! ئاواو بەو شێوە دەست لەیەکتریی بەردەدەنو خۆیان لەیەکتری بەری دەکەن! بەجۆرێك کە لەنێوانیاندا هیچ وادەو پەیمانێك نەبووبێ، ئەمجار بەرائەتی خۆی لەوە رادەگەیەنێ: کە بەهاوەڵی خودایان زانیوە، ئەو بوون بەهاوەڵەی بۆ خودا رەت دەکاتەوەو دەڵێ: ﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ﴾ ئەمن ئەوە رەت دەکەمەوە کە هاوشانو هاوەڵی خودابم، ئەوەی لەدونیادا بۆ منتان دانابوو بەشەریکی خوداتان حیساب کرد بوم، ئەمڕۆ رەتی دەکەمەوەو بڕوام پێی نیەو لێی بێ بەریم!!

وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾فاطر/١٤، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ﴾الممتحنة/٤، یان دەفەرموێ: ﴿كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾مريم/٨٢.

ئەمجار شەیتان وتارەکەی بەم رستەیە کۆتایی پێ دێنیو بەردێکی گەورە دەخاتە سەر دڵیانو پێیان دەڵێ: ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بێگومان ستەمکاران سزای بەئێشیان دەدرێو لەعەزابی سەختدا ژیانی قیامەتیان بەسەر دەبەن! ئای لەشەیتانو وای لەو چاودێرو سەرپەرشتیکارەی بانگی کردن بۆ گومڕاییو شوێنی کەوتن،

دەشکونجێ رستەی ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لەفەرمایشتی خودا بێ‌و کۆتایی حیوارەکەی پێ هێنابێ!

ئەمجار دوای ئەوەی حاڵ‌و وەزعی بەدبەختەکانی رون کردەوە، حاڵ‌و چۆنیەتی بەختیارەکانیش رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوون‌و لەدونیادا کردەوەی باشیان ئەنجام داوە دەخرێنە ناو باغەکانی بەهەشتەوەو لەلەزەت‌و خۆشیدا ژیان بەسەر دەبەن، باغەکانی بەشێوەیەکن بەژێر درەختەکانیاندا جۆگەو جۆبار دەکشێن‌و وەندەی تر باخەکان دەرازێننەوە، بۆ هەتا هەتایە ئەو خودا پێداوانە لەناو بەهەشتدا دەمێننەوەو وەغری لێ ناکەن، ئەم کامەرانی‌و سەروەرییە کە دەستیان دەکەوێ ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ بەتۆفیق‌و هیدایەتی خودایە چنگیان دەکەوێ: بەهۆی ئەوەوەیە کە خودا لەدونیادا رێنومایی کردون بۆ چاکە کردن‌و روکردنە کارێك خوداو پێغەمبەر پێیان خۆش بووە،

﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾ فریشتە بەسەلامکردن لێیان هەواڵیان دەپرسن، خۆیان لەناو خۆیاندا سەلاّو لەیەکتری دەکەن،

وەکوو لەچەند شوێنی تردا ئاماژەی بۆ ئەم سلاّو لێ کردنە دەکاو دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾الزمر/٧٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَالمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَلَامٌ عَلَيْكُم﴾الرعد/٢٣-٢٤، یان دەفەرموێ: ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَاماً﴾الفرقان/٧٥، یان دەفەرموێ: ﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾یونس/١٠، سەرباری هەموو خۆشیەکی بەهەشت سەلامی پەروەردگارە لێیان وەکوو دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ قَوْلاً مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾یس/٥٨.

ئەشكونجێ رستەی ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لەفەرمایشتی خودا بۆو گوتنی حیوارەکەی پێ هێنابێ!

ئەمجار دوای ئەوەی حاڵو وەزعی بەدبەختەکانی رون کردەوە، حاڵو خۆشبەختی بەختیارەکانیش رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوونو لەدونیادا کردەوەی باشیان ئەنجام داوە دەخرێنە ناو باغەکانی بەهەشتەوەو بەعیزەتو خۆشیدا ژیان بەسەر دەبەن، باغەکانی بەشێوەیەکن بەژێر درەختەکانیاندا جۆگەو جۆبار دەکشێنو وەندەی تر باخەکان دەرازێننەوە، بۆ هەتا هەتایە ئەو خودا پێداوانە لەناو بەهەشتدا دەمێننەوەو وەغری لێ ناکەن، ئەو کامەرانیو سەروەرییە کە دەستیان دەکەوێ ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ بەتۆفیقو ویستی خودایە چنگیان دەکەوێ: بەهۆی ئەوەوەیە کە خودا لەدونیادا ڕێنومایی کردون بۆ چاکە کردنو روکردنە کارێك خوداو پێغەمبەر پێیان خۆش بووە،

﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾ فریشتە بەسەلامکردن لێیان هەواڵیان دەپرسن، خۆیان لەناو خۆیاندا سەڵاو لەیەکتری دەکەن،

وەکوو لەچەند شوێنی تردا ئامازەی بۆ ئەم سڵاو لێ کردنە دەکاو دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾الزمر/٧٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَالمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَلاَمٌ عَلَيْكُم﴾الرعد/٢٣-٢٤، یان دەفەرموێ: ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَاماً﴾الفرقان/٧٥، یان دەفەرموێ: ﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾یونس/١٠، سەرباری هەموو خۆشیەکی بەهەشت سەلامی پەروەردگارە لێیان وەکوو دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ قَوْلاً مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾یس/٥٨.

ـەشكونجێ رستەی ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لەفەرمایشتی خودا بێو ـۆتیی حیوارەكەی پێ هێنابێ!

ئـەمجار دوای ئـەوەی حـاڵو وەزعـی بەدبەختـەكانی رون كـردەوە، حـاڵو حۆنیەتی بەختیارەكانیش رون دەكاتەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا ـتـحت جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوونو ـەدونیادا كـردەوەی باشـیان ئـەنجام داوە دەخرێنـە نـاو باغـەكانی بەهەشـتەوەو ـەـزەتو خۆشـیدا ژیـان بەسـەر دەبـەن، باغـەكانی بەشـێوەیەكن بـەژێر ـرەختـەكانیاندا جۆگـەو جۆبـار دەكشێنو وەنـدەی تـر باخـەكان دەرازێننـەوە، بۆ هەت هەتایە ئەو خودا پێداوانە لەناو بەهەشتدا دەمێننـەوەو وەغـری لـێ ناكـەن، ـەم كامـەرانیو سـەروەرییە كـە دەسـتیان دەكـەوێ ﴿بِـإِذْنِ رَبِّهِـمْ﴾ بـەتۆفیقو هیـیمەتی خودایە چنگیان دەكەوێ: بەهۆی ئەوەوەیە كە خودا لەدونیادا ڕێنومایی كردون بۆ چاكە كردنو روكردنە كارێك خوداو پێغەمبەر پێیان خۆش بووە،

﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾ فریشتە بەسەلامكردن لێیان هەواڵیان دەپرسن، خۆیـان ـەـو خۆیاندا سەڵاو لەیەكتری دەكەن،

وەكـوو لەچـەند شـوێنی تـردا ئامـاژەی بـۆ ئـەم سـلاو لـێ كردنـە دەكـاو ـەـەرموێ: ﴿حَتَّـى إِذَا جَاؤُوهَـا وَفُتِحَـتْ أَبْوَابُهَـا وَقَـالَ لَهُـمْ خَزَنَتُهَـا سَـلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾الزمر/٧٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَالمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَلَامٌ عَلَيْكُم﴾الرعد/٢٣-٢٤، یان دەفـەرموێ: ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّـةً وَسَـلَاماً﴾الفرقـان/٧٥، یـان دەفـەرموێ: ﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَـلَامٌ وَآخِـرُ دَعْـوَاهُمْ أَنِ الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾یونس/١٠، سەرباری هـەموو خۆشیەكی بەهەشت سـەلامی پـەروەردگارە لێیـان وەكـوو دەفـەرموێ: ﴿سَـلَامٌ قَـوْلاً مِـن رَّبٍّ رَّحِـيمٍ﴾یـس/٥٨.

ئیرادەی خۆتان بەبێ ئەوەی من بەڵگەو دەلیلێکم پێ بێ، ئامادەباشی خۆتان نیشان داو شوێنم کەوتن، خراپەم لەدڵ شیرین کردن، ڕێبازی لارو لوێرم لەپێش چاو جوان کردن، بێ سێو دو ملتان لێنا، بانگەوازی پەروەردگارتان پشت گوێ خست، هەرچەن بانگەوازییەکەی خودا ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە بەهێزانەی لەتەك دابوون، بۆ خۆتان بەخۆتان کرد!

دڵنیابن ﴿مَا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنْتُمْ بِمُصْرِخِيَّ﴾ من ناتوانم رزگارتان بکەمو هیچ کۆمەکییەکی ئێوەم پێ ناکرێ، سزای دۆزەخم لەسەر ئێوە بۆ سوك ناکرێ، ئێوەش ناتوانن هیچ یارمەتیەکی من بدەنو بۆتان ناکرێ عەزابم لەسەر سوك بکەن! ئاواو بەو شێوە دەست لەیەکتریی بەردەدەنو خۆیان لەیەکتری بەری دەکەن! بەجۆرێك کە لەنێوانیاندا هیچ وادەو پەیمانێك نەبووبێ، ئەمجار بەرانەتی خۆی لەوە رادەگەیەنێ: کە بەهاوەڵی خودایان زانیوە، ئەو بوون بەهاوەڵەی بۆ خودا رەت دەکاتەوەو دەڵێ: ﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ﴾ ئەمن ئەوە رەت دەکەمەوە کە هاوشانو هاوەڵی خودابم، ئەوەی لەدونیادا بۆ منتان دانابوو بەشەریکی خوداتان حیساب کرد بوم، ئەمرۆ رەتی دەکەمەوەو بڕوام پێی نیەو لێی بێ بەریم!!

وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾فاطر/١٤، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ﴾الممتحنة/٤، یان دەفەرموێ: ﴿كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدّاً﴾مریم/٨٢.

ئەمجار شەیتان وتارەکەی بەم رستەیە کۆتایی پێ دێنیو بەردێکی گەورە دەخاتە سەر دڵیانو پێیان دەڵێ: ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بێگومان ستەمکاران سزای بەئێشیان دەدرێو لەعەزابی سەختدا ژیانی قیامەتیان بەسەر دەبەن! ئای لەشەیتانو وای لەو چاودێرو سەرپەرێشتیکارەی بانگی کردن بۆ گومڕاییو شوێنی کەوتن،

دەشکونجێ رستەی ﴿إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لەفەرمایشتی خودا بێ‌و کۆتایی حیوارەکەی پێ هێنابێ!

ئەمجار دوای ئەوەی حاڵ‌و وەزعی بەدبەختەکانی رون کردەوە، حاڵ‌و چۆنیەتی بەختیارەکانیش رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوون‌و لەدونیادا کردەوەی باشیان ئەنجام داوە دەخرێنە ناو باغەکانی بەهەشتەوەو لەلەزەت‌و خۆشیدا ژیان بەسەر دەبەن، باغەکانی بەشێوەیەکن بەژێر درەختەکانیاندا جۆگەو جۆبار دەکشێن‌و وەندەی تر باخەکان دەرازێننەوە، بۆ هەتا هەتایە ئەو خودا پێداوانە لەناو بەهەشتدا دەمێننەوەو وەغری لێ ناکەن، ئەم کامەرانی‌و سەروەرییە کە دەستیان دەکەوێ ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِمْ﴾ بەتۆفیق‌و هیدایەتی خودایە چنگیان دەکەوێ: بەهۆی ئەوەوەیە کە خودا لەدونیادا رێنومایی کردون بۆ چاکە کردن‌و روکردنە کارێك خوداو پێغەمبەر پێیان خۆش بووە،

﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلامٌ﴾ فریشتە بەسەلامکردن لێیان هەواڵیان دەپرسن، خۆیان لەناو خۆیاندا سەڵاو لەیەکتری دەکەن،

وەکوو لەچەند شوێنی تردا ئاماژەی بۆ ئەم سڵا و لێ کردنە دەکاو دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾الزمر/٧٣، یان دەفەرموێ: ﴿وَالمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَلاَمٌ عَلَيْكُم﴾الرعد/٢٣-٢٤، یان دەفەرموێ: ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَاماً﴾الفرقان/٧٥، یان دەفەرموێ: ﴿دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾یونس/١٠، سەرباری هەموو خۆشیەکی بەهەشت سەلامی پەروەردگارە لێیان وەکوو دەفەرموێ: ﴿سَلَامٌ قَوْلاً مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾یس/٥٨.

## نموونەی بەختەوەران و بەدبەختەکان

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا حاڵو چۆنیەتی بەدبەختەکانو سەرەنجامیان لەناو دۆزەخدا بەیان کرد، هەروەها حاڵو وەزعی موسوڵمانە بەختەوەرەکانی دیاری کردو بەمرازگەییشتنی راگەیاندن، نموونەی حاڵی هەردوو تاقمەکەو جوداوازی نێوانیان دشوبهێنێ، شتی مەعنەویو نامادی بەشتە هەست پێکراوەکان دەشوبهێنێ بۆ ئەوەی ماناکان لەناو ذیهندا بچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ﴾ ئایا نازانی ئەی ئەو کەسەی خیطابت ئاڕاستە دەکرێ؟ ئایا نابینی

پەروەردگار چۆن نموونـە دەهێنێتـەوە پەنـدو وشـەی حیکمـەت لەشـوێنی تایبـەتی خۆی دا دەنێ، وشەی پیرۆز: کەوشەی تەوحیدە، وشەی ئیسلامو بانگەوازی قورئانە دەشوبهێنێ بەدرەختێکی پیرۆزو پۆشناخ کە دارخورمایەو چوار دیاردەی پیرۆزی تێدان:

١- دارخورما: درەختێکی روخسار جوانو بۆنخۆشو میوەو بەروبوومەکەی بەسوودە تامی خۆشە،

٢- قەدەکـەی چەسـپاوەو رەكو ریـشالی بەزەویـدا رۆچـونو قـایمو پتـەوەو بەئاسانی هەڵناکەندرێ،

٣- لقو پۆپەکانی بەرز بوونـەوەو بەروبوومەکەی پاكو خاوێنـەو پوختـەو پاڵفتەیە،

٤- هەموو ساڵێك بەئیزنی خودا بەروبومی خۆی دەدا!

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: (الكلمـة الطيبـة) رسـتەی (لا الـه الا الله)یـە، (الـشجرة الطيبـة) دارخورمایـە، هـەمان راو تەفـسیر لـەئیبنو مەسـعوودو ئەنـەسو ئیبنو عومەر ریوایەت کراوە،

حەدیثەکەی ئیبنو عومەر ئیمامی بوخاری ریوایـەتی کـردووەو بـەم جۆرەیـە (كنا عند رسول الله ﷺ فقـال: أخبرونـي عـن شجرة تـشبه الرجـل المسلم أو كالرجـل المسلم لايتحات ورقها صيفاً ولا شتاءً، وتؤتي أكلها كل حين باذن ربها، فقال ابن عمر: فوقع في نفسي انها النخلة، ورأيت أبا بكر وعمر لايتكلمان، فكرهت أن أتكلم، فلما لم يقولوا شيئاً قال رسول الله ﷺ: هي النخلة)،

ئیبنـو عومـەر دەفـەرموێ: لەخزمـەت پێغەمبـەردا بـووین، پێمـانی فـەرموو: درەختێـك هەیـە وەکـوو پیـاوی موسـوڵمان وایـە، بـەهاوینو زسـتان گەڵاکـەی هەڵناوەرێ، هەموو ساڵێك بەئیزنی خـودا بـەروبوومی خـۆی دەدا، پـێم بڵێن: ئـەو

درەختە چیە؟! ئیبنو عومەر دەڵێ: کەوتە دڵمەوە ئەو درەختە دار خورما بێ، بەڵام بینیم ئەبو بەکرو عومەر گوێیان لێیەو قسە ناکەن، ئیتر من پێم ناخۆش بوو وڵام بدەمەوە، جا کە کەس دەنگی نەکرد، پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی فەرمووی: ئەو دارە خورمایە،

﴿بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ هەر بەو جۆرە پەروەردگار پەندو مەثەل بۆ ئادەمیزادان دەهێنێتەوە، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە رێبازی حەق بگرنە بەرو پێیدا بڕۆن، لەهێنانەوەی پەندو مەثەل زێدە تێگەیشتن‌و بیرخستنەوە هەیە، تەشبیهی مەعانی مەعقوول‌و نامادی بەشتی مادی ماناکان لەدڵی بیسەران دەچەسپێنێ، شك‌و گومان تەم‌و مژ دەرەوێنێتەوە، شتی نامادی وەکوو شتی مەلموس دەخاتە بەردەست!

ئەمجار پەروەردگار نموونەی وشەی کوفر دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ﴾ رەوشتی کەلیمەی پیس: کە وشەی کوفرو ئیشراکە وەکوو رەوشتی درەختێکی پیس وایە: ئەویش درەختی گوژاڵە یان درەختێك کە وەکوو ئەو بچێ،

ئەبو بەکری بەزار لەئەنەسەوە ریوایەتێکی بەمەوقوفی هێناوە، ئیبنو ئەبی حاتەم بەمەرفوعی ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ومثل كلمة خبيثة كشجرة خبيثة﴾ ئەو درەختە درەختی حەنظەلە لەئایەتەکەدا ئەو درەختە بەسێ رەوشت تەوصیف کراوە:

١- درەختێکی تام تاڵ‌و تفت‌و بۆن ناخۆش‌و زیانبەخشە،

٢- لەرەگ هەڵگەنراوەو بنك‌و رەگەکەی لەزەویدا نین، هەر دەستی بۆ ببەی بەئاسانی هەڵدەکەنرێ،

٣- چونکە رەگی بەزەویدا نەڕۆییشتونە خوار وکوو ئەوە وایە: کە راوەستانی نەبێ، یان شیاوی ئەوە نیە راوەستانی هەبێ،

بەپێگ گرتن‌و بەرامبەریکردن جودازی لەنێوان وشەی حەق‌و بەتاڵدا دەردەکەوێ، وشەی حەق کە وشەی یەکتاپەرستی‌و ئیمانە چەسپاوو رەگ‌و ریشە داکوتراوو بەسوودە بۆ ئادەمیزادان، وشەی بەتاڵ: کە وشەی شیرك‌و کوفرە بێ هێزو زیانبەخش‌و لەقۆك‌و لەرزۆکە،،

خاوەنی وشەی حەق موسوڵمان‌و خوداپەرستانی دامەزراون خاوەنی وشەی بەتاڵ کافرو یاخی بووەکانن،

بەکورتی ئەوانەی خاوەنی نەفسی بەرزو دڵی رۆشنن، موفەککیرو زاناو دانان، ئەوانە خاوەنی کەلیمەی پیرۆزن، زانیارییەکەیان سودبەخش‌و بەپیتە، دەبنە هۆی خێرو خۆشی بۆ گەل‌و نەتەوە، ئەم بەهرانە لەدڵ‌و دەروونیان جێگیرو چەسپاوە، لق‌و پۆپەکانیان بۆ ئاسمان بەرز بوونەوە بەهەر چوارلادا بڵاوبوونەوە، رەگ‌و ریشاڵیان داکوتاوە، هەموو کاتێ خێرو خۆشی‌و پیت‌و بەرەکەت بەگەل‌و نەتەوە دەبەخشن‌و ئادەمیزادیان لێ بەهرەمەند دەبێ، ئادەمیزاد شارەزا دەکەن بۆ رێبازی حەق‌و سەرفرازی، دەق دەشوبهێنە دار خورما بنکێکی قایم‌و پتەوی هەیە لق‌و پۆپەکانی لەبەرزی بەچوارلایدا پەخش بوون، ئادەمیزاد بەهاوین‌و بەزستان لەبەرەکەی دەخۆن،

خاوەنی بیری بۆگەن‌و پیس‌و مێشکی پوچ‌و بێ هیمەت‌و ناپیاو ئەوانەن نەفسیان زەعیفەو کوێرانە شوێن ئەم‌و ئەو دەکەون، هەر رۆژە بەزوڕنایەك دەژەنن بۆ پارت‌و گرۆهێك کڕنوش دەبەن‌و بانگەشە دەکەن، ئەوانەش خاوەنی کەلیمەی پیسن، دوا بیرو باوەڕی پوچ کەوتون‌و چڵکاوخۆری بێگانەن، لەزەرەرو زیان زیاتر هیچی تریان لێ ناوەشێتەوە، دەبنە بەڵاو ئافاتی روخێنەر بۆ گەل‌و

ولات دەق دەشوبهێنە درەختی گوژاڵك و بێ بەروبوومن، بێ رەگو ریشاڵن بەر قەرار نینو نابن!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە خاوەنانی کەلیمەی پیرۆز لەدونیاو قیامەتدا بەمراز گەیشتوو سەرفرازن! دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ واتە: پەروەردگار ئەوانەی ئیمانیان هێناوە راگیریان دەکا لەسەر ئەو گفتو بڕیارەی: کە لەژیانی دونیادا لەسەری بوون: کە ئەویش ئیمانی چەسپاوە لەدڵو دەروونیاندا؛ ئەو ئیمانەی کە بەڵگەو دەلیل لەدڵیاندا رەگی داکوتاوە، مەبەست ئەوەیە: جێگیر بوونو بەردەوام بوون لەسەر خوداناسیو طاعەت، پاداشی مسۆگەرو رێزو فەضلو بەخششی پەروەردگاری لێ وەدەست دێ،

یا مەبەست ئەوەیە: پەروەردگار لەدونیادا موسوڵمانان راگیرو دامەزراو دەکا؛ بەم جۆرە لەئایین ژێوان نابنەوەو لەسەر بیرو باوەڕی حەقیان بەردەوام دەبنو چەوسانەوەو ئەزیەتدانی کافران کاریان تێ ناکاو لەهەڵوێستی خۆیان نایەنە خوارێ؛ وەکوو بیلالی حەبەشیو هاوەڵانی چەندێك لەلایەن موشریکەکانی قورەیشەوە سزادران، ئەوان لەهەڵوێستی خۆیان پاشگەز نەبوونەوە، نموونەی موسوڵمانانی دامەزراو لەسەر ئایینو خاوەنی هەڵوێستی مەردانە لەسەر بیرو باوەڕی حەقو راستیان زۆرو زەبەندەیە، لاپەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتی پڕن لەباسو خواسی ئەو کەڵەمەردانەی کە بەبیرو باوەڕی حەقو خودا پەسندیان بەرەنگاری بەتاڵ بوونەوەو ئازارو ئەشکەنجەی ملهوڕان نەیانتوانیوە تۆزقاڵێك لەهەڵوێستی خۆیان ژێوانیان بکەنەوە!

راگیر کردنو دڵ دامەزراوییان لەقیامەتدا لەم رووەوەیە: کە لەکاتی لێکۆڵینەوەو حیساب لەگەڵ کردندا لەوەڵامی پرسیاردا زمانیان تێکەڵو پێکەڵ

نـابێو بـەزمانی رەوانو لەسـەرەخۆو ژیرانـە وەڵام دەدەنـەوەو تـەنگو چـەڵەمەی مەحشەر نایانترسێنێ،

هەنـدێك دەڵێن: قسەی مەشهوورو باو ئەوەیـە: کـە مانـای ئایەتەکـە ئـەوەبێ: ئەباتو دامەزراو بێ لـەکاتی پرسیارو وەڵامـی گۆڕدا، مەبەسـت بـە(الحیـاة الـدنیا) مـاوەی ژیـانی دونیـابێ، مەبەسـت بـە(وفي الآخـرة) رۆژی قیامـەتو حیـسابو لێکۆڵینەوەی ئەو رۆژە ئەستەمو پڕکارەساتەبێ،

بوخـاریو موسـلیمو ئەحمـەدو هـی تـریش، هـەموویان لەبـەرائی کـوڕی عازیبـەوە ریوایـەتیان کـردوە: کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: (المسلم اذا سئل في القبر، شهد أن لا اله الا الله، وأن محمداً رسول الله فذلك قوله: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُـوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ هـەمان ریوایـەت لەئـەبو هورەیرەیـشەوە ریوایەت کراوە،

ئیبنو ئەبی شەیبە هەمان فەرموودەی پێشووی لەبەرائەوە ریوایـەت کـردوەو ئـەمجار دەربـارەی ئایەتەکـە وتوویـەتی: مانـای تـەثبیـت لـەجیهاندا ئەوەیـە: کـە ئادەمیزاد دەمرێو لەگۆڕدا دوو فریشتە دێنە لایو پێـی دەڵێن: خـودای تـۆ کێیـە؟ دەڵێ: خودام (الله)یە، دەڵێن لەسەر چ ئایینێك بـووی؟ دەڵێ لەسـەر ئـایینی ئیسلام بوم، دەڵێن: پێغەمبەرت کێیە؟ دەڵێ: پێغەمبەری من حەزرەتی محەممەدە ﷺ،

ئەبو داوود لەعوثمانی کوڕی عەففانەوە ریوایـەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبـەر ﷺ کـە لـەدفن کردنـی مـردو دەبـووەوە لەسـەر گۆڕەکـەی رادەوەسـتاو دەیفـەرموو: (اسـتغفروا لأخـیکم، واسـألوا لـه التثبیـت، فانـه الآن یـسأل) داوای لێخۆشـبوون بـۆ براکـەتان بکـەن، لـەخودا بپاڕێنـەوە دامـەزراوبێ، لـەکاتی پرسـیار لێکردنـی فریشتەکاندا نەشڵەژێ، چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ،

ئیمامی رازی لەکاتی راڤەکردنی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: قسەی باو ئەوەیە: ئەم ئایەتە دەربارەی پرسیارو وەڵامی فریشتە لەگۆڕدا هاتبێتە خوارێ، واتە: خودا موسوڵمان دەرس دادەداو لەگۆڕدا فێری کەلیمەی حەقی دەکا، لەکاتی پرسیاری دوو فریشتەکەدا دامەزراوی دەکا بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بەشێوەیەکی حەق‌و راست،

ئەمجار قورئان وەك‌و ئوسلوب‌و شێوازی خۆی ئاکام‌و سەرەنجامی کافرانیش دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەردگار ناهێڵی کافرو ستەمکارەکان بەمراز بگەن، لێیان دەگەڕێ لەگومڕایی خۆیاندا بمێننەوە، چونکە ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە ئیمان بهێنن، قاچیان هەڵخلیسکاوەو کەوتوونە ناو قوڕەلیتەی شەهوەت‌و ئارەزۆ بازییەوە،

واتە: پەروەردگار ستەمکاران وا لێ دەکا لەگۆڕدا زمانیان تێکەڵ‌و پێکەڵ بێ‌و نەتوانن وەڵامی راست بدەنەوە!!

ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم‌و بەیهەقی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن: دەڵێ: کافر کە مردن یەخەی پێ دەگرێ فریشتە دێنە سەری لەپێشەوەو لەدواوە لێی دەدەن، جا کە خرایە ناوگۆڕەوە بەهۆش خۆی دێتەوەو دای دەنیشێنن پێی دەڵێن: خودای تۆ کێیە؟ وەڵام ناداتەوە، خودا ناوی پەروەردگاری لەبیر بردۆتەوە، ئەمجار پێی دەڵێن: ئەو پێغەمبەرەی بۆ سەر ئێوە رەوانە کراوە کێیە؟ ناتوانێ وەڵام بداتەوە، ئا ئەمەیە: کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ﴾.

ئەمجار لەکۆتایی ئایەتەکەدا پەروەردگار دەربارەی هەردو تاقمەکان مەشیئەتی رەهاو بێ سنووری خۆی رادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ﴾ واتە: بەگوێرەی مەشیئەت‌و ویستی خۆی یاسای بوونەوەر دادەنێ‌و پێی رازی دەبێ، تا ئەو کاتەی حیکمەت‌و دانایی خۆی داخوازی ئەوە دەبێ بیگۆڕێ

ئەوکاتەش لەچوارچێوەی مەشیئەتو دەسەڵاتی خۆیدا یاساکە دەگۆڕێ، چی بوێ چۆنی بوێ ئەوە دەکا، ئەگەر مەیلی لێ بێ ئەم هیدایەت دەداو ئەو گومڕا دەکا، گومڕا کردنی ئادەمیزاد لەدونیادا بریتییە لەوە کە لەبەردەم فیتنەو هەواو ئارەزۆبازیدا خۆناگرنو قاچیان هەڵدەخلیسکێ، لەقیامەتیشدا گومڕاتر دەبنو ریسواتر دەبن!!

گومڕا بوونەکەیان لەم روەوەیە: کە ئامادەباشییان بۆ شەڕ تێدایەو ئارەزۆی نەفسییان کردوە بەرابەری خۆیان.

## سپڵەیی کافران بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا، فەرمان بەموسوڵمانان بەوە نوێژەکانیان ئەنجام بدەنو ماڵی خۆیان ببەخشن

﴿ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ ۗ قُلْ تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ﴾

دواى ئەوەى پەروەردگار حاڵو وەزعى بەختەوەرانو بەدبەختەكانى نمايش كرد، دێتەوە سەر باسى ئەوانەى سپڵەيى بەرامبەر نيعمەتەكانى خودا دەكەن! ئەوانيش دانيشتوى مەككەو دەورو بەرينى: كە خودا ئەو نيعمەتانەى خۆى بەسەردا رشتون؛ لەوڵاتێكى ئارامو دوور لەشەڕ نيشتەجێى كردون، ژيانو گوزەرانى خۆشى پێداون، حەزرەتى موحەممەدى كردۆتە پێغەمبەرو سەرەتا بانگەوازيكردنى ئەوانى پێ سپێراوە كەچى لەجياتى ئەوەى شوكرانە ژمێربن سپڵەو پێ نەزانن،

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْراً وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ﴾ ئايا تۆ سەيرى حاڵو وەزعى سەيرو سەمەرەى ئەو بەدبەختانە ناكەى!؟ سەرنج نادەيە حاڵى ئەوانەى نيعمەتى زۆرو زەبەندەى خوداوەندييان پێدراوە: كە هەندێ لەو نيعمەتانە ناردنى پێغەمبەرە بۆ سەريان؛ بانگەوازييان دەكا بۆ ئيمان، سەرۆكايەتييان دەكا بۆ رێبازى لێخۆشبوونو بۆ سەرەنجامو ئاكامێك كە بەهەشتە! كەچى واز لەهەموو ئەو نيعمەتانە دەهێننو لەجياتى ئەوان كوفر وەردەگرن! ئەو نەفامانە پياو ماقوڵو ريش سپى گەلەكەى تۆن ئەى موحەممەد! هەڵسو كەوتى ئەمانيش وەكوو هەڵسو كەوتى هەموو پياو ماقوڵو ريش سپى گەلو نەتەوەكانى تر وايە، بەم هەڵسو كەوتە ناشيرينو نابەجێيەيان گەلو هۆزەكەى خۆيان بەرەو دۆزەخ رەوانە دەكەن! لەناو دۆزەخدا شوێنو جێگايان بۆ داناون!!

بەڵێ خانووى هيلاكەتيان بۆ ئامادە كردون، ئەو خانوە شومەش ﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ﴾ دۆزەخە دەچنە ناوىو دەخرێنە ناوى، بەراستى خراپ قەرارگايەكە ئەوان دەچنە ناوى،

ئەوان لەئاستى نيعمەتى رەوانەكردنى پێغەمبەر بۆ سەريانو بانگەوازى كردنى پێغەمبەر بۆيان سپڵەييان نواند، ئەو بانگيان دەكا بۆ يەكتاپەرستى، ئەوان پشت هەڵدەكەنو سوور دەبن لەسەر كوفرو بێدينى!!

﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَاداً لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِهِ﴾ ئەوانە چەند هاوەڵو هاوشانیان بۆ خودا داناوە، وەکوو خودا دەیانپەرستن، بەندایەتییان بۆ دەکەن، وەکوو بەندایەتیکردن بۆ خودا، تایبەتمەندی وایان بۆ بەڕەوا دەزانن: کە هەر بۆ خودا دەشیەنو بۆ کەسی تر نابن، ئەم خودا درۆزنانەیان کردون بەهاوەڵی خودا بۆ ئەوەی ئاکامی کارەکانیان گومڕا کردنی ئادەمیزادان بێ لەرێگای یەکتاپەرستی، هەر کەسێك بەقسەیان بکا دەچێتە خانەی گومڕایانەوە،

(لام)ی (لیضلوا) (لام)ی عاقیبەتی پێ دەگوترێ، چونکە بتپەرستیو هاوەڵ دانان بۆ خودا هۆکارێکە سەردەکێشێ بۆ گومڕا بوون، چونکە گومڕا بوونی خۆیان نەویستووەو هەوڵیان بۆ نەداوە، بەڵام ئاکامی کارەکەیان گومڕا بوونە!

دەقی ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە پیاو ماقوڵو قسە رۆیشتوی گەلو نەتەوەکان بەئەنقەست هەوڵی ئەوەیان داوە رێگا لەرەشە خەڵکەکە بشێوێننو نەهێڵن بڕوا بەپێغەمبەران بکەن، جگە لەخودا خودا درۆزنەیان بۆ خۆیان دانابوون فەرمانیان بەرەشە خەڵکەکە دەکرد: کە بەندایەتییان بۆ بکەن،

بەڵێ بیرو باوەڕی یەکتاپەرستی لەهەموو رۆژگارێکدا خەتەرە لەسەر دەسەڵاتی ملهوڕانو بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان، نەك لەرۆژگاری جاهیلیەتی سەرەتاییدا، بەڵکوو لەرۆژگاری هەموو جاهیلیەتیەکدا کە ئادەمیزادەکان رو لەیەکتاپەرستی وەردەگێڕن، رێشمەی خۆیان دەدەنە ئاغاو دەرەبەگەکانیان، ئازادیو کەسایەتی خۆیان لەدەست دەدەنو ملکەچی هەواو ئارەزۆی ئەوان دەبن، یاساو شەریعەت لەبیرو بۆچوونی ئەو ملهوڕانە وەردەگرن، نیگاو سروشی پەروەردگار رەتدەکەنەوە،

ئا لەم کاتانەدا بەنگەوازی بۆ یەکتاپەرستی خەتەرە لەسەر ملهوڕەکانو بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە بەرپەرچی بانگەوازی یەکتاپەرستی دەدەنەوە، دژایەتی دەکەنو هەوڵی لەناوبردنی بانگەوازیکەرانی ئایینی حەقو راست دەدەن،

ئەی پێغەمبەر هەواڵیان بدەرێو پێیان رابگەیەنە ﴿قُلْ﴾ بەو گەلو نەتەوە نەفامە بڵێ: ﴿تَمَتَّعُوا﴾ لەززەتو خۆشی کەمو بێ بەقای ئەم ژیانی جیهانەتان بچێژن، تا ئەو کاتەی خودا بۆی داناونو ئەو ئەندازەی بۆی دەست نیشان کردون لەززەت لەژیان وەربگرن، سەرەنجامتان ئاشکرایە ﴿فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ﴾ پاداشو گەڕانەوەتانو حەوانەوەتان بۆ لای دۆزەخەو بۆ ناو دۆزەخە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾لقمان/٢٤، یان دەفەرمووێ: ﴿مَتَاعٌ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ الْعَذَابَ الشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ﴾يونس/٧٠، یان دەفەرمووێ: ﴿قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلاً إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ﴾الزمر/٨.

ئەی پێغەمبەر! واز لەئامۆژگاری کردنی ئەوان بێنە خۆماندو کردن لەگەڵیان بێ سوودە، ڕووبکەرە ئەوانەی گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانت دەگرن، قبووڵی نیعمەتەکانی پەروەردگار دەکەن! واز لەو کافرو ملهوڕو سەرڕەقانە بێنە، ڕووبکەرە ئەو کۆمەڵە خوداپەرستە، فێریان بکە چۆن شوکری خودا بکەن، چۆن بەندایەتی خۆیان رابگەیەنن،

ئەی فروستادە! ﴿قُلْ لِعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ فەرمان بەبەندە خاوەن باوەڕەکانم بکە بەئەو بەندانەی ئیمانیان هێناوە بەتاکو تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتیو هاتنی ڕۆژی قیامەت، پێیان بڵێ: با شوکرو سوپاسی خودای خۆیان بکەن: ﴿يُقِيمُوا الصَّلاةَ﴾ بەبەجێهێنانی نوێژەکانیان بەرێکو پێکی، چونکە نوێژ تایبەتمەندترین دیاردەی سوپاسکردنی بەندەیە بۆ پەروەردگار، عیبادەتێکە بریتییە لەیەکتاپەرستی!

﴿وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرّاً وَعَلانِيَةً مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لا بَيْعٌ فِيهِ وَلا خِلالٌ﴾ هەروەها پێیان بڵێ: ببەخشن لەو ماڵو دارایییەی پێمان بەخشیون، بەنهێنیو

بەئاشكرا ببەخشن، بەنهێنی: بۆ ئەوەی كەرامەتی پێ بەخشراوەكان و پیاوەتی بەخشندەكان بپارێزرێ، مالّ پێ بەخشینەكە نەبێتە مایەی خۆهەلّنانەوەو خۆبەزلزانی، بەئاشكرا ببەخشن لەهەر شوێنێك پێویست بوو ئاشكرا بێ، بەم جۆرە مەبەست ئەوەبێ خەلّكی چاوی لێ بكەن، یان زەكاتی مالّو سامان بوو، بەجێهێنانی فەرزو زەكاتی واجب بوو، ئەم بەنهێنی بەخشین و بەئاشكرا بەخشینە دەگەرێندرێتەوە بۆ هەستی موسولّمان خۆی و خۆی ئەم خالانە دەنرخێنێ!

ئەی موحەممەد! فەرمانیان پێ بكە مالّو سامانی خۆیان ببەخشن زەكات، سەرفیترە لەمالّی خۆیان دەربكەن بۆ ئەوەی رەصیدی سامانەكەیان گەشە بكا، با پەلە بكەن بۆ مالّبەخشین پێش ئەوەی رۆژی قیامەت بێ: كە لەو رۆژەدا فیدیەو كرین و فرۆشتنی تێدا نیە دۆستایەتی و خزمایەتی نامێنێ بۆ یارمەتیدان و رزگار بوون لەسزا، بەلّكوو لەو رۆژەدا ئەوەی فریا ئادەمیزاد دەكەوێ بیرو باوەری راست، كرداری چاك و لوطفی خودایە! رۆژی نەفسی نەفسییە،

وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾الحديد/١٥، یان دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلاَ تَنفَعُهَا شَفَاعَةٌ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ﴾البقرة/١٢٣، یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَّ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾البقرة/٢٥٤، نەك دۆستایەتی و برایەتی لەو رۆژەدا كەلّكی نامێنێ و بەس! بەلّكوو هەندێ دۆست و برادەر دەبنە دوژمنی یابە كوشتەی یەكترو راپۆرت لەیەكتری دەدەن وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾الزخرف/٦٧.

**بەڵگەی جۆراو جۆر لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی لەبوونەوەرو نەفسی ئادەمیزادەكاندا**

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّر لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار حاڵو وەزعی بەختەوەرانو بەدبەختەكانی رون كردەوە، چەند بەڵگەیەك دێنێتەوە لەسەر هەبوونی خودای كار ئافەریدەو تاكو تەنیاو زاناوخاوەن تواناو دەسەڵاتی رەهاو بێ سنووری، بۆ ئەوەی ئادەمیزادان هەڵبنێ بۆ شوكر كردنی پەروەردگارو بەدیهێنەری بوونەوەر، سەركۆنەی كافرەكان دەكا لەسەر رو وەرگێرانو پشت هەڵكردنیان لەتێفكرین لەنیعمەتە جۆراو جۆرەكانی یەزدان، كیتابی بوونەوەر دەكاتەوەو لاپەڕەكانی هەڵدەداتەوە، دێڕە سەرسوڕهێنەرەكانی دەكەونە ئاخاوتنو نیعمەتەكانی خودا نمایش دەكەن، لاپەڕە گەورەو زەبەللاحەكانی بوونەوەر یەكە یەكە هەڵدەداتەوە تا چاو هەتەر بكا

جۆرەها شێوەو رەنگ لەم نیعمەتانە نمایش دەکا: ئاسمانەکانو زەوی، خۆرو مانگ، شەوو رۆژ، بارانو هاتنە خوارەوەی ئاو لەئاسمانەوە، رسکانو سەوز بوونی گژو گیا لەزەویدا، دەریاو هاتووچۆی گەمیّ بەناویدا، کشانی جۆگەو جۆبارو ئاودانی زەویو پێگەیشتنی رزقو رۆزی، ئەم لاپەرە کەونییانە رادەنوێنرێن کەچی ئادەمیزاد لەبەر نەفامیو نەزانی سەیری ناکەن تێی نافکرن، نایخوێننەوە لێی ورد نابنەوە شوکرو سوپاسی خودا ناکەن لەسەر ئەو نیعمەتانە! بەراستی ئادەمیزاد سپڵەیەو نەزانو لاسارو نەفامە، ئەگینا دەبوو هەرگیز کوفرانی نیعمەت نەکەن،

**لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار دە بەڵگە دێنێتەوە لەسەر هەبوونی دەسەڵاتی خۆیو دەفەرموێ:**

١- ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئاسمانەکانی بەدیهێناونو بەرزی کردونەوەو بەئەستێرە رازاندونیەوە،

٢- ﴿وَالأَرْضَ﴾ زەوی دروست کردوەو رایخستووە، دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی زۆر لەدروستکردنی ئێوە گرنگترە، پڕن لەنیعمەتی جۆراو جۆر بۆ سوودو قازانجی ئێوە، هەست بەهەندێکیان دەکەنو بەهەندێکیان نازانن،

٣- ﴿وَأَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنْ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ﴾ دەبارێنێ لەبەرزاییەوە ئاو، بەهۆی ئەو ئاوەوە زەوی وشكو برینگ سەرلەنوێ زیندو دەکاتەوە، درەختو روەکی جۆراو جۆری تێدا دەروێنێ، کشتو کاڵی لێ بەرهەم دەهێنن، هەرچی پێویست بێ بۆ بژێوی ئادەمیزادو ئاژەڵو گیانلەبەرانی تر لەزەوی دەری دەهێنێ، جۆرەها میوەو بەروبوومی رەنگاو رەنگو خاوەن تامو بۆنو سوودی جودا جودا دەخولقێنێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّن نَّبَاتٍ شَتَّى﴾طه/٥٣.

٤- ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ﴾ کەشتیو گەمیکانی بۆ ئێوە رام کردون، واتە عەقڵو دەسەلاتی دروستکردنو بەکارهێنانی پێداون، وای لێ کردون بەسەر ئاوەوە دێنو دەچن لەم شار بۆ ئەوشارو لەم ولات بۆ ئەو ولات بەئیزنو رەزامەندی خودا، خۆتانو کالای خۆتانی پێ دەگوێزنەوە،

٥- ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنهَارَ﴾ سەرچاوەی ئاوی بۆ هەلقولاندون کانیاوو جۆگاو چۆمی بۆ بەدیهێناون، زەوی بۆ شەق کردون بۆ ئەوەی چۆمو روبارەکان لەم ولات بۆ ئەو ولات بکشێن سوودو قازانجی ژیان لەو چۆمانە وەردەگرن، جۆگاو نێرویان لێ هەلدەبەستن بۆ ئاو خواردنەوەو ئاودێرکردنی گشتو کالو پێویستیاتی تریش،

٦- ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ﴾ خۆرو مانگی بۆ رام کردون وای راهێناون بەردەوام لەهاتوچۆدا بن، شەوو رۆژ لێ براین بۆ گەشەپێدانو رێکو پێک کردنی ژیانی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترو درەختو روەکو شتی تریش، خۆرو مانگو ئەستێرەکانی تر هەموویان بێ راوەستان لەهاتوچۆدان هیچیان رێ لەویتریان ناگرێو نابێتە لەمپەر لەبەردەم ئەویتردا، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾يس/٤٠.

٧- ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ شەوو رۆژی راهێناون وای لێ کردون بەرێکو پێکی بەشوێن یەکتردا دێنو دەچن، جارێک شەو درێژ دەبنو رۆژ کورت، وەکوو لەزستاندا رودەدا، جارێکی تر رۆژ درێژ دەبن شەو کورت، وەکوو لەوەرزی هاویندا دێتەجێ، رۆژ کاتی هەولدانە بۆ دەستەبەرکردنی پێویستی ژیانو شەو کاتی حەسانەوەو ئارامگرتنە،

لەچەند شوێنێک قورئان ئاماژە بەم مانایە دەکا وەکوو دەفەرموێ: ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ

تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾الأعراف/٥٤، یان دەفەرموێ: ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾لقمان/٢٩، یان دەفەرموێ: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِ جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ﴾القصص/٧٣.

٨- ﴿وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ﴾ بەخشیویەتی بەئێوە ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد هەر شتێك داواتان کردبێ‌و بۆ داواکردن بشێ‌و پێویستتان پێی بێ‌و سوودی هەبێ، جا چون یەکە داواتان کردبێ یان پێتان نەزانبیبێ‌و داواتان نەکردبێ،

خیطابەکە بۆ رەگەزی ئادەمیزادە بۆ هەموو خاوەن عەقڵ‌و فامێکە کە شیاوی خیطاب لەگەڵ کردن بێ، چونکە پەروەردگار هەرچی لەزەویدا هەیە بۆ سودی ئادەمیزاد دروستی کردوە، ئەمجار شێوەی بەکارهێنان‌و سوود لێ بینین‌و داهێنانی خستۆتە ئەستۆی خۆیان، بۆ ئەوەی بەگوێرەی بیرو بۆچونی خۆیان، بەئەندازەی عەقڵ‌و ئەزمونی خۆیان، بەگوێرەی گەشە کردنی عەقڵی ئادمیزادییان‌و پێشکەوتنی هۆکارەکانی ژیان‌و وردە وردە بۆ سوودی خۆیان بەکاریان بێنن، بێگومان ئادەمیزاد لەچەرخی بیستەمدا گەیشتە تروپکی پێشکەوتن‌و داهێنان‌و کەشف کردنی بوونەوەرو دۆزینەوەی نهێنییەکانی مادە، بەپشتیوانی هێزی هەڵم‌و هەواو نەوت‌و کارەباو زەرەو شتی ترەوە زۆر پێشکەوتنی لەبوارە جیا جیاکانی ژیان بەدەست هێناوە پەی بەزۆر کون‌و کەلەبەری بوونەوەر بردوە،

﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لا تُحْصُوهَا﴾ ئەگەر بتانەوێ نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی کە خودا بەئێوەی داوە بیانژمێرن، ناتوانن ژمارەیان بکەن چونکە هێندە زۆرو جۆراو جۆرن لەژمارە نایەن، بەئێوە سەرژمێر ناکرێن، دەی کە ئێوە نەتوانن سەرژمێریان بکەن بەتەئکید ناتوانن شوکرانەی پێویستیشیان لەسەر بکەن،

طەلقی کوڕی حەبیب دەفەرموێ: مافی خودا زۆر لەوە قورسترە ئادەمیزاد پێی هەڵبگیرێ، نیعمەتەکانی زۆر لەوە زۆرترن کە بەندەکان بۆیان سەرژمێر بکرێن،،،

شافیعی دەفەرموێ: (الحمد لله الذي لایؤدی شکر نعمة من نعمه الا بنعمة حادثة توجب علی مؤدیها شکره بها)، سوپاس و ستایش بۆ خودایەکی ئەوتۆیە شوکرانە ژمێری نیعمەتێك لەنیعمەتەکانی ئەنجام نادرێ ئەگەر نیعمەتێکی تری نەبێ بەو نیعمەتە شوکری نیعمەتەکەی تری پێ بکا،

سەعدی شیرازی لەدیباچەی گولوستانەکەیدا دەفەرموێ: سوپاس و ستایش بۆ خودایەکە: کە هەر هەناسەیەك ئادەمیزاد هەڵیدەمژێ شایانی دو شوکرە چونکە کە هەناسە هەڵدەمژێ دەبێتە هۆی درێژە پێدانی ژیان، کە هەناسەش دەداتەوە گیان و جەستەی پێ ئاسوودە دەبێ،

دەی چۆن ئادەمیزاد دەتوانێ نیعمەتەکانی خودا سەرژمێر بکا؟ کەی لەتوانایدا هەیە شوکرانەی ئەو نیعمەتانە بکا؟!،

ئایا هەموو ئەم بوونەوەرە بۆ خزمەتی ئادەمیزاد راهێنراوە؟ ئایا ئەم بوونەوەرە گەورەیە تەسخیر کراوە بۆ ئەم مەخلووقە پچکۆلە؟ ئاسمان ئاوی لێ دێتە خوارێ، زەوی ئاوەکە وەردەگرێ، میوەو دانەوێڵە لەم تێکەو لێکەدا بەرهەم دێن، دەریا تەسخیر کراوە بۆ ئەوەی کەشتی بەئیزنی خودا بەناویدا هاتوچۆ بکا، چۆم و روبار دەکشێن و دەبنە هۆی ژیان و بەرهەم هێنانی رزق و رۆزی و بەرژەوەندی ئادەمیزاد دەستەبەر دەکەن، خۆر و مانگ رامکراون و بەردەوامن لەهاتوچۆداو ساتە وەختێك حەجمینیان نیە، شەو رۆژ بەشوێن یەکدا دێن و دەڕۆن،،،هتد، ئایا هەموو ئەمانە لەبەر خاتری ئادەمیزادە؟ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا یادی ناکاتەوەو شوکر و سوپاسی ناکا؟!

﴿إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ بەراستی ئادەمیزاد ستەمکارو سپڵەو بێ وەفایە،

تێبینی ئەوە دەکرێ: پەروەردگار لەکۆتایی ئەم ئایەتەدا فەرمووی: ﴿إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ لەسورەتی (النحل/١٨)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ اللّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ جوداوازی نێوان ئەم دوو کۆتاییە ئەوەیە: قسەو باس لێرەدا بۆ سەرژمێر کردنی هەڵوێستە ناشیرینەکانی ئادەمیزادە: کە بریتییە لەکوفرانی نیعمەتو ستەمکاریو شەریك دانان بۆ خودایە، لەسورەتی (النحل)یشدا مەبەست ژماردنی فەضلو بەخششی پەروەردگارە بەسەر ئادەمیزاددا، بڕێکیش لەو فەضلو بەخششانە لێخۆشبوونو رەحمەتە ئەم دوو صیفەتەی خۆی خستنە کۆتایی ئایەتەکەوە بۆ ئەوەی بەندەکانی هەڵبنێ بۆ گەڕانەوەو تۆبە کردن،

ئیمامی رازی لێرەدا دەفەرموێ: جوداوازی نێوان ئایەتەکان لەم روەوەیە: پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزادینە! کە من نیعمەتی زۆرو هەمە جۆرم رەخساندن ئێوە وەریان دەگرنو من دەیانبەخشم، کە تۆ نیعمەتەکانم وەردەگری دوو رەوشت دەنوێنی: ستەمکاریو هاوەڵدانانە بۆ خودا، منیش دوو رەوشتم هەن لەو کاتەدا: لێخۆشبوونو بەبەزەییە،

واتە دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئێوە ستەمکار بن من لێبوردووم، ئەگەر ئێوە سپڵەو پێنەزان بنو کوفرانی نیعمەتەکانم بکەن، من رەحیمو خاوەن بەزەییم، دەزانم کەمتەرخەمن، کەمتەرخەمیەکەتان بەسزا وەڵام نادەمەوە.

## نزاو پاڕانەوەی ئیبراهیم بەرەو ڕووی کابە

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ

وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ﴿٤١﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار بەبەڵگەی جۆراو جۆر ئەوەی چەسپاند: کە هیچ خودای پەرستراوی حەق نین جگە لەپەروەردگار، ئەوەی راگەیاند کە بەندایەتیکردن بۆ غەیری خودا دروست نیە، داوای لەپێغەمبەر کرد کە سەرسام بێ لەحاڵی ئەوانەی بتپەرستی دەکەن!

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی حەزرەتی ئیبراهیم دەکا: کە باپیرە گەورەی عەرەبەو قورەیشییەکان لەئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمەوە کەوتوونەوە، ئەو ئیبراهیمەی لەخودا پاڕایەوە کە شاری مەککەو دەورەبەری بکاتە شاری ئاشتیو تەبایی، خۆیو کوڕو نەوەکانی لەبتپەرستی بپارێزێ!! ئەوەشی راگەیاند: کە بڕێ لەکوڕو نەوەکانی لای ماڵی خودا جێنشین کردون، بۆ ئەوەی یەکتاپەرستی ئەنجام بدەن، نوێژ کە گەورەترین تاعەتە بۆ خودا ئەنجامی بدەن، هەروەها حەزرەتی ئیبراهیم شوکرو سوپاسی خودای کرد لەسەر ئەوە بەپیریو دوای ناهومێد بوون لەمنداڵ، خودا دوو کوڕی پێ بەخشین: کە ئیسماعیلو ئیسحاق بوون، هەروەها داوای لێخۆشبوونی بۆ خۆیو باوکو دایکو موسوڵمانان کردو داوای رزگاربوونی رۆژی حیسابو لێکۆڵینەوەی بۆ کردن!

دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِناً﴾ ئەمە یاد خستنەوەی پەروەردگارە بۆ ئادەمیزاد، بەڵگە هێنانەوەی مێژووییە بۆ موشریکەکانی قورەیش بەوە: کە مەککە شاری خودا پەرستییە، هەر لەکۆنەوە دامەزراوە بۆ خوداپەرستیو یەکتاپەرستی، هەر لەکۆنەوە حەزرەتی ئیبراهیم لەوانە بەری بووە: کە جگە

لەخودا شتی تر دەپەرستن، هەر ئەویش بوو لەخودا پاڕایەوە: کە شاری مەککە بکاتە شاری ئاشتیو تەبایی،

واتە: ئەی موحەممەد! یادی ئەوە بکەرەوە، ئەم راستییە بۆ گەلەکەت بگێرەوە: ئەو کاتەی ئیبراهیم لەخودا پاڕایاوە: وتی: خودایە! ئەم شاری مەککەیە بکەرە شارێکی وا ئەمنو ئاسایشی تێدا بەرقەرار بێ، کەس خوێنی کەسی تێدا نەڕێژێ، کەس تێیدا ستەم لەکەس نەکا، بێگومان پەروەردگار ولأمی نزاکەی دایەوە دوعاکەی قبوولْ کرد، کردی بەشارێکی ئەمینو ئارام بۆ ئادەمیزادو باڵندەو درەختو رووەك، ئادەمیزادی تێدا ناکوژرێ نێچیری تێدا راو ناکرێ، درەختی تێدا نابڕدرێ، هەر کەسێ چووە ناوی دەگەوێتە ناو حەرەمەوە ئیتر لەوێدا ناکوژرێتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَماً آمِناً﴾العنكبوت/٦٧، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِناً﴾آل‌عمران/٩٧.

بەراستی حەزرەتی ئیبراهیم نموونەی ئادەمیزادی کاملی خوداپەرستی لەخودا ترس بووە، دەم بەذیکرو سوپاسگوزار بووە، باوکی پێغەمبەرانو خۆشەویستی خودا بووە، خودای بەباش ناسیوەو بەندایەتی بۆ کردوە، خودای بەباشی ناسیوەو لێ ترساوە: نموونەی بەندەی راستاڵو موخلیص بووە،

سیاقی قورئانەکە وێنەی ئیبراهیم دەکێشێ کە لەپەنا ماڵی خودادا راوەستاوەو دەستی نزاو پاڕانەوەی بەرز کردۆتەوە بۆ لای پەروەردگارو لەدیمەنێکی پڕ لەخشوعو خوضوعدا لەخودا دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خودایە! ئەم شارە بکەیتە شاری ئاشتیو ئاشتەوایی ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الأَصْنَامَ﴾ خودایە! خۆمو کوڕو نەوەکانم بپارێزە لەوەی بتپەرستی بکەن، دوورمان بخەرەوە لەو کارە ناشیرینە ماڵوێرانکەرە، هیدایەتمان بدەو وامان لێ بکە: کە یەکتاپەرسەتی بکەینو عیبادەتمان خاڵص بۆ تۆ بێو کەس نەکەین بەهاوەڵو شەریکت!!

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە پێویستە ئادەمیزاد دوعا بۆ خۆیو باوكو دایکیو کوڕو نەوەی بکا، بێگومان دوعای ئیبراهیم هەندێکی گیرا بوو هەندێکیشی نا، حەزرەتی ئیبراهیم کە بەو دڵە گەرمەوە، بەو بیرو باوەڕە پتەوە دامەزراوەوە، بەو زوبانە شوکرانە ژمێرییەوە دەپاڕێتەوە دەیەوێ سەرڕەقو یاخی بووەکان بگێڕێتەوە بۆ ئیعتیراف کردن بەخودایەتی خودا، کافرەکان لەجیاتی سپڵەیی بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا شوکرانە ژمێر بن، بێ ئاگاکان بەئاگا بێنەوە، سەر لێ شێواوو لادەرەکانی نەوەو وەچەکانی بگەڕێنەوە سەر رێبازی بابە گەورەیانو شوێن رێو رەسمی ئەو بکەونو ئیبراهیم بکەنە رابەرو پێشەواو دابو نەریتی ئەو پەیرەو بکەن، دژی بتو بتپەرستی بن!!

ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم ئەوە رادەگەیەنێ: کە زوربەی زۆری ئادەمیزاد بەهۆی بتو ئەصنامەوە گومڕا بوونو فەرمووی: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيراً مِنْ النَّاسِ﴾ خودایە! بەراستی ئەوبتانە بوونە هۆی گومڕا بوونی زوربەی زۆری ئادەمیزاد لەرێگەی حەقو هیدایەت، بەجۆرێك کردویانن بەخوداو دەیانپەرستن، هەڵبەتە وەپاڵدانی گومڕاکردن بۆ بتەکان لەروی مەجازەوەیە، ئەگینا بتو صەنەم بێ گیانو دەسەڵاتی هیچیان نیە،

ئەمجار درێژە بەپاڕانەوەکەی دەداو دەڵێ: ﴿فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي﴾ جا کەسێك بڕوا بەمن بکاو لەسەر بیرو باوەڕی من بێ لەسەر مەنهەجو رێبازی من ئیمانی بەتۆ هەبێو راستاڵانە یەکتاپەرستی بکا، ئەوە لەمنەو لەسەر رێبازی منەو لەپێڕی منە،

﴿وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ کەسێکیش پێچەوانەی فەرمانی من بکا، وەڵامی بانگەوازییەکەم نەدەنەوە، یەکتاپەرستی ئەنجام نەدەن، ئەوە عائیدە بەتۆیەو بۆ خۆت زاناو ئاگاداری، دەتوانی لێیان خۆش بێو تۆبەیان لێ وەربگرێو هیدایەتیان بدەی بۆ رێگای راست،

عەبدوڵلای كوڕی عـەمر دەفـەرموێ: پێغەمبـەر ﷺ ئـەم وتەیـەی ئیبراهیمی خوێندەوە كە دەفـەرموێ: ﴿رَبِّ إِنَّهُـنَّ أَضْـلَلْنَ كَـثِيراً مِـنْ النَّـاسِ ،،الآيـة﴾ وتەكـەی حەزرەتی عیساشی خوێندەوە: كە دەفەرموێ: ﴿ان تعـذبهم فـانهم عبـادك﴾ ئـەمجار پێغەمبەر ﷺ دەستی نزای بەرز كـردەوە فـەرمووی: (اللهم أمـتي، اللهم أمـتي، اللهم أمـتي) ئـەمجار دەسـتی كـرد بـەگریان، پـەروەردگار فـەرمانی بـەجوبرائیل كـردو فەرمووی بـچۆ بـۆ لای موحەممـەد (خـودا باشـتر دەزانـێ) پێـی بڵـێ: بـۆ دەگریـەی؟! جوبرائیل هاتو پرسیاری لێ كرد، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی پێویست بوو پێی فەرموو: ئەمجار پەروەردگار بەجوبرائیلی فەرموو: بچۆ بـۆ لای موحەممـەد پێـی بڵـێ ئێمـە نەو رازی دەكەین‌و دەربارەی ئوممەتەكەی نیگەرانی ناكەین!

ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم دوعاو پاڕانەوەیـەكی تـری ئاڕاسـتەی پـەروەردگار كردو وتـی: ﴿رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِـنْ ذُرِّيَّتِـي بِـوَادٍ غَيْـرِ ذِي زَرْعٍ عِنْـدَ بَيْتِـكَ الْمُحَـرَّمِ﴾ پەروەردگارا! خـۆت ئاگـادارو زانـای بـەوەی مـن بـڕێ لەمنـداڵ‌و خێزانـی خـۆم (كـە ئیسماعیل‌و ئەوانەی لەودەكەونەوە) جێنـشینم كـردوون لەشـیوو دۆڵێكـی رەقـەن‌و چـەقەن‌دا كـە شـیوی مەككەیـە، لای خـانووی حـەرەمی تـۆ كـە كابەیـەو سـوكایەتی پێكردنی ئەو ماڵەت یاساغ كردوە، دەورو بەرەكەیت كردوە بەحـەرەم‌و نـابێ كـەس دەستی بۆ درێژ بكا بەبێ رێزی سەیری بكا!

﴿رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلاةَ﴾ خودایە بۆیە ئەو خانوو دەورو بەرەت كردوە بەخاكی حـەرەم رێـزت داوەتـێ بـۆ ئـەوەی دانیـشتوانی بتـوانن نوێـژی تێـدا بكـەن‌و روی تێبكەن‌و بەیادی خودا پەرستی ئاوەدانی بكەنەوە، یەكتاپەرستی تێدا ئەنجام بدەن، ﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنْ النَّاسِ تَهْـوِي إِلَـيْهِمْ﴾ خودایـە! وا بكـە دڵ‌و دەروونـی ئـادەمیزادان وەگـری بـن‌و بەحـەزو ئـارەزۆوە بـۆی بـێن‌و بەهەڵـەداوان‌و پەلەپـەل سـەفەری بـۆ بكەن، دڵیان بۆ زیارەتی بكوركێنێ‌و حـەزیان لەدیـدەنی بـێ، خودایـە خۆشەویـستی ئەم خاك‌و زێدە بخەیە دڵی بەندەكانتەوە بەتاسوخەوە لەهەر چوارلاوە بكەونە رێ

بۆ دیدەنی ماڵی خۆت کە کەعبەیەو بینینی دانیشتوانی دەورو بەری، کە نەوەکانی منن،

﴿وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ﴾ خودایە! نەوەکانم، ئەوانەی لای ماڵی خۆت جێنشینم کردون رزق و رۆزییان بدە لەجۆرەها میوەو بەروبوومی وڵاتانی دونیا، لەهەر چوارلای جیهانەوە خواردەمەنی بۆ کێش بکرێ، بۆ ئەوەی بتوانن بەوپەڕی دڵسۆزیو لێبڕانەوە تاعەتی تۆ بکەن، هەروەها چونکە وڵاتەکە وڵاتێکی دێمو بێ کشتو کاڵو بەروبوومە، خودایە رزق و رۆزییان بۆ بڕەخسێنە!

پەروەردگار ئەم نزایەی ئیبراهیمی گیرا کردوەو لەو کاتەوە تا بەئەمڕۆش شاری مەککە میوەی جیهانی لێ نابڕێو نەبڕاوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَماً آمِناً يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقاً مِن لَّدُنَّا﴾القصص/٥٧، بەڵێ فەضلو گەورەیی خودا هاتووّتە جێ، هەرچەندە لەمەککە داری بەرداری تێدا نیە، کەچی میوەی وڵاتانی دەورو بەری بۆ راگوێز دەکرێ، چوار فەسڵی ساڵ بێ میوە نابێ،

خودایە! رزق و رۆزییان بدە ﴿لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ بەڵکوو سوپاسو ستایشی نیعمەتەکانت بکەن، یان تا باشتر نوێژەکانیان ئەنجام بدەنو بەلێبڕانەوە بەندایەتیت بکەن!!

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە دەبێ مەبەست لەوەدەست هێنانی سوودە ماددییەکان ئەوە بێ یارمەتدەربن بۆ ئەنجامدانی خودا پەرستیو طاعەتکردن،

حەزرەتی ئیبراهیم لەدوعاو پاڕانەوەکەیدا موراعاتی ئەدەبو دابو نەریتی پاڕانەوەی کردوە، لالانەوەو نوزانەوەی تێدایە، رانواندنی پێویستاتی خۆیو نەوەکانیو کێشکردنی رەحمەتو بەزەیی خودای تێدایە، بۆیە خودا دەعاکەی گیرا

کـردو پێداویـستیەکانی پـێ بەخـشین، ئەمـەش شـتێکی ئاسـاییە، ئـەو بـە(خلیـل الرحمن) ناو دەبرێو باوکی پێغەمبەرانە،

﴿رَبَّنَـا إِنَّـكَ تَعْلَـمُ مَـا نُخْفِـي وَمَـا نُعْلِـنُ﴾ پـەروەردگارا! بێگومـان زاتـی پاکـت ئاگـادارەو دەزانـێ بۆچـی لێـت دەپارێینـەوە، ئاگـاداری نهێنـی نـاو دڵمـانیو ئـەوەی بەئاشـکرا دەیڵێین، ئـەتۆ زۆر زانـاتری بـەحاڵو وەزعو بەرژەوەنـدیمان، تـۆ هـەموو شتێك ئاشکراو نهێنی ئاگاداری، لەبوونـەوەردا هیـچت لـێ گـوم نـابێ، کـەوابێ زاتـی پاکت پێویستیت بەداوا کردنی ئێمە نیە، پێویستیاتی ئێمە دەزانـێ، وەلـێ کـە لێـت دەپارێینەوە بۆ دەرخستنی بەندایەتیمان، بۆ ئەوەی ئاتـاجی خۆمـان بـۆ رەحمـەتی بەرفراوانت رابگەیەنین،

﴿وَمَا يَخْفَـى عَلَـى اللَّـهِ مِـنْ شَـيْءٍ فِـي الأَرْضِ وَلا فِـي الـسَّمَاءِ﴾ هـیچ شـتێك لەئاسمانەکانو زەویدا لەخودا هـوون نیـەو نـابێ، هـەموو شـتێك بـۆ ئـەو ئاشـکراو نمایانە، چونکە ئەو بەدیهێنەرو هەڵسورێنەرو چاودێریانە،

ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم سوپاسو ستایشی پەروەردگار دەکا لەسەر ئـەوە: کە بەپیری منداڵی پێ بەخشیوەو وەجاخی کوێر نـابێو دەفـەرموێ: ﴿الْحَمْـدُ لِلَّـهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَـرِ إِسْـمَاعِيلَ وَإِسْـحَقَ﴾ سـوپاسو ستایـشی نـەبڕاوە بـۆ ئـەو خودایەیـە: کـە لەگـەڵ ئـەوەدا پـیر بـووەمو بەسـاڵا چـوم ئیـسماعیلو ئیـسحاقی پـێ بەخشیم پاش ئەوەی ناهومێد بووم لەوەی منداڵم ببنو گەیشتمە تەمەنی یەئس، دوو کوڕی پێدام ئیسماعیلو ئیسحاق، ئیسماعیل لەهاجـەرە بـووە، ئیـسحاق لەسـارا خاتوونە، ئیسماعیل سێنزە ساڵ لەئیسحاق گەورە ترە،

هەنـدێك دەڵێن: کـە ئیـسماعیل لـەدایك بـوو تەمـەنی ئیـبراهیم گەیـشتبوە نەودو نۆ ساڵ، کە ئیسحاق لەدایك بوو تەمەنی سەدو دوانزە ساڵ بووە،

﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ بێگومان خودای من بیسەرو شنەوایە بەپاڕانەوەو وتەکانم، وەڵامی دوعاکانم دەداتەوە هەر کەسێ لێی بپاڕێتەوە دوعاکەی گیرا دەکا، مەبەستەکانم بدرکێنم یان نەیاندرکێنم خودا ئاگاداری مەبەستەکانە،

ئەمجار لەخودا دەپاڕێتەوە: کە یارمەتی بدا بەردەوام بێ لەسەر شوکرو ستایش، دەفەرموێ: ﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي﴾ خودایە! وام لێ بکەی بتوانم ئەوەی لەسەرم پێویستە ئەنجامی بدەم نوێژەکانم بەرێكو پێکی ئەنجام بدەم، یارمەتیم بدە ئەرکەکانم بەجێ بێنم، هەروەها بڕێ لەنەوەکانیشم تۆفیق بدە ئەرکەکانی سەرشانیان بەرێكو پێکی ئەنجام بدەن، نوێژەکانیان بەجێ بێنن، بۆیەش بەتایبەتی ناوی نوێژی هێنا، چونکە گەورەترین عیبادەت نوێژە، نوێژ کاریگەریەکی گرنگی هەیە لەپاڵفتەکردنی دڵو دەروونو گێڕانەوەی ئادەمیزاد لەخراپەکاری،

﴿رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾ خودایە! عیبادەتمان قبووڵ بفەرموو، لێرەدا وشەی (دعاء) بەمانا عیبادەت هاتووە، وەکوو لەئایەتێکی تریش بەهەمان مانا هاتووە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾مريم/٤٨.

ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم دوعاو پاڕانەوە دڵسۆزانەکەی کۆتایی پێ دێنێ بەدوعایەکی سەرمنح راکێشی گشتی دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾ خودایە! تاوانەکانم داپۆشیو لێم خۆش ببی، هەروا لەتاوانی دایكو باوکم خۆش ببە، هەروەها لەتاوانی هەموو موسوڵمانان چاوپۆشی بفەرموو: لەو رۆژەدا کە حیسابو لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدەیو بەندەکانت کێش دەکەی بۆ پاداشدانەوەو تۆڵەستاندن لێیان لەسەر کردەوەکانیان،

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: دایکی ئیبراهیم موسوڵمان بووە، داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی (لەگەڵ ئەوەدا: کە کافر بووە) لەبەر وادەو بەڵێنێك کە

پێی دابوو، جا كە بۆی مەعلووم بوو كە باوكی كافرەو دوژمنی خودایە، خۆی لێ بەری كردو خۆی لێ دوور خستەوە، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾التوبة/١١٤.

شایانی باسە پاڕانەوەی ئیبراهیمو داوای لێخۆشبوون لەگوناهەكانی، ئەوە ناگەیەنێ: كە تاوانی كردبێو داوای لێبوردن بكا، بەڵكوو مەبەست لەم دوعا كردنەی و هانا بردنە بۆ خودا، پشت بەستنیەتی بەفەضلو كەرەمو رەحمەتی خودا،

## تێبینی:

ئایەتەكان ئەم مانایانەیان لێ وەردەگیرێن:

١- فێری ئەوەمان دەكەن كە داوای نیعمەتی ئاسایش بكەین بەراستی ئاسایش نیعمەتێكی فرە مەزنەو گەلێك گرنگە بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم سەرەتا داوای رەخساندنی ئاسایشی كرد، چونكە بەرژەوەندی دینو دونیا بەبێ ئاسایش دەستەبەر نابێ!

٢- دروستە ئادەمیزاد دوعا بۆ خۆیو باوكو دایكو وەچەو نەوەی بكا،

٣- شوێنكەوتنی پێغەمبەرو موصلیحان واجبەو نابێ بێگوێییان بكەین، چونكە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی ﴿فمن تبعني فانه مني﴾.

٤-داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانباران دروستە، بەڵام بۆ موشریك دروست نیە چونكە كۆڕای موسوڵمانان لەسەر ئەوە دامەزراوە: كە دروست نیە داوای لێخشبوون بۆ موشریك بكرێ: ئاماژە بەوەی كە خودا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾النساء/٤٨.

٥- دروست نيە بۆ هيچ كەس كە ماڵو منداڵى خۆى لەچۆڵەوانييەكى بێ ئاوو كشتو كاڵدا بەرەڵڵا بكا، نابێ لەم بارەوە لاسايى حەزرەتى ئيبراهيم بكاتەوە، ئەمە حاڵەتێك بووە تايبەت بووە بەئەو، بەفەرمانو نيگاى خودا كردويەتى،

٦- ئەوەشمان لەبير نەچێ دووبارە كردنەوەى حەزرەتى ئيبراهيم لەدوعا بەسۆزەكەى بە وشەى (رب) يان (ربنا) ئاماژەيە بەوە كە ئەو هاوار دەكاتە پەروەردگار بەصيفەتى (ربوبييەت) نەك بەصيفەتى (ئولوهييەت) چونكە كەم كەس هەن گومانيان لەئولوهييەتى خودادا هەبێ، بێ بڕواكانيش لەمەدا گومانيان نيە، بەڵام ئەوەى جێگاى موناقەشەيە مەوزوعى ربوبييەتە، تەنانەت كۆمەڵگا نەفامەكانيش بەتايبەتى كۆمەڵگاى جاهيلى عەرەب بڕوايان بەئولوهييەتى خودا هەبوە، بۆيە حەزرەتى ئيبراهيم لەدوعاكەيدا تەركيزى خستە سەر لايەنى ربوبييەت.

## هاتنى رۆژى قيامەتو نيشانەكانى، دواخستنى عەزابى قيامەتو چۆنيەتى سزادراوەكانو گۆڕينى ئاسمانەكانو زەوى

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ

تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ ﴿٤٤﴾
وَسَكَنتُمۡ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَتَبَيَّنَ
لَكُمۡ كَيۡفَ فَعَلۡنَا بِهِمۡ وَضَرَبۡنَا لَكُمُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿٤٥﴾
وَقَدۡ مَكَرُواْ مَكۡرَهُمۡ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكۡرُهُمۡ وَإِن كَانَ
مَكۡرُهُمۡ لِتَزُولَ مِنۡهُ ٱلۡجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ
مُخۡلِفَ وَعۡدِهِۦ رُسُلَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ
تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ
ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ مُّقَرَّنِينَ فِي
ٱلۡأَصۡفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٖ وَتَغۡشَىٰ وُجُوهَهُمُ
ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجۡزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ
سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٞ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ
وَلِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٢﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی تاكو تەنهایی خودای هێنانەوە، دوا ئەوەی باسی حەزرەتی ئیبراهیمی كرد: كە لەخودا پاڕاوەتەوە: خۆیو نەوەكانی لەهاوەڵدانان بۆ خودا بپارێزیو یارمەتییان بدا بۆ كردەوەی چاكو رۆژی قیامەت رەحمەتو لێخۆشبوونی خۆی بڕێژێ بەسەریاندا، ئەمجار بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە كە هاتنی رۆژی قیامەت شتێكی حەتمییەو گومانی تێدا نیە، دەفەرموێ: ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ﴾ ئەی موحەممەد! وا مەزانە: خودا بێ ئاگایە لەو كردارانەی ستەمكاران ئەنجامی دەدەن، وا مەزانە كە هەر كاتێ خودا مۆڵەتی ئادەمیزادی ستەمكار دەداو عەزابیان لێ دوا دەخا لێیان بێ ئاگایەو ئیهمالی كردوونو عەزابیان نادا، دڵنیا بە خودا یەكە یەكە تاوانەكانیان دەژمێرێو لەسەریان دەنووسێو لەرۆژی خۆی تۆڵەیان لێ دەستێنێ،

ئەم خیطابە بەرواڵەت بۆ پێغەمبەرەو لەواقیعدا مەبەست ئوممەتەكەیەتی لەسەر شێوەی (ایاك أعنی واسمعی یاجارة) كوردی وتەنی (بوكێ لەگەڵ تۆمەو خەسو گوێت لێ بێ) ئایەتەكە دڵدانەوەیە بۆ موسوڵمانانو هەڕەشەكردنە لەستەمكاران ؛ بەوە كە پەروەردگار كردەوەكانیان لەسەر دەنووسێو ئاگای لێیانەو لەرۆژی خۆیدا كە قیامەتە سزایان دەداتەوە، سزادانیان حەتمییەو ئەو عەزابەیان پێ دەگا، چونكە ئاگاداری خودا بەستەمكارییان داخوازی سزادانیانە، ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەكاتەوە: كە سزادانی ئەو ستەمكارانەی دواخستوە بۆ رۆژێك: كە تا بڵێی رۆژێكی سامناكو نائاساییە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ﴾ نەوەكوو سزادانەكەیان دوا دەخەین ئیللا بۆ رۆژێك دوای دەخەین كە تا بڵێی بەڵاو ناخۆشییەكانی سامناكن، هەر لەبەر دیمەنی بەسامی ئەو رۆژە چاوی ئادەمیزادان بەملۆق دەوەستێو چاو قوچاندنیان بۆ ناكرێ لەترسانو لەحەیبەتان دەشڵەژێنو چاویان بزبز دەڕوانن و پێڵویان وێك نایەنەوە، چاوەكان بەملۆق دەوەستن چاو قوچاندنو چاو گێڕان نامێنێ!

ئـەمجار وەصـفی هەڵسانەوەیان لـەگۆڕەکانیانو بەپەلـە هاتنیـان بـۆ دەشـتی مەحـشەر دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿مُهْطِعِـينَ﴾ لـەگۆڕەکانیان هەڵدەسـتنەوەو بەپەلـەو بەسەر شۆڕی دێن بۆ دەشتی مەحشەر، لەچەند شـوێنی تـردا قورئـان ئامـاژەی بـەم مانایە کردوە وەکوو دەفـەرموێ: ﴿مُّهْطِعِـينَ إِلَـى الـدَّاعِ﴾القمـر/٨، یـان دەفـەرموێ: ﴿يَوْمَئِـذٍ يَتَّبِعُـونَ الـدَّاعِيَ لَـا عِـوَجَ لَـهُ وَخَـشَعَت الْأَصْـوَاتُ لِلـرَّحْمَنِ فَلَـا تَـسْمَعُ إِلَّـا هَمْـساً﴾طه/١٠٨، یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعاً﴾المعارج/٤٣.

گورهەڵدەتـەکێنن‌و بەپەلـە رودەکەنـە سـارای مەحـشەر ﴿مُقْنِعِـي رُءُوسِـهِمْ﴾ سەریان بەرز کردۆتەوە بەترس‌و لەرزەوە دەڕوانن، بەم لاو ئەولادا ئاوڕ نادەنەوە،

﴿لا يَرْتَـدُّ إِلَـيْهِمْ طَـرْفُهُمْ﴾ چـاویان بـەملۆق وەسـتاوەو پێڵـووی چـاویان وێـك ناکەوێتەوە، بەڵکوو چاویان کراوەو وەستاوەو لەترسـان‌و لەشـڵەژاوییان چـاویان بـۆ لێك نانرێ، تا چاویان هەتەر بکا هەرچی دەبیبـنن هـەر دەیانترسـێنێ‌و جەسـتەیان وەلەرزە دێـنێ، ﴿وَأَفْئِـدَتُهُمْ هَـوَاءٌ﴾ دڵ‌و دەروونیـان خـاڵی‌و بۆشـە، هـیچ وەرنـاگرێ هیـچیان لـەبیر نـەماوە، لەترسـان پەشـۆکاوو شـڵەژاون، سەرسـام‌و وڕو حـەیرانن، هەرچی هومێدو هیوا هەیە لەدڵیاندا نیـە، هـیچ خۆشـی‌و کامەرانییـەکیان لـەدڵدا نیە،

ئەوە ئەو رۆژەیە خودا ئەوانی بـۆ هـەڵگرتووە، لـەم وێـستگەدا رایـان دەگـرێ، ئەم ترس‌و لەرزە رویان تێ دەکا دەپەشۆکێن دەشـڵەژێن هـەر دەڵێـی پەلـەوەری بـێ دەسەڵات‌و پچوکن لەژێر چنگی بازدا، دەڵێی کەروێشکن لەبـەردەم چـەپۆڵەی شـێرو پڵنگـدا!

ئەمـە ئـەو رۆژەیـە خـودا ئـەوانی بـۆ دانـاوە، ئـەو رۆژە بەهـەموو دیـاردە سـامناکەکانیەوە چـاوەڕێیانە حەتمـەن پێـی دەگـەن! کـەوابێ ئـەی موحەممـەد! وەخۆکەوەو ئامۆژگاری بکە ﴿وَأَنذِرْ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمْ الْعَذَابُ﴾ ئادەمیزادان بترسێنە

لەناخۆشیو نارەحەتی رۆژێك كە لەو رۆژەدا عەزاب یەخەیان دەگریّو تێكیانەوە دەپێچیّ، ﴿فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ جا ئەوانەی: كە ستەمكار بوون گوێیان بەپەیامی پێغەمبەر نەداوە كە ئەو عەزابە دەبینن دەست دەكەن بەدادو فیغان، بەناڵەو هاوار، رودەكەنە خوداو لێی دەپارێنەوەو دەڵێن: ﴿رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ نُجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعْ الرُّسُلَ﴾ خودایە بمانگێرەوە بۆ دونیا بۆ ماوەیەكی كەم مۆڵەتمان بدە، با هەڵەكانی خۆمان راست بكەینەوە كەمتەرخەمیمان پڕ بكەینەوە، بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەكانتەوە بچین، بڕوایان پێ بكەین، ببینە یەكتاپەرستو بەدڵسۆزی بەندایەتیت بۆ بكەینو شوێن پەیامی پێغەمبەرانت بكەوین، ئەمجار بمانهێنەوە بۆ سارای مەحشەر،

نموونەی ئەم ئایەتە لەشوێنی تری قورئاندا هاتووە وەكوو دەفەرموێ: ﴿لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾المنافقون/١٠، یان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ، لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحاً فِيمَا تَرَكْتُ﴾المؤمون/٩٩-١٠٠.

ئەمجار خودا بەشێوەی سەرزەنشتەوە وڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُمْ مِنْ قَبْلُ مَا لَكُمْ مِنْ زَوَالٍ﴾ ئەوە ئێوە نەبوون لەدونیادا پێش ئەم حاڵەتان سوێندتان دەخواردو دەتانگوت: كە ئێمە مردین جارێكی تر زیندوو ناكرێینەوە؟ بڕواتان وابوو قیامەت نیەو حیسابو لێكۆڵینەوە نیە لەژیانی دونیاوە بۆ ژیانی قیامەت گواستنەوە نیە، دەتانگوت ژیان هەر ژیانی دونیایەو كە مردین تازە زیندوو نابینەوە؟ وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لاَ يَبْعَثُ اللّهُ مَن يَمُوتُ﴾النحل/٣٨، دەی كەوابێ ئەم سزایە بچێژن لەتۆڵەی ئەو ئینكاریكردنەتان، ئەمە لەحاڵەتێكدا ئێوە بێ ئاگا بوون، ئەگەر وردبوونایەوەو بەخۆتاندا بچونایەوە دەتانزانی كە ئەم رۆژە دێو ئێوە ژێوان دەبنەوە بەلام ژێوان بوونەوە سودی نیە! ﴿وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ

فَعَلْنَا بِهِمْ﴾ ئێوە جێنشین بوون لەشوێنی ئەوانەی: کە ستەمیان لەخۆیان کردوە، هاوەڵی ستەمکارانتان کرد، بەریّو شوێنی ئەواندا رۆیشتن چاوتان لەوان کردو لاسایی ئەوانتان کردەوە، هەرچەندە بۆتان ئاشکرا بوو چیمان بەو ستەمکارانە کرد، چۆن لەناومان بردن لەتۆڵەی رەتکردنەوەی پەیامی پێغەمبەرانو بەرەنگار بوونەوەی بانگەوازی حەق، بەچاوی خۆتان شوێنەواری لەناوچوانتان بینیو بۆتان دەرکەوت ئاکامیان ریسواییو لەناو چوون بوو،

﴿وَضَرَبْنَا لَكُمُ الأَمْثَالَ﴾ ئامۆژگاریمان کردن، مەثەلمان بۆ هێنانەوە لەقورئانداو پێمان گوتن: کەسێك بتوانێ لەسەرتاوە شتێك دروست بکا زۆر بەئاسانی تر دەتوانێ دوای لەناوچوونی دروستی بکاتەوە، دەتوانێ سزای مۆڵەتدراویان بدا، وەکوو چۆن دەتوانێ سزای بەعەجەلەیان بدا، بەڵام ئێوە پەند ئامێز نەبوون وەهۆش خۆتان نەهاتنەوەو وازتان لەسەر رەقی خۆتان نەهێنا!

تازە بەتازە دەتانەوێ عەزابەکەتان دوا بکەوێو بگەرێنەوە بۆ دونیا، تازە کار لەکار ترازاوە، هەلتان لەکیس چووە!!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە حاڵو هەڵوێستی ئەمانیش وەکوو حاڵو وەزعی ستەمکارەکانی پێش خۆیان وایە دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ﴾ واتە: ئەوانەی جێنشین بوون لەشوێنی ستەمکارە پێشینەکان، هەڵوێستو حاڵو وەزعیان لەستەمکارە رابوردووەکان جیانەبوە، هەمان هەوڵو تەقەللای پێشینەکانیان داویانە بۆ رەتکردنەوەی حەقو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانو چەسپاندنی بەتاڵ، ئەمانیش هەموو هێزو توانای خۆیان لەم بوارەدا خستۆتە گەرو چییان پێکرا کردیان، بەهەموو جۆرێك دژی ئایینی حەق وەستان!

﴿وَعِنْدَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ﴾ فرت‌و فێڵ‌و مەکرەکانیان لای خودا نووسراوە، بێگومان سزای عادلانەیان دەداتەوە، هەموو شتێك لای خودا نووسراوەو تۆمار کراوەو بەگوێرەی کردەوەو هەڵوێستیان تۆڵەیان لێ دەستێنێ،

﴿وَإِنْ كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ﴾ سەرەنجامی مەکری ئەوان خەسارەتمەندی و بەفتارە چوونە، مەکری ئەوان ئەوەندە بەهێز نیە بتوانێ کێو لەشوێنی خۆی بجوڵێنی، مەکری ئەوان ناتوانێ ئایاتی خودا، شەریعەتی خودا، موعجیزەی پێغەمبەران: کە وەکوو کێو دامەزراون بپوچێننەوە، کەی مەکری ئەوان دەتوانێ کێو، یان شتێك: کە بەئەندازەی کێو دامەزراوو چەسپاوە لابەرێ‌و بیگوێزێتەوەو بەرەنگاری بکا، مەکری ئەوان لەژێر هێزی قودرەتی خودادایە چۆنی بوێ ئاوای لەگەڵ دەکا!

﴿فَلا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ﴾ ئەی موحەممەد! وا مەزانە خودا وادەو بەڵێنی کە داویەتی بەپێغەمبەرانی نایهێنێتە دی، دڵنیابە چی بەڵێنی داویەتی بەپێغەمبەران هەموان دێنێتە دی،!

شایانی باسە هەرچەندە خیطابەکە بۆ پێغەمبەرە وەلێ مەبەست ئوممەتەکەیەتی،، ئەمەش وەکوو پێشوو وایەو لەسەر شێوەی (بوکێ لەگەڵ تۆمەو خەس‌و گوێت لێ بێ) دەیەوێ موسوڵمانان وا لێ بکا بتمانە بەوادەو بەڵێنی بکەن‌و دڵنیا بن: کە خودا بەڵێنی خۆی دێنێتە دی‌و ستەمکاران سزا دەداو تۆڵە لەکافرو بەدرۆخەرەوەکان دەستێنێ!

﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ بێگومان پەروەردگار بالادەستەو بەتوانایە، ناهێڵێ ستەمکار لەسزا رزگاری بێ، ناهێڵێ مەکرباز بێ سزا بۆی دەرچێ! هەر شتێك بیەوێ بیکا دەیکاو کەس نیە بتوانێ ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم ویستی خودادا، هەر کەسێکی بوێ سزای بدا لەچنگی رزگاری نابێ‌و کەس ناتوانێ لەدەست خودا راکا،

پـەروەردگار خـاوەنی سـزاو تۆڵەیـە بـۆ ئەوانـەی پـەیامی پێغەمبـەرەکانیان رەت کردۆتەوەو شەریکیان بۆ خودا داناوە،

ئەمجار پەروەردگار کاتی تۆڵەستاندنەوەکەی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ﴾ واتە: پـەروەردگار خـاوەنی تۆڵەسـتاندنەوەو سزادانە لەرۆژێکدا، کە زەوی دەگۆڕدرێ بەزەوییەکی تـر بـەم جۆرە ئـەم زەوییـەی ئێستا دەبێتە تۆزو خۆڵو دووکەڵ بڵاو دەبێتەوە، پاشان دەبێتەوە زەوییەکی تر!

هەروەها ئاسمانـەکان دەگـۆڕدرێن، ئەسـتێرەکان بـڵاو دەبنـەوەو هەڵدەوەرنو وردو خاش دەبن، خۆر روناکی نامێنێو مانگ تاریکایی بەسەردا دێ،

هەرچەندە ئێمە نازانین چۆن ئـەم گۆڕانکارییـە دێتـە دیو شـێوەو سروشـتی زەوی تازەو ئاسمانی تازە چـۆن دەبـێ شـوێنەکەیان لـەکوێ دەبـێ، ئـەم گۆڕانکارییـە چۆن پەیدا دەبێ!

ئیبنو عەبباس ﷺ دەفەرموێ: زەوییـە تازەکـە هـەر ئـەو زەوییـەی ئێـستایە، وەلێ صیفاتەکانی دەگۆڕێن، کێوەکانی نامێنن، دەریاکانی دەتەقنەوەو پڕدەبنەوەو دەبنە دەشتێکی کاکی بەکاکیو هیچ بەرزاییو شیوو دۆڵی تێدا نابیندرێ،

هەندێك دەڵێن: پەروەردگار سەر لەنوێ زەویەکی تـرو ئاسمـانی تـر دروسـت دەکاتەوە،

ئیبنـو مەسـعوودو ئەنـەس دەفـەرموون: رۆژی قیامـەت ئـادەمیزاد لەسـەر زەوییەکی سپی حەشر دەکرێن، کەس لەسەر ئەو زەوییە تاوانی نەکردوە،

ئیمام ئەحمەد لەخاتو عائیـشەوە ریوایـەت دەکا دەڵێ: عائیـشە فەرمویـەتی: مـن یەکـەم کـەس بـووم دەربـارەی ئـەم ئایەتـە ﴿يَـوْمَ تُبَـدَّلُ الأَرْضُ غَيْـرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ﴾ پرسیارم لەپێغەمبەر ﷺ کردو وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئـەو رۆژە ئادەمیزاد لەکوێ دەبن؟ فەرمووی لەسەر پردی سیراط،

قەتادە لەحەسانی کوڕی بیلالی موزەنییەوە لەعائیشەوە ﷺ دەڵێ: پرسیارم لەپێغەمبەر کرد دەربارەی ئایەتی ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ﴾ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو رۆژە ئادەمیزادەکان لەکوێ دەبن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لقد سألني عن شيء ماسألني عنه أحد من أمتي، ذاك أن الناس على جسر جهنم)،

خاوەنی تەفسیری (روح المعانی) لەکاتی راڤەکردنی ئەم ئایەتەدا زۆر رای موفەسسرین رادەنوێنێ، بەڵام چونکە باسەکە باسێکی غەیبییە نەیتوانیوە شتێك بڵێ دڵ پێی ئاو بخواتەوە،

ئیبنو کەثیر زۆر بۆچونی جیاجیای هێناون، گەلێك فەرمودەی پێغەمبەری لەم بارەوە ریوایەت کردون، پوختەکەیان ئەوەیە: کە من نووسیومە، هەرچەندە لەبارەی لەفظەوە هەندێ جوداوازی لەنێوان ریوایەتەکاندا هەیە، بەڵام لەرووی ماناوە یەکن،

بەکورتی ئایەتی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺو زانستی تازە کۆکن لەسەر ئەوە: کە رۆژێك دێ زەوی دەبێتە یەکپارچە ئاگرو ئادەمیزادی لەسەر نابن،

ئەم ئایەتە پیرۆزە یەکێکە لەموعجیزەکانی قورئان، کە ئەمڕۆ زانستی تازە پشتگیری دەکا، مانای ئەم ئایەتەو زانیاری تازە بەتەواوی یەکتر دەگرنەوە،،! زانایانی فەلەك دەڵێن: زەوی‌و خۆرو باقی ئەستێرەکانی تر لەکۆندا کورەیەکی ئاگراوی بوون لەبۆشاییدا لەهاتوچۆدا بوون، ملیونەها ساڵ ئەم کورە ئاگرینە بەدەوری خۆیدا سوڕاوەتەوە، پاشان خۆری لێ بووەوە، دوای ملیونەها ساڵی تر ئەستێرە گەڕۆکەکانی تر لێی جیابوونەوە کە یەکێ لەو گەڕۆکانە زەوی بوو، ئەمجار دوای چەند هەزار ساڵی تر مانگەکانی لێ جیابوونەوە، گومانیش نیە جارێکی تر ئەم حاڵو وەزعە بەسەر بوونەوەردا دێتەوە، واتە: زەوی‌و خۆرو

ئەستێرەکانی تر پاش ملیونەها ساڵی تر سەر لەنوێ دەتوێنەوەو دەبنەوە بەکورەیەکی ئاگراویو ماوەیەکی تر لەبۆشاییدا هاتوچۆ دەکا، ئەمجار جارێکی تر لەم کورە ئاگراوییە خۆرو زەوی لێ جیا دەبنەوە، زەوییەك دێتەوە کایە جودا لەم زەوییەو خۆرێك پەیدا دەبێ لەم خۆرەی ئێستا جوداوازەو ئاسمانەکانیش لەئاسمانی ئێستا ناچن!

دەی ناوەرۆکی ئەم تیورە زانستییە لەگەڵ مانای ئایەتەکەدا چ دژایەتێکیان نیە، دەتوانین لەروانگەی ئەم تیورە زانستییەوە مانای ئایەتی ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ﴾ حاڵی ببین، هەر کاتێکیش زانیاری پێش کەوت تیۆرێکی زانستی تر سەری هەڵدا دژی ئەم تیورەو دەرکەوت تیورە پێشوەکە هەڵە بووە ئەوە مانای ئایەتەکە هەروەك خۆی دەمێنێتەوەو دەبێ هەوڵ بدەین بزانین خەلەلی بەراورد کردنەکەمان لەکوێدا بووە، واتە: نابێ رێگە بەخۆمان بدەین ئایەتەکانی قورئان سەد دەرسەد بەتیورە زانستییەکان مانا بکەین، ئایەتەکە دانێینو تیۆرەکەی بەسەردا تەطبیق بکەین، وا خۆمان پێوەند بکەین هەرکاتێ تیۆرەکە هەڵوەشایەوە مانای ئایەتەکە هەڵوەشێتەوە (استغفر الله!)،

تیورە زانستییەکان رێبازی خۆیان هەیەو قورئان رێبازی خۆی هەیە، دەتوانین بۆ مانای ئایەتەکانی قورئان سوود لەتیورە زانستییەکان وەربگرین، بەڵام نابێ تیورە زانستییەکان بکەینە مانای ئایەتەکانو بڵێین ئەم تیورە زانستییە پڕاو پڕ مانای فلان ئایەتە، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیەو ئاواتەخوازین کەس تێی نەکەوێ، چونکە ئێمە بڕوامان وایە قورئان حەقو راستەو هەرگیز ناراستیو بەتاڵ روی تێ ناکەنو تێیدا نینو سەد دەرسەد حەقەو راستە، بەڵام تیوری زانستیی ئەمرۆ راست دێتە بەرچاوو سبەینێ هەڵدەوەشێتەوە، ناراست دەردەچێ!

﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾ هەرچی مەخلووقات هەیە هەموویان لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، چاوەڕوانی بڕیاری پەروەردگارن، هەموویان لەپێش دوو

دەستی خودای تاك‌و تەنهاو بالآدەستدا دەوەستن، جگە لەپەنای خودا هیچ پەنایەکی تریان نیە، جگە لەخودا کەس بەفریایان ناکەوێ، جگە لەخودا کەسی تر بڕیاری بەدەست نیە، فەرمانڕەوای تاك‌و تەنیا خۆیەتی‌و بەس!

ئەمجار زەبوونی‌و بێ توانایی تاونبارەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ﴾ ئەی موحەممەد! تۆ لەو ڕۆژەدا تاوانباران دەبینی کۆمەڵ کۆمەڵ بەزنجیرو پێوەند کراون، بەیەکترەوە بەستراونەوەو شەتەك دراون، ئەوانەی مولحیدو بێ باوەڕن پێکەوە شەتەك دراون، ئەوانەی موشریکن، یا پیاوکوژن، یا خیانەتکارو دزو سودخۆرن هەر کۆمەڵەو بەجیا پێوەند کراون‌و تێکخراون، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ﴾الصافات/٢٢، یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾التكوير/٧، یان دەفەرموێ: ﴿فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ﴾الشعراء/٩٤.

﴿سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ﴾ کراسەکانیان لەقەترانە: کە زۆر زوو ئاگر دەگرێ، واتە: جەستەیان بەقەتران سواخ دەدرێ، بۆیە دەگرێ، لاشەیان دادەپۆشێ،

قەتران جەوییێکی بۆگەنە لەداری عەرعەر دەردەچێ‌و چەوریشە، زۆر زوو گڕ دەگرێ،

﴿وَتَغْشَى وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ ئاگری دۆزەخ ڕوویان دادەپۆشێ، سەرتاپای جەستەیان بەهۆی ئەو قەترانەی لەجەستەیان هەڵسوراوە گڕ دەگرێ، یان کراسیان بۆ دروست دەکرێ‌و لەو جەوییە هەڵدەکێشرێ، ئاگریان تێ بەردەدرێ، بۆیە بەتایبەتیش ناوی دەم‌و چاوی هێنا، چونکە دەم‌و چاو گرنگترین‌و بەرێزترین ئەندامی جەستەی ئادەمیزادن، ئەوەتا لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ﴾المؤمنون/١٠٤، یان دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾الزمر/٢٤.

ئەمجار پەروەردگار هۆی سزادانەکەیان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ﴾ پەروەردگار ئەو کارانە دەکا بۆ ئەوەی هەموو ئادەمیزادێك بەگوێرەی کردەوەکانی سزای شیاوی خۆی وەربگرێتەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە! سزای کافرو تاوانباران دەدا لەسەر کوفرو تاوانیان، پاداشی موسوڵمانو خواپەرستانیش بداتەوە لەپاساوی ئیمانو باوەڕو کردەوەی باشیان! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى﴾النجم/٣١.

﴿إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ بێگومان خودا زۆر بەخێرایی حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەندەکاندا دەکا، حیسابکردن لەگەڵ ئەم غافڵی ناکا لەحیسابکردنی ئەو. وەکوو چۆن رزقو رۆژیدان بەخدر بێ ئاگای ناکا لەرزقو رۆژیدانی بەمەمەند! چونکە خودا ئاگاداری هەموو نهێنیو ئاشکرایەکە هەموو ئادەمیزاد بەنیسبەت خوداوە وەکوو یەك بەندە وایە وەکوو دەفەرموێ: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾لقمان/٢٨، دروستکردنو زیندوکردنەوەی هەموو ئادەمیزاد لای خودا وەکوو دروستکردنو زیندو کردنەوەی تاقە نەفسێك وایە،

﴿هَذَا بَلَاغٌ لِلنَّاسِ﴾ ئەم قورئانە راگەیاندنە بۆ ئادەمیزادانو بۆ پەندو ئامۆژگاری بەسیانە، بەڵگەیەکی بەهێزەو ئەگەر بەگوێرەی رێنوکاییيەکانی هەڵسو کەوت بکەن سەرفرازی دونیاو قیامەت دەبن،

ئەم قورئانەمان بۆ ناردوون بۆ ئەوەی نەصیحەتو ئامۆژگاری لێ وەربگرن ﴿وَلِيُنذَرُوا بِهِ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی پێی بترسێندرێن لەسزاو تۆڵەی خودا ﴿وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ بیکەنە بەڵگەو بزانن کە خودا تاكو تەنهایەو هیچ خودای تر نین جگە لەئەو ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵو هۆشەکان بیر بکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن.

**واتە : ئەم ڕاگەیاندنەی قورئان سێ سوودی سەرەکی هەن :**

١- ترساندن لەعەزابی خودا.

٢- بەڵگە هێنانەوە لەسەر هەبوونی خودایەکی تاكو تەنها،

٣- ڕێ نیشاندانو فێر بوونی ڕێبازی ژیان بەشێوەیەکی بەختەوەرانە.

**بەیارمەتی خودا لەپاکنووسای جزمی سیازدەیەم بوومەوە بەمەش سورەتی إبراهیم تەواو دەبێ خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی جزمەکانی تر ...**

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی الحجر

ئەم سوڕەتە ناوی سورەتی (الحجر)ە چونکە چیرۆکی (ئەصحابول حیجر)ی تێدایە، ئەمانە گەلی (ثمود)ن. حیجر شوێنێکە لەنێوان مەدینەو شامدا.

**پەیوەندی ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتی ئیبراهیم لەچەند ڕویەکەوەیە :**

١- لەبارەی سەرەتاوە: هەردوو سوڕەتەکە بەوەصفو پێدا هەڵدانی قورئان دەست پێ دەکەن.

٢- لەبارەی ناوەڕۆکەوە: لەهەردوکیاندا وەصفی ئاسمانەکانو زەوی کراوە. لەهەردوکیاندا بەشێك لەچیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمو چیرۆکی پێغەمبەرەکانی تر هەیە. بەمەبەستی دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺو بۆ تەسەللادانەوەی لەو ئەزیەتو ناڕەحەتیەی لەقوڕەیشییەکانەوە تووشی دەبوو. ئەو ئەزیەتو ناڕەحەتیە دەخاتەوە بیری پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەرانی تر لەلایەن گەلەکانیانەوە تووشیان

بووەو لەئاكاما سەركەوتن بۆ پێغەمبەرەكانیان بووە. هەندێ جاریش موناقەشەی كافرەكان دەكاو بۆڕیان دەدا.

٣- لەبارەی كۆتاییشەوە: موناسەبەی ئەم سورەتە بەسورەتی ئیبراهیمەوە لەم روەوەیە. لەكۆتایی سورەتی ئیبراهیمدا وەصفی حاڵو وەزعی كافرەكان لەرۆژی قیامەتدا دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَبَرَزُواْ للّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ، وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ، سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمْ النَّارُ﴾ لەكۆتایی ئەم سورتەشدا فەرمووی: ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾ هەواڵی ئەوەمان دەداتێ كە تاوانبارو كافرەكان: ئەوانەی كە مانەوەیان لەناو ئاگردا درێژە دەكێشی، دەبینن موسوڵمانە تاوانبارەكان؛ ئەوانەی هاوەڵیان بۆ خودا دانەناوە لەدۆزەخ رزگاریان دەبێ، ئاواتەخوازی ئەوە دەبنو خۆزگە دەخوازن: كە ئەوانیش لەدونیادا موسوڵمان بوونایە..

دوا ئایەتی سورەتی ئیبراهیم بەوەصفی قورئان كۆتایی پێ دێ. سورەتی حیجریش بەوەصفی قورئان دەست پێ دەكا. ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَقُرْآنٍ مُّبِينٍ﴾ لێكچواندنی كۆتایی سورەتی ئیبراهیمو سەرەتای حیجر ئەمیش جۆرە پەیوەندییەكە.

سورەتی (الحجر) مەككییەو نەوەدو نۆ ئایەتە.

**مەبەستە سەرەكییەكانی ئەم سورەتە وەكوو هێڵێكی گشتی سورەتە مەككییەكانی تر لەم تەوەرانەدا دەسوڕێنەوە:**

١- چەسپاندنی تاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتیو زیندو بوونەوەو حیسابو لێكۆڵینەوەو پاداشو سزا.

٢- بیرخستنەوەو دەستنیشانكردنی هۆكاری لەناوچوونی ملهوڕانی مێژوو بەدرۆخەرەوانی پێغەمبەران.

بۆیە: سورەتەکە بەهەڕەشەو ترساندنو سەرزەنشتکردن دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ، ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾.

**سورەتی (الحجر) بەشێوەیەکی گشتی ئەم باسانەی لەخۆ گرتووە:**

١- موناقەشەو چەندوچون لەگەڵ کافرو موشریکەکان؛ دانو سانی نێوان ئەوانو پێغەمبەران؛ هەر لەحەزرەتی نووحەوە تا دەگاتە پێغەمبەری ئاخرزەمان. ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الأَوَّلِينَ، وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلاَّ كَانُواْ بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾(ئایەتی ١٠-١١).

٢- بەڵگە هێنانەوە لەسەر هەبوونی خودای تاكو تەنیاو بەتواناو دەسەڵات.

٣- چەسپاندنی راستی نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ.

٤- چیرۆکی ئادەمو حەواو سوژدە بردنی فریشتەکانو سەرپێچیکردنی شەیتان.

٥- حاڵو وەزعی بەدبەختەکان لەناو ئاگرداو حاڵی خودا پەرستانو بەختەوەران لەبەهەشتدا.

٦- دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ بەگێڕانەوەی سەرگورشتەی پێغەمبەرانی وەکوو: لوطو شوعەیبو صالح لەگەڵ نەتەوەکانیان.

٧- باسکردنی نیعمەتەکانی خودا بەسەر پێغەمبەرەوە کە هەر گرنگیان قورئانی پیرۆزە.

## وەصفی قورئانو هەڕەشەکردن لەکافرەکان

﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ ٢ ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٣ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ٤ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ٥ ﴾.

﴿الـر﴾ دەبێ ئـەم جـۆرە پیتانـە بـەجیا جیـا بخوێندرێنـەوە (الـف، لام، راء) دەربـارەی مانـاو مەبەسـت بـەهێنانی ئـەم جـۆرە پیتانــە چـەند رایـەك هەیـە، لەسەرەتای سورەتی (البقرة)دا ئاماژەمان پێ کـردووە. یـەکێك لـەو مانایانـە ئاگـادار کردنـــەوەی عەرەبەکانـــە بـــەئیعجازو سەرئاســـایی قورئـــان لـــەرووی بەلاّغـــەتو فەصاحەتەوەو تەحـەددا کردنـی ئـەوانو ئـادەمیزادانی تریـشە کـە نـاتوانن وێنـەی کورتترین سورەتی بێنن. بەعەرەبەکان دەفەرموێ: قورئان بەزمانی ئێوە نازڵ بووە، وشەکانی لەو جۆرە پیتانـە پێـك هـاتوون، دە ئێـوە ئەگـەر دەڵێن: ئەمـە لـەخوداوە نەهاتووە (ئەوە عەرزو ئەوە گەز) دەبتوانن وێنەی سورەتێکی ئـەم قورئانـە بخەنـە روو.

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَـابِ وَقُـرْآنٍ مُـبِينٍ﴾ ئـەم ئایەتانـەی لـەم سورەتەدان، ئایـاتی نامەیـەکی ئاسمـانی کـاملّو تـەواون لەهـەموو رویەکـەوە، ئایـاتی قورئـانێکی رونکەرەوەو مانا ئاشکراو هیدایـەت ئامێزە. کـە ئەوپـەڕی بەلاغـەتو فەصاحەتی

تێـدا کۆبۆتـەوە. لـەناو نامـە ئاسمانییـەکاندا تاقـە کتێبـە، لەهـەموو رویەکـەوە پەسندە، پەندو ئامۆژگاریو حوکمو یاسای ژیانی لەخۆگرتووە. بەکوردیو کورتی کتێبی خودایەو قورئانەو سەرچاوەکەی لەلەوحولمەحفوظدایە!!

﴿رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَـانُوا مُـسْلِمِينَ﴾ ئەمـە هـەواڵی یەزدانـە دەربـارەی کافرو موشریکەکان، کە لەرۆژی قیامەتدا لەهەڵوێستی خۆیان پەشـیمان دەبنـەوەو ئاواتەخوازی ئەوە دەبنو دەڵێن: خۆزگە ئێمەش موسوڵمان بووینایە.

جا ئەم پەشیمان بوونەوە ئایا لەکاتی گیان دەرچووندایە؟ یان رۆژی قیامـەت کە حاڵو وەزعـی خۆیـانو موسـوڵمانان دەبیـنن؟ یـان ئـەو کاتـە دەبـێ کـە دەبیـنن موسوڵمانان بەسەلامەتی بەسەر پردی سیراطدا تێدەپەڕن؟ یان ئەو کاتە دەبێ: کە موسوڵمانە تاوانبارەکان دوای سزادانیان لەسەر تاوانەکانیان ڕزگاریان دەبێ؟ ئەمانە راو بۆچونی زانایانی ئیسلامن.

پرسیارێك دێتە پێشەوە: بۆچی وشـەی (ربما) کـە بـۆ تەقلیلـە لـەم شـوێنەدا بەکار هێنراوە؟ خۆ تەمەننا کردنی ئیمانو ئیسلام لەم شوێنانەدا گرنگو حەتمیو زۆر گەورەو بەهەندە!

لـەوەڵامدا دەگـوترێ: بۆیـە وشـەی (ربمـا)ی بـەکارهێناوە، چـونکە ئـەو ناڕەحەتیو چەرمەسـەرییەی تووشـی دەبـن وایـان دەتاسـێنێو ئەوەنـدە پەشـۆکاوو شـڵەژاو دەبـن تەمـەننا کـردنو ئاواتـە خوازیـشیان لەبیردەچێتەوە، مەگـەر لـەبڕێ مەوقیفـدا: کە تۆزێك وەسەرخۆ دێنەوە تەمەننای موسوڵمانی بکەن!

یان مەبەستەکە ئەوەبێ، پەشیمانبوونەوە هەر چەندە کەمیش بێ حەق وایە خۆتـانی لێبپـارێزن، چـونکە ئـادەمیزادی عـاقڵو ژیـر خـۆ لەشـتێك دەپـارێزێ کـە گومـانی ئـەوەی لێبکا تێـدا تووشـی غـەمو ناڕەحـەتی دەبـێ، وەکـوو چـۆن خـۆی لەغەمو ناڕەحەتییەك دەپارێزێ کە دڵنیایە تووشی دێ، عـاقڵ مەنـد ئـەو کەسـەیە

خۆ لەپەشیمانبوونەوەی کەم بپارێزێ وەکوو چۆن خۆی لەپەشیمانبوونەوەی زۆر دەپارێزێ!

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾الأنعام/٢٧.

طەبەرانی لەئەبو موساوە ریوایەتێکی هێناوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کە دۆزەخییەکان لەدۆزەخدا کۆبوونەوە، وەندێکی خودا مەیلی لێ بێ موسوڵمانیشیان لەگەڵ دەکەون، جاکافرەکان بەموسوڵمانەکان دەڵێن: ئەرێ ئێوە موسوڵمان نەبوون؟ دەڵێن: بەڵێ ئێمە موسوڵمان بووین. کافرەکان پێیان دەڵێن: دەی باشە ئەوە موسوڵمانیەتیەکەتان هیچ فریاتان نەکەوت؟ ئێوە وەکوو ئێمە خرانە ناو ئاگرەوە؟؟ ئیتر پەروەردگار کە ئەمە دەبیسێ فەرمان دەدا کێ ئەهلی قیبلە بووە لەدۆزەخ دەریان بێنن، دەریان دێنن جا کە کافرەکان ئەوحاڵە دەبینن دەڵێن: خۆزگە ئێمەش موسوڵمان بووینایە ئێستا وەکوو ئەوان لەدۆزەخ دەرچووینایە. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ ئەم دوو ئایەتەی سەرەتای سورەتی (الحجر)ی خوێندەوە..

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند ئاراستەی کافرەکانی مەککە دەکاو، فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ﴾ ئەی موحەممەد! واز لەکافرەکان بێنە، لێیان بگەڕێ با لەبێ ئاگایی خۆیاندا بمێننەوە، لەزەت لەژیان وەربگرن، وەکوو ئاژەڵ بخۆن و بخۆنەوە، هیواو ئارەزۆی تەمەندرێژی و دەستکەوتنی ماڵ و سامان و پلەو پایە مردنیان لەبیر بەرێتەوە، لەدەریای هیواو ئاواتی دونیایی دا پەلەبکەن، راستی هاتنی رۆژی قیامەت و راستی پێغەمبەرایەتی تۆیان لەدڵ و دەروونیاندا نەچەسپێ و کوێرانە رەتی بکەنەوە.

﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لەوە بەولاوە ئاكامو جەزای كردەوەو هەڵوێستەكانیان دەزانن، بۆیان مەعلووم دەبێ چەند خەسارەتمەندو ماڵ كاولن.

واتە: بەتەما موسوڵمانبونی ئەوانە مەبە، ئەوانە نایەنە سەر ئایینو موسوڵمان نابن، بیانترسێنی یان وازیان لێبێنی چوون یەكە، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ﴾ ابراهیم/٣٠.

ئەحمەدو طەبەرانیو بەیهەقی لەعەمری كوڕی شوعەیبەوە فەرموودەیەكی بەمەرفووعی هێناوە دەفەرموێ: (صلاح أول هذه الأمة بالزهد واليقين، ويهلك آخرها بالبخل والأمل) هاتیو خۆشبەختی پێشینانی ئەم نەتەوەی ئیسلامە بەهۆی زوهدو یەقینەوە بوو، لەناوچوونی ئەم نەتەوەیە بەهۆی بەخیلیو ئەمەلی دوورو درێژەوە دەبێ.

ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەدوو شت ترسم لێتان هەیە: ئەمەلی درێژو شوێنكەوتنی هەواو ئارەزۆبازی، چونكە ئەمەلی درێژ قیامەتتان لەیاد دەباتەوە، شوێنكەوتنی هەواو ئارەزۆ لەرێبازی حەق لاتان دەدا.

ئەمجار دوای هەڕەشە كردن لەوانەی پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە هۆی دواكەوتنی هاتنی عەزاب بۆ سەریان دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ إِلاَّ وَلَهَا كِتَابٌ مَعْلُومٌ﴾ واتە: دابو نەریتی خودا بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك، یەك جۆرە، دانیشتووی هیچ گوندو شارێك نافەوتێنێ، هەتا بەڵگەیان لەسەر راست نەكاتەوەو بیانوویان نەبڕێ. هەموو گەلو نەتەوەیەك رەهنومایی دەكا، رێگەی راستو حەقیان نیشان دەدا، جا كە كاتی لەناوچونیان هاتو ئەجەلیان هات لەناویان دەبا.

بەكورتی خودا سزادانی هیچ گەلو نەتەوەیەك لەكاتی دیاریكراو، دوا ناخا هەروەكوو پێشیشی ناخا، لەناوبردنی هەموو گەلو نەتەوەیەك ئەجەلێكی

دیاریکراوی هەیەو لەلەوحولمەحفوظدا نووسراوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ الرعد/٣٨. یان دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ الأعراف/٣٤.

مەبەست لەم ئایەتانە ئەوەیە: ئەگەر خودا بیویستایە زوو عەزابی کافرەکان بدا زوو عەزابی دەدانو لەناوی دەبردن! بەڵام حیکمەتی خودا داخوازی ئەوە بووە مۆڵەتیان بدا بۆ ئەوەی پەشیمان ببنەوە، بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك ئەجەلێکی دیاریکراویان هەیە پاشو پێش ناکا.

﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ﴾ لەناوچوونی هیچ گەلو نەتەوەیەك پێش هاتنی ئەجەلی خۆی نایەتەدی. هەر کاتێکیش ئەجەلیان هات دوا ناخرێ! ئەمە ئاگادار کردنەوەیە بۆ دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری بۆ ئەوەی واز لەبتپەرستیو هاوەڵدانان بۆ خودا بهێنن، چونکە ئەو بتپەرستیو هاوەڵدانانە دەبێتە هۆی لەناوچوونیان بەسزا. بابەدواخستنی عەزاب لەخۆیان بایی نەبن، سزاو عەزابیان بۆ پەزمەندە کراوە، هەر کاتێ وەختی هات پاشو پێش ناکا.

نامەی دیاریکراوو تەمەنی دیاریکراوو نەخشە بۆ کێشراو خودا دەیدا بەگەلو نەتەوەو دانیشتووی شارو شاروچکەکان بۆ ئەوەی بەگوێرەی نامەی خودا هەڵسو کەوت بکەن، بەگوێرەی کردارو هەڵسو کەوتیان تەمەنیان دەست نیشان دەکرێ! ئەگەر ئەوان ئیمان بهێننو چاکەکارو صالحو عەدالەتکاربن خودا تەمەنیان درێژ دەکا، ژیانی سەربەستیو ئازادی دەگوزەرێنن، هەتا بەگوێرەی بەرنامەی خودا کار بکەن ئیشیان باشە، کە لایان داو وازیان لەو بەهابنەڕەتیانە هێناو تەنانەت کەمینەیەکی خێریشیان تێدا نەماوە، کەس نەبوو ڕەهنومایی خەڵك بکا بۆ خوداپەرستیو چاکەکاری ئەو کاتە وەختی لەناو چوونیانە، جا یان سەرلەبەر قاڕەبڕیان دەکاو دەپوکێنەوەو هەبوونیان لەدەست دەدەن، یان

سەروەری و باڵادەستییان لێ دەستێنێتەوە، بەژیانی کولەمەرگی و ژێردەستەیی ژیان بەسەر دەبەن مردنەکەیان باشترە لەو ژیانە پڕ ناسوورو دەردی سەریە.

دەگوترێ: کەی ئەمە وایە؟! ئەوەتا چەندەها گەل و نەتەوە هەن، بێ بڕوان، چاکەکار نین، صالح نین، عەدالەتکار نین، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەهێزن دەوڵەمەندن، بەردەوامن لەژیاندا پێشکەوتوون...هتد.

لەوەڵامدا دەڵێن: ئەمە وەهەم و بێ بناغەیە، هەر گەل و نەتەوەیەك ئاوابێ و لەژیانی خۆشدا بێ دەبێ کەمینەیەکی خێریان تێدا مابێ، دەبێ رەوشتێکیان هەبێ شیاوی ئەو سەروەرییە بن، دەبێ بەشێوەیەك لەشێوەکان چاکەکار بن، دەبێ جۆرە عەدالەتکارییەکیان تێدا مابێ و بەم بەها پیرۆزانەوە دەژین لەگەڵ نەیان مان لەناو دەچن!

چونکە سوننەتی خودا نەگۆڕاوەو ناگۆڕێ، هەموو گەل و نەتەوەیەك بەگوێرەی کردەوەکانیان تەمەنیان بۆ دیاری دەکرێ! ژیانی دونیایان بەگوێرەی کردەوەکانیان بۆ خۆش دەبێ!

## بڕێ بێ ئەدەبی کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ رەتدانەوە دەمکوتکردنیان

﴿ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓا۟ إِذًا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾

﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ﴿١٥﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی توندی ئاڕاستەی کافرەکان کرد، ئەمجار شوبهەو ئینکاریکردنیان بۆ پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ باس دەکا، بێ ئەدەبیو ناماقوڵیەکانیان بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ روون دەکاتەوە. ئەمجار ئەوەش رادەگەیەنێ: کە دابو نەریتی ئەو نەفامانە بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا چون یەکە، هەموو پێغەمبەرانی پێش تۆ ئاوا بێ ئەدەبییان دەرباره کراوەو بەشتی ناشیرین تۆمەتبار کراون، بەدرۆیان خستوونەوە، پێغەمبەرەکان لەبەرامبەر نەفامیو سەررەقی گەلەکانیاندا خۆڕاگرو پشوو درێژ بوون، ئەتۆش ئەی موحەممەد! چاو لەئەوان بکەو لەبەرامبەر نەفامی ئەو عەرەبە موشریکانەدا خۆگر بە، پەیامی خۆت بگەیەنە.

قەتادە دەڵێ: ئەوانەی بێ ئەدەبییان لەخزمەت پێغەمبەردا کرد: عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئومەیەو نەضری کوڕی حاریثو نەوفەلی کوڕی خوومیلیدو وەلیدی کوڕی موغەیره بوون، هەموویان ریش سپیو پیاو ماقوڵی قوڕەیشییەکان

بوون دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ﴾ کافرە قورەیشییەکان لەرووی گاڵتەپێکردن و ئەزیەتدانی پێغەمبەرەوە دەیانگوت: ئەی ئەو کەسەی لافی ئەوە لێ دەدەی گوایە پێغەمبەری و نیگات بۆ دێ و قورئانت بۆ نازڵکراوە: تۆ شێتی، بەراستی نەفامی لەوەدا: کە بانگمان دەکەی بۆ ئەوەی واز لەئایینی باوك و باپیری خۆمان بهێنن و شوێن تۆ بکەوین، وازمان لێبێنەو ئێمە شوێن شێتی وەکوو تۆ ناکەوین!! ئەمە پاداشی ئەو نەفامانە بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەو قورئانی بۆ هێنابوون، شارەزای رێبازی حەقی دەکردن، ئەوان بەشێتیان دەزانی و بوختانیان بۆ دەکردو جۆرەها تۆمەت و قسەی ناشیرینییان بۆ هەڵدەبەست. داوای سەیرو سەمەرەیان لێدەکرد، پێیان دەگوت: ﴿لَوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلَائِكَةِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ ئەگەر تۆ راست دەکەی پێغەمبەری؟ بۆچی فریشتەمان بۆ ناهێنی شایەدی بدەن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەت و پشتگیریت بکەن لەهەڕەشەکانتدا. بۆچی کێوەکانی دەوروبەری مەککەمان بۆ لانابەیی و کانیاومان بۆ هەڵناقوڵێنی؟ ئاوا بەوجۆرە جۆرەها پەلپیان لێدەگرت وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيراً﴾الفرقان/٧. یان دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءنَا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ أَوْ نَرَى رَبَّنَا لَقَدِ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوّاً كَبِيراً﴾الفرقان/٢١. لەشوێنێکی تردا قورئان قسەی فیرعەونمان بۆ دەگێڕێتەوە: کە ئاڕاستەی حەزرەتی موسای کرد. دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَاء مَعَهُ الْمَلَائِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾الزخرف/٥٣.

بەڵێ: داوا کردنی هاتنە خوارەوەی فریشتە لەم سورەتەو لەسورەتەکانی تریش دا دووبارە بۆتەوە، داواکە لەپێغەمبەری ئیسلام و پێغەمبەرەکانی تریش کراوە، ئەمە دیاردەیەك بووە لەدیاردەکانی نەفامی، قەدر نەزانییانە بۆ ئادەمیزاد: کە خودا رێزی لێناون، پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی لەئەو رەگەزەدا داناوە، لەو

ڕەگەزەدا کەسانێك: کە شیاوی ئەو پلەو پایەیەن دەیانکاتە پێغەمبەرو ئەو شکۆمەندییەیان دەداتێ.

ئەمجار بۆ ڕەتدانەوەی ئەو بێ عەقڵیو نەفامییە، پەروەردگار دابو نەریتی نەگۆڕی خۆی باس دەکا: کە هەر کاتێ فریشتەی ناردن بۆ سەریان بۆ بەهیلاکبردنیانە.

دەفەرموێ: ﴿مَا نُنَزِّلُ الْمَلائِكَةَ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَمَا كَانُوا إِذاً مُنْظَرِينَ﴾ ئێمە فریشتە نانێرینە خوار بۆ سەریان، ئیللا کە دەیاننێرینە خواری بەشێوەیەکی حەقو بەمەبەستی حیکمەتو بەرژەوەندییەکە خۆمان دەیزانین.

فریشتە نانێردرێن بۆ سەر پێغەمبەرێك لەپێغەمبەران مەگەر بۆ لەناوبردنی بەدرۆخەرەوەکانی گەلەکەی، بۆ فەوتاندنی ئەوانەی بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەکەوە نەچوون، ئەمەش لەکاتێکدایە: کە تەمەنی ئەو گەلە کۆتایی هاتبێ و کاتی لەناوبردنیان بێ! ئیتر پاشو پێش تێدا کردن ناکرێ. مۆڵەتدانو دواخستنی عەزابەکە نیە.

ئێمە فریشتە نانێرین، چ سودێك هەیە لەوەدا لەئاسمانەوە فریشتە بنێرینە خوارێو ئێوە بیانبینن؟؟! چونکە ئێوە ئەگەر بیانبینن دەبێ لەسەر شێوەی ئادەمیزاد بیانبینن، ئەگینا ئێوە هێزی بینینی ئەوانتان نیە، ئەوان عالەمێکی جوداوازن لەئێوە، جا ئەو کاتە ئەگەر ئەوان بڵێن: ئێمە فریشتەین بەدرۆیان دەخەنەوە، چونکە ئەوان لەسەر شێوەی ئاسایی ئێوە دەبینرێن. ئەو کاتە سەرتان لێ تێك دەچێ! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكاً لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلاً وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾الأنعام/٩. هاتنە خوارەوەی فریشتە زەرەرو زیانی ئەوانی تێدایە، چونکە ئێمە ئەگەر فریشتە بنێرینە خوارێ بۆ لەناوبردنیانە ﴿وَمَا كَانُوا إِذاً مُنْظَرِينَ﴾ ئەو کاتە هیچ مۆڵەت نادرێنو عەزابی ڕیشەکێشکەریان بەسەردا

دەدریّو دەیانفـەوتێنین. داب و نـەریتی ئێمـە لەگـەڵ گەلەپێـشینەکان وا هـاتووە هەرکاتێ پـەلپی نـازلکردنی موعجیزەیـەکیان گرتبێ و موعجیزەکە هاتبێتـە جێ و ئیمانیان پێ نەهێنابێ یەکسەر بەعەزاب لەناومان بـردون! کەوابێ بـا واز لـەو داوا کردنە بهێنین!!

ئـەمجار پـەروەردگار ڕەدی گوتـەی کافرەکـان دەداتـەوە کە دەڵێن: پێغەمبـەر شێتەو پەتەڕییە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ ئێوە گـەلێکی گومڕاو سەرلێشێواون، گاڵتە بەپێغەمبەری ئێمە دەکەن، گاڵتەپێکردنەکەتان زیـانی پێ ناگەیەنێ، چونکە ئێمە ئەو قورئانەمان نازڵ کـردوە، ئێمـە پارێزگاری دەکـەین ناهێڵین زیادو کەمی تێدا بکرێ، گۆڕانکـاری تێـدا بکـرێ، کـەس ناتوانـێ بـەرەنگاری بکا. ئەمە تایبەتمەندییەکی قورئانەو هیچ نامەیەکی تر ئەم تایبەتمەندییەی نیـە، خودا بۆ خۆی بەرعۆدەی پارێزگاری کردنی بووەو دەیپارێزێ!

ئەمجار تەسەللای پێغەمبـەر ﷺ دەداتـەوە لەسـەر ئـەو نەفامییـەی گەلەکـەی بەرانبـەری دەکـەن و بەشـێتی لەقەڵەم دەدەن، تەسـەللای بـەوە دەداتـەوە کـە ئـەو جـۆرە هـەڵس و کەوتانـەی گەلەکـەی بەرامبـەری دەینـوێنن داب و نـەریتێکی گەلـە سـتەمکارەکانی پێـشووە، ئـەوانیش هـەمان هـەڵس و کـەوتیان بەرامبـەر پێغەمبـەرەکانیان کـردوە. ئـەو ناخۆشـیەی توشـی تـۆ بـووە توشـی پێغەمبـەرەکانی پێشوش بووە، ئێمە پێغەمبەرەکانمان یارمەتی دان و ستەمکارەکانمان تێك شـکاندن، لەگەڵ تۆش و گەلەکەتدا هەمان هەڵس و کەوت دەکەین. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الأَوَّلِينَ﴾ بێگومـان ئێمـە لـەپێش ڕەوانـەکردنی تـۆدا چـەند پێغەمبەری ترمان ڕەوانە کردوون بۆ سەر نەتەوە پێشینەکان، بۆ سەر هۆزو تاقم و کـۆڕو کۆمـەڵی جیاجیـای ئـادەمیزاد، داوای یەکتاپەرسـتی و بڕواهێنـان بەزیندوبوونـەوەو هـاتنی ڕۆژی قیامـەتیان لێکـردوون، بەڵگـەو دەلیلـی ئاشـکراو روونیان لەسەر راستی پەیامەکەیان نوانـدوە، ﴿وَمَا يَأْتِيهِمْ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ كَانُوا بِهِ

﴿يَسْتَهْزِئُونَ﴾ بەڵام هەر پێغەمبەرێك هاتبێتە سەریانو داوای ئیمانهێنانی لێكرد بن ئیللا گاڵتەیان پێ كردوە، پەیامەكەیان رەتكردۆتەوە.

رستەی ﴿وَمَا يَأْتِيهِمْ...﴾ حیكایەتی حاڵی رابوردوە، چونكە (ما) كاتێك دەچێتە سە فیعلی موضاریع كە بەمانا حاڵ بێ، كاتێكیش دەچێتە سەر فیعلی ماضی: كە لەزمانی حاڵەوە نزیك بێ.

﴿كَذَلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ، لا يُؤْمِنُونَ بِهِ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ﴾ هەر بەو جۆرە قورئان دەخەینە دڵی تاواژنبارانەوە، حاڵیان وایە ئیمانی پێ ناهێننو بەلایانەوە كتێبێكی پەسند نیە، چونكە لەدڵیاندا ئامادەباشی وەرگرتنی كەلامی حەق نیە، بەروناكایی چرای هیدایەت دڵیان روناك نابێتەوە، وەكوو چۆن حاڵو وەزعی گەلەپێشینەكانیش ئاوا بوو، هەمان هەڵوێستیان نواند بەرامبەر ئەو پەیامەی لەخوداوە بۆیان نێردرا. ئەمە ئەگەر راناوی (نسلكه) بگەڕێتەوە بۆ قورئان.

دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ شیرك ئەو كاتە ماناكەی بەم جۆرە دەبێ: دەفەرموێ: ئێمە بەدرۆخستنەوەی پەیامی یەزدانی دەخەینە دڵی تاوانبارانەوە: ئەوانەی شوێن هیدایەتی خودا ناكەون، بێگومان ئەو بەدرۆخستنەوەو كوفرو شەریك دانانەی خرابوە دڵی تاونبارانی رابوردووەوە، دەیخەینە دڵی تاونبارانی سەردەمی تۆو ئەوانەی لەوەدوا دێنە گۆڕەپانی ژینەوە! سوننەتو دابو نەرێتی خودا دەربارەی گەلەپێشینەكان، ئەوانەی پێغەمبەریان بۆ سەرنێردراون رونو ئاشكرایە، بریتی بووە لەوە: كە ریسوایان بكا، كوفرو گاڵتەكردن بەپەیامی خودای خستۆتە ناو دڵیانەوەو پاشان لەناوی بردون، سەركەوتنو پیرۆزی بەشو باری پێغەمبەرانو موسوڵمانان بووە، تاوانبارانی لەناوبردونو پێغەمبەرانو شوێنكەوتوانیانی سەرفرازی دونیاو قیامەت كردون.

ئەتۆش ئەی موحەممەد! سەیری ئەو پێغەمبەرانە بکە چییان بەسەرهات لەگەڵ گەلە سەرەقە بەدرۆخەرەوەکانیان. دڵنیابە سوننەتی ئێمە ناگۆڕێو چیمان بەتاوانبارانی رابردو کرد، هەمان دەردو عەزاب تووشی تاوانبارانی تریش دەکەین. چۆن یارمەتی پێغەمبەرانی پێشوومان دا ئاواش یارمەتی تۆ دەدەین.

بەدرێژایی مێژوو کافرو خوانەناسو بەدرۆخەرەوەکان لەسەنگەری دژایەتیدان بەرامبەر یەکتاپەرستانو پێغەمبەران، بەرامبەر حەقو حەقخوازان هەموویان یەك هەڵوێستن، وەکوو دەگوترێ: (الكفر ملة واحدة) پێویستە موسوڵمانانیش یەك هەڵوێست بن یەك بەرژەوەندییان هەبێ، بۆ یەك مەبەست هەوڵو تەقەللا بدەن، لەپێناو ئایینی خودادا خۆیان بکەنە قوربانیو ماندو نەناس بن، بەماڵو گیان تێبکۆشن بۆ ئەوەی وشەی (لا اله الا الله، محمد رسول الله) بەرقەرارو، پایەدار بێ.

ئەمجار سیاقی قورئان نمونەیەکی قێزەونی سەررەقانەی ئەو کافرو تاوانبارانەمان نیشان دەدا کە لەناخیاندا خۆی داکوتاوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَاباً مِنْ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ، لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَسْحُورُونَ﴾ ئەگەر ئێمە دەرگایەك لەئاسمان لەسەر ئەو کافرە سەررەقانە بکەینەوە، وایان لێبێ بەو دەرگایەدا سەربکەون، یان ببینن فریشتە پێیدا سەربکەوێ، هێشتا بڕوا ناکەن، بەڵکوو دەڵێن: چاوبەستەکیمان لێکراوە، چاومان شتەکان وەکوو خۆیان نابینن، رووداوەکانمان لێچەواشە بوون، وامان لێهاتووە جگە لەشتە خەیاڵییەکان چی تر نابینین، سیحرمان لێکراوەو موحەممەد بەئایەتەکانی سەری لێشێواندین وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَاباً فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾الأنعام/٧.

بەکورتی ئینکاریکردنو سەررەقی ئەو موشریکانە گەیشتۆتە ئاستێك: ئەگەر خۆیان بەئاشکراو عەیان بۆ ئاسمان بەرز ببنەوە، مڵكو مەلەکوتی

ئاسمانەکان ببینن، دەڵێن: ئەم شتانەی بینیمان وەهمو خەیاڵە، حەقیقەتێکی نیە، ئەوە موحەممەد سیحری لێکردوین، هەستو هۆشی تێك داوین!! وەکوو چۆن زانایانی زانستی کیمیاگەری کاری ئاوا سیحراوی دەکەن، کاری وا دەکەن ئادەمیزاد وا دەزانێ: دەفڕێ لەراستیشدا نافڕێ. یان وەکوو لەرۆژگاری ئێمەدا زانایانی تەنویمی موغناتیسی ئەنجامی دەدەن نوستەرەکە بەنووستووەکە دەڵێ: ئەتۆ پاشای، ئەتۆ ئافرەتی، ئەتۆ ئەوەی، ئەوەی، ئەویش بڕوای پێ دەکا. چی پێ دەڵێ: لێی وەردەگرێو بەراستی دەزانێ.

هەروەها هەندێك ئادەمیزاد هەن توانایەکی تایبەتیان هەیە، دەتوانن عەقڵو هۆشی هەندێ کەس لەکار بخەنو شتی بێ بناغەو بێ حەقیقەتیان بخەنە مێشکەوەو پێیان بسەلمێنن: کە ئەوە راستو حەقیقەتە. ئێستا ئەو جۆرە زانیاریانە لەئەوروپا پەیمانگاو خوێندنگایان بۆ کراونەوەو دەخوێندرێن!

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە لەفەضای خاریجیدا تاریکی هەیە!

پەروەردگار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: کە کێشەو جیدال لەگەڵ ئەو موشریکە سەررەقانەدا بێهودەیە، ئەوە دەچەسپێنێ کە ئیمان نەهێنانی ئەوانە لەبەر بێ بەڵگەیی‌و کەم بەڵگەیی نیە، نەهاتنی فریشتە بەشێوەی پێغەمبەریی بۆ سەریان نابێتە لەمپەڕ لەبەردەم ئیمان هێنانیاندا، خۆ کردنەوەی دەرگای ئاسمان لێیانو بەرزبوونەوەیان بۆ ئاسمانو چاوپێکەوتنی ملكو مەلەکووتی ئاسمانەکان زۆر لەهاتنە خوارەوەی فریشتە بۆ سەریان گرنگترە، دەی ئەوان بەوە ئیمان نەهێنن چۆن بەئەمە بڕوا دەکەن!؟

بەکورتی ئەوانە گەلو تاقمو گرۆیەکی سەررەقن، بێ بڕوان، بێ شەرمو حەیاو ئابڕون، بەبێ پەروا بەناحەق ئینکاری حەق دەکەن!

## برێ لەدیاردەکانی قودرەتی خودا

﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَـٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ ﴾

دوای ئەوە پەروەردگار باسی کوفری کافرەکانی کرد، بێ دەسەڵاتی بتەکانیانی چەسپاند، ئەمجار باسی کەماڵی قودرەتی خودا دەکاو بەڵگەی تاک‌و تەنهایی زاتی پاکی لەبوونەوەردا رادەنوێنێ: سەیری ئاسمان بکەن لەبورجەکانی ورد ببنەوە،

سـەیری ئەسـتێرەکان بکـەن، بڕوانـنـە زەوی ڕاخـراوو شـیوو دۆڵو دەشـتو سارای.تەماشای کێوی چەسپاوو داکوتراوی بکەن، لەدارو درەختو گژو گیاو ئاوو هەوای بکۆڵنەوە، لەگیانلەبەرو شێوەو ڕوخسارییان ورد ببنـەوە، سـەیر بکـەن چۆن هەموو ئەمانەو شتەکانی تریش بەئەندازەو نەخشەو پلان دێنو دەچنو ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان ئـەنجام دەدەن! هـەموویان بەتـەرازووی حیکمـەتو زانیـاری هێنراونە وجود، سەیری دیمەنی زەوی بکەن، لەدیمەنی بای متوربەکەر (ریح لاقح) ورد ببنـەوە، لەدیمـەنی مـردنو ژیـان، دیمـەنی زینـدو بوونـەوەو حەشـرو نەشـر سەرنج بدەن هەموو ئەمانە بەڵگەو دەلیلی تاکو تـەنهایی خـودای پـەروەردگارن، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً﴾ بێگومـان ئێمـە لەئاسمانـەکاندا چـەند ئەستێرەی گەورەو گەڕۆکو ڕاوەسـتاومان بـەدی هێنـاون ﴿وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ﴾ ئـەم ئەستێرانەو ئەستێرەکانی تریشمان کردونە نیشانەی جوانیو ڕازاوەیی بونەوەر بـۆ هەر کەسێك تێیان بفکرێو لێیان وردبێتـەوە، هـەر کاتـێ سـەیری ئاسمـانی بـەرزو بەرین بکەی، تـا تێـی ڕامێنـیو لێیـان وردبیـەوە شـتی عەجایـەبو سەرسوڕهێنەر دەبینی، دەست ڕەنگینیو دەسەڵاتی خودای گردگاریان تێدا بەدی دەکەی!

(بروج) وێ دەچێ ئەسـتێرە گـەورەو زەبەلاحـەکان بـن، لەوانەیـە شـوێنڕەوو قۆناغـەکانی ئەسـتێرە گەڕۆکـە گـەورەکان بـن. ئـەو ئەسـتێرانەی: کـە لەمـەداری خۆیاندا لەهاتو چۆدان. هەر مانایەکیان بێ، مەبەست ڕانواندنی دەست ڕەنگینـیو وردەکـاریو ئیبـداعی پـەروەردگارە لەبوونـەوەردا، داوامـان لێـدەکا لـەو بوونـەوەرە جوانە ورد بینەوە بۆ ئـەوەی جوانییەکـەیمان بـۆ دەربکـەوێ. ئایەتەکـە سـەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ لایەنی جوانی بوونەوەر: کە لـەئاکامی پێکـەوە گونجانی ئـەفرادەکانی ئەوبوونەوەرە دێتە کایەوە!

بێگومـان تەماشـا کردنێکـی وردبینانـە بـۆ لای ئاسمـان لەشـەوێکی تـاریکی ئەنگوستەچـاودا، لـەو کاتانـەدا کـە دەبینـی ئەسـتێرەکان پـێ یـدا بڵاوبوونـەوەو

چاوشارکێ لەگەڵ ئێمە دەکەن‌و دەدرەوشێنەوەو پاشان نقوم دەبنەوە، ئەوجار چاو ئەستێرەیەکی تری دوور تر دەبینیێ‌و سەرەنجی لێدەدا، هەروەها تەماشا کردنێکی ئەو ئاسمانە لەشەوێکی مانگە شەودا، کە دەبینی مانگ خەومنوچکەیەتی‌و بوونەوەر بەدەوریدا کێشکەچییەو ئایەوێ نووستوی بەختەوەر بەخەبەر بێنیێ!

بەڵێ تەماشاکردنێکی لەم جۆرە دەبێتە هۆی ئەوەی: کە هەست بەحەقیقەتی جوانی بوونەوەر بکەی، سەرت لەدەست رەنگینی بەدیهێنەرەکەی سوڕبمێنێ‌و بەناچاری لەناخەوە بڕوا بەتاك‌و تەنیایی‌و خودایەتی‌و باڵادەستی خودا بکەی، ملی بەندایەتی بۆ کەچ بکەی‌و لەناخەوە ئیمان بەپێغەمبەران‌و پەیامەکەیان بێنیێ!! وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ﴾الصافات/٦.

ئەمجار وێڕای جوانی‌و رازاوەیی پارێزراویشە ﴿وَحَفِظْنَاهَا مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ رَجِيمٍ﴾ پارازستومانەو دەیپارێزین لەهەموو شەیتانێکی دوورخراوە لەرەحمەتی خودا، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَحِفْظاً مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ﴾الصافات/٧. واتە: ئاسمان دەپارێزین لەهەموو شەیتانێکی یاخی بوو لەطاعەتی خودا، هەر کاتێ لێی نزیك ببنەوە بیانەوێ توخنی بکەون بەتیر ئەستێرە لێیان دەدەین.

﴿إِلاَّ مَنْ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾ مەگەر کەسێ بیەوێ وتەیی لەعالەمی نهێنی‌و قسەو باسی فریشتەکان بدزێ ئەو کاتە شووڵە ئاگرێك دەردەچێ‌و بەئاشکرا شوێنی دەکەوێ‌و راوی دەنێ! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَّصَداً﴾الجن/٩. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِّلشَّيَاطِينِ﴾الملك/٥.

ئەم ئایەتانە هەواڵی ئەوەمان پێ دەدەن؛ کە شەیاتینی ویستوویانە بڕێك لەهەواڵی نهێنی لەوەی لای فریشتەکانە بدزن، پەروەردگار تیر ئەستێرەو شوڵە ئاگری بەسەردا باڵادەست کردوون و سوتاندونی، ئیتر ئێمە لەچۆنیەتی ئەمە ناکۆڵینەوە، بیری لێناکەینەوە بزانین هەواڵدزینەکەیان چۆنەو چۆن نیە، چونکە ئێمە توانای ئەوەمان نیە بزانین چۆنە هۆکارو ئەسبابی زانینی ئەوەمان پێ نەدراوە، ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە بڕوامان بەهەواڵی قورئان هەبێ و پێغەمبەر ﷺ چۆنی پێ ڕاگەیاندوین بەراستی بزانین، لێکۆڵینەوە لەم بارەوە نامانگەیەنێتە زانیاری ڕاست و دروست، جگە لەحەدس و گۆترەکاری چیمان دەست ناکەوێ.

موسوڵمان پێویستی بەحەدس و تەخمین نیە بۆ دڵنیابوون لەڕاستی ئاینەکەی، وا چاکە موسوڵمان خۆبپارێزێ لەتوێژینەوەی ئەم جۆرە نهێنییانە، بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاستی لێ گوم نەبێ!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەکۆندا شەیاتینی ڕێگای چوون بۆ ئاسمانیان لێ یاساغ نەبوە، چون بۆ ئاسمانەکان و هەواڵی نهێنییان لەفریشتەکان دەبیست و بەکاهین و کۆڵەوەنانیەکانیان دەگوت. کە حەزرەتی عیسا لەدایك بوو سێ ئاسمانیان لێ یاساغ کران، کە حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەدایك بوو هەموو ئاسمانەکانیان لێ یاساغ کران، هەر یەکێ لەوان بیەوێ هەواڵدزی لەئاسمانەکان بکا تیر ئەستێرەی تێدەگرن.[٢]

قسەی ڕاست ئەوەیە: کە تیری ئەستێرە شەیاتینی دەکوژێ پێش ئەوەی هەواڵەکە بدزێ، ئیتر هەواڵی ئاسمان بەهۆی پێغەمبەران و فریشتەی نیگاوە نەبێ ناگاتە دانیشتوانی سەرزەوی. هەر بۆیەش بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام دیاردەی کاهینی و کۆڵەوەنانی کۆتایی پێ هات.

---

(٢) تەفسیری رازی ج١٩/١٦٩.

ئەمجار پەروەردگار دوای ئەوەی بەڵگە ئاسمانییەکانی لەسەر تاكو تەنهایی خۆی ڕانواندن، بەشوێنیاندا بەڵگەی زەمینی ڕادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا﴾ نیشانەیەکی تر لەنیشانەکانی خودایەتیو تاكو تەنیاییمان ئەوەیە: کە ئێمە زەویمان ڕاخستوە، لەباری پانیو درێژیو قوڵی تا بڕوانی درێژکراوەتەوە، وامان لێکردوە گیانلەبەران بەئاسانی تێیدا هەڵبکەنو ژێواری خۆیانی لێوەدەست بێنن؛ ئیتر لەحەقیقەتدا زەوی بۆ خۆی خڕ بێ یان هیلکەیی بێ، یان هەرجۆرێکی تربێ، لەگەڵ مانای ئایەتەکە دژناوەستێ؛ چونکە زەوی کوڕەیەکی زۆر گەورەیە، هەموو ئەندازەیەکی وەکوو سارایەکی پانو بەرین دێتە بەرچاو، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ﴾الذاریات/٤٨.

﴿وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ﴾ چەند کێوێکی بەرزو زەبەلاحو دامەزراومان لەزەویدا دروست کردوە، بۆ ئەوەی لەرزە بەدانیشتوانی سەری نەکا، گیانلەبەران بەئاسانیو بەئاسایی بتوانن لەسەری بژین. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾النحل/١٥. لەسورەتی (الرعد)دا بەدرێژی لەم بارەوە دواوین.

﴿وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ ڕواندوومانە لەزەویدا لەهەموو جۆرە ڕوەكو دارو درەختێك بەئەندازەو تەرازو! هەموو گژوگیاو ڕوەكو درەختێك پێکهاتەکانی ئەندەدار کراون، حیکمەتو بەرژەوەندیەکی تێدا ڕەچاو کراوە، هەموو ڕوەکێك هەموو درەختێك عونصورەکانی پێکهاتەکانی وەکوو یەك نین، هەرچەندە لەیەك زەویدان بەیەك ئاو ئاو دەدرێن، دەبینی عونصورێکی تایبەتی لەم ڕوەك بۆ ئەوەی تر جوداوازی هەیە، بەهۆی هەڵمژینی غیذاء لەرەگەکانیەوە بۆ قەدو لكو گەڵاو گوڵو بەروبوومەکەی. ئەوەی کۆنترۆڵی ئەم جوداوازییە دەکا ئەو کونە پچکۆلە زۆر پچکۆلانەن، کە بەعەرەبی پێیان دەڵێن: (الفتحات الشعرية) بەدیوی دەرەوەی ڕەگەکانەوەن! سوبحانەڵلا ئەو بۆریە پچکۆلانە هەر ئەوەندە ڕێگا

بەهەڵمژینی غیذاکە دەدەن کە روەکەکە پێویستی پێ بێ، ئەوی تر رەتدەکاتەوە، چونکە وا دروست کراوە: کە جگە لەخۆراکی پێویست زیاتر هەڵنەمژێ.

بۆ نموونە عونصوری (بۆتاس) بەئەندازەی ٣٠٪ دەچێتە ناو ئەو زوراتەی ئێمە دەیخۆین. ٤٣،٣٪ دەچێتە ناو قامیشی شەکرەوە. ٦١،٥٪ دەچێتە ناو پەتاتەوە. ٣٤،٦٪ دەچێتە ناو بەرسیمەوە، بەهۆی ئەم جوداوازییەوەیە قامیش دەگونجێ بکرێتە شەکر، بەرسیم بکرێ بەبژێوی ئاژەڵ، زورات و پەتاتە ببێتە بژێوی ئادەمیزاد!!!

کەوابوو مانای ﴿مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ هەموو ئەندازەدارکراون بەتەرازوویەکی یەزدانی، کێشراون، بەتەرازووی حیکمەت و بەگوێرەی بەرژەوەندی ئادەمیزادو گیانلەبەران. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾الرعد/٨. هەروەکوو چۆن پەروەردگار ئەستێرەکانی رێکخستون، هات و چۆو روناکی و کێش و پێکهاتەکانیان وا دروستکراون: کە پێکەوە بگونجێن! بەسە بۆ بەڵگەی نەخشەکێشانی پەروەردگار لەبونەوەردا ئایەتی ﴿وَوَضَعَ الْمِيزَانَ، أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ﴾الرحمن/٨.

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ تۆ خودایە! کە لەبوونەوەردا هەموو شتێکت بەئەندازە دروست کردوە. هەر کەسێ بەچاوی وردبینی سەیری بوونەوەر بکا، دەست رەنگینی و قودرەتی پەروەردگاری بۆ ئاشکرا دەبێ و دەزانێ خودا هیچ شتێکی بوونەوەری بەهەوانتە دروست نەکردوە.

﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ﴾ ئامادەمان کردوە بۆ ئێوەی ئادەمیزاد لەزەویدا هۆکارەکانی ژیان هەر لەئاوو هەواو خواردەمەنی تا پۆشاک و جێگای حەوانەوەو پشوودان. ﴿وَمَنْ لَسْتُمْ لَهُ بِرَازِقِينَ﴾ هەروەها بۆ ئێوەمان رەخساندوە لەزەویدا کەسانێک و چەند شتێک کە ئێوە رزق و رۆزییان نادەن و ئێمە دەیان ژێنین، وەکوو

خێزان‌و منداڵ‌و خزمەتچی‌و کارمکەر هەروا ئاژەڵ‌و ئامێری خۆش رابواردن. پەروەردگار منەتی خۆی بەسەر بەندەکانی‌دا دەکا: بەوە: کە لەزەوی‌دا ئاژەڵی بۆ رام کردون هەندێکیان بەکار دەهێنن بۆ سواری‌و بارگواستنەوە، هەندێکیان بۆ سود بینین لەشیر و گۆشتیان، هەندێکیان بۆ جوانی‌و رازاندنەوە، ئەمانە هەموویان سودبەخشن بۆ ئێوەو رزق‌و رۆژیشیان لەسەر پەروەردگارە. ماسی لەدەریادا ئێوە بەخێوی ناکەن، باڵندە بەئاسمانەوە ئێوە بژێوی دابین ناکەن، دارو درەخت‌و ئاژەڵ ئێوە دروستتان نەکردون خودا بەدیهێناون‌و ئێوە سودیان لێدەبینن!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە خودا بۆخۆی خاوەنی حەقیقەتی هەموو شتێکە، هەموو کارێك بۆ ئەو ئاسان‌و سانایە، گەنجینەی هەموو جۆرە شتێك لای خۆیەتی‌و ئەو بەدیهێنەریەتی! ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ هەر شتێك لەبوونەوەردا هەیەو سوودی ئادەمیزادانی تێدایە هەموویان بەدیهێنراوی ئێمەن‌و ئێمە دەتوانین وایان لێبکەین سودیان لێببینرێ، هەموو شتێك بەئەندازە دەبەخشین‌و چەند پێویست بێ‌و بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا بێ ئەوەندەی دەدەینێ.

ئەمجار پەروەردگار هۆکارەکانی رەخساندنی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی رادەنوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ﴾ برێك لەفەضل‌و نیعمەتی خودا بەسەر بەندەکانی‌دا ئەوەیە: بای رەحمەت دەنێرێ هەوری باراناوی هەڵدەگرێ‌و لەو شوێنەی بیەوێ زەوی تێراو بکا باران دەبارێنێ‌و دەبێتە هۆی ژیاندنەوەی رووەك‌و دارو درەخت!

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَاباً ثِقَالاً سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾الأعراف/٥٧. هەروەها بای رەحمەتمان کردوە بەهۆکاری لابردنی تەپ‌و

تۆز لەگەڵاو گوڵی روەك‌و درەخت بۆ ئەوەی غیذای پێویست هەڵمژن‌و بەتۆوی نێرەکە یان، مێینەکان متوربە بکرێن‌و بەروبوم‌و میوە پێ بگەیەنن! لەهەمان کاتدا ئەم شەکانەوەی دارو درەختو روەکە بەهۆی باوە جۆرە ورزشێکە بۆ ئەو جەستە نامیيانەو گەشەی پێ دەکەن، وەکوو چۆن جەستەی گیانلەبەران بەورزش گەشە دەکا.

هەر لەم مانایەدایە: کە ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (الرياح لواقح للشجر وللسحاب) با متوربەی درەختو هەور دەکا، بای رەحمەت دەنێرین هەوری شێدار هەڵدەگرێ‌و کۆیان دەکاتەوە ﴿فَأَنْزَلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ﴾ لەبەرزاییيەوە بارانمان باراند، بەو بارانە خۆتان‌و ئاژەڵ‌و کشت‌و کاڵتان تێر ئاو دەکەین، پێداویستی ژیانتان بۆ دابین دەکەین، دەتوانن بەهۆی ئاوەوە درێژە بەژیان بدەن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾الأنبياء/٣٠. یان دەفەرموێ: ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاء الَّذِي تَشْرَبُونَ، أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ، لَوْ نَشَاء جَعَلْنَاهُ أُجَاجاً فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾الواقعة/٦٨-٧٠. یان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ﴾النحل/١٠.

دەی ئەوە برێکە لەگرنگی ئاو بۆ ژیانی گیانلەبەران‌و پێگەیشتنی کشت‌و کاڵ، ﴿وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ ئێوە ناتوانن ئەو ئاوەی ئێمە دەیبارێنن کۆی بکەنەوەو کۆنترۆڵی بکەن‌و نەهێڵن بەگوێرەی ویستی خۆمان دابەشی بکەین بەسەر زەویدا، باران باراندن بەدەست ئێمەیەو چۆنمان بوێ ئاوا دەیبارێنن، ئەگەر حەزمان لێبێ لەسەر روی زەوی دەیهێڵینەوە، ئەگەر بمانەوێ بەناو زگی زەویدا دەیبەینە خوارێ‌و نوغرۆی دەکەین‌و ناهێڵین کەس سوودی لێوەربگرێ‌و ناتوانن کشت، کاڵتانی پێ پاراو بکەن!

بـەکورتی ئێمـە دەتـوانین بـاران ببـارێنین، لەهـەوردا خـەزنی بکـەین، ئێـوە دەسەڵاتی ئەوەتان نیە.

ئـەمجار دوا ئـەوەی باسـی یاسـاو هۆکـاری درێـژەدان بـەژیانی کـرد، باسـی دروستکردنی ئـادەمیزادو گیـان پـێ بەخـشینو گیـان لێـستاندنەوەی دەکـا، دەتوانـێ لەنەبووەوە ئادەمیزاد بەدی بهێنێو گیانی پێ ببەخشێو دوایی بیمرێنێو ئـەمجار زیندووی بکاتـەوە.. ئـەم ئیـشانە بـۆ خـودا زۆر ئاسـانو سـانایە. دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّـا لَنَحْنُ نُحْيِ وَنُمِيتُ وَنَحْـنُ الْوَارِثُـونَ﴾ ئێمـە لەنـەبووەوە مـەخلوقات بـەدی دەهێـنینو گیانی پێ دەبەخشین پاشان دەیانمرێنینو دوایی زیندوویان دەکەینەوە بـۆ پـاداشو سزا، ئێمە هەموو کاتێ بمانەوێ گیان بەبەر مردوودا دەکەین، هەموو زیندویەکیش لەناو دەبەینو کەس ناهێڵینەوە، پاشان هەموانیان بۆ حیسابو لێکۆڵینـەوە زینـدو دەکەینەوە، هەموو ئادەمیزادێك پاداشو سـزای کردەوەکـانی وەردەگرێتـەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

ئـەمجار پـەروەردگار هـەواڵی ئـەوەمان پـێ دەدا: کـە زانیـاری تـەواوی هەیـە دەربارەی مەخلووقات بەپێشینەو پاشینەوەیان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِـنْكُمْ وَلَقَـدْ عَلِمْنَـا الْمُـسْتَأْخِرِينَ﴾ بێگومـان زانیـاری تـەواومان هەیـە دەربـارەی ئەوئادەمیزادانەی هاتوونە گۆڕەپـانی ژیانـەوەو مـردوونو دونیایـان جێ هێـشتووە سەرژمێری وردو تەواومان لایە دەربارەی خۆیانو کردەوەکانیان دەربارەی ئەوانەی ئێستا لەژیانـدانو ئەوانـەی لەوەبـەولاوە دێنـە گۆڕەپـانی ژیانـەوە. هـیچ شـتێکمان دەربارەی خۆیانو حاڵو وەزعیان، دەربارەیکردارو گوفتاریان لێگوم نەبوەو نابێ!

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ﴾ بێگومـان خـودای تـۆ ئـەی موحەممـەد! هـەموانیان زیندو دەکاتەوەو کێشیان دەکا بـۆ حیـسابو لێکۆڵینـەوە، کـافرو موسـوڵمان، چـاكو خراپ، گەورەو بچووك، کەسـی لـەبیر ناچـێو کـەس ناتوانـێ ئامـادەی رۆژی حەشـر نـەبێ، دەبـێ هـەموویان خۆشـییان بـێو ترشـیان بـێ گۆڕهەڵتـەکێنو حیـسابو

لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دا بکرێ. ﴿إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان پەروەردگار زاناو ئاگادارە، داناو لێزانە، هەرچی بوێو چۆنی بوێ ئاوا دەیکاو دەیڕەخسێنێ!!

## سەرەتای دروستبوونی ئادەمیزادو فەرمان کردن بەفریشتە بەسوژدە بردن بۆ ئادەمو سەرپێچی کردنی شەیتان

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ

فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾

ئەمە بەشی حەوتەمە لەو بەڵگانەی دەبنە نیشانەی هەبوونی پەروەردگارو دەسەڵاتو توانای لەبن نەهاتوویی و تاكو تەنهایی زاتی پاكی. پەروەردگار كە لەوەپێش دروستكردنی گیانلەبەرانی كردە بەڵگە لەسەر تاكو تەنهایی خۆی، بەشوێن ئەودا دروستكردنی ئادەمیزاد دەكاتە بەڵگە لەسەر هەمان مەبەست.

چونكە شتێكی ئاشكراو نمایانە، ناگونجێ رشتەی ئادەمیزاد بێسەرەتا بێ، دەبێ بگەرێتەوە بۆ سەر كەسێك بنچینەی ئادەمیزادبێو یەكەم مرۆڤ بێ دروستكرابێ، هەڵبەتە ئەو یەكەم مرۆڤە لەدایكو باوك پەیدا نەبوە، بەڵكوو بەقودرەتی خودا هاتۆتە دی. جا كە باسی دروستكردنی ئادەمیزادی یەكەمی كرد، هەڵوێستی فریشتەو جندۆكەش بەرامبەر ئەو رەگەزە دیاری دەكا.

بەڵێ لەم کۆمەڵە ئایەتەدا چیرۆکی ئادەمیزادو سەرەتای پەیدا بوونی رادەنوێنێ، چیرۆکی هیدایەتو گومڕاییو هۆکارە بنەڕەتیەکانیان باس دەکا!
چیرۆکی ئادەم لەچی دروست کرا؟ دوای دروستکردنی چی روی دا!

هەڵبەتە تا ئێستا دوو جار چیرۆکی دروستکردنی ئادەم (باوە گەورەی ئادەمیزاد) نمایش کراوە جارێکیان لەسورەتی (البقرة)داو جارێکیشیان لەسورەتی (الأعراف)دا، بەڵام نمایشکردنەکەیان هەر جارە بۆ مەبەستێکی تایبەتی بووە، لەکەش و هەوایەکی تایبەتی‌دا بووە، بۆیەشێوەی ئەداکردنەکەیان جوداوازە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ بێگومان ئێمە ئادەمیزادی یەکەم: کە ئادەمەو بابە گەورەی بەرەی ئادەمیزادە، لەقوڕێکی وشکەوەبوو دروستمان کرد.

صلصال: قوڕی وشك کە بەشتێك لێی بدەی ترینگە ترینگی لێبێ. حمأ: واتە: قوڕ. مسنون: لووس و بێ گرێ و گۆڵ. واتە: قوڕە رەشێکی ترشاوی لەقاڵب داڕێژراوی وشکەوەبوو!

سەرەتا گڵ بووە، ئەمجار بووەتە قوڕێکی رەشی ترشاوی بۆندار، دوایی بوەتە پەیکەرێکی داڕێژراوی سوورەوە بوو، جەستەی ئادەم پێش ئەوەی گیانی بەبەردا بکرێ بەم قۆناغانەدا تێپەڕیوە... وەکوو قورئان لەچەند ئایەتێکی تردا ئاماژەیان پێ دەکا. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ﴾(آل عمران/٥٩. لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِن طِينٍ﴾(ص/٧١). لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ، وَخَلَقَ الْجَانَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ﴾الرحمن/١٤-١٥.

هەڵبەتە دروستکردنی ئادەم بەو شێوەو لەو قۆناغانەدا نیشانەی قودرەت و بەدەسەڵاتی پەروەردگارە!

﴿وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ﴾ باوەگەورەی جندۆکەمان لەوەپێش لەبڵێسەی ئاگری بای گەرم دروست کردوون، واتە: لەمادەیەکی ئاگرینی زۆر گەرم! کە گڕەی هەیەو ڕێی هەر کەسێك بکەوێ دەیکوژێ.

ئیبنو مەسعوود فەرموویەتی گەرمی ئەم بای سەموومەی ئێستا بەشێکە لەحەفتا بەش. لەعائیشەوە فەرموودەیەك ریوایەتکراوە موسلیمو ئەحمەد هێناویانە دەفەرموێ: (خلقت الملائكة من نور، وخلقت الجان من مارج من نار، وخلق آدم مما وصف لكم) ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە ئادەمیزاد ڕێزدارەو پێکهاتەکانی پاكو خاوێنو سروشتەکەی خاکییە. بەڵام سروشتی جندۆکە سروشتێکی گەرمی هەڵچوی قێزەونە!

ئەوەی پێویستە لەسەر ئێمە ئەوەیە: دەبێ بڕوامان وا بێ: کە جندۆکە لەئاگر دروستکراون، بەڵام چۆنیەتی ئەم دروستکردنەو حەقیقەتی سروشتەکەیان لەئێمە نهێنییەو تەنیا بەهۆی سروشو نیگاوە دەتوانین شتێکیان لێبزانین! هەرچی لەم ڕێبازەوە بۆمان نەیەو پێمان ڕانەگەیەندرێ نایزانین، هەرچی لەم بارەوە بگوترێ: بەبێ پشتگیریکردنی سروش خەیاڵو ئەوهامەو بێ بناغەیە!

هەروەها دروستکردنی باوە ئادەمیش لەگڵو قوڕو قوڕی سورکراوەو گیان بەبەردا کردنی لەلایەن پەروەردگارەوە ئەمەش نهێنییەکی یەزدانییە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین، مەگەر لەڕێگای سروشەوە جۆرە زانیارییەکمان دەستکەوێ! دەتوانین بەهۆی تێڕوانین لەدەقی تری قورئانی پیرۆز بەتایبەتی ئایەتی ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ﴾و ئایەتی ﴿ولقد خلقنا الانسان من ماء مهين﴾ بڵێین: بنەمای ئادەمیزادو بنەمای ژیان هەمووی لەگڵو خۆڵی ئەم زەوییەیە، لەمادە سەرەکییەکانی ئەم زەوییە پەیدابووە، قورئان بەئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئادەم لەپێکهاتەی گڵ دروستکراوەو مادەی ئاویش بەیەقینی تێکەڵاوی بووە.

بەڵام چۆن ئەم گڵو ئاوە لەسروشتی خۆیەوە گۆڕا بۆ گۆڕەپانی زیندویی‌و، بووە ئەم ئادەمیزادە خاوەن عەقڵ‌و شعورە؟ بەراستی ئەمە نهێنی‌و پەنامەکییەکە، ئێمە هیچی لێنازانین‌و هەموو ئادەمیزاد بەزاناو دانایەوە تێیدا دەسەوەسان‌و کۆڵەوارە! وەلێ بۆ زانینی نهێنی گیانی ئادەمیزادو هەست‌و شعورو عەقڵی‌و هەموو توانا مەعنەوییەکانی تری‌و جوداوازی لەهەموو گیانلەبەرانی تر تەنها دەبێ پەنا بۆ قورئان بەرین‌و هەواڵی راست هەر لای ئەوە. هەر کاتێ بەوردی سەیری ئایەتی ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ بکەین دەزانین: ئەوە (روح الله)یە ئەم پێکهاتە جەستەیە نزمە بۆ ئەو ئاسۆ بەرزە بەرز دەکاتەوە. بەڵام هەمدیسان ئێمە ناتوانین چۆنیەتی پەیوەندیکردنی گیانی خودا بەو جەستە مادییەوە بزانین! هەر دەبێ بڕوامان پێی بێ و قورئان چۆنی فەرمووە وەری بگرین، ئەگینا چ هەوڵ‌و تەقەلّایەکی تر بدەین بیهودەیەو هەر ماندوبوونمان بۆ دەمێنێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار ڕێزلێنانی خۆی لەئادەم باس دەکا، هەواڵی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە: کە فەرمانی بەفریشتە کردوە سوژدە بۆ ئادەم بەرن‌و شەیتان سەرپێچی فەرمانەکەی کردو سوژدەی نەبرد، دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ﴾ ئەی موحەممەد! ئەوە بۆ گەل‌و هۆزەکەت باس بکە: کاتێ پەروەردگاری تۆ بەفریشتەکانی راگەیاند: کە ویستی وایە ئادەمیزادێك لەقوڕ دروست بکا فەرمووی: ﴿إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ ئەمن دەمەوێ ئادەمیزادێك لەقوڕی سورکراوە دروست بکەم. لەئێستاوە فەرمانتان پێ دەکەم ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ﴾ هەر کاتێ ئەو ئادەمیزادەم دروست کردو هێنامە گۆڕەپانی ژیانەوە ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ یەکسەر بەبێ سێ‌و دوو سوژدەی ڕێزی بۆ بەرن، ﴿فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ﴾ فریشتەکان هەموویان کڕنووشی ڕێزیان بۆ ئادەم برد، ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى أَنْ يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ﴾ جگە لەشەیتان: کە دوژمنی بوو،

ئەوسەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کردو هاوبەشی کڕنووش بردنەکەی نەکرد، زێدە لەهەموو فەرمان پێکراوەکان تەنیا ئیبلیس پابەندی فەرمانەکە نەبوو، خۆی بەزلزانیو ئینکاری کردو پێی ناخۆش بوو کە خودا ئەو رێزەی بەئادەم بەخشی!!

پەروەردگار روی کردە ئیبلیسو ﴿قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلاَّ تَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ﴾ فەرمووی: ئەی شەیتان! چیە بۆ تۆ نەچویتە پێری کڕنووش بەرانەوەو وەکوو فریشتەکان فەرمانی منت بەجێ نەهێناوە؟؟

شەیتان پاساوی بۆ هەڵوێستەکانی هێنایەوەو داکۆکی لەخۆی کردو ﴿قَالَ لَمْ أَكُنْ لأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ وتی: من هێندە پلە نزم نیم کڕنووش بەرم بۆ ئادەمیزادێك: کە لەقوڕە ترشاوێکی لنجو بۆگەنی دوایی بوو بەسوالەت، دروستت کرد، من زۆر لەو بەرزو بەرێز ترم؛ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ص/٧٦، من لەم باشترم، منت لەئاگر خولقاندوە، ئەوت لەقوڕ دروست کردوە. لەشوێنێکی تردا قورئان لەسەر زبانی شەیتان دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ﴾الأسراء/٦٢، ئایا دەبینی ئەم ئادەمە هیچو پوچەت بەسەر مندا پاساو داوەو رێزت لێناوە؟؟

هەڵبەتە شەیتان هۆی کڕنووش نەبردنەکەی بەوە پاساو دایەوە: کە ئەو لەئادەم باشترە، ئەو لەئاگر دروست کراوەو ئادەم لەقوڕ، ئاگر عونصوریی بەرزی تێدایەو روناکی دەبەخشێ، قوڕ عونصوری پەستی تێدایە، ئاگر لەقوڕ باشترە، هەرگیز شتی باشو بەرزو بەرێز نابێ رێز لەشتێك بنێ کە پلەی لەو نزمترە. هەڵبەتە شەیتان قیاسی کردو سەری لێشێوا، بەهەڵەچوو چونکە باشی مادەکە نابێتە نیشانەی باشی عونصورەکە، ئاماژە بۆ ئەوە کە فریشتە لەنوورو روناکی دروستکراون، ئاشکراشە نوور لەئاگر بەرێز ترە.

لەلایەکی تـرەوە هەڵوێـستەکەی شـەیتان سەرپێـچی فـەرمانی خـودا بـوو، ئاگـاداری ئـەوە نـەبوو: کـە ئـادەم ئامادەباشـی عیلمـیو عەمـەلی تێدایـە بـۆ ئاوەدانکردنەوەی زەویو جێ بەجێ کردنی ئەرکی سەرشانی!

بۆیە پەروەردگار نەفرینی لێکردو ﴿قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ﴾ فەرمووی: لەم جێگاو پلەو پایەت بـڕۆ دەرەوە، تـۆ نـەفرین لێکـراوی، لەرەحمـەتی مـن دوور خراوییـەوە، ﴿وَإِنَّ عَلَيْكَ اللَّعْنَـةَ إِلَـى يَـوْمِ الـدِّينِ﴾ بێگومـان تـا ڕۆژی قیامـەت ئـەتۆ لەعنـەتت لەسـەرەو ئـەو نەفرینـەت لـەکۆڵ ناکـەوێ. جـا بـۆ زێـدە گومـڕا کـردنو قوڵبوونەوە لەفرتو فێڵو هەڵخەڵەتاندنی ئادەمیزادو دەرخستنی حەسوودی خۆی بۆ ئادەمو وەچەکانی داوای تەمەندرێژی خـۆی کـردو ﴿قَـالَ رَبِّ فَـأَنْظِرْنِي إِلَـى يَـوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ وتـی: خودایـە مۆڵـەتم بـدە تـا ڕۆژی قیامـەت لـێم گـەڕێ بـەئارەزوی خـۆم ئادەمیزاد لەخشتەبەرم ﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنْ الْمُنْظَرِينَ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾ فـەرمووی: ئەتۆ مۆڵەتدراوی هەتا ڕۆژی قیامەت، چی دەکەی بیکە!

جا کە شەیتان داخوازییەکەی وەرگیراو مۆڵەتدرا ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمْ الْمُخْلَصِينَ﴾ وتی: خودایە! بـەهۆی ئەوەی: کە منت گومڕا کردو نەفرینت لێکردم، دەبێ خراپەکارییان بۆ جوان بکەم، تاوانو سەرپێچی کردنیـان لـەدڵ دا شـیرین بکـەم، هـەڵیان بنـێم بـۆ خراپـە، دەبـێ گومڕایان بکەم وەکوو چۆن تـۆ منـت گـومڕا کـرد!! منـیش هـەموویان گومڕا بکـەم جگە لەبەندە ڕاستاڵەکانت، ئەوانەی بەدڵسۆزی بەندایـەتی تـۆ دەکـەنو هیدایـەتت داون، ئەوانـە مـن دەسـەڵاتم بەسـەریاندا نیـەو نایـان وێرمـێ! شـەیتان بـۆ خـۆی زانیویـەتی: کـە فـرتو فێڵـی ئـەو، کـار لـەوان ناکـاو بەنـدە موخلیـصەکانی خـودا بەوەسوەسەی شەیتان هەڵناخەڵەتێن!

ئـەمجار پـەروەردگار هەڕەشـەی خـۆی ڕاگەیانـدو ﴿قَـالَ هَـذَا صِـرَاطٌ عَلَـيَّ مُسْتَقِيمٌ﴾ فەرمووی: ئەمە دابو نەریتی منە، ئەوە ڕێگایەکەو خۆم دامناوە، بڕیارو وادەمە: هەموو ئادەمیزادێك بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداشی دەدەمەوە. چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە! کەس ناتوانێ لەچنگم دەرچێو کەس لەسـزاو تۆڵەم قوتار نابێ! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾الفجر/١٤.

مانای ﴿هَذَا صِرَاطٌ عَلَيَّ مُسْتَقِيمٌ﴾ ئەو ئیخلاصو دڵسۆزییە ڕێگایەکە بـۆ لای من دێ، سەرەدەکێشێ بۆ ڕێزو پاداشی من، یان ئەوە ڕێبازی منە لەبەندایەتیکردندا ڕێگایەکە لەسەر من ڕاستە. یان ئـەو ڕێبـازەی مـن دەیچەسپێنمو جـەختی لەسـەر دەکەمەوە، ڕێبازێکی ڕاستو حەقو پیرۆزە.

ئەمـە ڕەتدانـەوەی قـسەکەی شـەیتانە: کـە وتـی: ﴿لأَقْعُـدَنَّ لَهُـمْ صِـرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ، ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَـمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِـدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ﴾الأعراف/١٦-١٧.

جـا شـەیتان وای گومـان بـرد: کـە بەسـەر هەنـدێ لـەئادەمیزاددا دەسـەڵاتو توانای هەیە، ئەوە بوو گوتی: ﴿لأُزَيِّـنَنَّ لَهُـمْ فِـي الأَرْضِ وَلأُغْـوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِـينَ﴾ ئـیتر پەروەردگار بەدرۆی خستەوەو فەرمووی: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَـنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾ بێگومان ئەتۆ هیچ دەسـەڵاتێکت بەسـەر بەنـدەکانی مـندا نیـە، موخلیص بن یان ناموخلیص بـن، وەلـێ ئەگـەر یـەکێك بەویـستی خـۆی شـوێن تـۆ کەوت ئەوە دەبێتە پێڕی تۆو بەشوێنکەوتووی تـۆ دەژمێـردرێ! دەسـەڵاتت بەسـەر ئەواندا دەبێ، چونکە بۆ خۆیان بەئیختیاری خۆیان ملکەچی تۆ بوونو گوێڕایـەڵی فەرمانو نەهیەکانت دەبن! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَـهُ وَالَّـذِينَ هُـم بِـهِ مُـشْرِكُونَ﴾النحـل(٩٩/١٠٠). کـەوابوو دەسـەڵاتی شـەیتان تـەنیا بەسـەر ئـەو

کەسانەدا هەیە: کە بۆ خۆیان شەیتان دەکەنە گەورەو خۆشەویستی خۆیان! جا ئەوانەی بەئارەزۆی خۆیان شوێن ڕێبازی شەیتان دەکەونو دەبنە تاقمو گرۆی ئیبلیس تۆڵەیان لێدەستێنم ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ باباش بزانن: کە دۆزەخ جێگای حەوانەوەی هەموو ئەوانەیە، هەر کەسێ بەئیختیاری خۆی شوێن شەیتان بکەوێ بەئاگری دۆزەخ سزای دەدەم!!

﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ﴾ دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە، ﴿لِكُلِّ بَابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ﴾ بۆ هەموو دەرگایەکی بەشێکی لەشوێنکەوتوانی شەیتان بۆ دیاری کراوەو قوتار بوونیان نیە دابەشکردنیان بەسەر دەرگاکانیدا بەگوێرەی کردەوەکانیانە. شوێن وجێگاشیان لەناو دۆزەخدا هەر بەگوێرەی کردەوەکانیانە! دەربارەی ڕاڤە کردنی (سبعة أبواب) لێرەدا دوو تەفسیر هەیە:

١- مەبەست بەحەوت دەرگا حەوت قاتو طەبەقە بێ یەك لەسەر یەك، ئەم قاتو طەبەقانە پێیان دەگوترێ (الدركات) وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾النساء/١٤٥. ئەمەش لەبەر ئەوە چونکە کوفرو بێدینی کافرەکان پلە پلەیە دەبێ شوێنی سزادانەکەشیان پلە پلە بێ!

٢- ڕایەکی تر هەیە دەڵێ: مەبەست بە(سبعة أبواب) حەوت بەشە بۆ هەموو بەشێك لەدۆزەخ دەرگای تایبەتی هەیە. ئیبنو جورەیج بەم جۆرە بەشەکانی دۆزەخی پۆلێن کردوون: (جهنم، لظى، الحطمة، السعير، سقر، الجحيم، الهاوية) ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە بەم شێوە بەشەکانی دۆزەخی ڕیز کردوون: (جهنم، السعير، لظى، الحطمة، سقر، الجحيم، الهاوية).

ئیبنو جورەیجو ضەحاك دەڵێن: لێی هەرە ژورووی کە (جهنم)ە بۆ یەکتاپەرستانی تاوانبارە. (السعير) بۆ جولەکەکانە. (الحطمة) شوێنی گاورەکانە.

(لظى) بۆ صابیئەکانە، (سقر) بۆ ئاگرپەرستانە. (الجحیم) شوێنی موشریکەکانە. (هاویة) کە ناخۆشترین شوێنی دۆزەخە بۆ دووڕووەکانە.

لێرەدا تێبینییەك هەیە: دەربارەی ئیستیثناکردنی ئیبلیس لەفریشتە: ئایا شەیتان لەرەگەزی فریشتەیە، یان لەرەگەزێکی ترە؟ بێگومان فریشتە لەنوور دروستکراون‌و شەیتان لەئاگر دروستکراوە، فریشتە بێ فەرمانی خودا ناکەن‌و هەمیشە لەپەرستنی خودادان، شەیتان نافەرمانی خودای کردو یاخی بوو کڕنووشی نەبرد، دەی چۆن ئیستیثنای ئیبلیس لەفریشتەکان کرا؟ کە مادام رەگەزیان یەك نەبێ چۆن ئەو لێیان جەرت دەکرێ؟؟

لەوەڵام دا دەڵێین: ئیستیثناکە لەسەر قاعیدەی خۆی نیە، واتە: موستەثنا بەشێك نیە لەموستەثنامینهو!

ئەمجار کە شەیتان لەپێڕی فریشتە نیە، ئەدی چۆن فەرمان بەفریشتەکان شەیتانیشی گرتەوە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: فەرمان بەشەیتان بۆ کڕنووش بردن بەفەرمانێکی تایبەتی بووە، لەسورەتی (الأعراف)دا بەروونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، کە فەرمانی ئاڕاستە کراوە، دەفەرموێ: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلاَّ تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ؟﴾ ئەم ئایەتەی سورەتی (الأعراف) دەق ئەوە دەگەیەنێ کە فەرمانی تایبەتی ئاڕاستەی شەیتان کراوە، مەرجیش نیە ئەم فەرمانەی ئاڕاستەی شەیتان کراوە هەمان فەرمان بێ: کە ئاڕاستەی فریشتەکان کراوە. وێ دەچێ فەرمانەکە لەتەك فریشتەکان دا ئاڕاستەی ئەویش کرابێ چونکە ئەو کاتە لەناو فریشتەکاندا بووە. وێ دەچێ بەتەنیا فەرمانی پێکرابێ‌و لەبەر بێ نرخی‌و بێ رێزی ناو نەبراوە.

## پاداشی خواپەرستانو خرپاریزان لەرۆژی قیامەت

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾

ئەعلەبی لەسەلمانی فارسییەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: سەلمان کە ئایەتی ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ی گوێ لێبوو لەترسان هەراسانی لێ هەڵگیرا هەلات سێ رۆژ لەترسان وەکوو شێتو هاری لێ هاتبوو، هێنایانە لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد : فەرمووی چیتە؟ بۆ وات لێهاتووە ؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایەتی ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾م بیست، سوێندم بەو کەسەی تۆی رەوانە کردوە بەحەقو راستی لەترساندا پەردەی دڵم پسا، ئیتر پەروەردگار ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ ناردە خواری!

ئیبنو ئەبی حاتەم لەعەلی کوڕی حوسەینەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: ئایەتی ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ﴾ دەربارەی ئەبو بەکرو عومەر هاتۆتە خوارێ، وترا: ئەو غیلو حیقدە چیە؟ وتی غیلو حیقدی سەردەمی نەزانی یە، لەسەردەمی نەزانیدا دوژمنایەتی لەنێوان هۆزی تەمیمو هۆزی عەدیو هۆزی قورەیشدا هەبووە!

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە، لەم رووەوەیە: پەروەردگار دوای ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا حاڵو وەزعی بەدبەختەکانی راگەیاند، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا حاڵو وەزعی بەختەوەرەکانی رانواند؛ پێمان دەڵێ: ئەوانەی بەهەشتینو تەقواکارو موخلیص بوونو شەیتان زەفەری پێ نەبردوون!

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ بێگومان ئەو خودا پەرستانەی خۆیان لەسزای خودا دەپارێزنو توخن تاوان ناکەونو ملکەچی فەرمانو نەهیەکانی پەروەردگارن، ختوکەو وەسوەسەی شەیتان کاریان تێناکاو بەوەسوەسەی ئەو هەڵناخەڵەتێن! ئەوانە دەخرێنە ناو بەهەشتەوە؛ ناو باغوبێستانی خاوەن بەرو میوەی جۆراو جۆرو سێبەری خۆشو هەواساز، لەم لاو لەو لایانەوە چوار کانیاوو سەرچاوە هەڵدەقوڵێن. سەرچاوەی ئاوو شیرو مەی سەرخۆشنەکەرو هەنگوینی صافو پاڵفتە، ئەم چوار سەرچاوە تایبەتن بەتەقواکارانەوە کەسیان لەگەڵ کەسیان کێشەو نیزاعیان لەسەر ناکەن! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاء حَمِيماً فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ﴾ محمد/١٥.

پێیان دەگوترێ، خودا پێتان دەفەرموێ؛ فریشتە پێتان دەڵێن: ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ آمِنِينَ﴾ بچنە ناو ئەو باغو سەیرانگایانەوە بەلەشی ساغو تەندروستی تەواوەوە، سەلامەتان لێبێ، دڵنیا بن لەهەموو ترسو خۆفێك، هەرگیز مەترسن لەوەی ئەم خۆشییەتان کۆتایی بێو بەسەر بچێ.

﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَاناً عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾ هەرچی رقو کینەو دژایەتی هەیە لەناو دڵیان دەری دەهێنین دڵو دەروونیان لەحیقدو حەسوودی پاك دەکەینەوە، هەموویان دەبنە برای یەکتریو خۆشەویستیەکی بێ

وێنە لەناویاندا دروست دەکەین، دڵیان لەئاست یەکتری صافو بێگەرد دەبێ. لەسەر کورسیو بالیف دادەنیشن رودەکەنە یەکتریو هەریەکەیان تەماشای نێوچاوانی ئەوی تر دەکا.

مەبەست ئەوەیە: خودا دڵیان پاك دەکاتەوە گرێو گۆڵی دونیایی تێدا ناهێڵێ، حەسوودی نامێنێ، بوغضاندن بەسەردەچێ غەیبەتو فیتنەیی باویان نامێنێ، کێشەو نیزاع نیە لەگۆڕێ، خودا خۆشەویستی دەخاتە دڵیانەوەو هیچ تایبەتمەندییەکی مادەئامێز نامێنێ، هەموویان بەمردن کۆتاییان پێ دێ.

لەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە ئەبو سەعیدی خودری ریوایەتی کردوە؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يخلص المؤمنون من النار فيحبسون على قنطرة بين الجنة والنار، فيقتص لبعضهم من بعض مظالم كانت بينهم في الدنيا، حتى اذا هذبوا ونقوا، أذن لهم في دخول الجنة) موسوڵمانە تاونبارەکان لەدۆزەخ رزگاریان دەبێ، ئەمجار لەسەر قەنطەرەیەکی نێوان بەهەشتو دۆزەخ رادەگیرێن لەهەندێ کەس تۆڵەی بڕێ ستەمکاری دونیا بۆ هەندێکیان وەردەگیرێتەوە هەتا پاکیان دەکاتەوەو غەلو غەشیان تێدا نامێنێ، ئەمجار رێگایان پێ دەدا بۆ چونە ناو بەهەشت.

﴿لا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ﴾ لەو باغو سەیرانگایانەدا هیچ جۆرە نارەحەتیو ناخۆشییەکیان نایەتە پێش، ئەزیەتیان تووش نابێ، چونکە پێویستیان بەهەوڵو تێکۆشان نیە بۆ وەدەستهێنانی داخوازییەکانیان هەرچی ئارەزۆی بکەن بەبێ ماندوبوون بۆیان دەستەبەر دەبێ!

لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرموودەیەك هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ان الله امرني أن، أبشر خديجة ببيت في الجنة من قصب، لاصخب فيه

ولا نصب) پەروەردگار فەرمانی پێ کردم: کە مزگێنی بدەم بەخەدیجە بەخانوێك لەبەهەشت دا لەدارقامیش دروست کراوە هیچ ناڕەحەتیو ناخۆشی تێدا نابینێ!

﴿وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ﴾ ئەو خودا پێداوانە لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە بۆ هەتا هەتایێ لێی دەرناکرێنو لێی ناگوێزنەوە.

لەفەرموودەی چەسپاوو صەحیح‌دا هاتووە دەفەرموێ: کە بەهەشتیەکان چوونە ناو بەهەشتەوە پێیان دەگوترێ: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! ئێوە لێرەدا بەلەشساغی ژیان بەسەر دەبەن و نەخۆش ناکەون، دەژینو نامرن، گەنجنو پیر نابن، لەم بەهەشتە رازاوەو خۆشە دەمێننەوە بەخۆشیو شادی ناخۆشی تێدا نابینن!

## بەکورتی:

بنەمای خۆشیو پاداشو سودمەندی سێ شتە:

١- دڵنیاییو رێز لێگرتن، ئەوە ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلامٍ آمِنِينَ﴾ ئاماژە بەوە دەکا: کە ئەومیان بۆ دابین دەکرێ.

٢- خۆشی بێ ئەستەنگو زیان، بەم جۆرە گوزەرانەکەیان حیقدو حەسەدی تێدا نەبێ، ماندوبونو نارەحەتی پێوە نەبێ ئەمەش بەنەصصی ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَاناً﴾و ﴿لا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ﴾ بۆیان دابین کراوە.

٣- نەبڕانەوەی خۆشیو کامەرانیەکەیان ئەمەش بەدەقی ﴿وماهم منها بمخرجين﴾ بۆیان دابین کراوە.

**تێبینی:**

ئایەتەکان بەروونی ئەم خاڵانەیان لەخۆ گرتووە:

١- پاداشی تەقواکاران؛ خۆپارێزان، ئەوانەی خۆیان لەشیرك‌و فاحیشە پاراستووە باغ‌و باغات و چوار کانی‌و سەرچاوەیان پێ دەدرێ، چوار جۆگا: ئاو مەی‌و شیرو هەنگوین. پێیان دەگوترێ بچنە ناو بەهەشتەوە بەسەلامەتی‌و خۆشی! قسەی حەق‌و راست و قسەی جەماوەری زانایانی ئیسلام‌و جەماوەری هاوەڵان‌و تابیعینە: کە دەفەرموون: مەبەست بە(المتقین) ئەو موسوڵمانانەیە: کە خۆیان لەهاوەڵدانان بۆ خوداو کوفر پاراستووە.

موعتەزیلەکان دەڵێن: (المتقین) ئەو کەسانەن: کە خۆیان لەهەموو تاوانێك پاراستووە.

٢- دانیشتوانی بەهەشت هیچ ناخۆشی‌و زیانێکیان توش نایە ئەوان لەهەموو نەخۆشییەکی گیانی وەکوو حیقدو رق‌و کینە بەدوورن، لەرووی جەستەییشەوە هیچ ماندو بوون‌و ناخۆشی‌و ئازارێکیان نیە.

٣- نازو نیعمەتی بەهەشت بەردەوام‌و هەمیشەییە برانەوەی نیەو خەڵکەکەشی نەمرن‌و لەناوچونیان نیە!

## لێخۆشبوونی خوداو سزای خودا

﴿ ۞ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾

طەبەرانی لەعەبدولای کوڕی زوبەیرەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای هەندێ لەهاوەڵانی دا تێپەڕی پێدەکەنین، فەرمووی: (أتضحكون، وذكر الجنة والنار بين أيدكم) ئیتر ئەم ئایەتە: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمُ﴾ هاتە خوارێ. ریوایەتی تریش لەم بارەوە هەن. نەمانەویست بیانهێنین!

جا دوا ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا حاڵو وەزعی تەقواکارانی باس کرد ئەمجار حاڵو وەزعی تاوانبارانیشی دیاری کرد، سوننەتو دابو نەرێتی خۆی لەبوونەوەردا رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ ئەی موحەممەد! هەواڵ بەبەندەکانم بدە، پێیان بڵێ: من خاوەنی لێخۆشبوونو رەحمەتی بەرفراوانم، هەرکەسێ بمەوێ لێی خۆش ببم لێی خۆش دەبم کەس نیە بتوانی بەرهەڵستیم بکا. سۆزو بەزەییم زۆرە، بەشی هەموویان دەکاو زیاتریش! لەهەمان کاتدا. ﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمُ﴾ سزاو تۆڵەم ئەو سزا بەئێشەیە: کە چەند جار بۆتان باس کراوە، بترسن لەسزاو تۆڵەم!

خەبەریان بدەرێ کە تۆڵەو عەزابی من بۆ ئەوانەی سورن لەسەر کوفرو تاونکاریو تۆبەناکەنو ناگەڕێنەوە، عەزابێکی بەئێشو کوشندەیە بەو سزایە تۆڵەیان لێدەستێنم، با خۆیانی لێبپارێزن!

ئەم ئایەتە وەکوو زۆر ئایەتی تر موژدەو هەڕەشەیە، هەڵنانو ترساندنە بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان هەمیشە لەحاڵەتی خۆفو ورەجادا بن، هیوایان بەرەحمەتی خودابێو لەعەزابیشی بترسن!

سەعیدی کوڕی مونصوورو عەبدی کوڕی حەمید لەقەتادەوە دەگێڕنەوە: دەڵێ: پێمان گەییشتوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لو يعلم العبد قدر عفو الله لما تورع من حرام، ولو يعلم العبد قدر عذاب الله، لنجع نفسه) ئەگر بەندە

بیزانیایە ئەندازەی عەفوی خودا چەند زۆرە، هەرگیز خۆی لەحەرام نەدەپاراست، خۆ ئەگەر بیزانیایە ئەندازەی عەزابی خودا چەند زۆرە بەخوداپەرستی خۆی بەهیلاك دەبردا

هەردوو پیری فەرمووده بوخاری‌و موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان الله خلق الرحمة يوم خلقها مئة رحمة، فأمسك عنده تسعة وتسعين رحمة، وأرسل في خلقه كلهم رحمة واحدة، فلو يعلم الكافر كل الذي عنده من رحمة لم ييأس من الرحمة، ولو يعلم المؤمن بكل الذي عند الله تعالى من العذاب، لم يأمن من النار). پەروەردگار لەو کاتەدا کە سۆزو بەزەیی دروست کرد سەت بەشی دروست کرد، نەوەدو نۆی لای خۆی هێشتەوە، تەنیا بەشێکی بەناو مەخلووقات دا بلاّو کردەوە، ئەگەر کافر پەی بەهەموو ئەو رەحمەتەی لای خودا هەیە ببردایە، هەرگیز لەرەحمەتی خودا ناهومێد نەدەبوو! خۆ ئەگەر موسوڵمانیش بیزانیایە خودا چەندەی عەزاب لایە، هەرگیز لەدۆزەخ ئەمین نەدەبوو!

ئیمام موسلیم بەم شێوە ریوایەتەکە دەهێنێ: (لو يعلم المؤمن ما عند الله من العقوبة، ماطمع بجنته احد، ولو يعلم الكافر ما عند الله من الرحمة، ماقنط من رحمته احد).

## چیرۆکی میوانەکانی ئیبراهیم‌و هەواڵدانیان بەلەناوچوونی گەلی لوط

﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ

بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرۡتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلۡكِبَرُ
فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُواْ بَشَّرۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ
ٱلۡقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقۡنَطُ مِن رَّحۡمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا
ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓاْ
إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا
لَمُنَجُّوهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ قَدَّرۡنَآ إِنَّهَا لَمِنَ
ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ
إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُواْ بَلۡ جِئۡنَٰكَ بِمَا كَانُواْ فِيهِ
يَمۡتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسۡرِ
بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَٱتَّبِعۡ أَدۡبَٰرَهُمۡ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٞ
وَٱمۡضُواْ حَيۡثُ تُؤۡمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيۡنَآ إِلَيۡهِ ذَٰلِكَ ٱلۡأَمۡرَ أَنَّ
دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقۡطُوعٞ مُّصۡبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهۡلُ ٱلۡمَدِينَةِ

يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِىٓ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی تاك و تـەنهایی خـۆی رانوانـدن، حاڵەتـەكانی قیامـەتی باسـكردن، حـاڵ و وەزعـی بەدبەختـەكان و بەختـەوەرەكانی رونكـردەوە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا چیرۆكی پێغەمبەران دەگێڕێتەوە، بۆ ئـەوەی بیستنی ئـەو چـیرۆكانە پـاڵ پێوەنـەرو هەڵنـەربێ بـۆ بەندایـەتیكردنی پـەروەردگارو لـەناكاما بەمرازگەییـشتن؛ هـەروا بـۆ ئـەوەی بیـسەران خۆیـان بپـارێزن لەبەدبـەختی دوارۆژیـان و نـەبن بەسـوتەمەنی دۆزەخ. گێڕانـەوەی ئـەم جـۆرە چـیرۆكانە شیكردنەوەی وادەو هەڕەشەكانی پەروەردگارە لەبەندەكانی.

جـا سـەرەتا چـیرۆكی حـەزرەتی ئیـبراهیم دەگێڕێتـەوە چـونكە مـوژدەی بەخشینی كوڕێكی زانای تێدایە بۆ ئیبراهیم، ئـەمجار باسـی پەهیلاكچونی قـەومی

لوط دەکا چونکە تـاوانێکی زۆرگـەورەو بـێ رەوشـتیان ئـەنجام دەداو پـێش ئـەوان کەسی تر پێکێشی ئەو کارەی نەکردبوو!

دەفـەرموێ: ﴿وَنَبِّئْهُمْ عَـنْ ضَـيْفِ إِبْـرَاهِيمَ﴾ ئـەی موحەممـەد! هـەواڵ بـدەرە گەلەکـەت دەربـارەی میوانــە بــەرێزەکانی ئیــبراهیم، کــە بریتــی بــوون لەچــەند فریشتەیەك خـودا نـاردبوونی بۆ لـەناوبردنی گـەلی لـوط ﴿إِذْ دَخَلُـوا عَلَيْـهِ فَقَـالُوا: سَلاماً﴾ کاتێك هاتنە لای ئیبراهیمو سلاویان لێکرد ، وتیان: سلاوت لێبـێو دووربـی لەبەلاو ناخۆشی، لەهەموو گیرو گرفتێك پارێزراو بێ!

﴿قَالَ إِنَّا مِنْكُمْ وَجِلُونَ﴾ ئیبراهیم بەمیوانەکانی گوت ئێمـە لـەئێوە دەترسـین، چونکە بەبێ ئیزن هاتبوونە ژوری! یان کاتێـك ئـەوەی گـوت: کـە بینـی دەسـت بـۆ خواردنەکـە نابـەن، ئیـبراهیم گۆلکەڵەیـەکی بـۆ سـوور کردبوونـەوەو خـستبویە بـەردەمیان کەچـی ئـەوان دەسـتیان بـۆ نـەبرد، ئەمـەش نیـشانەی ئـەوە بـوو کـە خەیاڵیان خراپەو بەتەما شتێکن!

﴿قَالُوا لا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلامٍ عَلِـيمٍ﴾ وتیـان: هـیچ مەترسـە، ئێمـە هـاتوین مزگێنیـت پـێ بـدەین بـەکورێکی زانـاو زیـرەكو تێگەییـشتوو لـەئاینی خـودا: کـە لــەئاکاما دەکرێتــە پێغەمبــەرو فروســتادەی خــودا ئــەویش ئیــسحاقە. وەکــوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيّاً مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾الصافات/١١٢.

﴿قَـالَ أَبَـشَّرْتُمُونِي عَلَـى أَنْ مَـسَّنِي الْكِبَـرُ فَـبِمَ تُبَـشِّرُونَ﴾ حـەزرەتی ئیـبراهیم بەسەرسامییەوە وتی: ئایا مزگێنی چیم پێ دەدەن؟ موژدەی ئـەوەم پـێ دەدەن: کـە کـورم دەبـێ لـەکاتێکدا خـۆمو خێـزانم پـیرو کەنـەفتینو لـەوە دەرچـووین تـازە منداڵمان ببێ. مزگێنی شتێکم دەدەنێ: کە بەخەیاڵ دا نایە! ئێوە چۆن مـوژدەی وا سەیرو دوور لەواقیعم پێ دەدەن؟!

فریشتەکان وەڵامیان دایەوە: ﴿قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلا تَكُنْ مِنَ الْقَانِطِينَ﴾ وتیان: ئێمە موژدەمان پێ داوی بەشتێکی حەق‌و واقیع‌و چەسپاو، ئەوەی مزگێنیمان پێ دای ویستی خودایە بەڵێنی خودایەو پاشگەزبوونەوەی نیە، ئەو کەسەی ئادەمی لەگڵ دروستکرد بەبێ ئەوەی باوك‌و دایکی هەبن دەتوانێ هەموو کارێك بکا! ئەتۆ ئەی ئیبراهیم! لەپێڕی ئەوانە مەبە: کە لەفەضل‌و رەحمەتی خودا ناهومێد دەبن، بەڵکوو تۆ ئەی ئیبراهیم! مزگێنی یەکە وەربگرەو بەشتێکی حەقی بزانەو چاوەڕوانی ئەوەبە ئەو کوڕەت ببێ!

هەڵبەتە حەزرەتی ئیبراهیم ئەم نیعمەتەی هێندە بەلاوە گەورە بوو بۆیە ئەم پرسیارە تەعەجوب ئامێزەی کرد، نەك خوا نەخواستە شتی لەو جۆرەی بۆ قودرەتی خودا بەدوور زانیبێ، حەزرەتی ئیبراهیم زۆر لەوە خوداناستر بوو شتی وای بەخەیاڵ دابێ!!

ئیبراهیم وەڵامی دانەوەو ﴿قَالَ وَمَنْ يَقْنَطُ مِنْ رَحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّالُّونَ﴾ وتی: کێ لەرەحمەتی خودا نائومێد دەبێ؟ کەس لەرەحمەتی خودا ناهومێد نابێ جگە لەوانەی رێبازی راست‌و حەقیان گوم کردوە، ئەمن یەقینی تەواوم بەوە هەیە هەر شتێك خودا بیەوێ بێتە دی دێتە دی، هیچ شتێك لەخودا یاخی نابێ، چی بوێ‌و چۆنی بوێ‌و کەی بیەوێ ئاوا دێتە دی!

ئەمجار دوا ئەوەی ئیبراهیم لەهاتنە دی ئەم موژدەیە دڵنیا بوو زانی مزگێنییەکە لەخوداوەیەو ئەوانە فریشتەن‌و ترس‌و خۆفی ئەوەی لێ رەوییەوە: کە پیاو خراپ بن، پرسیاری ئەوەی لێکردن هۆی هاتنەکەیان بەم شێوە چیە ﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ؟﴾ وتی: ئەو کارە گرنگەی ئێوە بۆی هاتوون جگە لەم مزگێنییە چیە؟ وا دیارە حەزرەتی ئیبراهیم لەناوەندی گفت‌و گۆکەداو بەگوێرەی قەرینەی حاڵ‌و وەزعی فریشتەکان بۆی دەرکەوت ئەو کارەی ئەوانی بۆ نێردراوە جگە لەموژدە پێدانەکە شتێکی ترەو کارە سەرەکییەکەیان غەیری مزگێنییەکەیە،

چونکە عادەتەن بۆ مزگێنی پێدان یەك فریشتە بەسە، ئەمانە ژمارەیەك بوون. وەکوو چۆن بۆ مژدە پێدانی حەزرەتی زەکەریاو خاتو مەریەم موژدەدەرەکە یەك فریشتە بووە.

فریشتەکان وەڵامیان دایەوە ﴿قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ﴾ وتیان: ئێمە نێردراوین بۆ لای گەلو نەتەوەیەکی تاوانکار: کە گەلی لوطە، کە هەرچی تاوانە ئەنجامی دەدەن، لەهەموو تاوانێکیان تاوانتر کاری نێربازییە: کە بەتەواوی لەناویاندا تەشەنەی کردوە، وازیان لەمێینە هێناوە سواری نێرینەکانیان دەبن، هاتووین لەناویان بەرین‌و بیانفەتێنین!

﴿إِلاَّ آلَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ جگە لەلوطو خاوو خێزانی ئێمە ئەوان رزگار دەکەین هەموانیان، ئەوان لەناو نابەین ﴿إِلاَّ امْرَأَتَهُ قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنْ الْغَابِرِينَ﴾ جگە لەژنەکەی لوط، ئەوە خودا بڕیاری داوە لەگەڵ کافرەکان دەمێنێتەوەو لەگەڵ ئەوان لەناو دەبرێ، ئەورزگاربوون نایگرێتەوە، چونکە ئەو یارمەتی کافرەکانی دەدا بۆ ئەنجامدانی کردەوە خراپەکانیان!

تێبینی ئەوە دەکرێ: فریشتەکان فیعلەکەیان وەپاڵ خۆیان دا وتیان: (قدرنا) هەرچەندە لەحەقیقەتدا فیعلەکە هی خودایە، ئەمەش لەم روەوەیە: کە فریشتەکان خۆیان بەنزیکی خوداو مەئمووری ئەو حیساب کردوە، وەکوو چۆن بیلاتەشبیه پیاوانی تایبەتی پاشا دەڵێن: ئەوەمان کردو ئەوەمان بڕیار داو فلان فەرمانمان دەرکرد! لەراستیشدا ئەوەی فەرمانەکە دەکا پاشا خۆیەتی نەك ئەوان!

ئەمجار چیرۆکی لەناوبردن‌و وێرانکردنەکە دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَ آلَ لُوطٍ الْمُرْسَلُونَ﴾ واتە: کاتێك فریشتەکان لای ئیبراهیم ئیشیان تەواو بوو، مزگێنی کوڕیان پێ دا، هەواڵی ئەوەشیان پێدا کە ئەرکی لەناوبردنی گەلی لوطیان پێ سپێردراوە، ئەمجار لەشێوەی کوڕی گەنجی تازە پێگەیشتودا رۆیشتن

بۆ شاری (سدوم) کە نیشتمانی گەلی لوط بوو! لوطو گەلەکەی نەیانزانی: کە ئەوانە فریشتەی خودان، هەروەکوو چۆن لەسەرەتاوە حەزرەتی ئیبراهیمیش نەیناسین. جا کە چوونە ماڵی حەزرەتی لوط، ﴿قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ﴾ لوط پێی گوتن: بەراستی ئێوە کەسانێکی نەناسراون بۆ من، ناتانناسم، دەترسم تووشی گێرەوەژێکم بکەن، ئێوە لەچ گەلو هۆزێکنو ئێوە کێن؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً﴾هود/٧٧.

هەندێك دەڵێن: شێوەکەیانی پێ سەیر بوو هەموویان گەنجو تازەپێگەیشتوو بوونو مویان لێنەهاتبوو، ترسا گەلەکەی پێیان بزانو بۆیان بێن!

فریشتەکان وەڵامی حەزرەتی لوطیان دایەوە ﴿قَالُوا بَلْ جِئْنَاكَ بِمَا كَانُوا فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ وتیان: ئێمە هاتووین تۆ دڵخۆش بکەین، هاتووین ئەو عەزابو لەناوبردنەی گەلەکەت گومانیان دەربارە هەیە بەسەریاندا بدەینو لەناویان بەرین، ئەو عەزابەی ئەوان بڕوایان پێ نەدەکرد پێیان بچێژین. ﴿وَأَتَيْنَاكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ ئێمە بەفەرمانێکی حەقو بۆ کارێکی حەق هاتووین بۆ لای تۆ: ئەویش لەنابردنی گەلە ستەمکارە بێ رەوشتەکەتە، دڵنیابە ئێمە راستگۆین لەوەی پێمان راگەیاندی، گومانت نەبێ ئەوان لەناو دەبەینو ئەتۆو شوێنکەوتوانت رزگار دەکەین!

ئەمجار دەستیان کرد بەئەنجامدانی رزگار کردنی لوطو شوێنکەوتوانی، ئەوەبوو پێش هاتنی عەزابەکە وتیان: ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ﴾ کە بەشێکی شەو رابورد پێش ئەوەی شەو کۆتایی پێ بێ، بەخۆتو خاوو خێزانتەوە (جگە لەژنەکەت) لەشار دەرچنو بڕۆن، ﴿وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ﴾ بۆخۆت لەدوایانەوە بڕۆ بۆ ئەوەی دەنەدەنەیان بدەیو بەپەلە بیانڕۆێنیو چاوت لێیان بێ، نەهێڵی کەسیان

دوا بکەوێ، نەوەکوو عەزاب بیگرێتەوە، ﴿وَلا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ﴾ کە گوێتان لەگرمەی عەزاب بوو کەس لەئێوە ئاوڕ بۆ پاشەوە نەداتەوە، نەوەکوو عەزابەکە ببینێ‌و دڵی بۆ قەومەکەی بسوتێ و بەزەیی پێدا بێنەوە، هەروەها بۆ ئەوەی چاوی لەدوانەبن بۆ نیشتمانەکەی‌و بەعەزم‌و جەزمەوە بەدڵنیایی‌و رەزامەندی خۆی بۆ نیشتمانی تازەی هەنگاو هەڵهێنێ.

ئەمجار جەختی لەسەر جڵەوگیرییەکە کردەوەو فەرمووی: ﴿وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾ بڕۆن بۆ ئەو شوێنەی خودا فەرمانتان پێ دەکا، بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوەو خەمی نیشتمان جێ هێشتنتان بێ! بڕۆن بۆ وڵاتی شام وەکوو ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: یان بۆ هەر شوێنێك جوبرائیل فەرمانتان پێ دەکا.

ئەمجار هۆی فەرمان بەپەلە کردنەکە لەچوونە دەرەوە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَا إِلَيْهِ ذَلِكَ الأَمْرَ﴾ نیگامان بۆ لوط کرد کە لەناوبردنی ئەو ستەمکارانە بڕیاری لەسەردراوەو بڕاوەتەوە، پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، کاری ئەوان تەواوەو حیسابیان بیتی بووە. ئەمجار (الأمر)ەکە شی دەکاتەوە واتە: ئەمرە ئاماژە پێکراوەکە رون دەکاتەوە چیە دەفەرموێ: ﴿أَنَّ دَابِرَ هَؤُلاءِ مَقْطُوعٌ مُصْبِحِينَ﴾ ئەوەل‌و ئاخری ئەو نەتەوە ستەمکارە لەبێخ دەردێنین، لەکاتی بەیانیدا ئاسەواریان دەبڕێنەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾هود/٨١.

ئەمجار پەروەردگار لەناوەندی چیرۆکەکەدا هەڵس‌و کەوتی ناشیرینی قەومی لووط دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ دانیشتوانی شاری(سەدوم) کاتێ بیستیان ماڵی حەزرەتی لووط چەند کوڕێکی تازەپێگەیشتوویان میوانن، بەهەڵەداوان‌و بەکەیفخۆشی‌و تەڕدەماخییەوە بەرەو

ماڵی حەزرەتی لووط رۆییشتن بۆ ئەوەی کاری ناشیرین‌و بەدرەوشتییان لەگەڵ بکەن.

سەیر بکە چەند بێ ئەخلاق‌و نەفس نزم بوون، پێچەوانەی هەموو داب‌و نەریتێك دەجولانەوە، لەجیاتی ئەوەی ریزی میوان‌و مامەڵەی جوان لەگەڵ غەریب‌و نەناسیاودا بکەن، دەیانەویست بەو شێوە ناشیرینە هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ بکەن!!

ریوایەتکراوە؛ دەڵێن: ژنەکەی لووط هەواڵی بەخەڵکەکە دا وتی: وا لەماڵی ئێمە سێ کوڕی گەنجی تازە رسکاوی لێن‌و تا بڵێی شۆخ‌و شەنگ‌و جوانن، تا ئێستا ئێمە کوڕی ئاوا جوانمان نەدیون!

جا کە راجمین‌و لەبەر دەرگای ماڵی لووط ئاپورەیان بەست، حەزرەتی لووط ویستی بەقسەو وتووێژ بڵاوەیان پێ بکا ﴿قَالَ إِنَّ هَؤُلاءِ ضَيْفِي فَلا تَفْضَحُونِ﴾ وتی: پیاوی خاس بن، تۆزێك پیاوەتی‌و موروومەتتان تێدا بێ، ئەوانە میوانی منن‌و شتێکی وایان لەگەڵدا مەکەن حەیام بچێ، هەر کارو هەڵوێستێکی ناشیرینیان لەگەڵدا بکەن سوکایەتیکردنە بەمن!

ئەمجار جەختی لەسەر جڵەوگیرییەکەی کردەوە فەرمووی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلا تُخْزُونِ﴾ لەخودا بترسن ریسوام مەکەن‌و ناموسم مەشکێنن بەوەی خراپە لەگەڵ میوانەکانمدا بکەن، وەلامیان دایەوە: ﴿قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنْ الْعَالَمِينَ﴾ وتیان: ئەوە پیمان نەگوتی جارێکی تر بەهیچ جۆرێ جڵەوگیری ئەو کارەمان لێ مەکە، هەر کاتێ ویستمان ئەو کارە لەگەڵ هەر کەسێك بکەین تۆ دەمی خۆت مەهێنە پێشەوەو خۆتمان لێمەکەرە ریش سپی، دیارە سەرچاوەی ئەم جۆرە جڵەوگیریانە ئەتۆی؟!

ئەمجار حەزرەتی لووط وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ هَـؤُلاءِ بَنَاتِي إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ﴾ فەرمووی: ئەوە ئافرەت هەن مارەیان بکەن‌و خودا بۆی حەڵاڵکردون، واز لەنێربازی بێنن، ئەگەر ئێوە بەگوێی من دەکەن.

مەبەست بە(بناتي) ئافرەتی گەلەکەیەتی چونکە پێغەمبەری هەر گەل‌و نەتەوەیەك وەکوو باوك وایە بۆ نەتەوەکەی. وەکوو پەروەردگار دەرحەق بەپێغەمبەری ئیسلام دەفەرمویٚ: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾الأحزاب/٦.

هەندێکیش دەڵێن: مەبەست بە(بناتي) کچەکانیەتی واتە: ئەوەتا من کچم هەن مارەیان بکەن!

ئەم قسەو باسانە رویان دا ئەوان بیٚ ئاگا بوون لەوەی چ عەزابێك بۆیان لەکەمین دایەو نازانن بەیانی چییان بەسەر دیٚ. بۆیە پەروەردگار بەپێغەمبەری خوٚی (محمد) دەفەرمویٚ: یان فریشتەکان بەلووط دەڵێن: ﴿لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ سوێند بەتەمەنی تۆ ئەوانە لەبیٚ ئاگایی دان‌و نازانن بەیانی چییان بەسەردیٚ.

جا ئەگەر راناوی (ك) لە(لعمرك)دا مەبەست پێغەمبەری ئیسلام بیٚ ئەوکاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبیٚ: سوێند بەتەمەنی تۆ ئەی موحەممەد! ئەو موشریکانەی قورەیش لەگومڕایی‌و سەرلیٚ شێواوی دان‌و گویٚ بۆ ئامۆژگاری تۆ ناگرن، رێبازی حەق‌و ناراست لێك جیا ناکەنەوە، ئەو هەموو چیرۆك‌و سەرگورشتانەیان بۆ دەگێڕییەوە پەند ئامێز نابن!

ئەگەر خیطابەکە ئاڕاستەی لووط کرابیٚ، ئەو کاتە قسەکە هی فریشتەکانە‌و بەلووط دەڵێن: سوێند بەتەمەنی تۆ ئەی لووط! ئەو کافرانەی گەلەکەت

لەگومڕاییو سەر لێشێواوی دان، چییان پێ بلێی بەگوێیانـدا ناچێو پەنـد ئـامێز نابن! فەرقی چاكو خراپ ناكەن سوودو زیانی خۆیان نازانن!

ئیبنـو عـەبباس ڕای وایـە: كـە خیطـابەكـە بـۆ پێغەمبـەر بـێ ﷺ دەڵـێ پەروەردگار كەسی دروست نەكردوە لەموحەممەد ڕێزدار تـر، ئـەم بیـستووە خـودا جگە لەموحەممەد سوێندی بەژیانی كەس خواردبێ.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی گەلی لووط باس دەكاو دەفـەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ﴾ لەكاتی هەتاوكەوتنـدا گرمـەو نـەڕەی فریـشتە لێـی دان، عـەزابی چاوەڕوان كـراوو هەڕەشـە پـێ لێكراویـان بـۆ هـات، سـەرەتای هـاتنی عەزابەكـەیان لەكاتی بەرەبەیانـدا بـوو تـا هـەتاو كـەوت، بۆیـە یەكـەمجار فـەرمووی: (مـصبحين) دوایی فـەرمووی: (مـشرقين) چۆنیـەتی لـەناوبردنو عەزابەكـەیان بـەم جـۆرە بـوو ﴿فَجَعَلْنَـا عَالِيَهَـا سَـافِلَهَا﴾ بـەخۆیانو خـانوو باڵەخانـەو زەویو دارو بەردیانـەوە، بەشارو گوندو مڵكوماڵیانەوە، هەموویمان لەزەوی پچڕاندو بـەرزمان كـردەوە بـۆ ئاسمـان، ئـەمجار هـەڵمان گێڕایـەوەو لەحـەواڕا بـەزەویمان كێـشانەوە هـەپروون بەهەپروون بوون، ناداریان بەسەر پاداریانەوە نـەما! ﴿وَأَمْطَرْنَـا عَلَـيْهِمْ حِجَـارَةً مِـنْ سِجِّيلٍ﴾ ئەمجار بەبەردی سوركراوە (بـەردە سـواڵەت) بـەردە بارانمـان كـردن، واتـە: بەسێ جۆر عەزاب سزای دان:

١- گرمەو ناڵەو نەڕەیەكی وا كە هەموویان زەندەقیان چوو.

٢- خاكو نیشتمانی ژێرەو ژەبەركردن بەهەموو شتێكیانەوە.

٣- بەردەبارانی كردن بەبەردی سوركراوە.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ بێگومان لەورووداوو كارەساتانەی بەسەر گەلی لـووطمـان هێنـا، پەنـدو ئامۆژگـاری هەیـە بـۆ كەسـانێك تێبفكـرن، لـەرووداوەكان، وردببنەوە، وردبینو خاوەن فیراسەت بن.

ئـەوەی کـە بەسـەر زێـدو نیـشتمانی گـەلی لـووط هـات جۆرێـك بـووە لەبوومەلەرزەو بۆرکانو زەوی ڕۆچونو بەردبارین، تەنانەت دەگوترێ: دەریاچـەی لـووط دوای ئـەو ڕرووداوە: واتـە: روداوی ژێـرو زەبـەر کردنـی شـاری عـەموورەو سەدومو چاڵبوونی شوێنەکەیان دورست بووە، کە شوێنەکەیان چاڵ بوو ئەمجار پـڕ بوو لەئاوو بوو بەدەریاچە! ئەمجار پەروەردگار سەرنجی دانیشتوانی شاری مەککەو هاوڕکێفـەکانیان رادەکێـشێ بـۆ ئـەوەی پەنـد وەربگـرنو تـەمێ خـواردو بـبن دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ﴾ بێگومان شـاری (سـدوم) کـە ئـاوا وێـران بـوو ئـەو عەزابەی تووش هات، لەسەر ڕێگەیەکی ئاشکرایە، هەر کەسێ بەو دەفـەرەدا گوزەر بکا شوێنەوارەکەی دەبینێ، تا ئێستاش شوێنەوارەکەی ماوە، کاروانی ئێوە کە دەچێ بۆ شام لەسـەر ڕێگایانـەو دەیبینـن. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ، وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾الصافات/١٣٧-١٣٨؟؟؟

پاشان ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەوانە پەندی لێوەرناگرن، چونکە ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ لەو وەزعەی بەسـەر گەلی لووطدا هات پەنـدو عیـبرەت بـۆ ئەوانـە هەیە کە خاوەن باوەڕن، موسـوڵمانن، ئەوانـە موشـریکن بەتـەما مەبـە ئەوانـە بـەو وەزعەی ئێستا تێیدان پەنـد لـەم جـۆرە روداوانـە وەربگـرن.. سـودمەند لـەم جـۆرە سەرگورشـتانە تـەنها موسـوڵمانانن ئەوانـە هەسـت بـەوە دەکـەن: کـە ئـەو جـۆرە سزایانە تۆڵەی خودایە لەکافرەکان لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبـەرەکانی. بـەلام ئـەوانی بڕوایـان نیـە بـەخوداو بـەئاییـنی خـودا ئـەم جـۆرە روداوانـە پـاڵ سروشـت دەدەن! کە لەشـوێنێکا زەوی تێـك دەروخـێ دەڵێن: ئـەوە ناوەکـەی کلـۆر بـووە، یـان فـلان هـۆ بۆتـە هـۆی پەیـدا بـوونی ئـەو بومەلەرزەیـە، ئێـستاش هەروایـەو بـێ باوەڕەکان ئەم جۆرە کارەساتانە پاڵ سروشت خـۆی دەدەنو هۆکـاری جـۆراو جـۆری بۆ دەدۆزنەوە. ناڵێن: ئەمە عەزابی خودایەو لەو وڵاتەی گرتووە. بۆ نموونـە سـاڵی (١٩٠٩ز) شاری (مسینا) لەئیطالیا نوغرۆ بوو، کەسێك بـۆی بکـرێ نووسـراو لەسـەر

ئەو روداوە بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە نووسەرەکان بەتایبەتی مولحیدو بێ بڕواکان پێیان وایە روداوەکە شتێکی سروشتییەو هۆکارە مادییەکانی بۆ دەژمێرن، کەسێکیان نایە بڵێ: ئەمە کاری خودایەو حەق وایە ئێمە لێی پەند ئامێز ببین!

ساڵی (١٩٩٩-١٩٩٨ز) ساڵێکی بێ بارانی و وشکە ساڵ بوو مەلاکان لەوتاری رۆژانی هەینی و وەعظو ئامۆژگارییاندا موسوڵمانیان هەڵدەنا بۆ زێدە خوداپەرستی و تۆبەو پەشیمانی لەتاوان و چەند جارێکیش نوێژە بارانە (صلاة الاستسقاء)یان کرد، کەچی بێ باوەڕو گروپە عیلمانیەکان گاڵتەیان بەموسوڵمانان و مەلاکان دەکردو دەیانگوت: مەلاکان بێ بارانییان قۆزتۆتەوەو کردویانە بەهۆکاری چەواشەکردن و هەڵخەڵەتاندنی دانیشتوانی کوردستان، ئیتر رۆژانە جۆرەها توانج و پلاریان لەموسوڵمانان دەگرت!!! بەئاشکرا لەسەر رادیۆ شڕو کونە فیشاڵەکانیان لەم بارەوە ناماقوڵیان دەکردن چەند جارێکیش مامۆستایانی ئایینی لەوتاری جومعەدا هەڕەشەیان لێکرد ن، بەڵام هەر قسە بوو (قسەش ناچێتە گیرفانەوە).

## چیرۆکی ئەصحابولئەیکە (گەلی شوعەیب)و ئەصحابولحیجر (گەلی ئەموود)

﴿ وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ

﴿فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٦﴾﴾

ئەمە چیرۆکی سێیەمو چوارەمە لەو چیرۆکانەی لەم سورەتەدا هەن، یەکەمیان سەرگورشتەی باوە ئادەمو ئیبلیس بوو دووهەم سەرگورشتەی حەزرەتی ئیبراهیمو لووط بوو، سێیەم چیرۆکی ئەصحابولئەیکە (گەلی شوعەیب)ە ئەیکە: درەختێکە لقو پۆپەکانی چڕو پڕن، لەو ولاتە ئەم جۆرە درەختە زۆرە. داری (الغضا)شی پێ دەگوترێ. ئەم گەلە بانگەوازییەکەی شوعەیبیان رەتکردەوە، پەروەردگار بەعەزابی مەشهوور بە(یوم الظلة) لەناوی بردن. کە بریتی بوو لەدەنگێکی زۆر گەورە کاتی بەیانی بەسەریاندا دراو زەندەقیان چوو. چیرۆکی چوارەم سەرکورشتەی حەزرەتی (صالح)ە لەگەڵ قەومەکەیدا مەبەست لەهێنانی ئەم جۆرە چیرۆکانە وەکوو چەند جارێك رونمان کردۆتەوە، هەڵنانی ئادامیزادانە بۆ خودا پەرستیو بەمرازگەییشتن، ترساندنیان لەسەرپێچی کردنو تاوان: کە سەردەکێشێ بۆ سزادان بەئاگری دۆزەخ، دڵدانەوەی پێغەمبەرە لەبارەی بەدرۆخستنەوەی گەلەکەی!

دەمێنێتەوە بزانین ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ...الآية﴾ چ پەیوەندییەکی بەم چیرۆکانەوە هەیە؟؟

لەوەڵام دا دەڵێین: پەروەردگار کە لەئایەتەکاندا باسی لەناوبردنی کافرو یاخی بووەکانی کرد، وەکوو ئەوە بگوترێ: لەناوبردن چۆن شیاوی خودای خاوەن بەزەییو میهرەبانە؟ ئیتر بەم ئایەتە وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە دەفەرموێ: من

مەخلووقاتم بەدیهێناوە بۆ ئەوەی خەریکی پەرستنم بن، جا کە ئەو ئەرکەیان ئەنجام نەداو پشتیان تێ کرد حیکمەتی خوایی من وەهایە: کە لەناویان بەرم سەر زەوییان لێپاك بکەمەوە.

یان مەبەست بەم ئایەتە تەسەللا دانەوەی پێغەمبەرە: کە بەرامبەر هەڵوێستی ناشیرینی قورەیشییەکان پشوو درێژ بێ، چونکە کە زاندرا پێغەمبەرانی پێشووش هەمان گیروگرفتیان هاتۆتە رێ لەلایەن گەلو نەتەوەکانیانەوە. تەسەلای دێتو پشوو درێژتر دەبێ!

دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانَ أَصْحَابُ الأَيْكَةِ لَظَالِمِينَ﴾ بێگومان ئەصحابولئەیکە (گەلی شوعەیب) نەتەوەیەکی ستەمکارو تاوانکار بوون، چونکە هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، چەتەییان دەکرد، تەرازووبازییان ئەنجام دەدا، ئامێری پیوانەو کێشانەیان کەمو کورتی تێدا بوو، ئیتر خودا تۆڵەی لێستاندن بەسێ جۆر عەزاب (صیحة، رجفة، عذاب یوم الظلة) لەناوی بردن، ئەو کاتەی حەزرەتی شوعەیب بانگەوازی گەلەکەی دەکرد بۆ ئیمانهێنان هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر لەناوبردنی گەلی لووطدا تێنەپەڕیبوو، لەهەمان کاتدا شوێنو جێگای گەلی لووطو گەلی شوعەیب لەیەکەوە نزیك بوون، بۆیە حەزرەتی شوعەیب نەتەوەکەی ترساندو هەڕەشەی لێکرد نو فەرمووی: ﴿وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ﴾هود/٨٩.

ئیبنو مەردەوەیهیو ئیبنو عەساکیر لەعەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مەدیەنو ئەصحابولئەیکە دوو نەتەوە بوون، پەروەردگار (شوعەیب)ی کردە پێغەمبەرو ناردیە سەریان. بەدرۆیان خستەوەو ئیمانیان پێ نەهێنا.

﴿فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ﴾ تۆڵەمان لێستاندن لەسەر ئەو کوفرو ستەمکارییەی ئەنجامیان دا، گەلی (ئەیکە)مان بەعەزابی(یوم الظلة) سزا دا؛ ئەوە بوو حەوت رۆژ

گەرماییەکی زۆر تونـدمان خـستە سـەریان، هەرچـی دارو درەختیـان هـەبوو هەڵپڕوکا، سێبەریان نـەما، ئـەمجار هـەورێکمان نـاردە سەریان زۆر پـێی خۆشحاڵ بـوون وایـان زانـی سـێبەریان لێـدەکا، هـەموویان لـەژێر سـێبەرەکەیدا کۆبوونـەوە، ئـەمجار ئاگرێکمـان نـاردە سـەریان هـەموویانی سـوتاند، ئـەهلی (مـدین) پـشمان بەصەیحەو گرمەی توند زەندق بـردن ﴿وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُبِينٍ﴾ هەریەکە لەو شارەی گەلی لووطی تێدا نیشتەجێ بوون شاری ئەصحابولئەیکە لەسەر ڕێگایەکی کاروان سەران‌و خەڵکی ڕۆژانە پێیدا تێدەپەڕن، کە کاروان‌و قەتار لەحیجازەوە دەچن بۆ شام بەلایان دا تێدەپەڕن‌و ئەو شوێنانە دەکەنە نیشانەی قۆناغ‌و نیشانەی ڕێگا..!!

ئەمجار دێتە سەر گێڕانـەوەی چیرۆکی حـەزرەتی صالح لەگـەڵ گەلەکـەیدا. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَابُ الْحِجْرِ الْمُرْسَلِينَ﴾ بێگومان ئەصحابول حیجر کـە گـەلی ثـەمـوودە پێغەمبەرەکـەیان (کـە حـەزرەتی صـالح بـوو) بەدرۆخـستەوە، کەسـێکیش پێغەمبـەرێك بەدرۆبخاتـەوە مانـای وایـە هـەموو پێغەمبـەرەکانی بەدرۆخـستۆتەوە. چونکە پێغەمبـەران هـەموویان یـەك پـەیامیان هەیـە، لەبنـەما سـەرەکییەکاندا یـەك دەگرنـەوە. بـەگوێرەی کـات‌و شـوێن جوداوازییـان تێـدا نیـە، بەڵکوو بانگەوازی هەموو پێغەمبەران لەو بنەما سەرەکییانەدا یەك بنەمایە!

﴿وَآتَيْنَاهُمْ آيَاتِنَا فَكَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆرمان پێدان لەسـەر راسـتی پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی صـاڵح؛ وەکـوو ئـەو حوشـترەی کـە لەبەردێکی ڕەق‌و تەق بەدوعاو پاڕانەوەی صالح پەیدا بـوو، کەچـی کـە حوشترەکە پەیدا بوو لـەجیاتی ئـەوە بـەموعجیزەی بـزانن، پـشتیان لێهـەڵکردو حوشترەکەیان سەربڕی‌و لەناویان برد. حوشترەکە بۆ خۆی موعجیزەیەکی گەورە بوو، بـەئارەزۆی خـۆی دەلـەوەڕا، ئـەو جۆگـا ئـاوەی هـەیانبوو ڕۆژێـك بـۆ حوشترەکە قۆرغ کرابـوو ڕۆژێکیش بۆ ئەوان بوو، شیرەکەشی زۆر بوو بەشی هەموو گەلەکەی دەکرد.

﴿وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً آمِنِينَ﴾ گەلی ثـەموود بـەهێزو توانـا بـوون، خانوەكانیان لەشاخو كێوەكان دادەتاشین، خانوەكانیان وا دروست دەكرد كە تێیـاندا دڵنیا بن لەدزو جەردە، لەروخانو تێك رمان، تا ئێستاش شوێنەواریان ماوە..

كاتێك پێغەمبەر ﷺ لەسەفەری چون بۆ تەبوكدا بەو دەڤـەرەدا تێپـەڕی زۆر بەخێرای ئەو مەسافەی بڕیو وڵاغەكەی كە سواری بـوو بەتونـدی هـەلینگـدا بـۆ ئەوەی زو لێی دەرچێ!

جـا وەكـوو بوخـاریو غـەیری بوخـاری لـەئیبنو عومـەرەوە ریوایـەت دەكـەن دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ بـەهاوەڵانی فـەرموو: (لا تـدخلوا بیـوت القـوم المعـذبین الا أن تكونـوا بـاكین، فـان لم تبكـوا فتبـاكوا خـشیة ان یـصیبكم مـا اصابهم) مەچـنە نـاو خـانووی نەتــەوەی غــەزەب لێگیراوانــەوە، مەگــەر بــەگریانو ترسـانەوە، ئەگـەر نەشگریان خۆتان بگریەنن نەوەكوو ئەوەی تووشی ئەوان بووە تووشی ئێوەش بێ!

ئــەمجار پــەروەردگار كــاتی لەناوبردنەكــەیان دیــاری دەكــاو دەفــەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ﴾ گرمـەو دەنگـی زۆر بـەهێزو زەندەقبـەری لـەناوبردن لەبـەیانی رۆژی چـوارەمی وادە پیـدراودا گرتنـیو تێكیـەوە پێچانو لـەناوی بـردن. وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەمە دەكاو دەفەرموێ: ﴿تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾هود/٦٥. ئیتر كە عەزابەكەیان بۆ هات ﴿فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ مَا كَـانُوا يَكْـسِبُونَ﴾ مـاڵو سـامانیان فریایـان نەكـەوتو عەزابەكـەی نەگێڕایـەوە. خانووبەرەی قایمو قۆڵو لەشاخ داتراشاوو زۆری نەفەرو كەرەستەی بـەرگری دادی نـەدانو عـەزابی لێنەگێڕانـەوە، بـەڵكوو هـەموویانی لاڵو پـاڵ خـستنو دوا بـڕاوی كردن!

جا كە پەروەردگار هەواڵی لەناوبردنی كـافرو سـتەمكارانی راگەیانـد: وەكـوو ئـەوە بڵێـی پرسـیارێك بێتـە پێـشەوەو بڵـێ: كـەی لـەناوبردنو عەزابـدان شـیاوی

پەروەردگاری خاوەن سۆزو بەزەییە؟ پەروەردگار وەلامی ئەم پرسیارە مەزنە کراوە دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەناویاندا هەیە بەحەق نەبێ دروستمان نەکردوون. کە بەدیمان هێناون بەحەقو راستی دروستمان کردون، بەعەدالەتو حیکمەتو زانایيو دانایی هێناومانە گۆرەپانی بوونەوەرەوە، بەشێوەی ستەمکارو بەتالو بێهودە نەمان خستوونە روو! بۆیەمان دروست کردوون خەلکەکە سەرگەرمی عیبادەتو تەقواو یەکتاپەرستی بن، جا کە ئادەمیزادەکان وازیان لەخوداپەرستی هێنا، پشتیان لەبەندایەتیکردن هەلکرد، بەپێی عەدالەتکاریو حیکمەتو داناییمان دەبێ ئەو ئادەمیزادە بێ بروایانە لەناوبەرین، سەرزەوییان لێپاك بکەینەوە، کەوابوو لەناوبردنی ئەو گەلو نەتەوە ستەمکارانەو پەلە کردن لەبەهیلاکبردنیان ئەو پەرِی عەدالەتو حیکمەتی تێدا بووە.

ئامـاژەی ئەوەشی تێدایە، کە ئەوەی تووشی ستەمکارو بەدرۆخەرەوەکانی پێغەمبەری ئیسلام دەبێ لەرۆژی قیامەتدا ئەوپەری عەدالەتو حیکمەتە بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدایە!!

﴿وَإِنَّ السَّاعَةَ لآتِيَةٌ﴾ بێگومان رۆژی قیامەت دێو هیچ شكو گومان لەهاتنەکەی دا نیە، جا ئەو کاتە خودا تۆلە لەوانە دەستێنێ کەشیاوی سزاو تۆلەن، پاداشو بەخششی خۆی دەدا بەو کەسانەی شیاوی پاداشی بەهەشتی رازاوەن.

﴿فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەتۆ رو لەو موشریکانە وەرگێرە، گوێیان پێ مەدە، لەئاست ئەزیەتو بەدرۆخستنەوەیان پشوو درێژ بە، خۆگربە، بەرەوشتی جوانو بەرز تێکەلیان بەو هەلسو کەوتیان لەگەلدا بکە، ئامۆژگارییان بکە، بیانترسێنە بەلکوو بەخۆیاندا بچنەوەو بێنە سەر رێگای راستو واز لەکوفر بێنن!!

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْخَلاَّقُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومـان خـودای تـۆ ئـەو خودایەیـە: کـە ئـەو ئادامیزادانەی دروست کردوە، بەڵکوو هەموو شتێکی دروست کردوە، دەزانێ چی دروست کردوە بۆچی دروستی کردون، هەر خۆی هەڵسوڕێنەری کاروبارە، ئەندازەی هەموو شتێکی دیاری کردوە! هەر ئەو خودایەش کە بوونەوەری هێناوەتە وجود دەتوانێ قیامەت هەڵستێنێو سزاو پاداش بەئەوپەڕی عەداڵەتکاریو حیکمەتو زانابییەوە بداتەوە بەبەندەکانی، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە!

### بەکورتی:

پەروەردگار خودای تۆو خودای ئەوانیشە، ئاگای لەحاڵی تۆو ئەوانیش هەیە، هیچ شتێکی نێوان تۆو ئەوانی لێگوم نابێ، دەی کەوابێ وا باشە ئیشی خۆت بەخودا بسپێریو پشت هەر بەئەو ببەستی، بۆ ئەوەی ناوانی تۆو ئەوان بکا، ئاشکراشە کە سەرەتا هەڵسو کەوت کردن لەگەڵیاندا بەپەندو ئامۆژگاری رەوشتی بەرزو جوان باشترە لەپەنابردن بۆ شمشێر! پەنابردن بۆ چەکو شەڕکردن لەگەڵیاندا کاتێك دەبێ هیچ رێگا چارەی تر نەمێنێ!

## فەضڵو نیعمەتی خودا بەسەر پێغەمبەری خۆیدا

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ

جَعَلُوا الْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ الْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

لەئايەتەکانی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کرد: کە خۆگرو پشوو درێژ بێ، فەرمانی پێ کرد کە چاوپۆشی بکاو ڕووەرگێڕانی کافرەکانو بەدرۆخستنەوەیان بەهەند نەگرێ. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی نیعمەتە زۆرو جۆراو جۆرەکانی خودا دەکا کە بەپێغەمبەری بەخشیوە، چونکە ئادەمیزاد کە یادی زۆری ئەو نیعمەتو بەخششانەی کرد کە پێی دراوە، لێبوردنو چاوپۆشی بەلاوە ئاسانترە!

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعاً مِنْ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾ بێگومان ئێمە بەتۆمان بەخشیوە حەوت ئایەتی پیرۆز: کە ڕۆژانە لەنوێژدا دووبارە دەکرێنەوە، ئەویش سورەتی فاتیحەیە.

ئیمامی بوخاری دوو تەفسیری بۆ مانای (السبع المثاني) ڕیوایەت کردوە. ڕیوایەتێك لەئەبو سەعیدی کوڕی موعەلاوە، ڕیوایەتێك لەئەبوهورەیرەوە:

١- حەدیثی ئـەبو سـەعیدی کوڕی (المعلی) دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ بەلاماندا تێپەڕی، مـن نوێـژم دەکـرد، بـانگی کـردم وەڵامـم نەدایـەوە تـا نوێژەکـەم تەواو کرد، ئەمجار هاتمە خزمەتی: فەرمووی: ئەوە چی بـوو بـەهۆی نـەهاتنت بـۆ لام بەزوویی؟ وتم: قوربان! نوێژم دەکرد، فەرمووی: ئەی خودا نافـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَـاكُم﴾الأنفـال/٢٤. ئـەمجار فـەرمووی: ئایـا پێش ئـەوەی لەمزگـەوت بڕۆمـە دەرێ گـەورەترین سورەتی قورئانـت پـێ نـەڵێم؟؟ دوایی پێغەمبەر ﷺ هـەنگاوی هـەڵهێنا بـۆ ئـەوەی بڕواتـە دەرێ منـیش وادەکـەییم بیرخستەوە فەرمووی: ﴿الحمد لله رب العالمين﴾ واتە سـورەتی (الحمـد) ئـەوە حـەوت ئایەتە دووبارە کراوەکانن (والقرآن العظيم)یش ئەوەیە: کە پێم دراوە.

٢- ریوایـەتی ئـەبو هـورەیرە ئەوەیـە: دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (أم القرآن: هي السبع المثاني، والقرآن العظيم).

هەندێك پێیـان وایـە مەبەسـت بـە(سبع المثـاني) حـەوت سورەتە درێژەکانـە (البقرة، آل‌عمران، النساء، المائـدة، الأنعـام، الأعـراف، الأنفـال، التوبـة) چونکە ئـەم حـەوت سورەتە چیرۆكو فـەرمان، نـەهیو پەنـدو ئامۆژگـاریو وادەو هەڕەشـەیان تێدا تابیلا بۆتەوە.

هەندێکی تر پێیان وایە: مەبەست بە(سبع المثـاني) هـەموو قورئانـە عـەطف کردنەوەی (القرآن العظيم) بۆ سەر (سبع المثاني) بۆ موغایەرەو جوداوازی نیە، بـۆ تەرادوفە واتە: زیاد لەوشەیەك بۆ یەك مانا، مانا یەکێکەو وشەکانی زۆرن! قورئـان لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿اللَّـهُ نَـزَّلَ أَحْـسَنَ الْحَـدِيثِ كِتَابـاً مُّتَـشَابِهاً مَّثَانِيَ﴾الزمر/٢٣.

ئەوەی کەوا جێگای متمانەیە ئەوەیە: تەفسیرەکەی بوخاری ئەصصە لـەوەدا: کە سورەتی (الفاتحة) (سبع المثانی)یە.

ئەمجار چ قەیدی نیە کە سورەتی تریش بە(سبع المثاني) وەصفدار بکرێن. هەروەها چ قیدی نیە هەموو قورئان بەو صیفەتە وەصف دار بکرێ!

جا کەسێك (السبع المثاني)و قورئانی گەورەی پێ درابێ، کە لەلایەن حەقی موطلەقەوە هاتووە، پەیوەندی بەحەقی موطلەقەوە هەبێ، کالای دونیایی کاری تێ ناکا، ئاواتە خوازی حاڵو وەزعی دونیا پەرستان نابێ، تەماعی لەخۆشیو ژیانی ئەواندا نیە، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! چاوەمەبڕە ئەو لەززەتو خۆشیو ماڵو سامانەی داومانە بەکۆمەڵی کافرو دەوڵەمەندەکانو کالای دونیاییمان پێ بەخشیون، وەکوو دەبینی بەرواڵەت هەندێك لەجولەکەو دییانو موشریکەکان لەژیانێکی خۆشدان، ئەتۆ چاوت لەوە نەبێ، چونکە لەئاکامدا تووشی سزایەکی بەئێش دەبن، عەزابی دۆزەخ چاوەڕوانیانە، تۆ لەجیاتی ئەو کالاو خۆشییەی ئەوان، (السبع المثاني)و قورئانی پیرۆزت بۆ هاتووە... مەبەست ئەوەیە: تۆ شانازی بکە بەو پەیامەی بۆت هاتووە، نیعمەتو فەضلی خودا بەسەرتدا بەهەند هەڵبگرە، گرنگی بەدونیاو کالای دونیایی مەدە، ئاواتە خوازی وەدەستهێنانی ئەو کالا رواڵەتیە کاتییە مەبە، ئەتۆ لەنێو فەضلو بەخششی خودادای، نیعمەتی دونیایی رواڵەتی کوا لەعاست ئەو نیعمەتەی بەتۆ بەخشراوە نموودی هەیە؟ ئەوەی دراوە بەئەو کافرانە لەبەرژەوەندییان نیەو هەڵخەڵەتاندنو ئیستیدراجە! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾طه/١٢١.

حەزرەتی ئەبو بەکر فەرموویەتی: کەسێك قورئانی درابێتیو پێی وا بێ کەسێکی تر بەخششی لەوە گەورەتری پێ دراوە، بێگومان ئەو کەسە بەهەڵەدا چووە؛ گەورەی بەپچوك داناوەو پچوکی بەگەورە حیساب کردوە.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: مەبەست ئەوە نیە نەبوو هەژاران قەناعەت بەهەژاری خۆیان بکەن‌و لێبگەڕێن ملهوڕەکان خۆیان بلێسنەوە، تاوای لێدێ ڕەورەوەی کۆمەڵایەتی لەگرێژنە بچێ‌و تەرازوی کۆمەڵایەتی لاسەنگ بێ‌و کۆمەڵگا بشێوێ‌و چینایەتی تێدا پەیدا ببێ، کۆمەڵ دابەش بێ بەسەر چینی نەبوو هەژارو چینی دەرەبەگ‌و ئەرستوقراتی. ئەو تاقمەیان هیچی نەبێ بیخوا ئەم تاقمەشیان لەنازو نیعمەتدا وەك گای عەلی خۆیان بلێسنەوە هەڵبەتە ئایینی ئیسلامی پیرۆز: کە لەسەر حەق‌و عەدالەت دامەزراوە، ئەوە دەچەسپێنێ کە حەق‌و ڕاستی ڕاگری بوونەوەرە، هەرگیز بەستەم ڕازی نابێ!

بەڵکوو ئەمە مانایەکی تایبەتییە لەم سیاقەدا هێنراوە بۆ بەرامبەریکردن لەنێوان ئەو حەقە گەورەو بەخششە فراوانەی دراوە بەپێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو تەماع‌و کالا هیچ‌و پوچەی خۆبەگەورە دەنوێنێ‌و لەواقیعدا کەم بایەخە، ئامۆژگاری پێغەمبەر دەکا: کە خۆلێسەرەوەکان ئیهمال بکاو گرنگی بەخودا پەرستە ڕاستاڵەکان بدا، چونکە ئەمان شوێنکەوتووی ئەو حەق‌و پەیامەن کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی کە لەڕاستیدا ئاسمان‌و زەوی‌و ئەوەی لەناویاندایە لەسەر ئەو حەق‌و عەدالەتە وەستاوە!.

﴿وَلا تَحْـزَنْ عَلَـيْهِمْ﴾ تۆ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! خەم بۆ ئاکام‌و سەرەنجامی سامناکی ئەوانە مەخۆ، ئەوە یاسایەکە عەدالەتکاری خودا داخوازیەتی. لێیان بگەڕێ با بەرەو ئاکامی خۆیان هەنگاو هەڵێنن، ئەوانە بەویستی خۆیان ئەو ڕێبازەیان هەڵبژرادوە خۆیان بەرپرسیارن!

﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُـؤْمِنِينَ﴾ باڵی میهرەبانی خۆت بۆ موسوڵمانان ڕابخە، لەگەڵیاندا بەنەرم‌و نیانی هەڵس‌و کەوت بکە، ڕوگرژو دڵڕەق مەبە لەئاستیان. ئەگەر هەڵەیەکیان کرد چاوپۆشییان لێبکە، داوای لێبوردنیان بۆ لەخودا بکە، بۆ کاری گرنگ ڕاوێژیان پێ بکە، چونکە ئەوان سوپای تۆن لەدونیادا مایەی

سەربەرزین بۆ تۆ لەقیامەتدا، هەتا ئەوان زۆر ترو خوداپەرست تربن، تۆ لای خودا پایەت بەرز دەبێتەوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾آل‌عمران/١٥٩.

ئەمجار ئەرکی سەرەکی پێغەمبەر ﷺ دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ إِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْمُبِينُ﴾ ئەی موحەممەد! بەو کافرانە بڵێ: هەر من ترسێنەری ئێوەم بەجۆرێك ترساندنەکەم بەئاشکرا بەئێوە بگات. دەتانترسێنم لەعەزابێکی بەئێش و ترسناك ئەگەر بەردەوام بن لەسەر گومڕایی و سەرپێچیکردنتان، چی بەسەر گەلە ستەمکارە یاخی بووەکانی رابوردو هات بەسەر ئێوەش دێ، چۆن خودا ئەوانی بەعەزاب لەناوبرد، ئێوەش لەناو دەبا!

لەصەحیحی موسلیم و بوخاریدا هاتووە ئەبو موسای ئەلئەشعەری دەیگێڕێتەوە. لەپێغەمبەرەوە ﷺ کە دەفەرموێ: (انما مثلي ومثل ما بعثني الله به، كمثل رجل أتى قومه، فقال: يا قوم أني رأيت الجيش بعيني، وأني أنا النذير العريان، فالنجاء النجاء، فاطاعه طائفة من قومه، فادلجوا وانطلقوا على مهلهم، فنجوا وكذبه طائفة منهم فاصبحوا مكانهم، فصبحهم الجيش، فأهلكهم واجتاحهم، فذلك مثل من أطاعني واتبع ما جئت به، ومثل من عصاني وكذب ما جئت به من الحق) نموونەی من و ئەو پەیامەی خودا منی پێ ناردووە وەکوو پیاوێك وایە، هاتە لای گەلەکەی و وتی: ئەی گەل و هۆزەکەم بەچاوی خۆم سوپای دوژمنم دی دەورەی داون، من ترسێنەری راستەقینەی ئێوەم خێرا خۆتان رزگار بکەن و ئەم شوێنە بەجێ بێڵن. جا کۆمەڵێکیان بەقسەیان کردو شەویان پێوەگرت و دەرچوون، کۆمەڵێکیشیان بەدرۆیان خستەوەو لەشوێنی خۆیان مانەوە. دەمەو بەیان سوپای دوژمن بەسەری دادان و تارومار کردن و رایماڵین ئەوە وێنەی کەسێکە بەقسەم بکاو شوێن پەیامەکەم بکەوێ، هەروەها وێنەی ئەوەی کە بەدرۆم بخاتەوەو یاخی ببێ..

﴿كَمَا أَنزَلْنَا عَلَى الْمُقْتَسِمِينَ﴾ لێرەدا دوو مانا هەیە:

١- ئەگەر ﴿كَمَا أَنزَلْنَا﴾ موتەعەلەق بێ بە ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ﴾ەوە مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: واتە: ئێمە داومانە بەتۆ حەوت ئایاتی قورئان لەو ئایەتانەی لەشەوو رۆژدا چەند جار لەنوێژدا دووبارە دەکرێنەوە وەکوو چۆن لەوەپێش (تەورات)و (ئینجیل)مان داوە بەجولەکەو دیانەکان، کە دابەشکەر بوون: ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾ ئەو جولەکەو دیانانەی ئێستا قورئانیان بەشبەش کردوە: بڕوایان بەهەندێکی کردو هەندێکیان رەتکردەوە، ئەوەی لەگەڵ کتێبی ئەواندا بگونجێ بڕوایان پێیەتی، ئەوەی وا نەبێ رەتی دەکەنەوە.

٢- ئەگەر ﴿كَمَا أَنزَلْنَا﴾ پەیوەند بێ بە ﴿وَقُلْ إِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْمُبِينُ﴾ ئەو کاتە ماناکە بەم جۆرەیە: ئەی موحەممەد ئەو کافرو موشریکانە بترسێنە بەوێنەی عەزابو سزایەك: کە ناردمان ﴿عَلَى الْمُقْتَسِمِينَ﴾ بۆ سەر ئەو کافرانەی لەکاتی حەجدا پێش رزگار کردنی مەککە رێگای حاجیانیان دەگرت، بۆ ئەوەی نەچن ئیمان بەپێغەمبەر بێنن. وەکوو دەڵێن: عەرەبەکان بەفەرمانی وەلیدی کوڕی موغەیرە لەناو خۆیاندا رێگاکانیان دابەش کردبوو هەر کۆمەڵەو دەچوو رێگایەکیانی دەگرت. بۆیە ناونران (مقتسمون) ژمارەیان چل کەس یان شانزە کەس بوون.

یان (مقتسمین) ئەو موشریکانەن کە قورئانیان بەشبەش کردبوو بەبازێکیان دەگوت: شیعرە، بەهەندێکیان دەگوت: سیحرو جادوبازییە، هەندێکیان بەخەیاڵات و گۆترەکاری هەندێکی تریان بەئەفسانەو قسەی کۆنی نەتەوە پێشینەکان دادەنا.

یاخود (مقتسمین) ئەو جولەکەو دیانانەن کە هەرچی لەقورئاندا موافیقی کتێبی ئەوان نەبوایە بڕوایان پێ نەدەکرد.

هەرچۆنێك بێ ئەو كافرانەی قورئانیان وا دابەش كردبوو هەر یەكەیان بەدەردێك گیرۆدە بوو، هەندێكیان لەشەڕی بەدرداو هەندێكیان لەشەڕی حونەیندا، هەندێكیان لەرووداوی بەنوقورەیظەدا بەسزای خۆیان گەیشتن، ئەمە سزای دونیایان بوو، سزای قیامەتیشیان لەوێ بوەستێ. هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ چۆنە.

﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سوێند بەخودای تۆ ئەی موحەممەد! ئێمە پرسیار لەهەموو كافران دەكەین، پرسیاری سەرزەنشت ئامێز، دەربارەی هەموو كردارێكیان، لەسەر هەموو گوفتارێكیان پرسیاریان لێ دەكەین، پرسیاریان لێدەكەین: ئاخۆ وەڵامی تۆیان داوەتەوە، چۆن بەپیر پەیامی ئێمەوە هاتوون، پڕاو پڕ پاداشیان دەدەینەوە.

ئەبو جەعفەر لەرەبیعەوە لەئەبولعالییەوە دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێ: پەروەردگار رۆژی قیامەت پرسیار لەبەندەكان دەكا لەبارەی دوو شتەوە: چییان پەرستووە چۆن وەڵامی پێغەمبەرانیان داوەتەوە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەمەعاذی كوڕی جەبەلەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی مەعاذ! رۆژی قیامەت مرۆڤ لەهەموو رویەكەوە پرسیاری لێدەكرێ، تەنانەت لەچاو رشتنیش، لەوردكردنی كل و كلچێوك و سورمە كە بەدەست وردی دەكا. وابكە رۆژی قیامەت یەكێكی تر نەبینم بەختەوەر تر بێ لەتۆ بەهۆی ئەوەی خودا پێی داوی.

جا كە ئەركی تۆ ئەی موحەممەد! ترساندنە لەرۆژی قیامەت حیساب و لێكۆڵینەوەو پەیامەكەت حەق و بەجێیە! ئەوە ئیتر كاتی بانگەوازی نهێنی نەماو وەختی خەباتی ژێر زەمینی بەسەرچوو! ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ بانگەوازی خۆت ئاشكرا بكە، ئەوەی فەرمانت پێ دەكرێ بەئاشكرا

بیگەیەنــە، بانگەوازییەکــەت بەهــەموو کــەس بەئاشــکرا رابگەیەنــە بــەرەنگاری موشریکەکان ببەرەوە، گوێ بەهەڕەشەو هاشوو هوشیان مەدە، خودا دەتپارێزێ، رو وەرگێڕە لەو موشریکانەی دەیانەوێ لەپابەندبوون بەئایاتی خودا بتگێڕنەوە.

﴿إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ﴾ ئێمە بـۆت لـەعۆدەی گاڵتەکـەرەکان دێـین، ئەوانـەی بەربەرەکانی تۆ دەکەن، گاڵتەت پـێ دەکـەن، قورئانەکـەت بـەدرۆ دەخەنـەوە، ئێمـە لەعۆدەیان دێیین! خۆمان دەزانین چییان پێ دەکەین، چۆنیان دەفەوتێنین!

ئەوانــەی زۆر دژی پێغەمبــەر بــوون و گاڵتــەیان پــێ دەکــرد کۆمــەڵێك بــوون لەموشــریکەکانی مەککــە. (وەلیــدی کــوڕی موغــەیرە)و (عاصــی کــوڕی وائیــل)و (ئەسوەدی کوڕی قەیس)و (ئەسوەدی کوڕی موطەلیب)و (ئەسوەدی کوڕی یـەغوث) بوون. هەریەکێ لەمانە بەجۆرێك لەناوچوون. وەکوو دەگێڕنەوە:

١- (وەلید) بەلای کابرایەکی شیرگەردا تێپەڕی سەرە رمێ بەقاچیا چوو گوێی پێ نەدا تا ئاوەدزی کرد ئاوساو پێی مرد.

٢- (عاصی کوڕی وائیل) رۆژێ چوو بۆ گەشتو گوزار دڕکێ بەقاچـیدا چوو ئاودزی کردو پێی مرد.

٣- (عەدی کوڕی قەیس) تووشی دەردێك هات کێمو زوخاو لەلوتیەوە دەهاتـە دەرەوەو بەناشیرینی مرد.

٤- (ئەسوەدی کوڕی مـوطـەلیـب) حـەزرەتی جوبرائیـل گەڵایـەکی دا بەچاویا زانی تێکەوتو کوێر بوو ئازارێکی زۆریشی هەبوو تا مرد هەر چاوی کوێرو هێشاو بوو.

٥- (ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغوث) تووشی نەخۆشی ئێسقان بوو بەو دەردە مرد.[٨]

ئەمجار وەصفی گاڵتەکەرەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّـهِ إِلَهاً آخَـرَ﴾ ئەوانەی لەتەك پەروەردگاردا چەند خودای تر دەپەرستن! بەمەش تەسەللای پێغەمبەر دەداتەوە، واتە: ئەی موحەممەد! تۆ دڵت بەخۆت نەمێنێ، بێ وێڵی ئەو کافرانە هەر بەوەندە نەوەستا گاڵتە بەپلەو پایەی پێغەمبەرایەتی تۆ بکەن، بەڵکوو شالاویان بۆ پلەو پایەی خودایەتیش بردوە، چەند بتێکی لەدارو بەرد تاشراویان کردوە بەشەریکی خوداو بەندایەتییان بۆ دەکەن!

﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لەوە بەولاوە سەرەنجامی خۆیان دەزانن! بۆیان دەردەکەوێ چییان پێ دەکەین، چۆن راپێچی دۆزەخیان دەکەین!

ئەمجار بەشێوەیەکی تر تەسەللای دڵی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾ بێگومان ئێمە دەزانین تۆ دڵت تەنگ دەبێ بەو قسانەی ئەو موشریکانە بەرامبەر تۆو ئایینەکەت دەیکەن. ئەتۆ هەر کاتێ دڵتەنگیت بەسەردا هات پەنا بەرە بۆ خودا پەرستی: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُنْ مِنْ السَّاجِدِينَ﴾ خودا بەدوور بگرە لەوەی موشریکەکان دەیڵێن: حەمدو سوپاسی خودا بکە لەسەر ئەوە کە هیدایەتی داوی بۆ ئایینی حەق، بۆ ڕێگەی ڕاست، لەسەرەتای شەوو ئەمسەرەو سەری رۆژدا خوداپەرستی ئەنجام بدە، لەخودا بپاڕێرەوە، چونکە پاڕانەوەت بەوجۆرە لەبارەگای پەروەردگارت نزیك دەکاتەوە، نەفس و هەستو شعورت بەرز دەکاتەوە بۆ عالەمی باڵا، وەکوو لەفەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە دەفەرموێ: (أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد) نزیکترین کات کە بەندە لەخودای خۆی نزیك بێ ئەوکاتەیە: کە لەسوژدەدایە.

---

(٨) تەفسیری رازی ج١٩/٢١٥. تەفسیری قورطبي ج١٠/٦٢ تەفسیری ئیبن و کەثیر ج٢/٥٥٩.

﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ سەرگەرمی خوداپەرستی بەو خەریکی حەمدو سوپاسی پەروەردگار بە، بەردەوام بە لەسەر ئەنجامدانی نوێژ، هەتا گیانت تێدایە، خودا پەرستی بکە تا مردن یەخەت پێ دەگرێ!

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە چارەسەری دڵتەنگی تەسبیحو تەقدیسو حەمدو ئەناکردنی پەروەردگارە. هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ: کە عیبادەت وەکوو نوێژ، لەسەر ئادەمیزاد پێویستە هەتا عەقڵو هۆشی بمێنێ. لەهیچ حاڵێکدا نوێژ لەسەر مرۆڤ لاناچێ، هەرچۆنێك بێ دەبێ نوێژ بکا، ئەگەر توانی بەراوەستانەوە ئەگەر نەیتوانی بەدانیشتنەوە، ئەگەر نەیتوانی بەراکشانەوە.

ئیمامی بوخاری فەرموودەیەك لەعیمرانی کوڕی حوصەینەوە روایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (صل قائماً، فان لم تستطع فقاعداً، فان لم تستطع فعلى جنب).

هەروەها ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر بەهەڵەچوونی هەندێ بێدینو خوانەناس کە دەڵێن: مەبەست بە(الیقین) مەعریفەو ناسینە، هەر کاتێ ئادەمیزادێك گەیشتە حاڵەتی عیرفانو خودا ناسین، ئیتر تەکلیفی لەسەر نامێنێ! ئەمەش ئەوپەڕی گومڕاییو سەرلێشێوانە، چونکە پێغەمبەران لەگەڵ ئەوەدا: کە خۆیانو هاوەڵانیان لەهەموو کەس زیاتر خودایان ناسیوە، لەهەموو کەس باشتر صیفەتەکانی خودایان دەناسین. دەیانزانی خودا چەند گەورەیەو چەند شیاوی رێزو تەقدیرە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لەهەموو کەس زیاتر خودا پەرستیان دەکردو ئەرکەکانی سەرشانیان ئەنجام دەدا. لەهەموو کەس زیاتر سوور بون لەسەر چاکەکاریو بەندایەتیکردن.

پێغەمبەری مەزن هەر کاتێ کارێکی گرنگی بهاتایە پێش پەنای بۆ نوێژکردن دەبرد.

لێرەدا وەکوو زانیمان ئایەتی ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ﴾ ئەوە دەگەیەنێ: کە ڕۆژی قیامەت پەروەردگار پرسیار لەهەموو کەس (بەکافرو موسوڵمانەوە) دەکا، مەگەر ئەوانە نەبێ کە بەبێ حیسابو لێکۆڵینەوە لێیان دەچنە بەهەشتەوە. ئایەتێکی تر هەیە ئەویش دەق ئەوە دەگەیەنێ: کە کافرەکان پرسیاریان لێدەکرێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾الصافات/٢٤. یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾الغاشية/٢٥-٢٦.

بەڵام ئەو ئایەتانەی کە بەرواڵەت ئەوە دەگەیەنن: کە لەڕۆژی قیامەتدا هەندێ کەسی کافر پرسیاریان لێناکرێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ﴾القصص/٧٨. یان ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْأَلُ عَن ذَنبِهِ إِنسٌ وَلَا جَانٌّ﴾الرحمن/٣٩. یان ﴿وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ﴾البقرة/١٧٤. یان ﴿إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾المطففين/١٥. ئەمە مانای وایە: کە ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکی پڕ کارەساتو حاڵو وەزعی جیا جیای تێدایە، لەهەندێ مەوقیف و حاڵو وەزعدا پرسیارو وەڵام هەیە، لەهەندێ موقیفدا پرسیارو وەڵام نیە، عیکریمە دەفەرموێ: (القيامة مواطن يسأل في بعضها، ولا يسأل في بعضها). ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پەروەردگار پرسیاریان لێناکا بۆ ئەوەی بەهۆی وەڵامەکەوە هەواڵێك بزانێ، خودا بۆ خۆی زاناو ئاگادارە بەهەموو شتێك، بەڵکوو پرسیاری لومەو سەرکۆنەکردنیان لێدەکا ، پێیان دەفەرموێ: بۆچی بەگوێی قورئانتان نەکرد، بۆچی پێغەمبەرەکانی منتان بەدرۆ خستوە؟ بەڵگەتان چیە؟!

بەیارمەتی خودا تەفسیری سورەتی (الحجر) تەواو بوو...

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی النحل

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (النحل) چونکە لەئایەتی (٦٨-٦٩)دا دووجار ناوی (النحل) هاتووە، باسی ئەوە دەکا: چۆن خودای پەروەردگار خستۆیەتیە دڵی هەنگەوە هەڵاڵەی گوڵو میوە بمژێو هەنگوین دروست ببێ، ئەو هەنگوینەی: کە چارەسەرو شیفایە بۆ ئادەمیزاد، ئەوەش خۆی لەخۆیدا چیرۆکێکی سەرسوڕهێنەرو سەرەنج ڕاکێشە، بۆ ئەوەی بیر لەئەو مەخلووقە بکەینەوەو خۆیو بەرهەمەکەی بکەینە بەڵگە لەسەر هەبوونی پەروەردگار! ئەم سورەتە ناوێکی تریشی هەیە پێی دەگوترێ: سورەتی نیعمەتەکان (سورة النعم) چونکە باسی زۆر نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی پەروەردگاری تێدایە بۆ بەندەکانی.

ئەم سورەتە جگە لەسێ ئایەتی کۆتایی نەبێ هوموو مەککییە، واتە لەمەککە هاتۆتە خوارێ، سێ ئایەتەکەی کۆتاییشی لەنێوان مەککەو مەدینە، لەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەئوحودەوە بۆ مەدینە هاتوونە خوارێ.

سورەتی (النحل) وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر باسە سەرەکییەکانی عەقیدە باس دەکا. باسی (ئولوهییەت، پێغەمبەرایەتی، زیندوو بوونەوە) دەکا، وەلێ هەندێ جار باسی لاوەکی پەیوەندیدار بەباسە سەرەکییەکانەوە دەهێنێو پێکەوە جۆشیان دەدا. ئەوە ڕادەگەیەنێ کە هەموو ئایینە ئاسمانییەکان لەچەند شتێکی سەرەکیدا یەکدەگرنەوە، یەکتاپەرستی ئایینی ئیبراهیمو ئایینی موحەممەد بەیەکەوە دەبەستێتەوە... حەقیقەتی ئیرادەی خوداییو ئیرادەی ئادەمیزادی لەبارەی ئیمانو کوفرەوە، لەبارەی هیدایەتو گومراییەوە شی دەکاتەوە. ئەرکی پێغەمبەران دیاری دەکا، دابو نەرێتی خودا دەرحەق بەکافرە

بەدرۆخەرەوەکان رون دەکاتەوە. مەوضوعی تەحلیلو تەحریمو بیرو بۆچونی بتپەرستەکان لەم بارەوە شی دەکاتەوە.

باسی کۆچکردن لەپێناو ئایینی خودادا، بەتاقیکردنەوەی خودا پەرستان دەربارەی ئایینەکەیان وکافربوونەوە دوای ئیمان سزاو پاداشی هەموو ئەمانە بۆ ئادەمیزادەکان لای خودا دیاری دەکا. ئەمجار باسی عەداڵەتکاریو چاکەکاریو ماڵبەخشین و وەفا بەعەهدو پەیمان دەکا!!

سەرەتای سورەتی (النحل) پەیوەندییەکی قایمو قوڵی هەیە بەکۆتایی سورەتی (الحجر)ەوە ئەوەتا پەروەردگار لەکۆتایی سورەتی (الحجر)دا فەرمووی: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ﴾ ئەوە دەچەسپێنێ کە حەشری رۆژی قیامەتو پرسیار کردن لەئادەمیزاد دەربارەی کردەوەی دونیایان دێو گومانی تێدا نیە. هەروەها ئایەتی ﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾ کە بەمانا هاتنی مەرگو مردنە. هەریەکێ لەم دوو ئایەتە پەیوەندییەکی قایمو قوڵو موناسەبەیەکی گونجاوی هەیە بەسەرەتای ئەم سورەتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلاَ تَسْتَعْجِلُوهُ﴾. بۆیەش لێرەدا فیعلی ماضی بەکار هێنا؛ فەرمووی: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ﴾ بەموضاریع نەیهێنا، چونکە هاتنەکە هێندە راستەو بێگومانە، هەرچەندە هێشتا نەهاتووە، وەکوو هاتوو وایە!!

## هاتنی قیامەتو راستی نیگا

﴿ أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ ﴾

بێگومان موشریکەکانی مەککە پەلەیان لەپێغەمبەر دەکرد: کە زوو عەزابی دونیا یان عەزابی قیامەتیان بۆ بێنێ. هەتا ماوەی دواکەوتنی عەزابەکە درێژەی بکێشایەو عەزابی هەڕەشە پێ لێکراویان دوا بکەوتایە ئەوان زیاتر شوویان لێ هەڵدەکێشاو پەلەیان لێدەکردو گاڵتەو لاقرتێیان پێ دەکردو وایان دەزانی پێغەمبەر ﷺ بەشتێك دەیانترسێنێ: کە حەقیقەتی نیەو چاوو راویان لێدەکا بۆ ئەوەی ئیمانی پێ بێنن‌و شوێنی بکەون، نەیاندەزانی دواکەوتنی عەزاب بۆ سەریان حیکمەتێکی خوداییەو رەحمەتە بۆ ئەوان، هەوڵی ئەوەیان نەدەدا لەئایەتە کەونییەکانی خودا وردببنەوە، ئایەتەکانی قورئان بەدڵ بخوێننەوەو سینگی خۆیانی بۆ بکەنەوە عەقڵی خۆیان بخەنە کارو بەخۆیاندا بچنەوە.

جا کە رۆژانی وەغرانی عەزاب درێژەیان کێشا، موشریکەکان وەندەی تر زمانیان درێژ کردو کەوتنە گازندەو گاڵتە کردن‌و قەشمەری کردن، وتیان: ئەی موحەممەد! ئەوەچی بوو عەزابەکەی ئێمە نەهات!! خۆ ئەگەر لەفەرزێکدا عەزابەکە بشێ، ئەوە بتەکانمان شەفاعەتمان بۆ دەکەن‌و رزگارمان دەکەن! ئیتر یەکەم ئایەتی ئەم سورەتە نازڵ بوو!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ...﴾ نازڵ بوو هاوەڵانی پێغەمبەر ترسیان لێ نیشت‌و دەنگە دەنگ‌و هاوار هاوریان پێکەوت، تا رستەی ﴿فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ نازڵ بوو ئیتر بێدەنگ بوون!

دەفەرموێ: ﴿أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ نزیکە عەزابی خودا یەخەی موشریکەکان بگرێ‌و بەهیلاکیان بەرێ، ئەمە فەرمانی خودایەو جێ بەجێ بوو، حوکمی خودایەو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، بڕیاری خودایە لەئەزەلەوە تا ئەبەد دەبێ بێتە جێ‌و ئەنجام بدرێ، بەڵام: کە تا ئێستا نەهاتۆتە دی‌و تەنفیذ نەکراوە، ئەوە لەبەر ئەوەیە پەروەردگار کاتێکی دیاریکراوی بۆ داناوە، تا ئەو کاتە نەیە عەزابەکە نایە، کەوابێ ﴿فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ پەلە مەکەن‌و پێش وەخت داوای هاتنی

مەکەن! واتە: بڕیارەکە دراوە بەڵام تەنفیذەکەی دواخراوە. ئەوەی کە موشریکەکان بەدووری دەزانن نزیکە، پەلە لەپەیدا بوونەکەی مەکەن!

﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پەروەردگار پاك‌و مونەززەهە لەهاوەڵ‌و شەریك‌و منداڵ‌و خێزان، ئەو بتانەی ئێوە بەتەمان شەفاعەتتان بۆ بکەن‌و عەزابی خوداتان لێ دوور بخەنەوە، نەشەفاعەتیان بۆ دەکرێ‌و نەدارای شەفاعەتکردنن، لەفەرزێکا شەفاعەتیش بکەن شەفاعەتیان لێ وەرناگیرێ!

## بەکورتی:

ئەم بتە بێ گیانە پڕو پوچانەی ئێوە کردوتانن بەهاوەڵی خوداو دەیانپەرستن‌و بەهەویان شەفاعەتتان بۆ بکەن، پڕو پوچ ترین مەخلووقاتن، زەبوونترین شتی بوونەوەرن، ئەدی چۆن ئێوە دەیانکەن بەهاوەڵی خودا لەبەڕێوەبردنی کاروباردا لەشەفاعەتکردندا!!

بەراستی پاك‌و بێ عەیبە ئەو خودایەی لەئادەمیزادەکان ناگەڕێ بەگومڕایی‌و سەر لێ شێواوی بمێننەوە، بەڵکوو لەئاسمانەوە نیگایان بەفروستادەی خۆیدا بۆ دەنێرێ، دڵیان زیندو دەکاتەوە ﴿يُنَزِّلُ الْمَلآئِكَةَ بِالْرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ پەروەردگار فریشتەدەنێرێتە خوارێ لەگەڵ نیگادا بۆ سەر ئەوانەی مەیلی لێبێ نیگایان بۆ بنێرێ لەبەندە هەڵبژاردەکانی!

پەروەردگار لێرەدا تەعبیری لەنیگا بەگیان لێدایەوە، چونکە چۆن گیان جەستەی مردو زیندو دەکاتەوە، نیگاش ئاوا دڵی مردوو زیندو دەکاتەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَ مَن كَانَ مَيْتاً فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُوراً يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾الأنعام/١٢٢.

بەکارهێنانی (روح) بەمانا نیگا لەقورئاندا باوە، ئەوەتا لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا﴾الشورى/٥٢.

پەروەردگار لەئاسمانەوە تەنها باران نابارێنێ ئەرزو لاشەکان زیندو بکاتەوەو بەس! بەڵکوو فریشتەش نازلێدەکا بۆ سەر زەوی نیگاو سروشیان پێدا دەنێرێ بۆ ئەوەی دڵو دەروونەکان زیندو بکاتەوە، عەقڵیو هەستو شعور پاڵفتە بکا، ژیان بخاتە ناو کۆمەڵگای ئادەمیزادەوە، لەکرمۆڵیو گەندەڵیو فەسادو ئاشوب بیپارێزێ، بەراستی نیگاو سروش گەورەترین نیعمەتی پەروەردگارە بۆ سەر ئادەمیزاد، یەکەم نیعمەتە کە خودا منەتی خۆی دەکا بەسەر بەندەکانی دا بەهۆیەوە. نیعمەتێکی هێندە گەورەو مەزنە خودا بەفریشتەدا کە پاکترین مەخلووقاتی خۆنی دەینێرێ بۆ سەر دڵی بەندە هەڵبژاردەکانی کە پێغەمبەرانن. بۆچی؟ ﴿أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاتَّقُونِ﴾ بۆ ئەوەی ئادەمیزادە بێ باوەڕەکان بترسێنن لەئاکامی سەرپێچیو یاخی بوون، پێیان بزانێنن: کە هیچ خودا نین شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ کردن بن جگە لەپەروەردگار جگە لەبەدیهێنەری بوونەوەر.

هەر پەروەردگار خودایەو شیاوی بەندایەتی بۆ کردنە، کەوابێ ئەی خەڵکینە! خۆتان لەسزاو عیقابی من بپارێزن، هەر کەسێ سەرپێچی فەرمانی من بکاو غەیری من بپەرستێ، بەئاگری دۆزەخ سزای دەدەم، هەر من پەروەردگاری ئێوەم رازی نیم کەسی تر بەخودا بزانن!!

ئایەتەکان بەرونی ئەوەیان گەیاند کە نیگاو سروش لەخوداوە بۆ پێغەمبەران بەهۆی فریشتەوە دێ، فریشتە سروش لەخوداوە وەردەگرن بەبێ ناوەند، ئەمجار ئەوانیش دەیگەیەنن بەپێغەمبەران، هەر بۆیەشە لەکۆتایی سورەتی (البقرة)دا فەرمووی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ (٢٥٨)﴾.

سەرەتا باسی خودای کرد، ئەمجار فریشتە چونکە ئەوان نیگاکە دێنن، ئەمجار باسی کتێبی (نیگا)ی کرد پاشان باسی پێغەمبەرانی کرد..

## بەڵگە لەسەر هەبوونی خوداو تاك‌و تەنهایی

﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ ۚ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی بەیانکرد کە نەهاوەڵی هەیەو نەمنداڵ، ئەو خودایەکی تاك‌و تەنهاو بێ ئاتاجە، بەڵگەی لەسەر هەبوونی خودایەکی داناو زاناو

خـاوەن دەسـەڵاتی رەهـا هێنانـەوە. دەسـتی کـرد بەرانوانـدنی ئایـاتی خـەلقو بەدیهێنان، ئایاتی نیعمەتو بەخششی خۆی بۆ بەنـدەکانی، ئـەم ئایەتانـە کۆمـەڵ کۆمـەڵ رادەنوێنـێ‌و دەیانکاتـە بەڵگـە لەسـەر هـەبونی زاتـی پـاکی خـۆی، لەسـەر دانـایی‌و زانـایی‌و دەسـەڵاتی بـێ سـنووری، لەسـەر تـاك‌و تـەنهایی‌و بەخـشندەیی؛ سـەرەتا بەباسـی بـەدیهێنانی ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و دروسـتکردنی ئـادەمیزاد دەستی پێکردو فەرمووی: ﴿خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ پەروەردگار ئاسمانەکان‌و زەوی بەشێوەی حەق بەدیهێنان، عالەمی باڵاو عالەمی ژێری‌و هەرچی تێیاندایـە لەسـەر بناغـەی حـەق‌و راسـتی لەنـەبوەوە بـەدیهێناون‌و بـەگوێرەی حیکمـەت‌و ئەنـدازەو نەخشەی یەزدانی هاتوونە کایەوە. بەهەوانتەو بێهودە دروست نەکراون، هەر خودا خـۆی دروسـتی کـردون‌و یارمەتـدەرو هـاوەڵی نیـەو نـەبوە، چونکە غـەیری خـودا کەسی تر توانای دروستکردنی هیچ شـتێکیان نیـە، جگـە لەپـەروەردگار کەسـی تـر شیاوی بەندایەتی بۆ کردن نیە. بەڵکوو هەموو شتێك لەسـەر حـەق وەسـتاوەو بـۆ لای حەق دەگەڕێتەوە، هەروەکوو چۆن لەسەرەتاوە بەحەق بەدی هێنراون!

﴿تَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خودا بەرزو پـاك‌و مونەززەهـە لـەوەی هـاوەڵی هـەبێ، هاوەڵی بۆ دابنرێ!

﴿خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ﴾ پـەروەردگار خودایـەکی وەهایـە ئادەمیزادی لەدڵۆپـە ئـاوێکی کـەم‌و زەعیـف‌و هـیچ‌و پـووچ بـەدیهێناوە؛ کەچـی کـە پێگەییشت‌و گەورە بـوو بەربـەرەکانی خودای خـۆی دەکا؛ پێغەمبـەرەکانی بـەدرۆ دەخاتەوە، هاوەڵی بۆ دادەنێ، خودا بۆیە دروستی کردوە بەندایەتی بکا، نـەك دژی بوەستێ! بەربەرەکانی پەیامی خودا دەکا؛ دەڵێ: پاش مـردن زینـدو بوونـەوە نیـە، دەڵـێ: ﴿مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾یس/٧٨، نموونەی ئـەم ئایەتـە ئایـەتێکی تـرە: کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاء بَشَراً فَجَعَلَهُ نَسَباً وَصِهْراً وَكَانَ رَبُّكَ قَـدِيراً،

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَى رَبِّهِ ظَهِيراً﴾الفرقان/٥٤-٥٥.

چ بازدانێکی گەورەیە قورئان تەصویری دەکا: لەدڵۆپە ئاوێکی هیچو پووچەوە بۆ ئادەمیزادێکی سەر رەقو کێشەکار؛ سەرەتاو ئاکامیان چەند لێك دوورن؛ سەرەتا دڵۆپە ئاوو ئاکام ئادەمیزادێکی (حەنە حەبەشی کار)!!

سەرەتا دڵۆپە ئاوێکی زەعیف، پاشان، ئادەمیزادێکی سەر رەقی کافری خودا نەناس، یان دەڵێ خودا هەر نیە، یان ئەگەر دان بەبوونیشی دا بنێ، هاوەڵی بۆ دادەنێ!

دەگێڕنەوە: ئوبەی کوڕی خەلەفی (الجمحي) هاتە لای پێغەمبەرو ئێسقانە رزیوێکی بەدەستەوە بوو، وتی: ئەی موحەممەد! تۆ پێت وایە: خودا ئەم ئێسقانە رزیوە پاش پۆڵکانی زیندو بکاتەوە؟! ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو!!

ئایەتەکەی سورەتی (یس)یش هەر بەم بۆنەوە نازڵ بووە! (یس/٧٨).

ئەمجار پەروەردگار منەتی خۆی بەسەر بەندەکانی دا دەکاو نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی کە پێی بەخشیون رایدەنوێنێ! سەرەتا بەئاژەڵەکان دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ پەروەردگار بۆ سوودمەندی ئێوەی ئادەمیزاد حوشترو رەشە وڵاخو مەڕو بزنی دروست کردوە، گەلێ بەرژەوەندی جۆراو جۆرتان لێیان دەست دەکەوێ، لەپێستو کوڵكو خوری موو مەرەز یان پۆشاك دروست دەکەن، راخەر (بەڕەو مافورو لباد...) دروست دەکەن، کەڵکی تریشیان لێوەردەگرن، شیرو ماستیان دەخۆنو دەخۆنەوە، سەریان دەبڕنو گۆشتیان دەکەنە خۆراکی جۆراو جۆرتان!

﴿وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەئاژەڵدا جوانیو رازاندنەوە، دیمەنێکی زۆر جوان بەدی دەهێنن لەکاتی گەڕانەوەدا بۆ

حەوشەو ئاغەڵەکانیان، هەروەها لەو کاتەدا بەیانیان کە لێیان دەخوڕن بۆ لەوەڕگا، دیمەنێکی رازاوەو قەشەنگ دروست دەکەن! بۆیە دیمەنی گەڕانەوەی پێش دیمەنی لێخوڕین بۆ لەوەڕگا خست، چونکە دیمەنی هاتنەوەی ئاژەڵ لەلەوەڕگاوە بۆ کۆزو لانەو ئاغەڵەکانیان جوانترو رازاوەترە! تێرو تەسەلو گوان پڕ لەشیرو گەدە پڕ لەلەوەڕ، زیاتر خۆشی دەدەن بەدڵی خاوەنەکەیان چاویان پێیان گەش دەبنەوە، بۆیان دەبنە مایەی ئیعتیبارو هۆکاری بەروبوومو وەسیلەی دەستکەوت!

جوانی ئەم ئاژەڵو حەیوانانە جوانییەکی سروشتییە، پێک دێ لەجوانی تاکەکانو دیمەنە کۆیەکەیان.

هەروەها ئەو وڵاخانەی ئێمە بۆ ئێوەمان دروست کردوون، ئامێری ئیش کردنن، سواریان دەبن، شتو مەکی خۆتانیان پێ دەگوێزنەوە، ﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنفُسِ﴾ بارو بارگەنەی گرانی خۆتانیان پێ هەڵدەگرن، کاڵاو شتو مەکی بازرگانیو پێویستیاتی خۆتانیان پێ دەگوێزنەوە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، کە ئەگەر ئەو وڵاغەبارە بەرانە نەبن ئێوە ئەو شتو مەکانەتان بۆ ناگوێزرێنەوە، لەو وڵاتەوە ناتوانن بچنە وڵاتێکی تر مەگەر بەناڕەحەتیو ماندوبوونێکی زۆر!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾المؤمنون/۲۱-۲۲. یان دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾غافر/۷۹-۸۰.

بێگومان ئاژەڵ لەهەموو کاتو شوێنێکدا سەرمایەیەکی ئابووری گرنگە، نیعمەتێکی مەزنو فرە گەورەیە، بۆیە پەروەردگار کۆتایی ئایەتەکەی بەوە هێنا:

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان خودای ئێوە زۆر بەسۆزو میهرەبانە، ئەم ئاژەڵانەی بۆ رام کردوون، کردونی بەسەرچاوەی رزق و رۆژی و خێرو بەرەکەت، لەزۆر لایەنەوە سوودیان لێوەردەگرن! گەڵێ بەرژەوەندی جۆراو جۆرتان بۆ دابین دەکەن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَاماً فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ، وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾يس/ ۷۱-۷۲.

ئەمجار پەروەردگار پێدانی جۆرێکی تر لەسامانی حەیوان دەکاتە مایەی منەتی خۆی بەسەر بەندەکانی داو دەفەرموێ: ﴿وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً﴾ پەروەردگار بۆ ئێوەی دروست کردووەو رام کردوە ئەسپو هێسترو گوێدرێژ بۆ ئەوەی بەکاریان بێنن بۆ سواری و بۆ خۆرازاندنەوە پێیان، هەروەها بۆ گەلێ مەبەستی تریش!

خوێنەری هێژا! کاتێك گرنگی و سودبەخشی و جوانی ئاژەڵت بۆ دەرکەوێ و مانای ئایەتەکەت لەدڵ دا شیرینتر دەبێ: کە تۆ لەبیئەو کۆمەڵگایەکی وەکوو ئەو کۆمەڵگایەدا بی کە یەکەمجار قورئانی تێدا نازڵ بوو، هەڵبەتە ئێستاش ئەو جۆرە بیئەو کۆمەڵگایانە زۆرن، لەهەموو کۆمەڵگایەکی کشتو کاڵی دا؛ کۆمەڵگای کشتو کاڵیش تا ئەمڕۆ لەجیهاندا زۆرینەن.. ئا لەم بیئەو کۆمەڵگایانەدا نیعمەتی ئاژەڵ و بەسوودی و گرنگی ئەم جۆرە حەیواناتانەت بۆ دەردەکەوێ.

لەو جۆرە بیئەو کۆمەڵگایانەدا: کە ژیانی ئادەمیزاد بەبێ ئەو ئاژەڵانە بەڕێوە ناچێ، یان وەکوو پێویست دەستەبەر نابێ، گرنگی نیعمەتی ئاژەڵت جوانتر بۆ دەردەکەوێ!

هەڵبەتە ئەو ئاژەڵانەی لەرۆژگاری هاتنە خوارەوەی قورئاندا لەنێوە دوورگەی عەرەبدا باو بوون: حوشترو رەشەوڵاخ و مەڕو بزن بوون. ئەسپو

هێسترو گوێدرێـژ بـۆ سـواریو جـوانی بـەکار هێنـراون، ئـەم سـێ جـۆرە حەیوانـە گۆشتیان ناخورێ. قورئانی پیرۆز: کە راپاندەنوێنێ ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە هۆکارێکی سەرەکین بۆ ئەنجامدانی پێویستیاتی ئادەمیزادو دابینکردنی حەزو ئارەزۆکانیان!

لەحوشترو رەشـەولاخو بـزنو مـەڕدا وەکوو ئاماژەیـان پـێ کـرا گـەلێ سوودو بەرژەوەنـدی جیـا جیـا هـەن، سـوود لەپێـستو کوڵـكو مـوو خـوریو مـەرەزیان وەردەگـیرێ، شـیرو گۆشـتیان دەخـورێ، بەهەنـدێکیان بـارو بارگەنـەو کالاکانتـان دەگوێزنەوە، دەبنە مایەی جوانیو دڵخۆشبون: کە ئێواران لەلەوەڕگاوە دەگەڕێنەوە بۆ کۆزو ئاغەڵی خۆیـانو بـەیانیان لێیـان دەخـوڕن بـۆ کێـوو کـەژ. هەڵبەتـە گونـد نشینو ئاژەڵدارەکان زۆر باشترو جوانتر لەشارەستانیەکان لـەم مانایـە حـاڵی دەبـنو کاریان تێ دەکا!

ئەمجار پاش رونکردنەوەی دروستکردنی ئاژەڵو ئەسـپو هێـسترو گوێدرێـژو سوودە تایبـەتیو گـشتییەکانیان بـۆ ئـادەمیزاد، مەجالەکـە بـەکراوەیی دەهێڵێتـەوە لەبەردەم بـیرو بۆچـونی ئـادەمیزاددا، بـۆ ئـەوەی ئەگـەر لـەدوا رۆژدا ئـامێری تـری پێشکەوتوو هاتنە کایەوە بۆ حەملو نەقڵو سواریو جوانیو رازاندنەوە، عـەقڵیان وەری بگرێو بەلایانەوە ئاسایی بێ، هەمیشە بەچاوی کراوەو عەقڵی کراوەوە هەوڵ بـدەن بـۆ پێـشکەوتنو سـەرکەوتنو پـشکنینی بونـەوەرو سـوود لێ بینینـیو دەفەرموێ: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ پەروەردگار بۆ ئێوە دروست دەکا غـەیری ئـەم ئاژەڵو بارەبـەرو ولاغـی سواریانە، ئـامێرو هۆکـاری گواسـتنەوەی خۆتـانو کـالاو بەروبومتان لەقەتارو ئوتومۆبێلو کەشتیو فڕۆکەو ئەم جۆرە شـتانە، شـتی واتـان بـۆ دروسـت دەکـا، عـەقڵی دروسـتکردنی ئـامێری واتـان پـێ دەبەخـشێ: کـە ئێـستا بەخەیاڵێشتاندا نایە، فێری دروستکردنی شتی واتان دەکا کە ئێستا نایزانن..

بەڵێ پەروەردگار بەم ئایەتـە عـەقڵی ئادەمیزاد دەکاتـەوە، تەصەورو بیریـان بـەرفراوان دەکـا، وایـان لێـدەکا بـیر لەپێـشکەوتن بکەنـەوە، پێیـان دەزانێنـێ: کـە

لەهەموو کاتو شوێنێکدا جگە لەو دیمەنەی دەیبینن دیمەنی تریش هەن، لەو ئامێرانەی بەکاریان دەهێنن بۆ پێویستیاتی ژیانیان، ئامێری پێشکەوتوتر هەن! بابیریان لێبکەنەوە، هەوڵ بدەن بیاندۆزنەوە، دروستیان بکەن، پەروەردگار دەیەوێ هەمیشە ئادەمیزاد ئاسۆی فیکرو بۆچوونی بەرفراوان بێ، دەیەوێ کاتێك ئەو ئامێرانە بەدی هێنران ئولفەتیان پێوە بگرن، بەکاریان بێنن، بەسیحرو جادویان حیساب نەکەن، نەڵێن: باوكو باپیری ئێمە کەر بارەبەریان بووە، سواری سۆپەرو مارسیدیس نابین، نەڵێن: خودا باسی ئەو چەند ئاژەڵەی کردوە، ئەو بارەبەرە گیانلەبەرانەی بۆ دیاری کردوین، ئیتر ئێمە هیچی تر بەکار ناهێنین!

بێگومان ئیسلام بیرو باوەڕێکی کراوەو گونجاوە، لەگەڵ هەموو ژیانێکی پێشکەوتوو تازەپەیدا بوو، هەمیشە ئامادەباشی تێدایە بۆ پێشوازیکردن لەهەموو رووداوێکی ژیان.

بۆیە قورئان هەر لەسەرەتاوە زەینو دڵەکان ئامادە دەکا بۆ پێشوازیکردن لەهەر ئامێرو وەسیلەیەکی پێشکەوتوو تواناو دەسەڵاتی ئادەمیزاد بەدی دەهێنێ، زانستو زانیاری ئادەمیزاد پەی پێ دەبا، رۆژگاری داهاتوو دەیانخاتە ڕوو!

بێگومان ئەمڕۆ هۆکاری حەملو نەقلی وا پەیدا بووە، ئامێری سواریو جوانکردنو رازاندنەوەی وا پەیدا بووە خەڵکانی پێشوو ئادەمیزادی سەردەمەکانی رابوردو پەیییان پێ نەبردوە، بەخەیاڵیشیاندا نەهاتووە، دیارە لەداهاتووشدا هۆکاری ئاسانکردنی ژیانو ئامێری گواستنەوەو سواری وا پەیدا دەبن ئادەمیزادەکانی ئەم سەردەمە نایزانن!

ئەمجار وێڕای ئەم گۆڕانکاریو پێشکەوتنە لەژیاندا، لەدروست کردنی ئامێرو هۆکارەکانی دا، لەدۆزینەوەی رێبازە جیا جیاکانی پێشکەوتنو گەشەپێدانی ژیاندا. رێگایەکی تری نەگۆڕ هەیە، رێگایەکە بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد، یەك رێگایەو نابێ بەزیاترو ناگۆڕێ، ئەویش رێگایە بۆ بەختەوەری، رێگایەکی راستو رەوانو

بێ چاڵو چۆڵییە، بێ کەندو لەندو قۆرتو پێچە، ئەویش ڕێگایە بۆ لای خودای مەزن! ڕێگای تریش هەن بەڵام ڕێبازی گومڕاییو سەرلێ شێوانن، ڕێگایەکن ئادەمیزاد ناگەیەننە مەبەست، پەروەردگار ڕێگای راستو ڕەوانی بۆ لای خۆی ڕون کردۆتەوە، بەهۆی نیگاو سروش بۆ پێغەمبەران ڕاستیو حەقیقەتی ئەو ڕێبازەی شی کردۆتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى اللّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ﴾ پەروەردگار بەفەضلو کەرەمی خۆی ڕێگای راستو پەیوەست بەخێرو خۆشیو بەختەوەری هەردو جیهانەوەی ڕون کردۆتەوە. بەڵگەی جۆراو جۆری لەبوونەوەردا لەسەر نمایش کردون، نامەی ئاسمانی لەو بارەوەو بۆ ئەو مەبەستە ناردوونە خوارێ، پێغەمبەرانی ڕەوانە کردون بۆ دۆزینەوەی ڕێگای راستو پەیڕەو کردنی ناسینی ڕێگا ناڕاستەکانو خۆ دوور خستنەوە لێیان! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ﴾الأنعام/١٥٣.

ئەمجار پەروەردگار بەندەکانی لەپەیڕەوکردنی ڕێگای خوارو خێچ ترساندوەو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهَا جَائِرٌ﴾ ڕێگا هەیە ڕێگای خوارو ناڕاستە، ئادەمیزاد بەرەو هەڵدێر دەبا، لەڕێبازی حەق دووری دەخاتەوە!

ڕێبازی راستو دروست ئایینی ئیسلامی پیرۆزە، ڕێگا خوارو خوارەکان ڕێبازی نەشازی ئایینەکانی ترە کە بەهاتنی ئیسلام سڕاونەوە! چونکە ئایینی ئیسلام ئایینی یەکتاپەرستیو گونجاو لەگەڵ سروشتە، ئایینی فیطرەتو خودا پەسندە، ئایینی هەڵبژاردەو بێ خەوشە، ئایینی سەر فرازیو ئازادیو بەختەوەرییە! خودا بۆ خۆی پێی رازییە، تێکەڵ بەسروشتی ئادەمیزادی کردوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ...﴾الروم/٣٠.

هیدایەتدان بەقودرەتی خودایە ﴿وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە هەمووتانی هیدایەت دەدا، بەلام ئەو ویستەی نەبوە. بەلکوو ویستی وابوە ئادەمیزاد وا دروست بکا: ئامادەباشی هیدایەت وەرگرتن و گومڕابوونی تێدابێ، توانای ئەوەی داوەتێ بتوانێ رێگای هیدایەت یان گومڕابوون هەڵبژێرێ، جا هی وایان هەیە رێگای راست و خودا پەسند دەگرێتەبەر، هی واشیان هەیە رێگای چەوت دەگرێتە بەر، هەردووکیشیان لەچوارچێوەی ویستی خودادا کارەکانیان ئەنجام دەدەن!

## تێبینییەکی گشتی:

ئایەتەکان بەروونی ئەوە دەگەیەنن کەئەو ئاژەڵانە ژێربار کراوان بۆ ئێوە سوودو گرنگی زۆرو هەمەچەشنەیان هەیە، سوودی جەستەییان لێدەبینن؛ بەخواردنی گۆشتەکەیان، سوودی بەروبومیان بەشیرو بێچویانەوە، کەڵکی کوڵک و خوری و موو مەرمز و پێست و بەرگنیان، سوودی سوار بوون و شتومەك پێ گواستنەوەیان لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر، سوودی زەوی پێ کێڵان و گەلێ شتی تریش، کەوابوو پێویستە ئادەمیزاد سوپاسی ئەم هەموو نیعمەتانە بکا، لەبەرامبەریاندا عیبادەتی خودا بکا نەك سپڵەیی بکا.

ئەوەش دەگەیەنن: کە رەوایە ئەو ولاخانە بەکاربهێنرێن بۆ سواری و شت و مەك گواستنەوە، بەلام بەئەندازەی توانای خۆیان و نابێ زیاد لەتوانایان باریان لێ بندرێ، زیاد لەقۆناغی ئاسایی و موعتاد رێگەیان پێ ببڕدرێ. نابێ زیاد لەحەد پەلەیان لێ بکرێ بۆ رۆیشتن. بێگومان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوین کە لەبەکار هێنانیاندا هێدی و هێمن بین، خۆراك و ئاوی خواردنەوەیان بۆ دابین بکەین.

ئیمـامی موسـلیم لەئـەبوهورەیرەوە فەرموودەیـەك دەگێڕێتـەوە دەڵـێ:
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اذا سافرتم في الخصب، فاعطوا الابل حظها من الأرض، واذا سافرتم في السنة فبادروا بها نقيها).

هەروەها گیانلەبەرەكانی تر، ئەوانەی خودای مـەزن بـۆ بەرژەوەنـدی ئێمـەی ئادەمیزاد دروستی كردوون! وەكوو: ئەسپ و ئێستر و گوێدرێـژ، ئەمـەش بەڵگەیـەكی تـرە لەسـەر توانـاو دەسـەڵاتی پـەروەردگارو زێـدە فـەضـڵ و كـەرەمی خۆیـەتی بـۆ بەندەكانی.

بۆیە زانایان فەرموویانە: پـەروەردگار ئـەم ئـاژەڵ و وڵاخانـەی كردۆتـە مڵكـی ئێمەو بۆی رام كردوین و سوود لێ وەرگرتنیانی بۆ حەڵاڵ كردوین، هەر ئـاژەڵێكیش ئادەمیزاد بتوانێ بیكاتە مڵكی خۆی دەتوانێ بەكرێی بدا.

ئیمام ئەبو حەنیفـەو ئیمـام مالیك و هـی تـریش، ئایـەتی ﴿وَالْخَيْـلَ وَالْبِغَـالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَـا وَزِينَـةً﴾ یـان كـردوە بەبەڵگـە لەسـەر ئـەوە: كـە گۆشـتی ئەسـپ و هێـستر و گوێدرێـژ نـاخورێ و خـواردنی حەرامـە، چـونكە پـەروەردگار بـۆ ئەمانـە دەفـەرموێ: بـۆ سـواری و بـۆ جـوانی. نافـەرموێ: بـۆ خـواردن. بـەڵام بـۆ ئـاژەڵ فـەرمووی: ﴿وَمِنْهَـا تَـأْكُلُونَ﴾ خـواردنی گۆشـتی حوشـتر و رەشـەوڵاخ و مـەڕ و بزنـی بەهۆی سەربڕینی شەرعییەوە بۆ حەڵاڵ كردوین.

ئـەوەی پـشتگیری ئـەم رایـە دەكـا فەرموودەیەكـە: ئەحمـەدو ئـەبو داوودو نەسـائی و دارقـوطنی و هـی تـریش ریوایـەتیان كـردوە لەخالیـدی كـوڕی وەلیـدەوە: دەڵێ پێغەمبـەری خـودا رۆژی خەیبـەر جڵەوگیری لێكـرد یـن لـەخواردنی گۆشـتی ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژو هەموو دڕندەیەكی خاوەن كەڵبـەو هـەموو باڵندەیـەكی چنگدار.

ئیمامی قورطوبی (کە بۆخۆی مالیکی مەذهەبە) دەفەرموێ: قسەی راستو حەقو بەجێ ئەوەیە: کە گۆشتی ئەسپ دەخورێو ئایەتو حەدیثەکان نابنە بەلگەی حەرامبوونی گۆشتی ئەسپ: یەکەم ئایەتەکە: کە بەلگەی ئەوەی تێدا بێ، دەبێ بەلگەی حەرامی گۆشتی گوێدرێژیشی تێدا بێ، دەی خۆ سورەتەکە مەککیە، کەوابێ چ پێویستییەك هەیە بۆ تازە کردنەوەی حەرامی گۆشتی گوێدرێژ لەسالّی خەیبەردا.

سەرباری ئەوەش، لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە: کە خواردنی گۆشتی ئەسپ حەلاّلە.

ئیجماعی موسولّمانان لەسەر ئەوە بەستراوە: کە گۆشتی ئەسپ دەخورێو لەفەرموودەی پێغەمبەردا ئەمە چەسپاوە.

ئیمامی موسلیم لەجابیرەوە فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە. دەڵێ: (نهی رسول الله یوم خیبر عن لحوم الأهلیة، واذن في لحوم الخیل).

نەسائی لەجابیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رۆژی خەیبەر گۆشتی ئەسپی دەرخوارد داین، نەهی لێکرد ین لەخواردنی گۆشتی گوێدرێژ.[٩]

## چەند بەلّگەیەکی تر بۆ چەسپاندنی ئولوهییەتو تاكو تەنهایی خودا

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۖ لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ

(٩) تەفسیری قورطوبی ج١٠/٧٦-٧٧.

وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿١٦﴾

ئـەم ئایەتانـە تەواوکـەری بەڵگـەکانی تـرن: کـە لـەوەپێش بـۆ چەسـپاندنی هـەبوونی پـەروەردگارو تـاكو تـەنهایی زاتـی پـاکی هێنرابـوون، لێـرەدا باسـی بــەدیهێنانی روەكو سروشــتەکانی دەکــا، باســی چــوار عونــصورە ســەرەکییە پێویستەکانی ژیان دەکا: کە بریتین لە(ئاوو گڵو ئاگرو هەوا).

باسی هەڵسورانی بوونەوەر دەکا، باسی دەریاو کێوو کەژ، باسی بارینی بارانو کاریگەری لەسەر ژیان ... ئەمانە هەموو دەکاتە بەڵگە لەسەر خودایەتی خۆی!

دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَـاءً لَكُـمْ مِنْـهُ شَـرَابٌ وَمِنْـهُ شَـجَرٌ فِيـهِ تُسِيمُونَ﴾ ئـەو خودایـەی ئاسمانـەکانو زەویو ئـادەمیزادو ئـاژەڵو وڵاخـی سواریو گیانلەبەری تری دروست کردوە هەر ئەو خودایەیە: کە بارودۆخی ژیانی بۆ ئێـوەی ئـادەمیزاد فەراهـەم هێنـاوە: لەبەرزاییـیـەوە بـارانی بارانـدوە، کردویـەتی بـەئاوێکی شیرینی گوارا بەخۆشـی دەیخۆنـەوە، نـەیکردوە بـەئاوێکی تفتو تـاڵو سوێرو بـێ خێر، هەر بەو ئاوە دارو درەختو کشتو کاڵتـان ئـاو دەدەن، یـان بـەبێ دەسـتکاری ئێوە بارانەکە خۆی ئاوی دەدا، کەژو کێوو دەشتو ساراتان بۆ شینو زەنـوێر دەبـێ، ئاژەڵی لێ دەلەوەڕێنن دەبێتە خێـرو بەرەکـەتو بـۆ خۆتـانو ئـاژەڵو گیانلـەبـەرانی تر.

﴿يُنبِتُ لَكُمْ بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالأَعْنَابَ وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ هـەر بـەو بارانو ئاوە بۆ ئێوە دەڕوێنێ کشتو کاڵ بەهەموو جۆرێکیەوە، داری زەیتونو داری خورمـاو مێوو هەموو درەختێکی تـری بـەردارتان بـۆ دەڕوێنـێ، بـۆ ئـەوەی رزقو رۆژیو بەروبومو میوەتان بۆ دابین بکا، بتوانن درێژە بەژیانی تێرو تەسەلی خۆتان بدەن، ببنە نیعمەت بەسەرتانەوە شوکرو سوپاسی بکەنو پاداشـتان بداتـەوە، ببنـە بەڵگە بەسەر بێ بڕوایانو بیانوویان نەمێنێ ئەگەر سزایان بدا .

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَـةً لِقَـوْمٍ يَتَفَكَّـرُونَ﴾ بێگومـان لـەو شـتانەی باسـكران بەڵگـەو نیشانەی بەهێز هەن: لەسەر ئەوەی؛ كە هیچ خودا نـین جگـە لـەزاتی پـەروەردگار. بەڵگـەی بـەهێز هـەن بـۆ كەسـانێك پەنـدو ئامۆژگـاری وەربگـرن، بـیر لـەو تێكەولێكەیـەی سروشـت بكەنـەوە، بـۆ ئـەوەی دڵیـان بـەئیمان ئـارام بگـرێ، دڵیـان بەباوەڕ روناك بێتەوە، نەفس‌و دەروونیان مشت‌و ماڵ بكرێ!

كەسێك بیر بكاتەوە، كە دەنكە تۆم دەكەوێتـە ژێـر گڵەوە، شێ‌و تـەڕایی پـێ دەگـاو كـاری لێـدەكا ، لای خـوارووی قـەڵش دەداو رەگـو ریـشاڵی لێ پەیـدا دەبـن، بەزەویدا ڕۆدەچێ و، لاسك‌و قەدەكەی لەزەوی دێتـە دەرو گەشـە دەكـاو لق‌و پـۆپ دەردەكا، گوڵ‌و دانەوێڵەو بەروبووم بەجۆرەها قەبارەو شێوەو شكڵ‌و رەنگ‌و بـۆن‌و بـەرام‌و تایبـەتی‌و سروشـتی لێ پەیـدا دەبـێ، دەزانـێ خودایـەك ئەمـە ئـاثـارو دروستكراوی بن، نابێ‌و ناگونجێ خودایەكی تر هەبێ لەو بچێ لەزات‌و صیفاتدا. چ جایی لەتایبەتمەندی ترین صیفاتی دا كە ئولوهییەتە!

شاعیرێكی عەرەب لەم بارەوە دەڵـێ:

| | |
|---|---|
| تـــأمل في ريــــاض الــــورد وانــــظر | عيـــون مــن لـــجين شــــاخـصات |
| علــى قُـــضُب الزبــر جــد شــاهدات | الى آثـــار مـــا صنـــع المـليـــك |
| عـــلى أهـدابـهـــا ذهـــب سـبيك | بــــأن الله لـيـــس لــــه شــريك |

نموونـەی ئـەم ئایەتـەی ئێـرە ئایـەتێكی تـرە: كـە دەفـەرموێ: ﴿أَمَّـنْ خَلَـقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَـانَ لَكُـمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾النمل/٦٠.

ئـەمجار پـەروەردگار نیـشانە گـەورەكانی بوونـەوەر رادەنوێنـێ منـەتی خـۆی بەسەر بەندەكانی دا دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالـشَّمْسَ وَالْقَمَـرَ وَالنُّجُـومُ مُـسَخَّرَاتٌ بِـأَمْرِهِ﴾ بەشـێكە لەنیعمـەتی خـودا بەسـەر ئێـوەدا وێـڕای نیعمەتـەكانی تـری كـە شـەوو رۆژی بـۆ ئێـوە رام كـردوە، بەشـوێن یـەكتردا دێـن‌و

دەچن، بۆ ئەوەی شەو بکەنە کاتی نوستن‌و پشوودان، بەرۆژیش هەوڵی دابینکردنی بـژیوو بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییـەکانتان بـدەن، خـۆرو مـانگی بـۆ رام کـردوون، بەشوێن یەکتردا دێن‌و دەڕۆن بۆ ئەوەی روناکی‌و گەرمی بدەن بەزەوی، ئێوەو دارو درەخـتو گـژو گیانلەبـەرانی تـر کـەڵکیان لێ وەربگـرن، گەشـەیان پـێ بکـەن، بەروبوومیان هەڵبێچن‌و پێ ی بگەیەنن، ژمارەی رۆژو مـانگ‌و ساڵ بـزانن، ئاسمـان بڕازێنێتـەوە بەئەسـتێرە چەسـپاوو گەڕۆکـەکان نـوورو رونـاکی خۆیـان ببەخـشن بەئادەمیزاد لەتاریکی شەودا بیانکاتە نیشانەی رێگاوبانی لـەدەریاو سارادا. هـەموو ئەم خۆرو مانگ‌و ئەستێرانە لەجەمسەری خۆیاندا دێن‌و دەچـن بـەگوێرەی یاسـاو نیظامێکی وردو جم‌و جوڵێکی ئەندازەدارو نەخشە بۆ کێشراو، زیـادو کـەم ناکـەن، هەموویان گەردنکەچی دەسەڵاتی بەرفراوان‌و بێ سنووری پەروەردگارن!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومـان لـەرامکردنی هـەموو ئەوشـتانەی باسـکران بەڵگـەو نیـشانەی ئاشـکراو رون هـەن بـۆ کەسـانێك عـەقڵی بیرکردنـەوەو تێگەییشتن لەنیشانەو ئایەتەکانی خودایان هەبێ.

کۆتایی ئایەتی پێشوو بە(یتفکرون) هێنا؛ کۆتایی ئـەم ئایەتـەی بـە(یعقلون) هێنا. چونکە ئایەتەکەی ئێرە ئاماژە بۆ ئـاثـارو نیـشانەی عالـەمی بـاڵا دەکا ، هـەر کەسێ عەقڵی هەبێ دەزانێ کە دروستکردنی ئەو هەموو ئەسـتێرەو مـانگ‌و خـۆرو گۆڕانی شەوو رۆژ بەو شێوە رێك‌و پێکـە دەبـێ خودایـەکی باڵادەسـتی زانـاو دانـای هەبێ. پێویست بەڵێ وردبوونـەوەی زۆر ناکا، بـەڵام ئایەتەکـەی پێـشوو ئامـاژە بـۆ ئاثارە بەردەست‌و نزیك‌و نزمەکان دەکا: وەکوو کشت‌و کاڵ‌و دارخورمـاو زەیتـون‌و داری مێـو...هتـد. ئەمـە پێویـستی بەلێوردبوونـەوەو تێفکـرین هەیـە بـۆ ئـەوەی بیانکەینە بەڵگە لەسەر هەبوونی خودایەکی بەتواناو بەدیهێنەر!

ئەمجار سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بـۆ دروسـتکراوانی سـەرزەوی بەهـەموو جۆرەکانیـەوە، دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا ذَرَأَ لَكُـمْ فِـي الأَرْضِ مُخْتَلِفـاً أَلْوَانُـهُ﴾ هـەروەها

بەلگەیەکی تر لەسەر هەبوونی خودا ئەو شتانەیە: کە خودا لەزەویدا بەدیهێناون، بەکانو کانیاوو گژوگیاو گیانلەبەرو درەختو دیاردەو دیمەنو تایبەتمەندی هەر جۆرە شتێك، رەنگو روخسارو سودبەخشییان بۆ ژیان، کە هەر یەکەو رەنگی جیایە، تامی جیایە سوودی جیایە...هتد.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ بێگومان لەو شتانەدا کە باس کران بەلگەو نیشانەی بەهێز هەن لەسەر بەدەسەلاتی پەروەردگار بۆ کەسانێك بیر لەنیعمەتەکانی پەروەردگار بکەنەوە، سوپاسی بێ پایانی زاتی پاکی بەدیهێنەر بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە جۆراو جۆرو زۆرو گرنگانە!

دوای ئەوەی بەلگەی لەسەر هەبوونی خودا هێنایەوە بەجیرمو قەبارەی ئاسمانەکان، ئەمجار بەجەستەی ئادەمیزاد خۆی، پاشان بەگیانلەبەرو تایبەتمەندییەکانیان. چوارەم جار بەسروشتی روەكو گژوگیاو درەخت ئەمانەی کردن بەنیشانەی هەبوونی خوداو بەتواناییو زانایيو دانایی زاتی پاکی. ئەمجار دێتە سەر بەلگە هێنانەوە بەدیاردە سەرسوڕهێنەرەکانی چوار عونصورە سەرەکییەکەی بوونەوەر (ئاوو گڵو ئاگرو هەوا) دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْماً طَرِيّاً﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە دەریای بۆ ئێوە رام کردوە، وای بەدیهێناوە دەتوانن بەهۆی بەلەمو کەشتییەوە بەناویدا گەشتو گوزار بکەن، شتو مەکی خۆتانی بەناودا بگوێزنەوە. هەوڵی راوکردنو ماسی گرتنی تێدا بدەن، بۆ ئەوەی گۆشتی تەڕو تازەی لێ بخۆن، گۆشتی ماسی بۆ حەلاڵ کردوون بەزیندوويیو بەمردوويی گۆشتەکەی دەخورێو سەربڕینی ناوێ!

کە دەفەرموێ: (لحما طريا) ئاماژەیە بۆ ئەوە کە گۆشتی ماسی دەبێ زۆر نەمێنێتەوە بخورێ، چونکە کە ماوەیەك مایەوە گۆڕانکاری بەسەردا دێ، زۆر زیانبەخش دەبێ بۆ تەندروستی ئادەمیزاد.

بۆ ئێوەی دروست کردوە لەناو دەریادا لوئلوء مەرجان و جەواهیر تری بەنرخ و بەها. بەهۆی ئامێری جیا جیاوە دەتوانن بچنە ناو دەریاوە، بڕۆنە بنکی دەریاوە ﴿وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ دەردێنن لێی خشڵ و ئامێری رازاندنەوە کە خۆتان و خێزانەکانتانی پێ دەڕازێننەوە. لوئلوئو مەرجان دەردێنن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾الرحمن/٢٢.

لوئلوئو: دروست دەبێ لەناو صەدەفی ئەوحەیواناتەی لەدەریادا دەژین، بەتایبەتی لەموحیطی هیندیدا.

مەرجان: لەبنکی دەریادا دەڕوێ، چەندەها جێگای مەرجان لێ روان لەدەریای سپی ناوەڕاستا لەئاستی وڵاتی تونس و جەزائیردا هەیە، هەر کاتێ وەختی دروێنەی هات حکوومەتی فەرەنسا دروێنەی دەکاو دەیفرۆشێتەوە بەوڵاتە (بەناو ئیسلامییەکان) بەڕۆنی خۆمان چەورمان دەکەن.

سوبحانەڵلا هەر دەڵێی موسوڵمانان قورئان ناخوێننەوە، دەڵێی مەخلووقی ئەم سەرزەوییە نین، هەر وەکوو ئەوە پەیمانیان دابێ بەخودا بڵێن: خودایە! ئێمە لوئلوئو مەرجان دەرناهێنین دەیکڕین، ئێمە دەست و پێ سپی و بێ دەسەڵاتین!! هەروەکوو ئەوە ئەو ئایەتە بۆ ئەوان نەهاتبێ و ئاراستەی ئەوان نەکرابێ! بەو هەڵوێستەشیان ئەوەی خودا بۆی حەڵاڵ کردون ئەوان لەخۆیان حەرام کردوە.

ساڵی (١٨٨٦ی ز) (٧٧٨) هەزار کیلۆ جرام مەرجان دەرهێنراوە کە بایی پێنج ملیون و حەوت سەدو پەنجا هەزار فرەنك بووە.[1]

﴿وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ﴾ دەریامان رام کردوە بۆ هاتوچۆی ئێوەی ئادەمیزاد، ئەتۆ دەبینی کەشتی بەناو ئەو دەریا قوڵ و پان و پۆڕەدا دەڕوا، بەگەردن و لووتی ئاوەکە شەق دەکا، لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لەکیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر،

[1] - تەفسیر مەراغی ج١٤/٦١

بۆ گواستنەوەی ئەو کالاو شتو مەکانەی لەوێ هەنو لێرە پێویستیمان پییە، یان لێرە هەنو لەوێ پێویستیان پییە! بۆیە فەرمووی ﴿وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ﴾ بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن فەضلو رزقو رۆژی کە خودا بۆی دیاری کردون بەدەستی بێنن!

﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی خودای خۆتان بکەن لەپاساوی ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیون، ئاوا بەسەر دەریادا بالاّ دەستی کردون، دەتوانن سوودی لێ وەربگرن، وای کردوە دەریا؛ کە شوێنی تێدا بەهیلاکچوونە بۆی کردوون بەسەرچاوەی سودو بازرگانیو رزقو رۆژی!

﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ﴾ دایناوە لەسەر زەوی چەند کێوێکی دامەزراوو چەسپاو بۆ ئەوەی زەوی هەڵتەکو داتەک بەمێوە نەکا، ژیان لەزیندەوەرانی سەری تێك نەدا، چونکە زەوی وەکوو گەمییەك وایە بەسەر ئاوەوە ئەگەر گەمێکە قەبارەی قورسو سەنگینی لەسەر نەبێ جوڵەجوڵ دەکا بەکەمترین هێز ئەملاو ئەولا دەکا ، ئەگەر شتی قورسی تێخرا ئیتر دادەسەکنێ، زەویش هەروایە، ئەگەر کێوی لەسەر نەبنو نەبنە لەنگەر بۆی هەڵتەکو داتەك دەکا..

﴿وَأَنْهَاراً﴾ پەروەردگار بەدی هێناوە لەزەویدا چۆمو روبار لەشوێنێکەوە دەکشێن بۆ شوێنێکی تر، کە دەبنە هۆی ژیانو گەشەکردنی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترو درەختو روەك. بەئاوی ئەو چۆمانە زەویو زاری دەوروبەریان ئاو دەدرێ، جۆگاو جۆباریان لێوە هەڵدەگیرێ بۆ شوێنی تر! ئەم چۆمانە هەندێکیان لەخۆر ئاواوە بۆ خۆرهەلاّتو هەندێکیان بەپێچەوانەوەو هەندێکیان لەباکورەوە بۆ باشوورو هەندێکیان بەپێچەوانەوە رەوان دەبن تا دەگەن بەدەریاکان.

﴿وَسُبُلاً﴾ هەروەها پەروەردگار ڕەخساندویەتی لەزەوی دا چەند ڕێگەوبانێك كە ئێمە پێیاندا دەڕۆین لەوڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر. وا ڕێ دەكەوێ لەناوەندی ڕێگەو بانەكاندا تووشی كێوێك دێین كەلێكی تێدەكەوێو پێی دەگوترێ: دەربەند.

﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بۆ ئەوەی شارەزابین‌و سەرتان لێ تێك نەچێ‌و بگەنە قۆناغی مەبەستتان!

﴿وَعَلامَاتٍ﴾ هەروەها پەروەردگار لەزەویدا ڕەخساندویەتی چەند نیشانەو دیاردەیەك وەكوو گردو كێوو شیوو دۆڵ بۆ ئەوەی ئەگەر ڕێبوار سەری لێ تێك چوو ئەم تەپۆڵكەو گردو كێوو شیوو دۆڵانە ببنە یارمەتیدەری‌و ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە چ لەدەریادا بێ چ لەوشكانی دا بێ!

﴿وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ هەروەها پەروەردگار ئەستێرەی كردوون بەنیشانە بۆ ڕێگەو بان، ڕێبوار بەهۆیانەوە ڕێ دەردەكا، هەروەها نیشانەو دیاردەن بۆ وەرزی كشت‌و كاڵ، بۆ گردكردنەوەی بەروبووم‌و تاقەتكردنی ژیواری ئادەمیزادو باقی گیانلەبەران، بەهۆی دەركەوتنی هەندێ ئەستێرەوە یان بەهۆی ئاوابوونیانەوە، یان بەهۆی دەركەوتنیان لەئاسماندا بەشێوەیەكی تایبەتی ئادەمیزاد ڕێ‌و شوێنی كارەكانیان دەزانن، گۆڕانی وەرزەكانی ساڵیان بۆ ئاشكرا دەبێ.

قەتادە دەفەرموێ: پەروەردگار ئەستێرەكانی بۆ سێ مەبەست دروست كردون، بۆ ئەوەی ببنە هۆی ڕازاندنەوەی ئاسمان، ببنە نیشانە بۆ ڕێگاو بان، شەیاتینییان پێ ڕەجم بكرێ‌و بڕەتێندرێن، هەر كەسێ لەم سێ مەبەستە زیاتر بڵێ: لەخۆوەو بەهەوانتە قسە دەكا.

### شتە تايبەتمەندييەكانى ئولوهييەت: بەديهێنان، زانينى هەموو پەنامەكىو ئاشكرايەكو زيندويى هەميشەيى

﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾

دواى ئەوەى لەئايەتەكانى پێشوودا بەڵگەو نيشانەى جۆراو جۆرى رانواندن لەسەر هەبوونى خودايەكى بەتواناو داناو زانا، هەندێ نيعمەتى پەروەردگارى بەسەر بەندەكانى دا باس كردن، ئەمجار لێرەدا تايبەتمەندى ئولوهييەت رادەنوێنێ: كە بريتين: لەبەديهێنانو دەستڕەنگينى لەدروست كردندا، زانينى شتى پەنامەكىو ئاشكرا، ژيانى ئەبەدى كە ئەم صيفاتە تايبەتييە سەرەكييانە بەڵگەن

لەسەر ئەوە: کە عیبادەتو پەرستش هەر شایانی ئەو پەروەردگارەیە، جگە لەو خاوەن نیعمەتە مەزنانە کەسی تر شیاوی بەندایەتی بۆ کردن نیە.

ئەمجار باسی ئەوە دەکا: کە هۆی هاوەڵدانان بۆ خودا دڵڕەقیو نەزانیو گومڕاییە، لەهەموانیش گومڕاتر پەرستنی ئەو بتو صەنەمە بێ گیانو بێ هەستانەیە: کە بەدەستی خۆیان دەیانتاشنو بەندایەتییان بۆ دەکەن.

لەوەپێش ئایاتی خەلقو ئایاتی نیعمەتی ڕانواندن، ئایاتی تەدبیرو بەڕێوەبردنو هەڵسوڕاندنی بوونەوەری نمایش کردن، ئەمەش بۆ ئەوەی بیانکاتە بەڵگە لەسەر تاكو تەنیایی خوداو پاكو مونەززەهی لەهاوەڵو منداڵو خێزانو یارمەتیدەر!

جا کە دڵو دەروونەکان ئامادەبوون بۆ ئیعتیرافو دان پیانان فەرمووی: ﴿أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لا يَخْلُقُ ؟﴾ ئایا کەسێك بتوانێ ئەو هەموو شتانەی باسکران بەدی بێنێ، ئەو هەموو تەصەروفاتە سەرنج ڕاکێشانە بکا؟ ئایا خودایەك کە بۆ خۆی پەروەردگاری بوونەوەرە ڕاگرو هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەرە، وەکوو شتێك وایە: کە هیچ کارێکی پێ نەکرێو توانای دروستکردنی هیچ شتێکی نەبێ؟

﴿أَفَلا تَذَكَّرُونَ ؟﴾ ئایا ئێوە هێشتا بیر ناکەنەوەو هەوڵی ئەوە نادەن ڕاستو ناڕاست لێك جیا بکەنەوە؟ خۆ بەس پێویستیتان بەبیرکردنەوە هەیە، شتەکە ئەوەندە ڕوونو ئاشکرایە تەنیا بیرکردنەوەی گەرەکە!

ئەمجار سەرەنجی بەندەکانی ڕادەکێشێ بۆ گەورەیی خۆیو زۆری نیعمەتەکانی بەسەریاندا، دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لا تُحْصُوهَا﴾ ئەگەر بتانەوێ نیعمەتەکانی پەروەردگار بژمێرنو کۆنتڕۆڵیان بکەن، ناتوانن سەرژمێریان بکەن، چونکە نیعمەتەکانی خودا زۆرو هەمە جۆرن، ئادەمیزاد ناتوانێ کۆنتڕۆڵیان بکا. ئێوە ناتوانن نیعمەتەکان بژمێرن چ جایی سوپاسی پێویست لەسەر ئەو

نیعمەتانە بکەن، زوربەی نیعمەتەکان ئادەمیزاد بۆ خۆی هەستیان پێ ناکا، مەگەر کاتێ کە نیعمەتەکەی لەکیس دەچێ، هەر لەپێکهاتەی جەستەی ئادەمیزاد خۆیدا، ئەوەندە نیعمەت هەن؛ کە ناتوانن سەرژمێریان بکەن؛ لەشی ساغو روخساری جوان، چاوو گوێچکەو لووتو جەرگو سیو گورچیلە...هتد. تەنانەت وەکوو سەعدی شیرازی دەفەرموێ: هەر هەناسەیەك کە هەڵی دەکێشیو دەیدەیتەوە، دوو نیعمەتەو پێویستی بەدوو شوکر هەیە، چونکە هەناسە هەڵمژینەکە دەبێتە هۆی درێژەدان بەژیانو، هەناسە دانەوەکە دەبێتە هۆی راحەتی جان!!

﴿إِنَّ اللَّـــهَ لَغَفُـــورٌ﴾ بێگومـان پـەروەردگار لێخۆشـبوونی زۆرە بـۆ ئێـوە، چاوپۆشیتان لێدەکا ، لەوەی: کە بەئەندازەی نیعمەتەکانی داوای شوکرو سوپاستان لێ ناکا، ئەگەر داوای لێ بکردنایە بۆتـان ئـەنجام نـەدەدرا، ئـەو کاتـە شیاوی سـزا دەبوون، ﴿رَحِيمٌ﴾ بـەرەحمو بەزەییـە بۆتـان، کـەوا کەمتەرخـەمیتانی داپۆشـیوە، هەرچەندە شیاوی ئەوەن نیعمەتەکانی خۆیتان لێ قەدەغە بکا، کەچی ئـەو هـەموو نیعمـەتو بەخششەی بەسـەردا رشـتوون، وێـڕای ئـەو هـەموو تـاوانو جەریمانـەی ئـەنجامیان دەدەن، کـە لەهـەموانیان تـاوانتر یەکسانی خـستنە لـەنێوان خـالیقو مەخلووقدا، هاوەڵدانان بۆ خودا لەزاتو لەصیفاتدا.

هەندێ لەزانایانی تەندروستی وتوویانە: هەر بەشێك لەجەستەی ئادەمیزاد کە ئازارێکی تووش دەبێ، هەرچی خۆشیو لەززەتی دونیا هەیە لێی تێك دەچێ، ئاواتەخوازی ئەوەیە: هەرچی دونیا هەیە ملکی ئەو بێو خەرجی بکا لەپێناو لاچوونی ئەو ئازارە لەسەری!

دەی پەروەردگار بەقودرەتو دانایيو زانایی خۆی جەستەی ئادەمیزادی بەو رێكو پێکیە پێکەوە گونجاندوە، کە ئادەمیزاد کە بۆ خۆی ئاگای لێ نیەو پێ ی نازانێ! دەی چۆن ئـادەمیزاد دەتوانـێ نیعمەتـەکانی خـودا: کـە بەسـەریەوەن

بیانـژمێرێ؟ یـان بتوانـێ لەبەرامبـەر ئـەو نیعمەتانـە سوپاسـی پێویـست بـۆ خـودا ئەنجام بدا؟؟

ئەمجار پاش ئەوەی عیبادەتکردنی ئادەمیزادی بۆ بتو صەنەمەکان پووچەڵ کـردەوە: لـەم روەوە: کەئـەو بـتو صـەنەمانە دەسـەڵاتی بـەدیهێنانو نیعمـەت بەخـشینیان نیـە، لەرویـەکی تریـشەوە عیبـادەت بـۆ کردنیـان بـەتاڵ دەکاتـەوە، ئەوەیش ئەوەیە: پەرستراو (خودا) دەبێ زانـاو ئاگادار بێ بەسـەر هـەموو شـتێکی نهێنیو پەنامەکی دا، دەی ئەم بتو صەنەمانە هیچ زانیاریو هەستو شعورێکییان نیە، کەوابێ چۆن بەکەڵکی خودایەتی دێن! دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُـونَ﴾ پـەروەردگار دەزانـێ چـیتان لەدڵدایـەو چـۆنی دەشـارنەوەو لـەکێ دەشارنەوە، هەروەها دەزانێ بـەزمان چی دەڵێنو بەئەندامـەکانی جەسـتەتان چی ئەنجام دەدەن، هەمووتان لەسەر دەبژێرێ! رۆژی قیامەت پاداشو سزاتان دەداتـەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە، لەهەموو کردارو گوفتارێکتان پرسیارتان لێـدەکا ، پرسیارتان لێدەکا دەربارەی سوپاسگوزاریتان بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی بەسەرێدا رشتوون، ئەو نیعمەتانەی پێتان زانیونو ئەوانەی پێتان نەزانیون!

ئـەمجار پـەروەردگار وەصـفی ئـە بتانـە بەشـێوەیەك دەکـا کـە لەئەهلییـەتی عبادەت بۆ کردن روتیان بکاو شیاوی ئەوە نەبن بکرێنە هاوەڵی خوداو پەرستشیان بۆ بکرێ! دەفەرموێ:

١- ﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِـنْ دُونِ اللَّـهِ لا يَخْلُقُـونَ شَـيْئاً وَهُـمْ يُخْلَقُـونَ﴾ ئـەو بـتو صەنەمانەی ئێوە لەجیاتی خودا دەیانپەرستن ناتوانن هـیچ دروست بکـەن بـەڵکوو بۆ خۆیان دروستکراون وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ؟ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾الصافات/٩٥-٩٦.

٢- ﴿أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ﴾ ئەو بتانە قەبارەیەکی بێ گیانن، بێ هەستو بێ شعوورن، نابیسن، نابینن، بێ عەقڵو نەفامن، هیچ سودێکیان لێ نابینن! لەداهاتووشدا گیانیان بەبەردا ناکرێ. بەڵام پەروەردگار خودایەکی زاناو داناو بەدیهێنەرو زیندووی هەمیشە زیندوە، قەت مردنی بەسەردا نایە! بەپێچەوانەی بتو صەنەمەکانی ئێوە: کە هەمیشە بێ گیانن و قەت زیندوییان بەسەردا نایە!

٣- ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ ئەو بتانە نازانن کەی عیبادەتکەرەکانیان زیندو دەکرێنەوە، نازانن کەی قیامەت رادەبێ؟ دەی چۆن ئێوە بەهیوای ئەوەن شەفاعەتتان بۆ بکەن، سودو خێرتان لێیان دەست بکەوێ؟

ئەوەی خێر لێدەستکەوتنی لێ چاوڕوان دەکرێ، کەسێکە هەموو شتێك دەزانێ و بەدیهێنەری هەمو شتێکە، ئەویش پەروەردگاری بوونەوەرە!

کەسێك شیاوی خودایەتییە بزانێ قیامەت کەی رادەبێ، زیندو بوونەوە چ کات دەبێ. ئەو خودا درۆزنانەی نازانن کەی عیبادەتکەرەکانیان زیندو دەکرێنەوە شیاوی خودایەتی نین، بەڵکوو ئەوانە گاڵتەی گاڵتەچییانن، ئەگینا بەدیهێنەر مەخلوقاتی خۆی زیندو دەکاتەوەو دەزانێ کەی زیندویان دەکاتەوە.

ئەمە ئاماژەیە کە زیندوبوونەوە پەیوەندی بەتەکلیفەوە هەیە بۆ پاداشو سزا وەرگرتنەوە چاکە بەچاکە خراپە بەخراپە! هەروەها زانینی کاتی هاتنی رۆژی قیامەت تایبەتمەندی خودایەتییە، لەهەمان کاتدا گاڵتەکردنە بەموشریکەکان کە فام ناکەنەوەو تێ نافکرن فەرقی راستو ناڕاست ناکەن!

ئەمجار کە قەڵا کۆنی بتپەرستی روخاندو بتپەرستی بەکارێکی نەفامانە لەقەڵەم دا، مەبەستی سەرەکی درکاندو فەرمووی: ﴿إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ ئەی خەڵکینە خودای بەحەقو راستی ئێوە تەنیا خودایەکە،جگە لەئەو خودای تر نین، هەر ئەو خودایە شیاوی پەرستشو عیبادەت بۆ کردنو بەندایەتی بۆ کردنە، هەر ئەو حەقەو شیاوی خودایەتییە!

﴿فَالَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ قُلُوبُهُمْ مُنكِرَةٌ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەم حەقیقەتە نیە، قیامەت بەدرۆ دەزانن، ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن، بڕوایان بەیەکتاپەرستی نیە، دڵیان ئینکاری تاكو تەنهایی خودا دەکا، لەئاستی حەقدا لوتبەرزو خۆبەزلزانو سەررەقن، دان بەتاكو تەنهایی خوادا نانێن، ئارەزۆیان لەبەدەستهێنانی ئەواب نیە، لەسزای دۆزەخ ناترسن، پێیان ناخۆشە پێغەمبەر بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی دەکا، هەر کە گوێیان لەبانگەوازی یەکتاپەرستی دەبێ دڵیان تەنگ دەبێو تەنگەتاو دەبن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ص/٥. یان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾الزمر/٤٥.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند ئاڕاستەی موشریکەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿لا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ گومانی تێدا نیەو شتێکی حەقو راستە: کە خودای تۆ دەزانێ ئەو موشریکانە لەدڵیاندا چ حەشار دەدەنو چ ئاشکرا دەکەن، ئاگادارە بەسووربوونیان لەسەر کوفرو بێدینیو پڕاو پڕ تۆڵەیان لێدەستێنێ ﴿إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار خۆبەزلزانو لوتبەرزە موشریکەکانی خۆش ناوێن، بەڵکوو هیچ خۆبەزلزانێکی خۆش ناوێو تۆڵەی لوتبەرزیو خۆبەزلزانییان لێ دەستێنێ!

ئیمامی موسلیمو ئەبو داودو تیرمیذیو ئیبنو ماجە لەئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت دەکەن: دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لایدخل الجنة من کان في قلبه مثقال ذرة من کبر، ولا یدخل النار من کان في قلبه مثقال ذرة من ایمان) پیاوێك

وتی: ئەی پێغەمبەری خودا پیاو پێی خۆشە کراسەکەی پاكو خاوێن، پێلاوەکانی جوانو چاك بن، ئەوەش بەلوتبەرزی حسێبە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان الله جميل يحب الجمال، الكبر من بطر الحق، وغمط الناس).

لەفەرموودەیەکی تری راستدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ان المتكبرين أمثال الذر يوم القيامة تطؤهم الناس بأقدامهم لتكبرهم)خودایە! لەتەکەببورو خۆبەزلزانیی بمانپارێزە!!!

## رەوشتی خۆبەزلزانان، ئینکاری کردنی موشریکەکان بۆ نیگاو پێغەمبەرێتی، سزای هەڵوێستەکانیان

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوٓاْ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوٓاْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ

تُشَٰٓقُّونَ فِيهِمۡۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ إِنَّ ٱلۡخِزۡيَ ٱلۡيَوۡمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡۖ فَأَلۡقَوُاْ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعۡمَلُ مِن سُوٓءِۭۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی یەکتاپەرستی رانواندن، بتپەرستی پوچەڵ کردەوە، بەشوێن ئەوەدا شوبهەو رەخنەی ئەوانە دێنێ کە بڕوایان بەپێغەمبەرایەتی نیە، یەکێکیش لەو شوبهەو رەخنانە رەخنە گرتنە لەقورئان: ئەو قورئانەی: کە حەزرەتی موحەممەد دەیکاتە بەڵگە لەسەر راستی پێغەمبەرێتی خۆی. ئیتر پەروەردگار لەدونیادا دەیانفەوتێنێو لەقیامەتیشدا سزای بەئێشی بۆ ئامادە کردوون:

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ ئەگەر بەو خۆبەزلزانو لوتبەرزانەی بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت نیەو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، ئەگەر پێیان بگوترێ: ئەوە خودای ئێوە چی ناردۆتە خوارێ، خۆیان لەوەڵامدانەوە هەڵە دەکەنو دەڵێن: کوا؟ خودا هیچی نەناردۆتە خوارێ، ئەم کەلامەی بەسەرماندا دەخوێندرێتەوە ئەفسانەو چیرۆكو سەرگورشتەی درۆینەو پڕوپووچی پێشینەکانە، لەو داستانو چیرۆکە خەیاڵپلاوانەوە وەرگیراوەو موحەممەد ئیدیعای ئەوە دەکا: کە لەخوداوە بۆی نێردراوەو نیگاو سروشە! وەکوو

لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ الفرقان/٥. پرسیارکەر دەگونجێ یەکێك بێ لەموسوڵمانان، یان هەندێ لەموشریکەکان بەگاڵتەوە پرسیار لەهەندێکیان دەکەن. یان نەضری کوڕی حاریث بێ، یان ئەو تاقمو گرۆهانە بن کە ڕێگاکانی دەوروبەری مەککەیان دەگرتن بە(مقتسمون) ناویان دەرکردوە، شاندی حاجیەکانیان هەڵدەنا: کە پەیوەندی نەکەن بەپێغەمبەرەوە، جا ئەو وەفدانە لەم گرۆهانەیان دەپرسی دەربارەی هاتنە خوارەوەی نیگا بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ ئەوانیش دەیانگوت: نیگا نیە، ئەفسانەی پێشینانە دەیخوێنێتەوەو دەڵێ: ئەمە کەلامی خودایە!! ئەمە دەربارەی قورئان، دەربارەی خودی پێغەمبەر خۆشی چەند بوختانیان بەدەمەوە هەڵبەستبوو: دەمێك دەیانگوت شاعیرە، کاتێکیش دەیانگوت: کاهینو فالگرەوەیە، چەلێکیش بەشێتو نەفامیان لەقەڵەم دەدا، پاشان هەموویان هاتنە سەر قسەی وەلیدی کوڕی موغەیرەی مەخزومی ریس سپیو پیاو ماقوڵیان، کە لەئەنجامی بیر کردنەوەی نەفامانەی خۆی هاتە سەر ئەوە کە قورئان سیحرێکی کاریگەربێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ، فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ، ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ، ثُمَّ نَظَرَ، ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ، ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ، فَقَالَ: إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾المدثر/١٨-٢٤.

هەموویان ڕایەکەی وەلیدیان قبووڵ کردو بڵاویان لێکرد ! لەڕاستی دا ئەو کافرە بێ هەستو شعوورانە ئەم درۆو دەلەسەو بوختانانە بۆیە هەڵدەبەستن ﴿لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ تا لەئاکاما ڕۆژی قیامەت تاوانی خۆیان بەتەواوی هەڵبگرنو بڕێ لەتاوانی ئەوانیش: کە گومڕایان دەکەن بەئەندازەی گۆمڕاکردنەکەیان تاوانی ئەوانیش بخەنە سەر ئەستۆی خۆیان، گوناهی ئەوانەی: کە بەنەزانی شوێن ئەمانە کەوتوون دەکەوێتە

ئەستۆی ئەمانە. تاوانی گومڕایی خودی خۆیان ئەوانەیش: کە گومڕایان دەکەن لەسەریان کۆدەبێتەوە.

ڕستەی (بغير علم) بەلای زومەخشەرییەوە دەبێتە حاڵ لەمەفعوول. واتە: ئەو موشریکانە کەسانێك گومڕا دەکەن: کە نازانن ئەوانە گومڕاکەرن پێیان وایە: ڕاست دەکەن‌و بۆ ڕێبازی ڕاست هیدایەتیان دەدەن!

بەلای ئیمامی ڕازییەوە حاڵە لەفاعیل، واتە: ئەو موشریکە قسە ڕۆیشتوانە کەسانی دیکە گومڕا دەکەن، نازانن دەبنە موستەحەقی چ سزایەکی بەئێش‌و ئازار لەسەر ئەو سەرلێ تێکدانەی ئەنجامی دەدەن! ئەگەر بیانزانیایە شیاوی چ سزایەك دەبن لەسەر ئەو گومڕا کردنەیان، هەرگیز کاری وایان نەدەکرد!

﴿أَلا سَاءَ مَا يَزِرُونَ﴾ هۆشیار ببنەوە، زۆر ناپەسندو نابارە ئەو تاوانەی ئەوان پێکێشی لێ دەکەن‌و ئەو تاوانەی ئەوان دەیخەنە ئەستۆی خۆیان!

ئیبنو ئەبی حاتەم لە(السدي)یەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: قوڕەیشییەکان کۆبونەوەو وتیان: مەحەممەد پیاوێکی زمان شیرین‌و لەخشتەبەرە، قسە لەگەڵ هەر کەسێکدا بکا هەڵی دەخەڵەتێنێ، بزانن هەوڵ بدەن چەند کەسێکی قسەزان‌و خانەدان بدۆزنەوە بیان نێرنە سەر ڕێگاکانی مەککە بۆ چەند شەوێك هەر کەسێك لەدەرەوەی مەککە هات بۆ لای موحەممەد بیگێڕنەوە. جا چەند کەسی گومڕاکەری زمانلووس دەچوونە سەر ڕێگاکانی مەککەو هەموو ڕێگاکانیان کۆنترۆڵ دەکرد، ئەگەر یەکێك بهاتایە بیویستایە پێغەمبەر ببینێ، پێشی ڕێگایان پێ دەگرت، جارێ پێش هەموو شتێك خۆیان پێ دەناساند، بنەچەو ڕەچەڵەکی خۆی بۆ کابرای میوان شی دەکردەوەو خۆی لێدەکردە پیاو ماقووڵی قوڕیش‌و ئەمجار دەیگوت: ئەگەر بۆیە هاتووی دەربارەی موحەممەد زانیاریت دەس بکەوێ؟ ئەوە با من ڕاستیت پێ بڵێم: موحەممەد پیاوێکی درۆزنە هیچی ڕاستی نیە، جگە لەبێ عەقڵ‌و نەفامەکان‌و بەندەو کۆیلە نەبێ کەسی تر شوێنی نەکەوتووە. کەسانێك

بڕوایـان پـێ کـردوە کـە هـەمویان هـیچو پـوچو خـوێڕین، ئـەگینا پیـاو مـاقوڵو عاقڵمەنـدان کـەس شـوێنی نەکـەوتووە. ئـیتر کـابرای ڕێبـوار دەگەڕایـەوەو ئـەم هەواڵانەی بۆ خێڵەکەی خۆی دەگێڕایەوە، ئائەمەیە مانای ئایەتی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُواْ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾.

جا ئەگەر کابرای ڕێبوار خودا هیدایەتی بدایە، کاتێك قسەی ئـەو ڕێگرانـەی دەبیست یەکسەر نەدەگەڕایەوە، دەیگوت: من ئەو هەموو قۆناغە ڕێگایانـەم بڕیـوە، گەییشتومە ئێرە، وەڵلا! تـا ئـەو پیاوە بەچاوی خـۆم نـەبینمو وتو وێـژی لەگـەڵ نەکەم ناگەڕێمەوە، دەبێ بزانم دەڵـێ چیو ناڵێ چـی! ئـیتر دەچـوە نـاو مەککـەوەو، چاوی بەموسوڵمانان دەکەوتو پرسیاری لێدەکردن؛ ئەوە موحەممـەد! دەڵـێ چـی؟ ئەوانیش قسەی خێریان بۆ دەکرد ئاینی ئیسلامی لەدڵ دا شیرین دەبوو...هتد.

بێگومـان ئـەم هـەڵسو کەوتـەی قوڕەیـشییەکان لـەو سـەردەمەدا شـەڕێکی ئیعلامـی نەخـشە بـۆ داڕێـژراوبوو، بـەدڵو بـەگیان ئـەنجامیان دەدا، پیـاوە گـەورەو ملهوڕەکانی قوڕەیش لەپـشتیەوە بـوون، لـەوەدواش و ئێـستاش و لـەداهاتووشدا ئـەو شەڕە بەردەوام بوو و بەردەوامیش دەبێ!

لەهەموو کاتو سەردەمێکدا دیکتاتۆرو ملهوڕەکان ئەوانەی نایانەوێ مـل بـۆ حـەقو راسـتی نـەوی بکـەن، بـۆ ئـەوەی پلـەو پایـەی خۆیـان لەدەسـت نـەدەن، بەرژەوەندییان نەفەوتێ دەست دەکەن بەبانگەشەو پڕوپاگەندە کـردن دژی ئـاینی خـودا، دژی پـەیامی خـودا: کـە بەپێغەمبـەرانـدا ناردوویـەتی بـۆ ئـەوەی ئـادەمیزاد لەکۆیلایەتی ملهوڕان رزگار بکەن!

دەی بـا ئەوانـە بـەئارەزۆی خۆیـان مـەکروفێڵ دژی بانگەوازی پێغەمبـەر ﷺ بکـەن، چـییان لەدەسـت دێ لـەفرتو فـێڵ ئـەنجامی بـدەن، دڵنیـابن ئاکـامی مەکرەکـەیان بـۆ خۆیـان دەگەڕێتـەوە، بۆخۆیـان پـێی زەرەرمەنـد دەبـن، ئـەوانیش

وەکوو گەل‌و نەتەوە پێشینەکان چۆن تووشی سزای سەختی پەروەردگار هاتن‌و بەهۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان ئەوەیان بەسەر هات کە بەسەریان هات!

﴿قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ بێگومان گەلەپێشینەکانی پێش ئەو موشریکانە جۆرەها فرت‌و فێڵ‌و فەجەریان دژی پەیامی پێغەمبەران ئەنجام دا، نەخشەو پیلانیان دژی فروستادەکانی خودا دارشتن، بۆ ئەوەی نەهێڵن ئایینی خودا بلاو بێتەوە، هەمیشە لەهەوڵ‌و تێکۆشاندا بوون بۆ ئەوەی نووری خودا بکوژێننەوە، بەلام کاتێکیان بەخۆ زانی: خودا هەموو هەوڵەکانی پووچەڵ کردنەوە، هیچ پیلان‌و نەخشەیەکیان لەبەردەم هێزی قودرەتی خودادا خۆی نەگرت‌و لەتەونی جاڵجاڵۆکە زەعیف تر بوون.

﴿فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُمْ مِنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِنْ فَوْقِهِمْ﴾ پەروەردگار لەناوی بردن، بەشێوەیەك خانوو باڵەخانیەکانی لەبناخەوە روخاندن‌و سەقف‌و هەلاشی بەسەردا خستن، فرت‌و فێڵی پوچەڵ کردنەوە، هەوڵ‌و تەقەللایان بێهودە دەرچوو، لەژێر دارو پەردووی خانوەکانیاندا سلار بوونەوە، ئەو کۆڵەکەو پایەو ستونانەی پێیان وا بوو خانوەکانیانی پێ پتەوو بەهێز بووە، بوو بەهۆی‌لەناوبردنیان، ﴿وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾ سزاو عەزابیان لەلایەکەوە بۆ هات کە پێیان نەزانی، هەرگیز بەخەیاڵیاندا نەدەهات دیوارو پایەو ستوونی خانوەکانیان ببێتە هۆکاری لەناچونیان، ئەوان ئەو خانوو قەلاو باڵەخانەیان بۆیە بنیات نابوو خۆیانی تێدا بپارێزن، کەچی لەنکاوێك ئەو خانوەی بنیاتیان نابوو، زۆر قایمکارییان تێدا کردبوو، پشتیان پێ بەستبوو بۆ خۆپارێزی تێیدا بۆ بەگۆڕو چاڵی مەرگیان! دە ئێوەش ئەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری! ئەی هەموو ئەوانەی ئەم قورئانەتان پێ دەگاو دەیخوێننەوەو تێی دەگەن! لەئاکام‌و سەرەنجامی بەرهەڵستکاری ئایینی خودا پەندوەربگرن‌و بەخۆتاندا بچنەوە، واز لەسەرپێچی‌و ستەمکاری بێنن! با ئێوەش بەدەردی ئەوان نەچن!

چونکە ئەمە دیمەنێکە دووبارە دەبێتەوە لەپێش قورەیش و لەدوا قورەیشیش، بانگەوازی ئایینی خوداش هەمیشە بەرەو پێش دەڕوا هەرچەندە کۆسپ و تەگەرەشی بێنە پێش! هەر کاتێکیش خودا بیەوێ بەرهەڵستکاران بەدەردی ستەمکارانی رابوردوو دەبا!

زوربەی راڤەکەرانی قورئان لەسەرئەوەن: کە مەبەست بەفەرموودەی ئایەتەکە ﴿قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ...﴾ نەمرودی کوڕی کەنعانە، کە لەبابل باڵەخانەیەکی گەورەی دروست کرد درێژییەکەی پێنج هەزار زیراع بووە. خۆی بەخودای سەرزەوی دەزانی و هەرگیز بەخەیاڵیدا نەدەهات ئەو قەلا پتەوە بڕوخێ و بۆخۆی و دارو دەستەی بکەونە ژێر دارو پەردوویەوە!!

جا ئەمە سزای دونیایانە ﴿ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ﴾ پاشان رۆژی قیامەت خودا ریسوایان دەکا، هەموو نهێنیی و نیازو مەبەستی پیسیان دەخاتە ڕو، بەعەزابی دۆزەخ زەلیلیان دەکا، ﴿وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنْتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ﴾ پەروەردگار بەشێوەی گاڵتەپێکردن و بۆ زیاتر سزادانیان پێیان دەفەرموێ: کوان ئەوانەی لەدونیادا پێتان وا بوو هاوەڵ و شەریکی منن، بۆ نایانهێنن بۆ ئێرە بۆ داوایان لێ ناکەن ئەمڕۆ بەرگریتان لێ بکەن و عەزابتان لێ دوور بخەنەوە، خۆ ئێوە لەدونیادا عیبادەتتان بۆ دەکردن، کردبوتانن بەگەورەو خۆشەویستی خۆتان، کوان و لەکوێن ئەو خودا درۆزنانەی کردبوتاننە پەرستراوی خۆتان و لەپێناویاندا دژایەتی موسوڵمانانتان دەکردو کێشەو نیزاعتان لەسەر دەکردن! ئامادەیان بکەن بابتوانن ئاگری دۆزەختان لێ دوور بخەنەوە. ئیتر کافرەکان بەخامۆشی و بەشەرمەزاری بێدەنگ دەکەون، هیچ وەڵامێکیان پێ نیە، حەق و ناحەق دەرکەوتووە، چی بڵێن: هیچ عوزرو بیانوویان نیە! ئیتر لەو کاتە بێ دەنگی و سامناکەدا ﴿قَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزْيَ الْيَوْمَ وَالسُّوءَ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ ئەوانەی زانیاری و بەڵگەی یەکتاپەرستیان پێ دراوە: کە پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان لەدونیادا، بانگەوازی

ئـەو کافرانـەیان دەکـرد بـۆ خوداپەرسـتیو ئـەوانیش گاڵتـەیان پـێ دەکـردن، دێنـە قـسەو دەڵـێن: بێگومـان ئـەمڕۆ ریـسواییو بەدئـەنجامی لەسـەر کافرانـە بەگـشتی! مەبەستی پێغەمبەرەکان بەم وتەیە زێدە سوکایەتی پێ کـردنو ناڕەحەتکردنیانـە! بێگومان کەسێك کەفرێ درێتە دۆزەخـەوە ئـەوە ئـەو پـەڕی ریـسوا کردنـە! وەکـوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ﴾آل‌عمران/١٩٢.

ئەو کافرانەیموستەحەقی ئەو سزاو ریسوا کردنەن ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَـةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ﴾ ئەو کافرانەن: کە لەسەر کوفر بەردەوام بوون تـا کـاتی مـردن، کـە فریشتە گیانیان دەکێـشن ئـەوان کـافرو بـێ بـڕوان سـتەم لـەخودی خۆیـان دەکـەن، چونکە خۆیان دەکەنە شیاوی عەزابی سەختی دۆزەخ. بەراستی ئەوانە ستەمکارن: کە ئاوا خۆیان تووشی ئەو عەزابە سەختە دەکەن!

جا کە مـردن یەخـەیان پـێ دەگرێو سـزای دۆزەخ دەبیـنن ئـەو کاتـە زێـوان دەبنەوە ﴿فَأَلْقَوُاْ السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ﴾ بەیدەست دەبنو گەردنکەچـی پێـشان دەدەن، دەڵـێن: سـوێندمان وا بـێ ئێمـە خراپـەمان نـەکردوە، کـەسمان نـەکردوە بـەهاوەڵی خـودا.. وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَاللّـهِ رَبِّنَـا مَـا كُنَّـا مُـشْرِكِينَ﴾الأنعـام/٢٣. ئـەوان درۆ لەسـەر خـودا دەکـەن، دەیانـەوێ بـەو سـوێند خواردنو پاڕانەوەیە خۆیان رزگار بکەن، بەخەیاڵی خۆیـان خـوا هەڵدەخەڵەتێنن!! (خوایە تۆبە).

ئەمجار پەروەردگار بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلَى إِنَّ اللّـهَ عَلِـيمٌ بِمَـا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەڵێ: ئێوە گەورەترین خراپەتان کردوە، ناشـیرینتر تاوانتـان ئـەنجام داوە، خودا ئاگادارو زانایە، کە ئێستا ئینکاری کردەوە ناهەموارەکانتان بکەن، خـودا لەپاســـــاوی کردەوەکانتـــــاندا ســـــزای عادڵانـــــەتان دەداتـــــەوە.

﴿فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ بڕۆنە ناو دۆزەخەوە، بچنە ناو (طبقات) چینەکانی دۆزەخەوە، جۆرەها سزای ناخۆش‌و بەئێش بچێژن، تۆڵەی هاوەڵدانان بۆ خوداو ستەمکاری وەربگرنەوە، ئەوە سزایەکی عادڵانەی خودایە بۆ ئێوە لەسەر تاوانە جۆراو جۆرەکانتان، بۆ هەتا هەتایە تێیدا بمێننەوە، خراپ جێگاو شوێن حەوانەوەیەکە: کە بۆ لوتبەرزو خۆبەزلزانان دانراوە؛ بۆ ئەوانەی لوتبەرزییان نواند لەئاست پێغەمبەران، خۆیان لەوە زلترزانی کە شوێن پەیامی پێغەمبەران بکەون! بێزیان نەدەهات بڵێن: (لا الـه الا الله) وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾الصافات/٣٥.

## ڕەوشتی تەقواکاران، ئیمانی خوداپەرستان بەسروش‌و ئیگاو پاداشی ئەوان

﴿ ۞ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْۚ قَالُواْ خَيْرًاۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٞۚ وَلَدَارُ ٱلْأٓخِرَةِ خَيْرٞۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٖ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۖ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِي ٱللَّهُ

ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار حاڵو وەزعی ئەوانەی رون کردەوە: کە پەیامی خودا رەت دەکەنەوە، پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوە، دەڵێن: موحەممەد ﷺ! ئەفسانەی کۆن دەنووسێتەوەو بۆ خەڵکی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەخوداوە بۆم هاتووە.

ئەمجار باسی ئەو سزاو عەزابەی کرد کە تووشیان دەبێ‌و دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، ئەمەش لەپاساوی کردارو هەڵوێستە ستەمکارەکانیاندا.

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا وەصفی موسوڵمانان دەکا؛ ئەو موسوڵمانانەی کە ئەگەر لێیان پرسیار بکرێ: پەروەردگار چی نازڵ کردوە؟ دەڵێن خودا خێرو بەرەکەتی بۆ ناردوین، ئەمجار پاداش‌و نیعمەتی نەبڕاوەی خۆی بۆ ئەو خوداپەرستانە دیاری دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ؟﴾ گوترا بەوانەی خوداپەرست‌و خۆپارێزن: ئەرێ خودای ئێوە چی نازڵکردوە؟ فەرمان‌و نەهی‌و ئامۆژگارییەکانی چۆنن؟؟ تەشریع‌و یاسای گونجاوەو بەکەڵکی کارپێکردن دێ یان نا؟ ئەوا وەڵامێکی کورت‌و پوخت دەدەنەوەو ﴿قَالُوا: خَيْراً﴾ دەڵێن: خودا خێری بۆ ناردوین، بەرەکەت‌و رەحمەتە بۆ کەسێك شوێنی بکەوێ‌و ئیمان بەپێغەمبەر بێنێ!!

ئەمجار ئەم خێرو بەرەکەتە رون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَـٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ پاداشی باش‌و نیعمەت‌و بەخشش هەیە بۆ ئەوانەی لەم

دونیایەدا چاکەکارو ئیماندارو خوداپەرستن، پاداشی زۆرو پیرۆز بڕیار دراوە بۆ هەر کەسێ بڕوای بەتاكو تەنیایی خودا هەبێ‌و شوێن پەیامی پێغەمبەر بکەوێ و بانگەوازی ئادەمیزادان بکا بۆ خودا پەرستی‌و کردەوەی چاکو پەسند؛ ئەوە لای خودا پاداشی باشی بۆ ئامادە کراوە لەپاساوی کردەوەی چاكو بڕواداریان‌دا لەدونیادا... سەروەری‌و سەرکەوتن‌و عیززەتو شکۆمەندییان پێ دەبەخشێ!

﴿وَلَدَارُ الآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان پاداشی رۆژی قیامەتیان زۆر باشترو بەنرخترە، قیامەت لەدونیا باشترە، پاداشی قیامەت لەهی دونیا باشترە، ژیانی قیامەت خۆشترو باشترە لەژیانی دونیا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾النحل/٩٧. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى﴾الضحى/٤. یان دەفەرموێ: ﴿وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾الأعلى/١٧.

ئەمجار پەروەردگار پاداشی قیامەت (کە لەپاداشی دونیایی بەباشتر دانا)دەفەرموێ: باشترین خانوو ئەو شوێنی حەوانەوەیە کەجێگای خودا پەرستان ومالّی خۆپارێزانە لەسزای خودا. ئەو جێگاو شوێن حەوانەوە باشەیان بریتییە لە ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ چەند باغو قەصرو باڵەخانەیەك تا بڵێی جوان‌و خۆش‌و دلگیرن، بەژێریان دا جۆگەو جۆباری ئاو دەکشێن وەندەی ترجوانی‌و خۆشی‌و رازاوەیی بەباڵەخانەو باغەکان دەبەخشن! وەصفی جوانی‌و خۆشی ئەو بەهەشتە نەبەزمان دەکرێ‌و نەبەقەڵەم دەنووسرێ، بەراستی هەر خودا دەزانێ: چۆنن‌و چەند خۆشن، هەرچی بەخەیاڵ دا بێ‌و نەفسی ئادەمیزاد حەزی لێبێ بڕانەوەو پاساغکردن بۆیان ئامادەیە.

﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ﴾ هەیە لەبەهەشتدا بۆ ئەوانەی لەدونیادا چاکەکارو خاوەن باوەڕو کردار باشن، هەرچی حەزیان لێبێ‌و بەخەیاڵیاندا بێ وەکوو

لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَفِيهَـا مَـا تَـشْتَهِيهِ الْـأَنفُسُ وَتَلَـذُّ الْـأَعْيُنُ وَأَنـتُمْ فِيهَـا خَالِدُونَ﴾الزخرف/٧١.

میـوەو میوەجـاتی زۆرو زەبەنـدە، نـەکۆتایی دێو نەیاسـاغ دەکـرێ. ئەمـە پاداشی تەقواکارو خوداپەرستانە ﴿كَذَلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُـتَّقِينَ﴾ وەکوو ئـەو پاداشـە پیرۆزو پاكو خاوێنە، پەروەردگار پاداشی هەموو کەسێك دەداتەوە: کە خاوەن بڕوا بێو خۆ لەبێ فەرمانی خودا بپارێزێ، کوفرو تاوانی نەبێ، کرداری چاكو ڕەوشتی جوان بێ.

ئەمجار پـەروەردگار حـاڵو وەزعـی خوداپەرسـتان لـەکاتی سـەرەمەرگـدا رون دەکاتــەوە وەکــوو چــۆن لــەوەپێش حــاڵو وەزعــی کافرەکــانی بــەیان کــرد. ئــەو تەقواکارانە: کە ئەوە پاداشو ئاکامیانە ﴿الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَـةُ طَيِّـبِينَ﴾ ئەوانـەن: کە فریشتە گیانیان دەکێشن، پاكو خاوێنن لەپیـسایی شیركو تـاوان، یەکتاپەرسـت دڵ پڕ لەنووری ئیمانن، جا بۆ دڵنیا بونیان لەئاکامو پاداشیان فریـشتەکان ﴿يَقُولُونَ سَلامٌ عَلَيْكُمْ﴾ پێیان دەڵێن: سەلامی خوداتان لەسەر بێ، ئاشتیو ئەزیـەت نـەبینین بـۆ ئێوەیـە، لـەم ڕۆ بـەولاوە ناخۆشـی نایەتـە ڕێگاتـان. ﴿ادْخُلُـوا الْجَنَّـةَ بِمَـا كُنـتُمْ تَعْمَلُـونَ﴾ مزگێنـی بـۆ ئێـوە بەبەهەشـتێك دەچـنە نـاویو خـودا بـۆ ئێـوەی دانـاوە بەهۆی ئەو کردەوە باشانەی لەژیانی دونیادا ئەنجامتان داون!

(طیـبین) وشـەیەکە: مانـای باشـی زۆری لـەخۆگرتوون، واتـە: بـەجێ هێنـانی فـەرمانی خـوداو شـوێنکەوتنی پـەیامی پێغەمبـەرو پابەنـد بـوون بەنەهیـەکانی شـەریعەتو خۆپاراسـتن لـەو شـتانەی جڵـەوگیرییان لێکـراوە، خـۆ ئارایـشت دان بەرەوشتە جوانو پەسندەکانو ڕوکردنە خوداو پشت بەسـتن بـەزاتی پـاکی، زێـدە ڕەوی نـەکردن لـەدابین کردنـی شـەهوەتو لەززەتـە جەسـتەییەکانداو زۆر شـتی تریش لەم ڕەوشتە جوانانەی لەخۆگرتوون! بۆیە فریشتە لەکاتی گیانکێشاندا: کە

تەنگانـەترین کاتـە مـوژدەی بەهەشـت دەدەن بەوانـەی (طیـب)ن، سـەلامیان لێ دەکەن، ترسیان لێ دەرەوێننەوە.

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فصلت/٣٠.

## هەڕەشە کردن لەموشریکەکان بەهۆی بەردەوام بوونیان لەسەر بەتاڵ

﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾

پەیوەندی ئـەم ئایەتـە بەئایەتـەکانی پێشوو لـەم روەوەیـە: کـە پـەروەردگار لەوەپێش باسی تانەی موشریکەکانی کرد کە ئاڕاستەی قورئانیان کـردن: دەیـانگوت ئەفسانەو چیرۆکی پێشینانە، قسەی شاعیرو هەستیارانە، ئەمجار هەڕەشـەی جۆراو جۆری لێکرد ن، پاشان پاداشی ئەوانەشی دیاری کرد: کە بڕوایان پێیـەتی، بەشـوێن ئەوانەدا ئەوەی ڕاگەیاند: کـە کافرەکـان واز لـەبیرو بـاوەڕی بـەتاڵی خۆیـان نـاهێنن مەگـەر ئـەو کاتـەی کـە فریـشتە دێ گیانیـان دەکێـشێو عـەزابی ریـشەکێش دێتـە سەریان، ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کە بـیرو بۆچـونی ئـەوان شـتێکی تـازە قـەڵا

نیەو پێش ئەوانیش گەلەکانی تر هەمان هەڵوێستیان نواندوە! لەتۆڵەی ئەوەدا خودا لەناوی بردنو پرواندنی، خودا ستەمی لێ نەکردن بەڵکوو بۆخۆیان ستەمیان لەخودی خۆیان کردا

بەکورتی ئایەتی ﴿هَلْ يَنظُرُونَ...﴾ رەخنەی دووەمە: کە کافرەکان لەروانگەیەوە ئینکاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان پێ دەکرد، ئەوە بوو: داوایان لەپێغەمبەر ﷺ کرد؛ خودا فریشتە بنێرێتە خوارێ لەئاسمانەوە شایەتی بدا لەسەر راستی پێغەمبەرایەتییەکەی، ئیتر خودای مەزن ئایەتی ﴿هَلْ يَنظُرُونَ...﴾ ی نارده خوارێ، هەرەشەی توندیان لێدەکا لەسەر ئەم هەڵوێستەو هەڵوێستە ناشیرینەکانی تریان!

دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَنْ تَأْتِيَهُمْ الْمَلاَئِكَةُ﴾ واتە: ئایا موشریکەکانی قورەیشو هاو وێنەکانیان لەبارەی راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ چاوەروانی چین؟ چاوەروانی ئەوەن فریشتە بێتە خوارێ شایەتی بدا لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی؟

یان ئایا ئەو موشریکانەی تانە لەقورئان دەدەنو دەڵێن: ئەفسانەو چیرۆکە کۆنی پێشینەکانە چاوەروانی ئەوەن ئیللا دەبێ فریشتە بێتە وێزەیانو گیانیان بکێشێ؟

﴿أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ یان چاوەروانی ئەوەن فەرمانی خودا بێ بەریشەکێش کردنیانو لەناو بچن؟

یان چاوەروانی ئەوەن فەرمانی خودا بێ بەرابوونی رۆژی قیامەتو ئەو تەنگو چەڵەمانەی تێیدا رو دەدەن! دیارە ئەو موشریکە سەر رەقانە واز لەکوفرو بێدینی خۆیان ناهێنن تا ئەو روداوانە نەبینن، ئەو کاتەش پەشیمان بوونەوەو بڕوا کردن بێ سوودەو هیچ شتێك دادیان نادا.

مەبەست لەئایەتەکە هەڵنانی موشریکەکانە بۆ ئەوەی واز لەکوفرو هاوەڵدانان بێنن، پێش ئەوەی کارەساتێك یەخەیان بگرێ: کە ئیتر کار لەکار دەترازێو تازە هیچ شتێك دادیان نادا!

جا وەنەبێ هەڵوێستی موشریکەکانی مەککە دەربارەی پەیامی پەروەردگار شتێکی تازە فەلّلا بێ؛ بەڵکوو ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ کافرو موشریکەکانی پێش ئەمانیش هەر وایان کردوە، هەر ئاوا بەپیر بانگەوازی خوداوە چونو ئاوا وەلامی پێغەمبەرەکانیان داوەتەوە. ئیتر خودا لەتۆڵەی ئەو جۆرە هەڵوێستە ناشیرینانەیاندا غەزەبی خۆی بەسەردا ڕشتنو عەزابی ریشەکێشی بۆ ناردن. ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ﴾ هەڵبەتە پەروەردگار بەم عەزاب بۆ ناردنو لەناوبردنە ستەمی لێ نەکردن، ﴿وَلَٰكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکوو بۆ خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد: کە ئاوا خۆیان دوچاری ئەو عەزابە سەختە کرد! چونکە خودا پەیامی بۆ ناردون، پێغەمبەرانی بۆ سەررەوانە کردن، بانگەوازییان کردن، بەڵگەیان بۆ هێنانەوە، ترساندیانن، موعجیزەیان نیشان دان، کەچی ئەوان لەکەللەشەقی خۆیان نەهاتنە خوارێ گاڵتەیان بەپێغەمبەرەکانیان کرد، زیاتر سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان..

﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا﴾ ئیتر سزای کردەوەکانیان هاتەوە پێشو ئاکامو سەرەنجامی هەڵوێستو کردەوەکانیان عەزابی سەختو تۆڵەی دژوار بوو ﴿وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئەو عەزابەی گاڵتەیان پێ دەکردو بەلایانەوە ئەفسانەبوو دەورەی دانو تێکیەوە پێچانو کردنیە پەندی رۆژگارو بۆ هەتا هەتایە خۆیان تووشی بەدبەختیو چارەڕەشی کرد! رۆژی قیامەتیش کە دەخرێنە ناو دۆزەخەوە پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەو دۆزەخەیە: کە لەدونیادا گاڵتەتان پێ دەکرد! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَٰذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنْتُمْ بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾الطور/١٤.

**کافرەکان ئیمان نەهێنانی خۆیان دەخەنە ئەستۆی قەدەرو ئینکاری زیندو بوونەوە دەکەن، پەیامی پێغەمبەران هەموویان لێك دەچێ**

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ

﴿الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾﴾

لەوەپێش دوو رەخنـەی کافرەکـان: کـە ئاڕاسـتەی پێغەمبـەرو پەیامەکـەیان کردبوو رانواند، لەم کۆمەڵە ئایەتانەشدا، دوو رەخنەی تری کافرەکان رادەنوێنـێو وەڵامیشیان دەداتەوە رەخنەیەکیان ئەوەیە: کە دەفـەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ نَحْنُ وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ موشـریکەکان دەیـانگوت: ئەگـەر خـودا بیویـستایە ئێمـە خـودا پەرست بـێن جگـە لەئـەو نەئێمـەو نـەباوكو بـاپیری ئێمـە کەسـی ترمـان نەدەپەرسـت ئێمـە هـەر کردەوەیـەك بکـەین، هـەر بـیرو باوەڕێکمـان هـەبێ، هـەمووی بەخواستی خودایـەو رەزامەنـدی ئـەوی لەسـەرە، هـەر شـتێکیش خواسـتی خـوای لەسـەر بـێ تـاوان نیـە، ئەگەر خودا بۆ خۆی خواستی نەبوایە لەسەر ئەم کردەوانەمان، هەرگیز ئەنجاممان نەدەدان!

هەروەها ئەگەر خواستی خـودای لەسـەر نەبوایـە ئێمـە هـیچ جـۆر لەگۆشـتی بەحیرەو سائیبەو وەصیلەو غەیری ئەوانەیش حەرام نـەدەکرد! ئەگـەر خـودا ئـەم کارەی ئێمەی پـێ ناخۆش بوایە، دەستی دەگرتین نەیدەهێشت بیکـەین، عـەزابی بـۆ دەنـاردین! ئـەم شـوبهەیە هـەمان شـوبهەیە: کـە پـەروەردگار لەسـورەتی (الأنعـام)دا باسی کردوەو دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم﴾الأنعام/١٤٨.

سەیرە کافرەکان هێندە نەفامن هاوەڵدانانیان بۆ خـوداو بتپەرسـتی خۆیـانو بـاوكو باپیرانیـان، ئـەو هـەموو کـردەوە ناشـیرینو ناپەسـندانەیان، حـەرامکردنی گۆشتی هەنـدێ ئاژەڵو هەندێ خواردەمەنی تر کـە لەخۆیانـەوە حـەرامیان کـردوە،

وەپاڵ خوداى دەدەن‌و دەڵێن: ئەمانە بەویستی خودایەو رەزامەندی لەسەرئەم کردارو بیرو باوەڕانەمان هەیە.

بەراستی نەفامن، بەهەڵە چوون، خراپ لەماناى مەشیئەتی خودا حاڵی بوون، گرنگرترین تایبەتمەندی ئادەمیزاد کە ویست‌و ئیختیارەو خودا پێی بەخشیوە بۆ ئەوەی لەژیاندا بەکاری بێنێ، لێی زەوت دەکەن، ئەم سەروەرییەی لێ دەستێننەوە، خودا هەرگیز نایەوێ بەندەکانی موشریك بن بتپەرستی بیرو باوەڕیان بێ، قەت خودا رازیی نابێ بەندەکانی بەهەوانتە شتێك: کە خودا بۆی حەڵاڵ کردون ئەوان لەخۆیانی حەرام بکەن. ویست‌و ئیرادەی خودا بۆ بەندەکانی لەقورئاندا شی کراوەتەوە، پێغەمبەران بەدورو درێژی بۆ گەلەکانیان رون کردۆتەوە، ئەی ئەوە نیە لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ﴾النحل/٣٦. ئەوە فەرمانی خودایەو ئەوە ویست‌و ئیرادەیەتی بۆ بەندەکانی. هەرگیز پەروەردگار فەرمان بەئادەمیزاد ناکا بەکارێك بزانێ: لەسروشتیاندا دەسەڵاتی کردنەکەی لێ یاساغ کردبن. یان بەزۆر بۆ ئەنجامدانی پێچەوانەی ئەو کارە رەهای کردبن.

بڕیاری خودا لەم بارەوە زۆر ئاشکراو رونە، ئادەمیزادی سەرپشك کردوە کە بەویستی خۆی چ رێگایەك دەگرێ بیگرێ.

ویستی خودای بەدیهێنەرو دانا وابوو: کە ئادەمیزاد دروست بکا ئامادەباشی هیدایەت‌و گومڕایی تێدا بێ، دەسەڵاتی پێداون بەویستی خۆیان کام رێباز دەگرن بیگرن، سەرباری ئەوەش عەقڵ‌و هۆشی پێداون، بۆ خۆیان تێبفکرن‌و بزانن کام رێبازی باشە هەڵی بژێرن، هەست‌و بیری پێ بەخشیون بەکاریان بێنن بەراوردی شتەکان بکەن، لەنیشانەی هیدایەت‌و بەڵگە جۆراو جۆرەکان وردببنەوەو رێبازی گونجاو هەڵبژێرن!

جا وەنەبێ پەروەردگار هەر بەوەنـدە وازی لـەئادەمیزاد هێنابێ‌و حەواڵەی عـەقڵ‌و هۆشـی خـۆی کردبـێ، بـەڵکوو شـەریعەتی خـۆی بەپێغەمبەرانیـدا ناردوە بۆیـان بـۆ ئـەوەی بیکەنـە بەرنامـەی ژیانیـان، بیکەنـە تـەرازوی کردەوەکانیـان، بەگوێرەی ئەو شەریعەت‌و یاسایە کارەکانیـان ئـەنجام بـدەن، راست لەناراسـت جیـا بکەنەوە حـەق‌و بـەتاڵ بـەراورد بکـەن. لەبـەر رۆشـنایی ئـەو شـەریعەت‌و یاسایەدا بەگوێرەی پەیام‌و بەرنامەی خودا هەڵس‌و کەوت بکەن.

پـەروەردگار کـە: پێغەمبـەرانی نـاردوون بۆیـە نـاردوونی ترسـێنەرو مـوژدە دەربن، هەرگیز نەیکردوون بەملهوڕو ستەمکار بـەزۆرەملێ ملـی خـەڵکی بـادەن بـۆ ئیمـان هێنـان، بـەڵکوو ئـەوان تـەنها راگەیانـدنیان لەسـەر بـووە، فـەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگاریان پـێ راگەیانـدون جـا لـەئاکامی ئـەم بانگەوازییـەدا، هەبوە رێگای هیدایەتی گرتووەو هەبوە رێگای گومرایی هەڵبژاردوە!

﴿كَذَلِكَ فَعَلَ الَّـذِينَ مِـنْ قَـبْلِهِمْ﴾ هـەر بـە شـێوە هەڵوێستو ناکارانـە کـافرو بێدینەکانی پێش ئەمان هەڵوێستیان نواندوەو هەمان بیرو بۆچونیان هەبوە.

واتــە: ئــەو عــوزرو بیانوانــەی موشــریکەکانی مەککــەو هــاو وێنــەکانیان دیهێننــەوە عــوزرو بەهانەیـەکی پـووچ‌و دەلیلێکـی بـێ بناغەیـە، لـەرووی عـەقڵ‌و تێفکرینەوە نیە بەڵکوو لاسایی کردنەوەی کافرە پێشینەکانە، ئەوانیش ئـەم جـۆرە بیانوو دەلیلانەیان دەهێنایەوەو پشتیان پـێ دەبەست.

﴿فَهَـلْ عَلَـى الرُّسُـلِ إِلاَّ الْـبَلاغُ الْمُـبِينُ﴾ ئایـا پێغەمبـەران جگـە لەگەیانـدنی فـەرمانی خـودا چـی تریـان لەسـەرە؟ بێگومـان پێغەمبـەران تـەنیا راگەیانـدنیان لەسـەرە، کـەوابێ ئـەی پێغەمبـەر! تـۆ هـەر راگەیانـدنت لەسـەرە، پـەیامی خـۆت بگەیەنە، مژدەی بەهەشت بدە بەخوداپەرستان‌و سەرپێچیکاران بترسێنە لـەئاگری دۆزەخ. ئەمە ئەرکی سەرشانی تۆیە، حیساب‌و لێکۆڵینەوەو سزا عائیـد بەئێمەیـەو خۆمان دەزانین چۆنیان تۆڵە لێ دەستێنینەوە!!

کافرەکان لەوەدا هەڵەن: کە دەڵێن: ئێمە هەرچی دەیکەین تاوانی تێدا نیە، چونکە هەرچی دەیکەین لەسەر خواستی خودایە هەر شتێکیش بەخواستی خودا بێ تاوانی تێدا نیە، جا پەروەردگار لەپوچەڵکردنەوەی ئەمەدا دەفەرموێ:

راستە، هەرچی دەیکەن لەسەر خواستی خودایە بەبێ خواستی ئەو هیچ شتێك نابێ، بەڵام ئەوە راست نیە: کە دەڵێن: هەر شتێك لەسەر خواستی خودابێ تاوانی تێدا نیە، چونکە خواستی خودای مەزن شوێنکەوتووی زانینی خوداخۆیەتی، هیچ کاتێکیش زانینی خودا بەهەڵە ناڕوا، پەروەردگار بەهۆی زانینی خۆیەوە زانایە بەوە: کە ئادەمیزاد ئەو ئیختیارەی پێ دراوەو بەو ئیختیارەی کارەکانی خۆی ئەنجام دەدا: جا هەرکاتێك ئیختیاری ئادەمیزاد رو بکاتە کردەوەی باش خواستی خودایش روی تێدەکاو توانایی خوداش روی لێدەکا و ئەو کردەوە باشەی بۆ دەخولقێنێ‌و پێشی رازییە، هەروەها ئەگەر ئیختیاری ئادەمیزاد روبکاتە کردەوەیەکی ناهەموار خواستی خودایش روی لێدەکا و تەوانایی خودایش روی تێدەکا ئەو کردەوە ناهەموارەی بۆ دەخولقێنێ، بەڵام پێ‌ی نارازییە! بەکورتی قودرەتی خودا وەکوو تیغێکی برندە وایە تەڕو وشك دەبڕێ‌و بۆ هەموو کردەوەیەك چاك بێ یان خراپ، وەکوو یەك وایە!

بەکورتی: خودا فەرمان دەکا بەچاکەکاری‌و نەهی لەخراپەکاری دەکا، ڕێگای چاك‌و خراپ بۆ بەندەکانی رون دەکاتەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾الشمس/٨. پێغەمبەران فەرمانی خودا رادەگەیەنن، جا لەئاکامی راگەیاندنی پەیامی خودا لەلایەن پێغەمبەرانەوە، ئادەمیزادی وا هەن ئیمان دەهێنن‌و پابەندی فەرمان‌و نەهیەکانی دەبن، ئەوانە سەرفرازو خۆشنودن. هی وایش هەیە پشت هەڵدەکاو رو وەردەگێڕێ. ئەوانە بەدبەخت‌و نەگبەتن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾الشمس/٩-١٠.

واتە: ئەواب و عیقابی خودا پابەندە بەدوو شتەوە: یەکەم ویستی خودا، دووەم روتێکردنی بەندەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەوهۆکارانەی سەردەکێشن بۆ رزگار بوون یان بەفتارە چوون!

**هیدایەتی خوداش دوو جۆرە:**

١- هیدایەتی شارەزایی کردن و رێنومایی کردن، ئەمەیان لەرێگەی پێغەمبەران و نامە ئاسمانییەکان و بانگخوازانی ئایین دەستەبەر دەبێ، ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران و بانگەوازیکەرانی رێبازی خودا پەرستی ئەمەیە.

٢- هیدایەتی تۆفیق و دەست پێوە گرتن تا دەگاتە مەبەست و ئەمجار پارمەتیدانی بۆ بەردەوامبوون لەسەری، ئەمەیان پابەندە بەپەیرەو کردنی بەندەکان بۆ رێگای هیدایەت و ئیمانهێنان. کەسێك ئیمانی هێنا خودا زیاتر هەڵی دەنێ بۆ کاری چاك و تۆفیقی دەدا بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئیمان و خوداپەرستی. کەسێکیش گومڕا بێ و کوفر هەڵبژێرێ و روو لەئیمانهێنان وەرگێرێ ئەوە خودا گومڕای دەکا و لەرێگای حەق دووری دەخاتەوە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رون دەکاتەوە: کە ناردنی پێغەمبەران داب و نەرێتێکی خودایە و بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك پێغەمبەری رەوانە کردوە، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنْ اُعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ بێگومان ئێمە بۆ سەر هەر گەل و نەتەوەیەکی پێش ئێوە، پێغەمبەرێکمان رەوانە کردوە، وەکوو چۆن بۆ ئێوەش پێغەمبەرمان ناردوە، ئەمە داب و نەرێتی خودا بووە لەگەڵ بەندەکانی و هیچ گەل و نەتەوەیەکی لەم سەروەرییە بێ بەش نەکردوە، هەموو ئەم پێغەمبەرانە پەیامی ئەوەیان راگەیاندوە و فەرمانیان بەگەلەکانیان کردوە: کە عیبادەتی خودا بکەن و خۆیان لەبتپەرستی و بەندایەتیکردن بۆ طاغوت بپارێزن خودا بەتاك و تەنها بناسن و هاوەڵی بۆ دانەنێن، ئاگایان لەخۆیان بێ شەیتان گومڕایان نەکاو لەرێبازی حەق لایان نەدا!

هەموویان بانگەوازی یەکتاپەرستییان کردوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾الأنبياء/٢٥. یان دەفەرموێ: ﴿وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَنِ آلِهَةً يُعْبَدُونَ﴾الزخرف/٤٥. دەی کەوابێ چۆن ڕەوایە بۆ ئەو موشریکە نەفامانە ئاوا بەهەوانتە بەبێ بەڵگەو دەلیل بڵێن: ئیمان نەهێنانمان بەویستی خودایەو ئەگەر ئەو ڕازی لەسەر نەبوایە ئێمە ئیمانمان دەهێنا!

**پوختەی قسە: مەشیئەت دوو جۆرە:**

١- مەشیئەتی شەرعی: بەم ڕەنگە خودا پێی خۆش بێ بەندەکانی کافر ببن، خودا ئەم جۆرە مەشیئەتەی نیەو نەبوە چونکە ئەو لەسەر زوبانی فروستادەکانی نەهی لەکوفر کردوە چۆن کوفری پێ خۆش دەبێ!

٢- مەشیئەتی تەمکینی: بەم ڕەنگە مەجال برەخسێنێ بۆ هەندێ کەس کە بەویستی خۆیان کوفر هەڵبژێرن و پەیرەوی بکەن. ئەم جۆرە مەشیئەتە نابێتە بەڵگە بۆ کافرەکان. پەروەردگار دۆزەخی دروست کردوە ئەهلی دۆزەخیش (کە کافرو شەیاتینین) دروستی کردون، ڕازی نیە بەندەکانی کافر ببن!!! ئەمەش حیکمەتێکی گەورەی تێدایە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە ئەوانەی بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەکانیەوە نەچوون و گوێ بیسی ئامۆژگاریەکانیان نەبوون خودا لەناوی بردون، سزای بەئێشیان بۆ بڕیار دراوە دەفەرموێ: ﴿فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ﴾ پاش ناردنی پێغەمبەران بۆ سەر ئادەمیزادو بانگەوازیکردنیان بۆ یەکتاپەرستی و پابەند بوون بەفەرمان و نەهیەکانی پەروەردگار هەیانبوو خودا هیداتی دان و تۆفیقی دان بۆ ئەوەی ئیمان بەفروستادەکانی خودا بێنن و پابەندی

ئامۆژگایـەکانیان بـن‌و پـەیڕەوی پەیامەکـەیان بکـەن ئەوانـە بـەمراز گەیـشتن‌و لەسزای دۆزەخ رزگاریان بوو.

هی وایشیان هەبوو ڕێگای راسـتیان نـەگرت‌و کوفرو گومڕاییـان هەڵبـژاردو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستنەوە، شوێن طاغوت کەوتن ئـیتر خـودا بەعـەزابی بـێ ئامانی خۆی لەناوی بردن، گەورەترین سزای ناردنە سەرو کردنی بەپەندی رۆژگار!

﴿فَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ دە بـەناو وڵاتو ناوچەکانی دەوروبـەرتاندا گەشت‌و گـوزار بکـەن، سـەیری ئـەو شـوێنەوارو کـەلاوە کۆنانەی گەلە ستەمکارەکان بکەن، لەوڵات‌و شارو گونـدو زەوی‌و زاریـان وردببنـەوە بـزانن ئـەو گەلەسـتەمکارانەی وەکوو گـەلی عـادو ثـەمودو ئەصـحابولئەیکەو هـاو وێنەکانیان چییان بەسەر هات؛ بڕواننە: شوێنەواری عەزابی ئێمە لەسـەریان چـۆن خاك‌و وڵاتمان لێ چۆڵ کردون‌و قەصرو باڵەخانـەیان بەسـەر یەکدا روخـاوە، مـاڵ‌و مڵك‌و زەوی‌و زاریـان بـێ خـاوەن بـەجێماوە، وردببنـەوە بـزانن سـەرەنجامی کـافرو بەدرۆخـەرەوەی پێغەمبـەران چـۆنەو چـۆن بـووە، بـەڵکوو پەنـدئامێز بـبن بـەخۆتاندا بچنەوەو تەمێ خواردو ببن.

ئـەمجار پـەروەردگار خیطـاب ئاڕاسـتەی پێغەمبـەر دەکـاو تەسـەللای دڵـی دەداتەوە: لەسەر ئەو سەر رەقی‌و ئینکاری‌و پشت هەڵکردنەیان لەبانگەوازییەکەی، هەرچـەندە پێغەمبـەر ﷺ لەهـەوڵ‌و تێکۆشـاندا بـوو بـۆ ئیمانهێنانیـان زۆر بەپەرۆشەوە بانگەوازی دەکردن‌و ئەوانیش هیچ شلوێ نەدەبوون‌و نەدەهاتنـە سـەر ڕێگای حەق‌و راستی، جـا پـەروەردگار تەسـەللای پێغەمبـەر دەداتـەوەو ئـەوەی بـۆ رون دەکاتەوە: کە هەموو کارێك بەدەست خودایـەو، پێغەمبـەر تـەنها راگەیانـدنی لەسەرە، مژدە بدا بەتەقواکاران‌و سەرپێچیکاران بترسێنێ!

دەفەرموێ: ﴿إِنْ تَحْرِصْ عَلَى هُدَاهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ يُضِلُّ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ سوور بی لەسەر ئیمانهێنانی ئەو موشریکانەو بتەوێ بیانخەیە سەر رێبازی ئیسلام‌و خودا پەرستی، ئەوە باش بزانە ئەو بەپەرۆشییەی تۆ بۆ ئیمانهێنانیان چ سودێکی نیە ئەگەر خودا بیەوێ بەهۆی هەڵبژاردنی رێبازی ناهەموارەوە کە بۆ خۆیان ئیختیاریان کردوە گومرایان بکا، بێگومان خودا هیدایەتی کەسێك نادا کە بۆ خۆی رێبازی ناهەمواری هەڵبژاردوەو دەیەوێ لەسەر گومڕایی‌و کوفرو بێدینی بمێنێتەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً﴾المائدة/٤١. یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾القصص/٥٦.

پۆختەی قسە ئەوەیە: کەسێك بۆ خۆی گومڕایی هەڵبژێرێ، بەلێبڕانەوە خەریکی دابینکردنی هۆکاری کوفرو بێدینی بێ، خودا بەزۆر نایگێڕێتەوە بۆ رێبازی راست، چونکە مەدای ئیمان‌و کوفر لەسەر ویست و ئیختیارە، نەك بەزۆرە ملی‌و ناچار کردن!

﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾ کەسانێك بۆ خۆیان گومڕایی هەڵبژێرن کەس نیە یارمەتییان بداو لەعەزابی سەختی خودا بیانپارێزێ.

ئەمجار رەخنەی چوارەم: کە کافرەکان ئاراستەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدی دەکەن رادەنوێنن‌و رەدیان دەداتەوە چونکە کافرەکان لێرەشدا قیاسێکی غەڵەتیان هەڵدەستاند! دەیانگوت: بیرو باوەڕی زیندوبوونەوەو حەشرو نەشر بەتاڵ‌و بێ بناغەیە، کەوابێ بڕواکردن بەپێغەمبەرایەتیش بەتاڵە. دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ موشریکەکان سوێندیان دەخواردو جەختیان لەسوێند خواردنەکەیاندا دەکردو سوێندەکەیان خەست دەکردەوە دەیانگوت: ﴿لا يَبْعَثُ اللَّهُ مَنْ يَمُوتُ﴾ هەرگیز خودا ئەم ئادەمیزادانە دوای مردن زیندو ناکاتەوە، کەسێك مردووی رزی‌و فەوتاوو بوو بەخۆڵ تازە لەکوێ جارێکی

تر زيندو دەبێتەوە!!! دەيانگوت: هەرگيز ئەمە نابێ‌و ناگونجێ، پەروەردگار ڕەددى دانەوە فەرمووى: ﴿بَلَى وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً﴾ بەڵێ ئەو زيندوبوونەوە دەبێ، وادەيـە كـە خودا داويەتى‌و پاشگەزبوونەوەى تێدا نيەو هەردێ! ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زوربەى ئادەميزادان لەبەر نەزانى‌و كورت بينينيـان نـازانن: كـە وادەى خـودا هەر دەبێ بێتـە جێ‌و ئـەو زينـدو بوونـەوەو حەشـرو نەشـرو لێكۆڵينـەوەو سـزاو پاداشـەى وادەى پـێ داوە هـەر دەبـێ ئـەنجام بـدرێ‌و هـاتنى ڕۆژى قيامـەت شـتێكى حەتمييـە، ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُـمُ الَّـذِي يَخْتَلِفُـونَ فِيـهِ﴾ بـۆ ئـەوەى حەقيقـەت‌و ڕاسـتى بـۆ ئادەميزاد لەو شتانەى ئيختيلافيان تێيـدا هەيـە ڕون بكاتەوە ـ تـەرازوى عەداڵـەتى موطلەق دابنێ پاك‌و پيس لێك جيا بكاتـەوە، فەرمانبـەدارو سەرپێچيكار پـاداش‌و سزاى خۆيان وەربگرنەوە، تۆڵەى ستەم لەسـتەمكاران بـستێنێ‌و پاداشـى چاكەكاران بداتەوە سزاى خراپەكاران بدا!

﴿وَلِيَعْلَمَ الَّـذِينَ كَفَـرُوا أَنَّهُـمْ كَـانُوا كَـاذِبِينَ﴾ هـەروەها بـۆ ئـەوەى كـافرو موشريكەكانى كە زيندوبوونەوەيان بەدرۆ دەزانى (علم اليقين)يان بۆ پەيـدا ببـێ‌و دڵنيـابن: كـە درۆيـان كـردوەو بڕواكـەيان پـوچ بـووە: كـە دەيـانگوت خـودا هـەرگيز مـردو زينـدو ناكاتـەوە. جـا كـە زينـدو دەكرێنـەوە كـێش دەكـرێن بـۆ حيـساب‌و لێكۆڵينەوە ئەمجار بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەكرێن، دەرگەوانانى دۆزەخ. پێيان دەڵێن: ﴿هَذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ، أَفَسِحْرٌ هَذَا أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ، اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاء عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾الطور/١٤-١٦.

ئەمجار هەر بەبۆنەوەى باسى قيامەت‌و زيندوبوونەوەوە، گونجـاوە: كـە باسـى بەتوانايى‌و دەسەڵاتى خۆى بكا، ئەوە ڕابگەيـەنێ: كـە لەئاسمانـەكان‌و زەويـدا هـيچ شتێك نيە لەخودا عاصى بێ‌و نەتوانێ ئەنجامى بدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَـا لِـشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُـونُ﴾ ئێمـە بـۆ هـەر شـتێك بمانـەوێ ئـەنجامى بـدەين، بەديهێنان بێ، يان زيندوكردنەوە، هێنانى ڕۆژى قيامەت بێ يان هەر شتێكى تر بێ

هەر ئەوەندە پێی دەڵێین: ببە ئیتر چۆنمان دەوێ‌و چەندمان دەوێ کەی دەمانەوێ بەبێ دواکەوتن یەکسەر دێتە دی هیچ پێیەوە ماندو نابین، فەرمانی پێ دەکەین ببەو دەبێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾القمر/٥٠. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾النحل/٧٧.

## پاداشی کۆچکاران، پێغەمبەر هەر دەبێ نادەمیزاد بێ، ئەرکی سەرشانیشی رونکردنەوەی قورئانە، موژدەدان‌و ترساندنە

﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ

فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ۩ ﴿٥٠﴾

دوای ئەوەی لەوەپێش پەروەردگار هەڵوێستی کافرەکانی دەربارەی زیندو بوونەوەو هاتنی ڕۆژی قیامەت ڕونکردەوە، کە نیشانەی ئەو پەڕی بێ عەقڵیو نەفامیو گومڕاییانە، حوکمی کۆچکردنو بەجێهێشتنی ئەو وڵاتەی ئەو جۆرە کافرانەی تێدان شی دەکاتەوەو موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ کۆچکردن بەمەبەستی ڕزگار بوون لەو ئازارو ئەشکەنجەیەی کە لەکافرەکانەوە تووشیان دەهات.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی شەش کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوارێ (صوهەیب، بیلال، عەممار، خەباب، عابیس، جوبەیر) کە کۆیلە بوون، قورەیشییەکان سزایان دەدان بۆ ئەوەی لەموسوڵمانەتی پەشیمان ببنەوە. جا صوهەیب پێی گوتن: من پیرێکی فانی پەککەوتەم، ئەگەر لەگەڵ ئێوە بم سوودتان پێ ناگەیەنم، ئەگەر لەدژیشتان بم زیانتان پێ ناگەیەنم، ئیتر بەپارە خۆی کڕیەوە، جا حەزرەتی ئەبو بەکر بەمەی زانی فەرمووی: سەودایەکی باشت کردوە یاصەهەیب! حەزرەتی عومەریش لەم بارەوە فەرمووی: صوهەیب پیاوێکی

باشە ئەگەر ترسی سزای خودایشی نەبوایە هەر نافەرمانی نەدەكرد! ئەمە ئەوپەڕی خوداپەرستییە كابرا ترسی ئاگری دۆزەخی نەبێ‌و خوداپەرست بێ! ئەی ئەگەر ترسی هەبێ دەبێ چۆن بێ؟!

بەلام هاوەڵەكانی تر هەریەكەیان بەبیانوێك خۆیان رزگار كرد دوایی كۆچیان كرد.

عەبدی كوڕی حەمیدو ئیبنو جەریرو ئیبنولمونذیر لەقەتادەوە ریوایەت دەكەن: كە لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی: ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەرن ﷺ دانیشتوانی مەككە ستەمیان لێكرد ن، لەماڵ‌و حاڵی خۆیان وەدەریان نان، هەتا هەندێكیان كۆچیان كرد بۆ خاكی حەبەشە، پاشان خودا شاری مەدینەی بۆ رەخساندن‌و بۆی كردن بەوڵاتی كۆچ بۆ كردن‌و دانیشتوانی ئەوێشی بۆ كردن بەپشتیوان‌و یارمەتیدەر.

دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ ئەوانەی لەپێناو ئایینی خودادا ماڵ‌و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتوو وازیان لەزێدو نیشتمانی خۆیان هێنا، لەخزم‌و كەس‌و كاری خۆیان دوور كەوتنەوە، كۆچیان كرد بۆ وڵاتی ترو خۆیان ئاوارە كرد پاش ئەوەی ستەمیان لێ كراو تووشی ئەزیەت‌و ناڕەحەتی بوون لەلایەن دوژمنانیانەوە، لەژیانی دونیایاندا جێ نشینیان دەكەین لەوڵاتێكی خۆشدا، خانوو شوێنی حەوانەوەی دلگیریان دەدەینێ، پلەو پایەو شكۆمەندییان پێ دەبەخشین، زاڵیان دەكەین بەسەر موشریكەكانی مەككەو بەسەر هەموو عەرەب‌و هەموو دانیشتوانی خۆرهەلات‌و خۆرئاوادا.

حسنة: لێرەدا بەمانا خانوو بەرەی دلگیرو زێدو نیشتمانی گونجاوە ئەویش شاری مەدینەی پیرۆزە. ئەمە رای ئیبنو عەبباس‌و شیعبی‌و قەتادەیە.

موجاهید دەفەرموێ: حسنة: بەمانا رزق‌و رۆزی پاك‌و خاوێنە.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: هیچ دژایەتیەك لەنێوان ئەم دوو رایەدا نیە. چونکە ئەو خودا پەرستە لەخۆبردوانە کە وازیان لەماڵو حاڵی خۆیان هێناوە، خودا لەدونیاداقەرەبووی باشتری بۆ کردونەوە، کەسێکیش لەبەر خاتری خودا واز لەشتێك بێنێ، خودا باشتری دەداتەوە. هەر بۆیەشە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوون بەگەورەی دونیاو دانیشتوانی سەر زەوی.

﴿وَلأَجْرُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ بێگومان پاداشی قیامەتیان زۆر گەورەترو بەنرخترو پیرۆزترە، چونکە پاداشی قیامەتیان بەمرازگەییشتیانە بەبەهەشتی رازاوەو نازو نیعمەتی نەبڕاوەو هەتا هەتایی. خۆ ئەگەر ئەوانە بیانزانیایە پاداشی قیامەتیان چەند پیرۆزو گەورەیە زیاتر تێدەکۆشانو پتر خۆیان ماندو دەکرد!

یان دەگونجێ (راناو)ەکە بگەرێتەوە بۆ کافرەکان، واتە: ئەگەر کافرەکان بیانزانیایە لەئاکامدا خودا ئاوا دونیاو قیامەت دەخاتە ژێر دەستی ئەو تاقمەو پێرو گرۆهە هەژارانەوەو پاداشی ئاوایان بۆ فەراهەم دەهێندرێ ئەوانیش زوو موسوڵمان دەبوونو ئازاری ئەو دەستە هەژارو بێ نەوایانەیان نەدەدا.

ئیبنو جەریرو ئیبنولونذیر لەعومەری کوری خەتتابەوە ریوایەت دەکەن دەڵێن: کاتێ: کە شتێکی دەبەخشێ بەیەکێ لەموهاجیرەکان پێی دەفەرموون: ئەمە وەربگرە خودا بەرەکەتی تێ بخا بۆت: ئەمە بەشی دونیاتە، دڵنیابە بەشی قیامەتت زۆر لەمە باشترو گەورەترە. ئەمجار پەروەردگار وەصفی کۆچکارەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەو کۆچکارانە کەسانێك بوون: کە لەئاستی سزاو ئازارو ئەشکەنجەدا خۆیان راگرت، گوێیان نەدا بەدەربەدەریو دوورە وڵاتیو بێ گوزەرانی، خۆگرو پشوو درێژو بەهیمەت بوون لەئاستی ئەو هەموو تەنگو چەڵەمانەی بەرەو رویان بوونەوە. لەپێناو ئایینی خودادا ماندو نەناس بوون، بۆ هەموو کارو بارێکیان کە چاوەروان دەکرا بێتە رێگەیان (خۆش یان

ناخۆش) پشتیان بەخودا دەبەستو لەهەموو شتێك بێ باك بوون! بۆیە خودا لەدونیاو قیامەت دا پاداشی باشی پێ بەخشیون!

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: دەگونجێ هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە لەبارەی ئەو موسولمانانەوە بێ: کە بۆ ولاتی حەبەشە کۆچیان کرد، دوای ئەوەی: کە قورەیشییە کافرەکان تینیان بۆ هێناو تەنگیان پێ هەڵچنینو ناچاریان کردن بەرەو ولاتی حەبەشە رەو بکەن کە ژمارەیان نزیکی (٨٠) هەشتا کەس دەبوون لەپیاوو ژن لەناویاندا عوسمانی کوڕی عەففانو روقیەی خێزانیو جەعفەری کوڕی ئەبو طالیبو ئەبو سەلەمەی کوڕی (عبد الأسود) بوون. خودا لێیان رازی بێو بەبەهەشت رازییان بکا... لێشیان رازی بووەو رازیشی کردون، جا خودا وادەی پاداشی باشی پێداون لەدونیاو قیامەتدا.[10]

ئەمجار وەڵامی رەخنەی پێنجەم دەداتەوە، کە دەیانگوت: پێغەمبەر دەبێ فریشتەبێ، ئادەمیزاد بەکەڵکی پێغەمبەرایەتی نایە! ئیتر پەروەردگار وەڵامی داتەوەو فەرموی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾ ئێمە هەرگیز پێش رەوانە کردنی تۆ ئەی موحەممەد! پێغەمبەرمان لەفریشتە نەناردوە بۆ سەر ئادەمیزاد، دابو نەرێتی ئێمە وا نەهاتووە فریشتە بکەینە پێغەمبەرو فروستادەی خۆمانو ئەرکی بانگەوازیکردنی ئادەمیزادی بخەینە ئەستۆ، ئیللا: کە ناردبێتمان، چەند پیاوێکمان ناردوەو نیگامان بۆ ناردون. واتە: لەرەگەزی ئادەمیزاد پیاومان هەڵبژاردوەو کردومانەتە فروستادەو ئەرکی بانگەوزیکردنی ئادەمیزادمان خستۆتە ئەستۆو فەرمانو جڵەوگیری خۆمان بەنیگا بۆ ناردوە.

ئەی موحەممەد! بۆ سەر گەلو نەتەوەی تۆو گەلو نەتەوەکانی پێشوو هەر کاتێ پێغەمبەرمان ناردبێ لەرەگەزی خۆیان پێغەمبەرمان بۆ ناردوون وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلاَّ

(10) تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٢/٥٧٠.

بَشَراً رَّسُولاً﴾الأسراء/٩٣. یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ﴾الكهف/١١٠.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە خودای مەزن حەزرەتی موحەممەدی کردە پێغەمبەرو رەوانەی کرد، عەرەبەکان رەخنەیان لێ گرتو وتیان: خودا زۆر لەوە گەورەترە فروستادەکەی ئادەمیزاد بێ. جا خودای مەزن ئایەتی ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَباً أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَى رَجُلٍ مِّنْهُمْ...الآية﴾ ناردەخوارێ.

دابو نەرێتی ئێمە وایەو وا بووە هەر کاتێ پێغەمبەرمان ناردبێ بۆ سەر ئادەمیزاد لەرەگەزی خۆیان پیاومان هەڵبژاردوەو کردومانە بەفروستادەی خۆمان! ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ دە ئەگەر باوەڕ ناکەن بچن پرسیار لەزاناو خاوەن نامەکان بکەن، لەمالمو کەشیشەکان بپرسن ئاخۆ پێغەمبەرەکانیان ئادەمیزاد بوون یان فریشتە بوون! جا ئەگەر وتیان: فریشتە بوون ئەوە لەسەر ئینکاری خۆتان بن ئەگەر وتیان: ئادەمیزاد بوون، ئەوە ئینکاری ئەوە مەکەن: کە موحەممەد پێغەمبەر بێو بۆ سەر ئێوە رەوانە کرابێ!

﴿بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرانەمان ناردوون بەبەڵگەی ئاشکراو موعجیزەی گەورەوە، کە شایەتی راستی دەدەن لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەو زاتانەی موعجیزەو بەڵگەکانیان لەسەر دەست دەردەکەوێ. هەروەها نامەی ئاسمانیمان بۆ ناردوون: کەئامۆژگاریو شەریعەتو یاسایان تێدا بووە بۆ خۆیانو گەلەکانیان.

﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ جا وەکوو نامەی ئاسمانیمان ناردوون بۆ پێغەمبەرەکانی پێش تۆ ئەی موحەممەد! قورئانیشمان بۆ تۆ نازڵ کردووە، بۆ ئەوەی تۆ ئەو نیگایەی لەخوداوە بۆیان نێردراوە: کە بیکەنە بەرنامەی ژیانیان، بۆیان شی بکەیەوە، ئەحکامی حەڵاڵو حەرامو یاسای ژیانیان بۆ رون بکەیەوە. چیرۆكو بەسەرهاتی گەلە پێشینەکانیان بۆ بگێڕیەوە: تا پەندی لێ

وەربگـرنو بـەخۆیان دا بـچنەوە، لەبەسـەرهاتو ئاکـامی گەلـە سـتەمکارەکان وردببنەوەو خۆیان لەقارو غەزەبی خودا بپارێزن ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی لەبوونەوەر فکر بکەنەوە، سەیری رابوردو بکەنو داهاتووی خۆیـانی لەسـەر بنیات بنێن ئەو هەڵەیەی گەلە پێشینەکان تـێی کـەوتن ئـەمان خۆی لێ بپـاریزن! لەنهێنی ژیان ورد ببنەوەو هیدایەت وەربگـرنو لـەدونیاو قیامـەتدا بەختـەوەریو سەرفرازی بەدەست بێنن!

جـا دوای ئـەوەی دەرگـای هیـوای لەبـەردەم ئادەمیزادەکـاندا کـردەوە، دەیانترسێنێ لەبەردەوام بوون لەو بیرو باوەڕەی کە خۆیـان پێوە پابەنـد کـردوە، هەڕەشەیان لێ دەکاو لەبەردەوام بوون لەسەر کوفرو تاوانکاریو دەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنَ الَّـذِينَ مَكَـرُوا الـسَّيِّئَاتِ أَنْ يَخْـسِفَ اللَّـهُ بِهِـمُ الأَرْضَ﴾ ئایـا ئەوانـەی دژایـەتی پێغەمبـەریان کـرد لەدانیـشتوانی مەککـەو دەوروبـەری، ویـستیان هـاوەڵانی لـەئیمانهێنان بگێڕنـەوە، تینیـان بـۆ بێـنن بـۆ ئـەوەی ژێـوان ببنـەوە، ئایـا دڵنیـان لەسزاو عەزابی بێ ئامانی خودا دڵنیان لەوەی:

١- کە خودا بەزەویدا نایانباتە خوارێ، ناترسـن کـە خـودا ریشەکێشیان بکـاو لەگۆڕەپانی ژیان وەلایانخا. وەکوو لەوەپێش قارونمان بـەخۆیو مڵکو سامانیەوە بەزەویدا بردە خوارێ!

٢- ﴿أَوْ يَـأْتِيَهُمُ الْعَـذَابُ مِـنْ حَيْـثُ لا يَـشْعُرُونَ﴾ یـان لـەنکاوێك عـەزاب بێتـە سەریانو غافلگیریان بکا. بـەجۆرێك، کـە نـەزانن لـەکوێوە ئـەو عەزابـەیان بـۆ دێ، وەکوو چۆن قەومی (لوط)مان وا لێکرد و غافلگیرمان کردن...

٣- ﴿أَوْ يَأْخُـذَهُمْ فِـي تَقَلُّـبِهِمْ فَمَـا هُـمْ بِمُعْجِـزِينَ﴾ یـان بەعـەزاب بیـانگرێو تێکیانــەوە بپێــچێ لــەکاتی هاتووچــۆکردنیان لەشــەوو رۆژدا، لــەکاتی ســەفەرو سەرگەرمی هەوڵدانیاندا بۆ ژیـان، لـەکاتی خـەریکبونو هەڵەوگیرییان بـەکاروباری

خۆیانەوە، خۆ ئاشکرایە لەهیچ حاڵێکدا لەدەست خودا رزگاریان نابێ، هەڵاتن‌و خۆشاردنەوەو خۆ قایمکردن چاریان ناکا.

٤- ﴿أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَى تَخَوُّفٍ﴾ یان خودا بەعەزابی خۆی بیانگرێ‌و لەگەڵ هەبوونی ترس‌و خۆف، لەحاڵەتی ترس‌و لەرزدابن‌و عەزابەکەیان بۆ بنێرێ، واتە چاوەڕوانی عەزابەکە بکەن‌و بۆیان بێ، ئەم جۆرە عەزابە پێچەوانەی جۆری یەکەمە کە فەرمووی: ﴿مِنْ حَيْثُ لا يَشْعُرُونَ﴾.

دیارە هاتنی عەزابی چاوەڕوانکراو لەگەڵ هەبوونی ترس‌و خۆفی هاتنی لەپێشەوە زۆر لەعەزابی غافڵگیری‌و لەنکاو سامناکترە، چونکە سزادان لەحاڵەتی ماندوبوونی ئەعصاب‌و دڵەراوکی دا زۆر بەئێش تر و ناخۆشترە لەسزادانی کوتوپڕی!

یان دەگونجێ (تخوف) بەمانا کەمبوونی ماڵ‌و منداڵ‌و رزق‌و رۆزی بێ وەکوو لەلوغەتی هۆزی هوزەیلدا هاتووە!

﴿فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان خودای ئێوە زۆر میهرەبان‌و بەبەزییە، خێراو دەسبەجێ سزاتان نادا، مۆڵەتتان دەدا، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە، بەخۆتاندا بچنەوە، واز لەکەمتەرخەمی خۆتان بێنن، هەڵەکانتان راست بکەنەوە، لەڕێبازی گومڕایی لادەن‌و تەمێ خواردو بن!

لەفەرموودەی صەحیحدا چەسپاوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (لاأحد أصبر على أذىً سمعه من الله، انهم يجعلون له ولدا، وهو يرزقهم ويعافيهم) کەس لەخودا بەصەبرتر نیە لەسەر خراپەکارییەك: کە بەرامبەری دەکرێ، ئادەمیزادەکان هاوەڵی بۆ دادەنێن، منداڵی‌و، کەچی ئەو رزق‌و رۆزییان دەداتێ‌و لەشساغیان دەکا..

هەروەها چەسپاوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله لیملی للظالم حتی اذا أخذه لم یفلته) بێگومان پەروەردگار مۆڵەتی ستەمکار دەدا بۆ ماوەیەك، جا ئەگەر ماوەکە بەسەرچوو دەیگرێو گیرۆدەی دەکا. کە گرتیشی ئیتر لەچنگی رزگاری نابێ. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾هود/١٠٢.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ الحج/٤٨.

دوابەدوای ئینذارو ترساندن گونجاوە: کە باسی قودرەتی بێ پایانی خۆی بکا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى مَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّداً لِلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ﴾ ئایا ئەو موشریکانەی کە ئاوا تەنگیان بەپێغەمبەرو هاوەڵانی هەڵچنیو بەردەوام بوون لەسەر کوفرو ستەمکاری خۆیان، هەروەها هەموو ئادەمیزاد بەگشتی سەیری مەخلووقاتی خودایان نەکردوە، ناڕوانن بۆ ئەو قەبارە خاوەن سێبەرانە، سەیری دارو درەختو کێوو بەردو دارو خانوو باڵەخانەی بەرز ناکەن، هەر کاتێ خواوەند خۆری لێ دەرخستن سێبەرەکانیان لەخۆرهەڵاتەوە بۆ خۆئاوا لاردەبێتەوە، لەجێگایەکەوە دەگوێزێتەوە بۆ جێگایەکی تر، لەسەرەتای خۆرهەڵاتندا سێبەرەکان لەجێگەیەکدان پاشان وردە وردە هەڵدەکشێنەوە، ئەمجار لەدوا نیوەڕۆ بەلایەکی تردا شۆڕ دەبنەوە، تا خۆرئاوا هەرپێوە دەچن، هەموویان حاڵیان وایە سوژدە دەبەن بۆ خودا، کڕنووشی ملکەچی خۆیان پێشکەش بەبارەگای پەروەردگار دەکەن!

بەراستی خۆر یەکێکە لەنیعمەتە گەورەکانی خودا، چونکە ئەگەر پەروەردگار ئەو خۆرە خاوەن تاوەی دروست نەکردایەو لەجەمسەری خۆیدا چاودێری نەکردایە، ئەم پڕتەو بەخشیی یەی بەسەر زەویدا نەدەبوو، زەوی نەیدەتوانی سوودی لێ وەرگرێ، ژیان لەسەر زەوی هەر نەدەبوو، چونکە هەموو

گیانلەبـەرێك، هـەموو دارو درەخـتو گـژوگیاو رووەكێـك پێویـستی بەتیـشكی خـۆر هەیە. ئەمجار ئەگەر دوری خۆر لەزەوی لەم ئەندازەیەی ئێستا هەیە كەمتر بوایـە سەر زەوی دەبوە بەستەڵەكو ژیانی تێدا نـەدەبوو ئەگـەر نـزیكتر بوایـە، هـەموو شتێكی سەر زەوی دەسوتاندو دوبارە ژیانی تێدا نەدەبوو..

ئەمە حاڵی بێ گیانو جەماداتە. ئاوا گەردنكەچی پەروەردگارن!! لەلایـەكی تـرەوە ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِنْ دَابَّةٍ وَالْمَلائِكَةُ وَهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ هەر بۆ خـودا كڕنـووش دەبـەن هەرچی لەئاسمانـەكانو زەویـدا هەیـە لەپێرۆو خشۆكو فریشتە، هەرچی لەسەر زەویدا دێو دەچێ، بەناویا یا بەهـەوادا دێو دەڕوا، لەسەر قاچ بڕوا یا لەسەر سك بكشێ، یان بەباڵ بفڕێ، لەوشكانی دا یان لەدەریادا چەڕەندەو پەڕەندەبن، یان ئادەمیزادو جندۆكە بـن یـان پـەریو فریـشتە بـن هـەموویان سـوژدە بـۆ پـەروەردگار دەبـەنو هیـچیان فیـز ناكـەنو خۆیـان لەبەرامبەر خودا بەگەورە نازانن! جا سوژدە بردنەكـەیان سوژدەبردنێكی عـادەتی ئاسـایی بـێ، یـان بەهـەر شـێوەیەكی تـر بـێ. چـونكە ئـەنجامی سـوژدە دامـاویو رامبوونە بۆ هێزی پەروەردگارو گەردنكەچ كردنە بۆ فەرمانو قەضاو قەدەری!

﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ ئەو فریشتەو پێـرۆو خـشۆكو باڵندانە لەپـەروەردگاری بانـسەریان دەترسـن، نافـەرمانی ناكـەن، ئـەركی سەرشـانی خۆیـان بـەگوێرەی توانـا ئـەنجام دەدەن، هەرچـی فـەرمانیان پـێ بكـرێ ئـەنجامی دەدەنو پابەنـدی دەبن.

هەموو شتێك گەردنكەچی یاسای خودایە، بەویستی ئەو لەجمو جۆڵ دایـە. بەراسـتی دیمـەنێكی سەرسـوڕهێنەرە ئـەو هـەموو حەشـاماتە لەسـێبەرو پێـرۆو خـشۆكو باڵنـدە وێـڕای فریـشتەو پەرییـەكانی ئاسمانـەكان لـەحاڵی گەردنكەچـیو فەرمانبـەرداری دان، خــەریكی عیبــادەتو ســوژدەبردنن، لەبــەجێهێنانی خــودا پەرسـتی دا لوتبـەرزی نـانوێننو خۆیـان بـەزل نـازانن، سەرپێـچی فـەرمانی خـودا

ناکـهن. ئهوانــهی خۆیــان لهھاوبهشــی کردنــی ئــهم دیمهنــه ســهر ســوڕهێنهره جیادهکهنــهوه، خۆبــهزل دهزانــن‌و سهرپێــچی فــهرمانی پــهروهردگار دهکــهن تــهنیا بهشێك لهئادهمیزادهکانن، ههر ئهوان خۆیان لهم هاوبهشییه ههڵدهماوێرن!

پوختــهی قــسه: ئهومیــه: پــهروهردگار ئــهوه رادهگهیــهنێ: کــه ئــهو لهبــهر گــهورهیی‌و شــکۆمهندی زاتــی خــۆی ســهرجهم دروســتکراوانی بهگیانلهبــهرو بــێ گیانیــهوه، هــهموویان ملکهچــی فــهرمان‌و ویــستهکانێ! وهکــوو لهشــوێنێکی تــردا دهفهرموێ: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَظِلالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ﴾الرعد/١٥.

## موناقهشهکردنی بیرو باوهڕی موشریکهکان‌و کاره ناپهسندهکانیان

﴿ ۞ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ فَتَمَتَّعُواْۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِمَا لَا يَعۡلَمُونَ نَصِيبٗا مِّمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡۗ تَٱللَّهِ لَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَفۡتَرُونَ ﴿٥٦﴾

وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۖ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾

دوای ئـــەوەی پـــەروەردگار ئـــەوەی رونکـــردەوە: کـــە هـــەموو بوونـــەوەر گەردنکەچی جەلالو شکۆمەندیی پەروەردگارن، بەشوێن ئەوەدا سێ شتی سەرەکی رادەگەیەنێ:

١- نەهی کردن لەهاوەڵدانان، چونکە هەموو بوونەوەرو ئەوەی تێیدایە مڵکی خۆیەتی، هیچ شتێك رایەی ناکەوێ ببێتە هاوەڵی خودا.

٢- بەیانکردنی کردەوە ناشیرینەکانی ئەو موشریکە نەفامانەو پوچەڵی قسەکانیان.

٣- مۆڵەتدانی خودا بۆ ئەو کافرو بێدینانە: کە دەسبەجێ سزایان ناداو پەلە لەلەناوبردنیان بەعەزاب ناکا، هەرچەندە کوفرەکەیان گەورەو کردەوەکانیان ناپەسندن!

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ اللَّهُ لا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ پەروەردگار فەرمانی بەبەندەکانی کردوە؛ کە دوو خودا یان زیاتر بۆ خۆیان بڕیار نەدەن، پێیانی فەرمووە: کەس مەکەن بەهاوەڵو شەریکم، جگە لەمن کەس مەپەرستن، هەر کاتێ ئێوە لەگەڵ مندا یەکی ترتان پەرست ئەوە شەریکتان بۆ من داناوە، خودای بەحەقو شیاوی خودایەتی هەر یەك خودایە؛ ئەویش ناوی (الله)یە هەر ئەو پەرستشی بۆ دەکرێو بەخودا دەناسرێ! کەوابێ ئەی بەندەکانم! لەسزای ئاگری دۆزەخی من بترسێن خۆتان بپارێزن لەعیقابی سامناکی من نەچن هاوەڵم بۆ دابنێن، بەندایەتی بۆ یەکێکی تریش بکەن!!

بەکورتی هیچ خودا نین شیاوی پەرستش بۆ کردن بن جگە لەپەروەردگار، کەسی تر غەیری خودا شیاوی خودایەتیو عیبادەت بۆ کردن نیە!

جا کە زاندرا خودای بەحەقو راست هەریەك خودایەو هەبوونی پێویستەو زاتییە، جگە لەخۆی هەموو بوونەوەر بەدیهێنراوی ئەوەو خۆی لەنەبوەوە هێناویەتە وجود، کەوابێ باش بزانن: کە ﴿وَلَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِباً﴾ هەر بۆ خودایە سەڵتەنەتو مڵکایەتی هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە، کەس رایەی ناکەوێ لەوەدا ببێتە هاوەڵی خودا، هەر خودا بۆ خۆی

بەدیهێنـەرو رزق‌و رۆژیدەریانـە ژیانیـان پـێ دەبەخـشێ‌و دەیانمرێنـێ هـەموویان بەنـدەو ملکی خۆنی. بەندایـەتی‌و طاعـەت‌و گەردنکەچی بەبـەردەوامی هـەر بـۆ ئەوەو بۆ کەسی تر نیـە، هـەر بـۆ ئـەو شیاوەو بـۆ کەسـی تـر ناشێ، هـەر بـۆ ئـەو پێویستەو بۆ کەسی تر نابێ!

جا کە ئەمانەتان زانین ﴿أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ ؟﴾ ئایا ئێوە ئەی گـرۆی ئـادەمیزاد! جگە لەخودا کەسی تر دەپەرستن؟ لەکەسی تر دەترسن؟

دوای ئـەوەی ئێـوە زانیتـان خـودای بوونـەوەر یەکـەو نابـێ بـەدوو، زانیتـان هـەموو شتێك ئـەو بـەدی هێنـاوەو پێویـستی بەئـەوبووە بـۆ پەیـدابوون‌و ئاتـاجی بەئەوە بۆ مانەوەو بەردەوام بوون! ئیترچۆن ئێوە غەیری خـودا دەپەرسـتن! چۆن لەغەیری خودا دەترسن؟؟

﴿وَمَا بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ﴾ واتە: کە پێویست بـوو تـەقوا بـۆ غـەیری خـودا نەکرێ، پێویستیشە شوکری حەقیقی هەر بۆ خودا بکرێ. چـونکە هـەر نیعمـەتێك ئێـوە هەتانـە: هـەر لەنیعمـەتی ئیمـان‌و لەشـساغی‌و ئـارامی دڵ‌و دەروونـەوە هـەتا دەگاتە نیعمەتی رزق‌و رۆزی‌و سـەرکەوتن‌و هـەموو پێویـستیاتێکی ژیـان‌و هۆکـاری خۆشبەختی‌و کامەرانی بۆ دونیاو قیامەت هـەمووی لەخوداویـەو بەدەسـت ئـەوە. کـەوابێ عـاقڵ ئـەو کەسـەیە هـەر لـەخودا بترسـێ، هـەر بەندایـەتی بـۆ خـودا بکـا، شـوکرو سوپاسـی حـەقیقی هـەر بـۆ خـودا ئـەنجام بـدا چـونکە هـەموو نیعمـەتێك لەخوداویە، هەموو هۆکارێکی ژیان‌و بەختەوەری دونیاو قیامـەت ئـەو فەراهـەمی دەهێنێ، هەر ئەویش دەتوانێ زەرەرو زیان لەبەنـدەکانی دوور بخاتـەوە. ئـەی ئـەوە نیە: کە ﴿ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ﴾ هەر کاتێـك تووشـی ناخۆشـی‌و تـەنگ‌و چەڵەمەیەك بوون زەرەرو زیان لەماڵ‌و سامانتان کەوت، خۆتان یان کـەس‌و کارتـان نەخۆش کەوتن بومەلەرزەو زریان‌و لافاو لەزێدو نیشتمانی دان، دوژمن هێرشی بۆ هێنان‌و دەورەی دان...هتد هەر پەنا بۆ خودا دەبەن‌و هاوار دەکەنـە بارەگـای ئـەوو

دەپاڕێنەوە، دەلاڵێنەوە هاوار دەکەن، لەناخەوە، بەئیلحاحەوە لێی دەپاڕێنەوە: کە رزگارتان بکاو ناخۆشیتان لەسەر لابەرێ، چونکە دڵنیان جگە لەخودا کەسی تر ناتوانێ بەهاناتانەوە بێ‌و تەنگ‌و چەڵەمەتان لەسەر لابەرێ!

﴿ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنْكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْكُمْ بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ پاش ئەو هەموو پاڕانەوەو لالانەوە: کە خودا ناخۆشی لەسەر لابردن‌و لەتەنگ‌و چەڵەمە رزگاری کردن، ترس‌و بیمی لێ دوور خستنەوە، نازو نیعمەتی پێدان، نەخۆشتان چاکبوونەوە مۆتەکەی بەڵاو موصیبەت رەوییەوە، ئا لەو کاتەدا دەبنە دوو تاقم؛ کۆمەڵێکتان لەسەر ئیمان‌و باوەڕی راست دەمێنێتەوە، بۆ هەموو شتێك پەنا بۆ خودا دەبەن‌و پشت بەئەو دەبەستن شوکری نیعمەتەکانی دەکەن. کۆمەڵێکیشتان هەڵدەگەڕێنەوە پاش هانا بردن بۆ بارەگای خوداو پاڕانەوەو لالانەوە لێی پاشگەز دەبنەوە، هاوەڵی بۆ دادەنێن، کوفرانی نیعمەتەکانی دەکەن، بەراستی ئەمانە سپڵەو پێ نەزانن. هەڵوێستەکانیان جێگای سەرسوڕمانە! پاساوی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا بەسەرپێچیکردن دەدەنەوە، لەباتی شوکر هاوەڵی بۆ بەڕەوا دەزانن کوفرانی نیعمەت دەکەن!

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُوراً﴾الاسراء/٦٧.

لەجیاتی سوپاسکردنی نیعمەتەکانی پەروەردگار ئەوان هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن ﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ﴾ (لام) ی (لیکفروا) یان لامی تەعلیلە واتە: بۆ ئەوەی کوفرانی نیعمەتەکانی بکەن، واتە ئەوان شەریکیان بۆ خودا داناوەو پێیان وایە: غەیری خودا ئەو بەڵاو موصیبەتەی لەسەر لابردون، مەبەستیشیان لەم هاوەڵدانانە ئەوەیە: دان نەنێن بەوەدا: کە ئەو نیعمەتانە لەخوداوەن!

یان لامی عاقیبەتو ئاکامو سەرەنجامە، واتە: ئاکامی ئەو پاڕانەوەو هاوارو فیغانە ئەو کوفرانو سپڵەییبە بوو!

ئەمجار هەڕەشەیان لێدەکاو دەفەرموێ: ﴿فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ بەئارەزۆی خۆتان رابوێرنو لەززەتو خۆشی دونیا بچێژن تا مەرگ یەخەتان پێ دەگرێو ماوەی دیاریکراو بۆ بەرەڵلایی‌و خراپەکاریتان کۆتایی پێ دێ، دوای ئەوە دەزانن چیتان بەسەر دێو تووشی چی دەبن، دەزانن چەند بەدبەختو ماڵوێرانن، پەشیمان دەبنەوە بەڵام پەشیمانی هیچ دادتان نادا، تازەکار لەکار دەترازێو دەستتان لەکونی هەمبانەکەوە دەردەچێ!!

**ئەمجار پەروەردگار کارو هەڵوێستە ناشیرینەکانی موشریکەکان رادەنوێنێ، کە لەتەك خودادا بتیان دەپەرەست، دەفەرموێ:**

١- ﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لا يَعْلَمُونَ نَصِيباً مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ﴾ ئەو موشریکانە بۆ ئەو بتانەی کە حەقیقەتەکەیان نازانن‌و نازانن ئەوانە بێ گیانن‌و زەرەرو زیانیان لێ پەیدا نابێ‌و هیچیان بەدەست نیە، ئەو نەفامانە بۆ ئەو بتە دارو بەردانە، بەشێك لەو نیعمەتانەی کە ئێمە کردومانە بەرزق‌و رۆزی ئەوان، دەڵێن: ئەوە لەبتەکانەوە بۆمان هاتووە، هەندێ لەبەروبومو ئاژەڵەکانیان تەرخان دەکەن بۆ بتەکانیان‌و کوشتنیان بۆ سەر دەبڕن، بۆ ئەوەی (بەخەیاڵی خۆیان) لەخودا نزیك ببنەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ مِمِّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعَامِ نَصِيباً فَقَالُواْ هَـذَا لِلّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَـذَا لِشُرَكَآئِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلاَ يَصِلُ إِلَى اللّهِ وَمَا كَانَ لِلّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَى شُرَكَآئِهِمْ سَاء مَا يَحْكُمُونَ﴾الأنعام/١٣٦.

ئەمجار پەروەردگار سوێند بەزاتی خۆی دەخواو هەڕەشەیان لێدەکا و دەفەرموێ: ﴿تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنْتُمْ تَفْتَرُونَ﴾ سوێندبێ بەزاتی خۆم پرسیارتان لێ دەکەم لەو بوختانو بیرو باوەڕە پووچەی هەڵتان بەستووە، سوێند بێ لەسەر ئەو

کردەوانەی ئەنجامیان دەدەن، سزای تەواوتان بدەمەوە، بەئاگری دۆزەخ تۆڵەتان لێ بستێنم. وەکوو لەشوێنکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾الحجر/٩٢-٩٣.

٢- ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ وَلَهُمْ مَا يَشْتَهُونَ﴾ بێ عەقڵیو نەفامی ئەو موشریکانە گەیشتۆتە رادەیەك، بوختانو درۆو دەلەسەیان گەیشتۆتە ئاستێك فریشتە کە بەندەی فەرمانبەرداری خودانو هەمیشە لەطاعەتی خودادان، کردویانن‌ە کچی خودا، دەڵێن: ئەوانە کچی خودان، ئەمجار لەگەڵ خودادا دەیانپەرستن، ئەوەتا هۆزی خوزاعەو کەنانە بەئاشکرا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد: کە فریشتە کچی خودانو لەگەڵ خودا دەیانپەرستنو وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثاً﴾الزخرف/١٩.

بەراستی ئەوانە کەوتوونە هەڵەی گەورەوە، زۆر گومڕابونو باش سەریان لێ تێك چووە چونکە خودا منداڵی نیە ئەوان منداڵی وەپاڵ دەدەن، ئەمجار لەوەشدا مێینە (کە بەلای ئەوانەوە لەنێرینە پلە نزمترە) بۆ خودایان داناوە، بۆ خۆیان کوڕدا دەنێنو بۆ خودا کچ، بۆ خۆیان رازی نابن کچیان هەبێ وەپاڵ خودای دەدەن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى، تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى﴾النجم/٢١-٢٢. یان دەفەرموێ: ﴿أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ، وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ، أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ، مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾الصافات/١٥١-١٥٤.

سەیرە بۆ خۆیان کوڕ هەڵدەبژێرن، پێیان ناخۆشە کچیان وەپاڵ درێ، ئەوەی بۆ خۆیان پێی رازی نینو بەسوکایەتی دەزانن وەپاڵ خودای دەدەن. بەراستی تاوانێکی گەورەیە بوختانەکەیان زۆر ئەستەمە، جارێ جوداوازی لەنێوان نێرو مێدا دەکەن، رێزو پلەو پایە بۆ نێرینە دادەنێنو کچ بەپلە نزم دەژمێرن، ئەمجار پلە نزمەکە وەپاڵ خودا دەدەن!!

بۆیـە پـەروەردگار لەشـوێنێکی تـردا بەئوسـلوبی پرسـیارێکی ئینکارئـامێز دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ؟﴾الطور/٣٩.

ئـەمجار پـەروەردگار رەخنـە لـەداب و نـەریتی موشـریکەکانی عـەرەب دەگـرێ لـەوەدا کـە رێزیـان بـۆ ئـافرەت دانـەدەناو پێیـان وابـوو: مێینـە هـۆی سـوکایەتی و سەرشۆڕییە، پێیان ناخۆش بوو کە کچیان دەبوو. دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا بُـشِّرَ أَحَـدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ئەگەر یەکێك لەو عەرەبانەی بڕوایـان وا بـوو فریشتـەکان کچی خودان، مـژدەی ئـەوەیان پـێ بدایـە کـە خێزانەکـەی کـچی بـووە، دەم و چـاوی رەش دادەگیرسـاو غـەم و ناڕەحـەتی دای دەگـرت و لەعەیبـەتان و لەخەفەتان قسەی پێ نەدەکراو زمانی نەدەگەڕا.

﴿يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ﴾ لەشـەرم و خەجاڵـەتیا خـۆی لەخـەڵك دەشاردەوە، پێی خۆش نەبوو کەس بیبینێ و کەس ببینێ لەبەر کاریگەری هـەواڵی ئـەوەی کـەوا کـچی بـووە. ئـەمجار لـەدڵی خۆیدا تـەگبیری دەکـرد چـی بکاو چـۆن بـەرەوڕووی ئـەم کارەساتە ببێتـەوە؟ لـەدووڕییانی هەڵبـژاردنی ڕێگایـەك لـەم دوو ڕێگایە قەتیس دەماو نەیدەزانی چی بکا ﴿أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّـرَابِ﴾ ئایا ئەم زارۆکە مێینە بهێڵێتەوە بەسوك و بێ نرخـی و مـیرات نـەگرێ و گرنگـی پـێ نەداو بەهیچ و پووچی بزانێ، یان زیندە بەچاڵی بکاو بەزیندویی ژێـر خـاکی بکـاو لەکۆڵ خۆی بکاتەوە و ئەم سوکایەتیە لەشانی خۆی داماڵێ!!

﴿أَلا سَـاءَ مَـا يَحْكُمُـونَ﴾ ئاگـادار ببنـەوە، بەراسـتی خـراپ کارێکـە ئـەو موشریکانە دەیکەن، خراپ گوفتارێکە دەیوێژن خراپ بەشکردنێکە بەشـی دەکـەن، خراپ نیسبەتدانێکە نیسبەتی بۆلای خودا دەدەن! نموونـەی ئـەم ئایەتـە ئایـەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَنِ مَثَلاً ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُـوَ كَظِيمٌ﴾الزخرف/١٧.

مادەی (بشر) هەرچەندە بۆ هەواڵێکە کە خۆشی بخاتە دڵو دەروونەوە، بەڵام بەگوێرەی بەکارهێنانی لەئەصلی زماندا بۆ هەواڵێك بەکار دەهێندرێ؛ کە کاریگەر بێو دەمو چاو بگۆڕێ، ئاشکراشە هەریەکێ لەهەواڵی خۆش یان ناخۆش پێستی دەمو چاو دەگۆڕن!

﴿لِلَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ﴾ هەیە بۆ ئەوانەی بڕوایان بەهاتنی ڕۆژی قیامەت نیە، پێیان وایە: جگە لەژیانی دونیا ژیانێکی تر نیە، ڕەوشتیان ناشیرینو نالەبارە، ئەوان ڕەوشتە ناشیرینەکەیان وەکوو مەثەل مەشهورو ئاشکرایە، واتە: ئەوان بۆ خۆیان ڕەوشتی نزمو پەستیان هەیە کە بریتییە لەپێویستیان بۆ منداڵی نێرینە تا پاش مردنیان جێگایان بگرنەوە، لەژیانی دونیادا خۆیانی پێ هەڵئێنەوە، کچیان ناخۆش دەوێ، بەهیچو پوچی دەزانن، بەزیندویی ژێر خاکی دەکەن بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی سوکایەتی پێکردن بۆ خۆیو عەشیرەتی. یان لەبەر بەخێوکردن زیندە بەچاڵیان دەکردن، دەیانگوت: هەژار دەکەوینو ناتوانین بەخێویان بکەین کەوابێ ئەو موشریکانە مەثەلی ناشیرینیان هەیە، ڕەوشتو ئاکاریان بەدو خراپەکارییە.

﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى﴾ هەر بۆ خودایە مەثەلی باڵاو پیرۆزو شکۆمەندی، کەمالی موطلەقی هەیە، تاكو تەنهاو فەردو صەمەدە، نەلەکەس بووە نەکەسی لێ بووە. بەرزو پیرۆزە لەوەی منداڵی هەبێ، هاوەڵی هەبێ! زاتی پاکی بێ ئاتاجە لەهەموو عالەم، پێویستی بەکەس نیە، پاكو مونەززەهە لەهەموو ڕەوشتێکی پەستو نزم! صیفاتی کەماڵو جەمالی موطلەقو ڕەهان! لەهەموو ڕویەکەوە بێ نەقصو بێ عەیبەو کەمالی موطلەقی هەیە!!

﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خودا غاڵبو باڵادەستەو کەس نیە بتوانێ بەسەریدا زاڵ ببێ، حەکیمو دانایە لەکارو باری دا هیچ شتێکی بێ حیکمەت نیە.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار کوفرو تاوانباری موشریکەکانی رانواند، رەحمەت وکەرەمو فەضلی خۆیشی بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِمْ مَا تَرَكَ عَلَيْهَا مِنْ دَابَّةٍ﴾ خودا زۆر بەصەبرو بەزەییە بۆ بەندەکانی ئەگەر خودا ئەو خەڵکەی بەهۆی تاوانەکانیانەوە بگرتایەو پەلەی لەسزادانیاندا بکردایە، هەرگیز لەسەر گۆی زەوی بڕۆیەکی نەدەهێشتەوە، گیانلەبەرێك بەزیندویی نەدەمایەوە، واتە: لەگەڵ لەناوبردنی ئادەمیزادە ستەمکارەکاندا هەموو گیانلەبەرەکانی تریشی لەناو دەبرد!

﴿وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ بەڵام پەروەردگار سزادانەکەیان هەڵدەگرێ بۆ کاتی دیاریکراوو پەلە لەسزادانی دەست بەجێیان ناکا.

بەیهەقی لەئەبو هورەیرەوە رایوایەت دەکا، دەفەرموێ: گوێم لێ بوو پیاوێك دەیگوت: ستەمکار هەر زیان بەخۆی دەگەیەنێ، ئەویش رەدی دایەوەو وتی: نەخەیر وا نیە بەڵکوو ستەمکار زیانی بۆ غەیری خۆیشی هەیە، تەنانەت (حوبارا) لەهێلانەی خۆیدا بەهۆی ستەمکاری ستەمکارانەوە مندار دەبنەوە.

لەئیبنو مەسعوودیشەوە ریوایەت کراوە: فەرموویەتی: لەوانەیە (جوعەل)[١١] لەکونەکەی خۆیدا بەهۆی تاوانی ئادەمیزادەوە لەناوبچێ.

ئەمە رەحمەتو میهرەبانی خودایە بۆ ئادەمیزاد؛ کە لەسەر تاوانەکانیان دەست بەجێ سزایان ناداو مۆڵەتیان دەدا بۆ کاتێکی دیاریکراوو وەختی هاتنی ئەجەلیان.

---

(١١) پیزۆیەکی رەشکەڵەیە.

جـا ﴿فَـإِذَا جَـاءَ أَجَلُهُـمْ لا يَـسْتَأْخِرُونَ سَـاعَةً وَلا يَـسْتَقْدِمُونَ﴾ كـە كـاتی لەناوبردنیان هات، ساتە وەختێك لەماوەی دیاریكراو دواناخرێن‌و پێش ناخرێن.

لەهەموو شتێك سەیر تر ئەوەیە: موشریكەكان شتێك بـۆ خۆیـان پـێ‌ی رازی نین بۆ خودای دادەنێن ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَـصِفُ أَلْـسِنَتُهُمْ الْكَـذِبَ أَنَّ لَهُـمْ الْحُسْنَى﴾ شتێك بۆ خودا بڕیار دەدەن كە بـۆ خۆیـان پێیـان ناخۆشـە هـەیانبێ، بـۆ خۆیـان پێیـان ناخۆشـە كـچیان ببـێ، هـاوەڵ‌و شـەریكیان لـەماڵ‌و سـامان‌و فەرمانڕەوایی‌و حوكمدا هەبێ، كەچی ئەمانە وەپاڵ خودا دەدەن دەڵێن: خودا كچی هەن، شەریكی هەیە، وێـڕای ئـەم تاونبارییـەیان زوبانیـان درۆی پیـادێ، كـە دەڵـێن: سـەرەنجامی بـاش‌و بەختـەوەری دونیـاو قیامـەتمان هەیـە درۆ دەكـەن، درۆ دەكـەن لەوەدا دەڵێن: لەقیامەتدا پلەو پایەی باشمان دەبێ‌و دەچینە بەهەشتەوە.

ریوایـەتكراوە: كـە موشـریكەكان وتیـان: ئەگـەر موحەممـەد راسـت بكـا زیندوبوونـەوە هـەبێ ئـەوە ئێمـە بەهەشـتین. ئـیتر پـەروەردگار رەدی دانـەوەو فەرمووی: ﴿لا جَرَمَ أَنَّ لَهُمْ النَّارَ وَأَنَّهُمْ مُفْرَطُـونَ﴾ هـیچ گومـانی تێـدا نیـەو شـتێكی حـەق‌و راسـتە: كـە ئـەوان دۆزەخـین‌و شـوێنی حەوانـەوەو مـاڵی كۆتاییـان ئـاگری دۆزەخـەو تێیـدا دەهێڵدرێنـەوە پـێش دەخـرێن بـۆ دۆزەخ‌و بـەگورجی ئاگریـان بـۆ دەهێندرێ‌و هیچ دوا ناخرێن!

پێویستە لەم دەرفەتەدا ئەوە بگوترێ: كە هەر كاتێ كۆمەڵگا لەراستە رێبازی خودا لای داو ئینحیرافی كرد كاریگەرییەكەی تەنیا بۆ سەر بیرو باوەڕ نیەو بـەس! بەڵكوو لەهەموو بوارێكی ژیاندا كاریگەر دەبێ. هەموو دابو نـەرێتێكی لەگرێژنـە دەچـێ، لەهـەموو لایەكـەوە كرمـۆڵ دەبـێ‌و دەرزێ‌و بۆگـەن دەكـا. بـیرو بـاوەڕ داینەموی ژیانە، بەبێ هەبوونی بیرو باوەڕی راست‌و پەسند ژیان خۆشی تێدا نیـە، دڵ ئارام ناگرێ، كۆمـەڵگا بەختـەوەر نابێ. بـێ بـیرو بـاوەڕی راسـت‌و پەسـند بـوو: كەوابی ئەوەی وای لەموشریكەكان كرد دابو نەرێتی كچ زیندەبەچاڵكردن دابێنن،

نەبوونی بیرو باوەڕی راست بوو کەوای لەکۆمەڵگای عەرەب کرد بەچاوی سووک سەیری ئافرەت بکرێ، دابو نەرێتی عەرەبەکان وا بوو کە کچیان دەبوو رەنگیان رەش دادەگیرساو غەمناك دەبوون ترسی هەژار بوون عەیبدارییان دەکەوتە دڵەوە، چونکە ئافرەت نەشەڕی پێ دەکرێو نەکارو کاسبی دەکا، جاری وایش دەبوو بەرپەلاماری دوژمن دەکەوتنو دەفڕێنرانو دەبوونە مایەی سوکایەتی بۆ هۆزەکە، ئەگەر هیچکە نەبێ بارن بەسەر باوكو براکانیانەوەو دەبێ بەخێویان بکەن ئەمە بوو تێڕوانینی کۆمەڵگای عەرەب پێش هاتنی ئیسلامو ئاوا بیریان دەکردەوە!!

ئیسلام هات دژی ئەم دابو نەرێتو تێڕوانینە راوەستا، بیرو باوەڕی راستو دروستی بڵاو کردەوە، ئەوەی چەسپاند: کە رزقو رۆژی بەدەست خودایەو خوداش رزقی هەموو کەس دەدا، کەس رزقی کەس ناخواو هیچ کەس لەوەی خودا بۆی داناوە زیاتری چنگ ناکەوێ.

ئەمجار ئەوەی چەسپاند: کە ئادەمیزاد بەنێرو مێیەوە لای خودا رێزی تایبەتی هەیە، ئافرەت لەروانگەی ئادەمیزادییەوە هاوشانی پیاوەو نیوەی کۆمەڵە، کچیش وەکوو کوڕ نیعمەتی خودایەو هۆکارێکە بۆ درێژەپێدانی ژیان.

حیکمەتی خودا واهاتووەو یاسای ژیان وایە: کە ژیان بەهۆی نێرو مێوە بەردوام بێ. رەگەزی مێینە لەیاسای ژیاندا بنەمایەکی سەرەکییە، بەڵکوو رۆڵی ئافرەت لەدرێژەپێدانی ژیان لەرۆڵی پیاو گرنگترە، چونکە ئافرەت بەرهەم هێنو پەروەردەکەری کۆمەڵە، یاسای ژیان بەبێ هەبوونی ژنو مێرد بەڕێوە ناچێ، دەی: کە ئەمە رۆڵی ئافرەت بێ لەرەورەوەی ژیاندا چۆن دەبێ کە یەکێك کچی بوو دڵتەنگ بێو رەنگی رەش دابگیرسێ!؟

ئاوا بەو شێوە نرخی عەقیدەی ئیسلامی دەردەکەوێ بۆ راستکردنەوەی بیرو بۆچوونو دابو نەرێتە کۆمەڵاتیەکان. لێرەدا تێڕوانینە دڵسۆزانەکەی ئیسلام بۆ ئافرەت خۆی دەنوێنێ. ئەو بیرو باوەڕە پەسندەی بەرامبەر ئافرەت لەناو دڵو

دەوروونەکاندا بڵاوکردەوە، دابو نەریتی کۆمەڵانی ئادەمیزادی بەرامبەر ئافرەت ڕاست کردەوە، ئافرەتی لەکۆیلایەتی تێڕوانینی نزمانە ڕزگار کرد، بەڵکوو بەرێزلێنان لەئافرەت ڕێزی لەهەموو ئادەمیزاد گرت، مرۆڤایەتی بۆ گەڕاندنەوە، چونکە مێیەنە بەشێکی سەرەکیی ئادەمیزادە، سوکایەتیکردن بەئافرەت سوکایەتی کردنە بەئادەمیزاد، زیندە بەچاڵکردنی کچ زیندە بەچاڵکردنی ئادەمیزاد هەموویەتی. بەفێرۆدانی بەشێکی ژیانە، بەرەنگاربوونەوەی حیکمەتی خودایە لەدروستکردنی ئادەمیزاد.

هەتا کۆمەڵگا لەبیرو باوەڕی ڕاستەقینە لابدرێ و دوور بکەوێتەوە بیرو بۆچوونی نەفامی لەناویاندا سەرهەڵدەداتەوە.

لەزوربەی زۆری کۆمەڵگاکانی سەردەمدا ئەمڕۆ بیرو بۆچوونە ناپەسندەکان سەریان هەڵداوەتەوە. ئەوەتا ئەمڕۆ لەهەندێ شوێنداو لەلای زۆربەی بیرو بۆچوونە ناپەسندەکان سەریان هەڵداوەتەوە. ئەوەتا ئەمڕۆ لەهەندێ شوێنداو لەلای زۆربەی زۆری ئادەمیزادان لەدایکبوونی کچ وەکوو لەدایکبوونی کوڕ پێشوازی لێ ناکرێ. وەکوو کوڕ مامەڵەی لەگەڵ ناکرێ، ئەمە نیشانەی هەڵگەڕانەوەی ئادەمیزادە لەئاینی ڕاستو گوێ پێنەدانە بەیاساو ئامۆژگارییەکانی ئیسلام.

سەیر ئەوەیە: کە وێڕای ئەم واقیعە ڕاستەو ئەم حەقیقەتە مێژووییە هەندێ چەقەچەناو لێرەو لەوێ توانجو پلار دەگرنە بەرنامەی ئیسلامو ڕەخنە لەیاساکانی تایبەت بەئافرەتەوەی دەگرنو هەڵسو کەوتی نامەسئوولانەی کەسانی بەناو موسوڵمان بەسەر ئیسلامدا دەسەپێننو دابو نەریتی کۆمەڵگا لادەرو دوورکەوتووەکان لەئیسلام وەپاڵ ئیسلام دەدەن! ئەوەندە ئەرکە ناخەنە سەرشانی خۆیانو تۆزێك لەیاساو شەریعەتی بڕوانن، بزانن: ئیسلام چ شۆڕشێکی گەورەی لەکۆمەڵگاو دەروونی مرۆڤەکاندا بەرپاکردوە؟؟

ئـەم ڕێزلێنانەشــی لــەئافرەت تێڕوانینێکــی بەرپێزانەیــەو بــیرو بــاوەڕی ڕاستەقینەی نازڵبوو لەخوداوە بەدی هێنـاوە، نـەك لـەئاکامی زەروورەتـی واقیعـیو بانگەوازیو داخوازی کۆمەڵایەتیو ئابورییەوە پەیدا بووبێ.

خودا ڕێزی تایبەتی بۆ ڕەگەزی ئـادەمیزاد دانـاوە، هـەر لەروانگـەی ڕێزلێنـان لەئادەمیزاد ڕێزی لەبەشە مێینەکە گرتووەو بەنیوەی کۆمەڵی داناوە، زێدە ڕێز بـۆ هیچ لایەکیان نیە مەگەر بەتەقوا...

کە ئیسلام هات هەندێ لەخێڵە عەرەبەکانی وەکوو خێڵی خوزاعەو کەنانـەو بـەنی تـەمیم کـچیان زینـدە بەچاڵ دەکـرد: هەڵبەتـە کەسـانی دیکـەش هـەبوونی ئەمـــەیان دەکـــرد بـــەلام ئـــەم ســـێ هـــۆزە لەهـــەموو کـــەس زیـــاتر ئەنجامیان دەدا.

ئیسلام هات زیندە بەچاڵکردنی کچی یاساغ کردو فەرمانی کردبە چاکەکردن لەگەڵیاندا؟؟؟

ئیـمام موسـلیم لەصـەحیحەکەیدا لەخاتوعائیـشەوە فەرمووەدەیـەك ریوایـەت دەکا: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من ابتلی مـن البنـات بشيء فأحـسن الیهن کن له سترأ من النار) کەسێك خودا بەتاقیکردەوەو کچی پێدا، ئـەویش جـوان بەخێوی کردن پەروەردەی ڕێكو پێکی کردن بێگومان بـۆی دەبنـە پـەردەو لـەئاگر دەیپارێزن.

هـەر ئیمـامی موسـلیم لەئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ریوایـەت دەکـا دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من عال جاریتین حتی تبلغا، جاء یوم القیامـة أنـا وهـو کهاتین) پەنجەکانی جووت کردن.

ئـەبو یـەعلا حـافیظ لەعەبـدوڵای‌کوڕی مەسـعوودەوە ریوایـەت دەکـا. دەڵـێ: پێغەمبەر فەرمووی: (من كانت له بنت فأدبها فأحسن ادبها وعلمها فأحسن تعليمها واسبغ عليها من نعم الله التي اسبغ عليه، كانت له ستراً أو حجاباً من النار).

## داب و نەرِیتی گەل‌و نەتەوەکان دەربارەی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران، ئەرکی پێغەمبەر لەرونکردنەوەی قورئان‌دا

﴿ تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾

دوای ئـەوەی لەئایەتـەکانی پێـشوودا پـەروەردگار پوچـەڵی‌و گەنـدەڵی بـیرو باوەڕی موشریکەکانی رونکردەوە، ئەوەی راگەیاند: کە خودا مۆڵەتی تاوانباران دەدا تا ماوەیەکی دیاریکراوو لەبـەر حیکمـەتێك، تەسـەللای پێغەمبـەری دایـەوە لەسـەر ئەو نارِەحەتی‌و ئەزیەتەی لەگەلەکەیەوە تووشی دەهات، تانـەو تەشـەریان لێ دەدا، بوختانیـان بـۆ هەڵدەبەسـتن، بریـاری هـاوەڵ‌و منـداڵیان بـۆ خـودا دەدا، گوێیـان بەپەیامەکـەی نـەدەدا، بـەپیر بانگەوازییەکەیـەوە نەدەچـون! تەسـەللای دەداتـەوە بەوە: کە قورەیشییەکان یەکەم گەل‌و نەتەوەیەك نین کە ئینحیرافیان کردبێ، تاقە گـەل نـین کـە سـەرڕەق‌و سەرپێـچیکاربن، بـەڵکوو لـەپێش ئەوانیـشەوە زۆر گـەل‌و نەتـەوە هـەبوون سەرپێـچی فـەرمانی خودایـان کـردوە، شـوێن رێبـازی شـەیتان

کەوتوونو گومڕا بوون، شەیتان گومڕابوونی لەپێش چاو جوان کردون لەژیانی دونیادا شەیتان رابەرو سەرپەرشتیکاریان بووە، خودا پێغەمبەرانی بۆ ناردون بۆ ئەوەی حەقو بەتاڵیان بۆ لێك جیابکەنەوە، کێشەو نیزاعیان بۆ یەکالا بکەنەوە، بیرو باوەڕیان بۆ راست بکەنەوە، هەروەها بۆ ئەوەی ببنە هیدایەتو رەحمەت بۆ ئەوانەی ئیمانیان پێ دەهێنن! دەفەرموێ: ﴿تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ﴾ سوێند بەخودا ئێمە چەند پێغەمبەرێکمان لەپێش تۆدا ناردوە بۆ سەر گەلو نەتەوە پێشینەکان، بانگەوازییان کردن بۆ ئیمانهێنان، بەدڵسۆزی پەیامی خودایان پێ راگەیاندن، کەچی نەتەوەکان پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە، بانگەوازییەکەیانیان رەتکردنەوە ﴿فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ﴾ شەیتان کردەوەکانیانی لەپێش چاو جوان کردن، کوفرو بتپەرستی لەدڵ دا شیرین کردن، ﴿فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ﴾ ئەمڕۆ ئەو سەرپەرشتیکاریانەو فریایان دەکەوێ؟!

واتە: ئەوان لەژێر زەبری عەزابو ئەشکەنجەدانو کەس فریایان ناکەوێ!

﴿فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ﴾ واتە: بەخەیاڵی خۆیان لەدونیادا یارمەتیدەریانە. حیکایەتی حاڵە.

هەندێك دەڵێن: مانای ﴿فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ﴾ واتە: رۆژی قیامەت شەیتان لەئاگردا هاونشینیانە، حیکایەتی حاڵی داهاتووە. واتە: لەو کاتەدا: کە کافرەکان لەدۆزەخدا سزا دەدرێن شەیتان یارمەتیدەریانە، جگە لەئەو کەس یارمەتیدەریان نیە. ئەویش هیچی پێ ناکرێ!!

ئەمە نەفیی کردنی یارمەتیدانە بەشێوەیەکی بەلیغو رەوان. ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بۆ ئەو موشریکانە لەقیامەتدا سزای بەئێش هەیە.

کەوابێ: ئەی موحەممەد! تۆ بەهەڵوێستی نابارو ناشیرینی گەلەکەت دلگران مەبە. گوێ بەدرۆخستنەوەی پەیامەکەت لەلایەن ئەو نەفامانەوە مەدە، تۆ چاو

لەپێغەمبەرەکانی پێش خۆت بکە، ئەوان بکەرە ئوسوەی حەسەنەی خۆت، ئەمییەت مەدە بەو موشریکانەی کە بوونە نێچیری شەیتانو شەیتان گومڕایی بۆ جوان کردون!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە داب و نەرێتی وەهایە تا بەڵگە نیشان نەداو رەهنوماو فروستادەی نەنێرێ هیچ گەلو نەتەوەیەك بەهیلاك نابا، دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلاَّ لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەی موحەممەد! ئێمە بۆیە قورئانمان بۆ ناردویو کردومانی بەپێغەمبەرو رەوانەمان کردوی بۆ سەر بەندەکانمان: کە ئەو قورئانەیان بۆ شی بکەیەوە، ئەو بیرو باوەڕو عیبادەتەی تێیدا کەوتوونە جوداوازییەوە بۆیان یەکالا بکەیەوە، حەقو بەتاڵیان بۆ لێك جیابکەیەوە، حەق بناسنو پابەندی بنو بەتاڵ بزانن خۆی لێ دوور بخەنەوە. قورئان دادوەرو نیوانکارە بۆ هەر مەسەلەیەك ئادەمیزادان تێیدا بکەونە کێشەوە، هیدایەت و رێ پیشاندەرە بۆ دڵە گومڕاکان، رەحمەتو فەڕو بەرەکەتە بۆ گەلێکی ئیماندارو خوداپەرست. قورئان رەحمەتە بۆ ئەو کەسانەی دەستی پێوە دەگرنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن!

## بەکورتی:

قورئان ناو بژیکەری نێوان ئادەمیزادەو کێشەکانیان بۆ یەکالا دەکاتەوەو هیدایەتیان دەدا بۆ رێبازی حەقو خوداپەسند.

### هەندێ لەدیاردەی دەسەڵاتی پەروەردگارو دیاردەی نیعمەتەکانی بەسەر نادەمیزادا

﴿ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾

پاش ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا وادەی بەهەشتی دا بەخودا پەرستانو هەڕەشەی دۆزەخی لەکافرەکان کردو تەسەللای پێغەمبەری دایەوە لەسەر ئەزیەتدانی قوڕەیشییەکان، گەڕایەوە سەر باسی چەسپاندنی بەتوانایی‌و تاک‌و تەنهایی خۆی، بەلگەی حیسسی‌و بەچاو بیندراوی رانواندن، بەلگەی بەرچاوو

دووباره بووەوەی سروشتی وەكوو روانو شین بوونی كشتو كاڵو دارو درەخت بەبارانو دۆشینی شیر لەئاژەڵو دروستكردنی جۆرەها خۆراكو شلەمەنی لەترێو خورماو دەرهێنانی هەنگوین لەسكی هەنگ، كە دەبێتە شیفاو چارەسەری زۆر لەنەخۆشیەكانو زیاد لەوەش خۆراكێكی بەتامو بەلەززەتە، ئەم بەڵگانەی هێنانەوەو كردنی بەنیشانەی خودایەتی خۆی.

ئیمام (فخر الدین)ی رازی دەفەرموێ: بێگومان مەبەستی سەرەكی لەناردنی قورئانی پیرۆز چەسپاندنو پێ سەلماندنی چوار بنەمای سەرەكیو بنەرەتین: ئیلاهییات، پێغەمبەرایەتی، زیندو بوونەوە، قەزاو قەدەر..! لەناو ئەم چواربنەمایانەشدا ئیلاهییات لەهەموانیان گرنگترە، بۆیە پەروەردگار لەسەرەتای سورەتەكەدا بەڵگەی لەسەر خوداوەندی خۆی هێنایەوە، قەباره فەلەكییەكانی كردن بەنیشانەی بەتواناییو خودایەتی خۆی، ئەمجار خودی ئادەمیزادو ئاژەڵو گیاو گژو دارو درەختو حاڵو وەزعی دەریاو زەوی كردە نیشانەی خودایەتی خۆی. ئەمجار هاتەوە سەر رانواندنو چەسپاندنی بەڵگەكانی تایبەت بەخودایەتی خۆی! سەرەتا دەستی كرد بەباسی نیشانە فەلەكییەكانو فەرمووی:

﴿وَاللَّهُ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ لەم ئایەتەدا پەروەردگار بەندەكان هۆشیار دەكاتەوەو سەرەنجیان بۆلای ئەو بەڵگانە رادەكێشێ: كە نیشانەی تاكو تەنهاییو بەتواناییو زاناییيەتی، ئەوە دەچەسپێنێ: كە هەر ئەو شیاوی خودایەتیو بەندایەتی بۆ كردنە، ئەوەی رونكردەوە كە ئەو خودا باڵادەستە خودایەكی وەهایە لەبەرزاییيەوە باران دەبارێنێو بەو بارانە زەوی وشكو برینگو مردو زیندوو دەكاتەوە، گژوگیاو دارو درەختی تێدا دەروێنێو كانی وكانیاوی تێدا دەتەقێنێ، بێگومان لەزیندو كردنەوەی زەوی بەو شێوە بەرچاوەی هەموو ساڵێك جارێك یان زیاتر دووباره دەبێتەوە، پاش ئەوەی شیناوردی تێدا نابینرێو وەكوو مردوو وایەو نەشو نمای تێدا بەدی ناكرێ بەو

بارانە زیندو دەبێتەوەو سەوز هەڵدەگەڕێ‌و زەنوێر دەبێتـەوە، ﴿إِنَّ فِـي ذَلِـكَ لآيَـةً لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ بێگومان ئا ئەم دیاردەیە، ئەم گۆڕانکارییە، ئـەو زینـدو کردنەوەیـە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرو نیشانەیەکی بەهێزو ئاشکرایە لەسـەر تـاك‌و تـەنهایی‌و بـەتوانایی‌و زانـایی‌و دانـایی خـودا! بـۆ کەسـانێك ئـەم قورئانـە دەبیـسن‌و لێـی ورد دەبنەوەو لێی حاڵی دەبن.

ئاو هۆی ژیانە بۆ هەموو زیندوێك. لێرەدا دەقەکە کردویەتی بـەهۆی ژیـان‌و زینــدو بوونــەوەی زەوی بەشـێوەیەکی گـشتی بـۆ ئـەوەی هـەموو زینــدەوەرێکی سەرزەوی بگرێتەوە بەئادەمیزادو پێڕۆو خشۆك‌و پەرنـدەو چەرەندەیەوە، بـەدارو درەخت‌و گژو گیایەوە. ئەو کەسـەی مـردو زینـدو دەکاتـەوە، ئـەو کەسـەی دەتوانـێ مردن بکا بەژیان هەر ئەو شیاوی خودایەتی‌و پەرستش بۆ کردنە، هـەر دەبـێ ئـەو بەخودا بزانرێ، بەراستی لـەم ئـاڵ‌و گـۆڕەدا لـەم زیندوکردنـەوەی زەویدا نیـشانەی زۆرو زەبەندە هەن بۆ گەل‌و نەتەوەیەك قسە ببیسن‌و لێی ورد ببنەوەو تێی بگەن. چونکە بیستنی بێ تێفکرین‌و تێگەیشتن بەکەڵکی هیچ نایەو هیچی لێشین نابێ!

لێرەدا بەڵگەیەکی تـر هەیە لەسەر بەدەسـەڵاتی خـودا، عیبرەتێکـی تـر هەیـە ئاماژە بەدەسەڵات‌و قودرەتی خودا دەکا، ئـەویش دەرهێنـانی شـیرە لـەگوانی ئـاژەڵ، بەراستی ئەمە یەکێکە لەبەڵگە هەرە مەزنەکان لەسەر بەتوانایی خودا، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنـاً خَالِـصاً سَـائِغاً لِلـشَّارِبِينَ﴾ بـۆ ئێـوە هەیـە ئـەی خەڵکینـە! لـەئاژەڵدا پەنـدو ئامۆژگـاری، بەڵگـەو نیـشانە لەسـەر بـەتوانایی‌و رەحمـەت‌و لـوطـف‌و کـەرەممان، سـەیری حوشـتر‌و رەشەوڵاخ‌و مەڕو بزن بکەن، لەدەست رەنگینی پەروەردگار وردببنەوە: ئەوەتا ئێوە زیاد لەوەی کەڵك لەکوڵك‌و خـوری‌و مـوو مـەرەزیان وەردەگرن، بەبەرهـەم هێنـانی بێچوو زاوزێیـان، هـەروەها بـەخواردنی گۆشـتیان سـوودمەند دەبـن، سـەرباری ئـەو سوودو فەڕانە دەرخواردتـان دەدەیـن شـیرێکی صافی دوور لەهـەموو خەوشـێك کـە

بەتامو گەوارایە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، ئەو شیرە پەیدا دەبێ لەنێوان ئەو مادە پیسە کە لەریخۆڵەوە رەت دەبێو، ئەو خوێنە سوورەی کە جگەری ئاژەڵەکان کێشی دەکا. ئەو شیرە صافەی: کە لەگوانی ئاژەڵ دەردێ لەچی دروست دەبێ؟ بێگومان ئەو شیرە وەدی دێ لەنێوان ئەو خۆراکەی لەگەدەدا پاش هەزمبوون دەمێنێتەوەو ئەو خوێنەی لەئاکامی هەزمبوونی خۆراکەکە پەیدا دەبێ! چونکە کە خۆراك هەزم بوو بەقودرەتی خودا دەبێتە گوشراوێکی پاڵفتەکراوو بەسوود بۆ جەستەو بەشێکیشی دەبێتە تلّپەی بێ سود: کە پاش ماوەیەك دەری دەدا بۆ دەرەوە ئەم خوێنە دەچێتە ناو هەموو خەلییەیەکی جەستەوەو بەسەر دەمارەکانی لەشدا دابەش دەبێو دەبێتە هۆی بەردەوام بوونی ژیان. ئەمجار برێ لەم خوێنە دەچێ بۆ ناو ئەو لوانەی لەناوگواندانو دەبێتەشیرێکی صافی بێ خەوش!

سوبحانەڵلا! هەر دەڵێ ی خودای داناو زانا جەستەی ئەو ئاژەڵانەو هەموو گیانلەبەرێکی شیردەری تری کردوە بەکارگە بۆ گۆڕینی خواردەمەنی بۆ خوێنو لەخوێنەوەبۆ شیر. هەر بەو جۆرە لەجەستەدا جگە لەغودەی ناو گوانو شیرەمەنی، غودەی لووت هەیە، چڵم دروست دەکا، غودەی چاو هەیە فرمێسك پەیدا دەکا، غودەی مەنەوی هەیە خوێنەکە دەگۆڕێ بۆ مادەی گەراو گەرچەك!! بۆ تۆمو رەچەڵەك!

بێگومان چۆنیەتی هەزمکردنی خواردەمەنیو تێکەوڵێکەو پاڵفتە کردنیو لێك جیاکردنەوەیگوشراوو تلّپەو تێر کردنی هەموو خەلییەکی جەستە بەو مادەی پێویستی پێ هەیەو لەخوێن وەدی هاتووە، تێکەوڵێکەیەکی سەیرو سەمەرەیەو تا بڵێی سەرسوڕهێنەرە. هەموو ئانیەو چرکەیەك ئەم عەمەلییەتە لەناو جەستەدا ئەنجام دەدرێ شان بەشانی عەمەلییەتی سوتاندنو بەتلّپەکردن! لەهەموو چرکەیەکدا لەناوجەستەدا تێکەوڵێکەی روخان و دروستکردن بەردەوامەو تا گیان لەجەستەدا بێ چرکەیەك راوەستانی نیە!!!

ئادەمیزاد لەبەرامبەر ئەم تێکەو لێکە بەردەوامە سەرسوڕهێنەرەدا هیچکەی پێ ناکرێ جگە لەوە کە لەناخەوە بڕوا بەدەسەڵاتو بەتوانایی ئەو بەدیهێنەرە کارسازە بکاو کڕنووشی بەندەگی بۆ زاتی پاکی ئەو خودا خاوەن قودرەتە رەهایە بەرێ.

جا وەکوو لەناژەڵدا ئێوە ئەو شیرە صافە بەکەڵکە بەتامو گەوارایەتان دەست دەکەوێو پەروەردگار بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە، خواردەمەنیو شلەمەنی تریشی بۆ رەخساندون؛ کردونی بەنیشانەی خودایەتی خۆی ئەوەتا: ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً﴾ بۆ ئێوە هەیە لەبەروبوومی داری خورماو داریترێدا چەند رزقو رۆزیی جۆراو جۆر؛ لەم درەختانە میوەی جۆراو جۆرو هەمەچەشنەتان بۆ فەراهەم هێندراوە، پێویستە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن، وردببنەوەو سەرنج بدەن: داری خورما خورمای جۆراو جۆرتان بۆ بەرهەم دێنێ داری مێو ترێی جۆراو جۆرتان بۆ دەگرێ، کە دەیکەنە ژیواری خۆتان بەتەڕیو بەوشکی، بە(روطاب)یو ترێییو بەخورماییو مێوژی کەڵکیان لێوەردەگرن، هەروەها لەبەروبومی ئەم درەختانە جۆرەها مەشروباتو شلەمەنی شیرینو بەتامو لەززەتی وەکوو دۆشاوی خورماو دۆشاوی ترێی رەنگاورەنگی جوان دروست دەکەن، مێوژو باسوقو شەربەتو حەڵواو جۆرەها خواردەمەنیو شەرابی ترێ بەتامو بەسوود لەبەروبوومی ئەمانە دروست دەکەن، هەموویان رزقو رۆزیی جوانو بەکەڵکن، هۆی راگیرکردنی تەندروستیو گەشەکردنی لەشو لارتانە.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان لەرەخساندنو زۆر کردنی ئەم هەموو نیعمەتە جۆراو جۆرانەدا، نیشانەو بەڵگەی بەهێز هەن لەسەر وجودو بەتواناییو میهرەبانی پەروەردگار بۆ نەتەوەیەك کە خاوەن هۆشو فام بنو عەقڵی خۆیان بخەنە کارو لەنیعمەتو دروستکراوانی خودا ورد ببنەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە دەڵێ وشەی (سكراً) ئەو خواردنەوەیە: كە ئەخورێتەوە ئادەمیزاد سەرخۆش دكا، هەڵبەتە هەموو سەرخۆشكەرێكیش بەخەمر دادەنرێو حەرامە، ئەدی چۆن خودا لەریزی نیعمەتەكانی خۆی دا راینواندوە؟؟

**زانایانی تەفسیر بۆ ئەم پرسیارە چوار وەڵامیان داوەتەوە:**

١- (سكر) لەزمانی عەرەبی دا بەمانا نەبیذە: كە بریتییە لەدۆشاوی ترێو خورماو خۆشاوی مێوژ، ئەمانە ئەگەر دروست بكرێن خواردنەوەیان حەڵاڵەو هیچ خراپەیەكی تێدا نیە.

٢- وشەی (سكر) بەمانا خواردەمەنی بەتامو لەززەت بێ، ئاشكراشە لەم میوانە زۆر خواردەمەنیو شلەمەنی خواردنەوە دروست دەكرێنو حەڵاڵو بێ عەیبن.

٣- خۆ ئەگەر وشەی (سكر) لەسەر مانای مەشهووری خۆی لێك بدەینەوەو بڵێن: بەمانا خواردنەوەی سەرخۆشكەرە، دەڵێین: ئایەتەكە لەمەككە نازڵ بووەو ئەو دەمەی ئایەتەكە هاتۆتە خوارێ شەراب حەرام نەكراوە، كەوابوو: رەوایە بەنیعمەت دابنرێو خودا بیكاتە منەت بەسەر بەندەكانی دا.

٤- وشەی (سكر) بەمانا خەمرەو لەسەر مانای خۆیەتیو ئەو كاتەی ئایەتەكە نازڵ بووە خەمر حەرام نەكراوە، ئاماژەی ئەوەشی تێدایە كە زرقو رۆزی حەسەن جیایە لەگەڵ خەمر، چونكە (رزقاً) عەطف كراوەتەوە بۆ سەر (سكراً) عەطفیش بۆ موغایەرەیە. كەوابوو: خەمر بەرزقی حەسەن ناژمێردرێ! ئەم ئایەتە رێخۆشكەرە بووە بۆ حەرامبوونی شەرابو قۆناغی یەكەم بووە بۆ یاساغكردنی خەمر: بەم جۆرە ئایەتەكە لەسەر مانای خۆی دەهێڵدرێتەوەو پێویست بەهەوڵدان بۆ دۆزینەوەی مانای تر نیە.

قۆناغی یەکەم ئەم ئایەتەی ئێرەیە: کە ئاماژەیەکی پەنامەکیو جوانی تێدایە: لەم ڕووەوە لەبەرامبەر ڕزقی حەسەنی داناوە.

قۆناغی دووەم ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ...الآية﴾.

قۆناغی سێیەم ئایەتی ﴿لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى...الآية﴾.

قۆناغی چوارەم ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ...الآية﴾.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (سکر) ئەوەیە: کە لەبەروبوومی خورماو ترێ حەرام کراوە. (ڕزقی حەسەنیش) ئەوەیە: کە لەبەروبوومی خورماو ترێ حەڵاڵ کراوە وەکوو سرکەو مرەباو خورماو مێوژو ئەم جۆرە شتانە[١٢] هەر لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت کراوە فەرموویەتی (سکر: حرامه، والرزق الحسن). حەڵاڵە.

ئەمجار بەڵگەیەکی تر لەسەر خودایەتی خۆی دەهێنێتەوەو ئەوە دەچەسپێنێ: کە ئەم بوونەوەرە بەدیهێنەرێکی دەست ڕەنگینو کارسازی هەیە، ئەوەتا دوای ڕانواندنی بەڵگەی دەرهێنانی شیر لەئاژەڵو بەرهەمهێنانی (سکر)و ڕزقی حەسەن لەبەروبوومی دارخورماو داری مێو، باسی چۆنیەتی دەرهێنانی هەنگوین دەکا لەهەنگو دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ﴾ پەروەردگاری تۆ ئەی موحەممەد! (ئەی بیسەر) خستویەتیە سروشتی هەنگەوەو فێری کردووەی سەرسوڕهێنەری کردوە، هەڵسو کەوتی وای خستۆتە هەستو سروشتەوە کە ئادەمیزادانی عاقڵو هۆشمەند تێیدا سەرگەردانو ناتوانن کاری وا ئەنجام بدەن!

زانایانی ژینگەو زاووزێو چۆنیەتی ژیانی گیانلەبەران زۆر توێژینەوەیان لەم بارانەدا ئەنجام داون، زۆر کتێبو نامیلکەیان لەسەر نوسیون، بەهەموو زمانێک

(١٢) تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٢//٥٧٥.

لێیـان دواون، ڕۆژنامـەو گۆڤـاری تایبـەتییان بـۆ تـەرخان کـردونو زانیـاری باشـیان دەربارەی جیهانی هەنگ بەدەست هێناوەو گەیشتوونە ئەم دەرئەنجامانە:

١- هـەنگ کۆمـەڵ کۆمـەڵی گـەورەن پێکـەوە ژیـان بەسـەر دەبـەن: کۆمـەڵی وا قـەرەباڵغیان هەیـە (٥٠) هـەزار هـەنگی لـەخۆ گرتـووە. هـەروەها هـەر کۆمەڵـەو لەخەلییەکی تایبەتیدا دەحەوێنەوە.

٢- هەموو کۆمەڵە هەنگێك هەنگێکی گـەورەیان تێدایـە پێـی دەگـوترێ: پاشـا یـان (یەعـسوب) ئـەم هەنگـە لەهـەموویان جەسـتەی گـەورەترەو فـەرمانی لـەناو خەلییەکەدا ڕەوایە. لەهەموو کۆمەڵە هـەنگێکدا چـوار سـەد پێـنج سـەد هـەنگێکی نێر هەیـە، ئەمانـە کـار ناکـەن، ژمارەیـەکی تـر لـەپانزە هـەزارەوە تـا پـەنجا هـەزار دەبنو ئەمانە ئیشکەرنو زوربەی کارەکان لەسەرشانی ئەمانەن!

٣- ئەم سێ جۆرە هەنگـە (پاشـا، هەنگـە نێرینـە، هەنگـە مێینـە) بەیەکـەوە بەوپەڕی پێکەوە گونجانەوە بەوپەڕی هاریکاریو کۆمەکی کردنی یەکترییەوە ژیـان بەسەر دەبەن! نمونەی کۆمەڵگایـەکی پێـشکەوتوو پێکـەوە گونجـاوو هـەم ئاهەنگـە: هەنگە گەورەکە (مەلیکە) ئەو هیلکەیە بەرهەم دێنێ کە بێچوە (پورە هەنگە)کەی لێ دەکەوێتەوە، ئەمە بەدایکی هەنگەکان دەژمێردرێ. هەنگـە نێرینـەکان تـەلقیحو متوربەی (مەلیکە= پاشا مێینـە= دایـە گـەورە)کە دەکـەن هـیچ ئیـشی تریـان نیـە. هەنگە مێینەکان خزمەتی خەلییە هەنگەکە (کۆمەڵگا هەنگەکە) دەکـەن خزمـەتی نێرینەکان دەکەن، کارو کاسبیو کـردو کـۆ دەکـەن، بەدرێـژایی ڕۆژ بـەناو کێڵگـەو باغو دارو دەوەنـدا دەسوڕێنەوە بـۆ کۆکردنـەوەی هەڵاڵـەو ئێـواران دەگەڕێنـەوە بـۆ نـاو هەنگەڵانەکـەو هـەنگوین بەرهـەم دێـنن بـۆ بـژێوی هەنگـەکانی نـاو خەلییـە هەنگەکە بەپچوكو گەورەیەوە، هەروەها ئەو کەڕەشانە بەرهـەم دێـنن بـۆ دروسـت کردنی شانە هەنگوینەکان بەشێوە (سداسی) شەشکونجی، شەشخانەیی ... لەهەنـدێ لەخانەکاندا هەنگە پچکۆلەکان بەخێو دەکەن لەهەندێکیشیاندا هەنگوین بێگومان

دەسترەنگين بەراستەو قەڵەمو پرگاڵەوە ناتوانێ نەخشەى خانووى شەشخانەيى ئاوا بكێشێ.

سوبحانەڵڵا : ئەم باڵەفرەكە پچكۆلەيە چۆن فێرى ئەم بيناسازييە بوو، چۆن ئەم كارە سەرسورهێنەرە ئەنجام دەدا؟؟

خودا خستويەتيە دەرونيەوە: كە خانوەكانى بەشێوەى شەشكونجى شەشسوچى دروست بكا بۆ ئەوە تۆزقاڵێكى لێ خەسار نەبێ، كونو كەلەبەرى بێهودەى تێنەكەون، هەموو كاتێ ماڵەكەيان خاوێنو پاكو بێگەردە، ئەگەر گەرمايان بوو، بەباڵەكانيان باوەشێنى خەلييەكە دەكەن، هەروا ئەم هەنگە مێيانە پارێزگارى خەلييە هەنگەكەدەكەنو بەرگرى لەشا هەنگ (مەليكە) دەكەن، لەبەرامبەر دوژمنەكانيان (كە بەزۆرى مێرولەو زنگەسورەو، هەندێ باڵندەن) يەكرێزو ئازايانە بەرگرى دەكەن. بەكورتى ئەركى زۆرو سەرەكى كۆمەڵگاى هەنگ لەسەر مێينەكانە، بۆيە پەروەردگار خيطاب ئاراستەى مێيەنەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿أَنْ اتَّخِذِي مِنْ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنْ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ خودا خستويەتيە دەروونى كۆمەڵگاى هەنگەوەو شارەزاى كردوە: كە لەكێودا شوێنى حەوانەوەى خۆى دروست بكا، لەكونە شاخو تەڵيشە بەردو كلۆرە داردا هەنگەلانى خۆى پێك بێنێ، هەروەها لەناوكوڵەسو صندوقى تايبەتى كە ئادەميزاد بۆى دروست دەكەن شانە هەنگوينەكان رابەستێ شەشخانو شوشسوچو چون يەك هيچيان لەهيچيان زيادو كەمى نەبێ، كونو كەلەبەرو درزو درازى تێدا نەبێ، لەهەندێ خانەو شانەدا هەنگوين پاشەكەوت بكاو لەهەندێكياندا مێوو خۆراكى بێچوە هەنگەكان خەزن بكا، بۆيە پێويستە شانەكان شەشخانە دروست بكا بۆ ئەوەى كونو كەلەبەرى نەمێنێتەوەو شوێنى بێ سودو بێهودە لەخانەكاندا بەدى نەكرێ.

هەر کاتێ هەنگێك بتۆرێ کۆمەڵێك هەنگی تر لەگەڵ خۆی دەباو بۆ جێگایەکی ترو دەیانەوێ لانەیەك پێکەوە بنێن، جا ئەگەر هەنگەکانی تری هەنگەلانەکە ویستیان بیانهێننەوە بۆ ناو خۆیان‌و ئاشتیان بکەنەوە، ئەوە بەگۆرانی‌و سازو سەمتور دەیانگێڕنەوەو دەیانبەنەوە لای خۆیان، ئەمەش نیشانەی زیرەکی‌و هۆشیاریاریانە[١٣] شایانی باسە هەنگ دوو جۆری هەیە: جۆرێکیان لەناو کونە شاخ‌و تلیشە بەردو کلۆرە داردا هێلانە دروست دەکاو ئادەمیزاد پەروەردەی ناکا، هەر کاتێ ئادەمیزاد دەستی پێ بگا هەنگوینەکەی دەردێنێ، کە لەئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿مِنْ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنْ الشَّجَرِ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەم بەشە.

جۆری دووەم ئادەمیزاد بەخێویان دەکا، صندوق‌و کۆلەس‌و لانەیان بۆ دابین دەکا رستەی ﴿وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەم بەشە.

﴿ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ ئەمجار کەلانەو هەنگەلانت بنیات نا لەبەروبوومی هەموو گژوگیاو دارو درەختێك بخۆ، هەرچی حەزت لێیەتی لەتامی شیرین‌و مزرو ئەو جۆرە تامانە بەکاریان بێنە، هەڵاڵی گوڵ‌و غونچەی هەموو دارو درەخت‌و گژوگیایەك بەئارەزۆی خۆت هەڵمژەو بیکەرە بژێو بۆ خۆت‌و بێچوە هەنگەکانی ترو کەرەسەی رابەستنی شانە هەنگوینەکان! بڕۆ بۆ سەرکانیاو جۆگاکان ئاو بەرەوە بۆ شارە هەنگەکە!

﴿فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً﴾ کە هەڵاڵەت هەڵمژی‌و ئاوت هەڵگرت ئەو رێ‌و رەسمە پەیڕەو بکە: کە خودا خستویەتیە ناو دڵتەوەو فێری کردوی بۆ رابەستنی شانەکان‌و بۆ دروستکردنی هەنگوین‌و بژێو بۆ بێچوە هەنگەکان.

---

(١٣) تەفسیری مونیر ج١٤/١٧١.

یان کە دەڕۆی بۆ نـاو دارەسـتانو گوڵو گوڵزار ئـەو ڕێگایـە بگـرە کـە خـودا فێـری کـردووی‌و لـەگومبوون مەترسـە، بەسـەلامەتی دەگەڕێیـەوە بـۆ شـارە هەنگەکەت!

ئەوانەی هەنگ بەخێو دەکەن‌و لەهەڵس‌و کەوتی هـەنگیان کۆڵیوەتـەوە، زۆر لەباسی زیرەکی‌و وردەکاری هەنگ دواون.

بـۆ نموونـە ئەگـەر یـەکێك بیـەوێ لەدەڤـەرێك شـارە هـەنگێك بدۆزێتـەوە، دەچێتە سەر کانیاوێك، جۆگە ئاوێك دادەنیشێ‌و چاوەڕوانی دەکا: کەی هەنگێك دێ بۆ سەر ئاوەکە ئاو بەرێ بـۆ شارە هەنگەکەی، جا کـە هەنگەکـە دێ سـەیری دەکـا ئـاخۆ کـە ئـاوی هـەلگرت رودەکاتـە کـوێ؟ چـونکە وەکـوو بـاوەو بەتاقیکردنـەوە دەرکەوتووە: هەنگ کە ئاوی هەلگرت دو سێ جار بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە تـا بەرز دەبێتەوە ئەمجار ڕێگەیەکی راست دەگرێتەبەر بەبێ فۆرت‌و پێچ دەگەڕێتەوە بۆ شارە هەنگەکەی خۆی! جا ئەو کەسەی کە بـۆ شـارە هـەنگ دەگـەڕێ کە تـوانی بەتەواوی ڕێگە راستەکە بدۆزێتەوە ئەوە تا ئەندازەیەك کارەکەی ئاسان دەبێ‌و لەو دەورو بەرە دەگەڕێ کە هەنگە ئاوبەرەکە بۆ لای فڕیوە. چونکە هەنگەکـە لەسـەر ئاوەکەوە تـا شـارەکەی راسـتە ڕێگایـەکی خـەدەنگی دەگـرێ‌و لێـی لانـاداو لێـی تێـك ناچێ!

هەنگ لەکاتی هەوڵدانی بۆ بـژێو هـەلالی گوڵو غونـچەو گـژو گیـا (بـەنێرو مێیەوە) کۆدەکاتەوەو بەباڵەکانی دەیگوێزێتەوە بۆ شارەکەی خۆی، ئەمە زیرەکـی‌و کارامەیییـەکی سەرسـوڕهێنەرە خـودا خـستیوتیە سروشـتییەوە، شـتێکی صـودفەو ڕێکـەوت نیـە، بـەڵکوو بەشـێکە لەریـسالەی کائینـاتی زینـدەوەرو ئـەرکی خـۆی لەبوونەوەردا ئەنجام دەدا. لەئاکامیشدا ئادەمیزاد لێـی بەهرەمەنـد دەبـێ. بەراسـتی پاك‌و مونەززەهە ئەو خودا بەدیهێنەرە خـاوەن توانـاو کارسـازە بـۆ هـەموو شـتێك هۆکارێکی داناوە!!

جا پاش ئەوەی خیطابی ئاراستەی جیهانی هەنگ کرد، ئادەمیزادانیش لەسوودی هەنگ ئاگادار دەکاتەوە، چونکە نیعمەتەکانی خودا بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادن‌و ئەو لێیان بەهرەمەند دەبێ. دەفەرموێ: ﴿يَخْـرُجُ مِـنْ بُطُونِهَـا شَـرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ﴾ دێتە دەرەوە لەسکی هەنگ هەنگوینێکی رەنگاورەنگ، هی وا هەیە سپییە، هەیە زەردە، هەیە سورە، بەگوێرەی چۆنیەتی ئەو دەفەرەی هەنگەکە هەلاَلی لێ هەلَمژیوە.

﴿فِيـهِ شِـفَاءٌ لِلنَّـاسِ﴾ لەهەنگویندا هەیە شیفاو چارەسەری زۆر لەدەردو نەخۆشی، زۆر داوو دەرمان هەیە بەشێك لەهەنگوینی تێکەلاَو دەکرێ‌و دەبێتە دەرمان‌و چارەسەری زۆر لەدەردان!

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەکەن؛ دەلَێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: قوربان براکەم سکی دەچێ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (اسقه عسلا) هەنگوینی دەرخوارد بدە، کابرا چۆوە مالَەوەو هەنگوینی دا بەبراکەی، پاشان هاتەوە خزمەت پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەفەرمانی جەنابت هەنگوینم دا بەبراکەم، بەلاَم نەك هەر پێی چاك نەبوو بەلَکوو سکچوونەکەی زیادی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اذهب فاسقه عسلا) برۆ هەنگوینی تری بدەرێ کابرا رۆیی بەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ هەنگوینی تری دا بەبراکەی‌و پاشان هاتەوە وتی: قوربان براکەم سکچونەکەی زیادی کردو پێی چاك نەبوو! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صدق الله وكذب بطن أخيك، اذهب فاسقه عسلا) خودا راست دەفەرموێ: سکی براکەت درۆ دەکا برۆ هەنگوینی تری بدەرێ. کابرا چوو هەنگوینی تریدایە براکەی‌و سکی چاك بوو سکچوونەکەی نەما.

هەندێ لەپزیشکانی رابردوو لەم بارەوە وتوویانە: ئەم کابرایە زێدە خۆراکی لەگەدا ماوەتەوە، جا کە هەنگوینیان داوەتێ هەنگوینەکە بەحوکمی ئەوەی

مادەیەکی سروشت گەرمە، خێرا خواردنەکەی ناو گەدەی کابرای حەل کردووەو پاڵی پێوە ناوە بۆ هاتنە دەرەوە، سکچوونەکەی بەرواڵەت زیادی کردوە، کابرای عەرەب وایزانیوە: کە ئەمە زیان بەتەندروستی براکەی دەگەیەنێ!

جا کە جاری دووەم هەنگوینی تری دایە زیاتر ئەو خواردنەماوەی ناو گەدەی حەل بوو زیاتر سکی چوو، پاشان کە جاری سێیەم هەنگوینی دایە ئیتر هیچ جۆرە خۆراکێکی فاسیدی لەگەدەدا نەهێشت سکی وەستایەوە، میزاجی تێکچووی هاتەوە تەرازوو ئازارو پێچی نەما!

پزیشکی سەردەم لەبارەی پێکهاتەی کیمیاوی هەنگوینەوە دەڵێن: ١٥-٢٥(ی ئاوە، (٣٠-٤٥)ی لیفیلۆزە، (٢٥-٤٠)ی کلوکۆزە. کەوابێ هەنگوین هێزو توانایەکی تەواو دەدا بەجەستەی ئادەمیزادو پێخۆرێکی باش‌و بەسوودەو دژی مادە ژەهراوییەکانە، سوودی هەیە بۆ نەخۆشییەکانی جگەرو تێکچوونی مەعیدەو ریخۆڵە، هەروەها بۆ تیفۆئیدو هەوکردنی سی، بۆ نەخۆشی سورێژەو سەحایای مێشکی (السحائي المخي) چارەسەرێکی کەم وێنەیە.. هەروەسا بۆ ذەبحەی صەدری‌و لاواز بوونی دڵ‌و ئیلتیهاباتی گورچیلە دەرمانێکی باش‌و بەسوودە!

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان لەو دیاردەو چۆنیەتی هەڵس‌و کەوتی هەنگدا، لەچۆنیەتی دروستکردنی هەنگوین‌و شانەرابەستنی دا نیشانەو بەڵگەی ئاشکرا هەن لەسەر هەبوونی خودایەکی خاوەن دەسەڵات‌و زاناو دانا بۆ کەسانێك لەدروسکراوانی خودا وردببنەوە، بزانن: خودا چۆن بەزانایی‌و دانایی خۆی سەرپەرشتیاری بوونەوەر دەکا، بەرژەوەندی ئادەمیزادی پاراستووەو هەموو ئەوشتانەی بۆ خزمەتی ئەو رەخساندوە.

هەنگ وەکوو سودی بۆ ئادەمیزاد هەیەو ئەو جۆرە هەنگوینە رەنگاو رەنگانەی بۆ بەرهەم دێنێ، هەر ئاوا سوودی بۆ دارو درەخت‌و گژو گیاش هەیە، زۆر نەخۆشی ئەوانیش لادەبا، بەروبومیان زیاد دەکا!!

**هەندێ لەحاڵەتەسەرسوڕهێنەرەکانی ئادەمیزادو قۆناغەکانی ژیانی: کە نیشانەی دەسەڵاتو تەنهایی پەروەردگارن**

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي ٱلرِّزْقِۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّي رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌۚ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا باسی حاڵو چۆنیەتی سەرسوڕهێنەری گیانلەبەران کرا، ئەمجار لێرەدا بڕێ قۆناغی سەرسوڕهێنەری ئادەمیزاد باس دەکا: چوار

قۆناغی تەمەنی ئادەمیزاد دەخاتە رو: قۆناغی منداڵی، قۆناغی گەنجی، قۆناغی گەڕاوەیی‌و کامڵی، قۆناغی پیری. کە ئەمەش نیشانەیەکی تری دانایی‌و بەدەسەڵاتی خودایەو بەڵگەیە لەسەر تاک‌و تەنهایی زاتی پاکی.

ئەمجار باسی جوداوازی‌و کەمی‌و زۆری رزق‌و رۆژی ئادەمیزاد دەکا، هەندێ کەس دەوڵەمەندەو هەندێ هەژار، هەندێ خاوەن پارەو سامان‌و هەبوو هەندێ دەست کورت‌و بێ مایەو گیرفان خاڵی! ئەمە دابەشکردنی پەروەردگارە، ئەمجار باسی نیعمەتی سێیەم‌و چوارەم دەکا. ئەوەتا لەرەگەزی خۆتان ئافرەتی بۆ رەخساندون بەیەکەوە لانەی ژن‌و مێردایەتی پێکەوە دەنێن‌و خۆشەویستی‌و سۆزی لەنێواندا بلاّو کردوونەوە، پێکەوە هەڵ دەکەن‌و وەگری یەکتری دەبن. کوڕو کچ‌و نەوەتان بۆ بەرهەم دێنن.

هەروەها رزق‌و رۆژی پاک‌و خاوێنتان بۆ لەدارو درەخت‌و گژو گیا وەبەرهەم دێنی‌و دەبێتە هۆی درێژە پێدانی ژیانتان‌و لەززەت وەرگرتن لەژیان.

دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ﴾ ئەی نەوەی ئادەمیزاد بیر بکەنەوەو ورد ببنەوە، بزانن: خودا لەنەبووەوە ئێوەی هێناوەتە گۆڕەپانی ژیانەوە، ئێوە هیچ نەبوون خودا هاوردونیە گۆڕەپانی ژیانەوەو تەمەنێکی دیاریکراوی بۆ داناون، هەر کەسەو تەمەنێکی دیاریکراوی خۆی هەیە! هی واتان هەیە تەمەنی کورتەو زوو دەمرێ، ﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ هی واتان هەیە تەمەنی درێژ دەبێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی پیرو کەنەفتەیی، وای لێ دێتەوە بێ هێزو لاوازو زەبوون، هەستەکانی وەکوو پێویست کار ناکەن، توانای عەقڵی‌و جەستەیی نامێنێ، لەرزۆک‌و لاوازو پەککەوتەو کەنەفت دەبێ، بەراستی بەسەر بردنی ژیان لەو جۆرە تەمەنەدا گەلێ سەخت‌و دژوارە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ زۆر جار لەدوعاو پاڕانەوەی دا لەخودا دەپاڕایەوە: کە تەمەنی نەوەندە درێژ نەبێ بگاتە تەمەنی زەلیلی‌و کەنەفتەیی دەیفەرموو: (أعوذ بك من البخل والكسل وأرذل العمر وعذاب القبر

وفتنة الدجال، وفتنة المحيا والممات) ئیمامی بوخاریو ئیبنو مەردەویهی لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردوە هەروەها ئەوەش چەسپاوە: کە پێغەمبەر ﷺ پەنای گرتووە بەخودا لەتەمەنی زەلیلیو پەککەوتەیی!

ئیمامی عەلی فەرموویەتی: تەمەنی زەلیلی ئەو تەمەنەیە کە لە(٧٥)ساڵی تێدەپەڕێ! وەڵێ ئەمە بۆ هەموو کەس وا نیە هی وا هەیە، عومری دەگاتە هەشتا! هێشتا گوڕو تینی تێدا دەمێنێ. هی وایش هەیە پێش تەمەنی (٧٠) ساڵی دەگاتە (أرذل العمر).

جا بۆیە دەیگێڕینەوە بۆ ئەو تەمەنە زلیلی و رەزیلییە ﴿لِكَيْ لا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئاً﴾ بۆ ئەوەی پاش زانینو تێگەیشتن نەزان ببنەوە، وەکوو سەرەتای ژیانیو تافی ساوایی کە هیچ شتێك نازانێ تاوای لێ بێتەوە، ئەو شتانەی: کە لەتەمەنی گەنجیو کامڵی دا فێریان بووە لەبیری بچنەوە. پیری و کەنەفتی عەقڵیو هۆشی لێ بستێننەوە، هیچ نەزانێو عەقڵی بەهیچ نەشکێو هیچی لەبیر نەمێنێ، کەشتێکیش فێر ببێ تاوێك لەبیری بچێتەوە، پرسیار دەکا لەشتێك ئەوە چیەو کێیەو؟ پێی دەڵێن ئەوە فلان شتە، یان فلان کەسە، پاش تاوێکی تر دووبارە پرسیار دەکاتەوە ئەوە چیەو کێیە؟

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار زانایەو هەموو شتێك دەزانێ، حیکمەتی دروستکردنی ئادەمیزادو زوو مراندنیو تەمەندرێژ کردنی دەزانێ بەتواناو خاوەن دەسەڵاتی رەهایە بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ شتێك دەسەوەسانی ناکا. ئەوەی بەسەر ئادەمیزاد دێ لەنەزانی ساواییو تێگەیشتنی تەمەنی گەنجیو کامڵیو پاشان پیر بونو کەفتەکاریو لەبیرچوونەوەی زانیاری هەرگیز بەسەر خودا نایەو خودا لێیان مونەزەهە! پەروەردگار زانیاری ئەزەلیو ئەبەدی هەیە، تواناو دەسەڵاتی رەهای هەیەو هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نایەو وەکوو ئادەمیزاد نیە،

ئەمڕۆ شتێك نەزانیو سبەینێ فێری ببێ، ئـەمڕۆ شتێك بزانـێو بـەیانی لـەبیری بچێتەوە.

شایانی باسە هی وا هەیە: زۆر پیر دەبێو هێشتا عەقڵو هۆشـی لەسـەرخۆیە، بەتایبەتی کەسێك موسوڵمان بێو دڵـی بـەئیمان ئـاوەدان بێ، بتوانێ ئەرکـەکانی سەرشانی ئەنجام بدا، ئەم جۆرە کەسانە با زۆریش پیر بن لەتەمەنی عادەتی ئـەولا بکـەون بەتەمەنەکـەیان نـاگوترێ (أرذل العمـر) بـەڵکوو ئـەوە تەمــەنی پـیرۆزە، تەمەنی خێـرو بەرەکەتـە. چونکە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: (خیرکم مـن طـال عمره وحسن عمله) واتە: باشترینی ئێوە کەسێکە تەمەنی درێژ بێو کرداری جـوان بێ، بەگوێرەی شەریعەت هەڵسوکەوت بکا.

﴿وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ﴾ وەکوو چۆن ئێوە لەتەمـەندا جوداوازن: هەیـە تەمـەن کـورتو هەیـە تەمـەن درێـژ، هەیـە زۆر تەمـەنی کورتـەو هەیە مام ناوەندی، هەر بەو جۆرە خودا لەپێدانی رزقو رۆزیـشدا جـوداوازی تێـدا پەیـدا کـردون، هەتانـە دەوڵەمەنـدو خـاوەن سـامان، هەتانـە دەسـت کـورت، هـەژار، هەتانە خاوەن پلەو پایە پاشاو فرمانڕەوا، هەتانە مسکێنو ژێر دەستە! ئـەم رزقو رۆزییەی پێ داون، ئەو مـاڵو سـامانەی پـێ بەخـشیون بـەپێی عـەقڵو هـۆشو زیرەکیتان نیە. کوردی گوتەنی: (دەوڵەمەندی بەقووەتی شانان نیە). هـی وا هەیـە خـاوەنی ملیـۆنو ملیـارە بۆخـۆی دینارێـك ناهێنـێ! هـی وا هەیـە بـۆ خـۆی زۆر بەنرخەو دینارێکی نیە!!

﴿فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَـوَاءٌ﴾ جـا کـە رزقو رۆزی هەموو کەس لەلای خوداوە بێ، بـژێوی هـەموو گیانلەبـەرێك بەدەسـت ئـەو بێ، وا مـەزانن: ئەوکەسـانەی رزقو رۆزییـان زۆر پێـدراوە، کـە دەوڵەمەنـدو خاوەن سامانەکانن بەشێك لـەو رزقو رۆزییـەی پێیـان دراوە دەیگێڕنـەوە بـۆ ئـەو

کۆیلانـەی کـە لـەژێر دەسـتیان دان، بـەڵکوو ئـەوەی ئەیـدەن بەوانـە، رزق‌و رۆژی خۆیانەو لەخوداوە بۆیان بڕدراوەتەوە، بەڵام بەسەر دەستی ئەواندا بۆیان دێ.

پوختەی قسە ئەوەیە: دەفەرموێ: پەروەردگار لەرزق‌و رۆژیدا ئێوەی بـەرزو نـزم کـردوە هەنـدێکی دەوڵەمەنـد کـردون‌و هەنـدێك هـەژار، رزق‌و رۆژی ئێـوەی لەبەنـدەکانتان زیـاتر کـردوە، ئـەوانیش وەکـوو ئێـوە ئـادەمیزادن دەی دەبوایـە بـەگوێرەی یاسـای خۆتـان ئـەو زێـدە رزقـەی پێتـان دراوە بیگێڕنـەوە بـۆ بەنـدە هەژارەکان بۆ ئەوە لەپۆشاك‌و خواردەمەنی‌و شوێنی حەوانەوەدا یەکسان بن، بـەڵام ئێوە بەم یەکسانی‌و بەرامبەرییە رازی نین، هەرچەندە ئـەوان‌و ئێـوە هـەردو لاتـان ئادەمیزادن‌و دروستکراوی خودان!! دەی کـەوابێ چۆن ئێـوە رێگـە بـەخۆتان دەدەن پەسـترین دروسـتکراوی خـودا بکەنـە هاوبەشـی خـودا؟! ئەمـە نموونەیەکـە خـودا دەیهێنێتەوە بۆ دەرخستنی ئەو کارە ناشیرینەی موشـریکەکانی قـوڕەیش کـە بتـی داتاشراو لەبەردو داریان دەکردە هاوەڵی خوداو دەیانپەرست!

لەئایەتێکی تردا باشتر ئەم پەندە رون دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿ضَـرَبَ لَكُـم مَّثَلاً مِنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاء فِي مَـا رَزَقْنَـاكُمْ فَـأَنتُمْ فِيـهِ سَوَاء تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَـتِكُمْ أَنفُـسَكُمْ﴾الـروم/٢٨. جـا کـە ئێـوە بـۆ خۆتـان رازی نـین لەگەڵ کۆیلەو ژێردەستەکانتاندا یەکسان بن؛ ئەدی چۆن یەکسانی دەخەنـە نێـوان بەدیهێنەرو دروستکراوانیەوە؟ چۆن بتـەکانتان دەبەنـە ریـزی خـوداو پلـەو پایـەی خودایەتییان پێ دەدەن!؟

﴿أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَـدُونَ ؟﴾ چۆن ئێـوە بەندایـەتی بـۆ بـت‌و صـەنەم دەکـەن؟ ئینکـاری نیعمـەتی خـودا دەکـەن؟؟ چـونکە شـتێکی سروشـتی‌و ئاسـاییە کەسـێك شـەریك بـۆ خـودا دابنـێ هەنـدێ لـەو نیعمەتانـەی کـە خـودا پـێی داوە پـاڵ شەریکەکەیان دەدا، کەواتە ئینکاری نیعمەتی خودا دەکا.

یان مانای ﴿أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ؟﴾ بەم جۆرەیە: ئایا ئێوە دوای چەسپاندنی ئەم هەموو بەڵگەو نیشانانە لەسەر تاکو تەنهایی خودا چۆن ئینکاری نیعمەتەکانی دەکەن؟

ئەمجار باسی چەند جۆر نیعمەتی خۆی دەکا: کە بەخشیونی بەئادەمیزاد بۆ ئاگادار کردنەوەیان و سەرنج راکێشانیان بۆ لای نیعمەتەکانی و دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَنِينَ وَحَفَدَةً﴾ واتە: پەروەردگار لەرەگەزی خۆتان و شێوەو روخساری خۆتان ئافرەتی بۆ ئێوە رەخساندوەو کردویەتی بەخێزانتان و وەگری یەکتری بوون و خۆشەویستی خستۆتە نێوانتانەوە، بەرژەوەندی یەکتری دەپارێزن و پێکەوە گونجاندونی و بەیەکەوە هەڵدەکەن!!

ئەمجار لەژنەکانتانەوە بۆ ئێوەی بەرهەم هێناوە منداڵ و نەوە: کە لەراستی دا منداڵ گوڵی ژیانەو هۆی خۆشی و رازاندنەوەی ژیانە، جێگای کەیفخۆشی و هاریکاری و یارمەتی و هەم ئاهەنگییە، تا منداڵن ئێوە بەخێویان دەکەن و کە ئێوە پیر بوون ئەوان کۆمەگیتان پێ دەکەن! دەبنە میراتگرو جێنشین و هۆی کوێرنەبوونەوەی ناوو ناوبانگتان!

﴿وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ رزق و رۆژی پاک و خاوێنی پێداون، خواردن و خواردنەوەی بەتام و لەزەت و گەوارای پێ بەخشیون پۆشاکی جوان و خانوبەرەی دڵگیرو زێدو نیشتمانی بەپیت و بەرەکەتی بۆ رەخساندون، ئامێرو هۆکاری گواستنەوەی بۆ دابین کردون! دەی سەرباری ئەم هەموو نیعمەتانە، وێڕای ئەو هەموو بەڵگانە لەسەر تاک و تەنهایی خوداو بەخشندەو میهرەبانی بۆ بەندەکانی کەچی ئەو ناکەس بەچەو سپڵەو پێنەزانانە بەخۆیاندا ناچنەوە، بیر لەئاکام و سەرەنجام ناکەنەوە!؟ ﴿أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ﴾ ئایا ئەوانە دوای ئەو رونکردنەوەو هێنانەوەی بەڵگە جۆراو جۆرانە، پێیان وایە: بتەکانیان هاوبەشی خودان، دەتوانن

سوودو زیانیان پێ بگەیەنن، پێیان وایە: (بەحیرەو سائیبەو وەصیلە)یان لێ یاساغەو نابێ سوودیان لێ وەربگرن؟ بەراستی ئەوانە بەهەڵەچوون جێی سەرزەنشتو لۆمەن!!

﴿وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ؟﴾ ئایا ئەوانە ویڕای ئەو هەموو نیعمەتە ئاشکراو جۆراو جۆرانە، بەردەوامن لەسەر کوفرانی نیعمەتەکانی خوداو ئاوا بەهەوانتە نیعمەتەکان وەپاڵ بتو صەنەمەکانیان دەدەن؟؟ دەڵێن: ئەوە نیعمەتی خوداکانمانن؟؟ ئای کەمێ عەقڵو کەم ئەزمونن؟! ئای کە نەزانو نەفامن؟ ئای کە سپڵەو پێ نەزانن؟!

ئەمجار پەروەردگار رەدێکی تری بتپەرستەکان دەداتەوە، دوو پەندو مەثەلیان بۆ لێ دەداو جەخت لەسەر پوچیو ناشیرینی بتپەرستی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقاً مِنْ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ شَيْئاً﴾ ئەو موشریکە نەفامو سپڵەو پێنەزانانە بەندایەتی بۆ شتێك دەکەن، شتانێك دەکەنە هاوەڵی خودا: کە ناتوانن هیچ رزقو رۆزییەکیان لەئاسمان و زەوی بۆ دابین بکەن بۆیان... ناتوانن باران ببارێنن، دارو درەختو دانەوێڵە بڕوێننو وەبەریان بێنن، بەڵکوو دارای ئەوەیان نیە بۆ خودی خۆیان سودێکیان هەبێ، زیانێك لەخۆیان دوور بخەنەوە، ناتوانن کۆمەگی بەخۆیان بکەن چ جای بەکەسانی تر! ﴿وَلا يَسْتَطِيعُونَ﴾ تەنانەت ئەگەر بیشیانەوێ بیکەن، هەر ناتوانن! هێنانی رستەی ﴿وَلا يَسْتَطِيعُونَ﴾ بۆ جەخت کردنەوەیە لەسەر بێ دەسەڵاتیو داماوییان، چونکە کەسێك دارای شتێك نەبێ لەوانەیە لەداهاتوودا بەجۆرێك ئەو داراییەی بۆ دەستەبەر ببێ، جا پەروەردگار بەرستەی ﴿وَلا يَسْتَطِيعُونَ﴾ ئەو ئەگەرەی رەواندەوە، ئەوەی دوو پات کردەوە: کە ئەم بتانە دارای پێدانی رزقو رۆزییان نیەو نایشیان بێو ناتوانن ئەو داراییە بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

بۆیە بە ﴿وَلا يَسْتَطِيعُونَ﴾ تەعبیری لەبتەکان دایەوە: کە بەڕواڵەت بۆ کۆی نێرینەی عاقڵ بەکار دێ، چونکە موشریکەکان پێیان وابوو: عاقڵن‌و تێگەیشتیان هەیە واتە: بەگوێرەی بیرو باوەڕی موشریکەکان تەعبیرەکەی ئەدا کرد.

جا کە ئەوە حاڵ‌و وەزعی بت‌و صەنەمەکان بێ؟ ئەوەش بەتوانایی‌و خاوەن دەسەلاتی خودا بێ، ئەوە بەخشندەیی‌و میهرەبانی بێ ﴿فَلا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الأَمْثَالَ﴾ ئێوە بەهیچ کلۆجێك هاوەڵ‌و هاوتا بۆ خودا دامەنێن، دروستکراوان مەبەنە ریزی ئەو، کەسی تر بەخودا مەزانن جگە لەخودای تاك‌و تەنهاو پەروەردگار!

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مانای ﴿فَلا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الأَمْثَالَ﴾ ئێوە جگە لەخودا کەسی تر مەپەرستن، کەسی تر لەگەڵ مندا بەخودا مەزانن، چونکە جگە لەمن خودای تر نین.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ خودا دەزانێ‌و شایەتی دەدا: کە هیچ خودا نین جگە لەخۆی، ئێوە نازانن‌و بەنەزانی خۆتان شتی تر دەکەنە هاوەڵ‌و هاوتای. بێگومان خودا دەزانێ ئێوە لەئاکامی ئەو هاوەڵدانانە بۆ خودا توشی چ عەزابێك دەبن‌و چیتان بەسەر دێ. بۆیە داواتان لێ دەکا: کە واز لەبەندایەتیکردن بۆ ئەو بت‌و صەنامانە بهێنن، ئێوە ئەو حەقیقەتە نازانن، ئەگەر بتانزانیایە عیبادەتتان بۆ نەدەکردن‌و وازتان لەبتپەرستی دەهێنا!!

## دوو نموونە دەربارەی بت‌و صەنەم

﴿ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا

هَلْ يَسْتَوُونَ ۚ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾

دوای ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار نەهی لەوەکرد هاوەڵی بۆ دابنێن، چونکە خودا دەزانێ: چۆن پەند لێ بداو ئێوە نازانن. ئەمجار فێریان دەکا: چۆن پەندو مەثەل بهێننەوە، دەفەرموێ: ئێوە کە پێتان وایە: خودا هاوەڵی هەیەو بتو صەنەم دەکەن بەهاوشانی، وەکوو ئەوە وایە: کابرایەك بێنێ یەکسانی بخاتە نێوان کۆیلەو بێ تواناو بێ دەسەڵاتی مادیو مەعنەویو کابرایەکی ئازادو خاوەن ماڵو دارایی؛ ئەویان هیچی لەدەست نایەو ئەمیان دەتوانێ بەئارەزوی خۆی ببەخشێو تەصەروف بکا.

هەروەها وێنەیەکی تری هاوەڵدانانەکەتان وەکوو کەسێك وایە یەکسانی بخاتە نێوان دوو مرۆڤەوە یەکیان کەڕو لاڵو هیچی لەدەست نایەو لەهیچ حاڵی نابێو بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە، ئەویتریان خاوەن بیرو هۆشو تێگەییشتنە دەتوانێ سوود بەخۆیو خەڵکی تریش بگەیەنێ!

دەی ئایا مەعقوولە ئەم دوو پیاوە وەکوو یەك بن؟؟ واتە: چۆن بێ گیانو جەمادات دەکرێنە هاوشانی خودا چۆن بەردو دارێکی بێ گیان، وەکوو خودا

بەندایەتی بۆ دەكرێو پەرستشی بۆ ئەنجام دەدرێ، یان چۆن كافری ریسواو ماڵوێران دەخرێتە تای تەرازوی موسوڵمانی سەركەوتوو پێگەیشتوو ئەمە دوو نموونەن پۆچو بەتاڵی بتپەرستی دەردەخەن!

ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباس ریوایەت دەكا: دەفەرموێ: ئایەتی ﴿ضَـرَبَ اللَّهُ مَـثَلاً عَبْـداً مَمْلُوكـاً﴾ دەربارەی كابرایەكی قورەیشیو بەندەكەی نازڵ بووە. ئایەتی ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ...﴾ دەربارەی عوسمانو بەندەیەكی كۆنەكۆیلەو تازە ئازاد كراویدا هاتۆتە خوارێ، ئەم كابرا كۆنە كۆیلەیە رقی لەئیسلام بوو هەمیشە حەزرەتی عوسمانی هەڵدەنا بۆ رەزیلیو چروكی.

لەریوایەتێكی تردا هاتووە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی عوسمانی كوری عەففانو مەولایەكەی : كە كافر بوو، ناوی ئوسەیدی كوری ئەبولعاص بوو، زۆر قینی لەئیسلام بوو، عوسمان چاودێری دەكردو بژێوی دەدایە، كابراكەش هەمیشە حەزرەتی عوسمانی هەڵدەنا بۆ دەس قوچاندنو خۆ گرتنەوە لەماڵبەخشین!

جا پاش ئەوەی پەروەردگار نەهی لەهاوەڵدانان بۆ خودا كرد، بەنموونەی واقیعیو بەرچاو، گەندەڵیو پووچی بتپەرستی رونكردەوە، دوو نموونەی لەواقیعی ژیان هێنایەوە.

یەكەمیان: ئەوەیە: كە دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً عَبْداً مَمْلُوكاً لا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ وَمَنْ رَزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقاً حَسَناً فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرّاً وَجَهْراً هَلْ يَسْتَوُونَ ؟﴾ ئەی بتپەرستو موشریكەكان! نموونەی ئێوە كە بتو صەنەم دەكەن بەهاوشانی خودا وەكوو ئەوە وایە: كابرایەك بێنی كۆیلەیەكی بێ دەسەڵات بكاتە هاوشانی خاوەنەكەی! كۆیلەیەك كە هیچی پێ ناكرێو ناتوانێ هیچ ببەخشێ، بكرێتە هاوشانی خاوەنەكەی كە خاوەن دەسەڵاتو هێزو توانایەو دەتوانێ بەئارەزۆی خۆی ماڵ ببەخشێ، بەنهێنیو بەئاشكرا، بەزۆریو بەكەمی تەصەروف لەماڵو سامانی

خۆیدا دهکا، ئایا ئهم دوو کهسه یهکسانن؟ وهکوو یهك وان؟ دهخرێنه ریزی یهکترهوه؟ بێگومان نا!

نموونهی یهکهمیان بتو صهنهمی بێ دهسهڵاتن، نموونهی دووهمیش نموونهی خودای باڵادهستو بهتوانایه، دهی خۆ عهقڵ رێگه نادا یهکسانی بخرێته نێوان ئهو دوو کهسهوه: که باسکران (کۆیلهو خاوهنهکهی) کهسێك بێ عهقڵ نهبێ جوداوازییان ههست پێ دهکا، ئهدی چۆن ئهوانه یهکسانی دهخهنه نێوان خودای باڵادهستی بهتواناو خاوهن نیعمهتو شکۆمهندو ئهم بتو صهنهمه داتاشراوانهی: که هیچ نازانن و هیچ شتێکیان پێ ناکرێ؟! چۆن یهکسانی دهخهنه نێوان خودایهك که ههموو شتێکی بهدهستهو بهردو دارێکی داتاشراوی هیچو پووچ؟!

دیاره ههرگیز یهکسانی ناخرێته نێوانیانهوه، بۆیه لهئاکاما فهرمووی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ حهمدو سوپاسی تهواوو پهسنیو پیرۆزیو دووری لهههموو خهوشێك بۆ خودای باڵادهستو شکۆمهنده، بۆ پهروهردگاری خاوهن نیعمهتو میهرهبانه، ههر ئهو شیاوی پهرستشو سوپاسه نهك ئهوبتو صهنهمانهی که ئهوان بهخودایان دهزانن و دهیانکهنه هاوهڵی خودا، وهڵێ زوربهی ئهو کافرو خودا نهناس و موشریکانه حهقو حهقیقهت نادۆزنهوه، نایناسن، خودای خاوهن نیعمهتو میهرهبان ناناسن، ههتا پهرستشو عیبادهت ههر بۆ ئهو بکهن و پیرۆزیو بێ خهوشی زاتو صیفاتی رابگهیهنن و خهریکی حهمدو سوپاسکردنی بن!!

نموونهی دووهمیان: وێنهی خودای حهقو شکۆمهنده لهتهك بتو صهنهمی بێ دهسهڵاتدا. ئهم پهندهش ههر مانای پهندی یهکهم دووپات دهکاتهوه بهڵام بهشێوهیهکی ئاشکرا ترو روونتر! دهفهرموێ: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَى مَوْلاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّهُّ لا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَنْ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَهُوَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ؟﴾ واته: خودا پهندو مهثهلی هێناوهتهوه بۆ خۆیو

بت‌و صەنەمەکان؛ بەدوو پیاو: یەکیان لاڵەو قسەی بۆ ناکرێ‌و توانای هیچی نیە، نەبۆ خۆی‌و نەبۆ غەیری خۆی دارای هیچی نیە، سەرباری ئەوەش بارگرانییە بەسەر خاوەنەکەیەوەو ئەرکی بەخێوکردنی‌و دابین کردنی پێویستیاتی ژیانی لەسەر خاوەنەکەیەتی. ئەگەر خاوەنەکەی ئەرکێکی پێ بسپێرێ، بۆ شوێنێکی بنێرێ، ناتوانێ ئەنجامی بدا، لەکارەکەیدا سەرکەوتوو نابێ‌و کارێکی سوودمەند ناکا، چونکە تێناگا چی پێ دەگوترێ، بۆ خۆشی زمانی نیەو کەس تێی ناگا!

دووەمیان پیاوێکی ساغ‌و عاقڵ‌و زاناو زیرەك‌و تێگەیشتوو سوودی بۆ خۆی‌و غەیری خۆی هەیە: فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە دەکا. پابەندی حەق‌و عەدالەتەو بەعەدالەت حوکم دەکا، قسەی حەق‌و کرداری جوان‌و رەفتاری شیرینە، رێبازی راستی گرتووەو پەیڕەوی ئایینی حەق دەکا!

ئایا ئەم دوو پیاوە وەکوو یەك وان؟ یەکەمیان هیچ قازانجێکی لەدەست هەڵناوەرێ‌و دووەمیان هەموو سودێکی بۆ خەڵك هەیە. یەکەمیان وەکوو بت‌و صەنەم دیت‌و بیستنی نیە. دووەم: کە بریتییە لەخودای پەروەردگار خاوەنی هەموو صیفەتێکی کەماڵ‌و جەلالە، فەرمان دەکا بەبەندەکانی بۆ خودا پەرستی‌و یەکتاپەرستی و پەیڕەو کردنی عەدالەتکاری‌و بۆ خۆشی لەهەموو کارو فرمانێکی دا عەدالەتکارە. دەی کە ئەم دوو پیاوە بەمەثەل هێناومانەوە وەکوو یەك نەبن، چۆن ئێوە ئەی موشریکەکانی مەککە! یەکسانی دەخەنە نێوان خودای بالادەست‌و نێوان بتەکانتانەوە؟ بەراستی ئەو موشریکانە گومڕاو کەودەن‌و کەللەرەق‌و سەرلێشێواون!!

## پەروەردگار زانیاری دەربارەی هەموو غەیبو پەنامەکی ئاسمانەکانو زەوی هەیە بەدیهێنەری ئادەمیزادو باڵندەیە

﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾

دوای ئـەوەی لەئایەتـەکانی پێشوودا نموونـەی بتـەکانی بەکـەڕو لاڵو دەسەوەسان هێنایـەوە، نموونـەی خۆیشی بـەپیاوێکی عـادڵو زانـاو دانـا هێنایـەوە ئەوەی چەسپاند: کە هەرگیز ئەو دوو پیاوە چون یەك نین، ئیتر بەردەوامە لەسەر ڕانوانـدنی بەڵگـەی جـۆراو جۆرەکـانی خودایـەتی خـۆی، لێـرەدا ئامـاژە بەکـەماڵی عیلمو بەتوانایی خۆی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هـەر بـۆ خودایەو بـەس! زانینـی زانیـاری غـەیبو پەنامـەکی ئاسمانـەکانو زەوی، هـەر ئـەو غەیب دەزانێو کەسی تر ئاگای لەوەنیە، مەگـەر خـودا بەفـەضڵو گـەورەیی خـۆی بڕێ لەو زانیارییە بەهەندێ لەفریشتەو پێغەمبەرانو پیاوچاکان ڕابگەیەنێ!

ئەمجار کەمالی قودرەتی خۆی رادەگەیەنیٚو هەواڵی ئەوەمان پیٚ دەدا: کە خودای گەورەو شکۆمەند هەرکاتیٚ ئیرادەی شتیٚکی کرد، هەر ئەوەندە پیٚی دەفەرمویٚ: ببە، دەبیٚ، هیچ شتیٚك لەنەو عاصی نابیٚو هەرچی بیەویٚ ببیٚ دەبیٚ ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾ پەیدا بوونو کاروباری قیامەتو هەرچی کە پەیوەندی بەقیامەتەوە هەبیٚ، هەر کاتیٚ خودا ئیرادەی کرد پەیدا ببیٚ چاو تروکانیٚکە بەڵکوو کەمتریش! چونکە فەرمانی خودا دەست لەعاستو فەورییە، هەر لەگەڵ ئیرادەی کرد یەکسەر پەیدا دەبیٚو وەغرانی نابیٚ. فەرمانی ئەو ﴿كُن فَيَكُونُ﴾البقرة/١١٧. وەکوو دەفەرمویٚ: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾القمر/٥٠. یان دەفەرمویٚ: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾لقمان/٢٨.

## بەکورتی:

رابوونی قیامەت لای خودا شتیٚکی ئاسانەو هەر کاتیٚ ویستی ببیٚ لەکورتترین کاتو لەچاو تروکانیٚکدا ئەنجامی دەدا. بۆیەش (لمح البصر- چاو تروکان)ی بەکار هیٚناوە چونکە بەگویٚرەی بیرو بۆچونی ئیٚمە چاو تروکاندن کورتترین کاتە.

لەنیٚو شتە غەیبیو پەنامەکییەکاندا بەتایبەتی باسی قیامەتی کرد، چونکە زۆر کیٚشەو نیزاع دەربارەی هاتنو رابوونی لەنیٚوان ئادەمیزاددا هەیە، زۆر کەس بروای پیٚ نیە، بەدریٚژایی میٚژووی ئادەمیزاد جیٚگای موناقەشەو دەمەدەمیٚ نیٚوان یەکتاپەرستانو بیٚ باوەڕان بووە، زوربەی ئادەمیزاد پیٚیان وا بووە: کە هاتنی قیامەت شتیٚکی نامومکینەو نابیٚ، بروایان بەزیندوبوونەوە نەبووەو (ئیٚستاش هەر وایە!)

ئەمجار بەڵگەی رابوونی قیامەت دەهیٚنیٚتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بیٚگومان پەروەردگار بەسەر هەموو شتیٚکی مومکیندا بەتواناو

بالادهسته، ههرچی بیهوێ ببێ دهبێو کهس نیه بهرههڵستکاری بێو ببێته کۆسپو لهمپهڕ لهبهردهم ویستهکانی دا!

مهبهست لهئایهتهکه ئهوهیه: که تهحلیلو تهحریم لهکهسێك جوانه که زانیاری بهسهر ههموو شتێکدا ههبێ، دهی خۆ ئێوه ئهی موشریکهکان! هیچ زانیاریو ئاگاداریتان بهسهر شته پهنامهکیو غهیبییهکاندا نیه ئهدی چۆن بڕیاری حهلاڵکردنو حهرامکردن دهردهکهن؟

ئهمجار پهروهردگار بڕێ دیاردهی قودرهتو توانای خۆیو نیعمهتهکانی بهسهر ئادهمیزاددا رادهنوێنێو دهفهرموێ: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ پهروهردگار ئێوهی لهسکی دایکتاندا هێناوهته دهرێو خستونیه ناو جیهانی بهرفراوانو لهو کاتهدا حاڵتان وا بوو: ﴿لا تَعْلَمُونَ شَيْئاً﴾ هیچتان نهدهزانیو لهههموو شتێك بێ ئاگا بوون!

ئادهمیزاد لهسهرهتای هاتنه دونیایهوه هیچ شتێك نازانێ، ئهمجار ورده ورده خودا ههستهکانی بهئاگا دێنێو گهشهیان پێ دهکا، ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ﴾ ههستی بیستنو دیتنتان بۆ دهرهخسێنێ، عهقڵو هۆشتان پێ دهبهخشێ، جوداوازی نێوان خێرو شهڕ دهکهن قازانجو زهرهری خۆتان لێك دهکهنهوه. چاكو خراپ لێك ههڵدههاوێرن، ئهم ههستانهمان پێ بهخشیون، عهقڵو هۆشمان پێداون ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بۆ ئهوهی شوکرو سوپاسی نیعمهتهکانی خودا بکهن بهسهرتانهوه، ههموو ئهندامێکتان لهبواری خۆیدا بهکار بێنن، بتوانن عیبادهتی خودای خۆتان بکهنو فهرمانبهرداری فهرمانو جڵهوگیرییهکانی بن.

لهفهرموودهی صهحیحو قودسی دا هاتووهو بوخاری لهئهبو هورهیرهوه ریوایهتی کردوه دهڵێ: پێغهمبهر ﷺ فهرمووی: پهروهردگار دهفهرموێ: (من عادى لي ولياً، فقد بارزني بالحرب، وما تقرب الي عبدي بشيء أفضل من أداء ماافترضت

عليه، ولايزال عبدي يتقرب اليَ بالنوافل حتى أحبه، فاذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، ولئن سألني لأعيننه، ولئن دعاني لأجيبنه، ولئن استعاذني لأعيذنه، وماترددت في شيء أنا فاعله ترددي في قبض نفس عبد المؤمن، يكره الموت، واكره مسإئته ولابد منه).

پوختەی فەرموودەکەی ئەوەیە: موسوڵمان هەر کاتێ بەدڵسۆزیو خاڵصانە بەندایەتی پەروەردگاری کرد، هەموو کردەوەیەکی دەبێتە هی خودا، بیستنی بۆ خودایە، دیتنی بۆ خودایە. واتە: ئامێری‌بیستن‌و دیتنی لەشتێکدا بەکار دەهێنی کە خودا بۆی داناوە، کە هەڵمەت دەبا، کە دێ‌و دەچێ هەموو هەڵس‌و کەوتێکی هەموو بیرکردنەوەو قسەو گوفتارێکی بەگوێرەی شەریعەتی خودا بەکاردێنێ‌و لەطاعەتی ئەودا ئەنجامی دەدا، لەهەموو شتێکدا پشت بەخودا دەبەستێ‌و بۆ رەزامەندی ئەو دەیکا!

ئەمجار پەروەردگار بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوەو سەرنجیان بۆ لای بەڵگەیەکی تر لەسەر خودایەتی خۆی‌و کەماڵی قودرەتی رادەکێشێ‌و دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلاَّ اللَّهُ﴾ ئەوە نەیانڕوانیوەو سەیریان نەکردووەو ناڕوانن بۆ باڵندەکان لەحەوادا لەنێوان ئاسمان‌و زەویدا چۆن خودا رامی کردون و وای لێکرد ون بەدوو باڵ دەفڕن، لەهەوادا جگە لەخودا کەسی تر نیە بتوانێ رایانگرێ‌و نەهێڵی بکەونە خوارێ، هەرخودا: بەقودرەتی خۆی رایاندەگرێ‌و فڕینیان بۆ دەرەخسێنێ! ئەگەر قودرەت‌و دەسەڵاتی خودا نەبوایە هەرگیز ئەو باڵندانە فڕینیان بۆ نەدەکرا! چونکە کەریمی کارساز باڵندەی وا دروست کردوە دەتوانێ بفڕێ، هەوای وا سازداوە فڕینی تێدا بکرێ، ئەگینا ئەگەر پەروەردگار باڵندەی ئاوا دروست نەکردایەو هەوای وا ساز نەدایە باڵندەکان نەیاندەتوانی بفڕن.

سەیر بکەن خودا چۆن دوباڵی گونجاوی بۆ باڵندە دروست کردوە، وێکیان دێنێتەوەو بڵاویان دەکاتەوە: وەکوو چۆن مەلەوان لەناو ئاودا دەستو قاچی بەکار دێنێ! هەروا کلکێکی گونجاوی بۆ ڕەخساندوە تا یارمەتیدەری بێ بۆ نزم بوونەوەو نیشتنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلاَّ اللَّهُ﴾ مانای ئەوەیە: جەستەی باڵندە قورسەو جەستەی قورسیش ناتوانێ بەهەودا بڕوا ئەگەر شتێك لەژێرەوە هەڵی نەگرێ. کەوابوو ڕاگری ئەو جەستە قورسە لەهەوادا خودای خاوەن دەسەڵاتە، کە هەوای وا ڕەخساندوە ئەو جەستە قورسە هەڵبگرێ! بێگومان زانایانی ئیسلام زۆر لەمێژە ئەوەیان درکاندوە: کە زیاد لەدوازدە میل لەبەرزایی دا هەوا چڕیو پڕی نامێنێ بۆیە باڵندەکان لەو ئەندازە زیاتر بەرز نابنەوە!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بەڕاستی لەو ڕامکردنو گونجانەی باڵندەو هەوا بۆ ئەنجامدانی فڕین نیشانەو بەڵگەی بەهێز هەن لەسەر خودایەتی خوداو تاكو تەنهایی‌و بێ هاوەڵی‌و خاوەن دەسەڵاتی بێ سنووری! بۆ کەسانێك ئیمانیان بەخودا هەبێ‌و دڵیان بەنووری ئیمان ڕۆشن بوبێتەوە.

## بڕێ بەڵگەی جۆراو جۆر لەسەر تاكو تەنهایی خوداو نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی بەسەر بەندەکانی

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا

وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾

ئەمەش کۆمەڵە نیعمەتێکی ترن کە خودای پەروەردگار بەخشیونی بەئادەمیزادو رایاندەنوێنێو دەیانکاتە بەڵگە لەسەر خودایەتی خۆیو نیشانەی تاكو تەنهایی زاتی پاکی.

لەئایەتەکانی پێشوودا باسی بڕێ نیعمەتی خۆی کرد: کە بەخشیونی بەئادەمیزادو بریتی بوون: لەدروستکردنی خۆیانو رەخساندنی هەستو شعور بۆیان، بەخشینی زانستو زانیاری پێیان، ئەمجار فەضلو منەتی خۆی لەبوارێکی تردا بەسەر ئادەمیزاددا رادەگەیەنێ: دەربارەی چەند شتێك کە لەژیانی خۆیاندا سوودی لێوەردەگرنو خودا بۆی رەخساندونو فێری بەکارهێنانی کردون، کە بریتین لەخانووبەرەی تێدا حەوانەوەو ئارامگرتن لەشارو گوندەکاندا، هەروا خێمەو رەشماڵی لەکوڵكو موو دروستکراو کە زوربەی خێڵە کۆچەریو ئاژەڵدارەکان لەژێریاندا دەحەوێنەوەو وەکوو خانوو بەکاری دەهێنن هەروەها فێری کردون کە لەکوڵكو موو خوریو مەرمزو بەرگنی ئاژەڵەکانتان پۆشاكو

راخـەرو پێخـەف دروسـت بکـەن، هـەروا هەنـدێکی دەفرۆشـنو دەیکەنـە کـاڵای بازرگانیو تیجارەتی پێوە دەکەن، هەروەها فێری دروستکردنی قەڵاو شورای قایمو قوڵی کردون، زریّو جەوشەن بۆ خۆتان دروست دەکەنو خۆتانی پێ دەپارێزن!

جـارێکی تـر سـیباقی قورئـان هـەنگاو دەهـاوێ بـۆ رانوانـدنی نهێنییـەکانی بوونەوەرو شوێندەستی قودرەتی پەروەردگارو دیاردەی نیعمەتەکانی خـودا بەسـەر بەندەکانی داو دەچێتە ناو خانوو بەرەو ماڵو حـاڵی ئادەمیزادانـەوەو ئـەو شـتانە رادەنوێنـێ کـە هـۆی دڵخۆشـیو پـێ نـازینی ئـادەمیزادەو لـەژیاندا هـەوڵ دەدا بەدەستیان بێنێو زۆریان بکاو خۆیان پێوە هەڵنێتەوە؛ وەکـوو خـانوو بەرەوشـتو مەكو قەڵاو شورەو نەفەقو سەرداب‌و سێبەرو ئەم جۆرە شتانە!

دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَناً﴾ پەروەردگار خـانووی بـۆ ئێـوە رەخساندوە فێری کردوون چۆن دروستی دەکەن! تێیدا ئارام دەگرنو دەحەوێنـەوە. لەگەرماو سەرما دەتانپارێزێ، لەژیانی گوندنشینیو شارنشینی دا سوود لەو خانوو مەسـکەنانە وەردەگـرن. لەحاڵـەتی کۆچـەریو گەشـتو گـوزاردا شـتی تـری بـۆ رەخساندون، ئەوەتا: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الأَنْعَامِ بُيُوتاً تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَـوْمَ إِقَامَتِكُمْ﴾ بۆ ئێوەی بەدیهێناوە لەپێستی ئاژەڵ، خێمەو رەشماڵ، دەیانکەنە خانووی سـەفەریو هـەڵگرتنو گواسـتنەوەیان لەشـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر ئاسـانو کـەم ئەرکـە، بەئاسـانی کۆی دەکەنـەوەو دەیپێـچنەوەو لەشـوێنێکی تـر هـەڵی دەدەنـەوە لەژێریاندا ئارام دەگرنو دەحەسێنەوە!

﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَـا وَأَشْـعَارِهَا أَثَاثـاً وَمَتَاعـاً إِلَـى حِـينٍ﴾ خـودا بـۆ ئێـوەی رەخساندوە لەخوری مەڕو کوڵکی حوشترو مەرەزو مووی بزن، کـەلو پـەلی ماڵتـان، هەندێکی دەکەنە راخـەرو هەنـدێکی دەکەنـە پێخـەفو هەنـدێکی دەکەنـە پۆشـاك، هـەروا دەیکەنـە کـاڵای بازرگـانیو ئـاڵو وێـری پێـوە دەکـەن، تـا کـاتێکی دیـاریکراو لەزانیاری خودادا، کە کۆتایی ژیانتانە.

هەڵبەتە ئەم شتانە هەموویان بەگوێرەی داب‌و نەریتی کۆمەڵگای ئەو کاتەی عەرەب‌و غەیری عەرەب هۆکاری دابینکردنی پێداویستی ئادەمیزاد بوون، لەم خوری‌و کوڵك‌و مەرەزو موو بەرگنە سودیان وەرگرتووە، بەرگ‌و پۆشاك‌و فەرەنجی‌و پەستەك‌و کۆڵەباڵ‌و راخەرو پێخەف‌و خێمەو رەشماڵ‌و گوریس‌و قەیاسەو هۆڕو تێرەو جەواڵ‌و خەرارو رەشکەو تایینچەیان دروست کردون‌و بێ دابینکردنی ئەو شتانە نەیانتوانیوە پێداویستی ژیان دەستەبەر بکەن، ئەم شتانە کەل‌و پەلی پێویستی ژیانی ئەو سەردەمە بوون، هەرچەندە ئەمڕۆ ژیان گۆڕاوەو پێشکەوتنی پیشەسازی لەهەموو بوارەکاندا تەنگی بەو جۆرە کەل‌و پەلانە هەڵچنیوەو وەلای ناون‌و ئەو گرنگییەی بۆ نەهێشتوونەوە، وەلێ ئێستاش بەشێوەیەك لەشێوەکان سوودیان لێ وەردەگیرێ‌و پێداویستی ژیانن، بەتایبەتی بۆ گوندنشینان‌و ئەوانەی تا ئێستاش کۆچەرین‌و بەدوای لەوەڕو ئاو دابینکردن بۆ ئاژەڵەکانیان ئەم دیوو ئەو دیویانەو گەرمێن‌و کوێستان دەکەن. ساڵی چەند جار هەوار گۆڕکێ دەکەن‌و لەشوێنێکدا تاسەر نامێننەوە.

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلالاً﴾ هەر لەنیعمەتی خودایە بەسەر ئێوەدا: کە بۆ ئێوەی رەخساندوە لەو شتانەی دروستی کردوون: وەکوو درەخت‌و شاخ‌و کێو، خانووی جوان‌و رازاوەو سێبەرو سایەو ئارامگای خۆش‌و هەواساز، بەهۆی ئەو سێبەرانەوە خۆتان لەگەرمای هاوین‌و تیشکی خۆر دەپارێزن، لەوەیشوومەو رەشەبا پەنا دەگرن.

﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ الْجِبَالِ أَكْنَاناً﴾ هەروەها پەروەردگار لەکێوو کەژەکاندا چەند پەناگاو کەورگ‌و ئەشکەوت‌و قەڵاو پەناو پاساری بۆ خۆتان‌و ئاژەڵەکانتان بەدیهێناوە، خۆتانی تێدا حەشار دەدەن‌و خۆتان لەدوژمن‌و دڕندەو سەرماو گەرما دەپارێزن.

﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ﴾ هەروەها خودا بۆ ئێوەی دروست کردوە چەند جۆرە پۆشاکێك: کە ئەیکەنە بەرتانو لەگەرمای هاوینو سەرمای زستان دەتانپارێزێ!

﴿وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ﴾ بۆ ئێوەی رەخساندوە پۆشاکی لەزرێ دروستکراو: کە لەزەبری شیرو تیری دوژمنان دەتانپارێزێ، هۆکاری مانەوەتانە لەسەنگەری بەرگریو بەرخودانندا! جا وەکوو ئەو شتانەی بۆ دروست کردون ﴿كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾ ئاوا بەو جۆرە بۆ ئێوەی رەخساندوەو دەرەخسێنێ، نیعمەتەکانی خۆی بەسەر ئێوەدا تەواو دەکا لەدونیاو قیامەتدا بەختەوەرتان دەکا، بەڵکوو بیر بکەنەوەو بەخۆتاندا بچنەوە، بڕوا بەخودا بکەنو خۆتان بخەنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوەو خۆتان لەبەدبەختی دونیاو قیامەت بپارێزن. ئەو کاتە دەبنە فرمانڕەوای سەرزەویو بەسەر بەرزیو ئازادی ژیان بەسەر بەرن، کەڵانە بژینو مەردانە بمرن!

جا ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا﴾ ئەگەر پاش ئەم رونکردنەوەو شیکردنەوەیە، سەرباری ئەو هەموو نیعمەتانەی پێمان بەخشیون ئەوان هەر سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، پابەندی پەیامی ئیسلام نەبوونو بەڵگەو نیشانەکان کاریان تێ نەکردن، ئەوە تۆ هیچت لەسەر نیەو خەفەتیان بۆ مەخۆ لاسارییەکەیان چ زیان بەتۆ ناگەیەنێ چونکە ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ ئەتۆ تەنها راگەیاندنت لەسەرەو ئەنجامیشت داوە، ئەتۆ ئەرکی سەرشانی خۆت بەرێكو پێکی بەجێ هێناوە لەوە زیاتر بەرپرس نی!!

## بەکورتی:

ئەگەر ئەوان لەئیمانهێنان رویان وەرگێڕا ئەوە تۆ ناتوانی تۆوی ئیمان لەدڵیاندا بچەسپێنیو بیرو باوەڕی ئیسلامی لەدەروونیاندا بڕسکێنی!

ئەمجار هۆی پشت هەڵکردنەکەیان رون دەکاتەوەو ئەوە رادەگەیەنێ کە روو وەرگێرانەکەیان لەنەزانیو هەست نەکردن بەنیعمەتەکانی خودا نیە، بەڵکوو هۆکارەکەی سەررەقیو لوتبەرزییانە، ئەگینا ئەوان ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا﴾ ئەوان دەزانن؛ کە ئەو نیعمەتانە هەموویان لەخوداوەن، کەچی لەجیاتی ئەوەی سوپاسی خودا بکەن لەسەر نیعمەتەکانی، بەکردەوەکانیان ئینکاری نیعمەتەکانی پەروەردگار دەکەن، شتی ترو کەسانی تر دەکەنە هاوبەشی خودا، رەخساندنی رزقو رۆزیو سەرکەوتن وەپاڵ غەیری خودا دەدەن، دەڵێن: ئەم نیعمەتانە بەشەفاعەتی بتەکانمان پەیدا بوون!

﴿وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ زوربەی زۆری ئەو ئادەمیزادانە کافرو بێ بڕواو سەررەقنو بەئەنقەست ئیمان ناهێننو سوپاسگوزار نین، کەمێکیان نەبێ: زۆرینەیان لەبەر بێ عەقڵیو نەفامییان، دان بەراستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەددا نانێن، کە بڕوایان نیەو بەکافری ماونەوە لەبەر نەزانیو کەم فامییانە، نەك لەبەر سەررەقیو عینادی ئەنقەست!!

## تێبینی:

ئایەتی ژمارە (٨٠) بەشێوەیەکی گشتی ئەوە دەگەیەنێ: کە دروستەو موباحە سوود لەخوریو بەرگنو کوڵكو مۆو مەرەزی ئاژەڵ وەربگیرێ بەهەموو جۆرێك! تەنانەت مالیکییەکانو حەنەفییەکان فەرموویانە خوریو بەرگنو کوڵكو موی مندارەوەبوو پاکەو دروستە کەڵکی لێ وەربگیرێ! بەڵام دەبێ بشۆردرێن نەوەکوو پیساییان پێوەبێ، ئەو فەرموودەیەی: ئوممومسەلەمە: کە دەفەرموێ: (لابأس بجلد الميتة اذا دبغ، وصوفها وشعرها اذا غسل) پشتگیری ئەم رایەی مالیکیو حەنەفییەکان دەکا. هەروەها فەرموودەیەکی تریش هەیە: ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائیو ئیبنو ماجە لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە؛ پێغەمبەر فەرموویەتی: (أيما اهاب دبغ فقد طهر).

حەنەفییەکان ئەوەشیان زیاد کردوەو فەرموویانە شاخو ئێسقانو ددانی مندارەبوو وەکوو تووکەکەی وایە. واتە: دروستە کەڵکی لێ وەرگیرێ، چونکە ئەم جۆرە شتانە گیانیان تێدا نیە، بەمردارەوەبوونی ئاژەڵەکە پیس نابن. وەڵێ زانا شەرعزانەکانی تر فەرموویانە ئەمانە پیسن وەکوو گۆشتەکەی بەمردارەوە بوون پیس دەبن.

ئیمامی (الزهري)و (الليث)ی کوڕی سەعد پێیان وایە: دروستە کەڵك وەربگیرێ لەپێستی ئاژەڵی مردارەوەبوو با دەباغیش نەکرێ، چونکە فرمایشتی خودا کە لەئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿مِّن جُلُودِ الأَنْعَامِ﴾ عامە بۆ پێستی ئاژەڵی سەربڕاوو مردارەبوو، وەڵێ جەماوەری زانایانی ئیسلام پێچەوانەی رای ئەمانن. بەگوێرەی زاهیری رێبازی ئیمام مالیك دەباغکردن پێستی مردارەوەبوو پاك ناکاتەوە، بەڵام دروستە سوودی لێ وەربگیرێ بۆ بەکارهێنانی لەشتی وشکدا وەڵێ نابێ نوێژی لەسەر بکرێ، یان خواردەمەنی تەڕی تێ بکرێ.

زوربەی زۆری عولەمای مەدینەو حیجازو عێراق رایان وایە: دەباغکردن پێستی مردارەوەبوو پاك دەکاتەوە. بەڵگەیان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە لەپێشەوە نووسیمان (ايما اهاب دبغ فقد طهر)

ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی دروست نیە بەهیچ جۆرێ کەڵك لەپێستی مردارەوەبوو وەربگیرێ با دەباغیش کرابێ، چونکە وەکوو گۆشتەکەی پیسە! بەڵگەشی ئەو حەدیثەیە: کە ئەبوو داود لەعەبدوڵای‌کوڕی عوکەیم ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (لا تستمتعوا من الميتة باهاب ولاعصب) کەڵك وەرمەگرن لەمردارەوە بوو نەلەپێستی نەدەماری بەڵام باقی زانایانی حەدیثو فیقهی ئیسلامی پێچەوانەی رای ئیمام ئەحمەدن. چونکە فەرموودەیەك هەیە دەربارەی مەڕەکەی مەیمونە ئەبو داوودو نەسائی لەمەیمونەوە ریوایەتیان کردوە: دەڵێن: کە مەڕەکەی مەیمونە مرداربووەوە فڕێیاندا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لو اخذتم

اهابها؟) دەبوایە پێستەکەیتان گل بدایەوە کەڵکتان لێ وەربگرتایە؟ عەرزیان کرد قوربان مەڕەکە مردار بوبووەوە چۆن پێستەکەی گل دەینەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یطهرها الماء والقرظ) ئاوو گزگل پاکی دەکاتەوە: واتە: بەدەباغکردن پاک دەبێتەوە.

## هەڕەشە لەموشریکەکان و حاڵ و چۆنیەتی رۆژی قیامەتیان

﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم

﴿مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا هەڵوێستو هەڵسو کەوتی موشریکەکانی بەیان کرد، ئەوەی ڕاگەیاند: کە ئەو کافرانە دەزانن: ئەو نیعمەتانە لەخوداوەنو پاشان ئینکارییان دەکەنو پاڵ غەیری خودایان دەدەن، شوکرو سوپاسی خودا ناکەن لەبەرامبەر نیعمەتەکانی دا. بەشوێن ئەوەدا هەڕەشە لەکافرکان دەکاو وەزعو حاڵی ڕۆژی قیامەتیان ڕوون دەکاتەوە. بڕێ دیمەنی ترسناکی ئەو ڕۆژە رادەنوێنێ.

دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيداً﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەو موشریکانە بترسێنە لەو ڕۆژەی لەهەموو گەلو نەتەوەیەك شایەدێك ڕاست دەکەینەوە بۆ ئەوەی ببێتە گەواهیدەر بەسەریانەوە. ئەو شایەدە پێغەمبەرەکەیانە، هەموو پێغەمبەرێك دەبێتە شایەد بەسەر گەلەکەیەوە دەربارەی ئەوەی چۆن وەڵامی پەیامەکەیان داوەتەوە، چۆن بەپیر پەیامو بانگەوازییەکەوە چوون. ئیمانیان پێ هێنا یان ڕویان لێ وەرگێڕا! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شَهِيداً﴾النساء/٤١.

دیمەنەکە سامناکە، پێغەمبەران شایەدی لەگەلەکانیان دەدەن چۆن بەپیر بانگەوازییەکەیانەوە هاتوون، چ هەڵوێستێکیان بەرامبەر پێغەمبەرەکەیان نواندوە؟ هەڵسو کەوتیان چۆن بووە؟! کافرەکان چاو بەملۆق ڕاوەستاون پەشیمانو هیوا بڕاوو قەتیس ماو! خەریکە زمندەقیان بچێ ببن بەقەترە ئاوو بتوێنەوە.

پێغەمبەران شایەتییان لێدەدەن، هەڵوێستو هەڵسو کەوتیان دەربارەی پەیامی خودا بەرودا دەدەنەوە. ﴿ثُمَّ لا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەمجار رێگە نادرێ بەوانەی کافر بوون عوزر بێننەوە، بەرگری لەخۆیان بکەن، چونکە شایەتیدانی پێغەمبەران لەو مەوقیفەدا کیفایەتە بۆ بڕیاردان دەربارەیان خوداش بۆ خۆی لەهەموو کەس باشتر دەزانێ چییان کردوەو چ هەڵوێستێکیان نواندوە. شایەتیدانی پێغەمبەرەکانیش لەسەریان بۆ زێدە سەرزەنشت کردنو ریسوا کردنیانە، خۆ ئەگەر رێگاشیان پێ بدرێ هیچ عوزرو بیانوویان بەدەستەوە نیە، بەڵگەیان بۆ ناهێندرێتەوە. ئەوان لەبەرامبەر نازو نیعمەتەکانی خودادا کوفرانیان کردوە، هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، غەیری خودایان پەرستووە ئیتر عوزری چی بێننەوە؟ بلێن چی؟

لەو رۆژەدا لەعەیبەتانو لەترسان زمانیان دەگیرێ سەرشۆڕو ریسوابوو هەستو خوستیان لا دەبڕێ: وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَـٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ، وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾المرسلات/٣٥-٣٦. یاساغکردنی قسەو عوزر هێنانەوە لێیان ئەمەش بۆ خۆی جۆرە سزایەکە لێیان دەسەندرێ.

﴿وَلا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ داواشیان لێناکرێ سەرزەنشتکردنی خودا لەسەر خۆیان لابەرن بەتۆبەکردنو پەشیمانبوونەوە خودا لەخۆیان رازی بکەن.

چونکە قیامەت خانووی پاداش وەرگرتنەوەیە، شوێنی ئیشکردن نیە، گەڕانەوەش بۆ ژیانی دونیا شتێکی محاڵەو نابێو بەخەیاڵیش نایەتە دی!! دونیا بەسەرچوو ژیانی دونیا نەماو قیامەت رابووە وەختی حیسابو لێکۆڵینەوەیە، رۆژی پاداشو سزا وەرگرتنەوەیە.

﴿وَإِذَا رَأَى الَّذِينَ ظَلَمُوا الْعَذَابَ فَلا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ ئەو کاتەی ستەمکارانو کافرو بێ بڕوایان؛ ئەوانەی پەیامی پێغەمبەرانیان رەتکردەوە،

پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستەوە، ئەو کاتەی ئەوانە عەزابی خودا دەبینن بۆیان ئاشکرا دەبێ: کە رزگار بوونیان نابێ، ساتەوەختێکیش عەزابیان لەسەر سووك ناکرێ، مۆڵەت نادرێن‌و سزایان بۆ دوا ناخرێ، بەڵکوو بەگورجی‌و گۆزو گومەت بەبێ تەئخیرو دواخستن راپێچ دەکرێن بۆ سزادان، جا کە دەست کرا بەسزادانیان ئیتر ئەو سزایەی: کە بۆیان بڕیار دراوە سووك ناکرێ‌و بەهیچ جۆرێ مۆڵەت نادرێن: کە ساتەوەختێك ئارام بگرن‌و بەئاسایشی بژین. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّارَ فَظَنُّوا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفاً﴾الكهف/٥٣.

ئەمجار هەواڵی ئەوەمان پێ دەدا: کە موشریك‌و ستەمکارەکان تاوانی کردەوەو هەڵوێستەکانیان دەخەنە سەرشانی پەرستراوەکانیان‌و لەپڕێکا پەردەی بێدەنگییان دەدڕێ‌و وەقسە دێن، بەهۆی چاوپێکەوتنیان لەدەشتی مەحشەردا بەپەرستراوەکانیان، کە خودا درۆزنەکانیانن لەگۆڕەپانی مەحشەردا دەبینن، پەنجەیان بۆ رادەدێرن‌و دەیانەوێ تاوانەکانی خۆیان بخەنە سەرشانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَى الَّذِينَ أَشْرَكُوا شُرَكَاءَهُمْ قَالُوا رَبَّنَا هَؤُلاء شُرَكَاؤُنَا الَّذِينَ كُنَّا نَدْعُو مِنْ دُونِكَ﴾ ئەو دەمەی موشریکەکان: ئەوانەی لەدونیادا هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، پەرستراوەکانیان دەبینن چاویان بەخودا درۆزنەکانیان دەکەوێ، تاوانی هاوەڵدانانەکەیان دەخەنە سەرشانی بت‌و صەنەمەکانیان، دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! ئەوانە ئەو خودا درۆزنانەمان بوون؛ کە ئێمە لەدونیادا عیبادەتمان بۆ دەکردن‌و لەجیاتی ئەوەی تۆ بپەرستن ئەوانمان دەپەرستن! (سەیرە! لێرەدا دان بەخودایی خودادا دەنێن دەڵێن: (ربنا) ئەی پەروەردگاری ئێمە (هؤلاء شرکائنا) ناڵێن: (هؤلاء شرکاء لله).).

وا پێدەچێ ئەم قسەیە بۆیە دەکەن بەهیوای ئەوەن سزاو عەزابەکە بەسەر هەموانیاندا دابەش ببێ. یان دەیانەوێ: تاوانەکانیان بخەنە سەرشانی بت‌و

صەنەمەکان‌و تۆزێك تەسەللای دڵی خۆیان بدەنەوە، هەرچەندە لێیان مەعلوومەو دڵنیان لەوەی: کە عەزابیان دەدرێ‌و رزگاربوونیان نیە، بەڵام وەکوو پەندی پێشینان دەڵێ: (ناوبردە پەلاماری هەموو پچك‌و چڵەگیایەك دەدا بۆ ئەوەی خۆی پێ بگرێتەوە!!).

ئیتر خودا درۆزنەکان ئەوانەی کرابوون بەهاوەڵی خودا زمندەقیان دەچێ‌و دەکەونە لەرزەو لەم تۆمەتە بێ بناغەیە وەدەنگ دێن‌و خۆیان بێ بەری دەکەن‌و ﴿فَأَلْقَوْا إِلَيْهِمُ الْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ بەخودا زانراوەکان، موشریك‌و هاوەڵدانەرەکان بەدرۆ دەخەنەوە، پێیان دەڵێن: بێگومان ئێوە درۆ دەکەن ئێمە هەرگیز پێمان نەگوتوون: عیبادەتی ئێمە بکەن‌و بەخودامان بزانن، ئێمە لەعیبادەتکردنی ئێوە بۆ ئێمە بێ ئاگاین، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ، وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاء وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾الأحقاف/٥-٦.

ئەمجار بەخودا زانراوەکان گەردنکەچی خۆیان بۆ پەروەردگار رادەنوێنن‌و بەندایەتی خۆیان رادەگەیەنن ﴿وَأَلْقَوْا إِلَى اللَّهِ يَوْمَئِذٍ السَّلَمَ﴾ هەموویان عابیدو مەعبوود دان بەخودایەتی پەروەردگاردا دەنێن‌و ئیعتراف بەوە دەکەن کە خودا تاك‌و تەنهایەو بێ شەریك‌و هاوتایە، هەموویان گەردنکەچ‌و زەلیل‌و بێ دەسەڵات لەبەردەم خودای پەروەردگارو خاوەن دەسەڵاتدا گوێ بیس‌و فەرمانبەردارن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُؤُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا﴾السجدة/١٢. یان دەفەرموێ: ﴿وَعَنَتِ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ﴾طه/١١١. هەموو ڕوویەك، هەموو سەرو گەردنێك بۆ خودا زەلیل دەوێ‌و دادەنەوێ‌و تەسلیم بە دەسەڵات‌و توانای رەهای پەروەردگار دەبێ، بۆیان مەعلووم‌و ئاشکرا دەبێ کە هەر ئەو خودایەو ئەو کاربەدەست‌و ئیش هەڵسوڕێنەرە ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ هەموو بت‌و صەنەم‌و خودا درۆزنەکانیان لێ ون دەبن‌و بێ

سایەو مایە دەمێنـنـەوە کـەس نیـە هاریکاری‌و یارمەتیـدەریان بێ، شـەفیع‌و فریـاد ڕەسیان دەست ناکەوێ، ئەوانـەی لـەدونیادا بـەخودایان دەزانـین‌و پێیـان وابـوو لای خودا ڕۆژی قیامەت شەفاعەتیان بۆ دەکەن، هەموویان پووچ دەرچون‌و هیچیان پێ نـەکرا. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَيَقُولُـونَ هَـؤُلاء شُـفَعَاؤُنَا عِنـدَ اللّهِ﴾يونس/١٨.

ئـەمجار دوا ئـەوەی هەڕەشـەی لـەگومڕایان کـرد، هەڕەشـە لەوانـە دەکـا: کـە وێـڕای گـومڕایی خۆیـان نـاهێڵن خـەڵکی تـریش ئیمـان بێنـێ، دەفـەرموێ: ﴿الَّـذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَاباً فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يُفْسِدُونَ﴾ ئەوانـەی سوورن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان‌و ئینکاری پێغەمبەرایـەتی تـۆ دەکـەن، هـاوەڵ بۆ خـودا دادەنـێن، بـۆ خۆیـان کـافرن‌و کەسـانی دیکـەش هەڵدەنێن بـۆ کـافربوون‌و مانەوە لەسەر کوفرو لایان دەدەن لەرێبازی خودا، دەبنە لەمپەڕو کۆسـپ‌و تەگـەرە لەبەردەم ئەوانەدا کە دەیانەوێ ئیمـان بـەخوداو پـەیامی پێغەمبـەر بێـنن، ئەوانـە زیاد لەو سزایەی خۆیان کە بۆیان دانراوە، سزای دیکەشیان بۆ زیاد دەکـەین، سـزای تاوانی کوفرو بێدینی خۆیان‌و سزای تاوانی ئەوانەی: کە گومڕایـان کـردون، ئەوانـە شیاوی دوو سزان؛ سزای کوفرو بێدینی‌و سزای گومڕا کردنی خەڵکانی تـرو سەر لێ تێکدان‌و چەواشە کردنیان وەکوو لەئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَهُـمْ يَنْهَـوْنَ عَنْـهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ﴾الأنعام/٢٦. نـاهێڵن خـەڵك موسـوڵمان بـێ‌و بـڕوا بەپـەیامی پێغەمبـەر بکا، بۆ خۆشیان لێی دوور دەکەونەوە.

ئایەتەکە بەروونی ئـەوە دەگەیـەنێ: کـە کافرەکـان سـزایان پلـە پلـەو جـۆراو جۆرە وەکوو چۆن پلەو پایەی موسوڵمانان لەبەهەشـتدا جوداوازی هەیە.

ئەمجار پەروەردگار بەتایبەتی شایەتیدانی پێغەمبـەر بەسـەر گەلەکـەی بـاس دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿وَيَـوْمَ نَبْعَـثُ فِـي كُـلِّ أُمَّـةٍ شَـهِيداً عَلَـيْهِمْ مِـنْ أَنفُسِـهِمْ﴾ ئـەی پێغەمبەر! باسی تەنگانەی ئەو ڕۆژە بکە ئەوە باس بکەو بەخەڵکەکەی ڕابگەیەنە:

کە پەروەردگار لەرۆژی قیامەتدا پێغەمبەری هەموو گەل و نەتەوەیەك دەکاتە شایەد بەسەر گەل و نەتەوەکەیداو بەرێك و پێکی شایەتییان لێ دەدا، بەڵگەو بیانویان بەدەستەوە ناهێڵێ، بەڵگەیان لەسەر راست دەکاتەوە، قوڕیان بەدەمدا دەداو بۆڕیان دەدا ﴿وَجِئْنَا بِكَ شَهِيداً عَلَى هَؤُلاء﴾ تۆش دێنن ئەی موحەممەد! دەتکەینە شایەدو گەواهیدەر بەسەر ئوممەتەکەتدا، شایەتییان لێ دەدای چییان کردوە، چییان وەڵام داویتەوە، چۆن لەگەڵ پەیامەکەی تۆدا هەڵس و کەوتیان کردوە، جا تۆ ئەو کاتە رێزو نرخی خۆت دەزانیو بۆت دەردەکەوێ چەند لای خودا رێزداری.

ئەم ئایەتە دەق دەشوبهێتە ئەو ئایەتەی سورەتی (النساء/٤١) کە دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيداً﴾ دەگێڕنەوە عەبدولڵای کوڕی مەسعود قورئانی بۆ پێغەمبەر دەخوێندەوە کە گەیشتە ئەم ئایەتە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەس!

جا ئیبنو مەسعوود دەڵێ: کە تەماشای پێغەمبەرم کرد: چاوەکانی فرمێسکیان هەڵدەوەراندن!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رون دەکاتە: کە بەهۆی رەوانەکردنی پێغەمبەر بۆ سەر ئادەمیزادو نازڵکردنی قورئان بۆ سەری بەڵگەو بیانووی ئوممەتەکەی بڕیون و دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَاناً لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئێمە قورئانمان بۆ سەر تۆ نازڵ کردوە رونکەرەوەی هەموو شتێکە، هەرچی ئادەمیزاد پێویستیان بێ لەژیانیاندا لەرێنمونیو رێکخستنی کۆمەڵ و چۆنیەتی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ یەکتریدا لەم کتێبە پیرۆزەدا بەیان کراوە، ئەم قورئانە رێنمونیو رەحمەت و فەڕو مزگێنییە بۆ موسوڵمان؛ بۆ ئەوانەی بڕوای پێ دەکەن و بەپێی ئەو بەرنامەیە هەڵس و کەوت دەکەن؛ رێنمویی گومڕایان دەکا، رەحمەت و فەڕە بۆ ئەوانەی بڕوای پێ دەکەن مزگێنییە بۆ ئەوانەی خۆیان بەخودا

دەسپێرن‌و گەردنکەچی فەرمان‌و نەهیەکانی دەبن، مژدەیان دەداتێ بەبەهەشتی بەرین‌و رازاوە.

ئەوەتا ئەی موحەممەد! قورئانمان بۆ ناردوی، هەموو شتێکی تێدا روون کراوەتەوە ئیتر کەس بیانووی نەما، کەس بەڵگەی بەدەستەوە نەما بۆ ئیمان نەهێنان، هیدایەت‌و رەحمەتەو مزگێنییە بۆ موسوڵمانان، جا کەسێك پێی خۆشە با شوێن ئەم قورئانە بکەوێ پێش ئەوەی رۆژی قیامەت بێ، ئیتر پەشیمان بوونەوە سوودی نەبێ‌و رێگە نەدرێ بۆ بێ بڕوایان عوزر بێننەوە، ماوەی ئەوە نەمێنێ هەوڵ‌و تەقەللا بدەن خودا لەخۆیان رازی بکەن!

بەیانکردنی قورئان بۆ ئەحکامە جۆراو جۆرەکانی حەلاڵ‌و حەرام بەدوو جۆرە یان بەهۆی نیگاوە بووە واتە: قورئان بەدەق دەیچەسپێنێ، یان بەهۆی فەرموودەی پێغەمبەرەوە دەبێ کە شیکەرەوەو رونکەرەوەی مانای قورئانە، ئەو شتانەی قورئان بەکورتی ئاماژەی پێکردون حەدیث شییان دەکاتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾النحل/٤٤.

ئەبو داوودو تیرمیذیفەرموودەیەك لەمیقدامی کوڕی مەعدیکەریبەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (انی أوتیت القرآن ومثله معه) ئەمجار زانایانی ئیسلام لەچوارچێوەی ئەو دەقانەی قورئان‌و حەدیثدا ئیتجیهادیان کردوەو بەگوێرەی رۆژگار ئەحکامەکانی ئایینیان بۆ خەڵك شی کردۆتەوە. یاسای ژیان‌و چۆنیەتی هەڵس‌و کەوت کردنی ئادەمیزادەکان بەرامبەر پەروەردگارو بەرامبەر خۆیان‌و ئادەمیزادنی ترو گیانلەبەران‌و بوونەوەر بەگشتی لەکتێبە شەرعییەکاندا کە لەو سەرچاوانە وەرگیراون شی کراونەوە. لەڕاستی دا قورئان یاسایەکی گونجاوو هەمیشەییە بۆ ئادەمیزادو هەرگیزاو هەرگیز کۆن نابێ‌و لەکار ناکەوێ!!

ئیمامی قورطوبی لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێ: ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزو ئاشکرایە: کە بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد لەهەموو رۆژگارێکدا یەکتاپەرست هەبوونو سەردەمێك نەبوە جیهان لەیەکتاپەرست خاڵی بووبێ! بۆ نموونە لەرۆژگاری پێش هاتنی ئیسلامدا (قس)ی کوڕی ساعیدەو زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل یەکتاپەرست بوون!

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکی دا دەربارەی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل دەفەرموێ: (یبعث أمة وحده) هەروەها سەطیحو وەرەقەی کوڕی نەوفەل.. پێغەمبەر ﷺ دەبارەی وەرەقەی کوڕی نەوفەل دەفەرموێ: (رأیته ینغمس في أنهار الجنة) ئەم جۆرە کەسانە بەڵگەو شایەدن لەسەر ئادەمیزادانی رۆژگاری خۆیان.[١٤]

## بنەما سەرەکییەکانی خۆشبەختی کۆمەڵگای ئادەمیزاد

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ

(١٤) تفسیر القرطبي ج١٠/١٦٤.

﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ
أَنكَٰثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ
أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ ۚ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ ۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ
لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى
مَن يَشَآءُ ۚ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟
أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ
بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾ وَلَا
تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ
وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾

ئاشكراو نمایانە: كە قورئانی پیرۆز بۆیە نازڵ كراوە گەلو نەتەوە دروست بكا، كۆمەڵگا رێك بخا، جیهانێك دروست بكا یاساو نیظام دابنێ! بەختەوەریو كامەرانی بخاتە نێو كۆمەڵگای ئادەمیزاد، قورئان بانگەوازییەكی جیهانیو سەرتاسەریو هەتا هەتایییە، بانگەوازییەكی عالەمی مرۆڤانەیە. دەمارگیری بۆ هۆزو خێڵو رەگەز تێدا نیە، بانگەوازییەكە تەنها بیرو باوەڕ تێیدا تەرازوو سەنگی مەحەكە، رابیطەو بێكەوە گرێدەری ئادەمیزادەكانە، هەموو كارو كردەوەیەك بەو تەرازوە كێشانە دەكرێو بەو مەحەكە بەتاقی دەكرێنەوە. بۆیە ئەو ئایینەی قورئان بەرنامەو پرۆگرامیەتی مەبادیئو بیرو باوەڕێكی وای لەخۆگرتووە كۆمەڵانی ئادەمیزاد بەیەكەوە دەبەستێتەوەو جۆشیان دەداو دەیانكاتە گەلو نەتەوەیەكی یەكدڵو یەك هەڵوێستو یەك مەبەست، ئارامیو خۆشبەختیو كامەرانی لەناو كۆمەڵانی مرۆڤدا بڵاو دەكاتەوە. ئادەمیزادەكان لەئاكامی پەیرەوكردنی ئەو مەبادیئە جوانو بەرزانەدا ئارامییان تێدا گەشە دەكا، ، لەوادەو پەیمانو مامەڵەكردندا بتمانە بەیەكتری دەكەن. تاكەكانی كۆمەڵ هەڵدەنێ بۆ هاریكاری كردنی یەكترێو خۆرازاندنەوە بەرەوشتی جوانو بەرز، جڵەوگیرییان لێدەكا لەرەوشتی ناشیرینو فەحشائامێز!

وەكوو زانیمان لەوەپێش پەروەردگار بەدوورو درێژی وادەو بەڵێنی بەخودا پەرستان دا، هەڕەشەی لەكافرەكان كرد، جەختی لەسەر تەرغیبو تەرهیب كردەوە، ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ پابەند بوون بەپەیامی پیرۆزی ئیسلامەوە.. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا فەرمانی كرد بەئادەمیزادان بەپابەندبوون بەچەند بنەمایەكی سەرەكی: كە بنەماو ماكی هەموو فەضیلەتو ئەخلاقی جوانو رەوشتی بەرزی كۆمەڵایەتین، فەرمانی پێ كردن بەعەدالەتكاری و چاكەكاریو وەفاكردن بەوادەو بەڵێن.

ئیبنو مەسعوود دەفەرموێ: جامیع ترین ئایەت لەقورئاندا بۆ خێرو شەڕ ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ...﴾ە.

قەتادە دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: هەر رەوشتێکی جوان هەبووبێ لەسەردەمی پێش ئیسلامداو کاریان پێ کردبێ بەجوانیان دانابێ، خودا لەم ئایەتەدا فەرمانی پێ کردوە. هەر رەوشتێکی ناشیرین کە لەسەردەمی نەزانی دا هەبووبێو بەلایانەوە ناشیرین بووبێ خودا نەهی لێکرد وە، طەبەرانیو ئەبو نەعیمو حاکیمو بەیهەقی لەسەهلی کوڕی سەعدەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: (ان الله یحب معالي الأخلاق، ویکره سفاسفها) بێگومان پەروەردگار رەوشتی بەرزی خۆش دەوێو رەوشتی پڕوپووچی ناخۆش دەوێ.

بوخاریو ئیبنو جەریرو ئیبنولمونذیرو طەبەرانیو حاکمو بەیهەقی لەئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت دەکەن: کە فەرموویەتی: گەورەترین ئایەت لەقورئاندا ﴿اللَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ە. جامیع ترین ئایەت لەقورئاندا بۆ خێرو شەڕ ئەو ئایەتەیە: کە لەسوڕەتی (النحل)دایە: کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ...﴾ رونترین ئایەتیش دەربارەی تەوککولو خۆسپاردن بەخودا ئایەتی ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً، وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾الطلاق/٢-٣.

ئایەتی ﴿يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً﴾الزمر/٥٣. لەهەموو ئایەتێکی قورئان زیاتر جێگای هیواو بەتەمابوونی رەحمەتی خودایە.

بەیهەقی لەباسی (شعب الایمان)دا دەفەرموێ: حەسەنی بەصری ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ...﴾ خوێندەوە پاشان فەرمووی: پەروەردگار هەرچی خێرو شەڕ هەیە لەیەك ئایەتدا کۆی کردۆتەوە، سوێندم بەخودا هەرچی عەدالەتکاریو طاعەتی خوداو ئیحسان هەیە کۆی کردۆتەوەو فەرمانی پێ کردوە،

هەرچی خراپەکاریو تاوانو ڕەوشتی ناشیرین هەیە کۆی کردۆتەوەو نەهی لێکرد وە.

**بەکورتی:**

ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەبنەمای سەرەکی کۆمەڵگای ئیسلامی دەژمێردرێن، کۆڵەکەی ژیانی کۆمەڵگای ئیسلامینو یاسای ژیانی ئادەمیزادن.

لەئایەتی یەکەمدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾ پەروەردگار لەم کتێبەدا کە بۆ تۆی نازڵ کردوە ئەی پێغەمبەر! فەرمان بەبەندەکانی دەکا: بەشێوەیەکی گشتی عەداڵەتکاریو ویژدان بەکار بێنن لەهەموو شتێکدا؛ لەمامەڵە کردنو دادگایی کردنو فرمانڕەواییو هەڵسو کەوتی ڕۆژانەتاندا، لەبیرو باوەڕو خوداپەرستیو هەڵسو کەوتکردن لەگەڵ خۆتانو غەیری خۆتاندا!

ویژدان بەکار بێنن لەعیبادەتدا، کەسێك شیاوی پەرستن نیە بەندایەتی بۆ مەکەن، جگە لەخودا پەرستشو دوعاو پاڕانەوەتان ئاڕاستەی کەسی تر مەکەن، چونکە جگە لەپەروەردگار کەسی تر بەحەقو عەداڵەت شیاوی پەرستنو بەندایەتی بۆ کردن نیە، ئەو شتانەی بەناحەق بەخودا زانراونو بەخودا حسێب کراون وەکوو بتو صەنەمو ئەستێرەو فریشتەو پێغەمبەران و پیاوچاکانو سەرۆکەکان، هیچیان شیاوی خودایەتی نین، بەندایەتییان بۆ مەکەن بۆ خۆیان بەندەی خودان، نابرێنە ریزی تەقدیسی خوداییەوە! بۆیە ئیبنو عەبباس دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالعَدْلِ﴾ فەرمووی: (شهادة ان لا اله الا الله) واتە: خودا فەرمان دەکا بەوەی ئێوە شایەتی بدەن کە جگە لەخودای پیرۆزو باڵا دەست هیچ خودای تر نین!

ئیبنو ئەبی حاتەم لەموحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظییەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: ڕۆژێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بانگی کردم؛ فەرمووی: عەداڵەتکاریم

بۆ پێناسه بکه، وتم: به‌راستی پرسیارت له‌کارێکی گه‌وره‌و ئه‌سته‌م کرد، ئه‌تۆ شێوه‌ی هه‌ڵس‌و که‌وتت له‌گه‌ڵ ئاده‌میزادان به‌م جۆره بێ عه‌داڵه‌تکاری بۆ له‌خۆت پچوکتر وه‌کوو باوك وابه، بۆ له‌خۆت به‌ته‌مه‌ن تر وه‌کوو کوڕ وابه، بۆ هاوته‌مه‌نانی خۆت وه‌کوو برا وابه، له‌گه‌ڵ ئافره‌تیش هه‌مان هه‌ڵس‌و که‌وتت هه‌بێ، به‌گوێره‌ی تاوان‌و سه‌رپێچی سزای خه‌ڵك بده، سزایه‌کیان بده له‌گه‌ڵ جه‌سته‌یاندا بگونجێ، سزادانه‌که‌شت مه‌به‌ستی شه‌خصی تێدا نه‌بێ، رقی خۆتیان پێ نه‌رێژی نه‌وه‌کوو بچیه ریزی سنور به‌زێنانه‌وه. جا هه‌ر کاتێ تۆ ئاوا هه‌ڵس‌و که‌وتت کرد، ئه‌وه عه‌داڵه‌تکاریت ئه‌نجام داوه.

ئیمامی بوخاری له‌تاریخه‌که‌یدا سه‌رگورشته‌یه‌ك ده‌گێڕێته‌وه ده‌فه‌رموێ: عه‌لی کوڕی ئه‌بو طالیب به‌لای کۆمه‌ڵێك ئاده‌میزاددا تێپه‌ڕی وتووێژیان بوو، فه‌رمووی: ئه‌وه ده‌رباره‌ی چی ده‌دوێن؟ وتیان: باسی پیاوه‌تی‌و شکۆمه‌ندی ده‌که‌ین. فه‌رمووی: جا ئه‌وه‌ی له‌قورئانه‌دایه به‌ستان نیه که ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾؟

عه‌دل: ویژدان به‌کارهێنانه‌و. ئیحسان: چاکه‌کارییه له‌هه‌موو شتێکدا، ئیتر له‌مه زیاتر چی هه‌یه؟

به‌رزترین پله‌ی ئیحسان‌و چاکه‌کاری ئه‌وه‌یه: تۆ چاکه له‌گه‌ڵ که‌سێك بکه‌ی: که خراپه‌ی له‌گه‌ڵ کردبی، پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌فه‌رمووده‌ی خۆیدا فه‌رمانی به‌ئه‌نجامدانی ئه‌م جۆره ئیحسانه کردوه، فه‌رموویه‌تی: (وأحسن الى من أساء اليك تكن مسلما).

ئیمامی شیعبی ریوایه‌تی کردوه ده‌ڵێ: حه‌زره‌تی عیسا فه‌رموویه‌تی: (ئیحسان ئه‌وه‌یه: ئه‌تۆ چاکه بکه‌ی له‌گه‌ڵ که‌سێك که خراپه‌ی له‌گه‌ڵ کردوی،

ئیحسان بریتی نیه لەوە تۆ چاکە بکەی لەگەڵ کەسێکدا کە چاکەی لەگەڵ کرد بێ).

لەصەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا فەرموودەیەك هەیە عەبدولای کوڕی عومەر ﷺ ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الاحسان ان تعبد الله كأنك تراه، فان لم تكن تراه فانه يراك). چاکەکاری ئەوەیە: وا بەندایەتی بۆ خودا بکەی وابزانی تۆ چاوت لەخودایە. خۆ ئەگەر تۆ خودا نەبینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ!

سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ: عەدالەتکاری لەم شوێنەدا بریتییە لەوەی تۆ کە ئیشێك بۆ خودا دەکەی ئاشکراو پەنامەکیت وەکوو یەك وا بێ، ئیحسان ئەوەیە پەنامەکییەکە لەئاشکراکە جوان تر بێ‌و دڵسۆزی تێدا بێ. فەحشاو مونکەریش ئەوەیە: بەپێچەوانەی ئیحسانەوە بێ. واتە: رووە ئاشکراکەی لەنهێنییەکەی جوانتر بێ.

وەکوو گوترا: ئیحسان هەموو کارێکی خێرو باش دەگرێتەوە، جا ئەو کارە باشە دەربارەی پەیوەندی نێوان بەندەو خودا بێ، یان پەیوەندی نێوان خێزان‌و کۆمەڵ بێ، یان دەربارەی پەیوەندی بەکۆمەڵی ئادەمیزادەوە هەبێ بەگشتی؛ بۆیە دوا بەدوای فەرمان بەعەدالەت‌و ئیحسان فەرمووی: ﴿وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى﴾ واتە: خودا فەرمان دەکا بەبەندەکانی کە یارمەتی خزم و کەس‌و کاریان بدەن‌و ماڵیان پێ ببەخشن. کەوابوو بەشێکی گرنگ لەئیحسان، ئەوەیە: چاکە لەگەڵ خزم‌و کەس‌و کار بکەی! جا چاکە کردنەکە بەهاتووچۆو دیدەنی کردنیان بێ، یان بەیارمەتیدان‌و ماڵبەخشین بێ پێیان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ﴾الاسراء/٢٦.

بۆیــەش بەتایبــەتی نــاوی دەســگیرۆ کردنــی خــزم‌و کــەس‌و کــاری هێنــا، هەرچەندە بەشێکە لەئیحسان‌و وەکوو تیکرار وایە، تا ئاگادارمان بکاتـەوە: کـە ئـەم جۆرە چاکەیە گەلێ گەورەو پیرۆزەو پێویستە گرنگی پێ بدرێ‌و هەرگیز پاشگوێ نەخەین، هەڵبەتە ئەم جۆرە کۆمەکی کردنە بەخزم‌و کەس‌و کار ناچێتە خانـەی دەمــارگیری خێلایــەتی‌و عەشــرەتگەرییەوە، ئەمــە بــەردی بنــچینەی تــەکافول‌و هاریکارییــە، ئیــسلام دەیکاتــە بناغــەو لــەوێوە پــەل دەهـاوێ بــۆ مــوحیطی عـام‌و تەکافولی کۆمەڵایەتی دادەمەزرێنی‌و گەشەی پێ دەکا.

﴿وَيَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ﴾ هـەروەها نـەهی دەکـا لـەداوێن پیـسی‌و کاری ناسروشتی‌و ستەمکاری.

وشەی (الفحشاء) هـەموو کـارێکی ناشـیرین‌و سـنوور شـکێنی دەگرێتـەوە، وەلێ زوربـەی کـات تایبـەت دەکـرێ بـەداوێن پیـسییەوە بـۆ دەست درێـژ کـردن بـۆ سـەر نامووسی خەڵك، بەکاردێندرێ!

وشـەی (المنكـر)یـش هـەموو کـارێکی ناسروشـتی‌و ناشـیرین دەگرێتـەوە، هـەر شـتێك سروشــتی ســەلیم بەناشـیرینی بزانــێ شــەرعیش بەناشـیرنی حلێـب دەکـا، کەوابوو ئایینی ئیسلام ئایینی فیطرەتە هەر کاتێ سروشت تێك چوو لەسـەنتەری خۆی لای دا شەریعەت ناگۆڕێ‌و لەسەر شێوەی خـۆی دەمێنێتـەوە، پێویـستە هـەوڵ بدرێ سروشتەکە بگێڕدرێتەوە بۆ سەر رێبازی راستەقینەی خۆی.

وشەی (البغي) بەمانا ستەمکاری‌و لادان لەحەق‌و عەدالەتە.

هەنـدێ لەموفەسـسرین فەرموویانـە: فەحـشا ئـەو شـتە یاسـاغکراوانەن: کـە دەبنــە هــۆی روخانــدنی ئــەخلاق‌و رەوشــتی کۆمــەڵ: وەکــوو زینــاو دزی‌و مەیخواردنەوەو وەرگرتنی ماڵی خەڵکی بەناڕەوا.

مونکەریش بریتییە: لەهەر کارو کردەوەیەك: کە شەرعو عەقڵ بەناشیرینی دابنێن، وەکوو کوشتنو لێدانو ئەزیەتی خەڵك بەناڕەوا.

بەغیی: بریتییە لەستەمکردنو دەستدرێژیکردن بۆ سەر خەڵك!

ئیمام ئەحمەدو ئەبو داوودو تیرمیذیو ئیبنو ماجەو هی تریش لە(أبو بكرة)وە فەرموودەیەك ریوایەت دەکەن: دەفەرموێ: (مامن ذنب أجدر أن يعجل الله تعالى لصاحبه العقوبة في الدنيا، مع مايدخر لصاحبه في الآخرة من البغي وقطيعة الرحم) هیچ تاوانێك ئەوەندە شیاو نیە: کە خودا پەلە بکا لەسزادانی خاوەنەکەی لەدونیادا وێڕای سزای سەختی قیامەت بەئەندازەی تاوانی بەغیو پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

## بەکورتی:

عەداڵەت بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانەو ئیحسان زیاد کردنە تێیدا. فەحشاو مونکەرو بەغیی سنوور بەزێنی شەرعو عەقڵی سەلیمە.

هەرچەندە هەوڵ بدرێ بەچاوڕاو شتی ناشیرینو ناسروشتی لەپێش چاو جوان بکرێ، سروشتی ئادەمیزاد پاش ماوەیەك دژیان دەوەستێو رەتیان دەکاتەوە، چەندێك هۆکاری روخێنەر بەهێز بکرێن، بەهێز ببن، ملهوڕو ستەمکاران هەوڵی مانەوەو جێگیربوونیان بدەن بۆ ماوەیەکەو زۆری پێ ناچێ کە سروشتی ئادەمیزاد دژیان دەوەستێو شۆڕشیان لەدژ بەرپا دەکا. مێژووی ژیانی ئادەمیزاد سەرلەبەری راپەڕینو شۆڕشو بەگژداچونەوەیە. دژی فەحشاو مونکەرو بەغی، دژی کاری ناسروشتیو نەگونجاو لەگەڵ فیترەتی سەلیمدا.

کەوابێ گرنگ نیە ئەگەر لەسەردەمێکداو بۆ ماوەیەك دەوڵەتو فرمانڕەوا لەسەر بناغەی فەحشاو مونکەرو بەغیی دابمەزرێن، تەنانەت ئەگەر زوربەی

کاتیش فرمانڕەوایی‌و دەسەڵات لەسەر ئەو بنەمایانە دابمەزرێن، مانای ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو باروذۆخە گونجاوەو بە کەڵکی ئەوە دێن کۆمەڵگای ئادەمیزادیان پێ بەڕێوە بچن! نەخەیر نابێ بەوە هەڵخەڵەتێین، چونکە بەگژدا چوونەوەی سروشتی ئادەمیزاد بۆ ئەو بنەمایانە نیشانەی ئەوەیە: ئەو شتانە جیسمی نامۆن لەگەڵ سروشتی سەلیمدا بەکەڵکی ژیان نایەن، ژیان تێك دەدەن، کۆمەڵگا دەڕوخێنن، میکرۆبن‌و دەبێ قەڵاچۆ بکرێن، دەبێ بەهەموو هێزو توانامانەوە دژیان بوەستین!! فەحشاو مونکەرو بەغیی شێرپەنجەی کۆمەڵایەتین‌و نابێ بهێڵدرێ بنج داکوتن، ئەگینا دەردی دژوار تووشی کۆمەڵگا دەبێ‌و دەرمانی زەحمەت دەبێ. وێرانی وڵات‌و روخانی ئەخلاق‌و تێکچونی کۆمەڵگای لێ دەکەوێتەوە. فەرمان بەعەدالەت‌و ئیحسان‌و جڵەوگیری لەفەحشاو مونکەرو بەغی گونجاوو لەبارە بۆ فیطرەتی سەلیم‌و بەهێزی دەکا. بۆیە لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ:

﴿يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ پەروەردگار ئامۆژگاریتان دەکا بەڵکوو بیر بکەنەوە تێبفکرن، بەخۆتاندا بچنەوە، بەگوێرەی سروشتی سەلیم هەڵس‌و کەوت بکەن، نەهێڵن فایرۆسی روخێنەر تووشی کۆمەڵگای ئادەمیزاد بێ.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی بەشێوەیەکی کورت ئاراستە کردن‌و فەرمانی دا بەپەیڕەوکردنیان، دەگەڕێتەوە بۆ سەریان‌و بەتایبەتی ناوی هەندێکیان دەهێنێ‌و سەرەتا باسی وەفا بەوادە دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ﴾ پابەندی عەهدو پەیمانی خۆتان بن‌و لێیان پاشگەزمەبنەوە. بتمانەی خۆتان مەدۆڕێنن، چاودێری پەیمانی سوێند لەسەر خوراوی خۆتان بن، ئاگاتان لەو پەیمانە بێ: کە لەگەڵ خودادا بەستوتانە، هەوڵ بدەن سەر لەبەر ئەحکامی ئیسلامی تەطبیق بکەن، هەر عەهدو پەیمانێکتان خستە سەرشانی خۆتان پابەندی بن‌و پشتی لێ هەڵ مەکەن، بۆ ئەوەی بتمانەتان

بەیەکتر بەهێز ببێ، چونکە بەبێ هەبوونی ئەم جۆرە ئیقەیە کۆمەڵگای بەختەوەر پێك نایە، ژیانی کامەرانی بۆ ئادەمیزاد دەستەبەر نابێ.

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر پابەند بوون بەوادەو پەیمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلا تَنقُضُوا الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ خۆتان بپارێزن لەپەیمانشکێنی نەچن ئەو عەهدو پەیمانەی لەسەر ئایین بەستوتانەو بەناوی خودا جەختتان لەسەر کردوە هەڵی بوەشێننەوە لێی پاشگەز ببنەوە، لەملی خۆتانی داماڵن.

﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً﴾ ئێوە پەیمانتان داوە خوداتان کردوە بەشایەدو بەرعۆدە لەسەر پەیمانەکانتان، کەوابێ پابەندبن پێیانەوەو هەڵیان مەوەشێننەوە. خودا لەخۆتان مەڕەنجێنن، هەڵبەتە مەبەست بەعەهدو پەیمان لێرەدا ئەو عەهدو پەیمانانەیە کە ئادەمیزاد لەناو خۆیاندا دەیانبەستن بۆ چەسپاندنی حەق و رەتکردنەوەی ستەم و زۆرداری. وەکوو ئەوپەیمان و عەهدەی قورەیش کە لەپێش هاتنی ئیسلامدا قورەیشییەکان لەمەککە بەستیان، ئەوەبوو: هەموو تیرەو بنەماڵەی قورەیشییەکان لەماڵی عەبدوڵای کوڕی جودعاندا کۆبوونەوەو پەیمانیان بەستو گفتیان بەیەکتری دا: کە ستەم لێکراوێکیان لەمەککەدا بینی مەککەیی بێ یان مەککەیی نەبێ، یارمەتی بدەن و کۆمەگی پێ بکەن تا ستەمەکەی لەسەر لادەبەن و مافی زەوت کراوی بۆ وەردەگرنەوە، قورەیشییەکان ئەم پەیمانەیان ناونا (حلف الفضول) واتە پەیمانی رەوشت بەرزی.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ کە بۆ خۆی چاودێری عەهدو پەیمانەکانە ئاگای لەهەڵس و کەوتی پەیمان بەستووەکان هەیەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ واتە: بێگومان! خودا ئاگادارو چاودێری هەموو کارو کردەوەیەکتانە، دەزانێ چی دەکەن و چی ناکەن، چاوی لێتانە ئاخۆ پابەندی عەهدو پەیمانەکانتان دەبن، یان لێیان پاشگەز دەبنەوە، هەموو شتێکتان لەسەر دەژمێرێ و پاداش و سزاتان لەسەری دەداتەوە، ئەگەر پابەندیان بن و وەفا بەوادەو

بەڵێنی خۆتان بکەن، پاداشتان دەداتەوە، ئەگەر لێیان پاشگەز ببنەوە لێتان ناڕازی دەبێ واتە بەگوێرەی کردەوەتان عیقابو سزای پڕاوپڕتان دەداتەوە. ئەمە بەتەماکردنو وادەدانە بەوانەی پابەندی پەیمانەکانیان دەبن، هەڕەشەیە لەسەرپێچیکارانو ئەوانەی پابەندی بەڵێنی خۆیان نابن.

ئەمجار بۆ سییەم جار جەختی یاساغیو حەرامی پەیمانشکێنی کردەوەو فەرمووی: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا﴾ نەچن لەپەیمانشکێنیو پاشگەزبوونەوە لەوادەو بەڵێندا وەکوو ئەو ئافرەتە وا بن: کە ڕێسراوەکەی خۆی دەکردەوە بەخوری، دوای ئەوەی خوریو مووی خۆی دەڕستو بەکەڵکی ئەوە دەهات بکرێتە رایەڵو پۆو کەرستەی پێویستی لێ دروست بکرێ، دەهات سەرلەنوێ خاوی دەکردەوەو دەیکردەوە بەخوریو وەکوو خۆی لێدەکردەوە. واتە: سوودی لەکارەکەی نەدەبینی! هەر کەسێ عەهدو پەیمانی خۆی هەڵوەشێنێتەوە وەکوو ئافرەتێکی شێتو وێتی کەم عەقڵو کەودەنو هیچ لەبارا نەبووی خوێریلە وایە ریسەکەی دەڕێسێ پاشان تاڵ تاڵ خاوی دەکاتەوەو هەڵیدەوەشێنێتەوە!

هەڵبەتە ئادەمیزادێك عەقڵو هۆشی هەبێ، رێزی خۆیو خەڵکی دی بگرێ، کەسایەتی خۆی بپارێزێ، رازی نابێو ڕێگا بەخۆی نادا هەڵسو کەوتی بێ سوودی وەکوو ئەو ئافرەتە بێ عەقڵە رەنج بەخەسارە بکا، رازی نابێ ژیانی خۆی لەشتی بێ سوودو بێهودەدا بەسەر بەرێ!

عەبدوڵای‌کوڕی کەثیرو سوددی دەڵێن: ئەمە ئافرەتێکی شێتی بێ عەقڵ و ئەحمەق بوو خەڵکی مەککە بوو ناوی رەبطە بوو کچی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕ تەیمی کوڕی موڕڕەبوو هەر کە خوریو مووی دەڕست دوایی خاوی دەکردەوەو هەڵیدەوەشاندەوە...

موجاهیدو هی تریش دەڵێن: ئەمە نموونەو مەثەل هێنانەوەیە بۆ کەسێك پەیمانشکێن بێ. کەسێك لەعەهدو پەیمانی خۆی پاشگەز ببێتەوە وەکوو ئافرەتێك وایە ریسەکەی بکاتەوە بەخوری، واتە: کردەوەکانی کردەوەی ئادەمیزادی هۆشمەندو رێزدار نیە.

﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ أَنْ تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ﴾ وەکوو ریوایەتکراوە هەندێ لەعەرەبەکان: کە لەگەڵ پێغەمبەردا پەیمانیان دەبەستو دوایی هەڵیان دەوەشاندەوە، بیانوویان ئەوەبوو، دەیانگوت: پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵی دان کەمو بێ هێزن، قورەیشییەکان زۆرو بەهێزن، ناچار بووین لەپەیمانەکەمان پاشگەزببینەوە. واتە: وەکوو ئەو ئافرەتە بێ عەقڵە مەبن ریسی خۆتان بکەنەوە بەخوریو عەهدو پەیمانی سوێند لەسەر خوراوو جەخت لەسەر کراوی خۆتان هەڵبوەشێننەوە، سوێندو پەیمانەکانتان بکەنە هۆکاری فرتو فێڵو پاشقول گرتن لەلایەنی بەرامبەرتانو لەوادەو بەڵێنی خۆتان پاشگەزببنەوە لەبەر ئەوەی کۆمەڵێکی تر هەیە بەهێزترو زۆرترن بچن پەیمان لەگەڵ ئەواندا ببەستن واز لەهاوپەیمانی پێشووتان بێنن!

موجاهید دەڵێ: عەرەبەکان دابو نەرێتیان وابوو: کەلەگەڵ یەکێك پەیمانیان دەبەستو دەبوونە سوێند خۆری یەکتری، پاشان ئەگەر یەکێکی تریان دەست کەوتایە لەم کابرا هاوپەیمانەی خۆیان بەهێز تربوایە، لەپەیمانەکەیان پاشگەز دەبوونەوەو دەچوون لەگەڵ ئەم کابرا بەهێزەدا پەیمانیان دەبەست! جا بەم ئایەتە جڵەوگیرییان لێ کرا!

هەندێك پێیان وایە: ئایەتەکە رودەکاتە موسوڵمانانو لەوە دەیانترسێنێ: کە بەزۆریو بەهێزی قورەیشییەکان هەڵنەخەڵەتێنو نەچن پەیمانی دابەستراویان لەگەڵ پێغەمبەردا هەڵبوەشێننەوە. بەکورتی ئایەتەکە فەرمان بەموسوڵمانان دەکا: کە پابەندی عەهدو پەیمانی خۆیان بن بەهیچ جۆرێ پەیمانشکێنی نەکەن!

هەر لەروانگەی ئەم ئایەتەدا ئەگەر وڵاتێکی ئیسلامی، یان پارتێکی ئیسلامی لەگەڵ وڵاتێکی تر یان حیزبێکی تردا پەیمانی بەستو موعاهەدەیان مۆر کرد نابێ پەیمانەکەیان بشکێنن لەبەر ئەوەی کە وڵاتێکی تر یان حیزبێکی تریان دەست کەوتووە لەهاوپەیمانی پێشوویان زۆر ترو بەهێزترە لەپەیمانەکەیان پاشگەز ببنەوە بەم بیانوە گوایە بەرژەوەندی وڵات یان حیزب لەوەدایە!!

هەرگیز ئایینی ئیسلام بیانووی ئاوا پەسند ناکا، رازی نیە بۆ ئەم جۆرە مەبەستانەو بەم بیانوانە پەیمانی جەخت لەسەرکراوو مۆرکراو پاشگوێ بخرێ. ئیسلام بێ پێچو پەنا فەرمان دەکاو جەخت لەسەر پابەند بوون بەپەیمانو موعاهەدەی دابەستراو مۆر کراو دەکاتەوە!!

رازی نابێ سوێندو پەیمان بکرێنە هۆکارو وەسیلە بۆ پاشقول لەیەکتری گرتن، هەر نەتەوەو کەسێك پەیمانی لەگەڵ موسوڵمانان بەست دەبێ دڵنیابن: کە پەیمانیان پارێزراوەو فرتو فێڵی تێدا نیە. چونکە ئیسلام هەرگیز پەیمانو هاریکاری پەسند ناکا ئەگەر لەسەر بنچینەی (بر)و (تەقوا) نەبێ، هەر کاتێکیش پەیمانەکە لەسەر بنەمای (بر)و(تەقوا) بوو دەبێ پێیەوە پابەند بنو بەهیچ شێوەیەكو بۆ هیچ بەرژەوەندییەك لێی پاشگەز نەبنەوە.

ئیسلام رێگە نادا پەیمانو موعاهەدە ببەستن لەسەر خراپەکاریو تاوانو فیسقو فجور، رێگە نادا پەیمان ببەسترین بۆ داگیر کردنی ماڵو وڵاتی کەسانی دیکەو بۆ چەوساندنەوەی گەلو نەتەوەی تر، بۆ دابەشکردنو بەشبەشکردنی زێدو نیشتمانی گەلو نەتەوەی تر! لەسەر ئەم بنەمایەو بەم پێیە یەکەم کۆمەڵی موسوڵمانان هاتە کایەوەو بەگوێرەی ئەم یاسا خوداییە یەکەم حکوومەتی ئیسلامی لەسەر دەستی پێغەمبەری خودا لەمەدینە دامەزرا، لەژێر سایەی ئەم یاسایەدا جیهان نیعمەتی دڵنیاییو بتمانە بەیەکبوونی بەخۆوە بینی، ئادەمیزادان لەمامەڵەو هەڵسو کەوت لەگەڵ یەکتریاندا بتمانەیان بەیەکتر دەکرد، هاریکارو

هەمئاهـەنگی یـەکتر بـوون، کۆمەڵگایـەکی نموونـەییان هێنایـە کایـەوە، تـا سـەرکردایەتی ئـادەمیزاد بەدەسـت ئیـسلامەوە بـوو خۆشـبەختیو کامـەرانیو دڵنیـاییو بتمانـە بەیـەك کـردن لـەناو موسـوڵماناندا بـاڵی خـۆی بەسـەر جیهـانی ئیسلامیدا کێشابوو، هەر کاتێکیش فرمانڕەوایی بێتەوە ژێر دەستی ئیسلامو یاسای قورئان بەرقەرار بێو کاری پێ بکرێ، هەمان ئارامیو دڵنیاییو بتمانە بەیەککردن دێتەوە کایە!!

﴿إِنَّمَـا يَبْلُـوكُمْ اللَّـهُ بِـهِ﴾ هـەبوونی ئـەو حاڵەتـەو جـوداوازی نێـوان گـەلو نەتەوەکان لەبارەی زۆریو هێزو تواناوە بۆ تاقیکردنەوەی ئێوەیە، بۆ ئەوەی خـودا دەری بخـا تـا چ ئەندازەیـەك ئێـوە ئـیرادەو عەزیمـەتتان هەیـە، تـا چـەند پابەنـدی وادەو بەڵێنـەکانتان دەبـن، چـۆن ڕێـزی قـسەو عەهـدی خۆتـان دەگـرنو، خۆتـان دەپـارێزن لەپەیمانـشکێنی؛ ئـەو پەیمانـەی خوداتـان کـردوە بەشـایەد بەسـەریەوەو بەسوێند جەختتان لەسەر کردۆتەوە.

ئەمجار هەڕەشە لەوانە دەکا: کە دژی حەق دەوەستنو یارمەتی بـەتاڵ دەدەنو بانگەشەی بۆ دەکەن! دەفەرموێ:

﴿وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَا كُنْتُمْ فِيـهِ تَخْتَلِفُـونَ﴾ بێگومـان پـەروەردگار ڕۆژی قیامەت ئەوەی تێیداکەوتوونە خیلافەوە بۆتـان ڕون دەکاتـەوە، ڕاستو درۆتـان بـۆ ئاشـکرا دەبـن حـەقو بـەتاڵتان بـۆ دەردەکـەون، دەزانـن یەکتاپەرسـتیو پێغەمبەرایـەتیو زیندووبوونـەوە حەقیقـەتنو بـیرو بـاوەڕی موسـوڵمانان ڕاسـتەو هۆکاری بەختەوەرییە. بیرو باوەڕی پێچەوانەش مایەی نەگبەتییە.

ئەو خیلافـو نیزاعەی نێوان گرۆهـانی ئـادەمیزادو بڕیـار دەربارەیـان عائیـد بەخودایـەو ئـەو ڕۆژی قیامـەت دادگـایی نێوانیـان دەکـاو هـەر کەسـە بـەگوێرەی کـردەوەو بـیرو بـاوەڕی خـۆی سـزاو پاداشـی دەدرێتـەوە. کـەوابوو وەفـا بەعەهـدو

پـەیمانی خۆتـان بکـەن، تەنانـەت لەگـەڵ ئەوانـەشدا؛ کـە هـاوبیرو باوڕتـان نـین. لەعەقیدەو راو بۆچوندا دژتانن.

﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِنْ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَلَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ خۆ ئەگەر خودا بیویستایە ئادەمیزادانی هەموو دەکردنـە یـەك گەلو نەتەوە، لەهەموویاندا ئامادەباشی ئیمانهێنـانی تێدا دروسـت دەکـردن، وەلێ ویـستی وانـەبوە، هەریەکـەو ئامادەباشـی جـودای خـۆی هەیـە، هـەر کەسـەو بـیرو باوەڕێکی هەیە، نوسخەی دووبارە بووەی یەکتر نـین، بـۆ هیدایـەتو گومڕابـوونیش یاساو نیظامی خۆی داناوە، بـەگوێرەی ئـەو قـانونو یاسایە ویـستی ئادەمیزادەکـان بەرێوە دەچێ، هەر کەسە بەرپرسیارە لەکارو گوفتاری خۆی. جیـاوازی بـیرو بـاوەڕ نابێ ببێتە هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی وەعدو پەیمان، جوداوازی بیرو باوەڕ هۆکـاری پەیوەست بەویستی خوداوەی هەیە، جوداوازی نێوان گرۆهەکانی ئـادەمیزاد شـتێکە پابەندە بەویستی پەروەردگارەوەو ئەو سروشتی وا دارشتون! عەهدو پـەیمان نـابێ بشکێندرێن هەرچەندە بیرو باوەڕی هاوپەیمانەکان جیاوازی تێدا بێ!

بەراسـتی ئـەم یاسـایەی ئـایین دەربـارەی عەهـدو پـەیمان وەکـوو هـەموو یاساکانی تری لەترۆپکی بـەرزیو خـاوێنی دایـەو ئەوپـەڕی چاوپۆشـی سـەماحەتی تێدایە، هیچ یاساو نیزامێك جگە لەئیسلام نەیتوانیوە بەرجەستەی بکا!!

بـەکورتی ئەگـەر خـودا بیویـستایە هـەموو ئـادەمیزادی لەسـەر یەکـدین کـۆ دەکردنـەوە، سروشـتی وا دادەڕشـتن هـەموویان وەکـوو فریـشتە خـودا پەرسـتو فەرمانبـەردار دەبـوون، کـەس کەسـی نـەدەدزاو دژایـەتیو رقو کینـە لـەناویاندا نـەدەبوو، بـەڵام بڵـێین چـی حیکمـەتی خـودا داخـوازی ئـەوە نـەبوەو بـەو جـۆرە سروشتی ئادەمیزادی دانەڕشتووە!

حیکمـەتی خـودا داخـوازی ئـەوە بـووە ئێـوە وا دروسـت بکـا: کـە لـەکردەوەو باوەڕدا، لەپابەند بوون بەفەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودادا جوداوازیتـان تێـدا بـێ،

ئامادەباشیو بیرو بۆچوونتان جیاواز بێ، بۆخۆتان بەویستی خۆتان عەقیدەو کردەوەتان هەڵبژێرن، جا کەسێك ڕێبازی گومڕایی هەڵبژێرێ ئەوە خودا گومڕای دەکا کەسێکیش ڕێبازی هیدایەت پەسند بکا خودا هیدایەتی دەدا! نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً﴾یونس/٩٩. دەی بۆچی خودا ئەم مەشیئەتەی نەبوە؟ بۆ ئاوای کردوەو وای نەکردوە؟ ئەوە ئێمە تێ یدا کۆڵین.

دوا ئەوەی پەروەردگار ئادەمیزادانی ترساند لەپەیمانشکێنی بەشێوەیەکی گشتی، ئەمجار لەپەیمانشکێنی تایبەتی دەیانترسێنێ: ئەویش بریتی بوو لەپەیمانو بەیعەت بەستن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ:

﴿وَلا تَتَّخِذُوا أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ﴾ پەیمانو سوێندخۆریتان مەکەنە هۆکارو فرتو فێڵ بۆ لەخشتە بردنی خەڵك. مەبەست جڵەوگیریکردنە لەپەیمانشکێنی تایبەتی، ئەوەبوو هەندێ لەعەرەبەکان بەیعەتیان بەپێغەمبەر ﷺ کردبوو، لەسەر ئیسلامو سوێندیان خواردبوو، پاشان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە لەبەر کەمی دارو دەستەی پێغەمبەرو زۆریی موشریکەکان، ئیتر بەم ئایەتە جڵەوگیریان لێ کرا. پێیانی فەرمو: پەیمانەکانتان مەکەنە هۆکاری فرتو فێڵو هەڵخەڵەتاندن.

﴿فَتَزِلَّ قَدَمٌ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا السُّوءَ بِمَا صَدَدْتُمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ نەوەکوو بەم کردەوەتان قاچتان بخزێو بەرەو زلکاوی گومڕایی ڕەهێڵ بن، دوای ئەوەی لەسەر پێتەختی ئیستیقامەتو بیرو باوەڕی راستو پەسند جێگیر بووە، ئێوە ئەگەر پەیمانو عەهدەکانتان بکەنە هۆکاری فرتو فێڵو، سێ تاوانی گەورە ئەنجام دەدەنو دەکەونە سێ هەڵەی گەورەوە:

١- گومڕا دەبن‌و لەرێگەی حەق‌و هیدایەت دوور دەکەونەوە، پاش ئەوەی قاچتان لەپێتەختی هیدایەتدا جێگیر بووە، هەڵدەخلیسکێن‌و دەکەونە ناو زلکاوی گومراییەوە!

٢- ئێوە دەبنە پێشەوای خراپەو خەڵکی تر چاوتان لێدەکا و دەبنە گومڕاو گومڕاکەر، بەمەش لەدونیادا سزای توندو بەئێشتان دەدرێ؛ دەکوژرێن، دیل دەکرێن، ماڵتان لێ دەسەندرێ، لەزێدو نیشتمانی خۆتان وەدەر دەنرێن!

٣- لەقیامەتیشدا سزای بەئێشتان دەدرێ لەسەر ئەو ناحەقیکاریەتان‌و وازهێنانتان لەپێڕو کۆمەڵی خودا پەرست‌و هیدایەتدراوو چونە ناو تاقمی گومڕاو سەرلێ شێواو، سزاکەتان سزای ئاگری دۆزەخە! خۆتانی بۆ حازر بکەن!!

ئەمجار جارێکی تر پەروەردگار هەڕەشەی خۆی دووبارە دەکاتەوەو جڵەوگیری لەپەیمانشکێنی جەخت دەکاتەوە. دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَشْتَرُوا بِعَهْدِ اللَّهِ ثَمَناً قَلِيلاً﴾ ئێوە نەچن لەجیاتی ئیمان بەخوداو پابەند بوون بەعەهدو پەیمان، کاڵایەکی دونیایی کەمبایەخ وەربگرن. واز لەو مامەڵەیە بێنن، خۆتان خەسارەتمەندو ماڵوێران مەکەن!

بێگومان ئەمە ئاماژەیە بەوە: کە چەند تیرەو خێڵێك لەعەرەبەکان لەمەککە ئیمانیان هێنابوو بەیعەت‌و گفتیان بەپێغەمبەر دابوو، پاشان شەیتان لەخشتەی بردن‌و پاشگەز بوونەوە، کەمی‌و بێ هێزی موسوڵمانەکان‌و زۆری‌و بەهێزیی قورەیشییەکان ترساندنی‌و وای لێکردن پەیمانەکەیان لەگەڵ پێغەمبەر هەڵبوەشێننەوە. لەلایەکی ترەوە قورەیشییەکان پشی پشییان دەکردن‌و وادەی بەخشش‌و عەطایان پێ دەدان بەمەرجێ لەئیسلام پاشگەز ببنەوە. جا پەروەردگار بەم ئایەتە ئاگاداری کردنەوەو جڵەوگیری لێ کردن لەوەی خێرو خۆشی نەبڕاوەی قیامەت بگۆڕنەوە بەکاڵای کەم‌و کەمبایەخی دونیایی!!

﴿إِنَّمَا عِنْدَ اللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ!﴾ ئەوەی خودا بۆ خوداپەرستانی داناوە لەقیامەتدا لەپاداش و نازو نیعمەتی نەبڕاوە زۆر باشترو پیرۆز ترە لەو کالاّ کەم و بێ نرخەی دونیا، ئەگەر ئێوە شعوری ئەوەتان هەبێ جوداوازی نێوان خێرو خۆشی نەبڕاوەی قیامەت وکالاّی دونیای کەمخایەن بکەن!

ئەگەر ئێوە خاوەن عەقڵ و فام بن دەزانن: جوداوازی نێوان نیعمەتی نەبڕاوەی قیامەت و پڕوپیتاڵی دونیایی چەندەو چۆنە! هەموو نازو نیعمەتی دونیا لەچاو کەمێك لەنیعمەتی قیامەت بەهیچ دادەنرێ،

چونکە ﴿مَا عِنْدَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ﴾ ئەوەی لاتانە لەنازو نیعمەتی دونیا، بەڵکوو هەموو دونیاو نیعمەتەکانی بەسەر دەچن و دەبڕێنەوەو کۆتاییان دێ، بەلاّم ئەوەی لای خودایە لەپاداشی بەهەشت بەردەوام و نەبڕاوەیەو قەتقەت کۆتایی نایە، ئاشکراشە شتی نەبڕاوەو هەتا هەتایی زۆر باشترو بەنرخترە لەشتی بڕاوەو کەمخایەن! کەوابێ هەوڵ بدەن و تێبکۆشن بۆ وەدەستهێنانی ئەوەی لای خودایەو لەپیناویدا خۆتان بەخت بکەن!

﴿وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سوێندبێ ئێمە پاداشی ئەوانە دەدەینەوە: کە بەصەبرو ئارامن لەسەر خودا پەرستی و خۆڕاگرن لەبەرامبەر ئەزیەتی کافرانداو پابەندی وادەو بەڵێنی خۆیان دەبن، پاداشی باشیان دەدەینەوە، پاداشێکی وا شیاوی ئەوان بێ و بەگوێرەی خۆڕاگرتنەکەیان بێ، ئەگەر رۆژی سەد کاری خێر بکەن، کامیان لای خودا لەهەموان باشترە کردەوەکانی تریان بەتەرازوی ئەو کارە باشەیان کێشانە دەکەین!! سەرباری پاداشی باش و بەردەوام، لەخراپەکانیشیان خۆش دەبین!

بێگومـان پەیمانـشکێنیو پاشـگەزبوونەوە لـەوادەو بـەڵێن تـاوانێکی گـەورەو دەردێکـی کۆمەڵایـەتیو نەتەوەییـە! فـرتو فـێڵو پاشـقول لەیـەکگرتنو پـەیمان شـکاندن جێگـە بـەبیرو بـاوەڕ لـەق دەکـەن، شـێوەو روخـساری ئـەو کەسـە لـەدڵو دەروونی کەسانی دیکەدا ناشیرین دەکا.

کەسێك بەیعەت ببەستیو پەیمان مۆر بکاو خودا بکاتە شایەد لەسەر پابەند بـوون پێیـەوە، بـشزانێ کـە فـێڵ دەکـاو لـەدڵ دا بەتـەمایە لێـی پاشـگەز بێتـەوە، بـەکوردی سیاسـەت بکـاو لایـەنی بەرامبـەر هەڵخەڵەتێنێ، هـەرگیز بـیرو بـاوەڕی دانامەزرێو قاچی لەسەر رێبازی راست جێگیر نابێ. لەهـەمان کاتدا شـێوەی بـیرو بـاوەڕی خـۆی لـەلای ئەوانـەی پـەیمانیان لەگـەڵ دەبەسـتێ ناشـیرین دەکـاو دەزانـن پەیمانو وادەو بەڵێنەکانی بۆ فرتو فێڵە، بەمەش کەسانی دیکە لـەرێبازی ئیـسلام دوور دەخاتەوە، چونکە دەبێتە نموونەی خراپەو خەڵکی ساویلکەو بۆرە پیـاو ئـەو دەکەنە تەرازوی ئایینو لەروانگەی ئەم پیاوە خوارو خێچو پەیمانشکێنەوە سەیری ئایین دەکەنو دڵیان لەئیسلامو موسوڵمانان دەبێزرێ.

ئەگـەر سـەیری مێـژووی کـەوناڕای موسـوڵمانان بکـەین، دەبیـنین زۆر گـەلو نەتەوە بەهۆی وەفاداریو راسـتگۆیی موسـوڵمانانەوە موسـوڵمان بـوون، کاتێـك ئـەم گەلو نەتەوانە بینیویانە موسوڵمانەکان وەفا بەعەهـدو پـەیمانی خۆیـان دەکـەنو راسـتگۆو راسـتاڵن لەقـسەو کردەوەیـاندا، دڵـسۆزن بـۆ بـیرو باوەڕیـان، دەسـتپاكو دەروونپـاکن لەمامەڵـەو هـەڵسو کـەوتیاندا، ئـیتر ئـەو گـەلو نەتەوانـە: کـە ئـەم ئاکارانەیان لەموسوڵمانان بینیوە ئایینەکەیانیان بەدڵدا چووەو بێ لامجومی کـردن موسوڵمان بوونو هاتوونە ژێر ئاڵای (لا الـه الا الله محمـد رسـول الله)وەو لەپێناویـدا خۆیان بەخت کردوە.

بێگومـان ئایەتـەکانی قورئـانو فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ کاریگەرییـەکی وایان لەدڵی موسوڵمانانداا خولقاند، وەفا بەعەهدو پابەنـدبوون بـەوادەو بەڵێنـەوە لێیان بوو بەخویەکی سروشتیو تاكو کۆمەڵ تێیدا هاوبەش بوون.

مێـژوو بۆمـان دەگێڕێتـەوە: کـە لـەنێوان موعاوییـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیانو پاشـای رۆمدا پـەیمانێك هـەبوو، لـەئاخرو ئـۆخری مـاوەی پەیمانەکـەدا موعاوییـە بەلەشکرێکەوە هێرشی بردە سەریان، کـە مـاوەی پەیمانەکـە تـەواو بـوو موعاوییـە بـەخۆیو لەشـکریەوە دەس بـەکار بـوو شـوێنی سـتراتیژی خـستبوونە ژێـر دەسـتی خۆیەوەو خەریك بوو غافڵ گیریـان بکـاو پـەلاماریان بـدا! عومـەری کـوڕی عوتبـە وتی:

ئەڵڵاهو ئەکبەر ئەی موعاوییە! کوڕە پیاوەتیو وەفات هەبێ، پەیمانـشکێنیو غەدر واز لێ بێنە! من بۆخۆم لەپێغەمبەرم ژنەوتووە دەیفەرموو:

(من كان بينه وبين قوم أجل فلا يحلنّ عقده حتى ينقضي أحدها) کەسێك لـەنێوان ئـەوو گـەلو نەتەوەیـەکی تـردا عەهـدو پـەیمانی هـەبوو، بـا تامـاوەی دیاریکراو تێپەڕ نەکا پەیمانەکە هەڵنەوەشێنێتەوە.

ئیتر حەزرەتی موعاوییە یەکسەر لەشکرەکەی گێڕایەوە! ریوایەتی لەم جـۆرە دەربـارەی پارێزگـاریکردنی عەهـدو پـەیمان هەرچـەندە بەڕواڵـەت بەرژەوەنـدی لـە هەڵوەشـــــــــاندنەوەکەدا بـــــــــــەدی بکـــــــــــرێ، زۆرو

زەبەنــدەو مەشــهورو بــاون، ئــاینی پــیرۆزی ئیــسلام بــەهیچ جۆرێــك و بــۆهیچ مەبەستێك رێگە نادە پەیمان هەڵوەشێندرێتەوە.

بەهەموو جۆرێك هەوڵ دەدا ئادەمیزادان هــەڵنێ و گورو تینیــان پــێ بــدا بــۆ ئــەوەی وەفــا بەعەهــد بکــەن و ئــەرکی پابەنــد بــوون بەپــەیمان و وادەو بەڵێنــەوە لەخۆبگرن، بەصابیرو خۆڕاگریان حسێب دەکاو پاداشی صابیرانیش بێ ئەندازەیە!

## یەکسانی پیاو ئافرەت لەپاداش و کردەوەدا

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾

ئەم ئایەتە هەڵنانی پیاوو ئافرەتی تێدایە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان؛ ئەرکی واجب و سوننەت. دوای ئەوەی لەئایەتــەکانی پێــشوودا ئــادەمیزادانی هــەڵنان بۆ خۆڕاگری و پشوو درێژی لەسەر وەفا بەعەهدو پەیمان و بەجێهێنانی ئەرکەکانی سەرشانیان بەواجب و سوننەت و موباحــەوە. ئــەمجار هــەڵیان دەنــێ بــۆ ئەنجامــدانی هــەموو کــارێکی پەســندو بەســوود، هــەر کارێــك شــەریعەتی ئیــسلام پەســندی بکــا فەرمانیان پێ دەکاو هەڵیان دەنێ بۆ ئەنجامدانی!

یاسایەکی گشتی دادەنێ، یاسایەکی یەکسانی و عەدالەت ئامێز، یاسایەکی وەهــا پیاوو ئافرەت؛ ژن و مێرد، خوشك و برا تێیدا وەکوو یــەك ســەیر دەکــرێن و بەیــەك چاو تەماشا دەکرێن.

دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً﴾
واتە: هەر کەسێك كاری باش ئەنجام بدا لەنێرو لەمێ، وێڕای کردەوە باشەکانی خاوەن بڕوا بێ، یەکتاپەرست بێ پێی وا بێ پاداش‌و سزا هەیە، زیندو بوونەوە هەیە، ئەوە ئێمە دەیژێنین بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك؛ ژیانێکی پاك‌و خاوێنی پێ دەدەین ڕازی دەبێ بەو بەش‌و بارەی خودا بۆی دیاری کردوەو پێی داوە، دەزانێ خودا خاوەن ئیحسان‌و زاناو دانایە، چی داوەتێ هەر ئەوە بەشی ئەوەو هەر ئەوەندە لەبەرژەوەندی ئەودایە، دەزانێ ژیان‌و نیعمەتەکانی دونیا تەمەن کورت‌و کەمخایەنن زوو بەسەر دەچن‌و تێدەپەڕن، زۆر گرنگیان پێ نادا؛ بەبوونیان زۆر کەیفخۆش نابێ‌و بەفەوتانیان غەمبارو دڵتەنگ نابێ، ڕازییە بەبەشی خوداو قنیات دەکا.

﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان ئێمە لەقیامەتیشدا پاداشی تەواو دەدەینەوە بەئەوانە، پاداشی کردەوەی باش‌و ئیمانداری‌و ڕاستگۆیی‌و ڕاستاڵیان بەجوانترین شێوە دەدەینەوە، بەتەواوی ڕازییان دەکەین!

بەم جۆرە قورئان یاسای یەکسانی نێوان ئافرەت‌و پیاو دادەنێ! ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە نێرو مێ یەکسانن لەیاسای کردەوەو پاداشدا، لەپەیوەندییان بەخوداوە، لەپاداشیان لای خودا، لەڕێزیان لای خودا، هەر کەسە بەئەندازەی خوداپەرستی‌و دڵسۆزی لەخودا پەرستی داو لەئەنجامدانی کردەوەی چاکدا پاداشی دەدرێتەوە، تەرازووەکە تەقواو خوداپەرستییە، نێرینەیی و مێینەیی نیە! جا هەرچەندە لەئایەتەکەدا وشەی (مَن) پیاوو ئافرەت دەگرێتەوە، بەڵام بۆ زێدە چەسپاندنی ئەم حەقیقەتەو بۆ زێدە ڕونکردنەوە ﴿مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى﴾ شی هێنا! ئەمە لەسەردەمێکدا کە ڕێز بۆ مێینە دانەدەندرا، خەڵك بەهەبوونی ئافرەت تەنگەتاو دەبوون، بەچاوی سووك سەیر دەکرا، ئەگەر یەکێك هەواڵی پێ بدرایە کە کچی بووە ڕەنگی ڕەش دادەگیرساو وەزعی دەگۆڕاو خۆی لەخەڵکی دەشاردەوە،

لەبەر خەجاڵەتیو غەمو خەفەتباری نەیدەزانی چی بکا، دەکەوتە دڵەراوکێو بیری لەوە دەکردەوە: ئایا ئەم زارۆکە مێینە بهێڵێتەوەو قبووڵی ئەم ریسوایی و عەیبو عارە بکا، یان زیندە بەچاڵی بکاو لەکۆڵ خۆی بکاتەوە. بەڵێ: ئالەو کاتەدا: کە کۆمەڵ ئاوا سەیری ئافرەتی دەکرد، قورئان ئەم یاسایەی دابەزاندو ئەم رێزە پیرۆزەی دایە ئافرەتو بەم جۆرە یەکسانی خستە نێوان پیاوو ئافرەتەوە.

ئەوەشی راگەیاند: کە کردەوەی چاك پێویستی بەبنەمایەکی ئەصیل هەیە، بۆ ئەوەی لەسەری جێگیر ببێ، ئەویش بنەمای ئیمان بەخودایە، چونکە بەبێ هەبوونی ئەم بنەمایە بناغەی کۆمەڵی بەختەوەر ناچەسپێ، بەبێ هەبوونی ئەم پەیوەندییە پیرۆزە تاکەکانی کۆمەڵ کۆناکرێنەوەو یەکناخرێن، تاکەکانی کۆمەڵگا بەبێ هەبوونی بڕوا بەخودا پرتو بڵاو دەبنەوە، وەکوو تۆزو خۆڵی رۆژی رەشەبا یان لێ دێ، کۆ ناکرێنەوە.

عەقیدەو بیرو باوەڕ جەمسەرێکن هەموو هێڵەکانی کۆمەڵگا بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەگەر ئیمان نەبێ کۆمەڵگا پەرتەوازەو بێ سەرو بەرە، بیرو باوەڕە وا دەکا ئادەمیزادەکان کردەوەی چاك ئەنجام بدەنو هیوای پاداشو ئەنجامی کارەکانیان هەبێو بەهیوای دوارۆژێکی بەختەوەرو پڕ نازو نیعمەت بن.

ئەوەش رادەگەیەنێ: کە کردەوەی چاكو ئیمان بەیەکەوە پاداشەکەیان ژیانی بەختەوەرییە لەدونیادا.

ژیانی بەختەوەری لەدونیادا: زۆر لایەنی بەختەوەری دەگرێتەوە، مەرج نیە دەوڵەمەندیو هەبوونی کاڵاوماڵو منداڵ بێ، یان دەستەبەربوونی پلەو پایەو خزمو کەسو کارو کارەکەرو خزمەتچی بێ. چونکە لەژیاندا زۆر شت هەیە ماڵو سامان نیەو دەبێتە هۆکاری دڵخۆشیو راحەت: پەیوەندی بەخوداوە، بتمانە بەخودا، دڵنیابوون لەوە کە خودا چاودێرو پارێزگاریەتی، لەسشاغیو دڵنیاییو قەناعەت، ئارامی دەروونو ئارامی ناو ماڵو منداڵو، خۆشەویستی نێوان تاکەکانی

کۆمــەڵ، خوداپەرســتی وخــەریکبوون بەزانــستو زانیــاریو ئەنجامــدانی کــاری بەســوودو دڵخــۆش بــوون پێیــان هــەموویان هۆکــاری ژیــانی بەختــەوەرین. ئیبنــو عەبباسو کۆمەڵێك دەفەرموون: (الحياة الطيبــة) بیریتییــە لــەرزقو رۆژی حــەڵاڵو خۆشــبەختی. یــان خوداپەرســتیو دڵخۆشــبوون بــەو طــاعەتــە. یــان بریتییــە لەقەناعەت.

ئیبنــو کــەثیر دەفــەرموێ: (حیــاة طیبــة) هــەموو ئەمانــە دەگرێتــەوە. ئیمــام ئەحمــەد لەعەبــدوڵای کــوڕی عومــەرەوە ریوایــەت دەکــا: دەفــەرموێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموی: (قد أفلح من أسلم، ورزق كفافاً، وقنعه الله بما آتاه) بێگومان رزگــاری بــووە ئەوەی ئیمانی هێناوەو بەشی خۆی رزقو رۆژی پێدراوە خــودا قەناعــەتی داوەتــێو رازییە بەبەشی خۆی! ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردوە.

تــیرمیــذیو نەســائی لەفــەضالــەی کــوڕی عوبەیــدەوە ریوایــەت دەکــەن دەڵــێ بیستم پێغەمبەر دیفەرموو: (قد أفلح من هــدى للاسـلام، وكـان عيـشه كفافـاً وقنـع به).

ئیبنــو عــەبباس دەفــەرموێ: پێغەمبــەر ﷺ لــەخودا دەپاڕایــەوەو دەیفــەرموو: (اللهم قنعني بما رزقني وبارك لي فيه، واخلف عليّ كل غائبة لي بخير).

## قورئانی پیرۆزو چۆنیەتی خوێندنی، پلەو پایەی قورئانو شکۆمەندی

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ

يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَـٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾

دەربارەی نازڵبونی ئایەتی ژمارە (١٠١)، ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا....الآيـة﴾ دەڵێن کاتێک نازڵ بووە: کە موشریکەکان وتیان: موحەممەد سەیرە، گاڵتە بەهاوەڵەکانی خۆی

دەكا: ئەمڕۆ فەرمانێكیان پێ دەكا كەچی سبەینێ جڵەوگیرییان لەو كارە لێدەكا ! یان شتێكی تریان بۆ دێنێ: كە سوكتر بێ، وادیارە موحەممەد بۆ خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە هەڵی دەبەستێ: ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەو ئایەتی دوا ئەویشی نازڵ كرد.

دەربارەی ئایەتی (١٠٣) ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ...الآيـة﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لەرێگەی حوصەینەوە لەعەبدوڵای كوڕی موسلیمی حەضرەمییەوە ریوایەت دەكا: كە دەڵێ: ئێمە دوو كۆیلەمان هەبوون؛ یەكیان ناوی یەسارو ئەویتریان ناوی جەبر بوو، هەردوكیان صەقەلی بوون، بۆ خۆیان كتێبی خۆیان دەخوێندنەوەو زانیاری خۆیان فێری كەسانی دیكە دەكرد، زۆر جار پێغەمبەر ﷺ بەلایاندا تێپەڕ دەبوو گوێی لەخوێندنەوەكەیان دەگرت، ئیتر لەمەوە قورەیشییەكان دەیانگوت: موحەممەد لای ئەوانە قورئان فێر دەبێو ئەمانە فێری دەكەن! ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

موناسەبەو پەیوەندی ئەم ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: كە پەروەردگار لەوەپێش فەرمووی: پاداشی موسوڵمانان بەجوانترین شێوە دەداتەوە، ئەمجار رەهنومایییان دەكا بۆ كردارو گوفتاری وا كە كردەوەكانیان لەوەسوەسەی شەیتان پاڵفتە بكا. دوایی هەندێ وەسوەسەو ختوكەدانی شەیتان باس دەكا: كە دەیانخاتە دڵی كافرەكانەوە؛ لەوانە قەضیەی نەسخو سڕینەوەی هەندێ ئایەتو هێنانی ئایەتی دی بۆ شوێنەكەیان. یان شوبهەی ئەوە: كە دەیانگوت كۆیلەیەكی نەصرانی ئەم قورئانە فێری موحەممەد دەكا.. ئیتر پەروەردگار رەدێكی گورچكبڕی دانەوەو فەرمووی: ئەم قورئانە كەلامێكی عەرەبی ئاشكراو روونە، ئەو مامۆستا خەیاڵییەی ئێوە كابرایەكی عەجەمییە، چۆن دەزانێ كەلامێكی ئاوا عەرەبی رەوانو بەلیغ دابنێو فێری موحەممەدی بكا؟

ئاوا بەم جۆرە سیپاقی قورئان پێوە دەچێو لێرەدا باسی تایبەتمەندی قورئان دەکا، ئادابی خوێندنو خوێندنەوەیمان فێر دەکا، قسەو قسەلۆکی موشریکەکان دەربارەی قورئان رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ هەر کاتێ ویستت ئەی پێغەمبەر! ئەی ئادەمیزادینە! هەر کاتێك ویستتان قورئان بخوێننەوە، پەنا بگرن بەخودا لەوەسوەسەو ختوکەی شەیتانی نەفرین لێکراو، داوا بکەن خودا بتانپارێزێ لەهەموو کارێك کە شەیتان پێی خۆش بێ، بۆ ئەوەی دڵتان ئاگای لێبێ چی دەخوێننەوە، لەمانای ئایەتەکانی ورد ببنەوە، تێیان بفکرنو پەیرەوی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بکەن، بەگوێرەی ئامۆژگاریەکانی هەڵسو کەوت بکەن.

خۆپەناگرتن بەخودا لەوەسوەسەی شەیتانی نەفرین لێکراو رێخۆشکەرمیە بۆ خولقاندنی کەشو هەوایەکی گونجاو بۆ خوێندنی کەلامی خودا، روکردنە خودایە بەهەستو شعورێکی خاوێنەوە، بەدڵێکی پەیوەست بەخوداوە، هیچ پیسیو پۆخەڵییەك ئەو جەوە خاوێنەی لێ پیس نەکا.

ئەی ئادەمیزاد! پەنا بگرە بەخودا لەشەیتانی نەفرین لێکراو چونکە ﴿إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ شەیتان دەسەڵاتو توانای نیە بەسەر ئەو کەسانەدا: کە خاوەن باوەڕن، هەمیشە رویان لەخودایە، بەدڵ پەیوەستن بەخوداوە، بەدڵسۆزی بەندایەتی بۆ دەکەن، پشت هەر بەئەو دەبەستنو ئەو دەکەنە پشتیوانی خۆیان، شەیتان هەرگیزاو هەرگیز دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا ناشکێو چەندێك هەوڵ بدا بەوەسوەسە لەخشتەیان بەرێ هیچی بۆ ناکرێ. تەنانەت ئەگەر برێ جار ئەو خودا پەرستانە بکەونە هەڵەوە، زوو وەهۆش خۆدێنەوەو شەیتان بەلەعنەت دەکەنو تۆبەو پەشیمانی خۆیان رادەگەیەننو دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا!

﴿إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ﴾ دەسەلات‌و توانای شەیتان بۆ گومراکردن‌و لەخشتە بردن تەنیا بەسەر ئەو کەسانەدایە: کە دەیکەنە وەلی‌و خۆشەویستی خۆیان‌و بەیارمەتیدەرو پێشەوای خۆیانی دەزانن، گوێ بیسی فەرمانەکانی دەبن، بەپیر بانگەوازییەکەیەوە دەچن، لەجیاتی خودا پەرستی شەیتانپەرستی ئەنجام دەدەن! هەروەها دەسەلاتی شەیتان بەسەر ئەوانەش دایە: کە بەهۆی گومڕا کردنیان لەلایەن شەیتانەوە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن!

بێگومان لەو رۆژگارانەدا بەندایەتی کردن بۆ شەیتان‌و شەیتانپەرستی بەندایەتکردن بۆ خودای شەڕو نەگبەتی: لەلای هەندێ هۆزو گەل‌و نەتەوە باوبووەو ئێستاش پاشماوەی ماوە! ئەمجار پەروەردگار دوو شوبهەو رەخنەی کافرەکان: کە ئاڕاستەی پێغەمبەرو پێغەمبەرایەتیەکەیان دەکرد، باس دەکاو دەفەرموێ:

١- ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ هەر کاتێك ئایەتێك هەڵبگرین‌و لەناو قورئان بیسڕینەوە ئایەتێکی تر بخەینە شوێنی لەبەر حیکمەتێك‌و بەرژەوەندییەکی ئادەمیزاد، وەلحال خودا بۆخۆی لەهەموو کەس زاناترە بەو ئایەتەی نازڵی دەکا، دەزانێ بەرژەوەندی چیە لەگۆڕینی ئەحکامدا بەپێی رۆژگارو گۆڕانی بارو دۆخ... کافرەکان دەیکەن بە هەڵلاو دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ پیاوێکی درۆهەڵبەستی‌و بەدەم خوداوە درۆ دەکەی‌و بەئارەزۆی خۆت ئایەتێك لادەبەی‌و ئایەتێك دێنی، ئەمڕۆ فەرمان بەشتێك دەکەی‌و سبەینێ جڵەوگیری لێ دەکەی! ئەی پێغەمبەر! تۆ گوێ بەقسەی پووچی ئەوانە مەدەو لەدڵی مەگرە، ئەوانە زوربەیان نەزان‌و بێ عەقڵن، سودو بەرژەوەندی خۆیان نازانن، چ جایی لەسودو بەرژەوەندی ئەحکامی خودا حاڵی بن!

بێگومان موشریکەکان وەظیفەی ئەم قورئانە نازانن، هەست بەوە ناکەن: کە ئەم نامە پیرۆزە بۆ ئەوە هاتووە کۆمەڵگایەکی جیهانی سەرتاسەری ئادەمیزاد

دروست بکا، بۆ ئەوە نازڵ بووە ئوممەتێك رێك بخا کۆمەڵگای جیهانی بەرێوەبەرێ ببێتە رابەری مرۆڤایەتی!

نازانن؛ ئەم قورئانە دوا نامەی ئاسمانییە بۆ ئادەمیزاد. نازانن: ئەو خودایەی ئادەمیزادی دروست کردوە زاناو ئاگادارە بەو ئەحکامو یاسایانەی لەبەرژەوەندییانە، کە ئایەتێك نەسخ کرایەوەو حوکمەکەی تەواو بوو مەبەستی خۆی پێکاو ئایەتێکی تر هاتە شوێنی: کە باشتر لەگەڵ وەزعی تازە دەگونجاو حوکمەکەی بۆ کارپێکردنو بەردەوام بوون لەبارتر بوو ئەوە بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزاد خۆیانە!

نموونەی ئایاتی ئەم قورئانە پیرۆزە وەکوو دەرمانێك وایە دەدرێ بەنەخۆش تا چاك دەبێتەوە، پاشان ئامۆژگاری دەکرێ بەخواردنی پێخۆری تر؛ کە لەگەڵ تەندروستی ئاسایی کابرادا بگونجێ لەبارودۆخی ئاسایی دا. بێگومان موشریکەکان ئەم حیکمەتانە نازانن وەظیفەی ئەم قورئانە نازانن، بۆیە لەمەبەستی نەسخ کردنەوەی ئایەتێك بەئایەتێکی تر لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا حاڵی نابن، پێیان وایە: لابردنی ئایەتێكو هێنانی ئایەتێکی تر بۆ شوێنی دەست هەڵبەستی پێغەمبەرە، موحەممەد بەئارەزۆی خۆی ئەم ئایەتە لادەباو ئایەتێکی تر دەخاتە شوێنی!

با باش بزانن و دڵنیابن: کە موحەممەد شت بەدەم خوداوە هەڵنابەستێ، بەڵکوو ئەمە کاری خودایە، خوداش چی بۆێ بیکا دەیکا، چ حوکمێکی بەلاوە پەسند بێ بڕیاری دەدا بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتە.. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾البقرة/١٠٦ . بەڵام ئەوانە نەفامو نەزانن زوربەیان ئەم حەقیقەتانە نازانن!

ئـەمجار خـودا شـوبهەکەیانی رەتکـردەوەو فـەرمانی بەپێغەمبـەر کـرد: کـە روبەڕویان بوەستیّو وەڵامیان بداتەوە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِنْ رَّبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ ئەی موحەممەد! بـەو موشـریکە نەفامانـە بڵـێ: ئـەم قورئانـەی بـۆ مـن هـاتووەو بـۆ ئێـوەی دەخوێنمـەوە دەسـت هەڵبەستی خۆم نیە، بـەڵکوو جوبرائیـل: کـە فریـشتەی تایبـەتی نیگایـە لـەخوداوە هێناویـەتی بەحـەق‌و عەداڵـەت‌و حیکمـەت. نەسـخ کردنـەوەی ئایـەتێك‌و هێنـانی ئایـەتێکی تـر بـۆ شـوێنی لـەم حـەق‌و عەداڵـەت‌و حیکمەتـەوە سەرچاوە دەگـرێ. هەرگیز بەتاڵ توخنی ئەم قورئانە نەکەوتوەو ناکەوێ..

ئێمە هەندێ ئـەحکامی قورئـان نەسـخ دەکەینـەوەو حـوکمی تـری دەخەینـە شـوێنی ﴿لِيُثَبِّـتَ الَّـذِينَ آمَنُـوا﴾ بـۆ ئـەوەی بـەم جـۆرە نەسـخ کردنـەوەو گۆڕینانـە ئیمـانی ئیمانـداران زیـاتر بـچەسپێ. بڕوایـان بەنایـەتی مەنـسوخ‌و بەنایـەتی ناسـخ هەبێ، دڵیان بەحوکم‌و یاساکانی قورئـان ئـارام بگـرێ، خـودا پەرسـتان: کـە دەبیـنن ئایــەتێك نەســخ دەبێتــەوەو ئایــەتێکی تــر جێگــای دەگرێتــەوە، دەزانــن: ئــەوە لەخوداوەیە دەڵێن: ﴿هُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەمە راسـت‌و حەقـەو لـەخوداوە هـاتووە. جا کە ئەمە هەڵوێستیان بوو، ئـاوا بـەپیر ئـەحکامی تـازەی قورئانـەوە هـاتن، ئـەوە نیـشانەی ئەوەیـە لەسـەر ئـایین جێگیر بـوون‌و دڵیـان بەخوداپەرسـتی دامـەزراوەو دڵنیـان خـودا حـەکیم‌و دانایـە لـەکارو حـوکمی دا شـتێك ناکـا بـێ حیکمـەت بـێ‌و بەرژەوەنـدی تێـدا نـەبێ! ئەمـە ئامـاژەیە بـۆ ئـەوە: کـە موسـوڵمانان هـەر کاتـێ سـڕینەوەی ئایـەتێکیان بینـی‌و ئایـەتێکی تـر هاتـە شـوێنی زیـاتر بیـر و باوەڕیـان دادەمەزرێ‌و دڵیان ئـارام دەگـرێ‌و ئـایینی ئیـسلام لـەدڵ‌و دەروونیـاندا دەچەسـپێ‌و دەزانن: ئەوە لەحیکمەت‌و دانایی خوداوە سەرچاوە دەگرێ‌و حەق‌و بەتاڵ لێك جیا دەکەنەوە، بەپێچەوانەی کافرەکانەوە: کـە بـەهۆی نـازڵ بـوونی قورئانـەوەو نەسـخ

بوونـەوەی ئایـەتێك یـان زیـاترو هێنـانی ئایـەتێكی تـر بـۆ شـوێنی زیـاتر دەكەونـە گومانو راڕاییەوە.

ئـەم قورئانـە هیدایەتـدەرو رێنومـایی كـەرە بـۆ رێبـازی حـەقو مـوژدە دەدا بەخوداپەرستان بەبەهەشتی رازاوەو جوانو نەبڕاوە!

٢ گومانو رەخنەی دووەمیان: كە ئاڕاستەی پێغەمبەرو پەیامەكەیان دەكرد، ئەوە بوو: دەیانگوت: موحەممەد ئەم قورئانە لەلای خەڵك فێـر دەبێو پاشان دێ بەسەر ئێمەدا دەیخوێنێتەوە. راست ناكا لەخوداوە بۆی نایە! جا پـەروەردگار رەدی دانەوە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ﴾ بێگومان ئێمـە زۆر بـاش دەزانینو ئاگامـان لییـە: ئـەو موشریكو خودانەناسانە درۆی چۆن هەڵدەبەستنو بوختانی چەند گەورە ئاڕاستەی پەیامی پێغەمبەر دەكەن!

ئـەو موشـریكانە ئەوەنـدە نـەفامن دەڵێن: ئادەمیزادێـك ئـەم قورئانـە فێـری موحەممەد دەكا، درۆ دەكا لـەخوداوە بـۆی نـازڵ نـەكراوە، ئاماژەشیان بـۆ پیـاوێكی ناعەرەب دەكرد كە زمانی عەرەبی باش نەدەزانیو كۆیلەی پیاوێكی قوڕەیشی بـوو، لای (صـەفا) لەپـەنا كەعبـە شـتو مـەكی دەفرۆشـت، جـار جـار پێغەمبـەر لای دادەنیشتو هەندێ قسەی لەگەڵ دەكرد.

هەندێك دەڵێن: نـاوی جـەبر بـووە، هەیـە دەڵـێ نـاوی بـەلعام بـوو، ریوایـەت هەیە دەڵێ: ناوی (یەعیش) بووە كۆیلەی بـەنو حـەضرەمی بـووە! هەنـدێ دەڵێن: خولامی فاكیهی كوڕی موغەیرە، یان غولامی عاكیری حەضرەمی یـان هـی عوتبـەی كـوڕی رەبیعـە بـووە، عیـسایی بـوو موسـوڵمان بـوو، جـا كـە موشـریكەكان گوێیـان لەهەندێ چیرۆكی قورئان دەبوو دەیانگوت: ئەمە جەبری عەجەمی فێری دەكا!

ئـیتر پـەروەردگار ئـەم بوختانەشـی رەتكردنـەوەو بـەدرۆی خـستنەوەو فەرمووی: ﴿لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ﴾ زوبـانی ئـەو

کەسـەی ئامـاژەی بـۆ دەکـەن‌و بەمامۆسـتای موحەممـەدی لەقەڵـەم دەدەن زمـانی عەجەمییـەو عـەرەبی نیـە، قورئـان کـەلامێکی عـەرەبی ئاشـکراو رون‌و رەوانـە، بەڵکوو رەوانترین کەلامی عەرەبییە، دەی چۆن گومان دەبرێ کەسێك ئـەم قورئانـە فەصیحە بەلیغەی هێنابێ، لەکابرایەکی نا عەرەبی زمان عەجەمی فێری بـوو بـێ‌و ئەو فێری کردبێ؟! هەر کەسێ تۆزێ فام‌و عەقڵی هەبێ قسەی وا ناکاو بیرو رای وا دەرنابڕێ.

## بەکورتی:

ئەوەی لەوئادەمیزادە کۆیلـە دەبیـسترێ ئاخـاوتنێکی عەجەمییـە، نـەتۆ لێـی حاڵی دەبی نەئـەوان، قورئـان کـەلامێکی عـەرەبی فەصـیح‌و رەوان‌و بەلیغـە، ئـەوان بەباشـی لێـی حـاڵی دەبـن، دەی چـۆن دەگونجـێ ئـەو قورئانـە فەصـیح‌و رەوانـە عەرەبییە لەو کابرایە وەرگیرابێ؟!

وا پێدەچێ ئەو قسەیەی موشریکەکان فرت‌و فێڵێك بووبێ بۆ چەواشەکاری‌و بەرەنگاریکردنی ئیسلام، ئـەگینا بـۆ خۆیـان لـەناخی دڵیانـەوە زانیویانـە: کە ئـەو مەوزوعـە وا نیـەو پێغەمبـەر قورئـانی لـەو بەنـدە عەجەمییـە وەرنـەگرتووە.! عەرەبەکان بۆ خۆیان نرخی قورئانیان زانیوەو هەستیان بەبەلاغـەت‌و فەصاحەتی کردوە، زانیویانە کەلامێکی موعجیزەو ویستوویانە بەو جۆرە پڕوپاگەندانە پێشی پێ بگرن‌و بەرهەڵستی بکەن. باشە ئەو کۆیلەیـە کـە بیتوانیایـە کـەلامی ئاوادابنـێ بۆچـی بـەناوی خۆیـەوە بـلاوی نـەدەکردەوەو قورئـانی پـاڵ خـۆی نـەدەدا؟ بۆیـە هـەرگیز تەصـەور نـاکرێ‌و عـەقڵ نـایبڕێ‌و ناچـێتە دڵـەوە ئـەم کەلامـە بـەرزە موعیجزەیە لەکۆیلەیەکی ناعەرەبی بازاڕیی وەرگیرابێ.!

بـەم جـۆرە پـەروەردگار پێیـان دەفـەرموێ: ئـەی نەتـەوەی عـەرەب! ئێـوە بۆخۆتان لەهەموو کەس فەصیح ترو رەوانبێژترن، بۆ قسەو دەمە دەمێ زۆر ئازاو دەم گەرمن، بەشیعرو بەپەخشان لەهەموو کەس زیاتر بـەتوانان بـۆ ئاخـاوتن، دەی

ئێوە بۆخۆتان دەستەوەستان بوونو هەموو عەرەبیش بەڵكوو هەموو ئادەمیزاد دەستەوەستانن لەهێنانی كەلامێكی ئاواو ناتوانن تەنانەت سورەتێكی وەكوو هی قورئان بخەنە ڕو، ئەدی چۆن و بەچ عەقڵێك فێر كردنی ئەم قورئانە پاڵ كۆیلەیەكی زمان لاری ناعەرەب دەدەن؟! دیارە عەرەبەكان گەییشتونە ئەوپەڕی دەستەوەستانیو بێ توانایی، بۆیە پەنایان بۆ ئەم چەواشەكارییە بردوە: ئەمڕۆ پاش ئەوەی مرۆڤایەتی زۆر بەرەوپێش چووە، نووسینو خوێندنەوەو فێر كردنو هەوڵدان بۆ دانانی كتێبو نووسینی شیعرو پەخشان بەدونیادا بلاو بۆتەوە، لەهەموو بوارەكانی ژیاندا كتێبو نامیلكە دانراون، هەر كەسێك تۆزێك عەقڵی هەبێو كەمێك لەشت حاڵی بێ، یاساو نیظامی كۆمەلایەتیو چۆنیەتی قانون دانانو یاسا ڕێكخستن بزانێ: دەتوانێ هەست بەوە بكا: كە ئەم قورئانە دەسكردی ئادەمیزاد نیەو ناگونجێ ئادەمیزاد بتوانێ كەلامی ئاوا دابنێ!! تەنانەت ماددەپەرستەكانو شیوعییە خودا نەناسەكانیش لەروسیا ساڵی (١٩٥٤ی-ز) كە كۆنگرەی ڕۆژهەلاتناسەكانیان بەست لەروانگەی تانەدان لەئیسلام ئەوەیان دووپات كردەوە: كە ئەو قورئانە ناگونجێ زادەی بیری یەك كەس بێت: كە موحەممەدە. بەڵكوو كۆمەڵێكی زۆر هەمئاهەنگیو یارمەتی یەكتریان داوەو كاریان بۆ كردوە تا ئەو كەلامەی لێ كەوتۆتەوە، هەروا وتیان: ناگونجێ هەندێ لەو قورئانە لەنیوەدوورگەی عەرەبی دا نووسرابێتەوە، بەڵكوو هەندێ بەشی لەدەرەوەی ئەو هەرێمە نوسراوەتەوە!

ئەوەی: كە پاڵی پێوەنان ئەم رایە رابگەیەنن ئەوەیە: ئەوان بڕوایان بەوە نیە ئەم بوونەوەرە خاوەنی هەبێ، پێیان وا نیە خودایەك هەبێ ئەم بوونەوەرەی بەدیهێنابێو هەڵیسوڕێنێ هەروا بڕواشیان بەپێغەمبەرو پێغەمبەرایەتیو نیگا نیە. ئەوەشیان لا چەسپاوە كە قورئان زادەی بیری تاقە كەسێك نیەو موحەممەدێك ناتوانێ بەتەنها ئەو كەلامە بەرزە بخاتە ڕو!!

جا کە ئەمە راو بۆچونی کۆمەڵێك زانای موستەشریقین بێ لەسەدەی بیستەمدا، ئەدی چۆن دەگونجێ بگوترێ: کابرایەکی عەجەمی، کۆیلەیەکی ناعەرەبی هەتیومچە، ئەم قورئانەی فێری موحەممەد کردوە؟!!

ئەمجار پەروەردگار پەردە لەسەر بیرو بۆچونی هەڵەو پەڵەی کافرەکان هەڵدەداتەوەو هەڕەشەیان لێدەکا و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ لا يَهْدِيهِمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانەی بڕوا بەئایاتی قورئانی نازڵکراو بۆ سەر پێغەمبەر ناکەن، بەتەما ئەوە نین ئیمان بێنن بەو پەیامەی لەخوداوە بۆ ئادەمیزاد نێردراوە، ئەوانە خودا هیدایەتیان نادا، تۆفیقیان نادا بۆ بڕوا کردن بەئایاتی خوداو بەپەیامی پێغەمبەرانی، چونکە بۆخۆیان بەهۆی بێ بڕوایی‌و سەررەقی‌و تاوانکارییانەوە ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە ئیمان بێنن، ئەوانە لەقیامەتدا عەزابی بەئێشیان هەیە، تۆڵەی دژایەتیکردنی پێغەمبەرو بەدرۆ خستنەوەی ئایاتی قورئانیان لێ دەستێنێ!

﴿إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ﴾ نەوەکوو درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستێ، ئیللا کەسانێك کە ئیمانیان بەئایاتی خودا نیە، بڕوا بەموعجیزەو نیشانەکانی خودا لەبوونەوەردا ناکەن، سەیری بەڵگەکانی تاك‌و تەنهایی خودا ناکەن، چونکە ئەوان بەتەما نین لەسەر راستگۆیی پاداش وەربگرنەوە، ترسی ئەوەیان نیە لەسەر درۆکردن سزا بدرێن، ئەمانە رەوشتی ئێوەن ئەی کۆمەڵی کافرو بێ بڕوا! درۆ تاوانێکی ناشیرین‌و نابەجێیە، خوداپەرست ئالودەی نابێ‌و لەخاوەن باوەڕەوە سەر هەڵنادا! ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ ئەوانەی کافرو موشریکن لەقورەیشییەکان کە بەتۆ دەڵێن: ئەی موحەممەد! قسە بەدەم خوداوە هەڵدەبەستی ئەوانە خۆیان درۆزنن نەك تۆ! ئەوانە قسە هەڵبەستن نەك تۆ!!

## هەڵگەڕانەوە لەئایینو حوکمی کۆچکردن لەپیناو ئاییندا

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ ۞

﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار لەئایەتـەكانی پێشوودا ئـەوەی باسـكرد: كـە قورەیشییەكان بڕوایان بەپێغەمبەر نەكردو جۆرەها قسەو قسەلۆكو بوختانیان بۆ هەڵبەست؛ دەمێـك دەیـانگوت: بۆخـۆی قورئـانی هەڵبەسـتووە، یـان دەیـانگوت: كابرایەكی عەجەمی فێری دەكا. پاشان ڕەدی دانـەوەو هەڕەشـەی تونـدی ئاڕاسـتە كردن، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا حاڵو وەزعی ئەوانەی بەیان كرد: كە بـەزمان كوفر دەڵێنو دڵیان پـڕە لـەئیمان، هـەروا حـوكمی ئەوانـەش بـەیان دەكا: كـە بەئاشـكراو نهێنی كافرن.

دەربارەی هۆی نازڵبونی ئایەتی (١٠٦) ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ریوایـەت دەكـا؛ دەفـەرموێ: كاتێـك پێغەمبـەر ﷺ ویـستی بـۆ مەدینـە كـۆچ بكـا، موشریكەكان بیلالو خەبباب و عەمماری كوڕی یاسریان گـرتن، عـەممار قـسەیەكی وای بۆ گوتن: كە بەدڵی موشریكەكان بوو ئیتر وازیان لێ هێنا، كـە هاتـەوە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺو بەسـەرهاتەكەی بـۆ گێڕایـەوە، پێغەمبـەر ﷺ پـێی فـەرموو: ئـەو كاتەی بەڕواڵەت قسەكانت كردن دڵت چۆن بوو؟ ئایا بەدڵ پێت خـۆش بـوو؟ وتـی: قوربان! نەخەیر، بەدڵ پێم خۆش نەبوو. ئیتر پـەروەردگار ئـەم ئایەتـەی دابـەزانـد ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾.. هـەر ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لەموجاهیـدەوە ریوایەت دەكا؛ دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە دەربـارەی هەنـدێ لـە دانیـشتوانی شاری مەككـە نازڵ بووە، ئیمانیان هێنابوو، بڕێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر لەمەدینـەوە نامـەیان بـۆ نووسین داوایان لێكرد ن: كە كۆچ بكەن بۆ مەدینـە، ئـەوانیش لەمەككە دەرچـونو بـەرەو مەدینـە كەوتنـەڕێ، قورەیـشییەكان پێیـان زانـینو شـوێنیا كـەوتنو لـەڕێگا

گرتیانن، تووشی فیتنەیان کردنو بەزۆر وشەی کوفرئامێزیان بەدەمدا هات، ئیتر ئەم ئایەتە دەرحەق ئەوان نازڵ بووە!

ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەویەیو بەیهەقی لەکتێبی (الدلائیل)دا ریوایەتیان کردووە دەڵێن: موشریکەکانی مەککە عەمماری کوڕی یاسریان گرتو ئازارو ئەشکەنجەیان دا هەتا وایان لێکرد ناچار بوو جنێوی بەپێغەمبەر داو ستایشی بتەکانی کردن، جا دوایی کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چیت بەسەر هات؟ وتی: کارێکی خراپم کرد، هێندەیان ئازار دامو وایان لێکرد م دەرحەق بەجەنابت ناماقوڵیم کردنو خواکانی ئەوانم ستایش کرد! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کاتە دڵت چۆن بوو؟ وتی: قوربان! دڵم پڕبوو لەئیمان. فەرمووی: ئەگەر جارێکی دیکە تووشی مەوقیفی ئاوا بوویەوە زەختیان لێکرد ی کوفر بکەی، قەیناکا رازییان بکەو خۆت تووشی هیلاکەت مەکە! ئیتر ئایەتی ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ نازڵ بوو.

هەروەها ریوایەت کراوە: کە قورەیشییەکان زەختیان لەعەممارو یاسری باوکیو (سمية)ی دایکی کرد سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان، ئیتر کافرەکان (سمية)یان خستە نێوان دو حوشترەوەو رمێکیان لەشەرمگای بڕی بەم شێوە ناشیرینە شەهیدیان کرد. پاشان یاسریشیان شەهید کرد ئەم ژنو مێردە یەکەم شەهیدن لەپیناو ئیسلام دا!! بەڵام عەممار بەڕواڵەت کوفری بەدەمدا هاتو بەزوبان رازی کردن، ئەوانیش وازیان لێ هێنا. دوایی عەرزی پێغەمبەریان کرد: کە عەممار کافر بووەو کوفری کردوە! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخەیر عەممار کافر نەبوەو لەتەوقی سەریەوە تا سەرپەنجەی قاچی پڕە لەئیمانو بیرو باوەڕی ئیسلامەتی تێکەڵاو خوێنو گۆشتی بووە. جا دوایی عەممار بەگریانەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەکوڵی، پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی عەمماری دەسڕینەوەو دەیفەرموو: ئەوە چیتە؟ بۆ دەگری؟ ئەگەر جارێکی تر تووشی مەوقیفی ئاوا

بویەوە هەمان قسەی کوفرئامێز بکەرەوە پێی فەرموو: (ان عادوا فعد لهم بما قلت).

دەربارەی ئایەتی ژمارە (١١٠) کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ...﴾ ئیبنو سەعد لە(الطبقات)دا لەعەمری کوڕی حەکەمەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عەمماری کوڕی یاسر ئازارو ئەشکەنجە دەدرا بەجۆرێك ئاگای لەخۆ نەدەماو نەیدەزانی چی دەڵێ، صوهەیب ئەوەندە ئازار دەدرا تاوای لێ دەهات نەیدەزانی چی دەڵێ: ئەبو فوکەیهە بەهەمان شێوە عەزاب دەدرا، بیلال‌و عامیری کوڕی فوهەیرەو کۆمەڵێکی تر لەموسوڵمانان بەهەمان شێوە سزا دەدران، دەربارەی ئەوان ئایەتی ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا فُتِنُوا...﴾ نازڵ بووە. لەم بارەوە ریوایەتی تریش هەن بەپێویستمان نەزانی ئامازە بۆ هەموویان بکەین! دێینە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان.

دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ﴾ کەسێك پاش موسوڵمانبوونی پاشگەز بێتەوە، پاش ئەوەی خودای ناسی‌و راستی ئایینی بۆ دەرکەوت، کافر بوەوە، بەدڵ لەئیسلام پەشیمان بووەوە، ئەوە قارو غەزەبی خودای لەسەرەو دوور دەخرێتەوە لەرەحمەتی یەزدان، لەقیامەتیش‌دا سزای سەخت‌و سامناکی هەیە، چونکە شیرینی ئایینی چەشتووەو دوایی لێی لاداوە، هەروەها چونکە ژیانی دونیای بەسەر ژیانی قیامەتدا هەڵبژاردوە، لەبەر ئەوە شیاوی سزای سەختە. ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾ مەگەر کەسێك موسوڵمان بێ‌و زەختی لێ بکرێ‌و بەزۆر گوفتاری کوفری پێ بدرکێنن، یان کاری کوفر ئامیزی پێ ئەنجام بدەن، لەهەمان کاتدا دڵی پڕ بێ لەئیمان بەخوداو بەتاك‌و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی هەموو پێغەمبەرەکان بەگشتی‌و هی حەزرەتی موحەممەد بەتایبەتی، ئەو کاتە ئەگەر بەرواڵەت کرفر بکا هیچی لەسەر نیەو گوناهی ناگاتێ!

﴿وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنْ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ بەلاّم غەزەبو قارى خودا بۆ كەسانێكە بەدڵ لەئیسلام هەڵگەڕێنەوە، دڵیان بەكوفرو بێدینی دابمەزرێ، بەویستی خۆیان بێ زۆرە ملی كافر ببنەوە ئەوانە غەزەبی خودایان لەسەرە، لەرەحمەتی دوور دەكەونەوە لەقیامەتیشدا عەزابی سەختی دۆزەخیان بۆ ئامادە كراوە!!

ئەمجار هۆكاری ئەوە روون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ﴾ ئەم غەزەبو قار لێ گرتنەی خودا لێیان لەبەر ئەوەیە چونكە ئەوان ژیانی دونیایان هەڵبژاردوە بەسەر قیامەتدا، ملی لەپاشگەزبوونەوە ناوەو لەسەر ئایینی حەق بەردەوام نەبوە، ئامادەباشی تێدا نەبوە لەپیناو ئایینەدا ئەزیەت بدرێ نارەحەتی ببینێ، خۆبەخت بكا.

﴿وَأَنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ هەروەها چونكە خودا هیدایەتی گەلو نەتەوەی ستەمكارو كافر نادا، كەسێك ئینكاری ئایەتی خودا بكاو سوور بێ لەسەر خودانەناسی نیشانەی ئەوەیە: ئامادەباشی تێدا نیە رێگای خێر بگرێتە بەر، شەیتانو نەفسی بەدكاری رێگای كوفریان بۆ رازاندۆتەوە، ئەنجامدانی تاوانیان لەپێش چاو جوان كردوە، دڵی بەكوفر خۆشەو ئامادەباشی وەرگرتنی ئیمانی تێدا نەماوە بووەتە قوتابی شەیتانو شوێن رێبازی ناپیرۆزی كەوتووە.

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْغَافِلُونَ﴾ ئەوانەی لەئایین هەڵدەگەڕینەوە، دوای ئیمانهێنانو تێگەیشتن لەئیسلام پاشگەز دەبنەوە، ئەوانە ئەو كەسانەن خودا دڵی مۆر كردون، ئامێری بیستنو دیتنی حەقیقی لەكارخستون، ئەوانە ئیتر ئیمان ناهێننو كەلامی خودا بەباشی نابیستن، بەلگەو دەلیلەكانی تاكو تەنهایی خوداو زیندوبوونەوەو راستی پێغەمبەرایەتی ناچێتە دڵیانەوەو كاریان تێ ناكا، ئەوانە بەتەواوی بێ ئاگاو نەفامن، كەس لەوان

غافڵتر نیە، چونکە بیر نەکردنەوە لەئاکامی کوفرو بێدینی ئەوپەڕی غافڵیو نەفامییە.

﴿لا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمْ الْخَاسِرُونَ﴾ حەقەو چەسپاوە، هیچ گومانی تێدا نیە ئەوانە لەقیامەتدا بەهیلاکچوو بەفتارە چوون، فەوتاوو خەسارەتمەندن، تەمەنی خۆیان لەشتی بیهودەو زیانە خرۆدا بەسەر برد بەدەستی خۆیان بەویستی خۆیان خۆیان کردە سوتەمەنی دۆزەخ، خۆیان کردە شیاوی ئاگری دۆزەخ.

چونکە ئادەمیزاد لەم ژیانی دونیایەدا وەکوو بازرگان وایە: بەخوداپەرستی خۆشبەختی قیامەت دەکڕێ! جا کەوای نەکرد، نیشانەی ئەوەیە: لەبازرگانییەکەیدا خەسارەتمەند بووە.

یەکەم: ئەوانە شیاوی غەزەبو قاری خودان.

دووەم: ئەوانە شیاوی عەزابی سەختی پەروەردگارن.

سێیەم: ئەوانە دونیا ویستن.

چوارەم: خودا نائومێدی کردون لەهیدایەت دان.

پێنجەم: خودا دڵو دەروونی مۆر کردون ئامێری دیتنو بیستنی لەکار خستون.

شەشەم: خستونیە پێڕی غافلانەوەو ئاگایان لەهیچ نیە.

ئایەتەکان تاوانی پاشگەزبوونەوە لەئایینی ئیسلام بەگەورەترین تاوان دادەنێن، چونکە کەسێك تامی ئیمانی کردو پاشان بۆ ژیانی کورتی دونیاو کاڵای کەمبایەخی وازی لەئایین هێنا، شیاوی غەزەبی خودایە، شیاوی عەزابی خودایە، نائومێدە لەهیدایەتو دڵی داخراوەو حەق نابینیو راستی نابیسێ! ئەوانە لەقیامەتدا خەسارەتمەندنو مایە پوچو ماڵوێرانن.

چونکە عەقیدەو بیرو باوەڕ نابێ موساوەمەیان تێدا بکرێ، نابێ بکرێنە شوێنی زەرەرو قازانج. هەر کاتێ ئیمان بەخودا چووە ناو دڵەوە نابێ بۆ هیچ شتێکی تر واز لەئەم ئیمانە بهێندرێ، عەقیدە کاڵا نیە بفرۆشرێ، شتێك نیە بۆ هیچ شتێکی تر وازی لێ بهێندرێ، عەقیدە لەهەموو شتێك بەنرخترەو هیچ کاڵایەك ناخرێتە تەرازویەوەو نابێتە هاوتای، بۆیە واز هێنان لەبیرو باوەڕی ئیسلامی سزاکەی لەسزای هەموو تاوانێکی تر سامناکترە!

مەگەر کەسێك زۆری لێ بکرێ، تینی بۆ بێنن ئەویش لەترسی گیانی خۆی بەزوبانو بەرواڵەت کوفر بکا بەڵام دڵی پڕ بێ لەئیمان، ئەوی بەزوبان دەیڵێ بەدڵی نەبێ! ئالەم مەوقیفانەدا بۆ موسوڵمانان روخصەتە کە بەزوبانو بەرواڵەت خۆیان بەکافر نیشان بدەن!

بێگومان برێ لەموسوڵمانان ئەم روخصەتەشیان پەیڕەو نەکردوە، بەزوبانو بەرواڵەتیش کوفریان نەکردوە، مردنی خۆیان هەڵبژاردوە بەسەر ئەوەدا بەزوبان کوفر بکەن، ئەوەتا (سمية) دایکی یاسر بەسەرە نێزە شەرمگایان هەڵدڕی تا گیانی تێدا بوو سزایان دا ئەو وشەی کوفری بەدەمدا نەهات، هەروا باوکی یاسر لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گیانی سپاردو کوفری بەدەمدا نەهات!

بیلالی حەبەشی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەیان دا، دەهاتن لەچرقەی گەرمادا لەناو لمبەلاندا رایان دەکێشاو بەردی گەورەیان دەخستە سەر سنگی، داوایان لێدەکرد هاوەڵ بۆ خودا دانێو نەیگوت: هەر دەیگوت: (أحد أحد) دەیگوت: سوێند بەخودا ئەگەر وشەیەکی ترم بزانیایە لەوشەی (أحد، أحد) لەسەر شانتان گرانتربوایە ئەوەم دەگوت.

هەروەها حەبیبی کوڕی زەیدی ئەلئەنصاری کاتێك (مسیلمة)ی درۆزن پێی گوت: ئەتۆ شایەتی دەدەی کە موحەممەد رەوانە کراوی خودایە! وتی: بەڵێ، پاشان پێی گوت ئەی شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟ وتی گوێم لێ نیە تێت

ناگەم! چەندی سزای داو تەنانەت پارچە پارچەی کرد ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی بوو.

زاناو بلیمەتی بواری فەرموودە ئیبنو عەساکیر لەژینامەی عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهمی دا: کەیەکێك بووە لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ڕۆمەکان بەدیل گرتیان و بردیانە لای پاشای ڕۆم، پاشا پێی گوت: دەتکەمە هاوبەشی خۆم لەملك و سەڵتەنەتدا، کچی خۆمت دەدەمێ، بەمەرجێ ببیە نەصرانی، لەوەڵامدا وتی: ئەگەر هەرچی ماڵ و سامانی تۆو ماڵ و سامانی عەرەب هەیە بیخەیە ژێر دەستمەوە لەپاساوی پاشگەزبوونەوەم لەئیسلام، تەنانەت بۆ ساتە وەختێکیش، ئەمن ئامادە باشی ئەوەم تێدا نیەو پاشگەز نابمەوە، پاشا وتی: دەسا کەوابێ دەتکوژم؛ وتی: ئەوە گیانی من و ئەوە دەسەڵاتی خۆت چی دەکەی بیکە!

پاشا فەرمانی کرد هێنایان و هەڵیان واسی تیر هاوێژو تفەنگچیان هێنان، بۆ ترساندن و پاشگەزبوونەوە تیریان پێوە نان، تیرەکان لەنزیك قاچ و نزیك دەستی دەدران، ئەمجار وتیان: با نەتکوژین و گیانی خۆت ڕزگار بکە، ببە بەنەصرانی، ئەویش ملی نەداو داواکەی ڕەتکردنەوە، ئەمجار مەنجەڵێ مسی تواوەیان هێنا لەپێش چاوی ئەو دیلێکی موسوڵمانیان هێناو تێیان فڕێدا، یەکسەر بەبەرچاوی عەبدوڵڵاوە داپڵۆخاو ئێسقانی دەرکەوتن، ئەمجار داوایان لێکرد وتیان: یان ببە بەگاور، یان تۆش ئاوا دەخەینە ناو ئەو مسە تواوەوە، عەبدوڵڵا ملی نەدا، ئەمجار خستیانە سەر بەکرەو خلۆکە، بۆ ئەوەی فڕێی بدەنە ناو مسە تواوەکەوە ئالەو کاتەدا عەبدوڵڵا گریانی هات، پاشا تەماعی لێ پەیدا بوو، وایزانی ترساوەو لەئیسلام پاشگەز دەبێتەوە عەبدوڵڵا وتی: نەخەیر! من هەر لەسەر هەڵوێستی خۆمم، بەڵام بۆیە گریانم دێ من تەنها گیانێکم هەیەو ساتەوەختێك لەپیناو خودادا سزا دەدرێم و لەناو دەچم حەزم دەکرد بەئەندازەی مووی جەستەم گیانم هەبوونایەو لەپیناو ئایینی خودادا ئەو سزایەیان بدرایە!!

لەبرێ ریوایەت هاتووە: دەڵێ پاشا فەرمانی کرد چەند شەوو رۆژێك خواردن‌و خواردنەوەی لێیاساغ بکەن، جا کە زۆری برسی‌و تینوو بوو سفرەیەکی لەشەراب‌و گۆشتی بەراز بۆ رازاندەوەو بۆی نارد، ئەویش دەمی لێ نەداو بەلایا نەچوو؛ دوایی پاشا بانگی کردەوە وتی: بۆچی دەستت بۆ خواردن‌و خواردنەوەکە نەبرد؟ لەوەلامدا وتی: هەرچەندە بۆم حەلاڵ بوو بیخۆم‌و ناعیلاجی حەرام حەلاڵ دەکا ، بەلام نەمویست تۆ بەخۆم خۆش بکەم! ئیتر پاشا وتی: سەرم ماچ بکەو مەرەخەست دەکەم! عەبدوڵلا پێی گوت: هەموو دیلە موسوڵمانەکان لەگەڵ مندا مەرەخەس دەکەی؟ وتی: بەڵێ، ئیتر سەری ماچ کرد ئەویش هەموو دیلەکانی مەرەخەس کردن.

جا کە عەبدوڵلا هاتەوە بۆ مەدینە حەزرەتی عومەر فەرمووی: لەسەر هەموو موسوڵمانێ پێویستە سەری عەبدوڵلا ماچ بکاو من یەکەم کەس دەبم کە سەری ماچ دەکەم ئیتر هەستاو سەری ماچ کرد.[٥]

ئەمجار پەروەردگار حوکمی موسوڵمانە زەبوونەکانی ناو مەککە باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا فُتِنُوا ثُمَّ جَاهَدُوا وَصَبَرُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ پاشان ئەی موحەممەد! بزانە: کە خودای تۆ دەرحەق بەوانەی لەزێدو نیشتمانی خۆیان کۆچیان کردوە، دوای ئەوەی موشریکەکان ویستیان لەئایین پاشگەزیان بکەنەوە، ئەوانیش جیهادیان لەگەڵ کردن روبەڕویان بوونەوە، پشوو درێژو خۆگربوون لەجیهادەکەیاندا، بەشمشێر شەڕیان لەدژ کردن بەزوبان بەرائەتی خۆیانیان لێ راگەیاندن، بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! دوای ئەم هەڵوێست‌و کردەوانەیان کە بەرامبەر موشریکەکان نواندیان لێبوردو لێخۆشبووە لێیان‌و ئەو زەمانەسازی‌و کوفر کردنە رواڵەتیەی کاتی خۆی بەزۆرە ملێ‌و لەترسی گیانی خۆیان ئەنجامیان داوە لێیان ناگرێ‌و عەفوویان دەکا.

---

([٥]) في ظلال القرآن ج٥/٢٨٤-٢٨٥ نیبن‌و کەثیر ج٢/٥٦٩.

ئەمانە کۆمەڵێك بوون لەئیمانداران لەمەککەدا بوون زەبونو بێ هێـز بـوون، کافرەکـان زەختیـان لێکـردن کـە کـافر ببنـەوە ئـەوانیش بەرواڵـەتو بـۆ پاراسـتنی گیانی خۆیان وشەی کوفریان بەدەمدا هات، پاشان خودا یارمەتیدانو کۆچیان کـرد بۆ مەدینە، ماڵو سامانو خزمو خێزانو منداڵو وڵاتو زێدی خۆیان جێ هێـشتو خۆیـان گەیانـدە موسـوڵمانانو لەتـەکیاندا جیهادیـان دژی کافرەکـان ئـەنجام دا، لەپیناو ئایینی خودادا زۆر تەنگو چەڵەمەیان توش هات، جا پـەروەردگار هـەواڵی ئەوەمان دەداتێ کـە خـودا لـەتاوانی کـوفرە رواڵەتیەکـەی پێـشوویان خـۆش دەبـێو رۆژی قیامەت بەرەحمو بەزەیی دەبێ لەگەڵیان!

﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَـنْ نَفْـسِهَا﴾ واتـە: خـودای تـۆ ئـەی موحەممـەد! بەرەحمو بەزەییە بۆ ئەو ئیماندارانە لەرۆژێکدا کە هەموو کەس داکۆکی لەخۆی دەکا، کەس وەسەر کەسی ناپرژێ هەر کەسەو دەیەوێ خۆی رزگار بکا، چـی بەسـەر منداڵو باوكو دایكو خزمو کەسو کارەوە نیە، رۆژی نەفسی نەفسییە.

﴿وَتُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُمْ لا يُظْلَمُـونَ﴾ هـەموو کەسـێك سـزاو پاداشـی کردەوەکـانی خـۆی وەردەگرێتـەوە، هـەر کەسـە بـەگوێرەی کردەوەکـانی چـاکە بەچـاکەو خراپـە بەخراپـە پاداشـی خـۆی دەدرێتـەوە، ئـەوان سـتەمیان لێنـاکرێ لەپاداشی چاکەکار کەم ناکرێتەوە لەسزای تاوانبار زیـاد نـاکرێ، تەنانـەت کـەمترین ستەمیان لێ ناکرێ.

## بەکورتی:

زانایانی ئیـسلام کـۆکن لەسـەر ئـەوە: کەسـێك زۆری لێ کـرا بـۆ کـوفر کـردنو هەڕەشەیان لێکرد ئەگەر کافر نەبێتەوە دەیکـوژن، ئـەویش کوشـتنەکەی هەڵبـژارد، ئەوە لای خودا پلەو پایەی بەرزترە لەو کەسەی پەیڕەوی روخصەتەکە دەکا.

جا لەکاتێکدا پەروەردگار رێگای داوە: کە لەکاتی ناعیلاجیو زەختو زۆرە ملێ دا بۆ رزگارکردنی گیانی خۆی کابرا کوفر بڵێو کوفر بکاو هیچی لێ ناگیرێ ئیتر لەم روانگەوە زانایانی شەرع هەموو لقو پۆپی فیقهیان بۆ سەر قیاس کردوە. هەر کاتێ ئادەمیزاد زۆرەملێی لێ کرا بەناعیلاجی کارێکی ئەنجام دا ئەوە هیچی لەسەر نیەو هیچ حوکمێکی لەسەر دروست نابێ. حوکم بەکافربوونی ناکرێ ژنەکەی لێی جیا نابێتەوە، ئەگەر مرد نوێژی لەسەر دەکرێو لەگۆڕستانی موسوڵماناندا دەنێژرێ، بەڵام موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی دەڵێ: کابرا ئەگەر کوفری لێ دەرکەوت بەظاهیر بەپاشگەزبووە حلێب دەکرێو حوکمی کافری بەسەردا دەدرێ. ژنی تەڵاقی دەکەوێ، نوێژی لەسەر ناکرێ... وەکی تریش لەبەینی خۆیو خودادا بەموسوڵمان حسێبە. هەڵبەتە ئەمە رایەکی زەعیفەو قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ پشتگیری ناکەن!

ئەمجار زانایانی شەرع راجیاییان تێدا پەیدا بووە، دەربارەی کەسێك کە بەزۆر تەڵاقی ژنی پێ بدەن، یان ژنی لێ مارە بکەن!

حەنەفییەکان دەڵێن: تەڵاقی دەکەوێو مارەیی ژنیشی لێ دێ، چونکە تەڵاق پێویستی بەئیختیار هەیە، زۆرەملێ رەزامەندی ناهێڵێ نەك ئیختیار.

غەیری حەنەفییەکان پێیان وایە نەتەڵاقی دەکەوێ، نەمارەیی لێ دێ ئاماژە بەو فەرموودەیەی: کە طەبەرانی لەثەوبانەوە ریوایەتی کردوە (رفع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) حەنەفییەکان رەفعی حوکمەکەیان خستۆتە سەر حوکمی قیامەت واتە: گوناهی ناگاتێ..

پێویستە ئەوە بزانرێ: کە سێ شت هەن بەهیچ جۆرێك رەوا نیە بکرێن: (کوفر، کوشتن، زینا) روخصەت دراوە بۆ وتنی وشەی کوفر بەمەرجێ بەلایەوە حەڵاڵ نەبێ..

ئەمجار ئایا کە پیاوێك بەزۆر زینای پێ بکەن حەددی لەسەرە؟ هەندێ لەزانایان فەرموویانە حەددی لەسەرە، چونکە ئەو کارە ئەنجام دەدا بەئیختیاری خۆی.

زوربەی زۆری زانایان فەرموویانە: حەددی لەسەر نیە، ئەم رایە صەحیحو بڕوا پێکراوە. بەڵام ئەگەر ئافرەتێك بەزۆر زینایان لەگەڵ کرد ئەوە بەلای هەموو شەرعزانانەوە حەددی لەسەر نیە. چونکە ئایەتەکە زۆر لێکراوی لەبەر پرسیاری چەرت کردوە، دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ﴾ هەروەها پێغەمبەر فەرموویەتی: (ان الله تجاوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) هەروەها ئایەتەکەی سورەتی (النور/٣٣) کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ مەبەستی ئەو ئافرەتانەیە: کە بەزۆر توشی زینایان دەکردن.

## سەرەنجامی کوفرانی نیعمەتو سپڵەیی کردن لەدونیا

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾

دوای ئــەوەی پــەروەردگار هەڕەشــەی لــەکافرەکان کــرد بەعــەزابی دۆزەخ لەقیامـەتدا، هەڕەشـەی عـەزابی دونیاشی لێکـردن بـەوە کـە تووشـی برسـیایەتیو ترسو خـەمو خەفـەتیان دەکا، دەفـەرموێ: ﴿وَضَـرَبَ اللَّـهُ مَثَلاً قَرْيَـةً كَانَـتْ آمِنَـةً مُطْمَئِنَّةً﴾ خودا بەنموونەو بۆ عیبرەت باسی گوندێك (شارێك) دەکا، دانیشتوانەکانی بـێ وەیو دڵنیـا لـەدوژمنو ئافـات بـێ خـەمو کەدەر لەهـەموو ناخۆشـیەکی ژیـانی دونیـا، ﴿يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِـنْ كُـلِّ مَكَـانٍ﴾ رزقو رۆژی زۆرو زەبەنـدەی لەهـەموو لایەکـەوە بەئاسـانی بـۆ دەهـات، کەچـی دانیـشتوانەکان لـەجیاتی ئـەوەی سوپاسـی خودای لەسەر بکەن، ﴿فَكَفَـرَتْ بِـأَنْعُمِ اللَّـهِ﴾ کوفرانی نیعمەتـەکانی خودایـان کـرد ﴿فَأَذَاقَهَـا اللَّـهُ لِبَـاسَ الْجُـوعِ وَالْخَـوْفِ بِمَـا كَـانُوا يَـصْنَعُونَ﴾ ئـیتر پـەروەردگار بەبرسـییەتیو تـرسو خـۆف دایپۆشـین، ژیـانی لێ تـاڵ کـردن، لەشـوێنی ئـەمنو ئاسایشو دڵنیـایی تـرسو خـۆفی بـۆ رەخـساندن، لـەباتی دەوڵەمەنـدیو هـەبوویی، هـەژاریو برسـیایەتی پێـدان، لـەجیاتی دڵخۆشـیو لەشـساغیو تـەڕدەماخی ئـازارو ئەشـکەنجەو خـەمو خەفـەتی دانـێ، تـاڵیو ناخۆشـی ژیـانی پـێ چەشـتن دونیـای لێ وەتەنـگ هێنان، روناکاییان لەژیاندا نەما.

﴿وَلَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَـذَهُمْ الْعَـذَابُ وَهُـمْ ظَـالِمُونَ﴾ بێگومـان هـاتوە بـۆ لای دانیـشتوانی ئـەو شـارە پێغەمبـەرێك لەرەگـەزی خۆیـان، لـەخوداوە پــەیامی بــۆ هێنــان، داوای لێکــردن کــە خوداپەرســتی بکــەن، سوپاســگوزاری نیعمەتـەکانی بـن، بـەخۆیاندا بـچنەوەو واز لەبتپەرسـتی بهێـنن، کەچـی ئـەوان پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستەوە، سوور بون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، پـەرەیان بەسەررەقیو سەرکەشـی خۆیـان دا، ئـیتر خـودا بەسـزای ریـشەکێش لـەناوی بـردن، لەحاڵو وەزعێکدا کە ئەوان ستەمیان لەخودی خۆیان کردو بەردەوام بوون لەسەر کوفرو مەعاصی ئەگینا خودا ستەمی لێ نەکردن!

پەنـدو مـەثـەل جاری وا هەیـە بەشـتێك لێـدەدرێ: كـە رەوشـتێكی تایبـەتی هـەبێ، جـا ئـەو شـتە لـەواقیعدا هـەبێ یـان نـەبێ! جـاری واش دەبـێ بەشـتێكی دیاریكراو لێدەدرێ، جا ئەم شارەی: كە لێرەدا پەروەردگار بەمەثـەل هێناویەتیـەوە لەوانەیە شارێكی دیاریكراو بێ، لەوانەشە شارێكی نەبوو بێ!!

زوربـەی زۆری راڤەكـەرانی قورئـان پێیـان وایـە: ئـەو شـارە شـاری مەككەیـە، چـونكە ئـەو شـارێكی پـڕ ئاسـایش‌و خۆشـگوزران بـوو، دانیـشتوانی دەورو بـەری هەمیشە لەترس‌و دڵەڕاوكێدا بوون، شەوكوت دەكـران، دەفڕێنـدران كـەس لـەژیان‌و ماڵی خۆی دڵنیا نەبوو، هەر كەسێك بـچویایە نـاو مەككەوە ئـەمین دەبـوو، ترسـی لـەهیچ شـتێك نـەدەما كەچـی دانیـشتوانی مەككـە سـەرباری ئـەم هـەموو نـازو نیعمەتانە: كە گەورەترینییان رەوانە كردنی حـەزرەتی محەممـەد بـوو بـۆ سـەریان ئـەوان كـوفرانی نیعمـەتیان كـرد، سـپڵەییان نوانـد ئـیتر خـودا بـەرگی تـرس‌و برسـییەتی بەبـەردا كـردن، بـەڵام ئـەوان تـەمبێ خـواردوو نـەبوون، بـەرەنگاری پێغەمبـەریان كـردو بـەردەوام بـوون لەسـەر هەڵوێـستی نامەردانـەی خۆیـان، ئـیتر پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ كردن، فەرمووی: (اللهم أشدد وطأتـك علی مـضر، واجعلها علیهم سنین كسني یوسف) ئـیتر گرانیـەكی وایـان بەسـەردا هـات هیـچیان نـەما، برسـایەتی تینـی بـۆ هێنـان، وایـان لێ هـات لاكـە تۆپیویـان دەخـواردن ئێـسقانیان دەسـوتاندن‌و دەیـانخواردن، وشـتریان سـەر دەبـڕی هەنـدێ هـەژارو نـەبوو كوڵـك‌و خوێنەكـەیان تێكـەڵاو دەكـردو دەیـانخوارد بـەم جـۆرە خواردنـە دەگـوترێ: (عِلهِـز) كەسێك زۆر برسیایەتی تینی بۆ نەهێنی ئەم شتە ڤێزەونە ناخوا.

ئیمـامی رازی دەفـەرموێ: وا پێدەچـی ئـەم شـارەی كـە ئایەتەكـە باسـی دەكـا غەیری مەككە بێ، چونكە ئەم شارە بەنموونە بۆ مەككە هێندراوەتـەوە، ئاشكراشـە نموونەی هێنراوە بۆ مەككە غەیری مەككەیە. واتە: ئەم مـەثـەلە پەنـدو عیبرەتـە بۆ هـەموو شـارێك بەتایبـەتی بـۆ مەككـەو مەككەییـەكان، ترسـاندنیانە لـەئاكامی

سەرپێچی‌و بێدینییان، نموونەیە بۆ هەموو گەل‌و نەتەوەیەك خودا نازو نیعمەتی پێ بەخشی بن‌و ئەوان لەخۆیان بایی بن‌و یاخی بن، کافر بن‌و پشت هەڵ بکەن‌و خودا قارو غەزەبیان لێ بگری!

بێگومان ئەم حاڵ‌و وەزعەی ئایەتەکە باسی دەکا زۆر باش بەسەر حاڵ‌و وەزعی مەککەو دانیشتوانەکانی دا دەسەپێ! ئەوەتا پەروەردگار کابەی تێدا بنیات ناوە، کردویەتی بەشارێکی رێزدارو ئەمین، هەر کەسێ بچێتە ناوی دڵنیاو بەصەبرو نارامە، کەس دەستی بۆ درێژ ناکا، تەنانەت کابرا دوژمنی بابە کوشتەی خۆی لەوێدا دەبینێ پەلاماری ناداو نایکوژێتەوە، دانیشتوانی دەورو بەری مەککە هەمیشە لەشەڕو ناخۆشی دا بوون، هێرشیان دەکرایە سەر، خۆیان دەفرێندران، ماڵ‌و سامانیان تالآن دەکرا، ئافرەتیان دەفرێندران، کەچی دانیشتوانی مەککە لەسایەی کەعبەدا دڵنیاو بێ ترس ژیانیان بەسەر دەبرد، بێ خەم‌و خەفەت‌و بێ ئاژاوەو گێژاو!! هەروەها لەهەموو لایەکەوە بەهۆی قافڵەو قەتاری بازرگانییەوە رزق‌و رۆژییان بۆ دەهات، هەرچەندە شاری مەککە کەوتۆتە هەرێمێکی رەقەن‌و چەقەن‌و بێ کشت‌و کاڵ، کەچی هەمیشە هەموو جۆرە میوەو بەروبومێکی بۆ کێش دەکرا، بەبێ ئاژاوەو بەتێرو تەسەلی ژیانیان بەسەر دەبرد (کوردی گوتەنی لەتەڕی دەیانخواردو لەوشکی دەنوستن).

ئەمجار پێغەمبەرێك لەخۆیان بەزمانی خۆیان پەیامی بۆ هێنان، دەیانناسی، دەیانزانی: کە راستگۆو ئەمینە، هیچ خراپەو خراپەکارییان لێ نەبینی بوو، ئایینی ئیبراهیمی بۆ زیندو کردبوونەوە؛ ئەو ئیبراهیمەی کابەی دروست کردبوو! پەیامی خودا پەرستی بۆ هێنان‌و پێی راگەیاندن، کەچی بەدرۆیان خستەوە، پەیامەکەیان رەتکردەوە. ئەزیەتیان دا قەستی کوشتینان کرد...هتد.

## خۆراكى حەڵاڵ و خۆراكى حەرام

﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار هەڕەشەی لەکافرەکان کرد لەسەر ئەوە: کە سپڵەیی بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا دەنوێنن، پەندو مەثەلی بۆ هێنانەوە بۆ ئەوەی واز لەهەڵوێستی خۆیان بێنن، ئەمجار لەم ئایەتانەشدا فەرمان بەموسوڵمانان دەکا کە خواردەمەنی حەڵاڵ بخۆن و سوپاسی نیعمەتەکانی بکەن.

بەکورتی پێیان دەفەرموێ: کە ئێوە وازتان لەکوفر هێناو ئیمانتان قبوڵ کرد ، ئیتر خواردەمەنی حەڵاڵ و زوڵاڵ بخۆن، ئەوە دەستکەوت و غەنیمەتە بۆتان. واز لەخواردنی مردارەوەبوو لاکە تۆپیو بهێنن، ئەمجار ئەوەیان بۆ رون دەکاتەوە: کە حەڵاڵکردن و حەرامکردن بەهەوانتەو هەواو هەوەس نابێ، حەڵاڵ و حەرام بەعەقڵکاری نابێ، بەڵکوو پێویستی بەبەڵگەو دەلیلی شەرعی هەیە.

دەفەرموێ: ﴿فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمْ اللَّهُ حَلالاً طَيِّباً وَاشْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ دەبخۆن و بخۆنەوە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! لەرزقی پاک و حەڵاڵی بەسود: کە خودا بۆی رەخساندون، شوکرو سوپاسی خودای لەسەر بکەن، ئەو پەلەوەرو ئاژەڵانەی خودا رێگەی پێداون سودیان لێ ببینن هێلکەو شیرو ماست و پەنیرو رۆنەکەیان بخۆن، سەریان ببڕن گۆشتەکەیان بخۆن، بەخۆڕایی لەخۆتانیان حەرام مەکەن، سپڵە مەبن سوپاسگوزار بن، چونکە خودای خاوەن نیعمەت، فەضل و بەخشش، شیاوی سوپاس و پەرستشە، تاک و تەنهاو بێ شەریکە، دەی ئەگەر ئێوە راست دەکەن ئەو خودایە دەپەرستن، پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی بن، سەرپێچی یاساو شەریعەتی مەکەن!!

بەردەوام بن لەسەر پابەند بوون بەفەرمان و نەهیەکانی خوداوە، قورئانی بۆ ناردون و شوێنی بکەون!

جا چونکە هەمیشە حەڵاڵ زۆر ترە لەحەرام، گونجاو بوو کە خۆراکە حەرامەکان دیاری بکا بۆ ئەوەی بزانین جگە لەو دیاری کراوانە ئیتر هەموو

خواردەمەنیەکی تر بۆ ئێوە حەڵاڵو سود بەخشە، ئەگەر بەگوێرەی شەریعەتی خودا دەستیان بۆ بەرن، نەچن لەخۆتانەوە بەهەوانتە (بەحیرەو سابیئەو وەصیلەو حام)و ئەم جۆرە شتانە بێننە کایەوە. شتێك: کە خودا بۆی حەڵاڵ کردون ئێوە بەهەوانتە لەخۆتانی حەرام بکەن، هەرچی لەجیهاندا هەیە حەڵاڵو پاكو خاوێنە بۆ ئێوە، دەتوانن سودی لێ وەربگرنو بەکاریان بێنن.

﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ ئەوەی: کە حەرامە لەسەر ئێوەو نابێ لەکاتی ئاسایی دا بیانخۆن گۆشتی مردارەوەبوو خوێنی رەوانو گۆشتی بەرازو گۆشتی هەر ئاژەڵێك بەغەیری ناوی خودا سەر ببڕدرێو سەر بڕینەکەی بۆ رێزگرتن لەغەیری خودا بێ وەکوو ئەو ئاژەڵانەی لەسەر بەردە تایبەتیەکان (نصب) سەریان دەبڕن بۆ بتەکان. ئەم جۆرە سەربڕاوانە خواردنی گۆشتەکەیانو سود بینین لەکوڵكو موویان، حەرامو پیسەو توخنی مەکەون.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرمووده‌یەکدا فەرموویەتی: (ملعون من ذبح لغير الله) نەفرین لێکراوە کەسێك ئاژەڵ لەسەر ناوی غەیری خوداو بۆ رێزلێنان لەغەیری خودا سەر ببڕێ.

بەکورتی هەر ئاژەڵو پەلەوەرێك لەکاتی سەربڕینی دا ناوی غەیری خودای لەسەر بهێندرێ، وەکوو ئەوە ناوی بتو صەنەم یان ناوی جندۆکە یان ناوی پێغەمبەرو پیاوچاکی لەسەر بهێندرێ، جا ئەم پیاو چاکانە زیندو بن یان مردو بن گۆشتی ئەو سەربڕاوە حەرام دەبێ، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ ناوی ئەوانەدا ناوی خوداش بێنێ هەر حەرام دەبێ. چونکە ئەو حەیوانە بۆ غەیری خودا سەربڕاوە. کەوابوو کەسێك حەیوانێك سەربڕێو لەکاتی سەربڕینی دا ناوی پێغەمبەر ﷺ یان عەبدولقادری گەیلانی یان کاکەحەمەدی شێخ یان سەید ئەحمەدی روفاعی یان سەید ئەحمەدی بەدەوی...هتد لەسەر بێنێ ئەو گۆشتە حەرام دەبێو خواردنی دروست نیە زۆر جار لەکوردەواری خۆمان دا کابرا حەیوانێك سەر دەبڕێ لەکاتی

سەربڕینی دا دەڵێ: ئەمە مەولوودی پێغەمبەرە یان بۆ خێری عەبدولقادری گەیلانییە، ئەم جۆرە ناو هێنانە خواردنی گۆشتی ئەو سەربڕاوە حەرام دەکا!!!

بێگومان ئەم چوار خۆراکە حەرامە لەمەپێش لەسێ سورەتی تردا باسکراون: لەسورەتی (البقرة/١٧٣) ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ....الآية﴾ لەسورەتی (المائدة/٣) ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ...الآية﴾و لەسورەتی (الأنعام/١٤٥) ﴿إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً...الآية﴾.

دەبێ ئەوەش بزانرێ: ئەو گۆشتە حەرامانەی لەسورەتی (المائدة)دا باسکراون وەکوو (المنخنقة، الموقوذة، المتردية، النطيحة...هتد) ئەمانە دەچنە چوار چێوەی مردارەوە بووەوەو حوکمی ئەویان هەیە.

ئەمجار پەروەردگار هەندێ حاڵەتو بارودۆخ لەو حوکمە گشتییە چەرت دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ کەسێك ناچار بوو برسیایەتی تینی بۆ هێناو بڕستی لێ بڕیو لێی مەعلووم بوو ئەگەر لەو خۆراکە حەرامە نەخوا دەمرێو بەهیلاك دەچێ، بۆی ڕەوایە خواردنە حەرامەکە بخواو خۆی تووشی فەلاکەت نەکا، بەمەرجێ ئەو خۆراکە حەرامە بەشی ناچارێکی تر نەبێو لێی داگیر بکا یان لێی بڕفێنێو بۆخۆی بیخواو کابرای تر لەبرسا بمرێ! هەروەها دەبێ ئەوەندە لەو حەرامە بخوا کە برسیایەتیەکەی نەهێڵێ نەك بچێ خۆی لێ مربکاو تا دەتوانێ لێی بخوا: واتە: نابێ لێ خواردنەکەی بگاتە ئەندازەی تێریو هەڵاوسان. خودای بەرزو مەزن تاوانبەخشو میهرەبانە دەرحەق بەو کەسانەی لەکاتی ناچاریدا لەخۆراکی حەرام دەخۆنو بەگوێرەی پێویست نەفسی خۆیانی پێ کوێر دەکەنەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە دەگوترێ: ئادەمیزادی برسی چاری ناچارە لەو حەرامە بخوا، دەی بەچ موناسەبەو هۆیەکەوە وشەی (غفور) لێرەدا بەکار

هێنـراوە، خۆ ئـەو کابرایـە تـاوانی نـەکردوە تـا خـودا لێی خـۆش ببـێ! لـەوەڵامدا دەڵێین: راگرتنی ئەندازەی چاری ناچارو دەست نیشانکردنی، زۆر قورس‌و گرانـە، زوربەی کات ئـەو ئـادەمیزادە ناچـارانە سـنوور بـەزێنی دەکـەن‌و زیـاد لەئەنـدازەی شەرعی دەخۆن، بۆیە موناسیب بـوو لێـرەدا باسـی میهرەبـانی‌و تاوانبەخشی خـودا بکرێ!

ئەمجار جڵەوگیری لەپەیڕەوکردنی ڕێبازی موشـریکەکان دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَلا تَقُولُوا لِمَـا تَـصِفُ أَلْـسِنَتُكُمْ الْكَـذِبَ هَـذَا حَـلالٌ وَهَـذَا حَـرَامٌ﴾ نەچـن وەکـوو موشـریکەکان بکـەن بەهەوانتـەو بەهـەواو ئـارەزۆ شـت حـەڵاڵ یـان حـەرام بکـەن، نـەچن وەکوو موشریکەکان بەهەواو هەوەس بڵێن: ئەوەی لەسکی ئـەم ئاژەڵانەدایـە تایبەتــە بەنێرینــەکانمان‌و یاســاغە لەســەر خێزانــەکانمان، مردارەوەبــوو خــوێنی رەوان‌و گۆشتی بەراز مەخۆن.

## بەکورتی:

هـەر لەبـەر قـسە کردنـی زمـانی خۆتـان، بـەدرۆ بـەبێ بەڵگـەو حوججـەت، مـەڵێن: ئـەوە حەرامـەو ئـەو حەڵاڵـە. بـەبێ ڕێنومـایی شـەریعەتی خـودا، هـەر لەخۆتانەوە ئەو خواردنە حەڵاڵ مەکەن‌و ئەو خواردنە حەرام بکەن!!

﴿لِتَفْتَـرُوا عَلَـى اللَّـهِ الْكَـذِبَ﴾ بـۆ ئـەوەی سـەرەنجام بـەدەم خـوداوە درۆ هەڵبەستن، حەڵاڵکردن‌و حەرامکردنەکە پاڵ خودا بدەن، بـەبێ ئـەوەی خـودا هـیچ جۆرە تەشریعێکی لەو بارەوە نازڵ کرد بێ، خـودا هـیچ شـتێکی لـەو شـتانەی ئێـوە بەحەرامتان داناوە، حـەرام نـەکردوە، هـەروەها هـیچ شتێکیـشی لـەو شـتانەی ئێـوە بەحەڵاڵی دادەنێن حەڵاڵ نەکردوە. کەوابێ ئێـوە بـەدەم خـوداوە درۆ هەڵمەبەسـتن چونکە ﴿إِنَّ الَّـذِينَ يَفْتَـرُونَ عَلَـى اللَّـهِ الْكَـذِبَ لا يُفْلِحُـونَ﴾ بێگومـان ئەوانـەی درۆ لەسـەر خـودا هەڵدەبەسـتن لـەدونیاو قیامـەتدا رزگاریـان نابـێ، هـەرگیز بـەمراز ناگەن‌و لەهەردو دونیادا بێ نرخ‌و ریسوان.

ئـەبو نـەضـرە هـاوەڵێکی پێغەمبـەرە ﷺ دەفـەرموێ: ئـەم ئایەتـەی سـورەتی (النحل)م شەوێك خوێندەوە ئیتر لەو کاتەوە تا ئـەمڕۆ ترسـاوم نـاوێرم فتـوا بـدەم. راستیان گوتووە: هەر کەسێ فتوا بەپێچەوانەی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر بـدا لەبەرنەزانیو تێنەگەییشتن بێگومان بۆ خۆی گومڕا بـووەو ئـەو کەسەشـی گومڕا کردوە: کە فتوای بۆ داوە.

ئـەمجار ئـەوە روون دەکاتـەوە: کـە ئـەو دەسـتکەوتانەی بـەدرۆ هەڵبەسـتن، دەستیان دەکەوێ شتێکی کەمو کەمبایەخە. دەفـەرموێ: ﴿مَتَاعٌ قَلِيـلٌ وَلَهُـمْ عَـذَابٌ أَلِـيمٌ﴾ ئـەو کاڵایـەی بـەدرۆ هەڵبەسـتن لەسـەر خـودا چـنگیان دەکـەوێ هـیچو بـێ نرخە، تاوێکەو دەڕوا، سێبەری دارەو پایەدار نیە، ماوەیەکی کورتەو بەسەر دەچێ، ئـەوەی بۆیـان دەمێنیتـەوە عـەزابی بەئێـشی دۆزەخـە، کـە بـۆ هـەتا هەتایـە تێیـدا دەمێننەوەو لێی قوتار نابن. لەبنەڕەتدا ئایەتەکە خیطابـە بـۆ ئـەو موشـریکانەی (بەحیرەو سائیبەو وەصیلەو حـامی)یـان داهێنـا بـوو بـەختوخۆڕایی گۆشـتی ئـەم ئاژەڵانەیان لەخۆیان حەرام کردبوو.

دوای رونکردنــەوەی حــەڵاڵو حــەرامو موبــاح بــۆ موســوڵمانان باســی ئــەو خواردنانە دەکا: کـە لـەکاتی خۆیـدا لەنەتـەوەی جولەکـە یاسـاغ بـووە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِـنْ قَبْـلُ﴾ واتـە: حـەرامەمان کـرد لەسـەر ئەوانەی جولەکە بوون ئەو خواردنانەی لەمەوپێش بۆمان گێڕایتەوە، ئاماژەیـە بـۆ ئایەتی (١٤٦) لەسورەتی (الأنعام) کە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَـا كُـلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَـا أَوْ مَـا اخْـتَلَطَ بِعَظْـمٍ﴾ کـەوابوو بـۆ ئێـوە دروسـت نیـە ئـەی گـەلو نەتـەوەی پێغەمبـەری ئاخرزەمـان! کـە لەخۆتانـەوە خـواردن حـەڵاڵو حـەرام بکـەن، لاسـای جولەکـەکان مەکەنەوە لەو شتانەی لێمان حەرام کردبوون.

﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ﴾ ئێمە ستەممان لێ نەکردن: کە ئەو شتانەمان لێیاساغ کردن ﴿وَلَكِنْ كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵکوو ئەوان بۆخۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد بەوە: کە تاوانیان ئەنجام دان، هەتا ئێمەش لەبەر حەرامکردنی ئەو شتانە سزامان دان!

بێگومان نەتەوەی جولەکە شیاوی ئەو خۆراك لێ یاساغکردنە بوون، چونکە سنور بەزێنییان کردبوو، سەرپێچی فەرمانی خودایان کرد، کەوابوو بۆخۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، خودا ستەمی لێ نەکردن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾النساء/١٦٠. کەوابوو هۆی خواردن لێ یاساغکردنەکە خۆیان بوون.

﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا السُّوءَ بِجَهَالَةٍ﴾ پاشان خودای خاوەن سۆزو بەزەیی دەرحەق بەو کەسانەی بەنەزانی تاوانێکیان لێ رودەدرێ‌و سوور نابن لەسەری‌و بەردەوام نابن لەئەنجامدانی ﴿ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا﴾ پاشان تۆبەی لێ دەکەن‌و پەشیمان دەبنەوە، دەست دەکەن بەئەنجامدانی کردەوەی باش‌و خۆیان راستاڵ دەکەن ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! لێخۆشبوونی زۆرو بەرفراوانە، بەشی هەموو کەس دەکا، هەر کەسێ بەدڵ لەتاوانەکانی پەشیمان ببێتەوە رەحمەت‌و لێخۆشبوونی خودا دەیگرێتەوە رەحمەت‌و لێخۆشبوونی خودا پەیوەستن بەتۆبەو پەشیمانبوونەوە لەتاوان‌و چاکەکاری بەگوێرەی شەریعەتی خودا، جا کەسێك تاوان بکا بەنەزانی‌و نەفامی پاش ئەنجامدانی تاوانەکە پەشیمان ببێتەوە پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی پەروەردگار بێ‌و بەگوێرەی شەریعەتەکەی هەڵس‌و کەوت بکا، ئەوە بێگومان خودا لێی خۆش دەبێ، لەدونیاو قیامەتدا رەحمی پێ دەکا!

## رەوشت و پلەو پایەی ئیبراهیم و شوێنکەوتنی ئایینەکەیو ڕێزگرتنی جولەکە لەرۆژی شەممە

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾

ئەمجار بەبۆنەی باسکردنی شتە یاساغکراوەکان لەسەر گەلی جولەکە لەکاتی خۆیدا، هەروەها بەبۆنەی ئیدیعا کردنی موشریکەکانی قورەیش: کە لافی ئەوەیان لێدەدا دەیانگوت: ئێمە لەسەر ئایینی ئیبراهیمینو ئەوەی حەرامی دەکەین لەخۆمانو لەقەبەڵی خوداکانمانی دەکەین ئەوە بەگوێرەی ئەو ئایینەیە، لێرەدا سیاقی قورئانەکە باسی حەزرەتی ئیبراهیم دەکاو ئایینی پاکیو رەوشتی بەرزی رادەنوێنیو پەیوەندییەك لەنێوان ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمو ئایینی تازەهێندراو لەلایەن حەزرەتی موحەممەدەوە دروست دەکاو ئەوە رون دەکاتەوە کە ئەو شتە یاساغکراوانە لەنەتەوەی جولەکە لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمدا نەبوەو چ

پەیوەندییەکی بەئایینی ئیبراهیمەوە نیە، وەصفی ئیبراهیم دەکا: کە پێشەواو رابەری یەکتاپەرستان بووە، هەرگیز هاوەڵی بۆ خودا دانەناوە، سوپاسگوزارو فەرمانبەرداری پەروەردگار بووە، جا کە ئەوان راست دەکەن لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمن دەبا شوێنی بکەونو پابەندی ئایینەکەی بن، چونکە ئایینی ئەو بناغەو کاکڵەی ئایینی ئیسلامەو هەر کەسێك شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەوێ شوێن ئایینی ئیسلام کەوتووە، ئەمجار دوای وەصف کردنی ئیبراهیم بەو رەوشتە بەرزانە فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەوێ: کە ئایینی یەکتاپەرستییە. ئایینی بت شکێنو صەنەم ترۆ کردنە، ئایینی خۆتەسلیم کردنە بەخوداو پشت بەئەو بەستنە!!

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبۡرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً﴾ بێگومان ئیبراهیم کە باپیرە گەورەی ئێوەیە، ئێوەی جولەکە لافی ئەوە لێدەدەن کە لەسەر ئایینی ئیبراهیمن، ئێوەی عەرەبی بتپەرستیش لافی ئەوە لێدەدەن کە ئەو زاتە باپیرە گەورەی ئێوەیە. دەی ئەو زاتە نموونەی ئادەمیزادی یەکتاپەرستو هیدایەتدراوو هیدایەتدەرو فەرمانبەردارو سوپاسگوزاری پەروەردگار بوو، بەتەنیا خۆی ئوممەتێ بوو، هاو تەرازووی ئوممەتێ بوو لەبەر ئەوە ئەوەندە خووو رەوشتی بەرزو پەسندی تێدا بوون بەئەندازەی خووو رەوشتی گەلو نەتەوەیەکی هەڵبژاردە رەوشتی جوانی تێدا گرد ببونەوە.

یان (أمة) بەمانا پێشەواو رابەری خێرو چاکەیە، واتە: ئیبراهیم پێشەوایە بۆ هیدایەتو خێرو ئایینی حەق.

هەردو ماناکە نزیکن، چونکە پێشەواو رابەر بۆ رێبازی حەقو ئایینی راست لەو کاتەدا کە پێشەوایەو هیدایەتی خەڵك دەدا بۆ ئایینی حەق خێرو پاداشی خۆی هەیەو خێرو پاداشی ئەوانەشی هەیە: کە شوێن پەیامەکەی دەکەون،

کەوابوو بەئەندازەی گەل‌و نەتەوەیەك خێرو پاداشی دەست دەکەوێ، ئەو کەسە گەل‌و نەتەوەیەکە نەك تاکە کەس!

﴿قَانِتاً لِلَّهِ﴾ لەخودا ترس بوو، فەرمانبەرداری پەروەردگاری خۆی بوو، بەباشی‌و دڵسۆزی خوداپەرستی دەکرد

﴿حَنِيفاً﴾ وازی لەبتپەرستی‌و هاوەڵدانان بۆ خودا هێنابوو بەتەواوی روی کردبوە خوداو لێ براببوو بۆ خوداپەرستی‌و ﴿وَلَمْ يَكُنْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ هەرگیز لەپێڕو تاقمی موشریکان نەبوە، بەمندالی‌و گەورەیی یەکتاپەرست بوو، رۆژێك لەرۆژان هاوەڵی بۆ خودا قەرار نەداوە.

﴿شَاكِراً لأَنْعُمِهِ﴾ هەمیشە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی پەروەردگار بووە، بەزمان‌و بەکردەوە شوکری نیعمەتی خودای دەکرد، وەك ئەو موشریکانە نەبوو: کە بەزوبانی ئینکاری نیعمەتی خودا دەکەن‌و بەکردەوە پێی کافرن، هاوەڵ دادەنێن بۆ خوداو دەڵێن: ئەو رزق‌و رۆزییە، هی خوداکانی خۆمانە. خواردنی حەڵاڵ بەهەوانتەو بێ بەڵگەی شەرعی لەخۆیان حەرام دەکەن. بەهەواو هەوەسی خۆیان دەڵێن: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە!!

﴿اجْتَبَاهُ﴾ خودا هەڵیبژاردوە کردویەتی بەپێغەمبەری خۆی، بەبەندەی راستاڵ‌و فەرمانبەرداری خۆی ژماردوە. ﴿وَهَدَاهُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ شارەزای کردوە بۆ رێبازی راست: کە رێبازی یەکتاپەرستییە رێبازی خودا پەرستی راستەقینەیە!!

﴿وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنْ الصَّالِحِينَ﴾ لەژیانی دونیادا چاکەمان پێ بەخشیوە، لای هەموو گەل‌و نەتەوەکان خۆشەویستمان کردوە، هەموو پەیڕەوانی ئایینەکان رێزی لێ دەگرن، لەقیامەتیشدا ئەو زاتە لەپێڕو تاقمی راستاڵانە بۆ خۆی داوای ئەو پلەو پایەی کردوە لەخودا پاڕایەوە بیخاتە

زومرەی صاڵحانەوە وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾الشعراء/٨٣.

**پەروەردگار لەم ئایەتانەدا حەزرەتی ئیبراهیمی بەنۆ صیفەت ئارایش داو نۆ ڕەوشتی بەرزی بۆ دەست نیشان کرد:**

١- ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً﴾.

٢- ﴿قَانِتاً لِّلَّهِ﴾.

٣- ﴿حَنِيفاً﴾.

٤- ﴿وَلَمْ يَكُنْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾.

٥- ﴿شَاكِراً لأَنْعُمِهِ﴾.

٦- ﴿اجْتَبَاهُ﴾.

٧- ﴿وَهَدَاهُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾.

٨- ﴿وَآتَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً﴾.

٩- ﴿وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنْ الصَّالِحِينَ﴾.

ئەمجار دوای ژماردنی ئەم ڕەوشتو سەروەریانە بۆ ئیبراهیم فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا بەوەی شوێن ئەو زاتە بکەوێو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنْ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً وَمَا كَانَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ بەبۆنەی ڕاستی ڕێبازی ئیبراهیمو ڕەوشتی بەرزییەوە نیگامان بۆ تۆ کرد ئەی پێغەمبەر! کە تۆ شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەوێ: ئەو ئیبراهیمەی وازی لەهەموو ئایینێکی بەتاڵو بێ بناغە هێناو ڕوی کردە ئایینی ڕاستو پابەندی یەکتاپەرستی بوو، هیچ کاتێ نەبەمنداڵیو نەبەگەنجیو نەبەپیری هاوەڵی بۆ خودا دانەناوە یەکتاپەرستو خودا پەرستێکی

راستاڵو دڵسۆز بوو، پێغەمبەرێکی خاوەن شکۆو رابەرێکی پیرۆزو خاوەن هەڵوێست بوو.

ئایەتەکە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە شوێن کەوتنی پێغەمبەر بۆ ئایینی ئیبراهیم لەئوصولو بنەما سەرەکییەکاندا بووە، دەربارەی یەکتاپەرستی و رەوشتە بەرزەکانو کردارە چاکەکان بووە. واتە: شوێنکەوتنەکە لەئەوابیتەکاندا بوە نەك لەشتە فروعو موتەغەییراتەکاندا، چونکە بەگوێرەی دەقی قورئانو بەگوێرەی پێشکەوتنی ئادەمیزادو گۆڕانی بارودۆخ پەیڕەوو پرۆگرامی پێغەمبەران گۆڕانکاری تێدا کراوە. هەر پێغەمبەرەو شەریعەتو یاسای خۆی جیابووە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾ المائدة/٤٨.

## بەکورتی:

هەموو پێغەمبەران لەئەوابیتەکاندا یەك ئایینو یەك مەنهەج بوون، لەموتەغەییراتەکاندا جیاوازییان هەبوە!

ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ...الآية﴾ نیشانەیە بۆ بەرزی پلەو پایەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە گەورەترین نیعمەتو پلەو پایە بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ئەوەیە: کە پێغەمبەری ئاخر زەمان شوێن ئایینەکەی بکەوێ.

شوێنکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم ئەوەیە: پەیڕەوی ئایینەکەی بکرێ لەیەکتاپەرستیو خوداپەرستیو رەوشتی بەرزدا، ئەو رۆژی جومعەی دانابوو بۆ زێدە عیبادەت تێدا کردنو کاروباری تایبەتی، حەزرەتی موحەممەدیش هەمان رۆژی هەڵبژاردوە بۆ ئەو عیبادەتە تایبەتیە کە نوێژی هەینییە، چونکە ئەو رۆژە رۆژی شەشەمی هەفتەیەو لەو رۆژەدا پەروەردگار دروستکردنی موخلوقاتی خۆی تەواو کردوە، لەو رۆژەدا نیعمەتەکانی خۆی بەسەر بەندەکانی پەخشان کرد.

دەی بۆ جولەکە رێزی رۆژی شەممە دەگرن و ئەو رۆژەیان کردوە بەرۆژی تایبەتی خۆیان؟ ئەوە ئەم ئایەتە وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ نەوەکوو رۆژی شەممە گێڕدراوە بەرۆژی تایبەتی بۆ جولەکەکان بۆ عیبادەت تێدا کردن، بەهۆی ئیلحاح و پێداگرتنی ئەو کەسانەوەبووکە کەوتنە کێشەو خیلافەوە لەگەڵ حەزرەتی موسادا دەربارەی دامەزراندنی رۆژی شەممە بۆ پشوودان و زێدە عیبادەت تێدا کردن. ئەگینا حەزرەتی موسایش وەکوو حەزرەتی ئیبراهیم هەر رۆژی هەینی دادەنا بۆ عیبادەتکردن، کەوابوو بڕیاردانی رۆژی شەممە شتێکی تایبەتە بەجولەکەکانەوەو لەئایینی ئیبراهیم وەرنەگیراوە، لەئەنجامی کێشەو نیزاعی کۆمەڵ لەبەنوئیسرائیلییەکان هاتە کایەوە. پەروەردگار بۆخۆی ئاگاداری ئەم ئیختیلافەیەو بۆخۆی دەزانێ چییان لەگەڵ دەکا رۆژی قیامەت!

زومەخشەری دەفەرموێ: مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: نەوەکوو ئۆباڵ وتۆڵەی تاوانی رۆژی شەممە بڕیار دراو چەسپا؛ کە بریتی بوو لەمەسخ کردنەوەی برێ جولەکە بەمەیمون و بەراز، بۆ ئەوانەیان بوو کە کێشەیان تێکەوت، ئەوە بوو: ئەوان جارێك راوکردنیان لەشەممەدا بەرەوا دانا، جارێکی تر بەنارەوایان دانا، لەکاتێکدا پێویست بوو لەسەریان کۆڕایان هەبوایە لەسەر یاساغکردنی راو لەو رۆژەدا، بەتایبەتی دوای ئەوەی پەروەردگار هەڵینان: کە خۆیان بپارێزن لەڕاو کردن لەو رۆژەدا، رێزی لێ بگرن و پێشێلی فەرمانی خودا نەکەن. مەبەست لەئایەتەکە، هەڕەشە کردنە لەسەرپێچیکاران و ئەوانەی سنوور بەزێنی دەکەن، خودا ناهێڵێ بەسەریانەوە بچێ و تۆڵەی ئەم ئیختیلاف و گۆڕانکارییەیان لێ دەستێنێ.(١٦) (★★★)

(١٦) تەفسیری کەششاف ج٢/٢٣١.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! ڕۆژی قیامەت دادگایی ئەوانە دەکا: کە کێشەیان تێکەتو خیلافیان لەناودا پەیدا بوو، سزاو تۆڵەیان بەگوێرەی کردەوەو هەڵوێستیان لێ دەستێنێ، هەر کەسە بەپێی کردەوەکەی پاداشی دەدرێتەوەو سزای لێ دەستێنرێ.

## بنەمای بانگەوازی کردن بۆ لای ئایینو یاسای تۆڵەستاندنەوە لەخراپەکاران

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ (١٢٦)﴾ حاکم ریوایەتی کردوەو هەروەها بەیهەقی لە(الدلائل)داو بەزار لەئەبو

هورەیرەوە ریوایاتیان کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر جەستەی حەمزە وەستا: کە شەهید کرابوو پاش شەهید بوون ورگیان هەڵدڕی بوو، بڕێ ئەعضای تریشیان بڕیبوون، بەو دیمەنە زۆر نارەحەت بوو، سوێندی خوارد فەرمووی: دەبێ لەتۆڵەی تۆدا، حەفتا کەسیان لێ ئەتك بکەمەوە، هێشتا پێغەمبەر ﷺ هەر راوەستابوو نەجوڵابوو، حەزرەتی جوبرائیل ئەم ئایەتەی کۆتایی سورەتی (النحل)ی بەنیگا بۆ هێنا، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ تا کۆتایی سورەتەکە. ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەرای خۆی پەشیمان بووەوەو ویستی خۆی نەهێنایە دی.

تیرمیذی فەرموودەیەك ریوایەت دەکاو بەجوانی داناوە، حاکمیش هەمان فەرموودەی لەئوبەی کوڕی کەعبەوە ریوایەت کردوە دەڵێ: کە جەنگی ئوحود کرا شەصت یارمەتیدەر (أنصار)و شەش کۆچکار (مهاجرين) پێکران. یەکێك لەموهاجیرەکان حەزرەتی حەمزە بوو، هەموو شەهیدەکان ئەتك کرابوون، ئەنصارەکان وتیان: ئەگەر رۆژێك لەرۆژان دەستمان بەسەر قورەیشییەکان بڕوا دەبێ لەم ئەندازەیە زیاتریان لێ ئەتك بکەین. جا کە مەککە رزگار کرا پەروەردگار ئایەتی ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ....الآية﴾ی نازڵ کرد !

بەگوێرەی ئەم ریوایەتە، دەبێ ئایەتەکە تا رزگارکردنی مەککە نازڵ نەبووبێ، ریوایەتی پێشووش ئەوە دەگەیەنێ: کە پێش رزگار کردنی مەککە لەئاکامی جەنگی ئوحوددا نازڵ بووبێ.

ئیبنولحەصار بۆ کۆکردنەوەی هەردو ریوایەتەکە دەڵێ: ئەم ئایەتە سێ جار بۆیاد خستنەوە نازڵ بووە، یەکەمجار لەمەککە نازڵ بووە پاشان جارێکی تر لەئوحود نازڵ بووە، جاری سێیەم لەدوای زرگار کردنی مەککە هاتۆتە خوارێ.

جەماوەری موفەسسیرین پێیان وایە: ئەم ئایەتە مەدینەییە دەربارەی سوکایەتی کردن بەحەزرەتی حەمزە پاش شەهید بوونی لەجەنگی ئوحود نازڵ بووە، ئیمام بوخاریش لەصەحیحی خۆیدا لە(کتاب السیر)دا ئەمەی هێناوە.

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشووەوە لەم روەوەیە: پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ کرد: کە پەیڕەوی حەزرەتی ئیبراهیم: (باوکی پێغەمبەران) بکا، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە: کە لەچی دا شوێن ئیبراهیم بکەوێ، بۆی رون دەکاتەوە: کە لەبانگەوازیکردنی ئادەمیزاددا بۆ رێبازی حەق شوێن ئیبراهیم بکەوێ، بانگی ئادەمیزادان بکا بەسێ جۆر بەحیکمەتو ئامۆژگاری جوانو موجادەلە کردن بەشێوەی جوان، بانگەوازیکردنی ئادەمیزاد بۆ ئایینی خودا دەبێ بەشێوەیەکی لەسەرەخۆو هێمن ئەنجام بدرێ، بانگ کراو هەست بەراستیو لەباریی حەقیقەتی ئایینی بانگەوازی بۆ کراو بکا!

ئایەتەکە پەیوەندییەکی پتەوی بەئایەتەکانی پێشووەوە هەیە. بەتەدریجو پلە بەپلە پێدا دێن، سەرەتا بانگ کردن ئەمجار ئامۆژگاری کردن، ئەمجار دانو سانو موجادەلە، ئەمجار پاساو دانەوەی خاوەن کردەوەکان بەگوێرەی کردارەکانیان، ئەمجار پەروەردگار فەرمان دەکا بەلەبەرچاو گرتنی عەدالەتو ویژدان لەهەموو کاروبارێکدا، دەبێ تۆڵەستاندنەوە لەدەستدرێژیکەر بەئەندازەی خۆی بێ، زێدەرەوی تێدا نەکرێ، ئەمجار فەرمان دەکا: بەصەبرو خۆڕاگری لەبەرامبەر تەنگو چەڵەمەو ناڕەحەتیدا، صەبرو خۆڕاگریش بەتۆفیقو یارمەتی خودایە!

بێگومان بانگەوازی کردن بۆ ئایینی خوداو یەکتاپەرستیو رونکردنەوەی بەرنامەی ئەو ئایینە کارێکی پێویستە، ئەرکی سەرەکی سەرشانی پێغەمبەران بەگشتی، بانگەوازیکردنە بۆ ئایینو رونکردنەوەی ئایینە، بۆیە پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا: کە بەحیکمەتو دانایی بانگی ئادەمیزادان بکا بۆ ئایینی خودا دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ ئەی پێغەمبەر!

بانگی ئادەمیزادەکان بکە بۆ لای خودا بەحیکمەتو دانایی، پێیان بڵێ: وەرنـە ژێـر ئاڵای ئیسلامو واز لەهەموو بیرو باوەڕێکی تر بهێنن، بەکاراماییو لێزانی، بەقسەی جـوانو زمـانی شـیرین ئاخاوتنیـان لەگـەڵ بکـە، ئامۆژگـاری وایـان بکـە لـەدڵو دەروونیاندا کاریگـەر بێ، پەنـدو مـەتـەڵی وایـان بـۆ بێنـەوە کە دڵیـان راچڵەکێ، ﴿وَجَـادِلْهُمْ بِـالَّتِي هِـيَ أَحْـسَنُ﴾ بـەچ شـێوەیەك جوانـە موجادەلـەیان لەگـەڵ بکـە، بەهێدیو لەسەرەخۆیی لەگەڵیان بدوێ، ئـەوی پێویـستی بـەموناظـەرەو دانو سـان هـەبێ بـەجوانی لەگـەڵیان بـدوێ، چاوپۆشـی بکـە لەکەسـانێك قـسەتڕنو گوفتـار ناخۆشـن، لەبەرامبـەر خراپـەدا چاکە بکـە، هـەوڵ بـدە لەموجادەلـەو موناقەشـەدا بگەیـە حـەقو حـەق دەربکـەوێ لـەئاخاوتندا دەنـگ بـەرز مەکـەرەوە، جنێـو بەبەرامبەرت مەدە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْـلَ الْكِتَـابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾العنكبوت/٤٦.

ئەمە فەرمانە بەپێغەمبـەر کە نـەرمو نیـان بـێ، قسە رەقو روتـرش نـەبێ، وەکـوو چـۆن فـەرمانی بەحـەزرەتی موسـاو هـارونیش کـرد: کـە نـاردنی بـۆ لای فیرعەون بەلەسەرخۆییو نەرمو نیانی: پـێی فـەرموون ﴿فَقُولَـا لَـهُ قَـوْلاً لَّيِّنـاً لَّعَلَّـهُ يَتَـذَكَّرُ أَوْ يَخْـشَى﴾طـه/٤٤. لەسـەر هـەموو بانگەوازیکـەرێکی ئیـسلامی پێویـستە پابەندی ئەم فەرمانە خودایییە بێ، بەو شێوە بانگەوازی ئادەمیزادان بکا!

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَـدِينَ﴾ بێگومـان خـودای تۆ ئەی موحەممەد! زانـاو ئاگادارە بەوانـەی لـەرێبازی خـودا لایـان داوەو ئەوانـەی هیدایـەتیان دراوە، دەزانـێ: کـێ بەدبەختـەو کـێ بەختـەوەرە، هـەر خـودا خۆشـی لەرۆژی خۆی دا سـزاو پاداشـیان دەداتـەوە، حیـسابو لێکۆڵینـەوەو تۆڵەو پاداشـیان لای خودایە، لای تـۆ نیـە ئـەی پێغەمبـەر! هیدایـەتی ئـەوان بەدەسـت تـۆ نیـە هـەر راگەیاندنت لەسـەرەو حیـسابیان لای خودایـە وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَـشَاءُ﴾القـصص/٥٦. یـان دەفـەرموێ:

﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾البقرة/٢٧٢ هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ تا بلێی نەرمو نیان بووە لەبانگەوازیکردندا ئەوپەڕی حیکمەتو دانایی بەکارهێناوە لەراکێشانی خەڵك بۆ ئیسلام... دەربارەی نەرمو نیانی پێغەمبەر ﷺ ئەبو ئومامە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کوڕێکی گەنج هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی رەوانەکراوی خودا رێگەم دەدەی زینا بکەم؟ ئیتر خەڵکەکە بەروی دا هەڵشاخانو لێی تورە بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دادەی لێمی نزیك بکەنەوە، لێی نزیك بووە تا چوو لەبەردەمی لەخزمەتیدا دانیشت، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا تۆ پێت خۆشە خەڵکی وا لەگەڵ دایکت بکەن؟ وتی: قوربان! نەخەیر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دە خەڵکیش وەکوو تۆ پێیان ناخۆشە شتی وا لەگەڵ دایکیان بکرێ. ئەمجار فەرمووی: تۆ پێت خۆشە وا لەکچەکەت بکەن؟ وتی: نەخەیر قوربان! پێم خۆش نیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دە خەڵکیش پێیان ناخۆشە شتی وا لەگەڵ کچیان بکرێ! ئایا پێت خۆشە خەڵکی شتی وا لەگەڵ خوشکت بکەن؟ وتی: نەخەیر قوربان! فەرمووی: دەی خەڵکیش ئاوا پێیان ناخۆشە.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە سەرسنگیو فەرمووی: (اللهم طهر قلبه، واغفر ذنبه، وحصن فرجه فلم یکن شيء أبغض الیه منه).

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر کرد: کە بەهێدیو هێمنی بەحیکمەتو دانایی بانگەوازی ئەنجام بدا.

ئەمجار فەرمان دەکا بەعەدالەتکاریو ویژدان بەکارهێنان لەکاتی تۆڵەستاندنەوە لەدەستدرێژیکار، بەئەندازەی تاوانەکەی تۆڵەی لێ بسێندرێتەوە، چونکە بانگەوازی وا دەبێ سەردەکێشێ بۆ رق هەڵسانی کەسانی دیکەو پەنابردنیان بۆ کوشتنو ئەزیەتدانی بانگەوازیکەران، ئالەم کاتەدا کە تۆڵە کرایەوە نابێ زیاد لەتاوانەکەی تۆڵەی لێ بکرێتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ

بِهِ﴾ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئەگەر سزای خراپەکارتان دا بەئەندازەی تاوانەکەی تۆڵەی لێ بکەنەوە، زێدەڕەوی مەکەن زیاد لەئەندازەی تاوان تۆڵە مەسێننەوە.

پاشان داوا لەموسوڵمانان دەکا: کە لەوە بەرزتر بن هەوڵی تۆڵەستاندنەوە بدەن، بەڵکوو بەصەبرو ئارام بن، دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ﴾ ئەگەر ئێوە پشو درێژبن‌و، بە صەبرو ئارام بن‌و واز لەتۆڵەستاندنەوە بێنن عەفوویان بکەن‌و مەبەستتان پاداش‌و ئەوابی پەروەردگار بێ ئەوە زۆر باشترە بۆ ئێوەی خاوەن صەبرو ئارام، تۆڵە ستاندنەوە حەواڵەی خودا بکەن. ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە بەئەو ڕەوشتە بەرزە خۆی بڕازێنێتەوە، لەبەرامبەر ئەزیەتدانی نەفاماندا پشوو درێژ بێ دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللَّهِ﴾ بەصەبرو ئارام‌و پشوو درێژ بە لەبەرامبەر ئەزیەتدانی خەڵکدا، دڵنیاش بە بەصەبرو ئارامیت لەخوداوەیە، ئەگەر یارمەتی‌و تۆفیقی خودا نەبێ ئەتۆ ناتوانی بەصەبر بی، کەوابێ داوا لەخودا بکە صەبرو ئارامت پێ ببەخشێ تا بتوانی پەرە بەبەرنامەکەی خۆت بدەیی‌و ئەرکی سەرشانت بەئەنجام بگەیەنی!

﴿وَلا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! بەپشت هەڵکردنی موشریکەکان لەپەیامەکەت دڵتەنگ مەبە، گوێ مەدەرە هەڵوێستی ناشیرین‌و بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرایەتیەکەت. ئەوە تەقدیری خودایەو وای بڕیار داوە! یان ئەتۆ دڵگران مەبە بۆ شەهیدانی ئوحود، بەصەبرو ئارام بە.

﴿وَلا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِمَّا يَمْكُرُونَ﴾ دڵتەنگ مەبە لەو فرت‌و فێڵانەی ئەو موشریکانە ئەنجامی دەدەن، بەتێکۆشانی بەردەوامیان بۆ دژایەتی کردنی پەیامەکەت تەنگەتاو مەبە، گوێ مەدە بەهەواڵدانیان بۆ شەڕ پێکەیاندت، چونکە خودا پشتیوان‌و یارمەتیدەرتە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلاَ يَكُن فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ لِتُنذِرَ بِهِ﴾الأعراف/۲. یان دەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكٌ بَعْضَ مَا يُوحَى

إِلَيْكَ وَضَآئِقٌ بِهِ صَدْرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَاء مَعَهُ مَلَكٌ إِنَّمَا أَنتَ نَذِيرٌ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾هود/١٢.

خودا بەستە بۆ یارمەتیدانو بەهانا هاتنتەوە. زاڵت دەکا بەسەریاندا چەندێك هەوڵ بدەنو بیانەوێ زیانت پێ بگەیەنن دەستیان ناگاتێو ناتوانن ناتوانن بەرهەڵستی پەیامی پیرۆزت بکەن!

﴿إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ بێگومان هەمیشە پەروەردگار لەگەڵ ئەو کەسانەدایە: کە خۆیان لەمەحاریمەکانی دوورەپەرێز دەگرنو ترسی سزاو تۆڵەی بێ ئامانی ئەویان هەیە، هەروەها لەگەڵ ئەوانەدایە: کە بەجوانیو رێكو پێکی کارەکانیان ئەنجام دەدەنو ئەرکەکانی سەرشانیان جێ بەجێ دەکەن، پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی خودای خۆیانن، مافی کەس داگیر ناکەن، تەقواکارو چاکەکارن، لەترسی خودا وازیان لەشتە حەرامەکان هێناوە، کارو کردەوەی باشو بەسوود ئەنجام دەدەن!

ئەم لەگەڵ بونو یارمەتیدانەی خودا بۆ خوداپەرستان، چەند جارێك لەقورئاندا دووبارە بۆتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ﴾الأنفال/١٢. یان کە بەموساو هارون دەفەرموێ: ﴿لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾طـه/٤٦. هەروەها ئەو وتەی پێغەمبەر کە لەئەشکەوتەکەدا بەئەبوبەکری فەرموو: ﴿لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا﴾التوبة/٤٠.

بەڵێ بەو جۆرە کۆتایی بەسورەتی (النحل) هێناو ئامۆژگاری پێغەمبەری کرد چۆن هەڵسو کەوت بکا لەگەڵ ئەوانەدا کە بانگەوازییان دەکا بۆ ئیمان هێنان، ئەم ئامۆژگاریکردنە ئامۆژگارییە بۆ هەموو ئەوانەی پاش پێغەمبەر بەکاری بانگخوازی هەڵدەستن، ئامۆژگارییان دەکا: کە بەپیرەوە نەهاتنی بانگ کراوان نائومێدیان نەکا، ئەوان ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەنو هیدایەتو

گـومڕایی بەدەسـت خودایـەو بـەگوێرەی داب‌و نـەرێتی خـۆی لەبوونـەوەرداو لەسروشـتی دڵ‌و دەروونـەکانداو ئامادەباشـی ئـەو دڵانـە بـۆ هیدایـەت‌و گـومڕایی ویستەکانی خۆی دێنێتە کایەوە..

نابێ بانگخوازانی ئیسلام بـەفرت‌و فێڵی کـافرو بـێ بڕوایـان خەفـەتبار بـبن، ئەو داعی ئایینی خودایەو خودا پارێزەرو یارمەتیدەریەتی، لەفرت‌و فێڵ‌و پیلانـی ئەوانە دەیپارێزێ‌و یارمەتی دەدا. بەمەرجێ دڵسۆز بێ بۆ پەیامەکەی‌و مەبەسـتی تایبەتی خۆی نەبێ!

وا دەبـێ خـودا رێگـە دەدا ئەزیـەتی بـانگخواز بـدرێ بـۆ ئـەوەی ئەنـدازەی صەبرو بەئارامی خۆی بزانێ، کۆمەکی پێکردنی دوا دەکەوێ تـا دەربکـەوێ چـەند متمانەی بەخودای خۆی هەیە، بەڵام سەرەنجامی ئاشکراو دیار بـۆ خـودا پەرسـتانە چونکە کەسـێك خـودای لەگـەڵ بـێ‌و خـودا پـشتیوانی بـێ کـەس ناتوانـێ زەفـەری لێبێنێ!

**بەیارمەتی خودا لەپاکنوسی جزمی چواردەیەم بوومەوە بەمەش سورەتی نەحل تەواو دەبێ خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی جزمەکانی تر ...**

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی الإسراء

ئـەم سـورەتە نـاونـراوە بـە(الإسـراء) چـونکە بەباسـی مـوعجیزەی شـەوڕەوی پێغەمبـەر ﷺ لەمەککـەوە بـۆ مەدینـە دەسـت پـێ دەکـا. هـەروەها نـاوێکی تریـشی هەیە، پێی دەگوترێ: سورەتی بەنی ئیسرائیل چونکە چیرۆکی پەرتـەوازە بـوونو ئـاوارە بـوونی نەتـەوەی ئیـسرائیلی تێدایـە، دووجـار بـەهۆی فەسـادو بەدفەسـاڵی خۆیان لەزێدو نیشتمانی خۆیان وەدەرنران!

دەربارەی گـەورەیی ئـەم سـورەتە ئیمـام ئەحمـەدو تیرمیـذیو نەسـائیو هـی تریش لەعائیشەوە ریوایەت دەکەن: کە پێغەمبەر ﷺ لەهـەموو شـەوێکدا سـورەتی بەنوئیسرائیلی (الاسراء)و (الزمر)ی دەخوێند!

ئیمامی بوخاریو ئیبنو مەردەوەیهی لەئیبنو مەسعودەوە ریوایـەت دەکـەن: کـە پێغەمبـەر ﷺ دەربـارەی سـورەتی بـەنی ئیـسرائیل واتـە: سـورەتی (الاسـراء)و (الکهف)و (مریم)و (طه)و (الأنبیاء) فەرمووی: ئەم سورەتانە دەستەگوڵی یەکەمن! هەموویان مەککەیین. هەموویان چیرۆکو سەرگورشتەیان لەخۆ گرتوون!

ئەم سورەتە وەکوو وتمان مەککەییە، بەتەسبیحاتو تەنزیهی خودا دەست پێ دەکاو بەسوپاسکردنی خـودا کۆتـایی دێ، زۆر باسـی گـرنگو لایـەنی جۆراو جۆری لـەخۆ گرتـوون، زوربـەیان دەربـارەی عەقیـدەو بـیرو بـاوەڕن، هەنـدێ سەرەباسـی دەربارەی یاسای سلوکو هەڵسو کـەوتی تـاکو کۆمـەڵو ئـادابی سـلووکی پەیوەسـت بەبیروباوەڕەوە بـاس دەکـەن! هەنـدێ باسـی مزگـەوتی قـودسو چیرۆکی نەتـەوەی ئیسرائیل دەکا، ئەو مزگەوتەی پێغەمبەر شەوڕەوی بۆ پێکراوە. لایەنێ لە چیرۆکی ئادەمو شەیتانو رێزلێنانی خودا بۆ ئادەمیزاد باس دەکا.

وەلێ عونصوری هەرە دیار لەسورەتەکەداو باسە سەرەکیو جەمسەرەکەی باسی پێغەمبەرو هەڵوێستی قورەیشییەکان بەرامبەر پێغەمبەرو پەیامەکەیەتی!

چیرۆکی شەورەویو چیرۆکی بەرزبوونەوە بۆ ئاسمانەکان، شەورەوی لەمەککەوە بۆ مزگەوتی قودسو پاشان میعراج واتە: بەرز بوونەوە لەمزگەوتی قودسەوە بۆ ئاسمانەکانو بۆ لای سیدرەتولمونتەهاو ئەو عالەمە غەیبیو پەنامەکیە لەئێمە...! ئەم باسە زۆر ریوایەتی جیا جیاو سەرگورشتەی جۆراو جۆری تێدا ریوایەت کراونو کێشەو نیزاعێکی زۆرو زەبەندەی تێدا پەیدا کراوە، هەتا ئەمرۆش ئەو نیزاعو کێشەیە پایەدارەو خەڵکی دەمە دەمێی تێدا دەکەن!

راجیایی هەیە دەربارەی ئەو شوێنەی شەورەوییەکەی لێکراوە، هەندێ پێیان وایە: لەخودی کەعبەرا شەورەوییەکە دەستی پێ کردوە. لەم بارەوە فەرموودەیەك لەپێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە: دەفەرموێ: (بينا أنا في المسجد في الحجر عند البيت بين النائم واليقظان اذ أتاني جبريل عليه السلام بالبراق) هەندێ پێیان وایە: لەخانووی ئومموهانی کچی ئەبو طالیبەوە شەورەوی دەستی پێ کردوە، ئەو کاتە دەبێ بڵێین: مەبەست بەمەسجیدول حەرام خاکی حەرەمە، چونکە خاکی حەرەم مزگەوتەکەشی لەخۆ گرتووە.

ئیبنو عەبباسیش دەفەرموێ: (الحرم كله مسجد) وا ریوایەت کراوە: کە پێغەمبەر ﷺ لەماڵی ئومموهانی دا نووستووە، دوای نوێژی عیشا شەورەوی پێکراوە هەر هەمان شەو گەراوەتەوەو چیرۆکەکەی بۆ ئومموهانی گێراوەتەوە؛ فەرموویەتی: (مثل لي النبيون فصليت بهم) پێغەمبەران ئامادەکرانو پێشنوێژیم بۆ کردن!

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ هەستا بچێتە مزگەوت، ئومموهانی داوێنی گرت. ویستی نەهێڵێ بروا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چیتە؟ بۆ داوێنی پۆشاکەکەم

دەگری؟ وتی: دەترسم ئەگەر تۆ ئەم هەواڵە رابگەیەنیو بلاوی بکەیەوە قەومەکەت بەدرۆت بخەنەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر بەدرۆشم بخەنەوە من ئەوەیان بۆ دەگێڕمەوە، ئیتر رۆیشتە دەرەوە بۆ ماڵی کابە، ئەبو جەهل هاتە نزیکیو پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئیسراو میعراجی بۆ گێڕایەوە، ئەبو جەهل بەدەنگی بەرز هاواری کردو وتی: ئەی کۆمەڵی بەنی کەعبی کوڕی لوئەی وەرن گوێ بگرن، خەڵك لێی کۆبوونەوە پێغەمبەر ﷺ روداوەکەی بۆ گێڕانەوە خەڵکەکە سەریان سوڕماو هەیانبوو چەپۆڵەی لەسەری خۆی دەناو هەیانبوو چەپڵەی لێدەدا، هەندێ کەس موسوڵمان بووبون پاشگەزبوونەوە؛ هەندێ کەس بەهەڵەداوان رایانکرد بۆ لای حەزرەتی ئەبو بەکر، بۆ ئەوەی ئەم هەواڵەی بۆ بگێڕنەوە بەڵکوو ئەویش لەئایین پاشگەزبێتەوە، کە پێیان گوت: فەرمووی: ئایا پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی وا دەڵێ؟ وتیان: بەڵێ بەدەمی خۆی بۆ خەڵکەکەی دەگێڕێتەوە. ئەبو بەکر فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی ئەوە بڵێ، ئەوە من شایەدی دەدەم راست دەکا. وتیان: چۆن بەراستگۆی دەزانی: کە بڵێ لەتاقە شەوێکدا چوومە وڵاتی شامو پێش ئەوەی رۆژ بێتەوە هاتوومەوە مەککە؟ حەزرەتی ئەبو بەکر فەرمووی: بەڵێ: ئەگەر لەوەش دوور تر بفەرموێ، من بڕوای پێ دەکەم، پێی بڕوا دەکەم ئەگەر بڵێ چوومە ئاسمانەکانیش! هەر بەم بۆنەوە نازناوی (صدیق)ی بەسەردا بڕا. جا هەندێك لەکافرەکان مزگەوتی قودسیان بینیبوو داوایان لەپێغەمبەر ﷺ کرد وەصفی چۆنیەتی مزگەوتەکەیان بۆ بکا مزگەوتەکە هێندرایە پێش چاوی، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەباسی مزگەوتەکە بەوردی وەصفی کرد. وتیان: راست دەکەی چۆنی دەڵێی وایە. دەی باشە ئێمە کاروانێکمان بەرێوەیە لەشامەوە دەگەرێتەوە، هەواڵمان بدەرێ ئێستا لەکوێیەو چۆنەو چۆن نیە! ئیتر پێغەمبەر ﷺ ژمارەی وشتری قافڵەکەو حاڵو وەزعی کاروانەکەی پێ گوتن. فەرمووی: رۆژی ئەوەندەی مانگ لەگەڵ خۆرهەڵاتندا کاروانەکە دەگاتەوە مەککە وشترێکی بەڵەك لەپێش کاروانەکەوە دەبێ! ئیتر هەموویان هاتنە دەرەوە بەرەو (ثەنیە) رۆیشتن،

چاوەڕوانی کاروانەکە بوون. لەبەرزاییەکەوە تەماشایان دەکرد، خۆرهەڵات یەکیان وتی: ئەریٚ (والله) ئەوا خۆرهەڵات، یەکێکی تریان وتی ئەریٚ (والله) ئەوا کاروانەکە بەدەرکەوتو واهات وشترێکی بەڵەکی لەپێشەوەیە. موحەممەد چۆنی گوت وا دەرچوو! کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بڕوایان پیٚ نەکردو بەدرۆیان خستنەوە. وتیان: ئەمە سیحرو جادوە لێمان دەکا!

ڕاجیایی هەیە لەوەدا ئایا ئیسراو میعراج بەخەوبووە یان بەئاگایی بووە..؟ لەحەزرەتی عائیشەو موعاوییەوە ڕیوایەت دەکەن فەرموویانە: (والله مافقد جسد رسول الله ﷺ ولكن عرج بروحه) سوێند بەخودا شەوی ئیسراو میعراج جەستەی پێغەمبەر لەجێگاکەی خۆی نەجوڵابوو بەڵکوو بەروح ئیسراو میعراجی بینیوە!

زانایان دەڵێن: قسەی عائیشەو موعاوییە لێرەدا نابێتە بەڵگە چونکە ئەوان ڕوداوەکەیان نەبینیوە، ئەو کاتە عائیشە منداڵ بوەو موعاوییە کافر بووە، هەروەها چونکە ئەمەیان نەگێڕاوەتەوە بۆ لای پێغەمبەرو بەشێوەی حەدیث نایهێنن.

زانای تریش هەر پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ لەخەودا ئیسراو میعراجی دیوە.

ڕیوایەتی تریش هەن ئەوە دەگەیەنن: کە ئیسراو میعراج بەگیانو جەستە بووە، تەنانەت ئەو نوێنو جێگایەی تێیدا نوستووە ساردنەبوونەوە کە گەڕاوەتەوە.

ئیبنو کەثیر زۆر ڕیوایەتی لەم بارە هێناون، گەلێ سەرگوزشتەی گێڕاوەتەوە. ئەوەی پەسندیىو بتمانەی پیٚ بکریٚ لەناو سەرەجەم ڕیوایەتەکاندا ئەوەیە: کە پێغەمبەر ﷺ لەماڵی ئوممهانی شوێنی نوستنی خۆی بەجێهێشتووە هاتووە بۆ مزگەوتی کابە جا کە لای حیجربووە چاوی لەبیرەخەودا بووە شەوڕەوىو میعراجی پیٚ کراوەو دوایی گەڕاوەتەوە بۆ ناو جێگای نوستنیو هێشتا نوێنەکانی سارد نەبوونەوە!

هەرچەندە چ سودێك نابیندرێ لەم کێشە دورو درێژەی بەرپابووە دەربارەی ئیسراو میعراج و لەکۆن و نوێ دا جێگای موناقەشەو چەندو چوونی زانایان بووە، ئەمجار ئیسراو میعراج بەخەوبووبێ یان بەئاگابوو بێ چ لەواقیعەکە ناگۆڕێ، روداوی ئیسراو میعراج روداوێکی واقیعی چەسپاوبووە لەژیانی پێغەمبەردا، کەشف و تەجەللیەك بووە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو نیشاندانی نموونەیەك لەدەسەڵات و قودرەتی پەروەردگار، کە لەچاوتروکانێکدا ئەو هەموو رێگا دورو سەرسوڕهێنەرو عالەمە باڵایانەی بینی...

جا ئەوانەی خوداناسن و هەست بەدەسەڵات و قودرەتی خودا دەکەن و سروشتی پێغەمبەرایەتی دەزانن، روداوی لەم جۆرەیان بەلاوە محاڵ و وێنەچوو نابێ، سەرسام نابن لەو جۆرە شتانە، چونکە لەبەرامبەر قودرەتی خودادا هەموو کردارێك کە لەدیدی ئادەمیزاددا بەگران و قورس دەبیندرێن یەکسانن ئەو ئیشانەی کە بەتەصەوری ئادەمیزاد سوك و گرانییان لەنێواندایە لای خودا چون یەك و یەکسانن، هەموو کارێك هەرچەندە لای ئادەمیزاد گران و ئەستەم بێ لای خودا سوك و هاسانە، ئەوەی لەعالەمی ئادەمیزادا باوو رەسایە ناکرێتە قیاس بۆ قودرەتی خوداو دەسەڵاتی پەروەردگاری پێ پێوانە ناکرێ!

سروشتی پێغەمبەرایەتیش بریتییە لەپەیوەندیکردن بەعالەمی باڵاوە، بەشێوەیەك کە قیاس ناکرێتە سەر پەیوەندی ئادەمیزاد بەئادەمیزادەوە، ئەم جۆرە پەیوەندیکردنەو بینینی ئەو شوێن و عالەمە باڵایانەو گەیشتن پێیان بەهۆکاری ئاشکرا یان نادیار سەرسوڕهێنەرتر نیە لەپەیوەندی کردن بەعالەمی باڵاوە یان وەرگرتن لێی.

بێگومان حەزرەتی ئەبو بەکر راستی فەرموو: کاتێك کە وەڵامی قوڕەیشییە سەرسوڕماوەکانی دایەوە، زۆر بەلەسەرەخۆییەوە مەسەلەکەی گەڕاندەوە بۆ

سروشته ئاساییەكەی خۆی‌و فەرمووی: (اني لأصدقه بأبعد من ذلك أصدقه بخبر السماء).

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ئەوەی تێبینی دەكرێ بەبۆنەی ئەم روداوەو دەركەوتنی راستی ئەو هەواڵەیە بەبەڵگەی مادی كە باسكردنی كاروانەكە بوو: كە پێغەمبەر ﷺ بەوردی چۆنیەتی كاروانەكەی رونكردەوە. ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ: كە پێغەمبەر ﷺ گوێی بەترساندنەكەی ئوممهانی نەدا، كە ئامۆژگاری كرد روداوەكە نەگێڕێتەوە نەبادا گەلەكەی بەدرۆی بخەنەوە، ئەم روداوە غەریب‌و ناوازەیە هەزم نەكەن، بەڵكوو زۆر بەراشكاوی روداوەكەی بڵاو كردەوە، چونكە بتمانەی پێغەمبەر بەپەیامەكەی، دڵسۆزی بۆ راگەیاندنی ئەو حەقەی نیگای بۆ كراوەو ئەو حەقەی لەگەڵیەتی گەییشتبوە ئاستێك لەهیچ شتێك نەپرینگێتەوە، روبەرویان بوەستێ‌و بەئاشكرا روداوەكەیان بۆ بگێڕێتەوە، چی دەبێ باببێ، هەڵوێستیان چۆن دەبێ بەرامبەر خۆی‌و پەیامەكەی با ببێ!

بێگومان بەبڵاوكردنەوەی ئەم باسە لەلایەن پێغەمبەرەوە هەندێ لەوانەی ئیمانیان هێنابوو پاشگەزبوونەوە، هەندێكیان مەوزوعەكەیان كردە مایەی پێكەنین‌و گاڵتەو گومان خستنە سەر پێغەمبەرایەتیەكەی، بەڵام ئەمانە هیچیان نەیانتوانی ببنە كۆسپ‌و تەگەرە لەبەردەم بانگەوازیكردنەكەی پێغەمبەردا هیچیان نەیانتوانی پێغەمبەر لەهەوڵ‌و تێكۆشان دابنیشێنێ‌و حەق بشارێتەوە!

بەراستی ئەمە نموونەی رەچەشكێنیە بۆ بانگخوازانی ئیسلام كە پێویستە ئەوان لەبانگەوازی دا چاو لەپێغەمبەر بكەن، حەق رابگەیەنن، لەپێناو راگەیاندنی حەق‌و راستی دا لەهیچ شتێك نەترسن‌و خەمی ئەوەیان نەبێ كە بانگەوازیەكەیان لەدڵی بانگكراواندا كاریگەری نەبوە، نابێ ماستاو بۆ كەس بكەن، دەبێ حەققانی‌و راستاڵ بن، حەق رابگەیەنن جا خەڵك پێی خۆشە، یان

پێی فەڵسن چش! ئەوە گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە ئەوان پەیامی خۆیان رابگەیەنن، ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن.

ئەم سورەتە وەکوو هەموو سورەتە مەککیەکانی تر گرنگی بەدامەزراندنو چەسپاندنی بنەمای عەقیدەو یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوە دەدا، کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ دەردەخاو بەموعجیزەی پێویست پشتگیری لێ دەکا.

**سورەتی (الاسراء) بەشێوەیەکی گشتی ئەم خاڵانەی لەخۆ گرتوون:**

١- هەواڵدان لەروداوی ئیسراو میعراج کە لەراستی دا روداوێکی گرنگو موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەری ئیسلامە ﷺ.

٢- باسی چیرۆکی نەتەوەی ئیسرائیل دەکا لەحاڵی صەلاحو حاڵی فەسادییاندا، باسی ئەوە دەکا: کە لەحاڵەتی راستاڵیو پابەندبوونیاندا خودا سەروەری پێ دان، ماڵو منداڵی زۆری پێ بەخشین. کە پشتیان لەپەیامی خودا هەڵکردو لەخودا یاخی بوون لەزێدو نیشتمانی خۆیان وەدەرنران گوندو شارو خانووبەرەیان بەدەستی خۆیان روخاندن، مزگەوتیان وێران کران.

پاشان جارێکی تر سەرلەنوێ ویستیان پێغەمبەر لە شاری مەدینە دەر بکەن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الأَرْضِ لِيُخْرِجوكَ مِنْهَا﴾الاسراء/٧٦.

٣- برێ بەڵگەی کەونی لەسەر بەتوانایی خوداو گەورەییو تاکو تەنهایی دەهێنێتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ﴾الاسراء/١٢.

٤- هەندێ بنەمای ژیانی کۆمەڵایەتی دامەزراو لەسەر رەوشتی بەرزو جوان رانواندوە وەکوو لەئایەتی ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ تا دەگاتە ئایەتی (٣٩).

٥- هەڕەشەو گوڕەشەی توندو تیژ دەرحەق بەوانەی دەڵێن: خودا کچی هەنو پێیان وایە فریشتەکان کچی خودان، وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَفَأَصْفَاكُمْ رَبُّكُم بِالْبَنِينَ

وَاتَّخَذَ مِنَ الْمَلآئِكَةِ إِنَاثاً إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلاً عَظِيماً﴾الاسراء/٤٠. هەڕەشەی توندیان ئاڕاستە دەكا لەسەر ئەوە: كە دەڵێن: چەند خودایەكی تر هەن لەگەڵ خودادا (ئایەتی ٤١-٤٤).

٦- ئەوەشی تێدا رون كراوەتەوە: كە بۆچی پەروەردگار داواكاری كافرە قوڕەیشییەكان دەربارەی نازڵكردنی هەندێ موعجیزەی ماددی جێ بەجێ ناكا، (ئایەتی ٥٩) هەروا ئەندازەی سووربونو پەلپ گرتنی قوڕەیشییەكان بۆ نازڵبوونی ئەو موعجیزانەی داوایان كردبوو وەكوو ئەوە مەككە ببێتە شوێنێكی كشتو كاڵیو جۆگەو جۆباری تێدا بكشێن باخو باخاتی تێدا بڕەخسێن، یان چەند پارچەیەك لەئاسمان بكەوێتە خوارێ، یان وەفدی فریشتە بێن بۆ سەریان، یان پێغەمبەر ﷺ خانوێكی لەزێڕ دروستكراومان بۆ بەدی بێنێ، یان بەچاوی خۆیان ببینن پێغەمبەر سەربكەوێ بۆ ئاسمان! (٨٩-٩٧)

٧- هەندێ باسی پیرۆزیی قورئانو كاریگەری لەسەر دڵو دەروونەكان دەكا (ئایەتی ٨٢) ئەوەش رادەگەیەنێ كە هەموو ئادەمیزادو جندۆكە ناتوانن كەلامێكی ئاوا بخەنە ڕو (ئایەتی٨٨).

٨- رێزداریی ئادەمیزاد رادەگەیەنێ بەوە كە فەرمانی بەفریشتەكان كرد: كە سوژدە بۆ ئادەم بەرنو شەیتان ئەم فرمانەی شكاند (ئایەتی ٦١-٦٥).

٩- باسكردنی نیعمەتەكانی خودا بەسەر ئادەمیزاددا (١٢و١٧) سەرزەنشتكردنی ئادەمیزاد لەسەر ئەوە: كە سوپاسی خودا نەكەنو سپڵەو پێنەزانن (٨٣).

١٠- بەرامبەریكردنی دونیا ویستانو قیامەت خواهان. (ئایەتی ١٨و٢١).

١١- فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ بەئەنجامدانی شەونوێژو خوداپەرستی. (ئایەتی ٧٨-٧٩).

١٢- بەشێك لەچیرۆكی حەزرەتی موسا لەگەڵ فیرعەون و نەتەوەی ئیسرائیلدا دەگێڕێتەوە. (ئایەتی ١٠١-١٠٤).

١٣- حیكمەتی نازڵبوونی قورئانی بە وەجبە وەجبە بەگوێرەی روداوو پێویست رون كردۆتەوە. (ئایەتی ١٠٥-١٠٦).

١٤- كۆتایی سورەتەكەشی بەپاك و مونەزەهی خودا لەهاوەڵ و خێزان و منداڵ هێناوە.. (ئایەتی ١١٠-١١١).

## باسی شەورەوی پێغەمبەرو نازڵكردنی تەورات بۆ سەر موسا

﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ ﴾

پێغەمبەر ﷺ باسی ئیسراو میعراجی بۆ كافرەكان گێڕایەوە، ئەوانیش بەدرۆیان خستەوەو گاڵتەیان پێ كرد، ئیتر پەروەردگار بۆ راستی ئەو روداوەو پشتگیریكردنی پێغەمبەر ﷺ ئەم سورەتەی نازڵ كردو فەرمووی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي

أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى﴾ پاكو مونەزهو بێ عەیبو بێ هاوەڵو هاوشانە ئەو خودا بەدەسەڵاتەی: کە لەبەشێکی شەودا شەوڕەوی بەبەندەی خۆی؛ موحەممەد ﷺ کرد، لەمزگەوتی کەعبەوە بۆ مزگەوتی قودس: کە بەگوێرەی وەسائیلی هاتوچۆی ئەو رۆژگارە چل قۆناغە رێ لێك دوور بوون، ئەم ئیسراو میعراجە ساڵێك پێش کۆچکردن بووە. ئیبنو سەعد لەکتێبی (الطبقات)دا دەڵێ: شەوڕەوی کردنی پێغەمبەر هەژدە مانگ پێش کۆچکردن بووە.

مەبەست بەمەسجیدولئەقصا بەکۆڕای زانایانی ئیسلام مزگەوتی قودسە، بۆیەش پێی گوتراوە (الأقصى) چونکە زۆر لەمەککە دوور بووە، نێوان مەسجیدولحەرامو مەسجیدولئەقصا چل قۆناغە رێگابووە، مزگەوتی قودس دوور ترین مزگەوت بووە لەدانیشتوانی مەککە لەسەر زەویدا: کە دیدەنی کراوە بۆ رێز لێگرتن.

کە دەفەرموێ: (أسرى بعبده) صیفەتی عەبدایەتی بۆ چەسپاند لەم مەقامو پلەو پایەیەدا: کە مەقامی شەوڕەوی پێکردنو بەرزکردنەوەیە بۆ پلەو پایەیەك: کە هیچ ئادەمیزادێك نەیگەیشتۆتێ ئالەم مەقامەدا هێنانی وشەی (بعبده) مەغزایەکی تایبەتی هەیەو بۆ ئەوە هێندراوە: کە ئەم صیفەتە بەرچاوبگیرێو لەبیر نەچێتەوە، ئەوەکوو مەقامی عبودییەتو مەقامی ئولوهیەت تێکەڵ بەیەکتربن، دوایی خەڵکی لێیان بشێوێ!

وەکوو لەبیروباوەڕی مەسیحی دا روی دا، بەهۆی ئەو دیاردانەی کە پەیوەندی بەلەدایکبونی عیساو لەدونیا دەرچوونی یەوە هەیەو ئەو موعجیزانەی پێی درا، ئەوە بوو بەبۆنەی ئەم شتانەوە دوای لەدونیا دەرچوونی، هەندێ کەس هاتن پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیو مەقامی ئولوهیەتیان تێکەڵاو بەیەك کردن، بیرو باوەڕی سێ خودایيو عیسا خودایی داهات!!

بەم شێوەیە بیرو باوەڕی ئیسلامی بەپاك‌و خاوێنی‌و ئاسایی‌و دوور لەهەموو شیرك‌و شوبهەو تێکەڵ‌و پێکەڵییەك دەمێنێتەوە.

لەلایـەکی تـرەوە وشـەی (أسـرى) بـەمانا شـەوڕەوییە کەواتـە: مانـای شـەو لەوشەکەدا هەیە، ئەدی بۆچی وشـەی (لـیلاً)ی هێنـا؟! لـەوەلامدا دەگـوترێ: وشـەی (لیلا) بەنەکیرەیی تەقلیل دەگەیەنێ واتە: شەوڕەوییەکە لەماوەیەکی کەم‌و کورتی شەودا بووەو زۆری نەخایانـدوە.

**وەکوو لەمەوپێش ئامـاژەمـان پێکـرد دەربـارەی ئیـسراو میعراجـی پێغەمبـەر خیلاف‌و راجیایی هەیە:**

١- هەنـدێ دەڵێن: ئیسراو میعـراجەکەی بەگیان بووە، ئـەم رایـە لەحوزەیفـەو عایشەو موعاوییەوە ریوایەت کراوە.

٢- زوربەی زانایان کۆکن لەسەر ئەوە: کـە ئیـسراو میعـراج بەجەسـتەو گیـان بووە، چونکە خودا دەفەرموێ: (أسـرى بعبـده) وشـەی عەبـدیش نـاوە بـۆ جەسـتەو گیان، کەوابێ دەبێ دان بەوەدا بنێین: کە شـەوڕەوی‌و بەرزبوونـەوە بـۆ ئاسمانـەکان بەجەسـتەو گیـان بـووە. چـونکە ئـەو فەرموودەیـەی لەئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە ریوایـەت کـراوە، فەرموودەیـەکی مەشـهورەو لەکتێبـە صـەحیحەکانی حـەدیـثدا ریوایەتکراوە.

بـەکورتی ئایەتەکـەی ئێـرە بـەروونی ئیـسرا دەچەسـپێنێ، ئایـەتی سـورەتی (النجم)یش بەڵگەیە لەسەر راستی میعراج‌و روودانی...

﴿الَّـذِي بَارَكْنَـا حَوْلَـهُ﴾ شـەوڕەویمان بەبەنـدەی خۆمـان کـرد لەمەککەوە بۆ مزگەوتی قودس؛ ئەو مزگەوتەی کە دەورو بەرەکەیمان کردۆتـە خێـرو بەرەکـەت بۆ دانیشتوانی، ژیان‌و رزق‌و رۆژی‌و کێڵگەو دارو درەختی ئـاوو هـەواو بـەروبوومی هەمووی هەر خێرو بەرەکەتە، بۆ دین‌و دونیا شوێنێکی پیرۆزە لـەبارەی ئایینـەوە،

چونکە مەڵبەندی پێغەمبەرانە، لەبارەی دونیاییشەوە چونکە وڵاتێکی بەپیتو بەرەکەتە، پڕە لەدارو درەختی بەردارو بەروبوومی جۆراو جۆر.

شەوڕەویمان پێکرد ﴿لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا﴾ بۆ ئەوەی بەڵگەی تاكو تەنهایيو خودایەتی خۆمان نیشان بەندەی بەرێزمان بدەین. بەڵگەی بەهێزو پێز لەسەر بەتوانایيو دەسەڵاتی بێ سنووری خۆمانی نیشان بدەین! ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ بێگومان ئەو خودایەی شەوڕەوی بەبەندەی خۆی کرد، شنەوایە بەو قسەو قسەڵۆکانەی موشریکەکانی مەککە دەربارەی ئیسراو میعراجی پێغەمبەر دەیکەن، بینایە بەکردارەکانیانو لەسەر زەویو لەئاسمانەکاندا هیچی لێ گوم نابێو ئاگاداری هەموو هەڵسو کەوتێکیانە، هەموو زانیاریەکی دەربارەیان هەیەو بەهەموو جۆرێك کۆنترۆڵی کردونو هەموو شتێکیان لەسەر تۆمار دەکاو سزاو پاداشیان پڕاو پڕ دەداتەوە.

دوای ئەوەی باسی رێزگرتنی حەزرەتی موحەممەدی کرد کە لەمەککەوە شەوڕەویی پێ کرد بۆ قودس و لەوێ پێش نوێژی پێغەمبەرانی کرد. بەرزی کردەوە بۆ ئاسمانەکانو عالەمی باڵای پێ بینی، ئەمجار لەم ئایەتەدا باسی رێزداری حەزرەتی موسا دەکا: کە لەپێش حەزرەتی موحەممەد رێزی لێ گیراوە. دەفەرموێ: ﴿وَآتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِبَنِي إِسْرَائِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا مِنْ دُونِي وَكِيلًا﴾ لەوەپێش بەخشیومانە بەموسا کتێبی پیرۆزی تەورات: کە هیدایەتو رێنومایی یە بۆ بەنوئیسرائیلی. پێمان گوتن جگە لەخودا کەسی تر مەکەنە وەلیو دۆستو پشت پێ بەستوی خۆتان، خاوەنی بوونەوەر بناسنو، ئەو بپەرستنو پشت بەئەو ببەستن کەسی تر بەخودا مەزانن. هەڵبەتە ئەمە پەیامێکە پەروەردگار بەگوێی هەموو پێغەمبەرێکی داداوە، فەرمانی بەهەموویان کردوە: کە بەتەنیا خودا بپەرستنو هاوەڵی بۆ بەرەوا مەزانن لەهەموو شتێکدا پشت بەئەو ببەستن.

ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە روون دەکاتـەوە: کـە ڕێـزی لەنەتـەوەی ئیـسرائیل گرتـووە، نیعمـەتی خـۆی بـۆ تـەواو کـردون، هـەڵیناون بـۆ ئـەوەی شـوێن پـەیامی پێغەمبەران بکەون دەفەرموێ: ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ﴾ ئـەی نەتـەوەو وەچـەی ئەو کەسانەی لەگەڵ نوحدا لـەخنکان رزگارمـان کـردن، هیدایـەتمان دان بـۆ ڕێبـازی یەکتاپەرستیو حەقو خێرو راست. ئێوەش چاو لـەباوكو بـاپیری خۆتـان بکـەن، ئێوە لەهەموو کەس شیاوترن بەپەیڕەوکردنی ئایینی یەکتاپەرستیو شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەران، لەسەروی هەموویانەوە بابە گەورەتان حەزرەتی نوح ﷺ ﴿إِنَّهُ كَانَ عَبْداً شَكُوراً﴾ بێگومان نوح بەندەیەکی سوپاسگوزار بوو، زۆر زێدەڕەوی دەکرد لەسوپاسگوزاریدا، هەموو ئەندامێکی جەستەی لەو شتەدا بـەکار دەهێنـا کـە بـۆی دانـراوە! بـەزوبان ذیکـری خـودای دەکـرد، بەعـەقڵو ئـاوەز بـیری لەدروسـتکراوانی خودا دەکردەوە، بەچاو لەبونەوەر دەفکری...هتد.

ئیبنو مەردەویهی لـەمعاذی کوڕی ئەنەسـی جوهـەنی ریوایـەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە ئێوارەو بەیانی لێ دەهات دیفەرموو: (سـبحان الله حـين تمـسون وحـين تصبحون وله الحمد في السموات والأرض وعشيا وحين تظهرون).

ئیبنو جەریرو بەیهەقیو حاکم لەسـەلمانی فارسـی یـەوە دەگێڕێتـەوە: دەڵێ: حەزرەتی نووح کە پۆشاکێکی لەبەر دەکرد یان خواردەمەنیەکی دەخـوارد سوپاسـی خودای دەکرد، بۆیە نانراوە بەبەندەی سوپاسگوزار.

وەصف کردنی حەزرەتی نووح بە(عبد)و وەصف کردنی پێغەمبـەری ئیـسلام بـە(عبـد) بەڵگەیـە لەسـەر پلـەو پایـەی پێغەمبـەران، ئـەویش پلـەو پایـەی بەندایەتیکردنی خالیصانەیە بۆ خودا، ئادەمیزاد تـا زیـاتر بەندایـەتی خـودا بکـاو دڵسۆز بێ لەبەندایەتیکردنەکەیدا لای خودا پلەو پایەی بەرزتر دەبێتەوە. کەوابێ مـوعجیزەی ئیـسراو میعـراج نـابێ بەپێـچەوانەی خۆیـان وەصـف بکـرێن، هـەروەها نابێ پێغەمبەران بخرێنە شوێنێکەوە جێگای خۆیان نەبێ، پلەو پایەی پێغەمبەران

بەندايـەتيكردنى صـالحانەى دڵـسۆزانەيە. نـابێ پێغەمبـەر بخرێتـە پلـەو پايـەى خودايەتييەوە، وەكوو مەسيحى يەكان عيسايان بردۆتە پلەو پايەى خودايى يـەوەو بـەخوداى دەزانـن، سـەريان لەخۆشـيانو خـەڵكانى تـريش شـێواند، تـاوانى خۆيـانو ئەوانەى پێيان هەڵخەڵەتاون لەئەستۆياندايە.

مەبەست لەئيـسراو ميعـراج ئـەوە بـووە: خـودا ويـستويەتى بەڵگـەى گـەورەو نيشانەى خودايەتى خۆىو تاكو تەنهايىو دەسـەڵاتى بـەرفراوانى نيـشانى بەنـدەى خۆى حەزرەتى موحەممەد بدا، هەندێ لەو نيشانانە دۆزەخو بەهەشتو چۆنيەتى ئاسمانەكانو كورسىو عەرشو فريشتەكانن، ئەمانەى نيشان دان بۆ ئـەوەى دونيـاى لەپێش چاوان بێ نرخ ببـێ، چـونكە كەسـێك كـە ئـەم بوونـەوەرە گـەورەو فراوانـە ببينێ، ديارە دونياى لەپێش چاوان كەمبايەخ دەبێ، ئامادەباشى تێـدا بـەهێز دەبـێ بۆ بەرەنگار بوونەوەى هەموو تەنگو چەڵەمەيەكو لەخۆبوردنو جيهادو هـەوڵو تێكۆشان. ئەوە بوو لەو شەوەداو لەو ماوە كورتـەدا ئـەو هـەموو شـتە عەجايـەبو سەرسـوڕهێنەرانەى بيـنين، يەكـە يەكـە پێغەمبــەرانى چـاو پێكـەوتنو قـسەو ئاخاوتنى لەگەڵ ئەنجام دان.

لەلايـەكى تـرەوە شـەوڕەوى پێغەمبـەر ﷺ لەمەككـەوە بـۆ بەيتولەقـديسو پێـشنوێژى كردنـى بـۆ پێغەمبـەران لـەوێ، ئامـاژەيـە بـۆ يەكيـەتى پێغەمبـەران لەمەبەستى سەرەكى دا، ئەويش روكردنە خودايەو خوداناسى يەو يەكتاپەرستييە، بڕوابوونــە بەپێغەمبەرايــەتىو هـاتنى رۆژى قيامـەت. بـەڵێ پێغەمبـەران يـەك ئايينيـان هەيـە، يـەك هەڵوێـستو يـەك مەبەسـتن، هەرچـەندە رووگـەيان جيـابێ. شەريعەتەكانيان جوداوازى تێدا بێ، رۆژگار درێژەى كێشابێو سـەردەميان زۆر لێـك جيابوبنـەوە!! هـەر لەيەكـەم پێغەمبـەرەوە: كـە حـەزرەتى ئادەمـە، تـا خاتـەمى پێغەمبەران: كـە حـەزرەتى موحەممـەدە ﷺ هەموويان بانگـەوازى يەكتاپەرسـتىو خوداپەرستييان كردوە، ويستوويانە كۆمەڵگاى ئادەميزاد رێك بخـەن، هـەوڵيان داوە

تاك و كۆمەڵ بەبەختەوەری بژین، هەوڵیان داوە رێبازی كاروانی ئادەمیزاد راست بكەنەوە، لەسەر بناغەی حەق و عەدالەت و ئەخلاقی بەرزو رەوشتی جوان كۆمەڵگا دابمەزرێنن.

پێویستە ئاماژە بەوەش بكرێ: كە ئادەمیزادییەتی پێغەمبەرو پێویستی بەئۆكسجین لەبەرزایی و لەعالەمی باڵادا نەبوونە لەمپەرو كۆسپ بۆ تەواو كردنی گەشتە ئاسمانییەكەی. چونكە قودرەت و دەسەڵاتی خودا پێویستیاتی ئەوگەشتەی بۆ دابین كردبوو، پێویستی بەوە نەبوو ئۆكسجین و پێویستیاتی تری پێ بێ! وەكوو رووادی فەضای ئێستا: كە ئۆكسجین لەگەڵ خۆیان دەبەن! لەهەمان كاتدا چوونە سەر مانگ و مەریخ و غەزوی فەضا لەم چەرخەدا بەڵگەیەكی بەهێزە لەسەر راستی ئیسراو میعراج. بەراستی جێگای خۆیەتی بڵێین: حەزرەتی موحەممەد یەكەم رائیدی فەضایەو بەتیژرەوترین دەسەڵات و لەكورترین ماوەدا گەشتی فەضای ئەنجام دا.

## حاڵ و چۆنیەتی بەنو ئیسرائیلی لەمێژوودا

﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا

﴿٦﴾ إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ وَإِنۡ أَسَأۡتُمۡ فَلَهَاۚ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ لِيَسُـٔۥُاْ وُجُوهَكُمۡ وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يَرۡحَمَكُمۡۚ وَإِنۡ عُدتُّمۡ عُدۡنَاۘ وَجَعَلۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار باسـی نیعمەتـە جـۆراو جۆرەكـانی خـۆی بەسـەر نەتەوەی ئیسرائیلدا كرد، لەوانە نازڵكردنی تەورات: كە هیدایەتو نورو رەحمەتە بۆ ئەو نەتەوەیە. ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەكا: كە ئەو نەتەوە سپڵەو پێنەزانـە شوێن هیدایەتی تەورات نەكەوتن، بەڵكوو فەسادیان بڵاو كـردەوە، پێغەمبـەرانیان شەهید كردن خوێنڕێژییان دەست پێ كرد، ئیتر خـودا بابلییـەكانی بەسـەرۆكایەتی بەختونەصر بەسەردا زاڵ كردن، هێرشی كردە سەریانو كوشتنو بڕینی تێدا پەیدا كردن، ژمارەیەكی زۆرو بێ شماری لێ كوشتن ماڵو سامانی داگیر كـردن، مزگـەوتی قودسی روخاندن، ژنو منداڵەكانیانی گرتنو مۆركی بەندایەتی بەسەردا دان، ئـەوە یەكەم فەسادو ناشوب بوو كە بەسەریاندا هێندراو یەكەم تۆڵەبوو لێیان كرایەوە!

پاشـان: كـە تۆبـەیان كـردو پەشـیمان بوونـەوە، خـودا جـاهو دەسـەڵاتی بـۆ گێڕانەوە، ماڵو سامانی پێ دانـەوە، سـەر لـەنوێ بوونـەوە بـەخاوەنی ژنو منـداڵو ئـازادیو سەربەسـتییان بەدەسـت هێنایـەوە، كەچـی دووبـارە سـەر لـەنوێ دەسـتیان دایەوە خراپەكاریو یاخی بوونو فەساد بڵاوكردنەوەو تاوان ئەنجامدان! حـەزرەتی زەكـەریـاو حـەزرەتی یـەحیایان شـەهید كـردن، وڵاتیـان شـێواندو ئـەخلاقیان

روخاندو جیهانیان لەخۆیان تێکداو ژیانیان لەخۆیان تاڵ کرد، ئەمجار لەتۆڵەی ئەوەدا ئەمجارەیان خودا فارسەکانی بەسەردا زاڵ کردن، شمشێریان لێ وەکار خستن، زۆریان لێ کوشتو برکردن، ماڵو سامانیان لێ داگیر کردن، ژنو منداڵیان بوونە رفێندراو کۆیلەو داگیر کراو، جارێکی تر مزگەوتی قودسیان بۆ روخاندنەوە.

ئەمجار خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیان بەڵێنی پێدان بەوە ئەگەر پابەندی فەرمانەکانی بن، یارمەتییان دەداو ئەگەر سەرپێچی فەرمانی بکەن بەئاگری دۆزە سزایان دەدا!

دەفەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوّاً كَبِيراً﴾ بەنەتەوەی ئیسرائیلمان راگەیاندو نیگامان بۆ کردنو لەتەوراتدا کە بۆ موسامان نازڵ کردبوو بڕیاری خۆمانمان بۆ رونکردنەوە، هەواڵێکی راستمان لەسەر زمانی ئەو پێغەمبەرە پێ دان: کە ئەوان دووجار سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن، دووجار لەخودا یاخی دەبن، فەساد دەخەنە سەر ئاخی شامو فەلەستین، یان خاکی میصر، یان هەر خاكو ولاتێکی پێی تێدەخەن، دوو جار سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن، دوو جار بەپێچەوانەی شەریعەتی تەورات کار دەکەنو لەخودا یاخی دەبن:

١- یەکەمیان سەرپێچی کردنی فەرمانی تەوراتو گۆڕانکاری تێیداو شەهید کردنی بڕێ لەپێغەمبەران؛ وەکوو ئەوە حەزرەتی ئەشعیایان شەهید کرد (ئیرمیا)کە لەنارەزامەندی خودا ترساندنی؛ لەجیاتی ئەوەی گوێ بیسی ئامۆژگارییەکانی بن بەندیان کرد.

٢- دووەمیان: شەهیدکردنی حەزرەتی زەکەریاو حەزرەتی یەحیابوو، هەروەها هەوڵیان دا حەزرەتی عیسا شەهید بکەن.

سەرباری ئەوەش پشت لەتاعەتی خودا دەکەن، تەکەببورو فیزو یاخی بوون ئەنجام دەدەن، ستەمکارییەکی ئەستەم دەست پێ دەکەن؛ زێدەڕەوی دەکەن لەستەمکاریدا، ئەوپەڕی یاخی بوونو ستەمکاریی ڕەچاو دەکەن.

جا ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ أُولاهُمَا﴾ کە وەختی یاخی بوونو فەساد بڵاوکردنەوەی جاری یەکەمیان هات، ئاژاوەو ئاشوبیان بەرپا کردو کاتی ئەوە هات عیقابیان بدەینو تۆڵەیان لێ بستێنن، ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَاداً لَنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا خِلالَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْداً مَفْعُولاً﴾ ڕەوانەمان کردو زاڵمان کرد بەسەر ئێوەدا ئەی نەتەوەی جولەکە! چەند بەندەیەکی خۆمان؛ چەند ئادەمیزادێك، کە خاوەنی هەڵمەتو زەبرو زەنگ بوون، دارای ژمارەی شەڕکەری زۆرو ئامێری کاریگەری جەنگ بوون: کە بریتی بوو: لەبابلیەکان بەسەرۆکایەتی سنحاریب (بەختونەصر) هەڵمەتیان بۆ بردنو وڵاتیان کۆنترۆڵ کردن، لەشکرو سوپایان کەوتنە وێزەیانو ماڵ بەماڵو گەڕەك بەگەڕەك ماڵدۆزییان لێ کردن، بەناو خانوو ماڵیاندا بڵاوبوونەوە، شمشێریان لێ وەکار خستنو کوشتو بڕیان کردن، ماڵەو پیاو ماقوڵەکانیان کوشتن، تەوراتیان سوتاند، مزگەوتی قودسیان ڕوخاندو وێرانیان کرد، ژمارەیەکی زۆر لەژنو منداڵیان کرانە کۆیلەو خزمەتکار. ئەم بەڵێنەی خودا هاتە دیو گەڕانەوەی نەبوو!

قەتادە دەفەرموێ: خودا طالوتی بۆ سەرناردن، ئەو خۆیو نەتەوەکەی خاوەن هەڵمەتو زەبرو زەنگ بوون، دەستیان کرد بەکوشتار لێیان.

موجاهید دەڵێ: ئەوانەی جاری یەکەم ئەو دەردەیان بەسەر بەنوئیسرائیلی هێنا، لەشکری فارسەکان بووە. بەڵام ڕای یەکەم پەسندترەو جێگای متمانەیە.

جا کە بەنو ئیسرائیلی ئێشو ئازاری ژێر دەستەییو کۆیلەییان چەشتو بەڵاو موصیبەت داخی کردنو بەهۆش خۆی هێنانەوە، ئیتر تۆبەیان کردو بۆ لای

خودا گەڕانـەوە، حـاڵو وەزعـی خۆیـان چـاك کـردو سـودیان لـەو بـەڵاو تەنگانـەو زەبرو زەنگـە بینـی، لەلایـەکی تریـشەوە گەلـە سـەرکەوتوو داگیرکـەرەکان بـەهێزو بازوی خۆیان نـازینو ئـاوانیش طوغیانیـان کـردو فەسـادو ئاشوبیان لەسـەر زەوی بڵاو کردەوە، ئیتر خـودا نگینـی لێ سـتاندنەوەو چـەرخی گـەردوونی لێ وەرگێـڕانو دنیایان لێ سوڕا، سەرکەوتوو داگیرکـەری ژێرخـستنو ژێـر دەسـتەو چەوسـاوە کـانی بەهێز کردنەوەو گوڕوتینی تێدا ڕەخساندنەوە وایـان لێ هاتـەوە شیاوی ئـەوە بـن: دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی وەربگرنەوە!

﴿ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَاكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيراً﴾ پاشان جارێکی تر سەرلەنوێ لەپاساوی ئیستیقامەو خوداپەرستیو گەڕانەوەتان بـۆ لای خـودا، دەسـەڵاتو فـەرمانڕەواییمان بـۆ گێڕانـەوە، هێـزو شـکۆمەندیمان بـۆ ڕەخساندنـەوە، دوژمنەکانتانمان بەهیلاك بـردن، مـاڵو منـداڵو کـەسو کارمـان بـۆ زۆر کردنەوە، چەكو سیلاحی زۆرو زەبەندەمان بۆ ڕەخـساندنەوە، ژمـارەی پیـاوی بـەکارو جەربـەزەو شـەڕکەرمان لـەجاران بـۆ زیـاتر کردنـەوە، سـەرلەنوێ بوونـەوە بـەهێزی سـام لێکـراوو حیـساب بـۆ کـراوو خـاوەن دەسـەڵات! ئەمـە دابو نـەریتی پەروەردگارە لەبوونەوەردا وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾آل عمران/١٤٠. کورد وتـەنی : دونیـا هـەر ڕۆژەی یـاری یەکێکـە. یـان دەڵێن: دونیا دەسرۆکەیە هەر ڕۆژەی بەدەست یەکێکەوەیە.

جا پـێش ئـەوەی سـیاقی ئایەتـەکان، هەواڵـە وادە پێـدراوە ڕاسـتەکە تـەواو بکەن، قاعیدەیەکی کردەوەو پاداش دەکاتە ناواخنی دەقەکەو لەگەڵ هەواڵە غەیبی یەکە جۆشی دەداو دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا﴾ جا ئەگەر ئێـوە کـردەوەو هەڵوێـستتان بەرامبـەر خـوداو پـەیامی خـودا جوانو ڕێكو پێك بێ، پابەندی فەرمانی خودا بن بەگوێرەی فەرمانو جڵەوگیرییـەکانی هـەڵسو کەوت بکەن، خوداپەرستو ڕاستاڵ بن ئەوە چاکەتان لەگەڵ خۆتان کـردوە، پاداشـی

باشـتان بـۆ خۆتـان دەسـتەبەر کـردوە، چـونکە ئێـوە بـەطـاعـەتو خوداپەرسـتی سوودمەند دەبن، خودا دەرگای خێرتان لێ دەکاتەوە، بەرەکەتی ئاسمانتـان بەسـەردا دەرێژێ. لەدونیادا خراپەی خراپەکارانتان لێ دوور دەخاتـەوە، لەقیامـەتدا پاداشـی باشو نەبڕاوەتان دەداتەوە. خۆ ئەگەر خراپە بکەن، ئەوە خراپەتان لەگەڵ خـودی خۆتـان کـردوە، چـونکە ئێـوە بـەتاوانکردنو خراپـەکاریی زیـان بەنەفـسی خۆتـان دەگەیەنن. لەشومو تۆڵەی ئەو تاوانو سەرپێچیکردنەتاندا، پەروەردگار بـەجۆرەها سزا تۆڵەتان لێ دەستێنێتەوە؛ لەجیهاندا دوژمنتان بەسەردا زاڵ دەکا، ژێر دەسـتەو ریـسواتان دەکـا، مـاڵ داگـیر کـراوو ژنو منـداڵ بـراو دەبـن، لەقیامـەتیشدا سـزای ریسواکەرو بەئێشتان بەسەردا دەدا.

ئەمە دابو نەریتی خودایە لەبوونـەوەردا، هـەر کـاتێ بەنـدەکانی لێـی یـاخی بـن، تووشـی کوشـتنو تـالاّنو بڕۆیـان دەکـا، ژێـر دەسـتەو یەخـسیرو دەس بەسـەرو ریـسوایان دەکـا، هـەر کـاتێ پەشـیمان ببنـەوە تۆبـەو ئیـستیغفار بکـەن ئـەو دەردو بەلاّیانەیان لەسەر لادەبا، سەڵتەنەتو شکۆمەندییان بۆ دەگێڕێتەوە!!

یاسـای خودایـەو لـەدونیاو قیامـەتدا گۆڕانکاری بەسـەردا نایـە. یاسـایەکە وا دامەزراوە کردەوەی ئادەمیزاد تێیدا هەمووی بۆ خۆیەتی، بەروبوومو ئاکامی، خۆی سودی لێ وەردەگرێ، پاداش ئاکامێکی سروشـتییە بـۆ کـار، لـەوەوە بـەروبووم پەیـدا دەبـێ، بـاشو زۆریو کـەمی بـەگوێرەی کردەوەکـەو چـۆنیەتی ئەنجامدانیـەتی. یاسایەکە وا دەکا ئادەمیزاد بەرپرسـیار بـێ لـەخودی خـۆی، بیـەوێ چاکەی لەگـەڵ دەکا، بیەوێ خراپـەی لەگـەڵ دەکـا. کـەوابێ کـاتێ ئـادەمیزاد تووشـی عیقـابو سـزا دەبێ با هەر سەرزەنشتی خودی خۆی بکا!! چونکە بۆ خۆی ستەمی لەخۆی کـردوە ﴿وما ربك بظلام للعبيد﴾فصلت/٤٦.

جا کە ئەم یاسا رەسایەی دامەزراندو رایگەیاند، سیپاقەکە دێتەوە سەر تەواو کردنی هەواڵە غەیبی یە راستەکەو دەفـەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الآخِـرَةِ﴾ کـە کـاتی

سزاو عیقابی جاری دووەم هات، وەختی تۆڵەی فەساد خستنەوەو پرکێشکردنی کاری خراپو کوشتنی پێغەمبەران (زەکەریاو یەحیا) هات دوژمنەکانتان دەنێرینە سەرو ناحەزانتان بەسەرتاندا زاڵ دەکەین بتانچەوسێننەوە ﴿لِيَسُوءُوا وُجُوهَكُمْ﴾ بۆ ئەوەی ئاثاری ئازارو ئەشکەنجەو غەم خەفەت بەسەر دەمو چاوتانەوە ئاشکراو نومایان بێ، (چونکە شتێکی ئاشکرایە دیاردەکانی دەروون لەدەمو چاودا رەنگ دەدەنەوە، خۆشیو شادی تەڕو تازەیی تێدا دروست دەکا، غەمو خەفەت سیسیو ژاکانو بزڕکاوی تێدا دەرەخسێنێ!).

﴿وَلِيَدْخُلُوا الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ بۆ ئەوەی دوژمنەکانتان جارێکی تر مزگەوتی قودس کۆنترۆڵ بکەنەوەو دیقە دیقەی ئێوە بدەن بەسەرکەوتوویی داگیری بکەنەوەو ئێوە بخەنەوە ژێر دەستی خۆیان، وەکوو چۆن جاری یەکەم بەهەمان شێوە کۆنترۆڵیان کردو روخاندیان. ﴿وَلِيُتَبِّرُوا مَا عَلَوْا تَتْبِيراً﴾ بۆ ئەوەی هەرچی نیشانەی ژیارو ژێوار هەیە وێرانو خاپوری بکەن، هەرچی بیناتان کردووەو کۆتان کردۆتەوەو پەزمەندەتان کردوە بیڕۆخێنن، لەناوی بەرن تێکی بدەن ئاداری بەسەر پاداریەوە نەمێنێو وڵاتتان خاپور بکرێو بایە قوش تێیدا بخوێنێ!

**بەکورتی :**

بەختونەصر بۆ یەکەمجار هێرشی بردە سەر نەتەوەی ئیسرائیلو مزگەوتی قودسی روخاند، ئەمە لەسەردەمی ئیرمییادا بوو، کتێبە مێژوویەکانی جولەکە ئەمەیان لەروپەڕی خۆیاندا چەسپاندوە. لەجاری دووەمدا بەگوێرەی تەفسیری بەیضاوی ئەوەی هێرشی کردنە سەر ناوی (بیردوس) بوو پاشای بابل بوو. وەڵێ مێژووی جولەکە دەڵێ: قەیصەری رۆم بوو ناوی (ئەسبیانوس) بوو. لەنێوان ئەو دوو هێرشەدا نزیکەی (٥٠٠) پێنج سەد ساڵ بووە.

ئەمجار سیاقی قورئان بەشوێن راگەیاندنی ئەو هەواڵە غەیبییەو بەڵێنە ئەنجامدراوە (وعداً مفعولاً)دا دەرگای هیوا لەسەر بەنوئیسرائیلی یەکان دەکاتەوە، هیوای ئەوەیان دەخاتە دڵەوە؛ کە لەوانەیە ئەو ولات وێرانیو دەردو مەینەتە، رێخۆشکەر بێ بۆ رەحمەتو سۆزی خودا، دەفەرموێ: ﴿عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يَرْحَمَكُمْ﴾ ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! لەوانەیە خودا رەحمو بەزەیی پێتاندا بێتەوە، دوای ئەوەی لەجاری دووەمدا بەو بەڵاو موصیبەتانە لەبۆتەی دانو تۆڵەی لێ ستاندنو تەمبێ خواردوی کردن، ئەگەر تۆبە بکەنو واز لەتاوانو ستەم بێنن، ئەو زەلیلیو ژێردەستەییەتان لەسەر لابەرێ؛ بێگومان خودا وەفای بەوادەی خۆی کرد، دوای زەلیلی شانو شکۆی پێ بەخشینەوە، موڵکو سەڵتەنەتی پێ بەخشینەوە، پێغەمبەری تێدا ناردنەوە، چەند پێغەمبەریان تێدا هەڵکەوتەوە، سەرلەنوێ لەمزێدو نیشتمانی خۆیاندا ژیانیان بەئارامیو سەربەستی بەسەر بردەوە!

جا ئەگەر بەنو ئیسرائیلی بایاندایەوە بۆ سەر عاداتی کۆنیانو دەستیان کردەوە بەفەساد بڵاو کردنەوە لەسەر زەوی، ئەوە سزای خودا حازرو لەمستەو دابو نەرێتی خودا نەگۆڕەو هەمان تاسو حەمامە!!

دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عُدْتُمْ عُدْنَا﴾ ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! هەر کاتێ ئێوە پاش ئەم جاری دووەمە؛ پاش ئەوەی لەجاری دوهەمدا رزگاربوونەوە ئارامیتان تێکەوتەوەو کەوتنەوە خۆشیو هەرزانییەوە. ئەمجار بۆ سێیەمجار گەڕانەوە بۆ سەر رەوشتی ناباریو خراپەکاریتان دەست پێکردەوە، ئاشوبو فیتنەییتان هەڵگیرساندەوە، ئێمەیش دەگەڕێینەوە بۆ سەر دابو نەرێتی خۆمانو یاسا ئەزەلییەکەی خۆمانتان بەسەردا دەدەینەوە، ئاگری فیتنەو ئاشووب ، قارو غەزەبی خۆمان دەرێژین بەسەر ئەوانەدا ناپاکو ئاشوبگێڕن..

بێگومان جولەکە جارێکی تر گەڕانەوە بۆ سەر رەوشتی فەسادو ئاشوب بڵاو کردنەوە، پەروەردگار موسوڵمانانی بەسەردا زاڵ کردنو لەنێوە دوورگەی عەرەب

وەدەریان نان، پاشان جارێکی تر روویان کردەوە فیتنە گێڕیو ئاشوب نانەوە، خودا کەسانی تری بەسەردا زاڵ کردن، هەتا چەرخی بیستەم هاتە پێشەوە ئەمجارەش هیتلەری ئەڵمانی نازی بەسەردا زاڵ کردن، ئەو هەموو قەتڵو عامەی تێدا کردن، فەرمانی قەڵاچۆکردنی دەرکردن، ملیونەها کەسی تاوانبارو بێ تاوانی لێ کوشتن.

ئەمڕۆش: کە ساڵی (١٩٩٩) ی زاینی یە وا پەنجا ساڵ تێدەپەڕێ بەسەر دامەزراندی دەوڵەتۆکەی ئیسرائیلدا، کە هەر لەرۆژی دامەزراندنیەوە وێڕای فیتنەییو ئاشوبگێڕان لێرەو لەوێ، کارێکیان بەعەرەبی فەلەستینی کردوە با بەدەواری شڕی نەکردوە، لەهەر چوار لای جیهانەوە جولەکەی بیانی کێش دەکەن بۆ فەلەستینو عەرەبە خاوەن زەویو زارەکانی لێ وەدەر دەنێنو خۆیانی تێدا نیشتەجێ دەکەن، ماڵ لەخاوەن ماڵ حەرامەو ئەم دیاردە ناشیرینە رۆژانە بەردەوامە، بێگومان دەبێ رۆژێك بێ خودا کەسانێك بڕەخسێنێ تاڵاوی ئەمەیان پێ بڕێژنو جارێکی تریش وادەی خودا بێتەوە جێ. ئەمە وادەی خودایەو هەر دەبێ بێتە دیو زۆری نەماوە، کەسێ نەمرێ دەیبینێ!! ئەمە سەرباری ئەو عەزابو عیقابەی لەقیامەت تووشیان دێ!! بۆیە کۆتایی ئایەتەکەی بەوە هێنا: کە فەرمووی: ﴿وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيراً﴾ ئەم جۆرە سزادانەی کە باسمان کرد هی دونیایانە بۆ رۆژی قیامەتیش دۆزەخمان کردوە بەشوێنو جێگایانو لەهەموو لایەکەوە ئاگر دەوری کافرو بێ بڕوایان دەدا، فیتنەو ئاشوبگێڕان دادەگرێو کەسیان ناتوانێ لەو شوراو پەرژینە بچێتە دەرێ!

## مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز هیدایەتو مزگێنیو ترساندنە

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش باسی ڕێزلێنانی لەپێغەمبەر ﷺ کرد بەوە شەوڕەوی پێکردو نیشانەی قودرەتو خودایەتی خۆی نیشان دا، باسی ڕێز لێنانی موسای کرد بەوە: کە تەوراتی بۆ نازڵ کردوەو مایەی هیدایەتبوو بۆ نەتەوەی ئیسرائیل، ئاماژەی بەبەسەرهاتی ئەو نەتەوە ستەمکارە کرد: چییان کردو خودا چۆن تۆڵەی لێ ستاندن، ئەمجار باسی ئەو دیارییە پیرۆزە گرنگە دەکا: کە بۆ حەزرەتی موحەممەدی ناردوە کە قورئانی پیرۆزەو ناسیخی هەموو نامە ئاسمانییەکانی ترە، پڕە لەمەبەستی جۆراو جۆرو بەرزو پیرۆز، هۆکارێکی گرنگو ناوازەیە بۆ هیدایەتدانی ئادەمیزاد بۆ ڕێبازی حەقو بەختەوەری، مژدە دانە بەوانەی بەندایەتی بۆ خودا دەکەن، ترساندنی کافرو بێ بڕواکانە لەعەزابی سەختی دۆزەخ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! بۆچی بڕوا بەقورئان ناکەن، خۆ قورئانیش وەکوو تەورات خودا نازڵی کردوە بۆ هیدایەتدانی ئادەمیزاد، بێگومان ئەم قورئانە ئادەمیزاد هیدایەت دەدا بۆ ڕێبازی پتەوو حەقو ڕاستو کاریگەر لەعالەمی هەستو شعوردا، دڵو دەروون ڕادەچڵەکێنێ، عەقیدەیەکی واضیحو بێ گرێو گۆڵی هێناوە، بیرو باوەڕێکی دوور

لەخەیاڵو ئەفسانەو خەرافیات رادەگەیەنێ، ئادەمیزاد خەمیدەو خەمۆش ناکا، هەستو تواناکانی بەرەڵلا دەکا بۆ ئەوەی بەکاریان بێنێ بۆ کردەوەی چاكو بینا کردنو گەشە دان بەژیانو وڵات، ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ دەستەبەر کردنی ژیانی بەختەوەری دونیاو قیامەت، یاسای سروشتی بوونەوەرو سروشتی ئادەمیزاد پێکەوە گرێ دەدا، فەرمان بەبەندەکانی دەکا: کە لەبوونەوەر بفکرنو پێیدا بگەرێنو کەڵکی لێ وەربگرنو بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بێنن!

قورئان ئادەمیزاد هیدایەت دەدا بۆ رێبازێك راسترین رێگایە بۆ تەنسیق خستن لەنێوان دیوی دەرەوەی ئادەمیزادو دیوی ناوەوەی؛ لەنێوان هەستو هەڵوێستی دا، لەنێوان باوەرو کردەوەیدا، ئاواو بەو جۆرە قورئان هەموو لایەنەکان؛ مادیومەعنەوی پێکەوە گرێ دەداو پەیوەستیان دەکا بە عوروەتولوثقای پەروەردگارەوە، پەیوەستە بەو قودرەتە لەبن نەهاتوە ئیلاهییەو دەستی بەو حەبلە مەتینە گرتووەو چاو لەئاسمانو دڵ پڕ لەهیواو قاچ لەسەر زەوی چەقیو، هیچ شتێك نایجوڵێنێو کێوی ئەلبورزە، هەرچی دەیکا دەبێتە مایەی خۆشیو بەختەوەریو جێگای رەزامەندی خودا، کاسبی دەکا عیبادەتە، خۆی بەخێو دەکا خودا پەرستییە، هەوڵ دەدا ژیانی بەختەوەری بۆ خۆی دابین بکا بەخوداپەرستی بۆی دەنووسرێ.

قورئان ئادەمیزاد هیدایەت دەدا بۆ رێبازێك راسترین رێبازە لەبواری عیبادەتو خوداپەرستی دا، مووازەنە دەکا لەنێوان ئەرکەکانو هێزو تواناداد، زیاد لەتوانا ئەرك ناخاتە سەر کەس وای لێ بێ نەتوانێ ئەنجامی بدا، ئەوەندەش ئاسانکاری ناکا ئادەمیزاد هەست بەبەرەڵلاییو رەخاوەت بکاو ببێتە گاڵتەبازار. ئەندازەیەکی مام ناوەندی داناوە بۆ پەیرەوکردن؛ نەشیش بسوتێو نەکەباب!!

هیدایەتی ئادەمیزاد دەدا بۆ رێبازی راست لەپەیوەندی نێوان ئادەمیزادەکانو تاکەکانی کۆمەڵ برێکیان بەبرێکیانەوە، گەلو نەتەوە لەگەڵ هی ترو، حکوومەتو

دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەتو حکوومەتی تردا، ئەم پەیوەندیو عەلاقاتانە دادەمەزرێنێ لەسەر بنەمای پتەوو تۆکمەو واقیعی، هەواو ئارەزۆ چ رۆڵێکیان تێدا نابینن، بەرژەوەندی تایبەتیو مەبەستی تایبەتی بەرچاو ناگیرێن.

هیدایەتیان دەدا بۆ رێبازی راستو لەبار لەبواری فرمانڕەواییو رێکخستنی یاسای ئابووریو یاسای کۆمەلایەتیو یاسای نێودەوڵەتی شیاو بەجیهانی ئادەمیزاد.

هیدایەتیان دەدا بۆ رێبازی راست لەهەڵبژاردنی ئایینی ئاسمانیو جۆشدانی لەگەڵ ئایینەکانی ترداو رێزگرتن لەموقەدەسساتو بەها پیرۆزەکانیانو پاراستنی شوێنە رێزدارەکان و دێرو کەنیسەکانیان!

بەڵێ: ئەم قورئانە ئادەمیزاد شارەزا دەکا بۆ راستترین رێگا کە ئایینی بەرزی ئیسلامەو لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی دامەزراوە ﴿وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً﴾ مزگێنی دەدا بەخاوەن باوەڕان؛ ئەوانەی کردەوەی باش ئەنجام دەدەن، مزگێنیان دەداتێ، بەوە کە پاداشی گەورەیان هەیە.

﴿وَأَنَّ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ هەروەها هەڕەشە دەکا لەوانەی بڕوایان بەقیامەت نیە، بڕوایان بەخودا نیە، بڕوایان بەعەزابی بەئێشو دژواری دۆزەخ نیە.

واتە: پەروەردگار دو جۆر موژدە بەموسوڵمانان دەدا، یەکەمیان پاداشدانەوەی خاوەن باوەڕان، دووەم سزادانی دوژمنانیان. ئەمە یاسای پەروەردگارە، قاعیدەیەکی بنەڕەتییە لەبارەی کردارو پاداشەوە، یاساکە لەسەر بنەمای ئیمانو کردەوەی باش دادەمەزرێنێ، ئیمان بەبێ کردەوە بایەخی نیەو کردەوە بێ ئیمان وەکوو نەبوو وایە. دەبێ ئیمانو کردار پێکەوە بنو هاوکاربنو یەك بگرن ئەمجار بەرێكو پێکی ژیان بەڕێوە دەچێ، بەیەکدیگیر بوونی ئیمانو کردەوە بەیەکەوە هیدایەتدانی قورئان دەچەسپێ.

جا ئەوانەی بەهیدایەتی قورئان نایەنە سەر ڕێگای ڕاست، ئەوە شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، هەواو ئارەزۆ ڕابەریانە وای بۆ کەسانێك! شوێن هیدایەتی قورئان ناکەونو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەون. بێگومان ئادەمیزاد بۆخۆی نەزانەو چاکەو خراپەی خۆی نازانێ، زوو هەڵدەچێو زوو خۆی لەخۆ دەگۆڕێ. ﴿وَيَدْعُ الإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ وَكَانَ الإِنسَانُ عَجُولاً﴾ ڕەوشتی ئادەمیزاد بەپەلەییو بەتاڵوکەییە، جاری وا دەبێ ڕقی هەڵدەستێ نزا لەخۆی دەکا بەشەڕ، نزا لەمنداڵو ماڵو خێزانی خۆی دەکا، نزایان لێ دەکا بەمردن بەتێداچونو بەفتارەچون، بەزیان پێگەییشتن، جاری وا دەبێ ئادەمیزاد دوعای شەڕ لەخۆی دەکا وەکوو چۆن دوعای خێر دەکا.بێگومان ئادەمیزاد ڕەوشتی بەپەلەیی تێدایە. بەتاڵوکەیە، ئاگاداری سەرەنجامو ئاکامی کارەکان نیە، دوعای شەڕ لەخۆی دەکاو پەلە دەکا لەزوو بەدیهاتنی ئاکامی نزاکەی، نازانێ ئەوە زیانی بۆ خودی خۆی هەیە هیچ بیر لەئاکامەکەی ناکاتەوە. یان دەزانێ بەڵام خۆی پێ ناگیرێ خۆ ئەگەر خودا نزاکەی لێ وەرگرێ بەهیلاك دەچێ، بەڵام خودا خاوەنی فەضلو ڕەحمەتە، بەفەضلو ڕەحمەتی خۆی دوعاکان پاشگوێ دەخاو لێیان وەرناگرێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ اللّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾یونس/١١.

ئەبو داوود لەجابیرەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لاتدعوا على أنفسكم، ولا على أموالكم أن توافقوا من الله ساعة اجابة، يستجيب فيها) نەکەن لەکاتی تەنگەتاویو هەڵچونِدا دوعای شەڕ لەخۆتان یان ماڵو منداڵتان بکەن، نەوەکوو نزاکەتان بکەوێتە کاتێکەوە: کە خودا دوعای تێدا گیرا دەکاو دەعاکەتان گیرابێ.

## نیشانەی دەسەڵاتی پەروەردگارو نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی خودا بەسەر ئادەمیزاددا

﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ ٱلْقُرُونِ مِنۢ بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿١٧﴾ ﴾

ئەمجار دوای ئاماژەکردن بۆ شەوڕەوی کردن بەپێغەمبەرو ئامـاژە کـردن بـۆ نوحو ئەوانەی لەگەڵی دا رزگاریـان بـوو، ئامـاژە بـۆ چیرۆکی نەتـەوەی ئیـسرائیلو، ئامــاژەکردن بــۆ یاســای کــردارو پــاداشو وەصــف کردنــی قورئــان بــەوەی: کــە هیدایەتدەرە بۆ رێبازی راستو حـەق، دەگوێزێتـەوە بـۆ نیـشانە کـەونی یـەکان، بـۆ نیــشانەی گۆڕانکــاری لەبوونــەوەردا؛ گــۆڕانی شــەوو رۆژ بەشــوێن یــەکداو پەیوەستکردنی جمو جوڵی ئادەمیزادو سزاو پاداشی بەجمو جوڵی بونەوەرەوە.

دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَـا اللَّيْـلَ وَالنَّهَـارَ آيَتَـيْنِ﴾ شـەوو رۆژمـان کـردوە بـەدوو نیـشانەی ئاشـکراو هەسـت پێکـراو لەسـەر قـودرەتو دەسـەڵاتی رەهـای خۆمـان، نیـشانەی دەسـت رەنگینـیو کارسـازیمانن، گـۆڕانی شـەوو رۆژو بەشـوێن یـەکتردا هاتنیان بۆ دەستەبەر بوونی بەرژەوەندی ئادەمیزادە بەتایبەتی و بۆ گیانلەبـەرانی ترە بەگشتی، شەو کاتی حەسانەوەو ئارامگرتنو خۆ حەشاردانە، رۆژ وەختی کـارو کاسـبی وجـمو جـوڵو هاتوچـۆیە بـەناو زەوی دا بـۆ دەسـتەبەر کردنـی بـژێوو پێداویستی ژیان. بۆیە ﴿فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَـا آيَـةَ النَّهَـارِ مُبْـصِرَةً﴾ کـاتی شـەوو رۆژمان وا لێ کردوە: کە بگونجێ بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانی ئـادەمیزاد، لەشـەودا تـاریکی ئەنگوستەچـاو، گونجـاوە بـۆ تێـدا نوسـتنو ئـارامگرتن، لـەرۆژدا روناکیەکە باڵی خۆی بەسەر بوونەوەردا دەکێشێ گونجاوە بۆ جمو جوڵو هاتوچۆ، کەوابێ کە لەشەودا هەموو گیانلەبەرێك خۆی حەشار دەداو جـمو جـوڵو هاتوچـۆ کـەم دەبـێو شـتی تێـدا نابینـدرێ، لـە رۆژدا شـتەکان پێـچەوانە دەبنـەوەو هـەموو شتێك دەبینـدرێو بونەوەر روناكو گونجاوە بۆ تێداهەوڵدانو جمو جوڵ: ﴿لِتَبْتَغُـوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ﴾ بـۆ ئـەوەی هـەوڵی بەدەسـت هێنـانی فـەضلو رەحمـەتی خودایـان تێدا بدەن، بزانن چۆن کارەکانتان ئەنجام دەدەن، دەمێك بۆ کاروکاسبیو کاتێـك بـۆ حەسانەوەو پشوودان تەرخان بکەن، بەگوێرەی گۆرانی شەوو رۆژو وەرزەکانی ساڵ (بـەهارو هـاوینو پـایزو زسـتان)کـورتی شـەوو درێـژی رۆژو بەپێـچەوانەوە، ئێـوە کارەکانتان رێك بخەنو بەرنامەی ژیانتان دابرێژن، کاتی ئیشەکانتان بـزانن: بـزانن

کەی وەختی ئیش کردنەو کەی کاتی پشودانو نووستنە، کەی وەختی کێڵانو چاندنەو کەی کاتی دروێنەو بەرهەم هەڵگرتنە....هتد.

هەروەها ﴿وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾ گۆڕانکاریمان خستۆتە نێوان شەوو رۆژەوە بۆ ئەوەی ئێوە ژمارەو چەندییەت و چۆنیەت و حیسابی رۆژو حەفتەو مانگو ساڵ بزانن. وەرزەکانی کێڵانو چاندنو رواندنو دروێنەو رنینو چنین بزانن، کاتی قەرزو قۆڵەو زەکاتدانو بەکرێدانو کڕینو فرۆشتن دیاری بکەن. کاتی ئەنجامدانی نوێژکردنو رۆژوگرتنو وەرزی حەجو عومرە بزانن، ئەگەر شەوو رۆژ نەبوایە ئادەمیزاد نەیدەزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ بوونەوەردا بکا؛ نموونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاء أَفَلَا تَسْمَعُونَ ؟ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ؟ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ؟ وَمِن رَّحْمَتِهِ جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ؟!﴾القصص/٧١-٧٣. یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُوراً﴾الفرقان/٦٢. یان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاء وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلاَّ بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾يونس/٥.

﴿وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً﴾ هەرچی شتێك ئێوە پێویستتان بێ بۆ بەرژەوەندی ژیانی دونیاو قیامەتتان کەڵکی لێ وەردەگیرێ، ئێمە رونمان کردۆتەوە، بەتەواوی بۆمان شی کردوونەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾الأنعام/٣٨. یان دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَاناً لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾النحل/٨٩. بەکورتی هیچ شتێك لەم بونەوەرەدا، بەرێکەوتو صودفە نیە، بەهەوانتەو بێهودە نەهاتۆتە وجود؛ کارسازیو رێكو پێکی ئەو یاسایەی شەوو رۆژ دەگۆڕێ، بەزوبانی حاڵ دەست رەنگینی خاوەنی شەوو رۆژ شی دەکاتەوە،

بەڵگەو نیشانەی بەدەسەڵاتیو خودایەتیەتی، شایەتو گەواهیدەرە لەسەر تاكو تەنهایی خودای بوونەوەر!! هەر بەگوێرەی ئەم یاساكەونی یە وردە، كردەوەو پاداش بەیەكەوە دەبەسترێنەوەو پەیوەستی یەكترین.

﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾ كردەوەی هەموو ئادەمیزادێكمان خستۆتە ئەستۆی خۆیو پێیەوە لكاوەو لێی نابێتەوە، وەكوو گەردنبەندو گلادە وایە لەملی دا ئەگەر كاری خێر بێ، وەكوو كۆتو زنجیر وایە لەملی دا ئەگەر شەڕ بوو!

مەبەست بە(طائر) لێرەدا كردەوەی ئادەمیزاد خۆیەتی. لەزمانی عەرەبی دا ئەگەر شتێك بەشتێكەوە ببەسترێو پێوەی پەیوەیست بێ دەڵێن: لەملی دایە، فلانكەس ئەو ئەركەی خراوەتە ئەستۆی، وا فلان ئەركم خستە ئەستۆی تۆ دەبێ ئەنجامی بدەی!

ئەو یاسایەی خودا: كە كردەوە لەئەستۆی بكەرەكەدایەو، هەر كەسە كردەوەی خۆی لەعودەی خۆیدایەو خۆی بەپرسیارە لەكردەوەكانی، یاسایەكی خودایيو بڕیارێكی بڕاوەی ئەزەلییە، گۆڕانكاری بەسەردا نەهاتووەو نایەو بەشێكە لەدابو نەریتی خودا لەبوونەوەردا ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ: كە ئادەمیزاد موجبەرەو چی لەچارە نووسراوە بڕاوەتەوەو ویستو ئیختیارێك كە دەبێتە مایەی ثەوابو عیقاب نەیماوە، نەخەیر ئەوە ناگەیەنێ، بەڵكوو هەموو ئادەمیزادێك موخەییەرە لەهەڵبژاردنی كارو كردەوەیەك بۆخۆی كە هۆی پاداشی باشە، یان هەڵبژاردنی كارێك: كە ببێتە هۆی سزای توندو دژوار!!

﴿وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً﴾ لەوە بەولاوە لەڕۆژی قیامەتدا نامەی كردەوەكانی بۆ دەردێنینو دەیخەینە بەردەستی خۆیو بۆخۆی تۆماری

کردەوەکـانی دونیـای دەبینـێ‌و بـۆی دەردەکـەوێ ئـەو تۆمـارە هـەموو کـارو کردەوەیەکی ئەوی تێدا تۆمار کراوە.

ئیبنو جەریر لە حەسەنی بەصریەوە فەرموودەیەکی قودسی گێڕاوەتەوە دەڵێ: (قال الله: یاابن آدم، بسطنالك صحیفة، وكل بـك ملكان كریمـان، أحـدهما عـن یمینك والآخر عن یسارك، فأما الذي عـن یمینـك فـیحفظ حـسناتك، وأمـا الـذي عـن شمالك فیحفظ سیئاتك فاعمل ماشئت أقلل أو أكثر حتى اذا مـت طویـت صـحیفتك، فجعلت في عنقك معك في قبرك، حتى تخرج یـوم القیامـة كتابـاً یلقـاه منـشوراً كفـى بنفسك الیوم علیك حسیبا).

جا تۆماری کردەوەکانی بەبڵاوکراوەیی دەخەینە بەردەمی و پێـی دەگـوترێ: ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً﴾ دە تۆماری کردەوەکانی ژیانی دونیات بخوێنەوە، بزانە: فریشتەکانی لای راست‌و لای چەپت چییان بۆ نووسیوی‌و چییان لەسەر تۆمار کردوی. بۆ خۆت دادگایی خۆت بکە، جا حەسەنی بەصری کە ئەمـەی دەخوێنـدەوە، دەیفـەرموو: ئـەی ئـادەمیزاد! بەراسـتی عـادڵ‌و خـاوەن ویژدانـە ئـەو کەسـەی خـۆتی کـردوە بەلێکۆڵـەرەوەو دادوەر بەسـەر خۆتـەوە، بـۆ خـۆت حـوکمی خۆت بدەو پێویست بەشایەدو بەڵگەی تر نیە!

جا کە ئادەمیزاد بۆ خۆی بەپرسیاربێ لەکردەوەکانی خۆی، ﴿مَنْ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَـدِي لِنَفْـسِهِ﴾ کەسـێك هیدایـەتی وەرگـرت‌و رێگـای حـەقی دۆزیـەوەو شـوێن شەریعەتی خودا کەوت‌و پەیڕەوی پێغەمبەری ئیسلامی کرد، ئـەوە سـودو قـازانجی بۆ خۆیەتی‌و خۆی لێی سودمەند دەبێ. ﴿وَمَـنْ ضَـلَّ فَإِنَّمَـا يَـضِلُّ عَلَيْهَـا﴾ کەسـێ گومڕابێ‌و لەرێگەی حـەق لابـدا، بـڕوای بـەخودا نـەبێ، شـوێن پـەیامی پێغەمبـەر نەکەوێ ئەوە زیان بەخۆی دەگەیەنێ‌و بەدبەختی بەسەر خۆیدا دەهێنێ‌و سـزای کردەوەکـانی لەسـەر خۆیـەتی‌و تۆڵـە لـەخۆی دەسـەندرێتەوە، چـونکە بڕیـاری خودایەو یاسای ئـەزەلی خۆیـەتی دەرحـەق بەبەنـدەکانی: کـە ﴿وَلا تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ

﴿أُخْرَى﴾ هیچ ئادەمیزادێکی تاوانبار تاوانی یەکێکی تر هەڵناگرێ، بەڵکوو هەموو نەفسێك تاوانی خۆی لەسەر خۆیەتیو کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ!

ئەمە ڕەتدانەوەیەکی ئاشکراو نومایانە بۆ ئەوانەی: کە خەڵکی تر هەڵدەنێن بۆ گومڕابوونو کافر بوون، پێیان وایە ئەوان دەتوانن ئۆباڵی ئەو گۆمڕابوانە بخەنە ئەستۆیخۆیان.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی وەلیدی کوڕی موغەیرە نازڵ بووە: کە گوتی: بڕوا بەموحەممەد مەکەنو گوناهەکەتان لەئەستۆی من!

هەروەها ڕەتدانەوەی ئەوکافرانەشە کە دەیانگوت: ئێمە سزا نادرێین. تەنانەت ئەگەر تۆڵەو عیقابیش هەبێ ئەوە ئۆباڵی ئێمە لەئەستۆی باوكو باپیرمانە، ئێمە لاسایی کەرەوەی ئەوانینو چاو لەئەوان دەکەین، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾سبأ/٢٥.

هیچ دژایەتیەك لەنێوان ئایەتەکەی ئێرەو ئایەتی سورەتی (النحل)دا نیە کە دەفەرموێ: ﴿لِيَحْمِلُواْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾النحل/٢٥. هەروەها ئایەتی ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَّعَ أَثْقَالِهِمْ﴾العنكبوت/١٣. چونکە ئەوانەی بانگەوازی خەڵك دەکەن بۆ گومڕابوونو کوفر، ئەوە تاوانی گومڕایی خۆیان لەسەرە، تاوانی تریشیان لەسەرە بەهۆی گومڕا کردنی خەڵکی تر. بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێك لەتاوانی تاوانکارەکان کەم بێتەوە.

بێگومان بەشێك لەرەحمەتو فەضلی خودا ئەوەیە: کە ئادەمیزاد بەرپرسیار ناکاو نایانگرێ تا پێغەمبەریان بۆ نەنێرێ ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ ئێمە بەگوێرەی عەدڵو حیکمەتو رەحمەتی خۆمان هیچ گەلو نەتەوەیەك سزا نادەین لەسەر کردنی کردەوەی نالەبار یان نەکردنی کاری باشو پێویست، هەتا

پێغەمبەریان بۆ نەنێرین، تا ترسێنەرو موژدەپێدەریان بۆ نـەنێرینو سەرپێـچی پەیامەکەی نەکەن، ئێمـە کـەس عیقـاب نـادەین. بـۆ هـەموو گـەلو نەتەوەیـەك پێغەمبـەرمان ڕەوانـە کـردوە پـەیامی ئێمـەی پـێ ڕاگەیانـدون، ئیقامـەی بەڵگـەی لەسـەر کـردوون، مـوعجیزەو نیـشانەی ڕاسـتی پێغەمبەرایـەتی خـۆی نوانـدوە، ئەحکامی حەڵاڵو حەرامی بـۆ شـی کردوونـەوە، مـوژدەی پاداشـی باشـی بەهەشـتی پێـداون، لەسـزای خراپـەکاری ترسـاندونی، جـا کـە گوێیـان بەپەیامەکـەی نـەدابێو بەدرۆیان خـستێبێتەوە ئـەو کاتـە ئێمـە ئـەو سەرپێـچیکارانەمان سـزاداون! وەکـوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ؟ قَالُوا: بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾الملك/٨-٩. یان دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾الزمر/٧١.

بەڵێ: لـەم بـارەوە ئایـەتی قورئـان زۆرن: کـە ئـەوە دەچەسـپێنن پـەروەردگار کەس ناخاتە ناو دۆزەخەوە تا پێغەمبەری بۆ نەنێرێو بانگەوازی نەکرێ بۆ ئیمان هێنانو نەترسێندرێ لەخراپەکاری!!

ئـەمجار پـاش ئـەوەی پـەیامی خـودای پـێ ڕاگەیەنـدراو سەرپێـچی فـەرمانی پەروەردگاری کرد شێوەی عەزابدانەکەیان لەدونیادا بـەم جۆرەیـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾ کـە کـاتی لـەناوبردنی گـەلو نەتەوەیـەك نزیـك بـووەوەو ویـستمان ڕیشەکێـشیان بکەین، فەرمان بەخاوەن نازو نیعمەتەکانیان دەکەین بەبەندایەتیکردن بـۆ خـوداو ئەنجامـدانی کـاری خێـرو سـودمەند بـۆ دونیـاو قیامـەتیان، جـا: کـە سەرپێـچی فەرمانەکانی ئێمەیان کرد، پەرەیان بەخراپەکاری خۆیان داو فیسقو فجوریان بلاوکردەوەو یاخی بوونو ڕۆچوون لەگومڕایی دا، ئەوە شیاوی ئەوە دەبن لەناو ببرێن،

عــەزابی ریــشەکەریان بــۆ پێویــست دەبــێ، ئــیتر تێکیــان دەشــکێنن‌و بەتــەواوی ریشەکێشیان دەکەین‌و دوابڕاو دەبن، لەقیامەتیش‌دا سزای دۆزەخ چاوەڕێیانە.

﴿مترفـون﴾ واتـە بـەناز پـەروەردەو خـاوەن نـازو نیعمـەت: ئـەم تـاقم‌و پێـڕە لەهـەموو گـەل‌و نەتەوەیـەکدا پێـڕی کاربەدەسـتان‌و دەوڵەمەنـدانی دڵـڕەق‌و دارو دەستەکانیانن؛ ئەوانەی ماڵ‌و دارایی زۆرو زەبەندەو خزمەتکارو کارەکەریان هەن‌و لەراحەت‌و خۆش رابواردنـدان، خـاوەن دەسـەلات‌و خۆڵێـسەرەوەو چەوسێنەرەوەن، هێندە زێدەڕەوی لەخۆش رابواردن‌دا دەکەن تا دڵ‌و دەروونیان پەسـت‌و بـێ هەسـت دەبـێ، خـوو دەدەنـە فیـسق‌و فجـورو خـواردن‌و خوداردنـەوەی لەئەنـدازە بـەدەر! ئەخلاق‌و رەوشتیان دەروخێ، گاڵتە بەهەموو بەهایەکی پیرۆزو موقەدەس دەکـەن، چنگ دەخەنە نامووس‌و شـەرەفی یەکتریـیەوە، گوێ بەحـەرام‌و حـەلاڵ نـادەن، کۆ لەپێـشێل کردنـی هـیچ قییـەم‌و رەوشـتێکی بـەرز ناکەنـەوە. جا ئـەم جۆرە پێـڕو تاقمانە تا جڵەویان بۆ شل بکرێ ئەوان زیاتر رۆ دەچن لەبێ رەوشتی دا، کە کـەس دەسـتی نـەگرتن‌و بەگـژیاندا نەچوەوەو پێیـاندا هەڵنەشـاخا، ئـیتر دەبنـە مـاکی فەسادو بێ رەوشتی، فیسق‌و فجور لەسەر زەوی بەرپا دەکـەن، ئـەخلاقی ناشـیرین‌و رەشتی نزم لەناو کۆمەڵدا بلاو دەکەنەوە، رەوشـتە بـەرزەکان دەڕوخێنن‌و رێزیـان ناگرن، ئەو رەوشتە بەرزانـەی کەکۆمـەڵ بـێ ئـەوان هـەڵناکا ئـەو تاقمـە پێـشێلیان دەکـەن‌و دەیـانڕوخێنن، پیـاوەتی‌و مەردایـەتی نـاهێڵن، ژیـانی ئـاژەڵ ئاسـا پـەیڕەو دەکەن، ئیتر ئەو گەل‌و نەتەوەیە کە ئەمە حاڵی کاربەدەسـت‌و گـەورە پیـاوانی بـێ، ئەمـە رەوشـتی دەوڵەمەنـدو قـسە رۆییـشتوەکانی بـێ، رۆشـنبیرو زانـاو رەشـە خەڵکەکەش لێیان بێدەنگ بن، کەس دەستیان وەبـەر دەسـتی نـەهێنێ، ئـەو گـەل‌و نەتەوە مۆرانەو خەمخۆرکە لێی دەداو دادەرزێ‌و زیندویەتی تێدا نامێنێ‌و هۆکـاری هێــزو توانــاو مانــەوەی لــەکیس دەچــێ‌و ســلار دەبێتــەوەو لاپــەڕەی ژیــانی دەپێچرێتەوەو دەچێتە توونی نەمانەوە.

قیرائەتێك هەیە میمی (أمرنا)تێ یدا موشەددەدە، لەسەر ئەو قیرائەتە ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مانای ﴿أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا﴾ بەم جۆرەیە: پیاو خراپو هەتیومچەکانیان دەکەینە بالادەستو فرمانڕەوا بەسەریانەوە، لەخودا یاخی دەبن، جا: کە وایان کرد خودا بەسزای توند لەناویان دەبا، نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجَرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا﴾الأنعام/١٢٣.

ئەمجار پەروەردگار کافرەکانی قورەیشو هاووێنەکانیان دەترسێنێو هەڕەشەی توندیان لێ دەکا لەوەی پێغەمبەر بەدرۆ بخەنەوە، سەرەنجیان رادەکێشێ بۆ ئەوەی کە زۆر لەگەلو نەتەوەکانی پێشوو بەهۆی تاوانو خراپەکارییانەوە خودا لەناوی بردونو عەزابی سەختی بەسەردا داون؛ دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ الْقُرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ﴾ چەند گەلو نەتەوەمان لەپاش رۆژگاری نوح لەناو بردنو ناسەوارمان بڕینەوە!! کاتێ یاخی بوونو سەرپێچیان کردو ئینکاری ئایاتو نیشانەکانی هەبوونو خودایەتی خودایان کردو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە.. وەکوو چۆن ئێوە ئێستا پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، دڵنیابن ئێوە لای خودا لەو گەلو نەتەوە بەدرۆخەرەوانە رێزدار تر نین، ئێوە گەورەترین پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، کەوابێ سزادانی ئێوە پێویست ترو لەپێش ترە!

قەتادەو حەسەن قیرائەتێك ریوایەت دەکەن میمی (أمرنا)تێ یدا مەکسورە ئەو کاتە (امرنا) بەمانا زۆر کردنە.

ئەمە هەڕەشەیە لەوانەی پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە، لەهەموو رۆژگارێکدا، چ لەسەردەمی ژیانی پیرۆزیدا یان دوای کۆچکردنی ماڵئاوایی کردن لەدونیا.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە ئادەمیزادانی ئەو چەرخانەی نێوان حەزرەتی ئادەمو حەزرەتی نووح لەسەر ئایینی ئیسلام بوون!

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: ڕۆژگـاری نێـوان ئـادەمو نـوح دە سـەدە بـووە، هەموویان لەسەر ئایینی ئیسلام بوون!

﴿وَكَفَى بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيراً بَصِيراً﴾ ئەی پێغەمبەر! بەسە کە خودای تۆ ئاگادارو بینایە بـەتاوانی بەنـدەکانی، دەزانـێ: چـی دەکـەنو هـەموو تاوانـەکانیان لەسـەر تۆمـار دەکـا، هیچی لێ گوم نـابێ، بەسـەر کـردەوەی موشـریکەکانو غـەیری موشریکەکاندا ئاگادارە، زانایە بەهەموو کردەوەی ئادەمیزادان بەچاكو خراپیـەوە، هیچ نهێنی یەکی لێ گوم نابێ، شنەواو بینایە بەهەموو کارو کردەوەیەکیان! لەسەر زەویو ئاسمانــەکاندا تاقــە گەردیلەیــەك، بــەڵکوو پچوکترێــشی لێ هــوون نــابێ، ئایەتەکە بەرونی ئەوە دەگەیەنێ کە تاوان هۆکـاری وڵات وێرانبـون و لەناوچـوونی گەلو نەتەوەیە.

ئایەتی ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە ئـەهلی فیترەت؛ ئەوانەی پەیامی پێغەمبـەرانیان پـێ نەگەیـشتووە مـردونو بانگـەوازییان بەگوێـچکەدا نــەدراوە، وەکــوو ئــادەمیزادانی ســەردەمی جـاهیلیو نموونــەیان لەئادەمیزادی ئەو دوورگە دوورانەی: کە تا ئێستا ئایینی ئیسلامیان نەگەیـشتۆتێ ئەوانە هەموویان بەهەشتین، هەروەها منداڵی موشـریكو کافرەکان: کـە بەمنـداڵی بمـرن، هێـشتا نەگەیـشتبێتنە تەمـەنی تـەکلیف. هـەروەها شـێتو کـەڕو پـیری خـەرەفاو! ئیمـامی عـەزالی دەفـەرموێ: ئـادەمیزاد دوای ڕەوانــە کردنــی حــەزرەتی موحەممەد سێ تاقمن:

١- تاقمێکیان بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتووە، ئەوانە بەهەشتین.

٢- تاقمێکیـان بانگـەوازی ئیـسلامیان پـێ گەیـشتووە، مـوعجیزەو نیـشانەی ڕاستی پێغەمبەرایەتیەکەیان دیوەو بیستووە، بـەڵام بڕوایـان پـێ نـەکردوە، وەکـوو ئەم کافرانەی ڕۆژگاری ئێمە، ئەوانە دۆزەخین.

٣- تاقمی سێهەمیان ئەوانەن کە بانگەوازی ئیسلامیان بەشێوەیەکی ناڕاست‌و تێکەڵ بەدرۆ پێگەییشتووە، ئەوانە هیوا وایە بەهەشتی بن!!

## پاداشی هەریەك لەوانەی دونیا ویستن، یان هەوڵی قیامەت دەدەن!

﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ ﴾

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەپێشەوەیان ئاشکراو نومایانە، ئەوەتا دوای ئەوەی پەروەردگار پەیوەندی هەموو ئادەمیزادانی بەکردەوەکانیانەوە چەسپاندو ئەوەی ڕاگەیاند: کە کردەوەی هەموو کەسێك لەئەستۆی خۆیدایەو ئەمجار ئادەمیزادان دەکاتە دوو بەش: بەشێکیان دونیای دەوێ‌و کاری بۆ دەکا، ئەوە سەرەنجامی ئاگری دۆزەخە. بەشێکی تریان قیامەتی گەرەکەو هەوڵی بۆ دەدا سەرەنجامی ئەمانیش

بەهەشتی بەرینە. هەردو بەشەکەش لەدونیادا خودا رزق و رۆژییان دەدا، چونکە بەخششی خودا لەدونیادا گشتی یەو بۆ هەموو کەسە هەرچەندە جوداوازی هەیە لەنێوانیاندا لەبارەی هەژاری و ساماندارییەوە.

پەروەردگار لەم ئایەتانەدا ئادەمیزادان پۆلێن دەکاو دەیانکاتە دوو تاقم؛ تاقمێکیان دونیا ویست و تاقمێکیان قیامەت ویست.

دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ﴾ کەسێك هەوڵی دونیای بێ وەفا بدا، دونیا مەبەست و ئاواتی سەرەکی بێ، هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکی بۆ دەستکەوتنی دونیا بێ، قیامەتی لەبیرچووبێتەوە، خودا بەگوێرەی ویست و ئیرادەی خۆی و بۆ کەسانێك مەیلی لێ بێ، رزق و رۆزی و خۆشگوزەرانییان بۆ دابین دەکا، جا وەنەبێ هەر کەسێك هەوڵی دونیا بدا، دونیای دەستگیر بێ، بەڵکوو دەبێ ئیرادەو مەشیئەتی خودای لەگەڵدا بێ، ماڵ و سامان پێدانی دونیا، دابینکردنی خۆشگوزەرانی پەیوەستە بەدوو شتەوە؛ دەبێ خودا مەشیئەتی لەسەر بێ نەك بەندە، بۆ کەسانێکە خودا بیەوێ نەك بۆ هەموو کەس.

کەوابێ دونیا پەرست و ماددە ویستەکان هەرچی بیانەوێ لەدونیادا نایاندرێتێ، برێکیان ئارەزۆو ویستەمەنییان بۆ دابین دەکرێ، زوربەی زۆریان بەهەژاری ژیان بەسەر دەبەن، لەدونیاو قیامەتدا بێ بەش و بارن، خۆشی نەدیتووی هەردو جیهانن. ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلاهَا مَذْمُوماً مَدْحُوراً﴾ پاشان بۆ هەموو ئەوانەی دونیا ویست و مادە پەرستن، لەجیهاندا بەناکامی خۆیان گەییشت بن یان نائومێد بوبن، دۆزەخمان بۆ ئامادە کردون، هەریەکەیان بەکۆڵێ تاوانی خۆیەوە دەچێتە ناوی و ئەو عەزابە دەچێژێ، سەرباری ئەو عەزابە بەنێشە سەرزەنشتکراون و لەهەموو لایەکەوە لۆمەیان دەکرێ، لەرەحمەتی خودا دوور خراوەن و بەزەیی خودا نایانگرێتەوە. ئەم سزایەی دونیا ویستان سێ تایبەتمەندی هەن؛ بەردەوامی سەرزەنشت و سوکایەتی پێکردن، دورخستنەوە لەرەحمەتی خودا!

بێگومـان ئـەم ئایەتـە هەڕەشـەیەکی تونـدو تیـژە بـۆ کافرە مادەپەرستەکان ئەوانـەی هـەموو هیـواو ئـاواتو مەبەسـتێکیان بـۆ وەدەسـتهێنانی دونیایـەو زۆرجاریش زوربەیان پێی ناگەن و هیچیان دەست ناکەوێ..

ئیمـامی ئەحمـەد فەرموودەیـەکی لـەخاتو عائیـشەوە ریوایـەت کـردوە دەفەرموێ: (الدنيا دار من لادار له، ومال من لامال له، ولها يجمع من لاعقل له).

ئـەمجار دێتـە سـەر باسـی تـاقمی دووەم؛ تـاقمی خوداپەرسـتو هەوڵـدەر بـۆ بەختەوەری ژیانی قیامەت. دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَرَادَ الآخِـرَةَ وَسَـعَى لَهَـا سَـعْيَهَا وَهُـوَ مُـؤْمِنٌ فَأُوْلَئِـكَ كَـانَ سَـعْيُهُمْ مَـشْكُوراً﴾ کەسـێك قیامـەتی مەبەسـت بـێ، هـەوڵو تەقـەڵلای بـۆ وەدەسـتهێنانی ژیـانی بەختـەوەری قیامەتـە. پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیرییـەکانی پـەروەردگارە، چـی لـەتوانادابێ دەیکـا بـۆ ئەنجامـدانی ئـەرکی سەرشانی، لەهەمان کاتدا خاوەن بـاوەڕو خوداپەرسـتو دڵ پـڕ لـەهیواو ئـاوات بـۆ رۆژی دوایی، بڕوای تەواوی بەخوداو بەپێغەمبەرانو زیندوبوونـەوەی رۆژی دوایـی هەیە. ئەوانە هەوڵو تێکۆشانیان جێگای پاداشو رێزلێنانـە، خـودا پاداشـی باشـیان دەداتەوە، بەڵام دەبێ سێ مەرجیان تێدابن:

١- دەبێ بەکردەوەکانی مەبەستی قیامەت بێ، مەبەستی رەزامەندی خودا بێ، ئەگەر ئەم مەبەستەی نەبێ کردەوەکانی بێ سوودە. لەقیامەت مایە پووچ دەبێ..

بوخـاریو موسـلیم فەرموودەیـەکیان لـەئیمامی عومـەرەوە ریوایـەت کـردوە. دەفـەرموێ: (انمـا الأعمـال بالنيـات وانمـا لكـل امرئـي مـانوى) کـردەوە کاتێـك سودبەخشە بۆ ژیانی قیامەت، کە نیەتی رازیکردنی خودابێ.

٢- دەبێ کردەوەکە کردەوەیەکی خوداپەسند بێ، کارێکی بەتاڵو پوچ نەبێ.

٣- دەبێ کردەوەکە بەئیمانەوە بکرێ، مەبەستی رەزامەنـدی خـودابێ، بـڕوای بەپاداشو سزا هەبێ!

هەندێ لەزانایانی سەلەفی صالّح فەرموویانـە: کەسێك سێ شتی تێدانـەبن، سوود لەکردەوە نـابینێ: ئیمـانێکی دامـەزراو، نییـەتو مەبەسـتی راسـتو دروسـت، کردەوەی پەسندو سودبەخش!

ئـەم تاقمـە موسـوڵمانە راسـتاڵانە قیامـەتیان هەڵبـژاردوەو گرنگـی بـەدونیا نادەن، ئەگەر خودا لەدونیادا شتێکی پێدان سوپاسی دەکەنو ئەگـەر نەشـیان درایـە صـەبر دەگـرنو رازی دەبـن بەبەشـی خۆیـانو دڵنیـان لـەوەی خـودا ئەوەنـدەی بـۆ بڕیونەوەو ئەو هەژاریو نەبونیە لەبەرژەوەندی ئەوانەو خودا باش دەزانێ شیاوی چەندن! واتە: رازین بەبەشی خودا.

ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە دیـاری دەکـا: کـە رزقو رۆزیـی هـەردو تاقمەکـە دەستەبەر کراوەو دەفەرموێ: ﴿كُلاًّ نُّمِدُّ هَؤُلاء وَهَؤُلاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّـكَ مَحْظُـوراً﴾ واتـە: پـەروەردگار هـەردوو تاقمەکـە: دونیاویـستەکانو قیامـەت ویـستەکان، لـەرزقو رۆزیو منـداڵو سامان بێ بـەش ناکا، هـەر کەسـە بـەگوێرەی خـۆی (کـافر، یـان موسـوڵمان) رزقو رۆزی دەداتـێ، مـاڵو منـداڵی پـێ دەبەخـشێ، چونکە لەدونیادا عەطاو بەخششی خـودا لەکەس یاساغ نـاکرێ، بۆ هـەموو کـەس پێداویستی ژیان دابین دەکا. بەڵام جوداوازی هەیە لەنێوان ئادەمیزادەکاندا ﴿انظُـرْ كَيْـفَ فَـضَّلْنَا بَعْـضَهُمْ عَلَـى بَعْـضٍ﴾ سـەیر بکـەو بڕوانـە حـاڵی ئـادەمیزادان: هەیـە دەوڵەمەندمان کردوە، هەیە هەژارو نەدارایە، هەیە مـام ناوەندییـە، خـودا بۆخـۆی دەزانێو هەر ئەوەش لەبەرژەوەندی ئادەمیزادە. وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الـرِّزْقَ لِعِبَـادِهِ لَبَغَـوْا فِـي الْـأَرْضِ وَلَكِـن يُنَـزِّلُ بِقَـدَرٍ مَّـا يَـشَاءُ إِنَّـهُ بِعِبَـادِهِ خَـبِيرٌ بَصِيرٌ﴾الشوری/٢٧. یان دەفـەرموێ: ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيـشَتَهُمْ فِي الْحَيَـاةِ الـدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَـاتٍ لِيَتَّخِـذَ بَعْـضُهُم بَعْـضاً سُـخْرِيّاً﴾الزخـرف/٣٢. یـان دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ﴾الأنعام/١٦٥.

ئەمە نیشانەی بێ باکی خودایە، نیشانەی خودایەتیو بێ ئاتاجیەتی، بەنیسبەت خودایەتی ئەوەوە جوداوازی لەنێوان کافرو موسوڵماندا ناکا، زۆر جار ماڵو سامانێکی زۆرو لەژمارە نەهاتوو دەدا بەکافرێکی بەدڕەوشت، لەهەمان کاتدا زۆر موسوڵمانی وا هەیە لەپەنا پاسارێکا لەبرسا دەمرێ، واش دەبێ موسوڵمانێکی باش هەزار قاتی کافرەکان ماڵو سامانی پێ دەبەخشێ!

**هۆی ئەم جوداوازییە دوو شتی سەرەکییە :**

١- هۆکاری رواڵەتی، وەکوو ئەوە هەندێ کەس زیرەكو بەسەلیقەو تێکۆشەرن لەبواری مامەڵەو بازرگانی و کشتو کاڵو چێوداریو ئەم جۆرە شتانەدا، تێکۆشاونو تێکۆشانەکەیان بەرهەمی بووە. ئەمانە هۆکاری عادەتیو رواڵەتینو ئیختیاری ئادەمیزاد رۆڵی هەیە تێیاندا.

٢- هۆکاری پەنامەکینو ویستو ئیرادەی خودایان لەسەرەو جگە لەخودا کەسی تر هۆکارەکان نازانێ.. عەقڵی ئادەمیزاد تێیاندا کۆڵە.

ئەمە جوداوازیی نێوان ئادەمیزادە لەجیهاندا ﴿وَلَلآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلاً﴾ بێگومان جوداوازی نێوان ئادەمیزاد لەقیامەتدا زۆر بەرفراوانترو بەرچاوترە. هی وا هەیە لەبنکڵی دۆزەخ دا دەستو قاچ پێوەندکراوو ریسوابووە، هی وایش هەیە لەشوێنە هەرە بەرزەکانی بەهەشتدا رادەبوێرێ جوداوازیی نێوان ئەم بەدبەختو ئەو خودا پێداوە عاسمانو رێسمانە!

ئەمجار دۆزەخییەکان لەناوخۆیاندا بەرزو نزمییان هەیە، هەیە لەبنکڵی دۆزەخو (أسفل السافلين)دایەو کوشندەترین سزاو ئازار دەچێژێ، هەیە ئازاری کەمترەو لەجێگایەکی ئەهوەنتردایە، هەرەچەندە ئەهوەنترین شوێنی دۆزەخو سوکترین سزای دۆزەخیان ئەوەیە کابرا تا ئەژنۆی لەئاگردایەو مێشکی دەکوڵێ!!!

هەروا بەهەشتییەکانیش جوداوازییان لەنێواندا هەیە؛ هەیانە لەئەعلا عیلیین‌دایەو خۆشترین مەقامو شوێنی لەبەهەشت دا پێ دراوە، هەمیشە پلەو پایەی نزمترەو ناگاتە ئەوانەی لەئەعلا عیلیین‌دان! هەرچەندە نزمترین پلەو پایەی بەهەشت بەجۆرێکە نەبەزمان دەگوترێو نەبەپێنووس دەنووسرێ! چاو نەیبینیوەو بەسەر دڵو دەروونی کەس‌دا رانەبردوە.

لەحەدیثی صەحیح‌دا هاتووە دەفەرموێ: (ان أهل الدرجات العلا ليرون اهل عليين كما ترون الكوكب الغابر في افق السماء).

ئیبنو عەبدولبەر لەحەسەنی بەصرییەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: کۆمەڵێك لەخەڵك لەبەر دەرگای ماڵی عومەری کوڕی خەتتاب کۆبونەوە، سوهەیلی کوڕی عەمری قوڕەیشی (کە یەکێك بوو لەپیاو ماقوڵانی قوڕەیش) هەروا ئەبو سوفیانو هەندێ ریش سپی تری قوڕەیشییان لەناودا بوون، رێگا درا بەصوهەیبو بیلالو هەندێ لەهاوەڵانی (بەدر) کە عومەر زۆری خۆش دەویستن، رێگایان درا چوونە خزمەتی، ئەبو سوفیان وتی: هەرگیز رۆژگاری ئاوا ناخۆشم نەدیوە! رێگا بەو کۆیلانە دەدرێ بچنە ژورەوە، ئێمەش دانیشتوین چاوەنوارین، کەس بەپیاومان نازانێ، سوهەیل کە لەهەموانیان عاقڵ تر بوو، وتی: خزمینە! ئەوە چیتانە دەڵێی رقتان هەستاوە؟ رقتان لەخۆتان هەستێ، خەتای خۆمانە ئەوان بانگ کران بۆ ئیمان هێنان، ئێمەیش بانگ کراین. ئەوان زوو بەپیر بانگکردنەکەوە چوون، ئێمە تەمبەڵیمان کرد، ئەمەش دەرگای عومەرە، ئەی دەبێ جوداوازیمان لەقیامەتدا چۆن بێ؟؟ جا کە ئەمرۆ لەبەردەگای ماڵی عومەر حەسوودی بەمانە بەرین، ئەوە پلەو پایەی قیامەتیان زۆر بەرزترو شکۆمەند ترە!

﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَـٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا

كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ ﴾

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەئایەتەکانی پێشەوە پەیوەندییەکی پتەوو تۆکمەیە. چونکە لەوەپێش ئادەمیزادانی کردن بەدوو تاقم؛ تاقمێکیان دونیا ویستو مادە پەرست، تاقمێکیشیان خواپەرستو قیامەتویست، سزای ئەوان ئاگری دۆزەخەو ریسوا بوونە، پاداشی ئەمانە بەهەشتی رازاوەو پانو بەرینە. بەڵام بۆ تاقمی خواپەرست سێ مەرجی دانان سێیەم مەرجیان ئەوە بوو: فەرمووی: ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ واتە: خاوەن بڕوا بێ، بەشوێن ئەوەدا حەقیقەتی ئیمانی رون کردەوەو ئەوەی راگەیاند: کە کاکڵەی ئیمانو کۆڵەکەی سەرەکی باوەڕ یەکتاپەرستییە؛ ئەمجار دەست دەکا بەروون کردنەوەی شەعائیری ئیمانو مەرجەکانی، بەدیاری کردنی کۆڵەکەو هۆکاری رێکخستنی کۆمەڵگای ئیسلامی.

لەلایەکی ترەوە لەوەپێش فەرمووی: ﴿إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ هەروەها فەرمووی: ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً﴾.

ئەمجار لێرەدا هەندێ فەرمانو جڵەوگیری قورئان رادەگەیەنێو هەندێ قاعیدەو یاسای پێکەوەنانی کۆمەڵگای خاوەن باوەڕ رادەنوێنێو فەرمان دەکا بەپەیڕەوکردنیان، بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی خاوەن باوەڕو تەباو هەمئاهەنگ پێک بێ، کۆمەڵگایەك بێ هاوەڵ بۆ خودا دانەنێ، خواپەرست بێ، رێزی باوكو دایکی تێدا بگیرێ، یارمەتی هەژارو نەبوانی تێدا بدرێ، باربووی رێبوارو لێقەوماوانی تێدا بکرێ. بەڵام بەشێوەیەکی مام ناوەندییانە، هەروا یاساغکردنی لەناوبردنی منداڵو زارۆك لەترسی هەژاری، یاساغکردنی داوێنپیسیو یاساغکردنی ئادەمیزاد کوشتن بەناڕەوا، سەروکاریکردنی ماڵی هەتیو بەشێوەیەکی باشو سوود بەخش،

وهڤا بەعەهدو پەیمان، ڕێکخستنی ئامێری پێوانەو کێشان، چەسپاندنی حەق‌و ڕاستی‌و جڵەوگیری کردن لەخۆبەزلزانی‌و فیزو لوتبەرزیی.. دەفەرموێ: ﴿لا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُوماً مَخْذُولاً﴾ خیطابەکە ڕو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ حەقیقەتی ئیمانی ڕاستەقینەی فێر دەکا: کە بریتییە لەیەکتاپەرستی‌و دانەنانی هاوەڵ بۆ خودا، مەبەستیش ئادەمیزادە بەرپرسیارەکانی ئوممەتەکەیەتی، چونکە ئەو کاتەی ئەم خیطابە نازڵ بووە، پێغەمبەر باوك‌و دایکی نەماوون! جڵەوگیرییەکە لەهاوەڵدانانە بۆ خوداو ترساندنی ئادەمیزادانە لەئاکامەکەی! فەرمانەکە گشتی یە بەڵام ئاڕاستەی تاك کراوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك هەست بکا: کە فەرمانەکە بەتایبەتی ئاڕاستەی ئەو کراوەو ئەو مەبەستە. عەقیدەو بیرو باوەڕ مەسئەلەیەکی شەخصییەو هەموو کەسێك بۆ خۆی لەخۆی بەرپرسیارەو سەرەنجام لەئەستۆی خۆیەتی.

پوختەی مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: ئەی ئادەمیزادی پێگەییشتوو! نەکەی هاوەڵ بۆ خودا دابنێی، نەچی جگە لەخودا کەسێکی تر بەخودا بزانی‌و بەندایەتی بۆ بکەی! چاك بزانەو دڵنیابە جگە لەخودا کەسێکی تر شیاوی پەرستن نیە، جا ئەگەر تۆ ئەی ئادەمیزاد لەگەڵ خودادا کەسێکی تر بپەرستی دەبیتە جێگای سەرزەنشت‌و لۆمە، ڕیسوا دەبی‌و کەس یارمەتیت نادا، خودا پشتت لێ دەکاو دەتداتە دەست ئەوانەی بەندایەتیت بۆ کردون‌و ئەوانیش هیچیان لەدەست نایە!!

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیذی لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەت دەکەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من أصابته فاقة فأنزلها بالناس لم تسد فاقته، ومن أنزلها، بالله، فيوشك الله له برزق عاجل أو آجل) کەسێك هەژاری یەخەی گرت‌و پێویستی بەیارمەتیدان هەبوو پشتی بەئادەمیزاد بەست‌و خودای لەبیر چووەوە، پێویستی یەکەی جێ بەجێ ناکرێ، کەسێك پەنا بۆ خودا بەرێ لەوانەیە خودا فریای کەوێ‌و زوو یان درەنگ ڕزق‌و ڕۆزیی دەداتێ!.

## بەكورتی :

یەكەم بنەمای دامەزراندنی كۆمەڵگای موسوڵمان یەكتاپەرستی پەروەردگارە، بەرەوا نەزانینی هاوەڵو هاوشانە بۆ زاتی پاكی!

﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ خودای تۆ فەرمانی كردوە بەوە: كە لەزاتی خۆی بەولاوە كەسی تر نەپەرستن، بەندایەتیو پەرستش هەر بۆ خودا ئەنجام بدەن، خۆتان لەبەندایەتیكردن بۆ غەیری خودا بپارێزن، چونكە عیبادەت كردن ئەوپەڕی تەقدیسو رێزلێنانە،جگە لەخودای خاوەن نیعمەتو دەسەڵات كەسی تر شیاوی ئەو رێزو تەقدیسە نیە.

ئایەتەكە بەجەختكردنەوە فەرمان دەكا بەیەكتاپەرستی، فەرمانەكە بەوشەی (قضی) ئاراستە دەكا، فەرمانێكەو دەبێ تەنفیذ بكرێ، وشەكە مانای جەختكردنەوە دەگەیەنێ، ئەو كورت هەڵێنانەی نەفییو چەرتكردنەكە دەیگەنێ جەختكردنەوەیەكی تر دەخاتە پاڵ تەعبیرەكە، هەمووشی دەبێتە تەئكیدو گرنگی پێدان بەیەكتاپەرستی! بەڕاستی هەر لەقورئان جوانە تەعبیری ئاوا ئاراستە بكاو رستەی ئاوا دابرێژێ!

جا كە بناغەی كۆمەڵگای موسوڵمانی دامەزراند: كە یەكتاپەرستی یە ئەمجار دێتە سەر ئەركە پێویستەكانی ترو ئاوێتەی خوداپەرستییان دەكاو دەیانكاتە بەشێك لەپێكهاتەی ئیمان! ئەوەتا دوابەدوای فەرمان بەیەكتاپەرستیو عیبادەتكردن بۆ خودا، فەرمان بەئادەمیزاد دەكا: كە لەگەڵ باوكو دایكیاندا چاكە كاربن، چونكە پاش پەروەردگار ئەوان هۆكاری رواڵەتی پەیدابوونی ئادەمیزادن، منداڵ بەهۆی هەبوونی دایكو باوكەوە دێتە وجود، ئەوان بەوپەڕی عەطفو خۆبەختكردنەوە بەخێوی دەكەن، زۆر ئەركوماندوبوون دەكێشن لەپیناو پەروەردەكردنو پێگەیشتنی منداڵدا كەوابێ رابیطەی یەكەم دوا رابیطەو پەیوەندی عەقیدە رابیطەی خێزانە، بۆیە ئایەتەكە چاكەكردن لەگەڵ باوكو

دایكو پەیوەست دەكا بەخوداپەرستی یەوە، ئەو ڕێزو نرخە تایبەتییەی پێ دەبەخشێ!

دەفەرموێ: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً﴾ واتە: پەروەردگار بەجەختەوە فەرمانی كردوەو بڕیاری داوە: كە چاكە لەگەڵ باوكو دایكتان بكەن، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾لقمان/١٤. چونكە باوكو دایك ئەوپەڕی توانای خۆیان بەخەرج داوە بۆ پەروەردە كردنو پاراستنو پێگەیاندنی منداڵەكان، كەوابێ جێگای خۆیەتیو وەفاو ئەمەكدانەوەیە لەلایەن ئەو منداڵەوە: كە چاكەی باوكو دایكی لەبەرچاوان بێ و چاكەیان بداتەوە، بەهەڵسو كەوت كردنی جوان لەخزمەتیاندا، بەگوێڕایەڵی فەرمانەكانیان بۆ دابینكردنی پێویستیەكانیان، هەوڵ بدا بەدڵی ئەوان بجوڵێتەوە، كارێك نەكا پێی دڵگران بن، ئەگەر پێویستیان بەیارمەتی مادی بوو ئەویش هەبوو بوو یارمەتیان بدا.

﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾ ئەی ئادەمیزادی ژیر هەر كاتێ باوك و دایكت یەكێكیان یان هەردوكیان گەیشتنە تەمەنی پیریو كەنەفتیو كەوتنە لای تۆو پێویستیان بەیارمەتی تۆ بوو؛ وەكوو چۆن ئەتۆ بەمنداڵی پێویستیت بەئەوان بووە، ئەوە دەبێ ڕەچاوی ئەم پێنج خاڵانە بكەیو هەوڵ بدەی بەوردی جێ بەجێیان بكەی!

١- ﴿فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ﴾ هەرگیز لەخزمەتیانداو بەرەوڕویان وشەی ئۆف نەڵێی، وشەیەكت لێ نەبیسن وەڕزبوونی تۆ لەوان بگەیەنێ. هیچ كاتێك نابێ بەروویاندا هەڵشاخیو قسەی ناخۆشت لێ ببیسن، بەتایبەتی لەحاڵی پیریو پەككەوتەییاندا، چونكە ئەو كاتە پێویستیان بەیارمەتیو دڵنەوایی زۆر تر هەیە، دڵیان ناسك بۆتەوەو بەكەمترین شت تورە دەبن، بەكەمترین سەرپێچی كردنی تۆ بۆیان دڵگران دەبن.

ئیمامی موسلیم فەرموودەیەك لەئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەكا؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (رغم أنفه، رغم أنفه، رغم أنفه، قيل: من يا رسول الله؟ قال من أدرك والديه عند الكبر، أحدهما أو كليهما ثم لم يدخل الجنة) تیرمیذیو حاكم ئەم فەرمووده‌یەیان لەئەبو هورەیرەوە بەشێوەیەكی درێژتر ڕیوایەت كردوە.

٢- ﴿وَلا تَنْهَرْهُمَـا﴾ نەكەی كردەوەیەكی ناشیرین لەڕویاندا ئەنجام بدەی سەرپێچی فەرمانیان بكەی، بەگژیاندا بچیەوە، لێیان توڕە ببی، بەدرۆیان بخەیەوە، ڕقەبەریيان لەگەڵ بكەی، وادەی درۆیان پێ بدەی!

٣- ﴿وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾ بەنەرمو نیانیو بەشێوەی ڕێز لێگرتنو ئەدەبو حیشمەتەوە ئاخاوتنیان لەگەڵدا بكە، بەشەرمو حەیاوە هەڵسو كەوتیان لەگەڵدا بكە بەشێوەی دایە گیان! بابە گیان! بانگیان بكە، نەچێ بەناوی خۆیانەوە بانگیان بكەی، لەخزمەتیاندا دەنگ بەرز بكەیتەوە بنەڕێنێ، بەچاوی مۆنو سوكایەتی سەیریان بكەی، قێزیان لێ بكەی، ڕو گرژ بی لەخزمەتیاندا.

٤- ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَـاحَ الـذُّلِّ مِـنْ الرَّحْمَـةِ﴾ بەكردەوە پچوكی خۆتیان بۆ بنوێنە، باڵی بەندایەتیو خزمەتچیەتی خۆتیان بۆ بكەرەوە، بەدڵ خزمەتكاریان بەو لەناخەوە ڕێزیان بگرە. نەك لەبەر لۆمەو ڕەخنەی ئەمو ئەو.

٥- ﴿وَقُلْ رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾ داوای ڕەحمەتو بەزەیی خودایان بۆ بكە، بۆیان بپاڕێوە، لەكاتی پیریو لەدوا مردنیان دوعاو پاڕانەوەیان بۆ لەپەروەردگار بكە، بڵێ: خودایە! ڕەحمیان پێ بكە، خودایە! بەرەحمەتو چاكەی خۆت دایانپۆشە، وەكوو چۆن ئەوان لەكاتی منداڵیمدا چاكەیان لەگەڵ كردوم، بەخێویان كردوم، پێیان گەیاندوم، خودایە لەتاوانیان خۆش بە، خێرو خۆشییان لەچارە بنووسە، بیانخەرە بەر بارانی ڕەحمەتی خۆت!

چاكه كردن لەگەڵ باوكو دايكدا لەحاڵی ژيانيانداو لەپاش مردنيشيان دەبێ، بەڵگەشمان ئەو فەرموودەيەی پێغەمبەرە ﷺ: كە ئەحمەدو ئەبو داودو ئيبنو ماجە لەماليكی كوڕی رەبيعەوە ريوايەتيان كردوە؛ دەڵێ: لەكاتێكدا ئەمن لەخزمەت پێغەمبەردا دانيشتبوم پياوێكی ئەنصاری هاتە خزمەتی، وتی: ئەی رەوانە كراوی خودا! ئايا پاش مردنی باوكو دايكم شتێك هەيە من چاكەيان پێ لەگەڵ بكەم؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نعم، خصال أربع؛ الصلاة عليهما، والاستغفار لهما وانفاذ عهدهما واكرام صديقهما، وصلة الرحم التي لارحم لك الا من قبلهما فهو الذي بقي عليك من برهما بعد موتهما) بەڵێ چوار جۆر كردەوە هەيە دەتوانی لەرێگەيانەوە چاكەيان لەگەڵدا بكەی: دوعايان بۆ بكەی، داوای لێخۆشبوونی تاوانەكانيان بۆ لەخودا بكەی، عەهدو پەيمانەكانيان جێ بەجێ بكەی، رێزی دۆستەكانيان بگری، صيلەی رەحم لەگەڵ ئەوانەدا نەپچڕێنی كە بەهۆی ئەوانەوە پەيوەندييان بەتۆوە هەيە. ئەم شتانەن كە لەسەرت پێويستە پاش مردنيان لەرێگەيانەوە چاكەيان لەگەڵ بكەی!

جا ئەگەر باوكو دايك كافر بوون ئەوە هەر دەبێ رێزيان بگریو بۆ خراپە نەبێ دەبێ گوێ بيسی فەرمانەكانيان بێ، چاكەيان لەگەڵ بكا، بەنەرمو نيانی لەگەڵيان بجووڵێتەوە، تا لەژيانداندا دوعايان بۆ بكا خودا هيدايەتيان بدا، بيانخاتە سەر رێبازی ئايينو خوداپەرستی، كە ئيمانيشيان هێنا داوای رەحمو بەزەيی خودايان بۆ بكا، بەڵام پاش مردنيان بەكافری نابێ دوعايان بۆ بكا، چونكە قورئان بەرروونی جڵەوگيری لەوە كردوە: كە دوعا بۆ كافر بكرێ با خزمو كەسو كاريش بن دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى﴾التوبة/١١٣.

سەير بكە قورئانی پيرۆز بەم ئاخاوتنە شيرينو ئوسلوبە جوانو لەسەرخۆيە، هەستی چاكەكردنو سۆز لەدڵی كوڕو كچدا بەرامبەر باوكو دايك

دەجوڵێنێ، هەڵیان دەنێ بۆ خزمەت کردنیان، بۆگوێ بیس بوونی فەرمانەکانیان، جا چونکە باوكو دایك بەسروشت ئامادەباشییان تێدایە بۆ خزمەتکردنی منداڵەکانیان، بۆ خۆبەختکردن لەپێناویاندا قورئانی پیرۆز ئەو فەرمانەی ئاراستەی منداڵی کردوە بەرامبەر باوكو دایکی ئاراستەی ئەوانی نەکردوە بەرامبەر منداڵەکانیان!

سەیربکە چۆن گژوگیای تازە شین بوو هەرچی ڤیتامیناتو بژێوی ناو دەنکە تۆمەکە هەیە هەڵی دەمژێو خۆی پێ پەروەردە دەکا تا وای لێ دێ دەنکە تۆم دەبێتە قروێلكو هیچی تێدا نامێنێ، یان بێچو لەناو هێلکەدا وردە وردە هەموو ڤیتامیناتی ناو هێلکەکە هەڵدەمژێو خۆی پێ پەروەردە دەکا تا وای لێ دێ هێلکەکە توێکڵەکەی دەمێنێتەوەو بەس!

هەر بەو جۆرەش منداڵ هەموو هێزو توانایەکی باوكو دایك هەڵدەمژن، ئەم باوكو دایکە هەرچی لەتوانایاندایە بۆ پێگەیاندنی منداڵەکانیان بەخەرجی دەدەن، کاتێك بەخۆیان دەزانن پیرو کەنەفت بوونو پۆڵکاون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بەبەختەوەر دەزانن!

وەلێ منداڵ کە پێ دەگاو خۆی دەناسێ هەموو ئەو خۆبەختکردنەی باوكو دایکی لەبیردەچێتەوە، لەبەر خاتری هاوڕێکانی یا دەستگیرانو خێزانی خۆی و منداڵی؛ واز لەباوكو دایکی دەهێنێو فەرامۆشیان دەکا، بۆیە باوكو دایك پێویستیان بەئامۆژگاری نیە بۆ چاکەکردن لەگەڵ منداڵەکانیان، بەڵکوو کوڕو کچەکان پێویستیان بەراچڵەکێنی ویژدان هەیە، بۆ هۆشیار کردنەوەو پێزانینی ئەوئەرکەی لەسەر شانیانە بەرامبەر ئەو باوكو دایکەی گوڵی تەمەنی خۆیانیان لەپێناو ئەماندا خەرج کردوە، ماندو نەناسانە بەشەوو ڕۆژ خۆیان بەخت کردوە بۆ پەروەردە کردنو پێگەیاندنیان. ئەو باوكو دایکەی خۆیانیان لەپێناو ئەماندا پیرو کەنەفت کردوە، هەموو هەوڵو تەقەلایەکیان داوە لەپێناو بەختەوەری

منداڵەکانیاندا. بۆیە فەرمان بەچاکە کردنەکە ئاڕاستەی منداڵ کراوە، ئاڕاستەی چینی تازە پێگەیشتوو کراوە بەرامبەر چینی پێشوو.

ئەبو بەکری بەزاز لەبورەیدەوە لەباوکییەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: پیاوێك دایکی لەکۆڵ کردبوو تەوافی کەعبەی پێ دەکرد، کە تەواو بوو، پرسیاری لەپێغەمبەر کرد ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەر خودا! ئایا چاکەی دایکم دایەوە؟؟ پێغەمبەر فەرموی: نەخەیر، هێشتا پاساوی ماندوبوونی هەناسەیەکی ئەوت نەداوەتەوە.

تیرمیذی لەعەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا؛ دەفەرموێ: (رضا الله في رضا الوالد، وسخط الرب في سخط الوالد). رەزامەندی خودا لەرەزامەندی باوك و دایکدایە نارەزایی خودا لەنارەزامەندی باوك و دایکدایە.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لەوانە دەکا: کە کەمتەرخەمی دەکەن لەچاکەکردن لەگەڵ باوك و دایکیاندا. دەفەرموێ: ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! باش بزانن: خودای ئێوە زۆر زانایە بەوەی لەدڵ و دەروونتاندایە، دەزانێ تا چ ئەندازەیەك بەدڵسۆزی یا بۆ ریایی و لەترسی لۆمەی خەڵك رێزی باوك و دایکتان دەگرن، بەڵکوو زۆر باشتر لەخۆتان ئاگاداری مەبەست و هەڵس و کەوتتانە، رێ دەکەوێ یەکێکتان بەهەڵە کارێك دەکا دەبێتە هۆی دڵگرانی باوك و دایکتان ئەوە خودا لەسەر ئەوە سزاتان نادا بەمەرجێ نییەتتان باش بێ چونکە ﴿إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلأَوَّابِينَ غَفُوراً﴾ ئەگەر ئێوە خۆتان صاڵح و راستاڵ بکەن، بەئەنقەست ئەزیەتی باوك و دایکتان نەدەن، فەرمانبەرداری پەروەردگار بن، لەوەی فەرمانی پێ کردون کەمتەرخەمی نەکەن، ئەوە خودا عیقابتان نادا، بێگومان پەروەردگار زۆر لێخۆشبوونی هەیە بۆ ئەوانەی لەتاوان پەشیمان دەبنەوە، لەو کردەوە خراپانە تۆبە دەکەن کە بەئەنقەست ئەنجامیان داون! دەست دەکەنەوە بەکردەوەی چاك و هەوڵی رەزامەندیی خودا دەدەن!

ئەمە هەڕەشەیە لەوانەی کەمتەرخەمی دەکەن دەربارەی چاکەکاری لەگەڵ باوك‌و دایکیان، بەئەنقەست ئەزیەتیان دەدەن. وادەو بەڵێنی خودایە بۆ ئەوانەی بەدڵسۆزی خزمەتی باوك‌و دایکیان دەکەن!

ئەمجار پاش فەرمان کردن بەچاکەکردن لەگەڵ باوك‌و دایکدا فەرمان بەچاکە کردن دەکا لەگەڵ ئادەمیزادی تر؛ دەفەرموێ: ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ﴾ ئەی ئادەمیزادی خاوەن دارایی‌و بەرپرس! ببەخشەو دەستی یارمەتی درێژ بکە بۆ کەس‌و کاری هەژارت، مافی خۆیان بدەرێ: صیلەی رەحمیان لەگەڵ مەپچڕێنە، هەڵس‌و کەوتی باشیان لەگەڵ بکە، لەماڵ بەخشین و یارمەتی بێ بەشیان مەکەن، هەروەها یارمەتی هەژاری تریش بدە کۆمەگی بەرێبوارو دابڕاو لەماڵ‌و حاڵی خۆی بکە، قسەی خۆشیان لەگەڵ بکە، بەیارمەتی ماڵیی‌و بەدابینکردنی پێداویستی ژیان فریایان بکەوە، تێشووی سەفەرو راحیلەیان بۆ دابین بکە تا دەگاتەوە زێدو نیشتمانی خۆی.

هەڵبەتە ئەم خیطابە بۆ پێغەمبەرەو مەبەست ئومەتەکەیەتی لەپاش خۆی..

ئەبو داود لەبەکری کوڕی حاریثی ئەنصارییەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا دەربارەی ئەوانەی: کە پێویستەو لەپێشەوەن بۆ چاکە لەگەڵ کردن. دەفەرموێ: (أمك وأباك، ثم أدناك ادناك).

بوخاری‌و موسلیم لەئەنەسەوە ریوایەت دەکەن؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من أحبّ أن يبسط له في رزقه وينسأ له في أثره، فليصل رحمه).

فەرمانی ئایەتەکە بەلای ئەبو حەنیفەوە بۆ وجوبەو خزمی مەحرەم دەگرێتەوە، وەکوو خوشك‌و براو دایك‌و باوك، بەلای شافعییەوە بۆ نەدبە. لەلای جەماوەری زانایان تەنیا نەفەقەی بنەچەو وەچە پێویستە، جگە لەوان نەفەقەیان

ناکەوێتە سەر ئینسان، بەلای ئیمامی ئەحمەدەوە نەفەقە بۆ هەموو خزمێك واجبە. یارمەتیدانی هەژارو ڕێبواران بەصەدەقەی سوننەت دەژمێردرێ.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: لێرەدا ئایەتەکە ڕاستییەك دەچەسپێنێ: ئەویش ئەوەیە: کە خزمو هەژارو ڕێبوار مافیان لەسەر ئادەمیزاد هەیە، حەقیان لەسەر هەبوو خاوەن دارایی هەیە، بەماڵبەخشین ئەو حەقەیان لەئەستۆدا دەماڵێ، یارمەتیدانو ماڵبەخشین بەخزمو هەژارو ڕێبوار جێگای منەتکردن نیە، بەڵکوو مافێکە لەئەستۆیدایەو خودا لەسەری فەرز کردووەو ئەنجامی دەدا، حەقێکە دەیدا بەخاوەن حەقو ئیممەی پاك دەبێتەوە، خۆشەویستی لەنێوان بەخشندەو پێ بەخشراودا پەیدا دەبێ.

بەڵام دەبێ ماڵبەخشراوەکەی بەسروکەت بێو زێدەڕەوی تێدا نەکا، بۆیە دوا بەدوای فەرمان بەماڵبەخشین فەرمووی: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا﴾ بەمیانەڕەوی نەبێ ماڵ مەبەخشن، لەخراپەکاریدا خەرجی مەکەن، بیدەن بەوانەی: کە شیاوی ماڵ پێ بەخشینن!

میانەڕەوی لەماڵبەخشیندا سیاسەتێکی نەگۆڕی سەرەکی ئایینی ئیسلامە لەڕوی ئابووریو کۆمەڵایەتیو ئایینی یەوە، ئەوەتا لەشوێنێکی تردا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا﴾الفرقان/٦٧.

عوسمانی کوڕی ئەسوەد دەفەرموێ: لەگەڵ موجاهیددا سەرگەرمی تەوافی کەعبە بووم، لەپڕێکا سەری بەرز کردەوە سەیری کێوی ئەبو قوبەیسی کردو فەرمووی: وەڵڵاهی ئەگەر یەکێك بارستایی ئەو کێوە لەطاعەتی خودادا خەرج بکا بەموسریف ناژمێر درێ، ئەگەر دیرهەمێك خەرج بکا لەخراپەکاریدا دەچێتە پێڕی موسریفەکانەوە.

ئیمامی عەلی دەفەرموێ: ئەوەی خەرجی دەکەی بۆ ماڵو منداڵت بەشێوەیەکی میانەڕەویو ئەوەی دەیبەخشی بەموحتاجان، ئەوە بەشی تۆیەو سودی لێ وەردەگری، ئەوەی دەیبەخشی بەشێوەی ڕیابازیو بۆ ناوو شۆرەت ئەوە بەشی شەیتانەو بێهودەیە، هەندێ لەزانایانی ئیسلام زێدەڕەویان کرد لەماڵبەخشیندا، پێیان گوترا: خێرو چاکە لەزێدەڕەوی دا نیە؟ لەوەڵامدا گوتی زێدەڕەوی لەخێردا نیە! واتە چەندێك لەرێگای خێردا ماڵ ببەخشی بەموسریف نازمێردرێی.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای سەعددا تێپەڕی لەوخەریکی دەستنوێژ شتن بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەم زێدەڕەوییە چیە ئەی سەعد! لەدەستنوێژگرتن دا؟ بۆ ئەوەندە ئاو بەکار دەهێنی؟ سەعد وتی: جا بۆ لەدەستنوێژ گرتنیشدا زێدەڕوویی هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، تەنانەت ئەگەر لەسەر چەمێکی ڕەوانیش بێ!!

ئیمام ئەحمەد لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەت دەکا؛ دەڵێ: کابرایەکی تەمیمی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی ڕەوانە کراوی خودا! من خاوەنی ماڵو سامانێکی زۆرو زەبەندەم، منداڵو خێزانێکی زۆرم هەیە، پێم بفەرموو: چۆن ماڵی خۆم ببەخشم، هەڵسو کەوتم چۆن بێ، چی بکەم باشە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تخرج الزكاة من مالك ان كان، فانها طهرة تطهرك، وتصل اقرباءك، وتعرف حق السائل والجار والمسكين) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆم کەم بکەرەوە، فەرمووی: ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيراً﴾ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەسمە، ئەگەر من زەکاتی ماڵو سامانم بدەم بەکاربەدەستە نێردراوەکانی تۆ ئەوە من ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێهێناوەو خوداو پێغەمبەرم لەخۆم ڕازی کردوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ: ئەگەر زەکاتی ماڵەکەت دا

بەپیاوی نێردراوی من ئەوە ئەرکی خۆت بەجێهێناوەو پاداشی خۆت هەیە، ئەو کەسە تاوانی لەسەرە کە ئەم یاسایە بگۆڕێ.

ئەمجار پەروەردگار دیمەنی ناشیرینی زێدەڕەوی دەردەخاو زێدەڕەوان بەبرای شەیاتینی یەکان ناو زەد دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ بێگومان ئەوانەی ماڵو سامانی خۆیان لەتاوانکاریدا دەبەخشن، لەپێناو ڕەزامەندیی خودادا نایبەخشن؛ ئەوانە پێڕو تاقمی شەیتانن، هاوەڵو هاونشینی شەیاتینی یەکانن، وێ چوو نموونەی شەیاتینیانن لەڕەوشتو کردەوەدا، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَاناً فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾الزخروف/٣٦.

لەزمانی عەرەبی دا هەر کەسێك ڕێو ڕەسمی تاقمێك پەیرەو بکا، بەبرای ئەوان دەژمێردرێ.

﴿وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُوراً﴾ واتە: شەیتان نیعمەتەکانی خودای لەبەر چاو نەبوو، پێیان کافربوو، سوپاسی ئەو نیعمەتانەی خودای نەکرد، سپڵەیی نواند، فەرمانی خودای شکاندو ڕوی کردە خراپەکاریو سەرپێچی کردن، خۆی تەرخان کرد بۆ ئەنجامدانی تاوانو بڵاوکردنەوەی فەساد لەسەر زەویو گومڕاکردنی خەڵك.

شێخی کەرخی دەڵێ: هەر کەسێك خودا ماڵو سامانو شکۆمەندی پێداو لەپێناو ڕەزامەندیی خودادا خەرجی نەکرد، ئەوە کافرە بەنیعمەتی خوداو وەکوو شەیتان وایە لەڕەوشتو کرداردا.

دابو نەرێتی عەرەبەکان وا بوو ماڵو سامانیان لەڕێگەی تاڵانو داگیرکردنو چەپاوکردنەوە کۆ دەکردەوە، پاشان لەپێناو خۆهەڵدانەوەو بەخۆنازیندا خەرجیان دەکرد، موشریکەکانی قورەیشیش ماڵو سامانی خۆیان لەپێناو ڕێگە گرتن

لەموسولمانبوونی خەڵکدا خەرج دەکردو بەهۆی ماڵو سامانیان سوکایەتییان بەموسولمانان دەکردو یارمەتی دوژمنانی ئیسلامیان دەدا، ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو بۆ هۆشیار کردنەوەی ئەوان لەوکارە ناشیرینەیان.

﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمْ ابْتِغَاءَ رَحْمَةٍ مِنْ رَبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُلْ لَهُمْ قَوْلاً مَيْسُوراً﴾ هەتا تۆ خاوەنی دارایی بەگوێرەی توانا ئاتاجان بێ بەش مەکە، جا ئەگەر جارێك لەجاران داوایان لێ کردی یارمەتییان بدەی ئەتۆش ماڵێکی وات لەژێر دەستا نەبوو بتوانی یارمەتییان بدەی، پشتت لێیان هەڵکرد لەوەی شتیان پێ بدەی، چاوەڕوانی نیعمەتو ڕەحمەتی خودای خۆت بووی بۆت بێ، بەهیوای شتێك بووی بێتە ژێر دەستت، ئەوە بەگفتو ئاخاوتنێکی شیرین ولامیان بدەرەوە، عوزریان بۆ بێنەرەوە، بەشێوەیەك جوابیان بکە لەدڵی نەگرن.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەئادەمیزادەکان دەکا: کە ڕێبازی پەسندو نموونەیی بگرنەبەر لەماڵبەخشیندا. دەفەرموێ: ﴿وَلا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَحْسُوراً﴾ دەستت بەگەردنتەوە شەتەك مەدە، واتە: ئەوەندە ڕژدو چروك مەبە، خۆت دوور بخەیتەوە لەخێرو خێراتو بەجێهێنانی یاسای خزمایەتیو پیاوەتیو بەخشندەیی بەجۆرێك سودت بۆ خۆتو خزمو کەسو کارو ئاتاجان نەبێ، صیلەی ڕەحم بەجێ نەهێنیو هیچت لێ هەڵنەوەرێ!

هەروەها ئەوەندەش دەست بڵاوو بەخشندە مەبە زیاد لەتوانای دارایی خۆت بێ، ئەوەندە دەست بڵا و بی هیچ لەدەستی خۆتدا نەهێڵیتەوە..

بەکورتیو پوختی بنەمای ماڵبەخشین بریتییە لەمیانەڕەوی لەبوارەکانی ژیاندا، میانەڕەوی لەماڵبەخشیندا، بەبێ دەست قوچاندنو دەست بڵاوکردن؛ ڕژدی زێدەڕەوییە لەخۆگرتنەوە لەبەخشین، دەست بڵاویش بریتییە لەزێدەڕەوی لەبەخشیندا، هەردوکیان ناپەسندن، باشترین کار ئەوەیە مامناوەندیی بێ.

ئیمام ئەحمەد لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ماعال من اقتصد) کەسێك پەیڕەوی ئیقتیصاد بکا هەژار نابێ.

بەیهەقی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الأقتصاد في النفقة نصف المعيشة) دەیلەمی لەموسنەدی (الفردوس)دا لەئەنەسەوە ریوایەت دەکا؛ فەرموویەتی: (التدبير نصف العيش، والتودد نصف العقل، والهم نصف الهرم، وقلة العيال أحد اليسارين) تەگبیرو پیلاندانان بۆ بەڕێوەچون نیوەی بژێوە، خۆ خۆشەویست کردن نیوەی عاقڵ مەندییە، غەمو نارەحەتی نیوەی پیرییە، کەمی خێزان نیمچە دەوڵەمەندییەکە.

هەردو پیری فەرموودە لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مامن يوم يصبح العباد فيه الا وملكان ينزلان من السماء، يقول أحدهما: اللهم اعط منفقاً خلفاً، ويقول الآخر: اللهم أعط ممسكاً تلفاً) هیچ رۆژێك نیە: کە بەندەکانی شەوی تێدا بەرۆژ دەکەنەوە ئیللا دو فریشتە دێنە سەر زەوی، یەکێکیان دەڵێ: خودایە! ببەخشە بەوانەی بەخشندەن، شوێنی بەخشینەکەیان بۆ پڕ بکەرەوە، ئەوی تریان دەڵێ: خودایە! ئەوەی نابەخشێ ماڵوێرانی بکە.

ئیمام موسلیم لەئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکی بەمەرفووعی هێناوە دەفەرموێ: (ومن تواضع لله رفعه الله) ماڵ بەبەخشین لێی کەم ناکا، هەر بەندەیەك بەخشندە بێ خودا شکۆمەندی دەداتێو پلەو پایەی بەرز دەکاتەوە، کەسێك لەبەر خاتری خودا خۆی بەکەم بزانێو موتەواضیع بێ خودا بەرزی دەکاتەوەو رێزو نرخی لەناو خەڵکدا بۆ زیاد دەکا.

ئەبو داود لەعەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە بەمەرفوعی فەرمودەیەك ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: خۆتان لەرژدیو چروکی بپارێزن، چونکە رژدی بوو بەهۆی

لەناوبردنی گەلەپێشینەکان فەرمانی پێ کردن بەبەخیلی ئەوانیش بەخیلییان نواند، فەرمانی پێ کردن بەپچڕاندنی صیلەی رەحم بەگوێیان کرد، فەرمانی پێ کردن بەفیسقو فجور ئەنجامیان دا!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە رزقو رۆزیی‌و دەوڵەمەندیی‌و هەژاریی بەندەکان پەیوەندە بەویستو ئیرادەی خودا لەبەر حیکمەتێك کە هەر خۆی دەیزانێو بەس! لەم روانگەوە تەسەللای پێغەمبەرو موسوڵمانان دەداتەوە، پێیان دەزانێنێ: کە تەنگ کردنەوەی رزقو رۆزی لەسەر چەند کەسانێك نیشانەی ئەوە نیە خودا رقی لێیانە، بەڵکوو ویستی خودای خاوەن رزقو رۆزیی‌و دارایی وایەو حیکمەتێکی تێدایە هەر خۆی دەیزانێ.. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! رزقو رۆزیی زۆرو زەبەندە دەکا بۆ کەسانێك مەیلی لێ بێ، هەروەها بۆ هەندێکیش کەمی دەکاتەوە، دەستکورتو نەدارایان دەکا، خودا بۆ خۆی یاسایەکی داناوە لەجیهاندا، دابو نەرێتێکی تایبەتی بۆ خۆی داناوەو بەگوێرەی ئەو دابو نەرێتە بونەوەر هەڵدەسوڕێنێ.

﴿إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيراً بَصِيراً﴾ بێگومان خودای تۆ: کە خاوەنی بوونەوەرە زاناو ئاگادارە؛ دەزانێ بەرژەوەندیی هەموو ئادەمیزادێك لەچی دایە، کێ شیاوی دەوڵەمەندییە، کێ شیاوی هەژارییە جوداوازی نێوان ئادەمیزادان لەبارەی دەوڵەمەندیو هەژارییەوە لەبەر رژدیو چروکی نیە، بەڵکوو بەرژەوەندییان وا دەخوازێ هەندێکیان هەژار بن هەندێکیان دەوڵەمەند! لەفەرمودەی پێغەمبەر هاتووە دەفەرموێ: هەندێك لەبەندەکانم هەن تەنیا هەژارییان بۆ باشە، ئەگەر دەوڵەمەندیان بکەم ئاینەکەیان لێ دەشێوێ، هەندێکیشیان تەنیا دەوڵەمەندیی بۆیان باشە، ئەگەر هەژاریان بکەم ئایینەکەیان تێك دەچێ.

جاری وایش هەیە دەوڵەمەندیی بۆ هەندێ کەس ئیستیدراجو لەخشتە بردنە، هەژاریی سزاو تۆڵەیە.

**بەکورتی** :

خودا بۆ خۆی (ڕەببولعالەمینە) بەخێوکەری ئادەمیزادە دەزانێ چی باشە بۆیان، چی خراپە بۆیان، بەگوێرەی پێویست دارایییان دەداتێ، بۆ هەندێك زۆرو بۆ هەندێك کەم، چونکە ئەوە لەبەرژەوەندییانە لەهەموو حاڵێکیشدا فەرمانیان پێ دەکا میانەڕەوبن، لەسنووری ئاسایی تێپەڕ نەکەن، نەزۆر دەست قوچاوبن نەزۆر دەست بڵاو!

## بنەمایەکی تری گرنگ بۆ یاسای کۆمەڵگای ئیسلامی

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُواْ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُواْ

بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەئادەمیزاد کرد بەپێنج شت: (یەکتاپەرستی، خوداپەرستی بەدڵسۆزی، خۆپاراستن لەهاوەڵدانان بۆ خودا، چاکە کردن لەگەڵ باوكو دایكدا، کۆمەکی کردن بەکەسو کاری هەژارو هەژارانی ترو رێبواران، ئەگەر توانای کۆمەکیشت نەبوو بەقسەی خۆش ولامیان بدەیەوە) دوای ئەم پێنج بنەما سەرەکییانە بۆ رێکخستنی کۆمەڵگا فێری چۆنیەتی ماڵبەخشینی کردنو فەرمانی پێ کردین میانەڕەو بین. ئەمجار جڵەوگیریمان لێ دەکا: لەسێ شت: لەکوشتنی بەناحەق، لەداوێنپیسی، لەنزیك بوونەوەی ماڵی هەتیو بەشێوەی ناپەسندا

ئەمجار فەرمانمان پێ دەکا بەسێ شتی گرنگ کە برِبڕەی ژیانی کۆمەڵاتین، ئەوانیش وەفا بەعەهدو بەڵێنو رێكو پێك کردنی ئامێری پێوانەو کێشانەیە

بەهەموو جۆرەکانیەوە. ئەمجار جلەوگیریمان لێ دەکا لەسێ شت: شوێنکەوتنی کوێرانە، خۆبەزلزانینو فیزەونی، هاوەڵدانان بۆ خودا.

بەکورتی خودای میهرەبان لەم ئایەتانەو ئایەتەکانی پێشوودا بیستو پێنج جۆر تەکلیفی خستە سەرشانمان بە یەکتاپەرستی دەستی پێکردو بەفەرمان بەیەکتاپەرستی کۆتایی هێنا.

دەفەرموێ: ﴿وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! نەچن کچەکاناتان زیندە بەچاڵ بکەن لەترسی هەژاریی یان لەترسی ئەوەی ببنە هۆی سوکایەتی پێ کردن بۆتان. ﴿نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ ئێمە بژێوی ئەوانیشو ئێوەش فەراهەم دێنین، ئێمە رزقو رۆژییان دەدەمینێ نەك ئێوە، وەکوو چۆن خەزێنەی رەحمەتی خۆمان دەکەینەوە بۆ کورەکانو رزقو رۆژییان بۆ دابین دەکەین، بۆ کچەکانیش بەهەمان شێوە رزقو رۆژیی فەراهەم دەهێنین. کەوابوو هیچ بیانوتان بەدەستەوە نیە بۆ لەناو بردنیان! خۆتان لەو تاوانە بپارێزن ﴿إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئاً كَبِيراً﴾ بێگومان زیندەبەچاڵکردنی ئەوانە تاوانێکی زۆر گەورەیە، زەرەرو زیانێکی زۆر ترسناکی لێ دەکەوێتەوە، بەدەستی خۆتان گەراو گەرچەکی خۆتان دەکوژێننەوە، بەشێکی گرنگی ئادەمیزاد کە ئافرەتەو نیوەی کۆمەڵەو دایکی دوا رۆژە، ئێوە بەساوایی قەلاچۆی دەکەن، ناهێڵن پێ بگاو وەبەر بێ، ئەوانە گوڵی ژیانن، ئێوە بەچرۆیی‌و بەناسکی قتیان دەکەن!!

لەصەحیحی موسلیمو بوخاری دا هاتووە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد چ تاوانێك زۆر دژوارو گەورەیە؟ پێغەمبەر ﷺ لەوڵامدا فەرمووی: (ان تجعل لله نداً وهو الذي خلقك) ئەوەتا تۆ هاوەڵ بۆ خودا دابنێو پێت وابێ جگە لەخودای گەورەو میهرەبان خودای تر هەن، لەحاڵێکدا هەر خودا تۆی دروستکردوە. گوتم: پاشان چ تاوانێك گەورەیە؟ فەرموی: (ان تقتل ولدك خشية ان يطعم معك!) ئەوەیە جگەرگۆشەی خۆت بکوژی لەترسی ئەوەی

خواردنت لەگەڵ دەخوا، واتە: لەترسی بەخێوکردنی زیندەبەچاڵی بکەی. گوتم پاش ئەوە چ تاوانێك زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: (ان تزنی بحلیلە جارك) ئەوەیە داوێن پیسی لەگەڵ هاوسەری جیرانەکەت بکەی!!

## بەکورتی :

زیندە بەچاڵکردنی زارۆکی مێینە ئەگەر لەترسی هەژاریی بێ ئەوە نیشانەی ئەوەیە: گومانی خراپتان بەخودا هەیەو لەبێ ئیمانیو بێ یەقینیتانەو سەرچاوەی گرتووە. خۆ ئەگەر لەبەر جۆرە غیرەتو ناموسێ بێ کە لەدابو نەریتی ئێوەدا هەیە، ئەوە هەوڵدانە بۆ لەنابردنی رەچەڵەکی ئادەمیزادو وێرانکردنی عالەم. یەکەمیان پێشێل کردنی فەرمانی خودایەو دووەمیان پێچەوانەی یاسای شەفەقەتو بەزەیی هاتنەوەیە بەو زارۆکە بێ دەسەڵاتانەدا، هەردووکیان ناپەسندن! بیانووەکانتان بۆ زیندەبەچاڵ کردنیان عوزری نامەعقوولو بیانووی بێ سەرو بەرن!

بێگومان دابو نەریتی عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی وابوو میراتیان بۆ مێینە دانەدەنا، میرات هەر بەشی نێرینە بوو بەس. وا دەبوو کابرا منداڵی مێینەی دەبوو هەر خێرا بەزیندوویی زیندە بەچاڵی دەکرد! بەبیانووی ئەوەی هەژارەو پێی بەخێو ناکرێ، خۆ ئەگەر ئەم کچە گەورەش ببێ کارو کاسبی ناکا، ناتوانێ وەکوو کوڕ تاڵانو بڕۆ بکا، راوو روتو چەتەیی پێ ناکرێ، ئەمجار چونکە هەژارە هاوشانی خۆی نایەتە داخوازیو ناچار دەبێ بیداتە ناهاوشان، ئەمەش لەککەیە بۆ شانیو پێی ناخۆشە کچەکەی بدا بەناهاوکوف، بەم بیانوە بێ جێیانە پرکێشی زارۆکی تازە لەدایکبووی دەکردو دەیبرد بەزیندوویی ژێر خاکی دەکرد!

خوێنەری هێژا! رێزنەگرتنی مێینەو سوکایەتی پێکردنیو پێشێل کردنی مافەکانی لەزوربەی کۆمەڵگاکانی ئەوسادا باوبووەو بەجۆرێك لەجۆرەکانی چەوساندنەوەو زیندەبەچاڵکردنو سوکایەتی پێکردن مافی ئافرەت پێشێل دەکراو

دەچەوسێنرایەوە، ئیسلام هات ئەم حەقەی بۆ چەسپاندەوە، مافی سروشتی خۆی پێ دایەوە. سەیری مێژووی کەوناراى ئادەمیزاد بکەن، بڕواننە سەرچاوەکانی مێژووی کۆمەڵایەتی ئادەمیزاد، لەهەر شوێنێك ئیسلام نەبووبێ چەوساندنەوەی ئافرەت بەرجەستە بووە، هەر کاتێ ئیسلام (شەریعەتی خودا) بەرقەرار نەبووبێ مافی ئافرەت پێشێل کراوە!!

ئەوانەیش لەژێر دروشمی غەیری ئیسلامدا بەدەم داوای مافی ئافرەت دەکەن پڕو پاگەندەی حیزبایەتیو چەواشەکردنی خەڵکانی سافیلکەو تێنەگەییشتووە. ئەگینا ئەوانە؛ کە ئێستا داوای مافی ئافرەت دەکەن بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیانە، دەیانەوێ کۆمەڵ بڕوخێنن، خێزان پەرتەوازە بکەن: ئەمجار بۆ خۆیان لەناوی قوڕاودا ماسی بگرن!

ئەگینا کێ دیویەتیو کێ بیستویەتی کاکی تێکۆشەر داوای مافی ئافرەت بکاو، کوڕو فیستفاڵ بەم بۆنەوە ساز بکا کەچی بۆخۆی خێزانی ئازار لەگەڵ چەشتووی خۆی بەرەڵا بکاو ژنی مێردار داگیر بکا!! کێ دیویەتی کابرا خۆی بەتێکۆشەرو جانفیدای گەلو وڵات بزانێ پاساوڵو گەوادەکانی بنێرێ لەفەرمانگەو خوێندنگادا یا لەماڵو خانەو لانەی خۆیدا کچی رو سووری دەست لێ نەدراو یان ژنی خاوەن مێردی جوانو جور بڕفێنن بۆ کاکی تێکۆشەر لەگەڵی رابوێرێ، تەعەددای ناموسی لێ بکا، خۆ ئەگەر ئافرەتی بێ دەسەڵات (معارضة) بوو تیرۆری بکا!!![17]

خوێنەری هێژا! سەیری وردی تەعبیری قورئان بکەو بەدڵ سەرنجی بدەرێ! لێرەدا رزقو رۆزی منداڵی پێش رزقو رۆزی باوکان خستووە دەفەرموێ: ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم﴾ کەچی لەسورەتی (الأنعام/١٥١)دا رزقو رۆزیی باوکانی پێش هی

(١٧) بۆ زێدە مەعلومات سەیری کتێبی چێشتی مجێور بکەن، هەروەها تەماشای کتێبی (کنت ابنا للرئیس) دانراوی (لطیف یحی) بکەن سەیری نووسراوی حیزبەکانی کوردستان بکەن بەتایبەتی لەکاتی شەڕی ئیعلامی دا بڕوانن چۆن پەردە لەسەر یەکتری هەڵ دەدەنەوە!!!

منداڵەکانی خستووەوە دەفەرموێ: ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ هۆی ئەم پاش‌و پێش خستنە ئەوەیە: لەئایەتەکەی ئێرەدا خیطاب ئاراستەی دەوڵەمەندەکان کراوە ئەوانەی کچی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکرد لەترسی هەژاری، دەترسان ئەگەر کچەکانیان بهێڵنەوە هەژار ببن، بۆیە رزقی منداڵ پێش خراوە، لەسورەتی (الأنعام)دا خیطابەکە ئاراستەی باوکانی هەژار کراوە، ئەوانەی گچی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکرد چونکە بەفیعلی هەژار بوون، بۆیە رزقی خۆیانی پێش هی منداڵەکانیان خستوە.

ئەمجار لەجڵەوگیریکردن لەکوشتنی منداڵەوە دەگوێزێتەوە بۆ جڵەوگیریکردن لەداوێن پیسی، چونکە لەراستی دا زینا زیندەبەچاڵ کردنە بەجۆرێك لەجۆرەکانی زیندەبەچاڵ کردن، یان بڵێ: زیندەبەچاڵ کردنە لەچەند رویەکەوە، زیندە بەچاڵ کردنە لەم روەوە: ئەو دڵۆپە ئاوە: کە مادەی ژیانە دەڕژێتە غەیری شوێنی خۆیەوە، زوربەی کات دوا بەدوای کارەکە هەوڵ دەدرێ خۆ لەئاکامەکەی رزگار بکرێ، بەم جۆرە هەوڵ دەدرێ (جەنینەکە) پێش دروست بوونی یان دوا دروستبوونی پێش لەدایکبوونی یان دوا لەدایکبوونی لەناو ببرێ‌و خۆیانی لێ رزگار بکەن! خۆ ئەگەر لەبەر هۆیەك لەهۆیەکان ئەو زارۆکە لەناو نەبرێ ئەوە بەرەڵای ناو ژیانێکی کولەمەرگی‌و چەرمەسەری دەکرێ، زوربەی کات ئادەمیزادی پەیدا بوو لەزینا بەچاوێکی بێ رێزو سوکایەتییەوە سەیری دەکرێ، بەزۆڵ‌و ناکەس بەچە دەژمێردرێ، هەموو ساتێکی مردنەو هەموو رۆژێکی تەمەنی جۆرە کوشتنێکە! لەلایەکی ترەوە زینا کوشتنی کۆمەڵە، کوشتنی ئەو کۆمەڵگایەیە: کە زینای تێدا بڵا و دەبێتەوە، خوێنەکان تێکەڵ‌و پێکەڵ دەبن کەس نژادو رەچەڵەکی خۆی ناناسێتەوە، بتمانە لەناموس‌و وەچەو نەوەدا نامێنێ، کۆمەڵ دادەرزێنێ، هۆکاری پەیوەندییان لێك دەپچڕێنێ‌و مردنی کۆمەڵ بەدی دێنێ!

زینا کوشتنی کۆمەڵە لەم رووەوە: کە ئاسانکاری بۆ ئەنجامدانی کاری جینسی لەرێگەی ناشەرعییەوە وا دەکا ژیانی ژن و مێردایەتی شەرعی گرنگی پێ نەدرێ، بەشتێکی زیادەو ناپێویست بژمێردرێ، پێکەوەنانی خێزانی شەرعی پێویست نەبێ، ئەمە لەکاتێکدا خێزان باشترین لانەیە بۆ پێگەیاندنی منداڵی ساوای ئێستاو پیاوی دوا رۆژ! جا لەبەر ئەم پەیوەندییەی نێوان زیندەبەچاڵ کردنی منداڵو زیناکردن: کە هەردوکیان دەبنە هۆی لەناوبردنی ئادەمیزاد دوا بەدوای جڵەوگیریکردن لەزیندەبەچاڵ کردنی منداڵ، جڵەوگیریی لەزینا کردوو فەرموو: ﴿وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾ وریابن، ئاگاتان لەخۆبێ، بەهیچ شێوەیەك نزیك زینا مەبنەوە، خۆتان بپارێزن لەو شتانەی سەر دەکێشن بۆ زینا، هیچ کارێك مەکەن راتان کێشێ بۆ زینا کردن، بێگومان زینا کردەوەیەکی ناشیرین و تاوانێکی گەورەو رێگایەکی زۆر سامناك و دژوارە، روخێنەری خێزان و کۆمەڵە، دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ناموسی خەڵك، تێکەڵاوبوونی نژادو رەچەڵەکی لێ دەکەوێتەوە، دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مافی خەڵك، هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئاژاوەو پشێوی یە، نەخۆشی سامناك و کوشندەی لێ دەکەوێتەوە.

ئیبنو ئەبی دونیا لەحەبیبی کوڕی مالیکی طائی یەوە فەرموودەیەك بەمەرفووعی لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت دەکا، دەڵێ: فەرموویەتی: (مامن ذنب بعد الشرك أعظم عند الله من نطفة وضعها رجل في رحم لا يحل له) هیچ تاوانێك دوای هاوەڵدانان بۆ خودا لەوە گەورەتر نیە پیاوێك دڵۆپە ئاوی خۆی بخاتە رەحەمێك کە بۆی حەڵاڵ نیە.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکی دا کە ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوە، وانەیەکی زۆر دڵگیرو کاریگەری بەکوڕێکی گەنج فەرموو: تێی گەیاند: کە چۆن تۆ پێت ناخۆشە کەسانی دیکە زینا لەگەڵ دایکت یان خوشك و کچ و پورت بکەن، خەڵکی تریش پێی ناخۆشە تۆ زینا لەگەڵ دایك و خوشك و کچ و پوریان بکەی!

ئەمجار پاش ئەوەی بەو شێوە كاریگەرە تاوانی زینای بۆ رون كردەوە، دەستی پیرۆزی خستە سەرشانی كوڕە گەنجەكەو دوعای بۆ كردو فەرمووی: (اللهم اغفر ذنبه، وطهر قلبه، وأحصن فرجه) ئیتر دوعاكەی پێغەمبەر واگیرابوو لەوەدوا ئەم گەنجە بەهیچ جۆرێك روی لەو شتانە نەكردەوە!

بێگومان هەر گەلو ولاتێك زینای تێدا بلاوبێتەوە بەرەو روخانو تێكچوونی یاسای كۆمەلایەتی دەڕوا، خێزانی تێدا دەڕوخێ، كۆمەلگای تووشی نەخۆشی سامناك دەبێ، ئەخلاقو رەوشت تیاندا پێشێل دەكرێ، زوو یان درەنگ ئەو كۆمەلگایە بەرەو نەمان دەڕوا، چونكە لەكۆمەلگای ئاوادا ئەخلاقو رەشت قەلاچۆ دەكرێن، هەر گەلو نەتەوەیەكیش ئەخلاقی جوانو رەشتی بەرزی نەما، بەنەبوو حیسابە.

بۆیە قورئان جلەوگیری نەك لەخودی زینا بەلكوو لەنزیكبوونەوەی داخوازییەكانیشی دەكا، ئەمەش ئەوپەڕی جلەوگیریو خۆپاراستنە لەو تاوانە، چونكە نزیكبوونەوە لەداخوازییەكانی زینا دەبنە هۆی پەیدابوونی زەحمەتێكی زۆر لەسەر ئادەمیزادو زۆر زەحمەتە لەكاتی پەیدابوونی ئەو زەحمەتەدا خۆی پێ لەو تاوانە بپارێزرێ! بۆیە ئیسلام بەهەموو جۆرێك دەیەوێ هۆكارو داخوازییەكانی زینا بنبڕ بكا، ئەوەتا بۆ زەرورەت نەبێ رێگا نادا ژنو پیاو تێكەلاوبن، كۆبونەوەی ژنو پیاوی نامەحرەم قەدەغە دەكا. دەرخستنی شوێنی جوانو هەوەس ئاوەری لەئافرەتدا مەنع كردوە، ئەوانەی توانای ژنهێنانیان هەیە هەلیان دەنێ بۆ ژن مارە كردن، ئەوانەی توانای ئەو كارە پیرۆزەیان نیە، داوایان لێ دەكا بەرۆژوبنو بەهۆی رۆژووەوە هەوەسو ئارەزۆی خۆیان كەم بكەنەوە، هەولْ دەدا: ئەو كۆسپو لەمپەرانەی دەبنە رێگر لەبەردەم ژن هێناندا قەلاچۆیان بكا، یان كەمیان بكاتەوە، ئادەمیزاد هەلدەنێ زێدەڕەوی لەمارەیی دا نەكەن، پەلپی نابەجێ لەو كچو كوڕانە نەگرن كە دەیانەوێ لانەی ژنو مێردیی پێكەوەنێن. هەولْ دەدا ترسو بیمی هەژار

بوون بەهۆی ژنهێنانو منداڵ زۆر بوون برەوێنێتەوە، دەوڵەمەندو خاوەن سامانان هەڵدەنێ کە یارمەتی ئەوانە بدەن کە دەیانەوێ خێزان دروست بکەنو نامووسی خۆیان بپارێزن، لەهەمان کاتدا گەورەترین سزاو تۆڵەی داناوە لەسەر ئەوانەی تاوانی زینا ئەنجام دەدەن. هەروەها سزای توندی داناوە لەسەر ئەوانەی بەبێ بەڵگەی ئاشکرا بوختان بەئافرەتی موحصەنو داوێنپاك دەکەن.... بەکورتی هەموو جۆرە وەسیلەیەکی گونجاوی بەکار هێناوە بۆ پاراستنی خێزانو کۆمەڵگای ئیسلامی لەو نەخۆشییە سامناکە روخینەرە.

ئەو وڵاتو کۆمەڵگایانەی لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوادا زینایان لەناودا شتێکی ئاسایی یە، ئەوانە گرنگی بەتێکەڵاوبوونی نژادو رەچەڵەك نادەن، شتێك کە پێی دەگوترێ: نامووسو عیرض لای ئەوان نەماوە، ئەم بەها رەوشتییانە لای ئەوان نیە، ئەوان بەلایانەوە ئافرەت کاڵایەکەو بۆ لەزەت لێ وەرگرتنەو بەس! ئەمەش دیاردەیەکی ترسناکەو هەڵگێڕانەوەی سروشتەو پێچەوانەی فیطرەتی ئادەمیزادییە..

چونکە مەبەست لەئافرەت تەنها دامرکاندنەوەی شەهوەتو ئارەزۆ نیە، بەڵکوو لەئایینی ئیسلامدا مەبەست لەئافرەت ئەوەیە ببێتە هاوسەری پیاوو هاوکاری ژیانی، پێکەوە لانەی خێزان پێکەوەنێن، پێداویستی ژیان دابین بکەن، هەریەکەیان ئەرکی گونجاوی سەرشانی خۆی ئەنجام بدا، منداڵ بەدی بهێنن و لەو لانە سروشتی یەدا پەروەردەی بکەن، خیانەتی ژنو مێردایەتی لەیەکتری نەکەن، جا کە خێزانەکان بەم جۆرە پێك هاتن، هەڵبەتە ئەو کۆمەڵگایەی لەو خێزانە پاكو سروشتیانە پێك دێ کۆمەڵگایەکی خاوێنو پاقژ دەبێ. کۆمەڵگایەکی نموونەو پەسند دەبێ، کۆمەڵگایەك دەبێ تاكو خێزان تێیدا بەختەوەر دەبێ، خۆشی لەژیان دەبینن!!

ئەمجار دوابەدوای جڵەوگیریی کردن لەکوشتنی منداڵو لەزینا کردن، جڵەوگیری لەکوشتن دەکا بەگشتی؛ مەگەر کوشتنەکە رەوا بێ، دەفەرموێ: ﴿وَلا

تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ ئەی ئادەمیزادینـە! نەکـەن پڕکێشی کوشـتنی ئـەو نەفسانە بکەن؛ کـە خـودا کوشـتنەکەیانی یاسـاغ کـردوە، مەگـەر بەحـەقێکی شەرعی بێ. شەرع ڕێگای کوشتیان بدا، ئەویش لەسێ حاڵ دایە؛ کەسێك لـەئایین پاشگەز ببێتەوە، پیاو ژنی هێنابێ‌و زینا بکا یـان ئـافرەت شوی کردبـێ‌و زینـا بکـا. کەسـێك بەئەنقەسـت موسـوڵمانێکی بـێ تـاوان بکـوژێ، ئەمانـە شـەرع ڕێگـای داوە بکوژرێن. وەکوو لەفەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە بوخـاری‌و مـسلیم لـەئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتیان کـردوە فەرمویـەتی: (لایحل دم امـرئ یـشهد ان لا الـه الا الله وأن محمداً رسول الله الا باحدى ثلاث النفس بالنفس، والثيب الزاني، والتـارك لدينـه المفارق للجماعة).

هەڵبەتـە ئـایینی ئیـسلام ئـایینی ژیـان‌و ئاشـتی‌یـە، کوشـتنی ئـادەمیزاد لـەو ئایینەدا تاوانێکی گەورەیە دوا هاوەڵدانان بۆ خوداتاوان لەوە گەورە تر نیە، چونکە خودا خۆی ژیانی بەو ئادەمیزادە بەخشیوە، ئـەو جەسـتەو گیانـە شاکاری دەسـتی پەروەردگارە، بەبێ ئیزنی خودا بۆ کەس نیە ئەو گیانـە لەناوبـەرێ و ئـەو قەڵایـە بڕوخێنێ! هـەموو ئادەمیزادێـك خـوێن‌و گیـانی پـارێزراوە، نـابێ دەسـتی بـۆ درێـژ بکرێ مەگەر بەحەق.

لەسونەنی تیرمیذی‌و نەسائی دا لـەئیبنو عومـەرەوە فەرموودەیـەك ڕیوایـەت کراوە دەفەرموێ: (لزوال الدنيا عند الله أهون من قتل مسلم) وێرانبوونی دونیا لای خودا ئاسانترە لەکوشتنی موسوڵمانێکی بێ تاوان!

کوشـتنی بەناحـەق تـاوانێکی زۆر گـەورەو سـامناکە، چـونکە هـۆی ئاشـوب نانەوەیـە، دەسـتدرێژیکردنە، تێکـدانی ئاسایـیشی گـەل‌و وڵاتـە، لەگرێژنـەبردنی جەمسەری کۆمەڵایەتییە، هۆکاری قەڵاچۆکردنی ئادەمیزادە!

ئـەمجار پـاش ئـەوەی پـەروەردگار بەرسـتـەی (الا بـالحق) هەنـدێ حاڵـەتی کوشـتنی چـەرت کـرد، مـافی تۆڵەی‌دا بـەخوێنگرەوەکانی کـوژراوو حـەقی تۆڵـە کردنەوەی بۆ چەسپاندون، بـەڵام لـەژێر چاودێری دەوڵەتداو دەبـێ کوشـتنەوەکە تەنیاو تەنیا روبکاتە بکوژو بەس! فەرمووی: ﴿وَمَنْ قُتِـلَ مَظْلُومـاً فَقَـدْ جَعَلْنَـا لِوَلِيِّـهِ سُـلْطَاناً﴾ کەسـێك بـەبێ تـاوان بکـوژرێ بێگومـان دەسـەڵاتێکی بـەرفراوانمان داوە بەخوێنگرەکانی، دەتوانن تۆڵـە لەبکوژ وەربگرنـەوە، بکوژ بکوژنـەوە، یـان عـەفوی بکەن، یان خوێن وەربگرن، لەهەموو حاڵەکاندا دەبێ لەژێر چاودێری قاضی‌دا بن‌و نابێ سەربەخۆ ئەم تۆڵە وەربگرنـەوە، خۆ ئەگـەر کـوژراو بێکـەس بـوو میراتگـرو خـوێنگری نـەبوون، ئـەوە فـەرمانڕەوا دەبێتـە میراتگـرو خـوێنگری کـوژراو، تۆڵـە لەبکوژ دەستێنێ!

ئـەبو داودو نەسـائی لەئـەبو شـورەیحی خوزاعییـەوە ریوایـەت دەکـەن دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ رۆژی رزگـار کردنـی مەککە فەرموویـەتی: (مـن قتـل لـه بقتيـل بعـد مقالتي هذه، فأهله بين خيرتين: اما أن يأخذوا العقل —أي الدية- أو يقتلوا) کەسـێك بەناڕەوا یەکێکی لێ کوژرا دوای ئەم وتەیەی من، ئەوە میراتگرەکانی سەرپشکن: یان خوێن وەربگرن، یان بکوژ بکوژنەوە!

دەسەڵاتێکی بەرفراوانیان دراوەتێ؛ کەس ناتوانێ دەستیان بەر دەسـت بێنـێ، بەویستی خۆیان کام جۆرە تۆڵەیەیان بەلاوە پەسند بوو ئەوەیان هەڵدەبژێرن.

وەلێ ئەم دەسەڵاتە بەرفراوانـە:کـە دراوە بـەوەلی کـوژراو، باپەنـدە بەمـەرجی زێدەڕەوی نەکردن لەتۆڵەستاندنەوەکەدا، ﴿فَلا يُسْرِفْ فِـي الْقَتْـلِ﴾ نـابێ خـوێنگری کـوژراو زێـدەڕەوی لەکوشـتنەوەی بکـوژدا بکـا، بـەم جـۆرە وێـڕای کوشـتنەوەکەی ئەتکیـشی بکـا، یـان بـچێ غـەیری بکـوژ بکوژێتـەوە. وەکـوو لـەناو کۆمـەڵگا دواکەوتووەکانی پێش ئیسلام‌و ئەمڕۆش‌دا باوە، هەندێ بنەماڵەو هۆزو عەشـیرەت: کە روداوێکی ناوا رو دەدات دەچن وێڕای بکوژ کۆمـەڵێك لـەخزم‌و کـەس‌و کاریـشی

دەکوژنـەوە، یـان دەچـن پیاوماقوڵێـك لـەجیاتی کوژراوەکـەی خۆیـان دەکوژنـەوە، بەمەش سەرپێچی فەرمانی خودا دەکـەنو حیکمـەتی قیـصاص پوچـەڵ دەکەنـەوە، هەر بۆیەشە کوشتنەوەکە کاریگەر نابێ، چونکە زۆر جار بکوژ وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێو پیاوێکی ریش سپیو بێ تاوان دەبێتە قوچی قوربانی!!

بـا خـاوەن خـوێن (وەلێ کـوژراو) زێـدەڕەوی نـەکا لەپـەیڕەوکردنی ئـەو دەسـەڵاتەی پێـی دراوە ﴿إِنَّـهُ كَـانَ مَنـصُوراً﴾ بێگومـان کـەسو کـاری کـوژراو (وەلێ کـوژراو) لەلایـەن خـوداوە یارمەتیـدراوە، مـافی تۆڵـەی بـۆ چەسـپاندوە، لـەدونیاو قیامەتدا پاداشی باشی بۆ داناوە، تاوانەکانی دەسڕێتەوە، بکوژیش بـەئاگری دۆزەخ سزا دەدا.

ئایەتەکـە ئامـاژەی ئـەوەی تێدایـە کـە باشـتر وایـە بـۆ وەلی کـوژراو خـوێن وەربگرێ، یان بکوژ مەرەخەس بکا، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾البقـرة/١٧٨. یـان ﴿وَأَن تَعْفُـواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾البقرة/٢٣٧.

ئەمجار پاش ئەوەی سیباقی ئایەتەکە حورمەتی نـاموسو نەفسی ڕاگەیانـدو جڵەوگیریی لەدەسـتدرێژیکردنە سـەریانی ئاڕاسـتە کـردو مـافی خـوێنگرو کـەسو کـاری کـوژراوو سـزای بکـوژی ڕونکـردەوە، باسـی حورمـەتی مـاڵی هـەتیو دەکـاو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُـدَّهُ﴾ نزیـك مـاڵو سامانی هەتیو مەکەونەوە بەمەبەستی خـواردنی یـان فەوتانـدنی، ئاگاداری خۆیو مـاڵو سـامانەکەی بـن، تەصـەروف لـەماڵی هـەتیواندا مەکـەن مەگـەر بـەجۆرێك لەبەرژەوەندیی هەتیوەکان بێ، کاتێك تەصەروف لـەماڵی هـەتیودا بکـەن بەئاشـکرا بەرژەوەندی ئەوی تێدا بێ، بەم جۆرە بیخەنە مامەڵەوەو پارێزگاری بکەن گەشـەی پێ بکەن، تا هەتیوەکە پێ دەگاو عەقڵو هۆش پەیدا دەکاو ڕەسیدە دەبێو دەبێتـە پیاوو دەتوانێ ماڵو سامانی خۆی ڕەدام بێنێو سەروکاری بکا.

ئەگەر رەسیدەبوو بەلام بێ عەقڵو گێل بوو، ئەوە دەبێ لەژێر چاودێری سەرپەرشتیاردا بمێنێتەوە، نابێ ماڵو سامانی بخرێتەوە بەردەست!

ئایینی ئیسلام ئایینی مرۆڤایەتیو ئاشتیخوازیو هەمئاهەنگی یە. خوێنوناموسو ماڵی موسوڵمانو غەیری موسوڵمانی تێدا پارێزراوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (كل المسلم على المسلم حرام دمه وعرضه وماله)[1] وەلێ بۆ ماڵی هەتیو زیاتر جەختی لەسەر پاراستنی كردۆتەوە، تەنانەت جڵەوگیری لەوە كردوە كە لێی نزیك ببنەوە، مەگەر بۆ بەرژەوەندی ماڵی هەتیوەكە بێ! چونكە هەتیو توانای رەدام هێنانو سەروبەر كردنی ماڵی خۆی نیەو ناتوانێ پارێزگاری بكا، گەشەی پێ بكا. بۆیە كۆمەڵی موسوڵمانان بەرپرسن: كە چاودێری هەتیو بكەن، ماڵەكەی بۆ بپارێزن، بۆی بەخێو بكەن، بۆی بخەنە بازرگانیو مامەڵەوە گەشەی پێ بكەن!

خوێنەری هێژا! بڕوانە فەرمانو جڵەوگیرییەكان؛ ئەوانەی ئەركی تاكە كەسین فەرمانو جڵەگیرییەكان بەتاكی (مفرد) ئاڕاستە كراون. ئەو فەرمانو جڵەوگیرییانەی ئەركی جەماوەرین بەشێوەی كۆ ئاڕاستە كراون. بۆ نموونە دەربارەی ئیحسان لەگەڵ باوكو دایكدا، دەربارەی ماڵ بەخشین بە هەژارو خزمو كەسو كار، ئامۆژگاری بۆ رەچاوكردنی مامناوەندیی لەماڵ خەرج كردندا، پابەندبوون بەحەقو راستی یەوە، خۆپاراستن لەفیزو خۆبەزلزانین هەموو ئەمانە بەشێوەی موفرەد ئاراستە كراون، كەچی دەربارەی جڵەوگیری لەكوشتنی منداڵو زیندەبەچاڵ كردنیان، جڵەگیری لەزیناو داوێنپیسی، جڵەوگیری لەكوشتنو بڕینی ناوخۆی ئادەمیزادەكان، دەربارەی فەرمان بەپارێزگاری كردنی ماڵی هەتیوو گەشە پێكردنی، دەربارەی وەفا بەوادەو بەڵێن. جڵەوگیری لەتەرازوبازیو دزیو فزی

[1] بوخاریو موسلیمو مالیكو ئەبو داودو تیرمذی ریوایەتیان كردووە.

ئامێری پێوانو کێشاندا بەشێوەی کۆ ئاراستە کراون. چونکە پابەندبوون بەو فرمانو جڵەوگیرییانە ئەرکی سەرشانی تێکڕای کۆمەڵن، پەیڕەو کردنیان سودی گشتی تێدایەو پێشێل کردنیان زیانی گشتی تێدایە، بۆیە لێرەدا جڵەگیری لەنزیکبوونەوە لەماڵی هەتیوی بەشێوەی کۆ هێنا، تا تێمان بگەیەنێ: کە پارێزگاریکردنی هەتیوو ماڵی هەتیو ئەرکی سەرشانی کۆمەڵەو دەبێ هەموو کەس لەعاست خۆیەوە خۆی بەبەرپرس بزانێ، جا چونکە سەرپەرشتیکردنی ماڵی هەتیو پەیمانێکەو لەئەستۆی کۆمەڵدایەو دەبێ هەر کەسە لەئاست خۆیەوە پابەندی ئەم پەیمانە بێ بۆیە دوا بەدوای ئەوە فەرمووی: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً﴾ پابەندی وادەو بەڵێنی خۆتان بن، ئەو عەهدو پەیمانەی بەیەکتری دەدەن، ئەو سەوداو مامەڵانەی دایان دەبەستنو لەسەر خۆتانیان پێویست دەکەن وەکوو کڕینو فرۆشتنو ئیجارەو رەهن...هتد لێیان پاشگەز مەبنەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ﴾المائدة/١. چونکە عەهدو پەیمانو سەوداو مامەڵە شتێکی گرنگو بایەخ پێدراون، خودا لێیان دەپرسێتەوە: پرسیار لەخاوەنەکانیان دەکا، پاشگەزبووەکان سزا دەدا، سەرزەنشتو لۆمەیان دەکا، کەسێ وەفا بەعەهدو پەیمانی خۆی نەکا بەسەرپێچیکار دەژمێردرێ!

عەهدو پەیمان فەضیلەو میثاقە، سەوداو بڕیاردان لەسەر فرۆشتنو کڕینی شتێك پابەندبونو پەیوەست بوونە، بەردەوام بوون لەسەریان نیشانەی ئیستیقامەو بتمانەیە، نیشانەی پاكو خاوێنی دڵو دەرونو سروشتی ئەو کەسانەیە کە پابەندن پێیانەوە. هەڵوەشاندنەوەی عەهدو پەیمان خیانەتو دووڕویی یە، ژێوان بوونەوە لەسەوداو مامەڵە لەدەستدانی بتمانەو پێشل کردنی مافی خەڵکە، پێویستە جێ بەجێیان بکاو پێیانەوە پابەندبێ، کەسێك بێ وادەو بەڵێن بێ وەفا بەعەهدو پەیمانی خۆی نەکا، پابەندی بڕیارو سەوداو مامەڵەی

خۆی نەبێ خاوەنی قسەی خۆی نەبێ تاوانبارەو سەرپێچی فەرمانی خودای کردوە.

عەهدو پەیمان شتێکی عامەو هەموو پەیوەندییەکی نێوان ئادەمیزاد لەگەڵ خودادا یان لەگەڵ خۆیو خەڵکدا دەگرێتەوە.

عەقد بریتییە لەو سەوداو فۆتویانەی ئادەمیزاد لەسەرخۆی پێویست دەکا، وەکوو سوێندو نەزرو سەودای فرۆشتنو کڕینو ئیجارەو صولحو ژن مارەکردنو شوکردن...هتد، جا ئەم عەهدە عەهدی تاك بێ، عەهدی کۆمەڵ بێ، عەهدی حکوومەت بێ، عەهدی حاکم بێ، عەهدی مەحکووم بێ، پابەند بوون پێیەوە واجبە!!

بێگومان فەرمان بەپابەندبون بەعەهدو پەیمانو عوقود لەقورئانو فەرمودەی پێغەمبەردا بەجۆرەها شێوەو شێواز ئاراستە کراون و. جەخت کراوەتەوە لەسەر پابەندبون پێیانەوە. دەفەرموێ: ﴿وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ﴾البقرة/١٧٧. یان دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾المؤمنون/٨. یان دەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾البقرة/٢٧٥.

وەفا بەعەهدو عەقد یانی جێ بەجێ کردنی ناوەرۆکیانو پابەندبوون پێیانەوە بەشێوەیەکی شەرعیو پەسند!

ئەمجار لەفەرمان بەوەفاکردن بەوادەو بەڵێن: دەگوێزێتەوە بۆ فەرمانکردن بەرێکخستنی ئامێری پێوانەو کێشانەو دزیو فزی نەکردن تێیان دا، دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ ئەگەر شتتان بەکەسانی دیکە فرۆشت بەتەواوی بۆیان کێشانەو پێوانە بکەن، لێیان کەم مەکەنەوە، ئامێری پێوانەو کێشانە رێكو پێك بکەن، کەمو کوڕییان تێدا نەبێ، مافی خۆیان بەتێرو تەسەلی بدەنێ، ئەگەر بۆخۆتان دەکێشا یان دەپێوا مەهێڵن حەقی کەسانی دیکەتان

بەلادا بێ، ئەگەر لەحەقی خۆتان کەم بکەنەوە قەیناکا، بەتەرازووی راستو عەدل شت کێشانە بکەن، دزیو فزی تێدا نەبێ، هەموو خەڵك پێویستی بەمامەڵەو شت گۆڕینەوەو کڕینو فرۆشتن هەیە، تەرازوبازی ستەم کردنە لەکۆمەڵو تاوانێکی گەورەو بەفتارەدەرە، خۆتانی لێ بپارێزن!

﴿ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ وەفا کردن بەعەهدو پەیمانو بەردەوام بوونتان لەسەرپابەندبوون بەوادەو بەڵێنو رێکخستنی ئامێری پێوانەو کیشانە زۆر باشە بۆ ئێوە لەدونیاو قیامەتدا سەرەنجامی باشی دەبێ بۆتان؛ لەدونیادا رەبێنی مامەڵەتان زیاتر دەبێ، ناوی باشەو چاکەتان بەناو خەڵكدا بلاودەبێتەوە، لەقیامەتیشدا شیاوی پاداشی باشن.

لەقورئانی پیرۆزدا زۆر ئایەت لەم بارەوە هەن؛ وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾الرحمن/۹. یان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾هود/۸۵. یان ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾المطففين/۱-۳.

بێگومان وەفا بەعەهدو پابەندبوون بەبڕیارو بەڵێنو رێکخستنی تەرازووو حوقەو کێلۆو مەترو قسناغو مەنو دۆلکەو هەموو ئامێرێکی پێوانەو کێشانە دابو نەرێتێکی خوداپەسندو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووی بەرزو پیرۆزە، بناغەیەکی توندو تۆڵی پێکهێنانی کۆمەڵگای بەختەوەرو هاریکارو هەمئاهەنگە. هۆکاری بلاوبوونەوەی بتمانە بەیەك کردنو ئارامی گەلو کۆمەڵە، نیشانەی گەشە کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە. زۆرجار کابرایەکی هەژار بەهۆی دەستپاکیو مامەڵە دروستی یەوە دونیا روی تێ کردوەو بووەتە خاوەنی سەروەتو سامانێکی زۆرو لێی حەساوەتەوە.

﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ ئەی ئادەمیزاد! شوێن شتێك مەکەوە: کە زانیاریت دەربارەی نیە، بەهەوانتەو بەبێ زانیاری راست حوکم مەدە، لەخۆتەوە مەڵێ ئەوە وایەو ئەوە وا نیە، بەبێ بەڵگە بڕیار مەدە!

ئایەتەکە جڵەگیری لەکافرەکان دەکا شوێن بیرو باوەڕی فاسید نەکەون، لەبواری ئیلاهییاتو نبوواتدا نەبنە لاسایی کەرەوەو شوێن هەواو هەوەس نەکەون! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ﴾النجم/۲۳.

هەروەها ئایەتەکە جڵەوگیری لەشایەتیدانی بەدرۆو بوختانکردن بەژنو پیاوی داوێنپاكو درۆ هەڵبەستنو تانەو تەشەردان لەموسوڵمانانو هەڵگێڕانەوەی حەقائیقی عیلمیو هەواڵی چەسپاو...هتد دەگرێتەوە، رەوا نیەو نابێ ئادەمیزاد لەخۆیەوە شت بڵێ: یان کار بکا بەرێبازێك کە زانیاری دەربارەی نیە، یان ذەمی کەسێك بکا؛ بەنەزانیو شتێکی پاڵ بدا کە تێیدا نەبێ!

زۆر بەداخەوە بەهۆی لاوازبوونی ئیمانو روخانی رەوشتەوە ئەم رەوشتە ناشیرینەی کە ئاماژەمان پێ کرد بەشێوەیەکی بەرفراوان لەناو موسوڵماناندا تەشەنەی کردوە، وای لێ هاتووە رەمڵ هاویشتنو قسە هەڵبەستنو بوختانکردن دیاردەیەکی بڵاوو بەرچاوە لەناو موسوڵماناندا، کابرا بەئارەزۆی خۆی درۆ هەڵدەبەستێو بڵاویان دەکاتەوە، ئەمجار کەسانی دیکە دێن شییان دەکەنەوە، بەڵگەو دەلیلیان بۆ دەهێننەوە، تا وای لێ دێ راستی هون دەبێو ئاسەواری نامێنێ! بۆیە قورئانی پیرۆز لەو دیاردە ناشیرینە دەمانترسێنێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً﴾ بێگومان گوێچکەو چاوو دڵ دەربارەی هەموو ئەمانە پرسیار لەخاوەنەکانیان دەکرێ: لەچیدا بەکاری هێناون؟ چۆن بەکاری هێناون؟ چونکە چاوو گوێچکە هۆکاری زانیاری حیسسیو تاقیکردنەوەن،

ئەم جۆرە زانیاریانە لەرێگەی ئەوانەوە پەیدا دەبن، زانیاری‌یە عەقڵییەکانیش بەهۆی دڵەوە دەستەبەر دەبن.

جا کەوابێ ئەگەر ئادەمیزاد گوێی لەشتێکی حەرام گرت، یان سەیری شتێکی حەرامی کرد، یان دڵی خۆی خەریك کرد بەزانیاری حەرامو شتی پڕو پووچ، ئەوە کابرا بەرپرسیارەو تاوانی کردوە، چونکە ئەو ئامێرانەی لەشتی حەرامدا بەکارهێناون، کە دەبوایە لەخواپەرستی‌و شتی بەسوودا بەکاریان بێنێ.

ئیبنو عەبباس لەمانای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: هەرچی نەیبینی و نەیبیسی، یان لێ دڵنیانەبێ، شایەدی لێ مەدە.

قەتادە دەڵێ: ئەگەر شتێکت نەبیستبێ مەڵێ بیستومە، شتێکت نەدیبێ مەڵێ دیومە، شتێکت نەزانی مەڵێ دەیزانم.

هەندێ جڵەوگیری ئایەتەکە ڕو دەکاتە ئەوە کابرا لەزانیاری‌یەوە قسە نەکا، بەڵکوو لەگومانو وەهمەوە بڵێ ئەوە وایەو ئەوە وا نیە، واتە: شوێن گومان دەکەون وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾الحجرات/١٢. پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەیەکی دا کە ئیمامی بوخاری لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتی کردوە فەرمویەتی: (اياكم والظن، فان الظن اكذب الحديث) خۆتان لەگومان بپارێزن چونکە درۆترین قسە ئەوەیە بڵێی: وا پێدەچێ، گومانم وایە.

شەکەلی کوڕی حومەید دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دوعایەکم پێ بفەرموو: بۆ خۆپاراستن لەشەڕ بیخوێنم، ئەویش دەستی گرتمو فەرمووی: بڵێ: (أعوذ بك من شرّ سمعي وشرّ بصري، وشرّ قلبي، وشرّ منيّ) خودایە! پەنادەگرم لەشەڕو خراپەی بیستنم لەشەڕی دیتنم، لەشەڕی گومانی دڵم، لەشەڕی هەواو ئارەزۆی شەهوەتبازیم.

﴿وَلا تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحاً﴾ بەفیزو خۆبەزلزانینەوە بەسەر زەویدا هاتو چۆ مەکە، چونکە تۆ بۆخۆت دروستکراوێکی زەبونو لاوازی، چەندێك بەخۆت بنازیو خۆت بەبەهێز بزانی هێشتا دروستکراوی لەتۆ بەهێزترو گەورەتر زۆرنو تۆ لەچاویاندا هەر هیچ نی، بڕوانە لەژێر قاچتدا زەوی هەیە بەو هەموو پانو پۆڕیەوە، سەیری ئەم لاو ئەولای خۆت بکە چەند کێوی بڵندو زەبەللاح دەبینی ﴿إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً﴾ ئەتۆ چەندێك زلو بەهێزبی ناتوانی زەوی شەق بکەی، بەئەندازەی کێوەکانیش بەرزو بڵندو سەرکەش نی! دەی کەوابێ ئەو تەکەببورو خۆبەزلزانینەت لەچی یە؟ بۆ وەندە بەخۆت دەنازیو لەخۆت ڕازی؟ چەندێك خۆت بەفۆزو ئازاو زیرەكو هەڵکەوتوو بزانی، زۆر کەس لەوانەی ئێستا لەژێر خاکدان لەو ڕەوشتانەدا لەتۆ لەپێشتر بونو شکۆمەندتر بوون. کاتێکیان بەخۆ زانیوە سلاربوونەوەو چوونە توونی نەمانەوە، هاکا ڕۆژێکیش مەرگ یەخەی پێ گرتیو خوستەی لێ بڕی!!!

﴿كُلُّ ذَلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِنْدَ رَبِّكَ مَكْرُوهاً﴾ هەموو ئەو ڕەوشتانەی بۆمان شی کردییەوە بەفرمانو بەجڵەوگیری: کە بیستو پێنج ڕەوشتن ئەوەی جڵەوگیریمان لێ کردوە ڕەوشتی ناشیرینو ناپەسندنو خراپییەکەیان لای خوایەو ناخۆشیو دەوێنو هەرکەسێ بیانکا سزای دەداو جێگای نارەزامەندی خودانوئێوەش بەهەموو جۆرێك خۆتانیان لێ بپارێزنو توخنیان مەکەون.

﴿ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ﴾ ئەوەی فەرمانمان پێ کردی لەڕەوشتی ناشیرین ئەوانە هەموویان بەشێکن لەو نیگایەی بۆمان ناردووی ئەیموحەممەد! بۆ ئەوەی بەئادەمیزادانی ڕابگەیەنیو بۆیان شی بکەیەوەو فێریان بکەی!

﴿وَلا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَتُلْقَى فِي جَهَنَّمَ مَلُوماً مَدْحُوراً﴾ خودایەکی تر بڕیارمەدەو مەیکە بەهاوەڵی خودا، کەس مەبەرە هاوشانی خودای تاكو تەنیا،

ئەگەر وا بکەی‌و هاوەڵ بۆ خودا دابنێی، ئەوە سزای سەخت دەدرێی‌و دەخرێیە ناو دۆزەخەوە، سەرزەنشت دەکرێی‌و لەرەحمەتی خودا دوور دەخرێیەوە، لەهەموو خێرو خۆشی یەك بێ بەش دەبی!

## تێبینی :

لەئایەتی ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ: کە دروستە حوکم بە(قییافە) بکرێ چونکە هەر شتێك ئادەمیزاد زانیاری پێ هەبێ، یان گومانی غالبی هەبێ دروستە حوکم بەو زانیارییە بکا. هەروەها دروستە حوکم بەقورعەش بکرێ چونکە ئەویش بەشێکە لەخەرساندنو تەخمین! سەرناس (قائف) منداڵ وەپاڵ باوکی دەدا بەهۆی لێکچونی نێوانیانەوە، وەکوو شەرعزان قیاسی فەرع دەکا بۆ سەر ئەصڵ بەهۆی لێکچونی نێوانیان‌و هەبوونی عیلەتی حوکم لەهەردوکیاندا..

پێغەمبەر ﷺ کارکردنی بەزانیاری قیافەو سەرناسی لەبواری چەسپاندنی نژادی ئوسامە (کە رەش پێست بوو) بۆ زەیدی کوڕی حاریثە (کە سپی پێست بوو) بەرەوا داناوە.

لەصەحیحی موسلیمدا فەرموودەیەك لەخاتو عائیشەوە ریوایەت دەکرێ دەفەرموێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆ لای من، زۆر کەیفخۆش بوو، دەم‌و چاوی گەشابوەوە فەرمووی: (الم تر ان مجززا) مەبەستی کابرایەکی قائیف بوو. سەیری زەیدی کوڕی حاریثەو ئوسامەی کوڕی کرد هەردوکیان جەستەیان داپۆشرابوو تەنها قاچیان دیار بوو. وتی: ئەم قاچانە لێك دەکەن. جەماوەری زانایانیش ئەم خۆشحاڵییەی پێغەمبەریان بەوتەی کابرای سەرناس کردۆتە بەڵگە لەسەر راستی بڕیاری قائیف.

## سەرزەنشتی کردنو دەمکوتانەوەی ئەوانەی منداڵو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن

﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئاماژەی بەسەرپێچی ئەوانە کرد: کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا سەرزەنشتی ئەوانە دەکا: کە منداڵ وەپاڵ خودا دەدەنو دەڵێن: خودا کچی هەن، کوڕو کچ بۆخۆیان دادەنێن، بەڵام بۆ خودا تەنیا کچ بەرەوا دەزانن، ئەمە لەکاتێکدا دەزانن خودا کەمالی موطلەقی هەیە، ئەوپەڕی شکۆمەندیو جەلالی هەیە.

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە لەقورئاندا چەند پەندو مەثەلی بۆ کافرەکان هێناوەتەوە بۆ ئەوە پێیان پەندئامێز بن‌و بەخۆیاندا بچنەوە، کەچی ئەم پەندو مەثەلانە زیاتر شێلگیری کردن‌و هێندەی تر تاربون‌و لەرێبازی حەق لایان دا.

دەفەرموێ: ﴿أَفَأَصْفَاكُمْ رَبُّكُمْ بِالْبَنِينَ وَاتَّخَذَ مِنَ الْمَلائِكَةِ إِنَاثاً ؟﴾ پرسیارەکە پرسیارێکی ئینکار ئامێزەو بۆ سەرزەنشتکردنی ئەو کافرانەیە: کە دەڵێن: فریشتەکان رەگەزی مێینەن‌و کچی خودان سەرزەنشتی ئەوانە دەکا: کە هاوەڵ‌و منداڵ بۆ خودا دادەنێن، ئەوان بۆخۆیان بەچاوی سووك دەڕواننە کچ‌و بەپلەی نزمتر لەپلەی کوڕ حسێبی دەکەن، بۆخۆیان لەترسی هەژاری‌و عەیبداری زیندەبەچاڵیان دەکەن، کەچی بێ شەرمانە وەپاڵ خودایان دەدەن. جا کە خودا بۆخۆی کوڕو کچ دەبەخشێ بەئادەمیزاد ئایا دەگونجێ‌و عەقڵ پەسندی دەکا کوڕ بدا بەئێوەو بۆ خۆی کچ هەڵبژێرێ؟ ئایا دەگونجێ خودا رێزی ئێوە بگرێ‌و هەر نێرینە ببەخشێ پێتان‌و بۆ خۆیشی کچ دابنێ؟

ئەمە جۆرێکە لەبەدەمەوەدان‌و موجاراتکردنی کافرەکان، بۆ ئەوەی بێ بناغەیی‌و پووچی باوەڕەکەیان دەربکەوێ، ئەگینا قەضیەکە لە بناغەوە ناپەسندەو نامەعقوولەو هەرگیز خودا هاوەڵ‌و منداڵی نیەو نەبوەو نای بێ! ﴿إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلاً عَظِيماً﴾ ئێوە بەو هەڵوێستەتان بەو قسەیەتان: کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن‌و فریشتە بەکچی خودا دەزانن. قسەیەکی گەورە دەپڕمێنن! تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدەن، خۆتان شیاوی سزایەکی سەخت‌و دژوار دەکەن، چون‌و بەچ عەقڵێك کوڕ بۆ خۆتان دادەنین‌و کچ وەپاڵ خودا دەدەن؟ بەراستی دابەشکردنێکی ستەمکارانەیە... وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الأُنثَى ؟ تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى﴾النجم/٢١-٢٢. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَداً، لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئاً إِدّاً، تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً، أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً، وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَداً، إِن

كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً، لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدّاً، وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْداً﴾ مريم/٨٨-٩٥.

بەڵێ ئێوە بەو بوختانە گەورەتان: کە کچ پاڵ خودا دەدەن قسەیەکی زۆر گەورە دەکەن، تا بڵێی ناشیرین‌و نەگونجاوو بێ بناغەو وێ نەچووە. هیچ تەصەورو تەصدیقێك بیرۆکەی ئاوا ناهێنێتە کایەوە، قسەیەکی هێندە گەورەو بوختانێکی ئەوەندە زەبەللاحە کەس ناوێرێ ئەنجامی بدا ئەدی ئێوە بەچ عەقڵێکەوە، بەچ بیرو بۆچونێك ئەو قسە گەورە دەدرکێنن؟ هەرگیز نەدەبوو ئێوە قسەی ئاوا بێ بناغە بکەن، نەدەبوو روتان بێ شتی وا بڵێن.

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِيَذَّكَّرُوا وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلاَّ نُفُوراً﴾ بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا هەموو ئامۆژگاری‌و بەڵگەو دەلیلێکمان رون کردۆتەوە، پەندو مەثەلمان بۆ ئادەمیزادەکان هێناونەوە، ترساندومانن هەڕەشەمان لێ کردون، هەڵمان ناون بۆ چاکەکردن‌و ئیمانهێنان‌و خوداپەرستی، چیرۆکمان بۆ گێڕاونەوە، نموونەی زۆرمان لەمێژوو بۆ هێناونەوە بۆ ئەوەی پەندئامێز ببن، واز لەبتپەرستی‌و بوختانکردن‌و ستەم‌و سەرپێچیکردن بهێنن، کەچی ئەو هەموو بیرخستنەوەو پەندو ئامۆژگارییانە کاریان تێ ناکەن زیاتر گومڕا دەبن‌و لەحەق دوور دەکەونەوەو هەڵدەتیزێنن! بێگومان قورئان مەنهەجی ئایینی یەکتاپەرستییەو بۆ چەسپاندن‌و رونکردنەوەی ئەو مەبەستە پیرۆزە زۆر رێبازی جیا جیای رەچاو کردون، جۆرەها ئوسلوبی بەکارهێناون، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان وا لێ بکا بیر بکەنەوە، بەخۆیاندا بچنەوە، چونکە یەکتاپەرستی شتێکی فیطرییەو لەسروشتی ئادەمیزادایە، هەر پێویستی بەبیرکردنەوەیە، بەتەنها گەڕانەوەی بۆ یاسای سروشت‌و مەنطیقی سروشت، بۆ بیر کردنەوە لەئایەتە کەونی یەکان‌و نیشانەکانیان، بڕوای یەکتاپەرستی پەیدا دەبێ‌و پەردە لەسەر بڕوا فیطرییەکە هەڵدەدرێتەوەو پاك‌و خاوێن‌و بێ گەردنمایان دەبێ، کەچی ئەم نەفامانە بەپێچەوانەوەن، هەتا قورئانیان

بۆ بخوێندرێتەوە، تا زیاتر ئەو کەلامە پیرۆزە ببیسن زیاتر پشت هەڵدەکەن، پتر گومڕا دەبن، یان بڵێین: خۆیان گومڕا دەکەن‌و لەبەر قورئان هەڵدێن‌و گوێچکەی دڵیان دادەخەن لەترسی ئەوەی نەوەکوو دەستکەوتە ماددییەکانیان لەکیس بچن، نەوەکوو بیرو باوەڕی پڕو پووچیان بنبڕ بکرێ!!

ئەمجار جارێکی تر بۆ موجاراتکردنی موشریکەکان‌و بەدەمەوەدانیان دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذاً لابْتَغَوْا إِلَى ذِي الْعَرْشِ سَبِيلاً﴾ ئەی موحەممەد! بەو موشریکانە بڵێ: کە لەتەك خودادا خودای تر دادەنێن، شتی تر بەخودا دەزانن، پێیان بڵێ: ئەگەر ئەو بیرو باوەڕەی ئێوە ڕاست بوایە، ئەوەی ئێوە دەیڵێن گونجاو بوایە ئەگەر لەتەك خودادا خودای تر هەبونایە (وەکوو ئێوە دەڵێن) دڵنیابن ئەو بەخودا دانراوانەی ئێوەش بەندایەتییان بۆ خودای خاوەن عەرش دەکرد، هەوڵیان دەدا بەبەندایەتیکردن‌و پەرستش، خۆی لێ نزیك بکەنەوە، هەمیشە بەندایەتی خۆیان ڕادەگەیاندو گەردنکەچی دەبوون.

وشەی (لو) وەکوو نەحوی دەڵێن: (حرف امتناع لامتناع) کەوابوو هەر لەسەرەتاوە قەضیەکە پاساغەو نەبووەو نابێ ببێ، هیچ شتێك نیە هاوەڵی خودا بێ، خودا بێ هاوەڵ‌و بێ منداڵ‌و بێ وێنەو نەظیرە. ئەو شتانەی موشریکەکان بەخودایان دەزانن دروستکراوێکی خودان، جا ئەو شتە ئەستێرە بێ، یان ئادەمیزاد بێ، یان ئاژەڵ بێ، گیانلەبەر بێ یان بێ گیان بی، هەموویان بەگوێرەی یاسای کەون بەندایەتی خودا دەکەن‌و ملکەچی ویست‌و ئیرادەی زاتی پەروەردگارن!

﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّاً كَبِيراً﴾ پاك‌و مونەززەهی بۆ خودا لەو شتانەی کە شیاوی زات‌و صیفاتی ئەو نیە، بەرزی‌و پیرۆزیی بۆ زاتی پاکی لەوەی ئەو موشریکانە وەپاڵی دەدەن، پەروەردگار زۆر لەوە بەرزو پیرۆزترە: کە هاوەڵ‌و منداڵی هەبێ، ئەو ئاتاجی بەهاوەڵ‌و منداڵ نیە، خودایەکی تاك‌و تەنهاو بێ ئاتاجە لەکەس نەبووەو کەسی لێ نەبووەو کەس هاوشانی نیە.

بەدوو وشەی (علواً كبيراً) ئاماژە بۆ هەبوونی جوداوازییەكی زۆر بەرفراوان لەنێوان زات‌و صیفاتی خوداو نێوان ومپاڵدانی هاوشان‌و منداڵ‌و شەریك بۆ خودا، جوداوازییەكە هێندە بەرفراوان‌و ئاشكراو نمایانە، تەصەوور ناكرێ، دەبێ جوداوازی نێوان خودایەكی ئەزەلی بێ سەرەتا لەگەڵ دروستكراوێكی تازە پەیدابوو چۆن تەصەوور بكرێ؟! بۆیە لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً، أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً﴾مريم/ ٩٠-٩١.

ئەمجار پەروەردگار گەورەیی خۆی‌و شكۆمەندیی‌و بەرفراوانی دەسەڵاتی رون دەكاتەوە دەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ﴾ حەوت ئاسمانەكان‌و زەوی بەهەموو حەشامەتێكیانەوەو ئەوەی تێیاندایە لەدروستكراوان هەموویان تێكڕاو بەبەردەوامی شایەتی تاك‌و تەنهایی بۆ خودا دەدەن، گەواهیدەری ربوبییەت‌و ئولوهییەتی زاتی پەروەردگارن، هەموویان خەریكی تەقدیس‌و تەنزیهی بەدیهێنەری خۆیانن. هەموو گەردیلەیەكی ئەم بوونەوەرە گەورەیە خەریكی تەسبیحاتی خودایە، هەموو بوونەوەر بەیەكدەم شایەتی دەدا: كە خودا تاك‌و تەنهاو بێ وینەو بێ هاوەڵ‌و منداڵە.

هەموو بەردو دارێك، هەموو دەنكی تۆم‌و پەلكە گەڵایەك هەموو گوڵ‌و بەروبوم‌و میوەیەك، هەموو خشۆك‌و باڵندەو پێڕۆیەك، هەموو گیانلەبەرێكی ئەم بوونەوەرە لەوشكانی بێ، یان لەناو ئاودا بێ یان لەهەوادا بێ، دانیشتوانی ئاسمانەكانیشیان لەگەڵدا بێ، هەموویان سەری بەندایەتییان داخستووەو تەسبیحاتی زاتی پاكی دەكەن هەموو شتێكی ئەم بوونەوەرە نیشانەی تاك‌و تەنهایی خودای بێ هاوتایە.

ئەمجار جەخت لەسەر رستەی پێشوو دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ هەرچی شت هەیە لەبوونەوەردا هەموویان تەسبیحاتی خودا دەكەن، جا یا بەزوبانی حاڵ یان بەزوبانی مەقال!!

﴿وَلَكِـنْ لا تَفْقَهُـونَ تَـسْبِيحَهُمْ﴾ وەلێ ئێـوە لەتەسـبیحاتەکەیان حـاڵی نـابن، نازانن: شتە جۆراو جۆرەکانی بوونـەوەر چۆن تەسـبیحاتی خـودا دەکـەن! چونکە تەسبیحاتکردنەکەیان بەزوبانێکە ئێوە لێی حاڵی نابن!

لەصـەحیحی بوخاریـدا فەرمـوودەیـەك هەیـە لـەئیبنو مەسـعودەوە ریوایـەت کراوە دەفەرموێ: (كنا نسمع تسبيح الطعام وهو يؤكل).

قەتادە دەڵێ: هەموو شتێك گیانی تێدایەو تەسبیحاتی خودا دەکا.

﴿إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُـوراً﴾ بێگومـان پـەروەردگار زۆر بـەحیلمو لەسـەرەخۆیە، پەلە لەسزادانی ئەوانە ناکا کە لێی یاخی دەبن، هاوەڵی بۆ دادەنـێن. مۆڵـەتیان دەدا بـۆ ئـەوەی لەتاوانـەکانیان پەشـیمان ببنـەوە، تۆبـە بکـەن، بـەخۆیاندا بـچنەوە! لێخۆشبوو لێبوردوە بۆ ئەوانەی تۆبە دەکەنو دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا!

ئیمـامی ئەحمـەدو ئیبنـو مـەردەویهی لـەئیبنو عومـەرەوە ریوایـەت دەکـەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان نوحاً عليـه الـسلام لـما حـضرته الوفـاة قـال لابنيه: آمركما بسبحان الله وبحمده فانها صلاة كل شيء، وبها يرزق كل شيء).

زانایانی تەفسیر راجیاییـان هەیـە دەربـارەی عومومییـەتی ئایـەتی ﴿وَإِن مِّـن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ﴾ ئاخۆ ئایەتەکە تەخصیص روی تێ دەکـا یـان نـا؟ کۆمـەڵێك دەڵـێن: عومومییـەتی ئایەتەکـە باقییـەو مەبەسـت تەسـبیحاتی مەجازییـە، واتـە: هەموو دروستکراوێك نیشانەی ئەوەیە: کە خودا تاكو تەنهایە. وەکوو ئەبو نوئاس دەڵێ: (وفي كل شيء له آية تدل على أنه واحد).

کۆمەڵێکی تـر دەفـەرموون: تەسـبیحاتکردنەکە حـەقیقی یـەو هـەموو شـتێك بەزوبانی خۆی تەسبیحاتی خودا دەکا بەڵام ئادەمیزاد نایبیسێ!

کۆمەڵێکی تـر دەفەرمون: (من شـيء) لەئایەتەکـەدا عامـەو مەبەسـت خاصـە، واتە: شتی زیندوو گەشەدار دەگرێتەوە شتی بێ گیـانو بـێ نـەشو نما ناگرێتـەوە.

هـەر بۆیەشـە عیکریمـە دەفـەرموێ: داری تـەڕ تەسـبیحات دەکـاو داری وشـك تەسـبیحات ناکـا. لەفـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺدا پـشتگیری بـۆ ئـەم رایـە دەسـت دەکەوێ: ئەوەتا: لەئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕیو فەرمووی: (انهما ليعذبان وما يعذبان في كبير اما أحدهما فكان يمشي بالنميمة، واما الآخر فكان لايستبرئ من البول) ئیتر پێغەمبـەر ﷺ لقـەدارێکی تـەڕی هێنـاو کـردی بـەدو لەتـەوەو هـەر لەتـەی لەسـەر گـۆڕی یـەکێکیان چـەقاند فـەرموی: (لعلـه يخفـف عنهمـا مـالم ييبـسا)[1] فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ کـە دەفەرموێ: (مالم ييبسا) ئاماژەیە بۆ ئەوە ئەو دو لقەدارە هەتا تـەڕاییان تێـدابێ تەسبیحات دەکەن، هەر کاتێ وشك بوون دەبنە جەمادو لەتەسبیحاتکردن دەکەون.

زانایانی ئیسلام لەژێر رۆشنایی ئەم فەرمودەدا هاتوونـە سـەر ئـەم رایـە: کـە روانـدنی درەخـت لەسـەر گۆڕسـتانو خوێنـدنی قورئـان لەسـەر گـۆڕ سـوودی بـۆ مردوەکان هەیە. چونکە ئەگەر بەلقـەدارێکی تـەڕ سـزا لەسـەر مـردو سووك ببـێ، چـۆن دەبـێ بەخوێنـدنی قورئـان لەلایـەن موسـوڵمانێکەوە سـزای مـردووان سـوك نەبێ؟!

هەر لەم روانگەشەوەیە: کە زانایان دەفەرموون: هەر خێـرو خێراتێـك بکـرێ بۆ مـردو پێـی دەگا. زانایـانی هـەر چوار مـەذهـەب ئـەم رایـەیان بـەلاوە پەسـندە.

[1] بەشێکە لەو حەدیثەی بوخاری لەباسی دەسنوێژدا ژمارە (٢١٦) (باب/٥٥) (من كبائر ان لايستر من بوله) ریوایەتی کردووە. موسلیم لەباسی (الطهارة)دا ژمارە (٢٩٢) (باب/٣٤) (الدليل على نجاسة البول ووجوب الإستبراء منه) ریوایەتی کردووە.

## پاراستنی پێغەمبەر ﷺ لەئەزیەتی موشریکەکانی مەککە لەکاتی خوێندنی قورئاندا

﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٤٨﴾ ﴾

دوای ئەوەی دەربارەی مەسائیلی ئیلاهییات دواو بیرو بۆچونی موشریکەکانی رەتکردەوەو پەندو ئەمثالی هێنانەوە بۆ بەرپەرچدانەوەیان، دێتە سەرباسی پێغەمبەرایەتیو راستی پێغەمبەریەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنێو گاڵتە بەعەقڵی ئەوانە دەکا کە نایانەوێ لەقورئان حاڵی بنو گوێی خۆیانی لێ کەڕ دەکەنو پابەندی فەرمانو حەڵەوگیرییەکانی نابنو گاڵتەی پێ دەکەن، ئەزیەتی پێغەمبەر ﷺ دەدەن، بوختانی بۆ هەڵدەبەستن؛ دەڵێن: کاهینە، جادوبازە، شێتە، شاعیرە، خۆی قورئانی داناوەو بەناوی خوداوە بڵاوی دەکاتەوە.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ....﴾ ئیبنولمونذیر لەئیبنو شەهابی زوهرییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: هەر کاتێ پێغەمبەر ﷺ قورئانی بۆ موشریکەکانی مەککە بخوێندایەوەو بانگەوازی بکردنایە گاڵتەیان پێ دەهاتو دەیانگوت: ﴿قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ﴾فصلت/٥. پەروەردگار ئایەتی ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا....الآية﴾ی نازڵ کرد.

ریش سپیو گەورەکانی قورەیش گوێیان لەقورئانخوێندنی پێغەمبەر ﷺ دەگرت: بەڵام بەهەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا کاریان تێنەکا، دڵیان پێی دانەخورپێ، بەربەرەکانی فیترەتو سروشتی خۆیان دەکردو خۆیان لێ گێل دەکرد، پەروەردگار قاری لێ گرتنو دڵی مۆر کردنو گوێچەکەیانی هاخنیو سودیان لەو نورو روناکیو رەحمەتە وەرنەگرتو بەرێنمونییەکانی بەهرەمەند نەبوون! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ حِجَاباً مَسْتُوراً﴾ ئەی پێغەمبەر! کاتێك تۆ قورئان بۆ موشریکەکان دەخوێنییەوە، ئێمە لەنێوان تۆو ئەو کافرە بێ باوەڕانەدا پەردەیەکی داپۆشەر دەگێڕین؛ پەردەیەك: کە بەچاو نابینرێ.

واتە: بەهۆی کردەوەی ناپەسندی خۆیان کارێکی وایان لەگەڵ دەکەین تۆ نەناسن، هەست بەو بەڵگەو نیشانانە نەکەن: کە دەبنە شایەدی راستی پێغەمبەرایەتی تۆ! لەمانای قورئان ورد نابنەوە، ئەگەر لێشی ورد ببنەوە نایانەوێ تێی بگەن. ﴿وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ﴾ بەسەر دڵەکانیاندا پەردەی ئەستور دەگێڕین بەجۆرێك هیچ تێگەیشتنێك دەربارەی قورئان نەچێتە ناو دڵیانەوە، لەهیچ حاڵی نەبن، هیچ زانیاریو حوکمو نهێنیو مەبەستو ئاکامێکی بەسود رو لەدڵیان نەکا. ﴿وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً﴾ گێراومانە لەگوێچەکەیاندا گوێ گرانیو کەڕیی، هیچ نابیسن، هەرچی سودی هەبێ ناچێتە ناو گوێچکەیانەوە. ئیبنو ئیسحاق لەکتێبی بەناوبانگی خۆیدا ریوایەتێکی دورو درێژ لەموحەممەدی

كوڕی موسلیمی كوڕی شیهاب ئەویش لەزوهرییەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: كۆمەڵێك لەسەرانی قوڕەیش هەر كەسە لەماڵی خۆیەوە شەوێك لەشەوان خۆ دەدزێتەوەو دێ گوێ لەقورئان خوێندنی پێغەمبەر بگرێ: كە شەوانە لەماڵی خۆی لەناو نوێژدا دەیخوێند، هەریەكەیان لەپەنا پاسارێكەوە بەبێ ئەوەی ئەویتریان پێی بزانێ، خۆی گرتو گوێچكەیان كلۆر كردو تا بەیانی گوێیان لێ گرت، جا كە بەیانی هەریەكەیان گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی لەرێگەدا بەیەكتر دەگەنو لوتیان دەبێ بەلوتی یەكترییەوەو دەست دەكەن بەسەرزەنشتكردنی یەكتری دەڵێن: كوڕە دەخیل جارێكی تر شتی وا مەكەن، ئەگەر گەنجەكانمان شتی واتان لێ ببیسن دەكەونە گومانەوە دەربارەی ئایینەكەیانو لەوانەیە هەڵبخەڵەتێن جا: كە شەوی دووەم دادێ خۆیان پێ ناگیری، هەریەكەیان خۆ دەدزێتەوەو دێتەوە شوێنی خۆی وەك شەوی پێشوو خۆیان مەلاس دەدەنەوەو هەتا بەیانی گوێ لەقورئانخوێندنی پێغەمبەر دەگرنەوە، كە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە لەرێگەدا تووشی یەكتری دەبنەوەو هەمان ئامۆژگاری شەوی پێشووی یەكتر دەكەنەوە، كە شەوی سێیەم دادێ هەمان رفتار ئەنجام دەدەنەوە، كەبەیانی دادێو دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ، لەرێگە یەكتر دەگرنەوە، ئیتر هەندێكیان بەهەندێكیان دەڵێن: وەرن با پەیمان بەیەكتر بدەین: كە هەرگیز جارێكی تر نەیەینەوە بۆ گوێگرتن لەقورئانخوێندنی موحەممەد. پەیمان بەیەكتر دەدەن: كە جارێكی تر ئەو كارە نەكەن

جا كە دونیا روناك بووەوە كێشتەنگاو داهات ئەخنەسی كوڕی شورەیق گۆچانی دەست دایەو دەچێ بۆ ماڵی ئەبو سوفیانو پێی دەڵێ: پێم بڵێ: تۆ رات چیە دەبارەی ئەوەی لەموحەممەدت بیست؟ ئەویش دەڵێ: هەندێ شتم بیستو تێشی گەییشتمو زانیم مەبەست چیە، هەندێ شتیشم بیست نەتێی گەییشتمو نەمزانیم مەبەست چیە. (ئەخنەس)یش دەڵێ: دەسا منیش هەروەكوو تۆ وا بووم.

ئـەمجار لـەوێ هەڵدەسـتێو دەڕوا بـۆ مـاڵی ئـەبو جـەهل هـەمان پرسیاری ئاڕاسـتە دەكا. ئەویش دەڵێ جا چیم لێ بیستووە؟؟

ئێمـەو خێڵـی عەبدولـمەناف لەكۆنـەوە بەربـەرەكانیمان لـەنێواندا هـەبووە. لەسەر پیاوەتیو شكۆمەندی پێشبڕكێمان كردوە: میواندریی خەڵكیان كـرد ئێمـەش كردمان، وڵاغی سوارییان دا بەخەڵك ئێمەش دامـان، یارمـەتی خـەڵكیان دا ئێمـەش كردمان؛ تا وامان لێ هات پێكەڵ پێك بووینو وەكوو یەكمان لێ هـات. ئێـستا ئـەوان دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرێكمان تێدا هەڵكەوتووە لەئاسمانەوە نیگای بۆ دێ. دەی ئێمە كەی دەگەینە ئەو پلەو پایـە؟ سـوێندبێ هـەرگیزاو هـەرگیز بـڕوای پـێ نەكـەینو قەت ئیمانی پێ نەهێنین ئیتر ئەخنەس هەڵدەستێو بەجێی دێڵێ.[1]

ئاواو بەو جۆرە قورئان كاری دەكردە سەر دڵو دەروونی ئەوانـەی گوێیـان لێ دەبـوو، هەسـتی دەجوڵانـدنو لەوەتـەری حەسـساسی دەدان، بـەڵام ئـەوان خۆیـان لێ گێل دەكردو خۆیان لێ دوور دەخستەوەو لێی دەتاراند چونكە دەیانزانی ئایینی تـازە لەبەرژەوەندییەكانیان دەداو پلەو پایەی دونیاییـیان: كـە بـەناڕەوا بۆیـان فەراهـەم هــاتبوو نــامێنێ، فیــزو خۆبــەزلزانییان تێــدا دەچــێ، كۆتــایی بەملــهوڕیو دەرەبەگایەتییان دێ.

﴿وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْا عَلَى أَدْبَـارِهِمْ نُفُـوراً﴾ هـەر كـاتێ تـۆ ئەی موحەممەد! لەقورئان خوێندنتدا باسی پەروەردگارت بەتاكو تەنهایی بكەیو بڵێی: (لا اله الا الله)و نەڵێی (واللات والعزى) پاشـەو پـاش دەگەڕێنـەوەو بـڵاوەی لێ دەكەن بەتوڕەییو رق هەڵساوی بەفیزو تەكەببورو خۆبەزلزانییـەوە دەگەڕێنـەوە، بێـزاری خۆیـان دەردەبـڕن لەوتـەی تـاكو تـەنهایی خـودا، چـونكە پێیـان وایـە: چەسپاندنی ئاڵای (لا اله الا الله) كۆتایی هاتنی ملهوڕی ئەوانی پێوەیە. ئـەگینا ئـەو

[1] فی ظلال القرآن ج٣٣٢/٥ – ٣٣٣. طه ٥ ساڵی ١٩٦٧.

پیاوماقوڵو سەرۆکانەی قورەیش ئەوەندە کەودەنو نەفام نەبوون جوداوازی نێوان بیرو باوەڕی پوچی خۆیانو ئایینی ئیسلامی پیرۆز نەکەن! ئەوان بەیەکتاپەرستی قەڵس دەبوونو پێیان خۆش نەبوو وشەی (لا اله الا الله)ببیسن وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾الزمر/٤٥.

﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِ﴾ ئێمە ئەی موحەممەد! دەزانین باش ئاگامان لێیە چۆنو بەچ شێوەیەك گوێ دەگرن ﴿إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ﴾ ئەو کاتەی گوێ لەتۆ دەگرن، بەشێوەی گاڵتەکردنو لاقرتێ پێ کردنو بەدرۆخستنەوەت گوێ دەگرن. ئێمە زاناترین بەو نهێنیو قسە پەنامەکییانەی ئەوان لەنێوان خۆیاندا بەگوێچکەی یەکتریدا دەچرپێنن دەربارەی تۆو قورئان، ﴿وَإِذْ هُمْ نَجْوَى إِذْ يَقُولُ الظَّالِمُونَ﴾ ئەو کاتەی بێ باوەڕو موشریکەکان دەڵێن: ﴿إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلاَّ رَجُلاً مَسْحُوراً﴾ ئێوە تەنیا شوێن پیاوێکی جادولێکراو کەوتون شوێن پیاوێك دەکەون سەنتەری عەقڵی لەدەست داوە، ئایا دەگونجێ ئێوە شوێن پیاوێکی شێتو وێت بکەون؟ یان شوێن پیاوێکی جادوباز دەکەون، بەجادوبازیی ئادەمیزادەکان هەڵدەخەڵەتێنێ. جا کە ئێوە شوێن موحەممەد بکەون ئەوە شوێنی پیاوێکی لەو جۆرە دەکەون!

هەر لەو وتەکەیانەوە دەردەکەوێ: کە قورئان رایچڵەکاندون، هەستی بزواندون، ئەوان لەناخەوە هاتوونە سەر ئەوە کە: قورئان کەلامێکی ئاسایی نیەو هەست دەکەن: قورئان شتێکی تێدایە هی ئادەمیزاد نیە، بۆیە وەپاڵی سیحرو جادوبازی دەدەن، کەوابێ ئەوان قەناعەتیان پەیدا کردوە: کە قورئان قسەی موحەممەد نیە. دەی ئەوان ئەگەر ویژدانیان هەبوایە دەبوو یەکسەر بڵێن: ئەمە کەلامی خودایە، ئەمە نیگایەو لەخوداوە هاتووە.

﴿انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الأَمْثَالَ﴾ سەرەنج بدەو لەهەڵوێستو بیرو بۆچوونی ئەو ملهوڕو نەفامانە ورد بەرەوە چۆن رەوشتو سیفەتی سەیرو جۆراو جۆرت بۆ بڕیار دەدەن: دەمێك دەڵێن: شێتە، تاوێكی تر دەڵێن: جادوبازە، جاخێكی تر دەڵێن شاعیرە، نەخەیر كاهینە، نا فێڵبازەو دەچێ لای كەسانی تر ئەمە دەخوێنێ‌و دێ بەئێمەی دەگەیەنێ ﴿فَضَلُّوا﴾ بەراستی ئەوانە گومڕابونو لەرێبازی حەق لایان داوە، شارەزای رێبازی هیدایەت نەبوون بەسەرلێ شێواوی ماونەوە ﴿فَلا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً﴾ ناتوانن هیچ رێبازێك بگرنە بەر، رێگای هیدایەت ناگرن، ناشتوانن بایس بۆ هەڵوێستە شپرێوەكەی خۆیان بهێننەوە. حەیرانو پەشۆكاوو گومڕاو سەرلێ شێواوو بەدبەختی دونیاو قیامەتن!! هەرچی دەیڵێن درۆیە، هەرچی دەیكەن هەڵەیە، كەس بەحاڵی ئەوان نەبێ.

## ئینكاریكردنی موشریكەكان بۆ زیندوبوونەوەو رەتكردنەوەی ئینكاریكردنەكەیان

﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقًا جَدِيدًا ﴿٤٩﴾ ۞ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ خَلۡقًا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ

أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ ﴾

وەکوو ئاشکرایە ئەو مەسەلە گرنگانەی لەقورئاندا باسیان لێوە دەکرێ بەئوسلوبی جۆراو جۆر دووبارەو سێبارەیان دەکاتەوە چوار مەسەلەی گرنگو سەرەکین: کە بریتین لەئیلاهیاتو پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوەو قەزاو قەدەر. جا لەوەپێش باسی ئیلاهیاتی کردو بەشوێن ئەوەدا باسی ئەو رەخنەو شوبهانەی کرد: کە ئاراستەی پێغەمبەرایەتی کراونو رەتی کردنەوەو پوچەڵی کردنەوە. ئەمجار لەم ئایەتانەدا باسی شكو گومانی کافرەکان دەکا دەربارەی زیندوبوونەوەو پاداشو سزای کردەوەی ئادەمیزادان، گومانەکانیان دەڕەوێنێتەوەو پوچەڵیان دەکاتەوە، بەجۆرێك ئەگەر خاوەن ویژدان سەیری بکا دڵنیا دەبێو دەزانێ: کە داواکە شتێکی راستو حەقەو یەکسەر بڕوای پێ دەکا! قسەی کافرەکان رادەنوێنێو رەتدانەوەکەش رادەگەیەنێو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَئِذَا كُنَّا عِظَاماً وَرُفَاتاً أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقاً جَدِيداً ؟﴾ ئەوانەی بڕوایان بەزیندو بوونەوەی رۆژی قیامەت نیەو ئینکاری هاتنی ئەو رۆژە دەکەن، کاتێك گوێیان لەقورئانخوێندنی تۆ دەبێ ئەی موحەممەدو باسی زیندو بوونەوەی تێدایە، بەشێوەی پرسیاری ئینکارئامێزو بەسەر سوڕمانەوە وتیان: ئایا ئێمە کاتێك مردینو بوینە ئێسقو پروسقی لێك ترازاوو لێك هەڵوەشاوو رزیوو بوینەوە بەگڵو خۆڵ، ئایا ئێمە پاش ئەو نەمانو رزینو پۆلکانەی بەسەرماندا دێ جارێکی دی سەرلەنوێ دروست دەکرێینەوەو جەستەمان وەکوو پێش مردنمانی لێ دەکرێتەوە؟؟ واتە: نەخەیر شتی وا نابێو ناکرێ، نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ أَئِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ ؟ أَئِذَا كُنَّا عِظَاماً نَّخِرَةً، قَالُوا تِلْكَ إِذاً كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾النازعات/١٠-١٢. یان

دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾يس/٧٨-٧٩.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا: کە وڵامیان بداتەوە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيداً ، أَوْ خَلْقاً مِمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: زیندوکردنەوەی مردوو بۆ خودا کارێکی ئاسانە، چ ماندوبونێکی تێدا نیە، زۆر لەدروستکردنی یەکەمجارتان ئاسانترە (واتە: لەتەصەورو بیرو بۆچونی ئێمەی ئادەمیزاددا، ئەگینا بەنیسبەت خوداوە هەموو کارێك وەکوو یەك ئاسانەو کاری ئاسان‌و کاری گران لای ئەو چون یەکە) چونکە هەموو مادەیەکی لێکدراوو پێکهاتوو ئەگەر توخمەکانی دەست کەوتن‌و خاصیەتەکانی زاندران‌و ناسران بەئاسانی شتی هاو وێنەی لێ دروست دەکرێتەوە. جا ئەگەر لەفەرزێکدا ئێوە ئەی بێ باوەڕان؛ ئەی موشریکەکان! ئەگەر دوای مردنتان ببنە شتێك کە زۆر دوور بێ قبوڵی گیان بکا، ببنە بەردو ئاسن کە بەڕواڵەت ئەوانە لەئێسقانە رزیوو گڵ‌و خۆڵ نائەهل ترن بۆ گیان بەبەراکردن، یان هەر دروستکراوێکی تر: کە لەتەصەورو عەقڵی ئێوەدا ناگونجاوترە بۆ قبوڵکردنی گیان، وەکوو ئاسمانەکان‌و زەوی‌و کێوەکان. ئەوە دڵنیابن خودا دەتوانێ سەرلەنوێ زیندوتان بکاتەوە. واتە: ئێوە دوای مردنتان ببنە هەر شتێ نەك ئێسقانە رزیو: کە بۆنێکی گیانی لێ دێ‌و رۆژگارێك بووە قبوڵی گیانی کردووەو گیانی تێدا بووە. خودا زیندوتان دەکاتەوەو بۆ دەشتی مەحشەر کێشتان دەکاو حیساب‌و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکاو سزاو پاداشی کردەوەکانتان وەردەگرنەوە.

هەڵبەتە ئەوان توانای ئەوەیان نیە ببنە بەردو ئاسن یان هەر شتێکی تر. وەلێ ئەمە وەکوو بەرلێ بڕینەوە وایەو موبالەغەکردنە لەرەهایی‌و بەرفراوانی دەسەڵاتی خودادا. لەهەمان کاتدا ئاماژەی سوکە سەرزەنشتکردنێکی تێدایە بەوەی: کە ئەوانە وەکوو بەردو ئاسن بێ هۆش‌و هەستن!

ئـەمجار دوای ئـەوەی زیندوبوونـەوەیان بـەدوور زانـی، بەدووریـشی دەزانـن: کەسێك هەبێ، ئەوان ببنە بەردو ئاسنو زیندویان بکاتەوە! ﴿فَسَيَقُولُونَ مَـنْ يُعِيـدُنَا ؟﴾ ئـەی موحەممـەد! ئـەمجار ئـەوان دەڵێن: باشـە، کـێ دەتـوانێ ئێمـە بـە حاڵـەوە زیندو بکاتەوە. ئەگەر ئێمە مردینو بوینە بەردو ئاسن، یان دروستکراوێکی تر کێ دەتوانێ ئێمە بێنێتەوە حاڵەتی ژیان؟؟

﴿قُـلْ الَّـذِي فَطَـرَكُمْ أَوَّلَ مَـرَّةٍ﴾ پێیـان بڵـێ: زیندوکـەرەوەتان ئـەو کەسـەیە یەکەمجار ئێوەی لەنەبووەوە هێنانەوەتە وجوود. ئەو کەسەی ئێوەی لەگڵو خۆڵێـك کە هێشتا بۆنی ژیانی نەکردبوو بـەدی هێنـاوە، لەنـەبووەوە ئێـوەی دروسـت کـردوە، هـیچ نـەبونو هێنانیـە گۆڕەپـانی ژیـانو پێـی گەیانـدنو بەسـەر زەوی دا بـڵاوی کردنـەوە، ئـا ئـەو خودایـە دەتـوانێ ئێـوە سـەرلەنوێ زینـدوو بکاتـەوە.. وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وهـو الـذي يبـدأ الخلـق، ثـم يعيـده وهـو أهـون عليه﴾الروم/٢٧.

ئـەوەی چاوەڕوان دەکـرێ لـەکاتی بیـستنی ئـەم وڵامـە گورچکبڕەدا ئەوەیـە: ﴿فَسَيُنْغِـضُونَ إِلَيْـكَ رُءُوسَـهُمْ﴾ کـە سـەرت بـۆ دەلـەقێنن، لاقرتێـت پـێ دەکـەن، بەمەبەستی گاڵتە پێ کردن و بەدرۆخستنەوەت سەریان دەلەقێننو ئەمجار پرسیار دەکـەنو ﴿وَيَقُولُـونَ مَتَـى هُـوَ ؟﴾ دەڵـێن: جـا ئـەو زیندوبوونـەوە کـەی دەبـێ؟ مەبەستیان ئەوەیـە: هـاتنی رۆژی قیامـەت شـتێکی نامەعقوولـەو عـەقڵ بـەدووری دەزانێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا هاتووە دەفـەرموێ: ﴿وَيَقُولُـونَ مَتَـى هَـذَا الْوَعْـدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾الملك/٢٥.

﴿قُـلْ عَـسَى أَنْ يَكُـونَ قَرِيبـاً﴾ ئـەی موحەممـەد! پێیـان بڵـێ: ئێـوە لـەو رۆژە بترسـن چـونکە نزیکـە بـێو هـەردێ گومانتـان لـەهاتنی دا نـەبێ، چـونکە هـەموو

هاتوێك نزیكە، هەر شتێك هاتنی موحەقەق بێ نزیكە با زۆریش بومغرێ! وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيداً، وَنَرَاهُ قَرِيباً﴾المعارج/٦-٧.

شایانی باسە كاتی هاتنی قیامەت نهێنی یەكی یەزدانەو كەسی لێ ئاگادار نەكردوە، نەفریشتەكانی نزیك بارەگای ئەقدەس نەپێغەمبەران، كەس ئاگاداریی‌و زانیاریی دەربارەی هاتنی قیامەت نیە. بەلام پێغەمبەر هەوالی پێ داوین: كە هاتنی نزیكە، لەفەرموودەیەكی دا: كە ئەحمەدو موسلیم‌و بوخاری‌و تیرمیذی لەئەنەسەوە ریوایەتیان كردوە دەفەرموێ: (بعثت أنا والساعة كهاتين) ئاماژەی بە قامكەشادەو قامكی ناوەڕاستی كرد.

وشەی (عسی) لەئایەتەكەدا بۆ رەجاو ئومێد نیە، بەڵكوو بەمانای تەئكیدو چەسپاندنی هاتنەكەیەتی.

ئەمجار پەروەردگار هاتنی رۆژی قیامەت بەشێوەیەكی سوك‌و ئاسان دەخاتە بەرگوێچكەی ئادەمیزادان‌و دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ﴾ زیندوبوونەوەتان رۆژێك دەبێ پەروەردگار بانگتان لێ دەكا، ئێوەش هەمووتان لەگۆڕەكانتان راست دەبنەوە فەرمانبەردارو دەست بەسینگەوەو ملكەچ‌و پابەند بەفەرمان‌و سوپاسگوزارو سەناخوان.

بڕێ لەزانایانی تەفسیر پێیان وایە: مەبەست بەو بانگكراوانە خاوەن باوەڕانن، بەلگەشیان سوپاس كردنەكەیانە كە لەوشەی (بحمده)ی وەردەگیرێ.

ظاهیری ئایەتەكە ئەوە دەگەیەنێ: هاتن بەدەمەوەكە گشتییەبەلام هەر بێ بڕواكان مەبەستن چونكە سیاقی ئایەتەكە باسی ئەوانەو بۆ ئەوان هێندراوە.

بەهەرحاڵ دیمەنەكە سەرسوڕهێنەرو هەست بزوێنە، دیمەنێكە وێنەی ئەوانە دەكێشێ كە لەدونیادا بڕوایان بەو رۆژە نەبوە، كەچی ئێستا ئاوا بەدەم بانگكردنەكەوە دێن‌و دەم بەویردو سوپاس‌و سەنا! بەراستی ولامدانەوەیەكی

سەرسوڕهێنەرە، هاتن بەدەنگەوەیەو ئیعتیرافو داننانە لەلایەن کەسانێکەوە: کە لەوەپێش ئینکاری ئەو ڕۆژەیان کردوە، ئینکاری خودایان کردوە، ئەو ڕۆژە: کە بانگ دەکرێن هیچ وڵامێکیان نیە جگە لەوەی پڕ بەدەمیان دەڵێن: (الحمد لله، الحمد لله).

ئیتر ئەو ڕۆژە کە بیر لەژیانی دونیایان دەکەنەوە، وەکوو سێبەری ماوەکورتو تارمایی یەك دێتەوە یادیان ﴿وَتَظُنُّونَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ وا گومان دەبەن: کە ماوەیەکی زۆر کورت ژیاونو ژیانی دونیایان ساتەوەختێك بووە، ئێوارەیەك یان چێشتەنگاوێك بووەو رابردوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾النازعات/٤٦. یان دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْماً﴾طه/١٠٤. یان دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ﴾الروم/٥٥. هەڵبەتە وێنەکێشانی دونیاو تەصەورکردنی بەو شێوە بۆ ئەوەیە نرخی لەدڵی ئادەمیزاداندا کەم بێتەوە. گرنگی پێ نەدەنو هەوڵی قیامەت بدەن!!

هەندێك پێیان وایە: مەبەست بەمانەوە کەمەکەیان کە لەئایەتەکەدا ئاماژەی پێ دەکا مانەوەی نێوان دوو فووکردن بەصورەکەدایە، چونکە وەکوو دەڵێن: لەنێوان دوو فوکردنەکەدا (مابین النفختين) ئازاری گۆڕ هەڵدەگیرێو هەموو کەس خەویان لێ دەکەوێو بێ ئاگان، ماوەکەشی چل ساڵە، کە لەسورەتی (یس/٥٢)دا دەفەرموێ: ﴿مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا﴾ ئاماژە بەوە دەکا. کەوابێ ئەم گومان بردنو مانەوە بەکەم زانینە تایبەتە بەکافرەکانەوە. موجاهید دەڵێ: پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت کافرەکان سەرخەوێك دەشکێننو ماوەیەك خەویان لێ دەکەوێو لەززەتی

خەو دەچێژن، جا کە بانگ لەمردوان دەکرێ بۆ زیندوبوونەوە بەپەشۆکاوی و لێوەلەرزە راست دەبنەوە.[١٨]

## دابو نەریتی موجادەلەکردن و دەمەدەمێ

﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّۦنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ ﴾

ئەمجار سیاقی ئایەتەکان واز لەرەتدانەوەی ئەو کافرو موشریکانە دەهێنێ: کە بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیەو لاقرتێ بەوادەو هەڕەشەی پەروەردگار دەکەن و لەکاتی خوێندنەوەی قورئان بەسەریانداو باسکردنی رۆژی قیامەت بۆیان سەریان دەلەقێنن و گاڵتەیان پێ دێ، رو لەوان وەردەگێڕێ و رودەکاتە بەندە بڕوادارەکان، فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا کە دابو نەریتی موجادەلەو دەمەدەمێ فێر ببن و بزانن چۆن دان و سان لەگەڵ بەرامبەرەکەیاندا دەکەن، دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ ئەی موحەممەد! بەبەندە موسوڵمانەکانم بڵێ: پێیان رابگەیەنە لەهەموو کات و شوێنێکدا بەرامبەر بەموشریك و دژەکانیان قسەی

(١٨) تەفسیری قورطوبی ج٥/٢٩٩٥-٢٩٩٦.

جوانو شیرینو پڕمانا بکەن، قسەیەك بکەن لەدڵدا جێی ببێتەوە، ئیقناع ئامێز بێ، بەڵگەی ڕەتدانەوەیان تێکەڵاوی جنێوو قسەی نابەجێ نەبێ. هەموو دەمو گوفتار جوانو زمان شیرین بن، قسەپەڕێن و قسە تڕن نەبن، هەموو قسەیەك بگێڕنو ببێژنو ئەمجا ببیژن، بزانن چ دەڵێنو بۆچی دەیڵێن: وەکوو لەئایەتێکی تردا فەرمان بەپێغەمبەر دەکاو لەڕێگەی ئەویشەوە بۆ هەموو بانگخوازانی خاوەن باوەڕ دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾النحل/١٢٥. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾العنكبوت/٤٦. چونکە ئەگەر لەئاخاوتندا کاراماو لێزان نەبن، گفتو گۆتان خۆش نەبێ، ئەوە ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ﴾ بێگومان شەیتان ئارامیو ئاشتی نێوان موسوڵمانانو بێ بڕوایان تێك دەداو فیتنەو ئاژاوەیان دەخاتە نێوانەوە، بەگژیەکدا دەچن، شەڕو هەرا بەرپا دەبێ، ڕۆڵی دانو سانو گفتو گۆ وەلا دەنرێ، چەك وەکار دەخرێ، هەر کاتێکیش چەك وەکار خراو ئاگری فیتنە بەرپا بوو، کوژاندنەوەی ئەستەمە، زۆر شت کە لەڕێگەی دانو سانەوە ئەنجام دەدران لەکیس دەچن، شەیتان هەل بەدەست دێنێو کاری خۆی دەکا، چونکە شەیتان دوژمنی سەرەکی ئادەمو نەوەکانیەتی، دوژمنایەتیەکەی بۆیان ئاشکراو نمایانە. بۆیە پێغەمبەر ﷺ جڵەوگیری لەوە دەکا: کە ئادەمیزاد چەك بەرەو ڕوی برای موسوڵمانی ڕادێرێ چونکە نازانێ لەوانەیە شەیتان لەدەستی دەرچوێنێو توشی تاوانی گەورەببێ.

ئیمام ئەحمەدو موسلیمو بوخاری لەئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لايشيرن أحدكم الى أخيه بالسلاح، فانه لايدري أحدكم لعل الشيطان أن ينزغ في يده فيقع في حفرة من النار).

دوژمنایەتی شەیتان بۆ ئادەمیزاد دوژمنایەتێکی کۆنو دامەزراوەو لەکۆنەوە شەیتان دوژمنایەتی بۆ بەرەی ئادەمیزاد ڕاگەیاندوە وەکوو لەشوێنێکی تردا لەسەر

زوبانی ئەو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ﴾الأعراف/١٧.

هەر کاتێ ئادەمیزادان لەناوخۆیاندا ئاخاوتنیان نەرمو نیان بوو، دانو سانیان زانستانەو لەسەرخۆ بوو، خۆیان لەقسەی رەقو زبرو ترن پاراست، رێگای ئەوە دەبەستن؛ کە شەیتان بتوانێ ناوانیان تێك بدا، شەیتان نێوانی برایان تێك دەدا بەوتەی زبرو رەق کە لەدەم دەردەچێو ولامی ناشیرینی دەدرێتەوە، لەم قسەیەكو لەو ولامێك کاتێك دەزانی ئاشتی شێواو ناکۆکی پەیدابوو، شەڕ بەرپا بوو، دوژمنایەتی هاتە کایەوە. قسەی جوانو شیرین برینی دڵ دەرمان دەکا، گەشەو نەشە دەخاتەوە نێوان ئینسانەکانەوە. پێویستە ئەوە بزانرێ: مەبەست لەو فەرمانو ئامۆژگارییانە ئەوە نیە چاوپۆشی لەناهەقو ستەمکاریی بکرێ، واز لەئامۆژگاریو جڵەوگیریکردن لەخراپەکاری بهێنرێو دڵی بێ بڕوایانو خراپەکاران نەرمنجێندرێ، نەخەیر مەبەست ئەوە نیە. بەڵکوو پێویستە بەپێی تواناو گونجان جڵەوگیری لەخراپەکاریو تاوان بکرێ، بەلام دەبێ بانگخوازانی ئیسلام ئوسلوبێك بەکار بهێنن خراپەکار لەخراپەکردن بگێڕنەوە نەك بیتارێننو وای لێ بکەن زیاتر سوور بێ لەسەر خراپەکاری. وەکوو دەڵێن: (لكل مقام مقال) پیاوی زاناو دانا دەزانێ چۆن قسە دەکاو بۆ کێی دەڵێ.

﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلإِنسَانِ عَدُوّاً مُّبِيناً﴾ بێگومان شەیتان بۆ ئادەمیزاد دوژمنێکی ئاشکراو راستەقینەیە، هەمیشە لەهەوڵو تەقەڵلای تێکدانی نێوان ئادەمیزادەکاندایە! بەوشەی جوانو گوفتاری شیرین دەرگای لێ دەگیرێو بەربەستی خراپەکاری لێ دەکرێو ناتوانێ نێوان ئادەمیزادەکان تێك بدا.

ئەمجار سیاقی ئایەتەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئاکامو سەرەنجامی ئەو خەڵکەی لەگۆڕەکانیان راست دەکرێنەوە بانگێشی دەشتی مەحشەر دەکرێن، بۆیان

دەردەکەوێ هەموو شتێك بەدەست خودایەو کەس نیە بتوانێ دەستی بەردەست بێنێ!

﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ﴾ خودای ئێوە ئاگادارە بەئێوە، هەموو حاڵو ومزعێکتان دەزانێ، ئەگەر مەیلی بێنێ رەحمتان پێ دەکا بەوە تۆفیقتان دەدا بۆ ئیمانهێنانو ئەنجامدانی کرداری باش، یان ئەگەر بیەوێ هیدایەتتان ناداو بەبێ بڕوایی دەمردن و شیاوی عەزابی دۆزەخ دەبن.

واتە پێویستە بەو شێوە قسە لەگەڵ موشریکەکان بکرێ، نەك بەقسەی رەقو توندو تیژ پێیان بڵێن: ئێوە دۆزەخینو ئێوە بێ بڕوانو بەدبەختو ماڵوێرانو نەگبەتن، چونکە ئەم جۆرە قسانە زیاتر رقیان هەڵدەستێنێو سووریان دەکا بۆ بەردەوام بوون لەسەر کوفر.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کە پێویستە موسوڵمانان بەچاوی سووك سەیری موشریکەکان نەکەنو بەقەطعی پێیان وانەبێ ئەوانە دۆزەخین، چونکە چارەنووس نادیارەو هەر خودا بەندەی خۆی دەناسێ، کێ ناڵێ ئەوەی تۆ بەئەهلی دۆزەخی لەقەڵەم دەدەی پێش غەرغەرەی مردن تۆبە ناکاو خودا لێی خۆش نابێ؟!

سەرباری ئەوەش ئەو جۆرە قسانە دەبنە هۆی ناکۆکیو دڵی خەڵك کرمێ دەکاو ج سودێکیشی نابێ!

ئەمجار خیطاب ئاڕاستەی گەورەترین ئادەمیزاد دەکا: کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ بۆ ئەوەی ئوممەتەکەیشی چاو لەوبکەنو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً﴾ ئەی موحەممەد! ئێمە تۆمان بۆیە نەناردوە بە زۆرە ملێ خەڵکی بێنیە سەر رێگای ئیسلامو زەبرو زەنگ بەکار بێنی، ئەتۆ بەرپرسو رەقیبی ئەو خەڵکە نی، بەڵکوو مزدەدەرو ترسێنەری، لەگەڵیان هەڵبکەو رقیان هەڵمەسێنە بەنەرمو نیانیو گوفتاری شیرینو دانو سان لەگەڵیان بجوڵێرەوە،

فەرمان بەهاوەڵانیشت بکە ئەو ڕێبازە ڕەچاو بکەن، چونکە ئەو شێوە هەڵس‌و کەوتە کاریگەرترە بۆ ئیمانهێنانی خەڵك بەپەیامی ئیسلام‌و شوێنکەوتنت!!

﴿وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ خودای تۆ زانایە بەهەرچی لەئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە. ئاگای لەهەڵس‌و کەوتی هەموو فریشتەو پێغەمبەران‌و ئادەمی‌و جندۆکە هەیە. بەڵکوو ئاگای لەشتی وا هەیە هەر خۆی دەزانێ چیەو چی نیە. ئاگاداری حاڵ‌و وەزع‌و ژمارەو ئەندازەو قەبارەو چەندیەت‌و چۆنیەتیانە. هەروەها دەزانێ کێ شیاوی پێغەمبەرایەتی یەو کێ شیاوی پێغەمبەرایەتی نیە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ؟ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾الملك/١٤. خودا لەهەموو کەس باشتر دەزانێ: شانیان چ هەڵدەگرێ، هەر بەو زانیاریە موطلەقە ڕەهایە: کە ئاگای لەهەموو کاروبارێکی بەندەکانیەتی هەندێ لەپێغەمبەرانی ڕێزدار تر کردوە لەهەندێکیان، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ﴾ بێگومان هەندێك پێغەمبەرمان بەسەر هەندێکیاندا تەفضیل داون برێکیان زێدە ڕێزو تایبەتمەندیمان پێ بەخشیون، بۆ نمونە ئیبراهیممان کردوە بەدۆست‌و خۆشەویستی خۆمان، موسامان کردوە بەقسە لەگەڵ کراوی خۆمان، موحەممەدمان کردوە بەسەردەستەی پێغەمبەران‌و دوا پێغەمبەر، قورئانمان بەنیگا بۆ ناردوە، موعجیزەی ئیسراو میعراجمان بۆ فەراهەم هێناوە.

پەروەردگار بەم ئایەتە ڕەدی کافرەکانی داوەتەوە: کە دەیانگوت: زۆر دوورە هەتیوەکەی ئەبوطالیب ببێتە پێغەمبەرو ئەو پێخاوس‌و ڕوت‌و برسیانەی: وەکوو صوهەیب‌و بیلال‌و خەباب، ئەوانە صەحابەو هاوەڵ بن‌و گەورەو پیاوماقوڵەکانی قورەیشیش هیچ! جا: کە دەفەرموێ: (بمن في السموات) ئەوە ڕەدی ئەو قسەیانە: کە دەیانگوت: ﴿لولا نزل علينا الملائكة﴾. کە دەفەرموێ: (في الأرض) ڕەدی ئەو

قسەيانە: كە دەيانگوت: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾الزخرف/٣١.

كوڕاى زانايانى ئيسلام لەسەر ئەوە دامەزراوە: كە رەسولەكان لەنەبييەكان گەورەترن، ئولولعەزمەكانيان كە پێنجن لەوانى تر ڕێزدارترن. ئولولعەزم ئەو پێغەمبەرانەن لەسورەتى (الأحزاب/٧)و سورەتى (الشورى/١٣)دا ديارى كراون لەناو ئولولعەزمەكانيشدا حەزرەتى موحەممەد لەهەموان گەورەترە، دواى ئەو حەزرەتى ئيبراهيم ئەمجار حەزرەتى موسا ئەمجار حەزرەتى عيسا، ئەمجار حەزرەتى نوح درودى خودايان لێ بێ.

﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُوراً﴾ ئێمە زەبوورمان داوە بەداود، بەهۆى نازلكردنى زەبور بۆ سەرى ڕێزدارمان كردوە، واتە: ڕێزو شكۆمەنديى داود بەهۆى ناردنى زەبور بووە بۆى، نەك بەهۆى پادشاييو دەسەڵاتەوە بووە! هەروەها بۆردانى جولەكەكانيشەو پێيان دەفەرموێ: ئێوە ئينكارى نازلكردنى قورئان بۆ سەر موحەممەد مەكەن، چونكە وەكوو چۆن زەبورمان ناردوە بۆ داودو ئێوە بڕواتان پێيەتى، ئەميش قورئانمان بۆ ناردوەو ئيمانى پێ بهێنن!

## پوچەڵكردنەوەيەكى ترى شوبهەى كافرەكانو ڕەواندنەوەى گومانەكانيان

﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُولَـٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ

عَذَابَهُۥٓ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَـٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَـٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾

**دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا هەڕەشەی لەکافرەکان کرد لەسەر ئەوە ئینکاری هاتنی قیامەت دەکەن‌و زیندو بوونەوەیان بەلاوە درۆیە. لێرەدا هاتەوە سەریان‌و جارێکی تر نارەزامەندیی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەریان‌و هەڕەشەیان لێ دەکا لەسەر ئەوە فریشتە دەپەرستن، جندۆکە دەپەرستن، عیسا بەخودا دەزانن‌و عوزەیر دەکەنە کوڕی خودا، چونکە ئەوانەی ئەوان بەخودایان دەزانن بۆ خۆیان لەخودا دەپاڕێنەوە، بەندایەتی بۆ دەکەن، لەسزاو تۆڵەی دەترسن. کەوابێ ئەو کەسە شیاوی بەندایەتی بۆ کردنە: کە خاوەنی ئەوانە، دارای**

سودگەیاندنو زیانگەیاندنی هەیە، ئەو کەسە خودایە: کە بەدیهێنەرە، زاناو داناو هەمیشە زیندوو خاوەن دەسەڵاتە.

ئەمجار هەڕەشەی لەناوبردنیان لێ دەکاو دەفەرموێ: سەرەنجامی شارو دێهاتی ئێوە، ئاکامی خۆتانو ماڵو حاڵتان لەهی گەلەپێشینەکان باشتر نابێ، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر لاساریو سەرپێچی دوور نیە وەکوو گەلە پێشینەکان قەلاچۆ نەکرێن، یان سزا دەدرێن بەکوشتنو فراندنو تاڵانکردن.

ئەمجار رەدی ئەو موشریکانە دەداتەوە: کە پەلپی موعجیزەی حیسیو مادی لەپێغەمبەر دەگرن، وەکوو قورئان لێیان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الأَرْضِ يَنبُوعاً...الآية﴾ الأسراء/٩٠.

پێیان رادەگەیەنێ: کە بەجێهێنانی پێشنیارەکانیان لەوانەیە ببێتە هۆکاری لەناوچوونیان، چونکە ئەگەر ئێمە ئەو موعجیزانە بدەینە پێغەمبەر ﷺ پاشان ئێوە ئیمانی پێ نەهێنن، ئەوە بەگوێرەی دابو نەریتی خودا لەبوونەوەردا ریشەکێش دەکرێنو تاقەوارتان لێ نامێنێ!

جا هەرچەندە بەدیهێنانی موعجیزەی پێشنیارکراو لەبەرژەوەندیی کافرەکان نەبوو، کەچی ئەوان وەکوو (کەری دێز) لەقسەو لاساریی خۆیان نەدەکەوتن، بەپێغەمبەریان دەگوت: ئەگەر تۆ راست دەکەی پێغەمبەریو لەخوداوە نێردراوی، ئەو موعجیزانەی داوامان لێ کردوی دەتخستنە ڕو، وەکوو چۆن کاتی خۆی موساو غەیری موسا: کە داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان لێکراوە خێرا خستویاننە ڕو.

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە کە شەوڕەوی کردن بەپێغەمبەرو میعراجی بۆ ئاسمانەکان تاقیکردنەوەی ئادەمیزادەکان بوو، تەرازوی ئیمانو باوەڕیان بوو، وەکوو چۆن درەختی زەقوم لەناو ئاگری دۆزەخ دا تاقیکردنەوەیە بۆیان دەفەرموێ: ﴿قُلْ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُمْ مِنْ دُونِهِ فَلا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلا

تَحْوِيلاً﴾ ئەی موحەممەد! بەو موشریکە نەفامانە بڵێ: بەوانە بڵێ: کە غەیری خودا دەپەرستن، بڵێ: دەبانگ لەو شتانە بکەن: کە بەهاوەڵی خودایان دەزانن، بەندایەتییان بۆ دەکەن، ئایا دەتوانن وڵامیان بدەنەوە؟ دە لەکاتی تەنگانەو بەلاو موصیبەتدا هانایان بۆ بەرنو لێیان بپاڕێنەوە، بزانن ئاخۆ بەهاناتانەوە دێن؟ بەڵاو ناخۆشیتان لەسەر لادەبەن؟ دەتوانن ئەو ناخۆشیە لەئێوە دوور بخەنەوە، یان دەتوانن بیخەنە سەر یەکێکی تر؟ ئایا دەتوانن ئەو ناخۆشییانە لەشوێنێکەوە بگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر؟

بێگومان ئەوانەی ئەو موشریکانە بەخودایان دەزانن، ناتوانن: هیچ شتێك بکەن، هیچیان لەدەست نایە، ئەوان دەسەڵاتی ئەوەیان نیە سوود بۆ خۆیان کێش بکەنو زیان لەخۆیان دوور بخەنەوە، دەی چۆن بۆ غەیری خۆیان دەتوانن؟!

ئەو کەسەی توانای هەموو شتێکی هەیەو دەتوانێ ئەو شتانە بکا تەنها پەروەردگاری بێ هاوەڵو بێ نەظیرە، ئەو خودایەی بەدیهێنەرو رزقو رۆژیدەرە هەر ئەو دەتوانێ بەهانای لێقەوماوانەوە بێو فریادرەسیان بێ.

ئیبنو عەبباس دەڵێ: موشریکەکان دەیانگوت: ئێمە عیبادەت بۆ فریشتەو عیساو عوزەیر دەکەین چونکە هەر ئەوان شیاوی پەرستش بۆ کردننو بانگیان لێ دەکرێ.

ریوایەتکراوە کاتێك قورەیشییەکان گرانیو قاتو قڕیان بەسەردا هات، چوونە لای پێغەمبەرو هانایان بۆ ئەو برد، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی دوایی نازڵ کردو دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ﴾ ئەو مەخلوقاتانەی موشریکەکان بانگیان لێ دەکەنو داوای بەهاناچونیانەوە لێ دەکەنو بەخودایان دەزانن. لێیان دەپاڕێنەوە زیانیان لێ دوور بخەنەوە ئەوانە خودی خۆیان هاوار دەکەنە خوداو لێی دەپاڕێنەوە، خۆی لێ نزیك دەکەنەوە سوورن لەسەر بەدەستهێنانی رەزامەندیی خودا، بەندایەتی بۆ دەکەن، لەهەوڵو تێکۆشاندان بۆ

ئەوەی خودا لەخۆیان رازی بکەن، عیبادەتو بەندایەتی هەر بۆ خودا دەکەن، یەکتاپەرستن.

تیرمیذیو ئینو مەردەوەیهی فەرمودەیەکیان لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (سلوا لي الله الوسيلة، قالوا وما الوسيلة؟ قال: القرب من الله) ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

﴿أَيُّهُمْ أَقْرَبُ﴾ کێیان لەوانەی ئێوە بەندایەتییان دەکەنو لەخودا نزیکە، کێیان لای خودا نزیکترەو پایەی بەرزترە، هەوڵی ئەوە دەدا زیاتر لەخودا نزیک ببێتەوە، زیاتر بەندایەتی خودا بکا، جا کە دەستەوەسانیو داماوی لەبارەی لابردنی زیانو هێنانی سوودو قازانج بۆخۆیانو غەیری خۆیان رەوشتی بەرودوایان بێو هەموویان لەو بوارەدا چون یەك بن، ئەدی ئێوە بەچ عەقڵێك عیبادەتیان بۆ دەکەن؟ چۆن بەخودایان دەزانن؟

﴿وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾ ئەوانەی ئێوە بەخودایان دەزانن هەموویان لەپێشبڕکێی ئەوەدان خۆیان لەخودا نزیك بکەنەوە، هەردەم دەیانەوێ لەرێگەی طاعەتکردنەوە رەحمەتی خودا بەدەست بێنن، بەتەمای بەزەیی پەروەردگارن، لەسزاو تۆڵەی دەترسن خۆیان لەلاساریو سەرپێچی فەرمانەکانی دەپارێزن! چونکە ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُوراً﴾ بێگومان سزاو تۆڵەی خودای تۆ ئەی موحەممەد! سامناکەو شیاوی ئەوەیە لێی بترسێنو حەق وایە کەس لێی ئەمین نەبێ. پێویستە فریشتەو پێغەمبەران پاشگوێی نەخەن ترسیان لێی هەبێ، ج جایی ئەوان.

ئەمجار باسی سەرەنجامی جیهانو جیهانیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْ قَرْيَةٍ إِلاَّ نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَاباً شَدِيداً﴾ هیچ شارو لادێیەك نیە لەو شارو گوندانەی دانیشتوانیان ستەمکارو کافرن، سەرپێچیکارو تاوانبارن مەگەر ئێمە پێش هاتنی رۆژی قیامەت ئاسەواریان دەبڕینەوەو ریشەکێشیان دەکەینو

لەناویان دەبەین، یان سزایان دەدەین بەسزای بەلاو موصیبەتو کوشتنو بڕینو بلاوبوونەوەی نەخۆشی ترسناك، ئەمەش بەهۆی ستەمو ستەمکاری خۆیان، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَـكِن ظَلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾هود/١٠١. خۆیان تاوانبارنو خۆیان بەرپرسن!

﴿كَانَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُوراً﴾ ئەوەی گوترا بڕیارێکی گشتیو چەسپاوە لەزانیاری خودادا لەلەوحولمەحفوظدا تۆمار کراوە.

تیرمیذی لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (ان أول ماخلق الله القلم، فقال له: اكتب، فقال ماأكتب؟ قال اكتب المقدر وماهو كائن الى يوم القيامة).

ئەمجار وەکوو دەگێڕنەوە؛ دەڵێن: کافرە قورەیشییەکان چوونە لای پێغەمبەرو وتیان: ئەی موحەممەد! تۆ پێت وایە لەپێش تۆدا پێغەمبەری تر هەبوون! هەیانبووە بابۆی موسەخەر بووە، هەیانبووە مردوی زیندو کردوونەوە، جا ئەگەر دەتەوێ ئیمانت پێ بهێنین داوا لەخودای خۆت بکە کێوی (صەفا)مان بۆ بکا بەزێڕ!! ئیتر خودای مەزن ئەم بۆچونەی ڕەتکردنەوەو فەرمووی: ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَنْ نُرْسِلَ بِالآيَاتِ إِلاَّ أَنْ كَذَّبَ بِهَا الأَوَّلُونَ﴾ هیچ شتێك نەبوە ببێتە بەرهەڵستی ئێمە لەوەی ئەو موعجیزانەی موشریکەکانی مەککە پەلپیان لێ گرتبوو بیانهێنینە دی، جگە لەوەی کە گەلەپێشینەکان ئەو جۆرە پەلپانەیان گرتنو پاشان کە موعجیزەکانمان بەدی هێنان بڕوایان پێ نەکردو ئیمانیان نەهێنا ئێمەش لەناومان بردن، جا کە ئێمە بۆ موشریکەکانی قورەیش هەمان هەڵوێست بنوێنینو پەلپەکانیان بهێنینە دیو یەکسەر ئیمان نەهێنن، ئەوە بەگوێرەی دابو نەریتی خۆمان دەبێ لەناویان بەرین، ئەوەش ویستی ئێمە نیە، چونکە ئەم پەیامە پەیامێکی گشتیو هەمیشەیی یە، ئەمان خۆشیان ئیمان نەهێنن منداڵەکانیان

نــەوەكانیان ئیمـان دەهێـنن، بۆیــە ئــەو موعجیزانــەی داوایـان كـردوە پاشـگوێمان خستن‌و نەماهێنانە دی.

برێ لەو پەڵپانەی موشریكەكانی مەككە لەپێغەمبـەریان گرتبـوو ئـەوە بـوو، وتیـان: دەبـێ كێـوی صـەفا بكەیـە ئـاڵتون‌و كێوەكـانی دەوروبـەری مەككـە دوور خرێنەوەو زەوییەكەی وای لێ بێ بەكاری كشت‌و كاڵ بـێ‌و كانیـاوی تێـدا بتـەقێن‌و جۆگەو جۆباری تێدا جاری بن.

ئەو موعجیزانەی گەلە پێشینەكان داوایان لەپێغەمبـەرەكانیان كـردو دوایـی: كـە موعجیزەكـان هاتنــە دی بڕوایـان پــێ نــەكردن‌و ئێمــەش بــەهیلاكمان بــردن‌و ئاسەوارمان بڕینەوە زۆرو زەبەندەن. یـەكێ لەوانـە وشـتری صاڵح پێغەمبـەرە: كـە موعجیزەیـەكی خـودایی بـوو هاتـە دی، كەچـی سـەرباری ئـەوەی كـە ئیمانیـان پـێ نــەهێنا وشترەكەشــیان كوشــت‌و ســەریان بــڕی. ئــیتر بەعــەزابی گرمــەو ناڵــەی زەندەقبــەر لــەناوبران‌و ئێــستاش شــوێنەواری لەناوچــوونەكەیان مــاوەو نزیكــی ســنووری مەككەیــەو ئــەوان لەهاتووچـۆی گەشــت‌و گوزاریـاندا ئــەو شــوێنەوارانە دەبیـنن، وەكـوو زانیمـان پـەروەردگار چـەند جارێـك ئامـاژە بـەو رووداوە دەكـاو بـۆ نموونە موعیجزەی صاڵح پێغەمبـەر ﷺ دەگێڕێتـەوە، بۆیـەش بەتایبـەتی لێـرەدا مـوعجیزەی ئـەم پێغەمبـەرە رادەنـوێنێ چونكە خـۆی‌و گەلەكـەی عـەرەب بـوون‌و رووداوەكــە لای قورەیــشییەكان ئاشــكرا بــووە بەریوایــەت‌و عەنعــەنات بۆیــان گێڕدرابووەوە.

دەفـەرموێ: ﴿وَآتَيْنَـا ثَمُـودَ النَّاقَـةَ مُبْـصِرَةً﴾ بەخـشیمان بەگـەلی ئـەموودئـەو حوشــترە بەناوبانگــەی كــە بــەموعجیزە لەبــەردێكی رەق‌و تــەق هێنامانــە دەرێ. بەڵگەیەكی ئاشكراو نمایان بوو لەسەر بەدەسەڵاتی ئێمەو نیـشانەی تـاك‌و تـەنهایی ئێمــە بــوو، نیــشانەی راســتی پێغەمبــەرێتی پێغەمبەرەكــەمان بــوو، نیــشانەیەكی بەرچاوو بینراو بوو، بەچاو دەبینـراو بەعەقڵ هەستی پـێ دەكـرا، ﴿فَظَلَمُـوا بِهَـا﴾

بڕوایان بەو موعجیزە گرنگە نەکردو پێی کافر بوون، ئاوی خواردنەوەیان لێ قەدەغە کردو پاشان کوشتیانو سەریان بڕی. ئیتر خودا ریشەکێشی کردنو ئاسەواری بڕینەوە.

﴿وَمَا نُرْسِلُ بِالآيَاتِ إِلاَّ تَخْوِيفاً﴾ ئێمە موعجیزەو ئایات نانێرین ئیللا کە دەیاننێرین بۆ ترساندنی ئادەمیزادە لەهاتنی عەزابی بەعەجەلەو دەست لەعاست. بۆ ئەوەی پەندئامێزبنو بترسنو بەخۆیاندا بچنەوەو لەهەڵوێستەکەیان ژێوان ببنەوە، جا: کە موعجیزەکە هاتە دیو ئەوان ئیمانیان نەهێناو ترسیان لێ نیشت ئەوە عەزابیان دێتەسەرو لەناو دەبرێن، ئەمەش دابو نەرێتی خودایەو گۆڕانی بەسەردا نایە!.

بێگومان موعجیزەی ئیسلام بریتییە لەقورئان: کە نامەیەکی ئاسمانی یەو بەرنامەیەکی کامڵو گونجاوە بۆ ژیان، لەگەڵ بیرو عەقڵو دڵ دەدوێ، داخوازی سروشت جێ بەجێ دەکا، بۆ هەموو سەردەمەکان بەکاردێو کۆن نابێ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژو ساڵ دوا ساڵو چەرخ دوا چەرخ چینەکانی ئادەمیزاد دەیخوێننەوەو بڕوای پێ دەکەنو دەیکەنە بەرنامەی ژیانی خۆیان. جا چونکە ئایینی ئیسلام؛ ئایینی حەزرەتی موحەممەدەوە دوا ئایینەو تەواوکەری ئایینەکانەو هیچ دینێکی تر نایە ئەم بسڕێتەوە. دەبێ بەرنامەکەشی بەرنامەیەکی تۆکمەبێو بۆ هەتا هەتایی بێ.

بەڵام موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو بریتی بوون لەخاریقەی مادیو بۆ کاتێکی دیاریکراو بوونو لەگەڵ چینێك دواون کاریگەرییەکەیان تەنیا بۆ ئەو کەسانە بوو: کە موعجیزەکەیان بینیوەو بەس!

شایانی باسە هەموو ئەو بورکانو بومەلەرزەو لافاوو زریانەی بەینە نابەینێك لێرەو لەوێ ڕو دەدەن هەموویان موعجیزەنو بۆ ترساندنی ئادەمیزادە، بۆ ئەوەی پەند وەربگرنو بەخۆیان دا بچنەوە.

لەفـەرموودەی صـەحیحدا هـاتووەو بوخـاریو موسـلیم ریوایـەتیان کـردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الشمس والقمر آيتان من آيات الله، وانهما لاينكسفان لموت أحد ولا لحياته ولكن الله عز وجل يخوف بهما عباده، فاذا رأيتم ذلك فافزعوا الى ذكره ودعائه واستغفاره) بێگومـان خـۆرو مـانگ دوو نیـشانەن لەنیـشانەکانی پەروەردگار، ئەوانە بـەهۆی مـردنو ژیـانی کەسـەوە نـاگیرێن، بـەڵکوو کـە دەگیرێـن ئەوە خودا بەندەکانی خـۆی پـێ دەترسـێنێ. جا: کە بینیتـان خـۆرو مـانگ گیران پەلاماری یادی خودا بدەنو دەست بکەن بەڵێ پاڕانەوەو لالاناوەو نووزانـەوەو داوای لێخۆشبونو عەفووی لێ بکەن!

ئەمجار پێغەمبەر فەرمووی: (يا أمة محمد! والله ما أحد أغير من الله أن يزني عبده أو تزني أمته، يا أمة محمد! والله لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً).

پاشـان پـەروەردگار پێغەمبـەر ﷺ هەڵدەنێ بـۆ ئـەوەی بـەردەوام بـێ لەسـەر چاونەترسی خۆیو بێ پەروا پەیامەکەی خۆی بگەیەنێو لـەهیچ شـتێك نەترسـێ، فەرمووی: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّـاسِ﴾ ئـەی موحەممـەد! یـادی ئـەو کاتـە بکەرەوە: کە نیگامان بۆ ناردیو پێمان راگەیاندی: کە خودای تۆ بالادەسـتە بەسـەر هـەموو ئـادەمیزادان داو بـەزانیاریو ئاگـاداری خـۆی هـەمووی کـۆنترۆڵ کـردونو لـەژێر دەسـەڵاتی ئـەودان، بـەبێ ویـستو ئـیرادەی خـودا نـاتوانن هیچت لێ بکـەنو بڕیاری داوە لەزەرەرو زیـانی ئـادەمیزادان بتپـارێزێو لـەئاکامیشدا بالادەسـتت بکـا بەسەریاندا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاللّـهُ يَعْـصِمُكَ مِـنَ النَّـاسِ﴾المائـدة/٦٧. یـان: کـە مزگێنـی سـەرکەوتنی بـەدری پـێ دەدا دەفـەرموێ: ﴿سَـيُهْزَمُ الْجَمْـعُ وَيُوَلُّـونَ الـدُّبُرَ﴾القمـر/٤٥. یـان دەفـەرموێ: ﴿قُـل لِّلَّـذِينَ كَفَـرُواْ سَـتُغْلَبُونَ وَتُحْـشَرُونَ إِلَـى جَهَنَّمَ﴾آل‌عمران/١٢. هەروا گەلێك ئایەتی تریش لەم بارەوە لەقورئاندا هەن!

﴿وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِلنَّاسِ﴾ ئێمە ئەو شەوڕەوییەی بەتۆمان کردو ئەو بیستن‌و دیتنە گرنگانەی بۆت دەستەبەر بوو ئەوشتە عەجایەبانەی بەچاوی سەر بینیتن: هەر لەبەر تاقی کردنەوەی ئەو خەڵکە بوو ویستمان دەری بخەین کێ موسوڵمانی تەواوەو کێ بێ باوەڕە، ئەو شتانەی شەوی ئیسراو میعراج نیشانی تۆ دران بۆ ئیمتیحان‌و تاقیکرنەوەی ئادەمیزادەکان بوو بەنیسبەت خۆیانەوە، نەك بۆ ئێمە، ئێمە زانیاری بەرو دوامان هەیە دەزانین کێ چیەو کێ چی نیە، پێویستمان بەتاقیکردنەوە نیە.

## بەکورتی :

موعجیزەی تۆ قورئانە، پەیامی ئادەمیزادە بۆ هەتا هەتایە، بەرنامەی هەموو ئەجیالە یەك بەدوا یەکدا، بۆیە ئەو ئەزموونانەی ئادەمیزاد پێیدا تێپەڕی، داخوازی ئەوە بوون ریسالەیەکی بۆ بێ خاریقەی مادی نەبێ بەڵکوو ریسالەیەکی گشتی‌و هەتا هەتایی بێ، ئەویش قورئانی پیرۆزە، ئەو موعجیزە مادییانەی بۆ پێغەمبەر هاتوونە دی کە هەرە گرنگیان رووداوی ئیسراو میعراجە، نەکراوە بەموعجیزەیەکی وا پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بچەسپێنێ، بەڵکوو بۆ تاقی کردنەوەو لێك هەڵاواردنی موسوڵمان‌و بێ باوەڕان بوو. ئەوەبوو دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ باسی شەوڕەوی‌و میعراجی بۆ خەڵکەکە کرد، هەندێ لەوانەی موسوڵمان بوبوون پاشگەزبونەوە، بڕێ موسوڵمان ئیمانیا زیاتر بەهێز بوو کافرەکانیش پتر شێلگیربوون‌و لەسەر کوفری خۆیان زیاتر سوور بوون، کەوابوو ئەو بینینەی لەو شەوەدا خوادا نیشانی پێغەمبەری خۆی دا فیتنە بوو بۆ ئادەمیزادەکان‌و پێی تاقی کرانەوە، موسوڵمانی راست‌و ناڕاستی پێ کەشف کرا، ئیحاطەدانی پەروەردگاربوو بەئادەمیزادان، ئەوە وادەیەك بوو لەخوداوە بۆ پێغەمبەر ﷺ بەئاگاداریی کردن‌و پاراستنی‌و بەسەر خستنی‌و زاڵ کردنی بەسەر دوژمنانی دا.

﴿وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ﴾ ئەو درەختە نەفرین لێکراوەش کە لەقورئاندا باسمان کردوە هەر بۆ تاقیکرنەوەی خەڵکی باسمان کردوە، بۆ ئەوە دەری بخەین کێ خاوەن باوەڕەو باوەڕی زیاد دەکاو کێ بێ باوەڕەو سوورە لەسەر کوفرو بێدینی خۆی؟

ئەوە بوو خەڵکەکە کاتێ ئایەتی ﴿إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ، طَعَامُ الْأَثِيمِ﴾ یان بیست کەوتنە مقۆمقۆو راجیایی یەوە، هەندێکیان کە موسوڵمان بوبوون زیاتر ئیمانیان چەسپاو بڕوایان بەهێزتر بوو، هەندێکیان پێی شێلگیر بوون زیاتر سوور بوون لەسەر کوفری خۆیان، بۆ نموونە ئەبو جەهل وتی: سەیر بکەن (ابن ابي كبشة) مەبەستی پێغەمبەر بوو، هەڕەشەتان لێ دەکا بەوە دەڵێ: ئاگری دۆزەخ بەرددەسوتێنێ، کەچی لەهەمان کاتدا پێی وایە لەناو دۆزەخ دا درەختی ژەقنەموت هەیە!! ئێوەش بۆخۆتان باشباش دەزانن ئاگر چۆن درەخت دەسوتێنێ!!

عەبدوڵلای کوڕی زەیبەعرا وتی: سەیرە موحەممەد بەزەقوم دەمانترسێنێ، جا خۆ زەقوم بریتییە لەخورماو رۆنەکەرە، جا فەرمانی بەکارەکەرەکەی کرد: خورماو رۆنەکەرەیان بۆ هێنا بەهاورێکانی گوت: وەرن زەقوم بخۆن. بەمەش هەندێ لەنەفامان بەتەواوی گومڕابوون!

ئەو نەفامو گومڕایانە بیرێکیان لەوە نەکردەوە: کە لەدونیادا زۆر شت هەیە ئاگر نایانسوتێنێ، ئەوەتا جۆرە حەریرێك هەیە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (الحرير الصخري) ئاگر کاری تێ ناکا، بەڵکوو تا لەناو ئاگردا بێ زیاتر پاڵفتە دەبێ... بۆیە لەوڵاتە پێشکەوتووەکان ئاگر کوژێنەکان ئەو جۆرە پۆشاکە حەریرە دەپۆشن. ئەوەتا بۆخۆیان دەبینن حوشترمورغ پشکۆئاگرو پارچە ئاسنی گەرم دەخواو هیچی لێ نایە. ئەی ئەوەتا لەپێش چاوی خۆیان درەختی مەرخو عیفار دەدرێن لەیەكو ئاگریان لێ پەیدا دەبێ.

لەسـەر زەوی زۆر شـتی ئـاوا سەرسـوڕهێنەر هـەن، لەهەسـارەکانی تـریش دا هەروا، زەوی بۆ خۆی پڕی لەئاگر، تەنیا توێکڵەکەی سـەرەوەی: کـە ئێمـەی لەسـەر دەژین ئاگر نیە، هیچ درەختێك نیە ئـاگری تێـدا نـەبێ، هیـچ بـەردێك نیـە ئـاگری تێدا نەبێ، ئاو بۆ خۆی مادەیەکی ئاگرییـە، نزیکـە هەشـت لەنۆبەشـی ئوکسجینە، بەشـەکەی تـری ئەدرۆجینـە، دەی ئۆکـسجین مادەیـەکی ئـاگراوی بـەنزین ئاسـایە. کەوابوو زەوی ئێمە ئاگرە، ئاوی ئاگرە دارو بەردی پڕن لەئاگر!!

﴿وَنُخَـوِّفُهُمْ فَمَـا يَزِيـدُهُمْ إِلاَّ طُغْيَانـاً كَـبِيراً﴾ کافرەکـان بەهەڕەشـەو عـەزاب دەترسـێنن، بەعـەزابی دونیـاو قیامـەت دەیانترسـێنین کەچـی ترسـاندنەکە زیـاتر گومڕایان دەکاو پتر سوور دەبن لەسەر کوفرو بێـدینی خۆیـان، جـا کەسـانێك ئـەوە حـاڵو وەزعیـان بـێ چـۆن بەبـەجێهێنانی ئـەو مـوعجیزە مادییانـەی پـەڵپیان لێ گرتوون ئیمان دەهێنن؟ ئەوان ئەگەر بەقورئان ئیمان نـەهێنن چۆن بـەموعجیزەو خاریقەی مادی ئیمان دەهێنن؟؟

بۆیە پەڵپەکانمان نەهێنانە دی، حیکمەتو ویستو ئیرادەمان داخـوازی ئـەوە نەبوو وەکوو گەلی نوحو هودو صاڵحو شوعەیب..... لەناویان ببەین.

ئیتر هەندێ لەو بەدرۆخەرەوانە خۆیـان موسـوڵمان بـوونو بوونـە سـەربازی دڵسۆزی ئیسلام هەنـدێکیان بۆخۆیـان بـەکافریی مـردن، بـەڵام وەچـەو نـەوەکانیان موسوڵمان بوون.

## سەرگوروشتەی ئادەم لەگەڵ شەیتاندا فەرمان بەفریشتە بۆ کڕنوش بردن بۆ ئادەم

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ ﴾

**پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە لەدوو لاوەیە:**

١- گرێدان و پەیداکردنی لێکچواندنێك لەنێوان خەم و خەفەتی پێغەمبەر ﷺ بەدەست موشریکەکانەوە و خەم و خەفەتی ئادەم بەدەست ئیبلیسەوە. کە موشریکەکان بەرهەڵستی پێغەمبەریان کرد دەربارەی پێغەمبەرایەتیەکەی و

بەدرۆیان خستەوە، بەتایبەتی کە هەواڵی ئیسراو میعراجی پێدانو، باسی درەختی ژەقنەموتی بۆ کردن ئەوەندەی تر شێلگیربونو پەلپی موعجیزەی جۆراو جۆریان لێ گرت، حەسودییان پێ برد، لوتبەرزییان نواند، دوا بەدوای ئەوە گونجاوبوو: کە سەرگورشتەی حەزرەتی ئادەمو ئیبلیسی نەفرین لێکراو بێنێتە گۆڕێ: کە ئەویش حەسوودیو لوتبەرزیی وای لێ کرد، کڕنوش بۆ ئادەم نەباو فەرمانی خودا بشکێنێ!

٢- ئەوەیە: پەروەردگار لەئایەتی پێشوودا فەرمووی ﴿فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلاَّ طُغْيَاناً كَبِيراً﴾ لێرەدا باییسی طوغیانەکە دێنێتەوە: کە بریتییە لەوتەی ئیبلیس کەگوتی: ﴿لأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلاَّ قَلِيلاً﴾.

بەم جۆرە لەژێر رۆشنایی ئەو شتە عەجایبانەی پێغەمبەر ﷺ شەوی میعراج چاوی پێکەوتن، ئەوەی بینی کە بینی لەعالەمی باڵا، درەختی نەفرین لێکراویشی بینی: کە خۆراکی شوێنکەوتوانی شەیتانە؛ بەشوێن ئەو سەرگورشتەو روداوەدا دیمەنی ئیبلیسی نەفرین لێکراو دێنێ: کە هەڕەشە دەکا لەنەوەی ئادەم بەگومڕاکردنو لەخشتە بردنیان.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! سەرگوزەشتەی ئادەمو ئیبلیس بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، باسی دوژمنایەتی شەیتان دەرحەق بەئادەمو نەوەکانی بۆ ئوممەتەکەت بگێڕەوە، پێیان رابگەیەنە: کە دژایەتی نێوان ئادەمو شەیتان کۆنو چەسپاوە، لەو رۆژەوە ئادەم گیانی بەبەردا کراوە، ئەم دوژمنایەتییە بەرپابووە، تا دونیا دونیایە بەردەوام دەبێ!

ئەوە بگێڕەوە بۆ ئوممەتەکەت: کە ئێمە فەرمانمان بەفریشتەکان کرد: کڕنووشی رێزو خۆشەویستی بۆ ئادەم بەرن، رێزو تەقدیری بۆ دابنێن، نەك سوژدەی عیبادەتو تەقدیس.

﴿فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ﴾ هەموو فریشتەکان جگە لەشەیتان سوژدەی ڕێزو خۆشەویستیان بۆ ئادەم ئەنجام دا، شەیتان فەرمانی خودای شکاند، لوتبەرزی نواند، حەسوود بوو، سوژدەی نەبردو فەرمانی خودای ڕەتکردەوە. خۆی بەزل زانیو ئادەمی بەهیچ لەقەڵەم دا، بەتەوسەوە وتی: ﴿قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِيناً ؟﴾ ئایا دەگونجێ من کڕنووش بەرم بۆ ئادەم لەکاتێکدا ئەو لەقوڕ دروستکراوە من لەئاگر دروست کراوم؟! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ص/٧٦. حەسوودییەکەی شەیتان ئاشکراو نمایانە؛ باسی ئەوە دەکا: کە ئادەم لەقوڕ دروست کراوە بۆ ئەوەی لەڕێزی ئادەم کەم بکاتەوە، وەڵێ باسی ئەوە ناکا کە ئەو قوڕە نەفخەی گیانێکی لەخوداوە پێ بەخشراوە بەو نەفخە گیانی یە شیاوی ئەو ڕێزو نرخە بووە: کە فریشتەکانو شەیتانیش سوژدەی ڕێزو تەقدیری بۆ بەرن. حەسوودیو خۆبەزلزانی شەیتان گەییشتە ئاستێك فەرمانی خودای شکاند، بەربەرەکانی پەروەردگاری کرد! بەویەڕی جورئەتو کوفرەوە بەرەنگاری خودا بووەوە ﴿قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ ؟﴾ وتی: پێم بڵێ: هۆی چیە ئەم زەلامەت بەسەرمندا تەفضیل داوە؟ بۆدەبێ من سوژدە بۆ ئەو بەرم؟ خۆ من لەو بەڕێزترم، کەی ئەمە یاساو قانوونە خاوەن ڕێز کڕنووش بۆ بێ ڕێز بەرێ؟

ئەوەتا شەیتان بەخەیاڵی خۆی ستەمی پاڵ خودا داوە، پێی وایە ئەو لەئادەم ڕێزدارترە، چونکە ئەو لەئاگر دروست کراوەو ئادەم لەقوڕ بەدی هێنراوە، قوڕ لەئاگر پەست ترە..! ئەمە بیروبۆچوونی شەیتان بوو، ئەگینا ئەو مادەی شەیتانی لێ دروست کراوە ئەو مادەی ئادەمی لێ دروست کراوە هەموویان خودا دروستی کردوون خەڵقندەی خودانو هیچیان لەهیچیان ڕێزدارتر نین، بەڵکوو دەتوانین بڵێین: گڵ بەسوود ترە گڵ عونصورێکی سەرەکییە بۆ کشتو کاڵو پێکهاتەی بیناو ئاوەدانی، ئاگر هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سوتاندنو وێران کردن!

لەلایەکی ترەوە شەیتان بێ ئاگا بوو لەوەی: کە ئادەمیزاد وەکوو چۆن ئامادەباشی تێدایە بۆ شەڕ، ئامادەباشیشی تێدایە بۆ خێرو هیدایەت. بێ ئاگا بوو لەو حاڵەتەی ئادەمیزاد: کە پەیوەست دەبێ بەخوداوەو بەرز دەبێتەوەو شکۆمەندی بەدەست دێنێو پارێزراو دەبێ لەگومڕایی! بیری بۆ ئەوە نەچوو: کە ئەمە زێدە ڕێزێکەو ئادەمیزاد بەرز دەکاتەوە بەسەر کەسێکدا کە خاوەنی یەك سروشتەو یەك جۆر ئامادەباشی تێدایە.

﴿لَئِنْ أَخَّرْتَنِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ سوێند بێ ئەگەر مۆڵەتم بدەیو بمهێڵیەوە تا ڕۆژی قیامەت هەموو نەوەکانی ئادەم گومڕا دەکەم، ڕێگایان لێ تێك دەدەم، سەریان لێ دەشێوێنم، مەگەر کەمێکیان نەبێ کە نەتوانم کاریان لێ بکەم ئەگینا زوربەی زۆریان هەڵدەخەڵەتێنم!

ویستو ئیرادەی خودا وا داخوازبوو: کە ڕێگا بۆ مامۆستای شەڕ ئاچوغ بکا، دەستی بەردەستی نەهێنێو دەسەڵاتی تەواوی بداتێ، هەموو هەوڵەکانی بخاتە گەڕو چی بۆ دەکرێ بیکا. ﴿قَالَ اذْهَبْ فَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَوْفُوراً﴾ بڕۆ هەوڵی خۆتیان لەگەڵ بدە، بڕۆ وا ئیزنم دای، چیت بۆ دەکرێ دەربارەی گومڕاکردنیان دەست بەکاربە. ئەوان عەقڵو ئیرادەیان دراوەتێ دەتوانن بەویستی خۆیان شوێنت بکەون، یان پشتت تێ بکەن، جا هەر کەسێکیان شوێنت کەوتو لایەنی گومڕایی هەڵبژاردو ڕێبازی هیدایەتی فرامۆش کرد، ڕوی لەبانگەوازی ڕەحمان وەرگێڕاو وەڵامی بانگی شەیتانی دایەوە، چاوی خۆی لەئاست ئایاتی بونەوەر نوقاندنو گوێچکەی خۆی لەئاست بانگی حەق کەڕ کرد، ئەوە تۆشو شوێنکەوتوانت باش بزانن دۆزەخ شوێنو جێگاتانە، جەزای پڕاو پڕی کارو هەڵوێستتانە، بەو ئاگرە سامناکە تۆڵەی گومڕابوون لەخۆتو ئەوانەی شوێنت کەوتوون وەردەگرینەوە، سزاتان بۆ سووك ناکەینو لێی کەم ناکەینەوە. وێنەی ئەم

ئایەته ئایەتێکی تره: که دەفەرموێ: ﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ، إِلَى يَومِ الْوَقْتِ الْمَعْلُوم﴾الحجر/٣٧-٣٨.

هەسته برۆ هەر لەئێستاوه بکەوه شەڕ لەگەڵیان هەموو هێزو توانای خۆت بەکار بێنه ﴿وَاسْتَفْزِزْ مَنْ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ هەموو هێزو توانایەکت بخەره گەڕ بۆ بانگ کردنیان بۆ تاوانکاریی‌و یاخی بوون لەخودا، بەهەموو جۆرێك خەریکیان به هەڵیان خەڵەتێنه، بەوەسوەسەو ختوکەدان، تاوان‌و تاوانکارییان لەپێش چاو جوان بکه، هەموو وەسیلەیەکی بۆ گومڕایی‌و دەورەدان‌و زاڵبوون بەسەر دڵ‌و هەست‌و شعوریاندا بخەره مەیدان.

﴿وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ هەرچی دەست‌و دائیرەت هەیه، هەرچی لەشکری سەربازو سوارەو پیادەت هەیه، هەموویان بخەره گۆڕەپانی شەڕەوه دژی ئادەمیزاد، ئەمه ئیستیعارەو تەمثیله، مەبەست ئەوەیه: هەرچی دەتوانی بۆیان بەکار بێنه، هەرچی فرت‌و فێڵ‌و تەڵەکەبازی هەیه لەدژیان بیخەرەکار. هەرچی هێزو توانات هەیه هیچی مەهێڵەوەهەمووی بخەره کار. جا مەبەست بەو لەشکرو سوارەو پیادەی لەشکره. گوێڕایەڵەکانی شەیتان بن لەجندۆکەو ئادەمی: ئەوانەی بەویستی ئەو دەجووڵێنەوە. وەکوو ئیبنو عەبباس‌و موجاهید و قەتاده ریوایەتیان کردوه. یان مەبەست دەست‌و پێوەندەکانیەتی لەتیرەی جندۆکه. بەهەر جۆرێك بێ مەبەست لەو شێوه فەرمانه، هەڕەشه کردنه لەشەیتان نەك فەرمان کردنه، چونکه خودا فەرمان بەخراپەکاری ناکا. واته: ئەی شەیتان! برۆ چیت لەدەست دێ بیخەره گەڕ، سەرەنجامی خۆت‌و شوێنکەوتوانت دۆزەخه!!

﴿وَشَارِكْهُمْ فِي الأَمْوَالِ وَالأَولادِ﴾ هاوبەشییان بکه لەماڵ‌و منداڵدا: که هەردوکیان کۆڵەکەی ژیانن، هەڵیان بنێ بۆ ماڵ کۆکردنەوەو خەرجکردنی لەرێگای ناڕەواو ستەمکاریدا، هەڵیان بنێ بۆ دزی‌و داگیرکردن‌و غەششاشی‌و تەرازوبازی‌و زیناکردن‌و زۆڵ خستنەوەو دوایی کوشتنیان‌و زیندەبەچاڵ‌و کردنیان‌و لەکۆڵ خۆ

کردنەوەیان هەڵیان بنێ بۆ قەڵاچۆکردنی یاسای خودایی دەربارەی زەواج و تەڵاق و شیرەخۆری و نەسەب و نەفەقە و بەخێوکردن و پەروەردەکردن.

هاوبەشی کردن لەماڵ و ساماندا وەکوو ئەوە لەسەردەمی نەفامی دا هەندێ لەماڵەکەیان تەرخان دەکرد بۆ بتەکانیان کە ئەمە لەراستی دا بەشی شەیتانە! هاوبەشی کردن لەمنداڵەکانیاندا ئەوە بوو هەندێ لەمنداڵەکانیان دەکردە نەذرو فۆتۆ بۆ بتەکانیان، یان دەیانکردنە کۆیلە بۆ بتەکان، وەکوو (عبد اللات)و (عبد المناف). جاری وا هەبوو هەر راستەوخۆ دەیانکردە کۆیلەی شەیتان وەکوو (عبد الحارث) هەر ماڵ و سامانێك لەحەرامەوە هاتبێ یان بەناحەق تەصەروفی تێدا بکا، یان لەحەرامدا خەرج بکرێ، هەر منداڵێك لەحەرامەوە پەیدا بووبێ ئەوە لەراستی دا بەشی شەیتانی تێدایە.

شەیتان رێگەی پێ دراوە: کە هەرچی هۆکار هەیە بیخاتە گەڕ تەنانەت وادەو بەڵێنی رازاوەش. ﴿وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمْ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُوراً﴾ وادەو بەڵێنی درۆیان پێ بدە، پێیان بڵێ: بتەکانتان شەفاعەتتان بۆ دەکەن، تاوان بکەن خودا غەفورو رەحیمە، لێتان خۆش دەبێ، مامەڵەی سودو ریبا بکەن دەوڵەمەند دەبن، زەکات مەدەن با هەژار نەکەون، پەلە لەتۆبە کردن مەکەن بەکاڵەخۆ هێشتا زووەو کاتی نەهاتووە. بەتەما شەفاعەتی پێغەمبەر بن و گوێ مەدەنێ، دونیا بخۆی حازرە، گوێ مەدەنە قیامەت هێشتا دوورە... گەلێ وادەی تری لەم جۆرە. جا: کە رۆژی قیامەت دێ و دادگایی دەست پێ دەکاو درۆکانی دەردەکەون دەڵێ: جا بڵێم چی ﴿إِنَّ اللَّـهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾ابراهيم/٢٢.

بێگومان بەهێزترین وادەو هۆکاری هەڵخەڵەتاندنی ئادەمیزاد لەلایەن شەیتانەوە وادەی عەفوو لێخۆشبوونی خودایە لەتاوان، ئەمە فراوانترین دەرگایە شەیتان لێیەوە دەچێتە ناو دڵی ئەوانەوە: کاتێك ناتوانێ لەروی تاوانی ئاشکراوە لەخشتەیان بەرێ، ئەو کاتە شەیتان بۆ ئەم جۆرە کەسانە باری فێڵەکەی دەگۆڕێ و

بەنەرمی دەچێتە ناو دڵیانەوە، تاوانیان لەپێش چاو جوان دەکاو رەحمەت‌و بەزەیی خوداو لێخۆشبوونی زۆرو زەبەندەو بەرفراوانی رادەنوێنێ‌و بەم جۆرە لەخشتەیان دەبا.

﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾ بێگومان بەندە راستاڵەکانی من پارێزراون، تۆ ئەی شەیتان! ناتوانێ ئەوانە لەخشتەبەرێ، دەسەڵاتت بەسەریاندا ناشکێ، کەسێك دڵی پەیوەست بێ بەخوداوە، روبکاتە خودا، دەستی خۆی بە(عوروەتولوثقا)وە بگرێ، کەسێك نەفخەی یەزدانی ناو دڵی روناك کردبێتەوە هەرگیز شەیتان ناتوانێ کاری لێ بکاو هەڵی خەڵەتێنێ، چونکە ئەو دڵە روناکی نۆری ئیمانی تێدایە. ﴿وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً﴾ کیفایەتە: کە خودای تۆ پارێزەرو چاودێر بێ، یارمەتی موسوڵمانان بدا نەهێڵێ شەیتان لەخشتەیان بەرێ؛ بییان پارێزێ، خودا بەتوانایە فرت‌و فێڵی شەیتان پووچەڵ دەکاتەوە.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە پارێزراو کەسێکە خودا بیپارێزێ، هەموو کاتێکیش ئادەمیزاد ئاتاجی کۆمەکی پەروەردگارە.

## برێ لەنیعمەتەکانی خودا بەسەر ئادەمیزاددا

﴿ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزۡجِى لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِى ٱلۡبَحۡرِ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ أَعۡرَضۡتُمۡۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمۡ أَن يَخۡسِفَ بِكُمۡ جَانِبَ ٱلۡبَرِّ أَوۡ

يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمۡ أَمِنتُمۡ أَن يُعِيدَكُمۡ فِيهِ تَارَةً أُخۡرَىٰ فَيُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ قَاصِفٗا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغۡرِقَكُم بِمَا كَفَرۡتُمۡ ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ عَلَيۡنَا بِهِۦ تَبِيعٗا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِيلٗا ﴿٧٠﴾

لەئایەتی پێشوودا ئەوەی ڕاگەیاند: کە هەر خودا خۆی پارێزەرو چاودێری بەندە ڕاستاڵەکانیەتی، لەشەڕی شەیتان دەیانپارێزێ، ڕێگە نادا تووشی نەگبەتییان بکا. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا هەندێ نیعمەتی خۆی بەسەر بەندەکانی دا ڕادەنوێنێ‌و ئەوەمان بەگوێچکەدا دەدا: کە پێویستە ئادەمیزاد هەموویان هەموو کات شوکرانە ژمێربوونایەو کوفرانی نیعمەتەکانیان نەکردایە.

ئەوە شەیتانە بەخۆی‌و هەڵوێستیەوە، هەردەم بۆ ئادەمیزاد لەبۆسەدایەو دەیەوێ تووشی ئەزیەت‌و نارەحەتییان بکا، کەچی وێڕای ئەوەش کەسانێك هەن شوێن ئەو دوژمنە سەرسەختە دەکەون‌و پابەندی فەرمانەکانی، گوێی بۆ دەگرن، بەقسەی ئەو پشت لەبانگەوازی خودا هەڵدەکەن، بەپیر بانگەوازی ئەو خودایەوە ناچن کە بەبەزەیی یە بۆیان‌و یارمەتییان دەدا، پێداویستی ژیانیان بۆ دابین دەکا، لەکاتی تەنگانەو ناخۆشی دا بەهانایانەوە دێ‌و ڕزگاریان دەکا، دەفەرموێ: ﴿رَّبُّكُمُ الَّذِي يُزْجِي لَكُمُ الْفُلْكَ فِي الْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ﴾ خودای ئێوە پەروەردگارێکی

ئەوتۆیە کەشتیو گەمێکان دەڕۆیەنێ، بەقودرەتی لەبن نەهاتووی خۆی هێزو هۆکاری ڕۆیاندنی ئەو گەمی زەبەللاحانەی بۆ فەراهەم هێناون، خستوویەتیە دڵتانەوە: بەهۆی وزەی با، یان بوخار، یان کارەبا، یان ئەتۆمەوە ئەو کەشتیە زەبەللاحانە ، لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر ڵێ بخورن. خۆتان و کالاتانی پێ بگوێزنەوە، بازرگانیو گەشتو گوزار بکەن، ﴿إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً﴾ بەراستی پەروەردگار بۆ ئێوە بەرەحەمو بەزەیی یە، سەرباری ئەو هەموو سپڵەییو کوفرانی نیعمەتو ناشکوریانەتان کەچی خودا فەرامۆشتان ناکاو هۆکاری ژیانتان بۆ دابین دەکا. رزقو ڕۆژیتان دەدا، لەتەنگانەدا بەفریاتان دەکەوێ.

تەعبیرە قورئانیەکە لەوەتەری حەساس دەدا، دڵ دادەخورپێنێ بەئادەمیزادان دەزانێنێ: کە قودرەتی خودایە کەشتییان بۆ دەڕویەنێ، پاڵی پێوە دەنێ، کێشی دەکا، بەگەڕی دەخا بەسەلامەتی بەناو دەریاو ئوقیانووسەکاندا کاڵاو بەروبوومی خۆیانی پێ دەگوێزنەوە..!

﴿وَإِذَا مَسَّكُمْ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَنْ تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ هەرکاتێ لەدەریادا تووشی مەترسییەك بێن، تەنگو چەڵەمەیەکتان بێتە پێش، جگە لەخودای تاكو تەنها هەموو ئەو خودایانەی بەندایەتییان بۆ دەکەنو بەخەیاڵی خۆتان فریادرەسن لەبیرتان دەچنەوە هیچیانتان بەخەیاڵدا نایە. هیچتان هاوار ناکەنە فریشتەو بتو جندۆکەو عوزەیرو عیساو ئەمو ئەو، هانا بۆ کارڵو مێشێلو تیتۆو کەمال ئەتا تورکو جەمال عبدالناصر.... هتد نابەن، جگە لەخودا کەستان بەبیردا نایەو هەر ئەو بە فریادرەس دەزانن. لەکاتی تەنگانەدا دڵەکان مشتو ماڵ دەکرێن دەبنە حەقناسو حەقپەرست.

دەگێڕنەوە: دەڵێن: عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل: کە فەتحی مەککە کرا لەترسی پێغەمبەر هەڵهاتو چووە سەر دەریاو سواری کەشتی بوو بیەڕێتەوە بۆ وڵاتی حەبەشە، لەناو دەریادا ڕەشەبایەکی بەهێزو شەپۆلی بێ ئامان لێی دانو

کەوتنە مەترسییەوە، هەندێ لەسەرنشینانی کەشتییەکە وتیان: هیچ شتێك دادمان نادا جگە لەوە هانا بۆ خودا بەرینو لێی بپارێینەوە. عەکرەمە بەخۆیدا چووەوەو لەدڵی خۆیدا وتی: جا ئەگەر لەدەریادا جگە لەخودا کەس فریای ئێمە نەکەوێ، ئەوە لەوشکانیشدا جگە لەخودا کەسی تر فریادرەس نیە. ئەمجار وتی: خودایە! پەیمان بێو بەڵێن دەدەم ئەگەر ئەمجارە رزگارم بێ یەکسەر دەچم بۆ لای موحەممەدو دەست دەخەمە دەستییەوەو ئیمان دەهێنم! جا کە لەدەریا رزگاریان بوو عەکرەمە وادەی خۆی بەجێ هێناو چوو بۆ لای پێغەمبەرو ئیمانی هێناو موسوڵمانێکی خوداپەرستی راستاڵی لێ دەرچوو.

## بەکورتی :

ئێوە کە لەدەریادا تووشی تەنگانەیەك دێن هانا بۆ خودا دەبەنو بەدڵ هاواری لێ دەکەنو بەدڵسۆزی بەندایەتی بۆ رادەگەیەنن، کەچی ﴿فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ﴾ کە خودا بەهاناتانەوە هاتو رزگاری کردنو کەوتنە وشکانیو لەتەنگانەکە رزگار بوون روو لەخودا پەرستیو خودا ناسینەکەتان وەردەگێرنو دەگەڕێنەوە سەر حاڵەتی کوفرو بێدینی خۆتان، دەست دەکەنەوە بەهاوەڵ دانان بۆ خودا!

﴿وَكَانَ الإِنسَانُ كَفُوراً﴾ سروشتی ئادەمیزاد وایە کە زوزو نیعمەتەکانی خودای لەبیربچنەوە، کوفرانی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا بکاو سپڵەو پێنەزان بێ!

ئەمجار هەڕەشە لەئادەمیزاد دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنتُمْ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ الْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِباً ثُمَّ لا تَجِدُوا لَكُمْ وَكِيلاً ؟!﴾ ئایا ئێوە پێتان وایە: هەر کە لەدەریا رزگارتان بوو کەوتنە وشکانی ئیتر لەتۆڵەو عەزابی خودا رزگارتان بووە؟؟ ئایا ئێوە پێتان وایە خودا ئەگەر مەیلی لێ بێ ناتوانێ سزاتان بدا؟ ئایا ئێوە

دڵنیان لەوەی: کە خودا بەزەویدا رۆتـان چێنێ‌و بەئەرزدا بتانباتـە خـوارێ؟ یـان هـەر بەزەوییەکـەوە رۆتـان بـچێنێ؟ یـان ئەگـەر مـەیلی لێ بـێ لەئاسمانـەوە بەردەبارانتان بکاو بەخڕکە بەرد بتانکوژێ؟!

وەکوو ئەوەی لە گەلی لووط کرد. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەی پـێ دەکـاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِباً إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ﴾القمـر/٣٤. ئـەمجار کەستان دەست نەکەوێ هانای بۆ بەرن‌و کەس نەبێ رزگارتان بکا؟!؟

﴿أَمْ أَمِنتُمْ أَنْ يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَى فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفاً مِنْ الرِّيحِ فَيُغْرِقَكُمْ بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَـا بِـهِ تَبِيعـاً﴾ ئـەی پـشت هـەڵکردووەکان! ئـەی ئەوانـەی لەکاتی تەنگانەدا ئیعتیرافتان بەخودایەتیمان کردو، کە کەوتنە فـەرەحی‌و وشـکانی یەوە ژێوان بوونەوە! ئایا دڵنیان لەوەی جارێکی تر بتانباتەوە بۆ ناو دەریا، جا لەو کاتەدا: کە ئێوە سواری کەشتی دەبن، رەشـەبایەکی تونـدو تیـژتان بۆسـەر بنێـرێ، هەرچی بکەوێتە بەر، تێکی بـشکێنێ‌و وێرانـی بکـا، ئـەمجار لـەئاکامدا نقوومی نـاو دەریاتان بکاو بتانخنکێنێ، بەهۆی کافربوونتانەوە! پاشـان کەسـتان دەسـت نەکـەوێ داکۆکیتان لێ بکا، داواکار بێ لێمان بەوەی بەسەرمان هێنان!

بێگومان ئادەمیزاد هەموویان، هەموو کاتێك لەهەموو شوێنێك لەدەریادا بـن یان لەوشکانی دا، لەدەست پـەروەردگاردان، ئـەوان وەکـوو چـۆن لـەدەریادا لەدەست خودادان لەوشکانیشدا بەهـەمان جـۆر لـەژێر چـنگی قـودرەتی ئـەودان. دەی چـۆن دڵنیا دەبن لەقارو غـەزەبی ئـەو خـاوەن دەسـەڵاتە بـێ باکـە؟ چـۆن لـەوە ناترسـێن خودا بەزەویدا بتانباتە خـوارێ، بومەلـەرزەو بورکـان لەژێرتانـەوە هەڵبـستێ، یـان زریان‌و عاصیفەیەك بنێرێ بۆ سەرتان ئاوو قوڕو بەردو دارتان پێدادا؟ بەفتارەتان بەرێ‌و کـەس نـەبێ لەسـەرتان بـەجواب بـێ‌و داکۆکیتـان لێ بکا؟ یـان چـۆن دڵنیـان لەوەی: کە جارێکی تـر سـەرلەنوێ ناتانباتـەوە بـۆ نـاو دەریـاو ئـەو کاتـە شـەپۆل‌و

رەشەباو زریانتان بۆسەر بنێریو نقوومی ناو دەریاتان بکا بەهۆی بێ باوەڕیو بێ ئیمانیتان؟

ئای لەو بێ ئاگاییو نەفامییەی ئادەمیزاد تێیدایە؛ ڕو لەخودا وەردەگێڕنو پێی کافرنو سوپاسی نیعمەتەکانی ناکەن، کەچی لەتۆڵەو سزاشی ئەمینن، لەکاتی تەنگانەدا روی تێدەکەنو هانای بۆ دەبەنو دەیناسن، کەچی کە لەتەنگانەکە رزگاریان بوو هەڵدەگەڕێنەوە، بەخەیاڵی خۆیان جارێکی تر موحتاجی خودا نابنەوە!

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ بێگومان ئێمە ڕێزمان لەئادەمیزاد ناوە، بەسەر زۆر لەمەخلووقاتی خۆماندا، باومان داوەتێ، شێوەو روخساری جوانمان پێ بەخشیوە، زانستو زانیاریمان فێر کردوە. لەسروشتی دا گڵو نەفخەی یەزدانی تێدایە، ڕێزمان لێناوە بەوە ئامادەباشی ئەوەمان تێدا بەدی هێناوە کە بتوانێ زەوی ئاوەدان بکاتەوە، تێیدا هەڵسوڕێو تێبکوشێ بۆ وەدەست هێنانی پێداویستی ژیان، عەقڵو هۆشمان پێداوە فێری پیشەسازیو کشتو کاڵ کردنو چیوداریو شتی تر ببێ ڕێزمان لێناوە بەوە: کە فریشتەکانو هەموو بونەوەر ئەو پێشوازییە گەورەیان لەئادەم کرد، کڕنووشیان بۆ برد، ڕێزمان لێناوە بەوە ئەم ڕێزلێنانەمان لەنامەی خۆمان راگەیاندوەو بەگوێچکەی بوونەوەرماندا داوە.

﴿وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ دەسەڵاتی ئەوەمان پێ بەخشیوە هێزو تواناکانی ناوبوونەوەر بۆخۆی رام بکاو بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بێنێ. لەوشکانی دا بەگوێرەی رۆژگار دەتوانێ سواری وڵاغبەرزەو گوێدرێژو هێسترو گالیسکەو ئوتومبێل و قەتار ببێ، لەهەوادا سواری تەیارەو ساروخ ببێ لەدەریادا سواری کەشتیو گەمێی جۆراو جۆر ببێ!

﴿وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ رزقو رۆزیمان داونێ لەبەروبومی کشتو کاڵو میوەی درەختو گۆشتو شیری ئاژەڵ جۆرەها خواردەمەنیو خۆراکی تر، هەروا

شێوەو روخساری جوانمان پێ بەخشیون پۆشاکی جوانو رازاوەمان بۆ فەراهەم هێناون.

بەکورتی: وشەی (الطیبات) هەرچەندە خواردنو خواردنەوەی پاكو بەتام دەگەیەنێ وەلێ هەموو جوانیو رازاوەیەکی تری ژیان دەگرێتەوە.

﴿وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ زێدە رێزمان داونیو بەسەر زوربەی دروستکراوانی خۆماندا پاساومان داونەوە، دەسەلاتی ئەوەمان داوە بەئادەمیزاد: کە دەتوانێ زوربەی گیانلەبەرانی تر بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکار بێنێ، عەقلو هۆشمان پێداوە، پاداشو جەزای کردەوەکانی دەدرێتەوە.

رێزمان داونێ بەوە کردومانن بەئاوەدانکەرەوەی زەوی، رێزمان داونێ بەوە کە لەسروشتیاندا ئامادەباشی جۆراو جۆرمان رسکاندوە.

کە دەفەرموێ: (علی کثیر) بۆ ئەوەیە فریشتە چەرت بکا، چونکە تێکرای ئادەمیزاد لەتێکرای فریشتە رێزدار تر نیە.

هەرچەندە هەندێ لەموفەسسرین ئەم ئایەتە دەکەنە بەلگە لەسەر ئەوە کە جنسی ئادەمیزاد لەجنسی فریشتە رێزدارترە فەرمودەیەکی پێغەمبەریش ﷺ دەکەنە پالپشتی بۆچوونەکەیان.

طەبەرانی لەعەبدوللای کوڕی عومەرەوە لەعەبدورەزاقەوە ئەویش لەزەیدی کوڕی ئەسلەمەوە بەمەوقوفیو ئیبنو عەساکیر لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە بەمەرفوعی، فەرمودەکەیان ریوایەت کردووە، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الملائكة قالت: یاربنا أعطیت بني آدم الدنیا یأکلون فیها ویشربون ویلبسون، ونحن نسبح بحمدك، ولا نأكل ولا نشرب ولا نلهو، فكما جعلت لهم الدنیا، فاجعل لنا الآخرة، قال: لا أجعل صالح ذریة من خلقت بیدي كمن قلت له كن فیكون).

وەڵێ زوربـەی زانایـانی ئیـسلام پێیـان وایـە: تێکـڕای فریـشتە لـەتێکڕای ئادەمیزاد ڕێزدار ترن، بەڵام تاکە تاکەی ئادەمیزاد لەفریشتە ڕێزدارترن، بۆ نموونە حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەفریشتەکان ڕێزدار ترە.

## حاڵ و وەزعی ئادەمیزادەکان لەگەڵ پێشەوایانی خۆیان لەرۆژی قیامەت

﴿ يَوْمَ نَدْعُواْ كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَٰمِهِمْۖ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلٗا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلْأٓخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴿٧٢﴾ ﴾

پاش ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا باسی ڕێزلێنانی ئادەمیزادی کرد نیعمەتـە جۆراو جۆرەکانی خۆی بەسەر ئادەمیزاددا لەژیانی دونیادا ڕانواند، دێتە سەر باسی قیامەتو حاڵو وەزعی ئادەمیزادان لەو ڕۆژەدا، هەندێکیان خۆشبەختو کامەرانو هەنـدێکیان بەدبـەختو مـاڵوێران، ئـادەمیزاد تێکـڕا کـێش دەکـرێن بـۆ دەشـتی مەحشەرو لەو سارایەدا حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ، هەر کەسە بـەناوی ئـەو نامەیـەی کردەوەکـانی دونیـای تێـدا تۆمـار کـراوە بـانگ دەکـرێ، یـان بـەناوی پێغەمبەرەکەیەوە یان بەناوی ئەو کیتابەی پێغەمبەرەکەی پەیڕەوی کـردوە بـانگ دەکرێ، بانگیان لێ دەکرێ ئەی نەتەوەی ئیبراهیم! ئەی گەلی موسا! ئەی گەلی عیسا! دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ﴾ ئـەی موحەممـەد! باسـی ئـەو ڕۆژە بـۆ

گەلەکەت بکە: کە هەموو گەلو نەتەوەیەك بەناوی نامەی کردەوەکانیان یان بەناوی پێغەمبەرەکەیانەوە، یان بەناوی ئەو کتێبە ئاسمانییەی پێغەمبەرەکەیان کاری پێ کردوە بانگیان دەکەین‌و حیساب‌و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکەین، لەو رۆژەدا باسی نژادو رەچەڵەك لەگۆڕێ نامێنێ، عەشیرەت‌و هۆزو خێڵ چ رۆڵێکیان نیە، ناگوترێ: کوڕی فلان کچی فلتان، هۆزی فلان‌و فیسار، ناگوترێ: کێ کوردە یان کێ عەرەبە یان کێ فارسە یان کێ...هتد بابێ، بەڵکوو هەر کەسە بەناوی پێغەمبەرەکەیەوە یان بەناوی نامە ئاسمانی یەکەی کە پێغەمبەرەکەی کاری پێ کردوە بانگ دەکرێن.

دەشگونجێ مەبەست بە(امامهم) لەئایەتەکەدا ئەو پێشەوایانە بن کە خەڵك لەدونیادا شوێنیان کەوتوون، خاوەن باوەڕان شوێن پێغەمبەران‌و بەرنامەکانیان کەوتوون، گرۆهی کوفرو بێ باوەڕانیش شوێن پێشەوایانی خۆیان کەوتوون، شوێن هی وەکوو فیرعەون‌و نەمرودو مارکس‌و میشێل کەوتوون وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾القصص/٤١. بەڵام رای پەسند ئەوەیە: کە مەبەست بە(امامهم) نامەی کردەوەکانیان بێ، چونکە دوابەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَأُوْلَئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَابَهُمْ﴾ جا ئەگەر کەسێك لەو بانگ کراوانە نامەی عەمەلی بدرێتە دەستی راستی، ئەوە ئەوانە نامەی کردەوەکانی خۆیان بەکەیفخۆشی‌و تەڕدەماخییەوە دەخوێننەوە، دڵیان خۆش دەبێ بەبینینی کردەوە باشەکانیان کە لەناو تۆمارگای کردارەکانیاندا چەسپاوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيَهْ﴾الحاقة/١٩.

پاداشی کردەوەکانیان وەردەگرنەوەو ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلاً﴾ کەمترین شت لەکردەوەکانیان کەم ناکرێتەوە، (فتیل) بەو داوە باریکە دەگوترێ: کە لەناو

قەڵـشی دەنکـە خورمادایـە، بەنموونـە دەیهێننـەوە بـۆ کـەمترین شـت! وەکـوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْئاً﴾مريم/٦٠.

تیرمیذیو حافیظ؛ ئەبوبەکری بەزاز لەئـەبو هـورەیرەوە لەپێغەمبـەرەوە ﷺ ریوایەت دەکەن کە دەربارەی ئایەتی ﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ﴾ فـەرمووی: ئـەو رۆژە یەکێك لەو باونگکراوانە بانگ دەکرێ نامەی کردەوەکانی دونیای پێ دەدەرێ، بـاڵای بـەرز دەبێتـەوە، دەمو چـاوی سـپی دەبـن، تـاجێکی لوئلـوئی دەخرێتـە سەرسـەریو دەگەڕێتـەوە بـۆ لای هـاوەڵانیو لـەدوورەوە دەیبینـنو دەڵێن: خودایـە ئەوەمان بۆ بێنە، پیرۆزیمان بۆ بخەرە ناو ئەوەوە، کابرا دێتە ناویانو پێیـان دەڵێ: موژدەتان لێ بێ بۆ هەر یەکێك لەئێوە ئەمە هەیە.

ئەوەی لەدونیادا کافر بێ کە نامەی پـێ دەدەن رووی رەش دەبـن بـاڵای بـەرز دەبێو هاوەڵانی چاویان لێـی دەبـێ، دەڵێن: پـەنا بـەخودا لـەو روو رەشـە، خودایـە نەیهێنیـە لای ئێمـە، دێ بـۆ لایـان هـەموویان دەڵێن: دەك ریـسوابێ ئـەویش دەڵێ: دووربن لەرەحمەتی خودا بۆ هەر یەکێ لەئێوە ئەمە هەیە.

﴿وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِـرَةِ أَعْمَـى وَأَضَـلُّ سَـبِيلاً﴾ کەسێك لـەم ژیانی جیهانەی دا کوێر بێ، لەئاستی بەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگار، چاوی خـۆی بنـوقێنێو سـەیری ئایەتـەکانی بوونـەوەر نـەکا ئـەوە لەقیامـەتیشدا کوێرو کـوتر دەبێ، رێگای رزگار بوونی دەست ناکەوێ، بەڵکوو لەقیامـەتدا باشـتر رێگـای لێ گـوم دەبێ! چونکە هیوای لادان لەگومڕابوون نامێنێو کار لەکار ترازاوە.

بەراستی دیمـەنێکی سامناکە هەرچـی مـەخلووقات هەیـە کۆکراوەتـەوە هـەر کۆمەڵەو بەناوی پێغەمبەرەکەیەوە یان بەناوی ئـەو پـەیڕەوو پرۆگرامـەی شوێنی کەوتووە بانگ دەکرێ، بانگ دەکرێن بۆ ئەوەی نامەی عەمـەلیان بـدرێتێ، پاداشو سـزای خۆیـان وەربگرنــەوە، جـا ئەوانــەی نامــەیان دەدرێتــە دەسـتی راسـتیان

دەگەشێنەوە، بەرەوی خۆشەوە لەنامەی کرداریان ورد دەبنەوەو دەیخوێننەوە، پاداشی خۆیان بەبێ کەم و کوڕی وەردەگرنەوە بەئەندازەی تاڵە دەزوولەی ناو درزی ناوکە خورما ستەمیان لێ ناکرێ! خودایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت، بۆ خاتری زات و صیفاتت وامان لێ بکە لەو تاقمە بین کە نامەی عەمەلیان دەدرێتە دەستی راستیان و رووگەش و دڵخۆشی ئەو رۆژە بین!

## هەوڵ و تێکۆشانی موشریکەکان بۆ لادانی پێغەمبەر ﷺ لەرێبازی خۆی و ناچار کردنی بۆ ئەوەی مەککە بەجێ بێڵێ

﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازلبوونی ئایەتی ﴿وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ...الآيَة﴾ ئیبنو مەردەویەیهی‌و ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنو ئیسحاق‌و هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن: دەفەرموێ: ئومەییە کوڕی خەلەف‌و ئەبو جەهلی کوڕی هیشام‌و چەند پیاوێکی تری قورەیش کۆبونەوەو هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی موحەممەد! وەرە دەست بەجەستەی بتەکانماندا بێنە، ئێمەیش دێینە سەر ئایینی تۆ، پێغەمبەر ﷺ زۆری حەز دەکرد ئەوان موسوڵمان بن، بۆیە تۆزێك دڵی نەرم بوو ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنْ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ تا دەگاتە ﴿نَصِيراً﴾ی نازل کرد.

ئەبو شەیخ؛ ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ خەریکی ماچ کردنی بەردە رەشەی کەعبە بوو، کافرەکان وتیان: ناهێڵین بەردە رەشە ماچ بکەی هەتا نەیەی دەست بەبتەکانماندا نەهێنی، ئەویش تۆزێك بیری کردەوەو لەدڵی خۆیدا وتی: چ دەبێ ئەگەر دەستێك بەبتەکانیاندا بێنم بەمەرجێ بێڵن بەردە رەشە ماچ بکەم، خودا بۆخۆی دەزانێ من بەدڵ رقم لێیانە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ. ئەمانە (اسباب النزول)ن‌و لەکتێبەکانی تەفسیردا هێنراون جار جارە دەیاننوسینەوە.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: کە پەروەردگار لەئایەتەکانی پێشوودا نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خۆی بەسەر ئادەمیزاددا رانواندو حاڵ‌و وەزعیانی لەقیامەتدا رون کردەوە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی هەوڵ‌و تەقەلاکانی کافرەکان دەکا: کە چەند بەپەرۆشن بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەهەڵوێستی خۆی لابدەن، چەواشەکاری بخەنە نێو بەرنامەکەیەوە. جۆرەها فرت‌و فێڵیان بەکار هێنا بۆ ئەوەی وا لەپێغەمبەر بکەن بەدەم خوداوە شتێك هەڵبەستێ کە لەبەرنامەکەیدا نیە!

دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنْ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِي عَلَيْنَا غَيْرَهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! نزیك بوو موشریکەکان بەفرتو فێڵی جۆراو جۆریان تۆ لابدەن لەپەیرەوکردنی ئەو پەیامەی بۆت نێردراوە، ئەو حوکمانەی بۆمان ناردووی پابەندیان نەبی، پێشنیارت بۆ دەکەن بەوەرگرتنی هەڵوێستی جیا جیا، شتێك بەدەم ئێمەوە بلاو بکەیەوە: کە بۆمان نەناردووی لەبەرنامەکەتدا نیە، ﴿وَإِذاً لاتَّخَذُوكَ خَلِيلاً﴾ ئەو کاتە ئەگەر تۆ بەقسەیان بکەی‌و بەدڵی ئەوان بجووڵێیەوە دەتکەن بەدۆستو برادەری خۆیانو بەناو خەڵکدا بلاوی دەکەنەوە: کە تۆش بویتە موشریك‌و بیرو باوەڕی ئەوانت بەلاوە پەسندبوو، دەبێتە یارمتیدەرو پشتیوانی ئەوانو لەژێر چاودێری ئێمە نامێنی!! پارێزگاریت ناکەین، پشتیوانیت لێ ناکەین!

﴿وَلَوْلا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً﴾ ئەگەر ئێمە دڵی تۆمان لەسەر بیرو باوەڕی راستەقینەی خۆت دامەزراو نەکردایە بیرو باوەڕت بەپەیامی خۆت تۆکمەو پتەو نەبوایەن بێگومان نزیکبووی لەوەی کەمێ بەلایاندا مەیل بکەی، وات بەباش بزانیایە: کە کەمێ لەداخوازییەکانیان جێ بەجێ بکەی!!

واتە: بەهۆی دامەزراندنەکەی ئێمە بۆ تۆ، بەهۆی ئەوەی: کە ئیمانی تۆمان پتەوو تۆکمە کردوە، تۆ نزیك نەبووی لەوەی تەنانەت کەمێکیش مەیلی دڵ بکەی بۆ لایان، ج جایی بەقسەیان بکەی هەندێ لەداخوازییەکانیان بەدی بێنی.

**بەکورتی :**

تۆ لەوانەبوو تۆزێك مەیلی دڵت ببوایە بۆ لایان نەك لەبەر ئیمان لەرزۆکی خۆت بەڵکوو بەهۆی فرتو فێڵی جۆراو جۆریان، بەلام پارێزگاری‌و چاودێری ئێمە بۆ تۆ بەجۆرێك بوو نەمان هێشت کەمترین مەیل بکەی بۆ لایان!

خوێنەری هێژا: سەیر بکە: قورئان چۆن پاکیو ئیمان پتەوی پێغەمبەر ﷺ رادەگەیەنێ. دەی کەواتە: نابێ گوێ بگیرێ بۆ برێ ریوایەت: کە لەگەڵ مانای ئایەتەکەدا رێك ناکەون، بۆ نموونە ئەو دوو ریوایەتەی لەوەپێش دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتەکە هێناومانن، نابێ سەد لەسەد وەریان بگرین، چونکە ماناکەیان لەگەڵ مانای ئایەتەکە دژ دەوەستێ! بۆیە من زۆرجار ئەو جۆرە ریوایەتانە پاشگوێ دەخەمو تا بۆم بکرێ خۆمیان لێ دەپارێزم.

﴿إِذاً لأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيراً﴾ خۆ ئەگەر تۆ نزیك بوویتایە لەوەی کەمترین مەیل بکەی بۆ لای موشریکەکان، ئەوە بێگومان دوو چەندانەی سزای دونیاو دوو چەندانەی سزای قیامەتمان پێ دەچەشتی، واتە: لەدونیاو قیامەتدا عەزابی دوو قاتمان دەدای! چونکە کەمترین هەڵە بۆ پێشەواو رابەر شیاوی سزای دوو چەندانەیە، بۆیە ئەگەر زانایەك تاوانێك بکا سزاکەی لەسزای هەمان تاوان کە نەفامێکی نەخوێندەوار بیکا بەئێش ترە. تەنانەت هەندێ شت هەیە بۆ پیاوچاکان خێرو چاکەیە، کەچی بۆ زاتی وەکوو پێغەمبەرانو پیاوە هەرە نزیکەکانی خودا بەتاوانۆکە دەژمێردرێ بۆیە دەگوترێ: (حسنات الأبرار سيئات المقربين).

ئیمامی مالیكو ئەحمەدو موسلیمو خاوەنی سونەنەکان جگە لەئەبو داود لەئەبو جەحیفەو واثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من سنّ سنة سيئة، فعليه وزرها ووزر من عمل بها الى يوم القيامة) کەسێك دابو نەریتێکی خراپ دابێنێ، ئەوە تاوانی خۆی لەسەرەو تاوانی ئەوانەشی لەسەرە کە پەیرەوی ئەو دەکەنو شوێنی دەکەون!

هەر بۆیە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر تاوانێکیان بکردایە سزاکەیان دووچەندانە دەبوو، وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ﴾الأحزاب/٣٠.

ئـەمجار کـە موشـریکەکان نائومێـد بـوون: لـەوەی پێغەمبـەر ﷺ کـەمترین داخوازییان جێ بەجێ بکا، بەهیچ جۆرێ نەیانتوانی تووشی فیتنەی بکەن، کەوتنە هەوڵی ئەوە بەزۆر لەشاری مەککە وەدەری نێن، ئیتر پەروەردگار نیگای بۆ نارد: کە کۆچ بکا بۆ مەدینە..! لەزانستی خودادا ئـەوە چەسـپاوە کـە قورەیـشییەکان وەکـوو قەومی عادو لوط بنەبڕ نەکا، بەعەزابی کۆکوژ لـەناویان نـەبا، خـۆ ئەگـەر بـەزۆر پێغەمبەریان وەدەرنایە ئەو کاتە شیاوی ئەوە دەبوون خودا هـەموویان لەناوبـەرێ، ریشەکێشیان بکا، دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَادُوا لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِـنَ الأَرْضِ لِيُخْرِجُـوكَ مِنْهَـا﴾ نزیکبوو دانیشتوانی مەککە دووبـارە بەچاوو راوو فـرتو فێـڵ دوژمنایـەتیکردنت لەئاخی مەککە وە دەرت نێن، ئەو کاتە ئەگـەر بـەزۆر دەرت بکـەن ﴿وَإِذاً لا يَلْبَثُـونَ خِلافَكَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ دوای ئەوە لەپاش تۆ ئـەوان ماوەیـەکی کـەم نـەبێ نایانهێڵینـەوە، بەڵکوو لەناویان دەبەین! ئەمە دابو نەرێتی پـەروەردگارە، گـۆڕانی بەسـەردا نایـە، دەربـەدەر کردنـی پێغەمبـەر لەزێدو نـیشتمانی خـۆی تـاوانێکی گەورەیـەو تـەمبێ کردنـی سـەرلەبەری گەرەکـە، ئـەم بوونـەوەرەش یاسـاو نیظامـی یـەزدانی نـەگۆڕ دەیگێڕێ، صودفەو رێکەوت چ دەورێکی لەهەڵسوڕانی دا نیە، جا: کە خودا لەعیلمی خـۆی دا بڕیـاری نـەدابێ قورەیـشییەکان کۆکـوژ بکـاو ئاسـەواریان نەهێڵـێ، لەبـەر حیکمـەتێکی یـەزدانی نەیـەوێ وەکـوو گەلـە پێـشینە بەدرۆخـەرەوەکانیان بەسـەربێنێ، دیـارە مـوعجیزەی پێغەمبەرەکەشـی لـەجۆری (خـارق العـادة) نـابێ بڕیـاری ئەوەشـی نـەداوە کافرەکـان بـەزۆر دەری بکـەن، بـەڵکوو نیگـای بـۆ کـرد بەکۆچـکردن. تەنانـەت کـە کافرەکـان بیـستیان پێغەمبـەر ﷺ لەمەککە دەرچـووە، کەوتنە هەوڵدانی ئەوە نەهێڵن دەربچێو هەر چۆنێك بێ بیگێڕنەوە بۆ مەککە.

ئەمە هەڕەشەیەکی یەزدانییە لەگەورەو ملهوڕەکانی قورەیش بەوە: کـە دوای دەرچوونی پێغەمبەر لەمەککە ئەوان بەهیلاك دەچن. لەراسـتی دا ئـەم هەڕەشـەیە

هاتــە جــێ دوای نزیــك هــەژدە مــانگ لەبــەرواری كۆچــكردنی پێغەمبــەر ﷺ لەمەككەوە بۆ مەدینە لەجەنگی بەدردا زوربەی ئەو ملهوڕانە كوژران!

﴿سُنَّةَ مَنْ قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنْ رُسُلِنَا﴾ ئەوە داب‌و نەریتمان بوو دەربارەی ئـەو گەلە پێشینانەی كە پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆ خستەوە ئەزیەتیان دان‌و لەزێدی خۆیان راویان نان. لەبیخ دەرمان هێنان ریشەكێشمان كـردن‌و سـەرلەبەر لـەناومان بـردن، خـۆ ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ پێغەمبـەری رەحمـەت نەبوایـە بۆیـان عـەزاب‌و سـزایەكی سـەختیان بـۆ دەهـات‌و تێكیـەوە دەپێـچان‌و بـەهیلاكی دەبـردن، بـەڵام پێغەمبەری ئیسلام رەحمەتە بۆ ئادەمیزاد بەگشتی‌و بۆ گەلی قورەیش بەتایبـەتی، بۆیـە پـەروەردگار لەئایـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا كَـانَ اللّـهُ لِيُعَـذِّبَهُمْ وَأَنـتَ فِيهِمْ﴾الأنفال/٣٣.

ئەمە داب‌و نەریتی خودایـەو ﴿وَلا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْـوِيلاً﴾ گۆڕانكاری لـەداب‌و نەریتی خودادا نیەو تێیدا نەبووەو نابێ، قەت بێ وادەیی بەسەردا نایە.

## فەرمان‌و تەوجیهات‌و تەعلیمات بۆ پێغەمبەر ﷺ

﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ

وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسٗا ﴿٨٣﴾ قُلۡ كُلّٞ يَعۡمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَنۡ هُوَ أَهۡدَىٰ سَبِيلٗا ﴿٨٤﴾ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٨٠) ﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي....﴾ تیرمیذیو ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لەمەککە بوو، پاشان فەرمانی پێکرا: کە کۆچ بکا: ئایەتی ﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ...﴾ی بۆسەر نازڵ بوو.

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٨٥) ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ....﴾ بوخاری لەئیبنو مەسعود ریوایەت دەکا دەفەرموێ: من خۆم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەناو مەدینەدا دەرۆیشتین خۆی بەسەر لقە دار خورمایەکدا دابوو بەلای چەند پیاوێکی قورەیشی دا تێپەڕین، هەندێکیان بەهەندێکیان وت: ئەگەر پرسیارتان

لەموحەممەد بکردایە؟! ئەوانیش وتیان باسی گیانمان بۆ بکە پێناسەی (روح)مان بۆ بکە، ئەویش ساتێك راوەستاو سەری بەرز کردەوە، وام زانی نیگای بۆ دی، پاشان فەرمووی: ﴿قل الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾.

تیرمیذی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: قورەیشی یەکان بەجولەکەکانیان گوت: پرسیارێکمان پێ بڵێن: لەم پیاوەی بپرسین، ئەوانیش وتیان: دەربارەی (روح) پرسیاری لێ بکەن، ئەوانیش پرسیاریان لێ کرد، پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾. وەلێ حەدیثەکەی بوخاری ئەوە دەگەیەنێ ئایەتەکە مەدەنی بێ، لەکاتێکا سورەتەکە هەمووی مەککی یە، پرسیار کردنەکەی قورەیشییەکانیش هەر ئەوە دەگەیەنێ کە سورەتەکە مەککەیی بێ!

ئیبنو کەثیر بۆ کۆکردنەوە لەنێوان ئەو دوو حەدیثەدا دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دووجار نازڵ بووە؛ جارێکیان لەمەککەو جارێك لەمەدینە.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەئایەتەکانی پێشەوەوە ئەوەیە: دوای ئەوەی پەروەردگار باسی فرتو فێڵی کافرەکانی کردو شێوەی تەنگ پێ هەڵچنین و ئەزیەتدانیان بۆ پێغەمبەر ﷺ رونکردەوە، لەوەپێشیش باسی ئیلاهیاتو پێغەمبەرایەتیو زیندوبونەوەی کرد. ئەمجار لێرەدا فەرمان بەپێغەمبەر دەکا بەگەورەترین عیبادەت دوای ئیمان کە نوێژە. فەرمانی پێ دەکا بەنوێژ کردنو سەرەنجامی رۆژی قیامەتیشی بۆ رونکردنەوە دەفەرموێ: ﴿أَقِمْ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەو نوێژانەی لەسەرت فەرض کراون بەرێكو پێکی ئەنجامیان بدە، خۆتو ئەممەتەکەت پارێزگارییان بکەنو ئەرکانو مەرجەکانیان بەتەواوی تێدا ئەنجام بدەن. کە دەفەرموێ: ﴿لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ﴾ چوار نوێژ دەگرێتەوە

نیـوەڕۆ، عەصـر، مـەغریب، عیـشا. (دلـوك) بـەمانا لادانـی خـۆرە لەنیوەراسـتی ئاسمانەوە بۆ لای خۆرئاوا، ئەو كاتە كاتی نوێژی نیوەڕۆیـە، (غـسق الليـل)یـش ئـەو كاتەیـە كـە دونیـا بەتـەواوی تاریـك دەبیّ‌و (شـفق الأحمـر) سورایی كـەنار ئاسمـان نـامێنێ ئـەوەش سـەرەتای كـاتی نوێـژی عیـشایە. نوێـژی (عەصـرو مـەغریب)یـش لـەنێوانیاندا ئـەنجام دەدرێـن. هەرچـەندە خیطـابەكـە بـۆ پێغەمبـەرە ﷺ بـەڵام ئوممەتەكەیشی دەگرێتەوە.

﴿وَقُرْآنَ الْفَجْرِ﴾ واتە: نوێژی بەیانیش ئـەنجام بـدە، ئـەوە نوێـژی پێنجەمـە. كـردارو گوفتـاری پێغەمبـەر ﷺ كـاتی نوێـژەكانی بـەرێك‌و پێكـی رونكردۆتـەوە سەرەتاو كۆتـایی كـاتی هـەموو نوێـژێكی بـەو جۆرەی كـە ئـەمڕۆ لای موسـوڵمانان ئاشكراو عەیانە دەست نیشان كردوە.

﴿إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَـانَ مَـشْهُوداً﴾ بێگومـان قورئانخوێنـدنی بـەیانییان نوێـژی بـەیانی فریـشتەی شـەوو فریـشتەی رۆژ ئاگایـان لێیـەتی‌و لـەكاتی ئـەم نوێـژەدا فریـشتەی شـەوو رۆژ بەیـەك دەگـەن، فریـشتەی شـەو دەیانـەوێ بـەرز ببنـەوەو فریـشتەی رۆژیـش دێنـە خـوارێ، لـەو كاتـەدا كـە ئـەوان ئـاڵ‌و گـۆڕ دەكـەن نوێـژی بـەیانی ئـەنجام دەدرێ، وەكـوو لەفەرموودەیـەكی پێغەمبـەردا هـاتووەو ئیمـامی ئەحمەدو ئیرمیذی‌و نەسائی‌و ئیبن‌و ماجە لەئـەبو هورەیرەوە ریوایـەتیان كـردوە، هەروا لەصەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا دووبارە لەئەبو هورەیرەوە ریوایـەت كـراوە: كـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی فریـشتە نووسـەرو دەفتـەر بەدەسـتەكانی تایبـەت بەكردەوەی ئـادەمیزاد ئـاڵ‌و گـۆڕ دەكـەن؛ فریـشتەی رۆژ دێنـە خـوارێ‌و فریـشتەی شەو دەڕۆنەوە لەكاتی نوێژی بەیانی دا یـەكتر دەگرنـەوە، هـەروەها لـەكاتی نوێـژی عەصـریش‌دا كۆدەبنـەوە جـا كـە فریـشتەی شـەو بـەجێتان دێڵن‌و بـەرز دەبنـەوە، پـەروەردگار پرسـیاریان لێ دەكـاو (بـۆ خـۆشـی زۆر باشـتر دەزانـێ) دەفـەرموێ: كـە

بەندەکانمتان بەجێ هێشتن خەریکی چی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: خودایە! چوینە لایان خەریکی نوێژ کردن بوون، بەجێمان هێشتن خەریکی نوێژ کردن بوون.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش فەرموویەتی نوێژی بەیانی فریشتە نێشکگرەکان تێیدا کۆدەبنەوە، جا فریشتەی شەو بەرز دەبنەوەو فریشتەی ڕۆژیش دەمێننەوە.

هەندێکیش پێیان وایە مەبەست بەوشەی (مشهوداً) هەڵنانی ئادەمیزادە بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی بەجەماعەت بکا واتە: کەمەڵێکی زۆر ئامادەی ئەنجامدانەکەی بن.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: مەبەست بە(مشهوداً) لێرەدا ئەوەیە: ئادەمیزاد ئاثاری دەسەڵاتی خودا دەبینێ، نیشانەی کارسازی پەروەردگار بەدی دەکا، بەچاوی خۆی دەبینێ چۆن ئەو تاریکە شەوە ئەنگوستە چاوە روناکی خۆر رایدەماڵێ، جیهان لەتاریکیەوە دەکەوێتە حاڵەتی روناکییەوە، نووستو بەخەبەردێن هەروا گەلێك شتی تر دەبینێ کە دیاردەی دەسەڵاتو قودرەتی خودان.

مامۆستا سەییدیش لەم بارەوە دەفەرموێ: ئەم دوو کاتە؛ کاتی رۆژئاوابوونو هاتنی شەو، کاتی شەورابوردنو هاتنی رۆژ تایبەتمەندی خۆیان هەیە، لەسەر دڵو دەروون زۆر کاریگەرو سەرمەنج راکێشن، چونکە شەوداهاتنو هێرش هێنانی تاریکی، وەکوو رۆژبوونەوەو تاریکی رامالین هەردوکیان جێگای سەرمنجن و دڵ تێیاندا دەکەوێتە ترسو لەرزەوە، هەردوو کاتەکە شوێنی تێفکرینو بیر کردنەوەن لەیاسای بوونەوەر: کە چاو تروکانێك لەکار ناکەوێو راناوەستێ. ئالەم بەیانیەدا لەو کاتەدا: کە ئاسۆ روناکی تێدەکەوێ، کزەبایەکی هێدی هەڵدەبێ، زیندەوەرەکان بەئاگا دێنەوەو جمو جۆڵیان تێ دەکەوێتەوە، قورئان خوێندنو نوێژکردن لەوکاتانەدا تایبەتمەندیو کاریگەری خۆیان هەیە.

ئەمجار دێتە سەر دەست نیشانکردنی فەرزێکی تر: کە تایبەتە بەپێغەمبەر خۆیەوە. دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ﴾ شەو دوای نووستن، هەڵسە شەونوێژ بکە قورئانی تێدا بخوێنە، ئەمە یەکەم فەرمانە ئاراستەی پێغەمبەر کراوە بۆ ئەنجامدانی شەونوێژ ﴿نَافِلَةً لَكَ﴾ زێدە فەرزێکە لەسەر تۆو لەپێنج نوێژەکانی تر جودایەو تایبەتە بەتۆوە. بۆ تۆ فەرزو پێویستەو بۆ ئوممەتەکەت سونەتو تەطەووعە.

هەندێك دەڵێن: شەونوێژ بۆ پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی زێدە طاعەتە، چونکە بەنەصصی ئایەت پەروەردگار لەبەرودوای تاوانی پێغەمبەر خۆش بووە، بۆ غەیری خۆی لەئوممەتەکەی زێدە تاعەت دەبێتە کەفارەتی تاوانەکانیان. بەڵام ئیبنو جەریر ئەم رایەی رەتکردۆتەوە، دەڵێ: چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کراوە بەوەی داوای لێخۆشبوون بکا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾النصر/٣. هەروەها لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە: کە رۆژانە زیاد لەسەد جار (استغفر الله)ی کردوە، هەتا بەندە زیاتر لەخودا نزیك بێتەوە زیاتر لێی دەترسێ، هەرچەندە خودا دڵنیای کردبێ لەوەی کە لەتاوانەکانی خۆش بووە، ئەمە پلەو مەقامێکە پیاوی خۆی دەیزانێ!!

ئەی پێغەمبەر! ئەوەی فەرمانمان پێ کردی ئەنجامی بدە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَاماً مَحْمُوداً﴾ بۆ ئەوەی رۆژی قیامەت کە زیندومان کردییەوە مەقامی سوپاسکراوت پێ ببەخشین، هەموو دروستکراوان سوپاست دەکەن، زوربەی زانایانی تەفسیر پێیان وایە: ئەو مەقامە موحموودە کە بەپێغەمبەری ئیسلام دەبەخشرێ پلەوپایەی شەفاعەتی گەورەیە بۆ رزگار کردنی ئادەمیزادەکانی دەشتی مەحشەرە لەو نارەحەتیو مەترسییەی تێیدان.

نەسائىو حاكمو كۆمەڵێكى تریش لەحوزەیفەوە ریوایەت دەكەن: كە فەرموویەتی: (پەروەردگار هەموو ئادەمیزادان لەساراى مەحشەردا كۆ دەكاتەوە، دەنگى بانگ لێ كردنى بانگكەر دەبیسن چاو دەیان بینێ، هەموویان روتو پێ خاوسن، چۆن دروست كراون ئاوا، هەموویان بەپێوە، بێ خوستو نست، كەس قسە ناكا مەگەر ئیزن وەربگرێ، ئا لەو كاتەدا بانگ لەپێغەمبەر دەكرێ: ئەویش لەوەڵامدا دەفەرموێ: (لبیك وسعدیك، والخیر في یدیك، والشر لیس الیك، والمهدي من هدیت وعبدك بین یدیك، وربك والیك، لا ملجأ ولا منجى منك الا الیك تباركت وتعالیت سبحانك رب البیت) ئا ئەمەیە مەقامى مەحموود.

لەصەحیحى بوخارى دا فەرموودەیەك لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەكا دەفەرموێ: (ان الناس یصیرون یوم القیامة جثا، كل أمة تتبع نبیها تقول: یا فلان! اشفع حتى تنتهي الشفاعة الى النبي ﷺ فذلك یوم یبعثه الله المقام المحمود)[1].

ئیمامى موسلیم لەصەحیحەكەى فەرمودەیەكى لەئەنەسەوە ریوایەت كردووە، دەفەرموێ: پێغەمبەر بۆى باس كردینو فەرمووى: (اذا كان یوم القیامة ماج الناس بعضهم الى بعض فیأتون آدم فیقولون له: اشفع لذریتك فیقول لست لها، ولكن علیكم بابراهیم ﷺ فانه خلیل الله، فیأتون فیقول لست لها، ولكن علیكم بموسى فانه كلیم الله فیؤتى موسى فیقول لست لها ولكن علیكم بعیسى ﷺ فانه روح الله وكلمته، فیؤتى عیسى فیقول لست لها، ولكن علیكم بمحمد ﷺ فأوتى فأقول أنا لها)[2].

ئیمامى بوخارى لەجابیرى كوڕى عەبدولڵاوە فەرموودەیەك ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (من قال حین یسمع النداء، اللهم ربَّ هذه الدعوة

[1] بوخارى لەبابى تەفسیردا (باب ۱۱) ژمارەى فەرموودەى (٤٧١٨) ریوایەتى كردووە. وشەى (جثا) بە ماناى كۆمەڵ كۆمەڵ دێ.

[2] صەحیحى مسلیم كتاب الأیمان (۱۹۳/۳۱٦) باب (۸٤).

التامة والصلاة القائمة آت محمد ﷺ الوسلية والفضيلة وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته حلت له شفاعتي يوم القيامة)[٣].

ئیمامی تیرمیذی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أنا سيد ولد آدم يوم القيامة ولا فخر، وبيدي لواء الحمد ولافخر، وما من نبي يومئذ آدم فمن سواه الا تحت لوائي)[٤].

وشەی (عسی) لەزاراوەی عەرەبیدا بۆ رەجاو بەتەمابوونە بەڵام لێرەدا بۆ وجوبو تەئکید دێ.

ئەمجار بەبۆنەی فەرمانکردن بەپێغەمبەر ﷺ بەکۆچکردن بۆ مەدینە. فەرمان بە پێغەمبەر دەکا کە لەپەروەردگاری خۆی بپارێتەوە: کە لەدونیاو قیامەتدا پلەو پایەی باشی پێ ببەخشێ. دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ﴾ ئەی موحەممەد لەخودا بپارێرەوەو بڵێ خودایە! لەدونیاو قیامەت دەرچونو داخڵ بوونم پەسند بێ، چوونە دەرم لەمەککەو داخڵ بوونم بەشاری مەدینە جێگای رەزامەندی تۆ بێ. هەموو شتێکم بەراستی بێو راستەقینانە ئەنجامی بدەم، لەدونیا دەرچوونمو داخڵ بوونم بەگۆڕ دەرچوونم لەگۆڕو داخڵ بوونم بەدەشتی مەحشەر پەسندو راستەقینە بێ، جێگای رەزامەندی تۆ بێ. رێزم لێ بگری، پلەو پایەم بەرز بکەیتەوە.

﴿وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَاناً نَصِيراً﴾ خودایە! بەڵگەو نیشانەی بەهێزم پێ ببەخشە، هێزو توانای مادیو مەعنەویم بدەرێ بتوانم بەسەر ناحەزانمدا زاڵ ببم، ئایینەکەم بەجیهاندا بڵاو ببێتەوە، تاریکی کوفرو بێدینی راماڵم.

---

[٣] صەحیحی بوخاری لەباسی تەفسیردا (٤٧١٩) باب (١١).

[٤] ئیبنو ماجه له (الكتاب الزهد)دا ژمارە (٤٣٠٨) باب (٣٧). ئیمامی ئەحمەد لە (المسند)دا ژمارە (١٠٩٨٧)دا.

لەراستی دا خودا دوعاو نزاکانی پێغەمبەری گیرا کرد: خودی پێغەمبەر خۆی لەدەستی کافرەکان پارێزراو بوو دەستی دوژمنانی لێ دوور خستەوە... وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾المائدة/٦٧، ئایینی بەجیهاندا بلاوبۆوەو بەسەر ئایینەکانی تردا زاڵ بوو وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾التوبة/٣٣، فەرمانڕەوایی جیهانیان دەست کەوتو هەر ئەوانیش سەرکەوتوون، وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾المائدة/٥٦، یان دەفەرموێ: ﴿لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ﴾النور/٥٥.

هەڵبەتە داواکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی بۆ ئەوە نەبوە حەزی لەدەسەڵات بووبێ، بەڵکوو بۆ پارێزگاری ئایینو سنوورەکانی، چونکە پێویستە حەق هێزو توانای هەبێ بۆ بەرەنگار بوونەوەی ناحەزانی. بۆ لابردنی کۆسپو تەگەرەی کە دەخرێنە پێشی، بۆیە لەئایەتێکی تردا پەروەردگار ناردنی پێغەمبەران و ناردنی نامەی ئاسمانی بۆیان ئاوێتەی نازڵ کردنی مادەی ئاسن کردوە کە کەرەسەی هێزو توانای لێ پێك دەهێنرێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ...الآية﴾الحديد/٢٥.

لەئیمامی عوسمانەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: (ان الله ليزع بالسلطان مالا يزع بالقرآن) واتە: جاری وا هەیە بەهۆی هێزو دەسەڵاتەوە جڵەوگیری لەئەنجامدانی تاوانو بلاوبوونەوەی فەساد دەکرێ: کە زۆر جارئەو کارە بەهەڕەشەو تەماع بەرنانی قورئان نایەتەدی.

ئەمجار هەڕەشە لەکافرەکانی قورەیش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ﴾ ئەی موحەممەد! بەموشریکەکان بڵێ: حەقو راستی کە ئیسلامە لەخوداوە هات، قورئانی پیرۆزو ئیمانی راستو زانیاری بەسوود لەخوداوە هاتووە،

دەبێ بچەسپێ، بەتاڵ کە بتپەرستیو بێدینی یە جێگای نابێتەوەو پوچاوەیەو نابێ بمێنێ. ﴿إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً﴾ بێگومان بەتاڵ پوچاوەو بێ نەموودەو قەڵاچۆ کراوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾الأنبياء/١٨.

بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو نەسائی لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: ڕۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر ﷺ چووە ناو شارەوە لەدەوروبەری کابەدا (٣٦٠) سێ سەدو شەصت بت هەبوو ئیتر پێغەمبەر ﷺ دارێکی بەدەستەوەبوو، بەدارەکە تێوەی دەژنینو دەیفەرموو: ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً﴾ هەروا دەیفەرموو: ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾سبأ/٤٩.

حافیظ ئەبو یەعلاو لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا چوینە ناو مەککەوە لەدەوری کابە سێ سەدو شەصت بت هەبوو، لەجیاتی خودا پەرستشیان بۆ دەکرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەشکاندنیان هەموویان بەرەودەم خرانو تێك شکێنران. جا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً﴾.

بەڵێ بەتاڵ جێگیر نابێ، پایەدار نابێ، چونکە هۆکاری مانەوەی تێدا نیە، هۆکاری مانەوەی کاتیو لەرزۆکن، دەرەکین، بنەڕەتی نین هەر لەگەڵ لەرزیەکی پێکەوت دەروخێو دەپوچێتەوە، بەلام هۆکارەکانی مانەوەی حەق لەخودی خۆیدانو سروشتینو بنەڕتیو چەسپاوو دامەزراون، وا دەبێ هەواو ئارەزۆ دژی دەوەستێ، سوڵتەو هێزو توانا بەرەنگاری دەبێتەوە، بارودۆخ لەگەڵی دا گونجاو نابێ، بەلام دامەزراویو چەسپاویو راستی حەق هێزو توانای مانەوەی خۆی پێیە، حەق هەر دەبێ سەرکەوێو بالا بێ، چونکە سەرچاوەی حەق لەخوداوەیە، حەق ناوی پەروەردگارەو سەرەنجام پیرۆزی هەر بۆ ئەوە. وادەی خودایەو بەڵێنی ئەزەلی

یە، بەتاڵ بەردەوام نابێو باڵادەستی بۆ ئەو نابێ، وادەی خودایەو دەسەڵاتی خودا لەژوور هەموو دەسەڵاتێکەوەیە، کێ لەخودا راسگۆترە؟ کێ لەخودا وادەراست ترە؟؟ کەوابێ بەتاڵ بەتاڵەو دەبێ بڕواو نەمێنێ! حەق حەقەو دەبێ بچەسپێو بمێنێ.

ئەمجار پەروەردگار هەواڵ دەدا لەنامەی خۆی: کە قورئانی پیرۆزە بەوەی کە شیفاو رەحمەتە بۆ ئادەمیزادو دەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنْ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئێمە قورئانێك دەنێرینە خوارێ بۆ سەر تۆ ئەی موحەممەد! شیفای دەردی دڵانەو رەحمەتو فەڕە بۆ موسوڵمانان. بیرو باوەڕیان پێی زیاد دەکا، شیفایە بۆدەردی شكو گومانی ناو دڵو دەروون، بۆ دەردی نیفاقو شیركو ئیلحاد، بۆ دەردی نەزانیو گومڕایی، شیفایە بۆ دەردی وەسوەسەو ڕاڕایی، رەحمەتو فەڕە بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕنو شوێنی کەوتوون، چونکە شارەزاتریان دەکا بۆ خودا پەرستیو دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست. ئەمەش سەردەکێشێ بۆ چوونە ناو بەهەشتو ڕزگاربوون لەعەزابی دۆزەخ.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەیەکی دا کە دەیلەمی ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ: (من لم یستشف بالقرآن فلا شفاء له)[1] کەسێك لەقورئاندا شیفای دەست نەکەوێ شیفای نیە.

﴿وَلا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلاَّ خَسَاراً﴾ بیستنی قورئانو خوێندەوەی بۆ ئەوان دوور کەوتنەوە لەڕێگای ڕاستو ئیمانهێنان بۆ کافرو ستەمکاران زیاد دەکا، چونکە کوفرو بێدینی لەناخیاندا ڕەگی داکوتاوە، دڵیان لەوەرگرتنی حەق مۆر کراوە، پێی سودبەخشو بەهرەمەند نابن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن

[1] ئیبنو ماجە لەکیتابی (الطب)دا ژمارە (٣٥٠١) باب (٣٨) (الأستشفاء القرآن) ڕیوایەتی کردووە.

مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾فصلت/٤٤. یان دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْساً إِلَى رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾التوبة/١٢٥.

قورئانی پیرۆز (حبل المتين)ە دڵەکان بەخوداوە پەیوەند دەکا ئارامیو هەست کردن بەپارێزگاریو چاودێری دەکا.

قورئان شیفای دەردی هەوەسبازیو رژدیو چروکیو حەسودییە. شیفایە بۆ عەقڵ؛ ناهێڵێ بیرو بۆچونی شپرێویو شەطەطی تێبکەوێ. لەدەردە سامناکەکان دەیپارێزێ، مشتو ماڵی دەکا بۆ ئەوەی لەمەیدانی خۆیدا بەئازادی پەل بهاوێو ئامانجی پیرۆز بەدەست بێنێ.

شیفایە بۆ دەردی کۆمەڵایەتی؛ ئەو دەردانەی کۆمەڵ دادەرزێنن تێکی دەدەن، دەیڕوخێنن. کەوابێ هەر کەسێك، هەر کۆڕو کۆمەڵێك لەقورئاندا دەرمانی دەردەکانی نەدۆزێتەوە ئەوە شیفای نەخۆشیەکانی دەست ناکەوێ!!

هەر کاتێك ئادەمیزاد بەبێ شیفاو رەحمەت بەرەڵلا بکرێ هەواو هەوەسی خۆی رێبەری بن ئەوە لەحالەتی خۆشیو خۆشگوزەرانی دا سپڵەو پێنەزانە، لەحاڵەتی تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی دا هیوا بڕاوو مەئیوسە لەرەحمەتی خودا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَنْعَمْنَا عَلَى الإِنسَانِ أَعْرَضَ وَنَأَى بِجَانِبِهِ﴾ هەر کاتێ نازو نیعمەتمان بەسەر ئادەمیزادا رشت، رزقو رۆژیمان پێدا لەشساغیو دڵخۆشیمان پێ بەخشی لەجیاتی ئەوەی سوپاسگوزار بێ پشت لەطاعەتی خودا هەڵدەکا، روی خۆی وەردەگێڕێو دوور دەکەوێتەوە. ﴿وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ كَانَ يَئُوساً﴾ هەر کاتێ نەخۆشیو بەڵاو موصیبەتی توش بێن، لەجیاتی ئەوەی بەصەبرو ئارام بێ، رەشبینو غەمبارو خەمیدەیە، هیوا بڕاو دەبێ لەژیانو بەتەواوی دەڕوخێ! ئالێرەدا نرخی ئیمان دەردەکەوێ، خاوەن باوەڕ لەکاتی خۆشیو کامەرانیدا شوکرانەژمێرو سوپاسگوزارو مل کەچ بۆ فەرمانی خودا، لەکاتی تەنگو چەڵەمەشدا بەصەبرو

ئـارامو ورە بـەرزەو بـەهیوای رزگاربوونـەو نائومێـد نـابێ. نموونـەی ئـەم ئایەتـە ئایەتێکی تـرە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ الإِنسَانَ الضُّرُّ دَعَانَا لِجَنبِهِ أَوْ قَاعِـداً أَوْ قَآئِمـاً فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَا إِلَى ضُرٍّ مَّسَّهُ كَـذَلِكَ زُيِّـنَ لِلْمُـسْرِفِينَ مَـا كَـانُواْ يَعْمَلُونَ﴾یونس/١٢. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّـهُ لَيَؤُوسٌ كَفُورٌ ، وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاء بَعْدَ ضَرَّاء مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي إِنَّـهُ لَفَـرِحٌ فَخُورٌ﴾هود/٩-١٠.

ئەمجار ئەوە دەچەسپێنێ: کە هەموو فـەردێك، هـەموو کۆمـەڵێك بـەگوێرەی رێو رەسمی خۆی کار دەکا پاداشو سزای ئـەو کـارو کردەوانـەو حـوکم دەربارەیـان عائید بەخودایەو بۆ خۆی دەزانێ شیاوی چین. دەفـەرموێ: ﴿قُـلْ كُـلٌّ يَعْمَـلُ عَلَـى شَاكِلَتِهِ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: هەر کەسە بەگوێرەی ویستو بـیرو بۆچـونی خۆی کار دەکا. چۆن بیر دەکەنەوەو چۆن هەڵسو کەوت دەکەن با بیکەن ﴿فَـرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَى سَـبِيلاً﴾ خـودا ئێـوەی لەنـەبوومەوە بـەدیهێناوە، لەهـەموو کـەس باشـتر دەزانـێ چ ڕێبازێـك راسـتو گونجـاوەو خـودا پەسـندو حـەقنامێزەی سـزاو پاداشی هەموو کردەوەیەکتان دەداتەوە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایـەتێکی تـرە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَقُـل لِّلَّـذِينَ لاَ يُؤْمِنُـونَ اعْمَلُواْ عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ، وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾هود/١٢١-١٢٢.

ئەمجار هەر لەروانکەی پەڵپو بیانووی نابەجێوە کە لەپێغەمبەریان دەگرتن پرسـیاری چـۆنیەتی گیانیـان لێ کـرد: جـا ئـەم پرسـیارە لەلایـەن قورەیـشیەکانەوە بـووبێ بەتـەگبیری جولەکـەکان، یـان هـەر راسـتەوخۆ لەجولەکەکانـەوە بـووبێ. ئەمەش لەسەر ئەم رایە: کە دەڵێن: ئەم ئایەتەو حەوت ئایەتی دوایی مەدینەیین..

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الرُّوحِ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوانە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی چۆنیەتی روح، چیەو چۆنە؟!

﴿قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّـي﴾ لـەوڵامدا بڵێ: (روح) شـتێکە لـەکاری خـودای مـن، بەفەرمانو دروستکردنی ئەو بەدی هاتووەو نامادییە، زانینی چۆنیەتیەکەی عائید بەخودایـەو جگـە لەئـەو کـەس هیـچی لێ نـازانێ، ئێـوە شـتێك نەیەتـە نـاو چـوار چێوەی حەواستانو عـەقڵتان پـەی پـێ نـەبا، نـایزانن، لەشـتە مادییـەکانیش تـەنیا هەندێ دیاردەو وەصفەکانیان هەست پێ دەکەن؛ وەکوو رەنگو تامو دەنگو بۆنو جمو جوڵو گـەرمیو سـاردی، شـتێك نامـاددی بـێ وەکـوو (روح) ئێـوە هیـچی لێ نازانن.

**زانایانی ئیسلام دەربارەی گیان ( روح ) چەند رایەکیان هەیـە : ئـەوەی لـەدڵدا جێگای دەبێتەوە دوو رەئیە :**

١- ئیمامی رازیو ئیبنولقەییم لەکتێبی (الروح)دا پێیان وایە: روح جیسمێکی نـوورانی زینـدوی جمو جوڵ کارەو بەشێکە لەعالـەمی بـاڵا، سروشـتی جوداوازە لەگەڵ ئەم لاشەی تێیدایە. بەناو ئەو جەسـتەدا بڵاوبۆتـەوە وەکوو بڵاوبوونـەوەی ئاو بـەناو گوڵدا، یـان چـەوری لـەناو زەیتـونـدا، یـان ئـاگر لـەناو خـەڵوزدا گـۆڕانی بەسەردا نایەو وردو خاش ناکرێ، کەڵکی بۆ جەسـتە هەیـەو کە پەیوەنـدی پێـوە کرد ژیانی پێ دەبەخشێ بەمەرجێ قبووڵی ئەو فـەیضو فـەرە بکاو شـتێك نـەبێ ببێتەوە بەربەستو نەهێڵێ پێیدا بڵاوبێتەوە.

٢- ئیمامی غەزالیو راغیبی ئیصفەهانی دەڵێن: روح نەجیسمە نەجیسمانییە، پەیوەندی بەبەدەنەوە پەیوەندی تەدبیرو بەکار هێنانە.

لەکۆتایی ئایەتەکەدا جەخت لەسـەر پـەی نـەبردنی ئـادەمیزاد بەچـۆنیەتی روح دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئێوە ئەی ئادەمیزادینـە! ئەندازەیـەکی کـەم نـەبێ زانیاریتـان نـەدراوەتێ بـەو زانیارییـە کەمـەش هـەرگیز

ناتوانن بزانن روح چیەو چۆنە. سەرچاوەی زانیاری ئێوە هەستەکانتانن ئەوەی نەیەتە بەر جاسوسی هەستەکانتان نازانن چیە.

## سەرئاسایی قورئان

﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ إِنَّ فَضْلَهُ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ ﴾

دەربارەی سبب نزولی ئایەتی (٨٨) ﴿قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ...الآية﴾ ئیبنو ئیسحاق و ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: سەلامی کوڕی میشکەمی جولەکە بەناوی زوربەی جولەکەکانەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد! چۆن ئێمە شوێن تۆ بکەوین؟ ئەتۆ رو ناکەیتە رۆگەی ئێمە؟ ئەم کتێبەی هێناوتە ئێمە هیچ رێك و پێکیەکی تێدا نابینن، زۆر بێ سەروبەرە، نامەیەکی وەکوو تەوڕاتمان بۆ بێنە ئاوا رێك و پێك بێ، کتێبێکمان بۆ بێنە تێی بگەین، ئەگینا ئێمە دەتوانین کتێبی وەکوو هی تۆ بێنین..

ئیتر پەروەردگار ئایەتی: ﴿قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ﴾ ناردە خوارێ.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بەهی پێشەوە لەم رووەیە: دوای ئەوەی پەروەردگار منەتی خۆی نواند بەسەر پێغەمبەرا بەوە: کە وەحی بۆ سەر نازڵ کردوە، قورئانی بۆ ناردوە: کە شیفایە بۆ ئادەمیزاد، منەتی بەسەردا دەکا: کە قورئان بەپارێزراوی دەهێڵێتەوە، کەس ناتوانێ کەلامی وا بهێنێ‌و بیخاتە روو. دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ثُمَّ لا تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلاً﴾ سوێند بێ ئەگەر بمانەوێ ئەو تۆزە زانیاریەی پێمان داون؛ ئەو قورئانەی بەنیگا بۆمان ناردووی لەناو دڵ‌و دەروونەدا لەناو پەڕو کاسێت‌و شریتدا دەمانسڕیەوەو ئاسەوارێکمان لەلا نەدەهێشتنەوە، وەکوو حاڵەتی پێشوومان لێ دەکردنەوە: کە نەتاندەزانی نامەی قورئان چیەو ئیمان چیە! بێگومان پەروەردگار دەتوانێ کە لەنکاوێك ئەم قورئانە لەسەر دڵەکان هەڵبگرێ‌و لەناو کتێباندا بیسڕێتەوە. ﴿ثُمَّ لا تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلاً﴾ ئیتر ئەو کاتە تۆ کەست دەست ناکەوێ یارمەتیت بدا، ئەو زانیاریەی لێت سەندراوەتەوە بۆت بێنێتەوە، کەس ناتوانێ بەرگریت لێ بکاو نەهێڵێ ئەو کارە ئەنجام بدەین. ﴿إِلاَّ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ﴾ بەڵام رەحمەت‌و بەزەیی خودای تۆیە: کە ئەو ویستەی نەبووەو ئەو کارەی ئەنجام نەداوەو نایدا. ﴿إِنَّ فَضْلَهُ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيراً﴾ بێگومان فەضل‌و بەخششی خودا بەسەر تۆدا زۆرو بێ ئەژمارە، کردویتی بەگەورەترین و رێزدارترین ئادەمیزاد، مەقامی مەحموودی بۆ داناوی، قورئانی پیرۆزی بۆ ناردوی، فێری کردوی چۆن بەخەڵکی رابگەیەنی.

حاکیم‌و بەیهەقی‌و طەبەرانی سەعیدی کوڕی مەنصوور لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکەن؛ دەڵێ: (ئەم قورئانەی ئێستا لەبەر دەستتاندایە لەوانەیە لەناوتاندا هەڵبگیرێتەوەو مەحف بێتەوە، وترا: چۆن لێمان دەسەندرێتەوە، خۆ ئەوەتا لەدڵ‌و دەروونماندا چەسپاندویەتی، لەناو پەڕەو کتێبدا

نووسیومانەتەوە؟؟ فێری بوین‌و فێری منداڵەکانمانی دەکەین؛ ئەوانیش فێری نەوەی خۆیانی دەکەن، هەروا هەتا ڕۆژی قیامەت!! ئەویش فەرمووی: لەشەوێکدا هەرچی لەناو دڵ‌و دەروونەدا هەیە لەناو پەڕەو کاغەزو کتێبدا چەسپاوە هەموو دەسڕێتەوە کەس هیچی لێ نازانێ‌و هەموویان وەکوو ئاژەڵیان لێ بەسەر دێ).

لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێ: ئادەمیزاد هەموویان هەژار دەکەون: واتە لەبارەی قورئانەوە. ئەمجار ئیبنو مەسعود ئایەتی ﴿وَلَئِنْ شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ﴾ی خوێندەوە.

قورطوبی دەفەرموێ: ئەم حەدیثە ئیسنادەکەی صەحیحەو لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتکراوە فەرموویەتی: قیامەت را نابێ هەتا قورئان نەچێتەوە ئەو شوێنەی لێوەی نازڵ بووە. (لَهُ دَوِيٌّ كَدَوِيِّ النَّحْلِ) ویزەیەکی لێ دێ وەکوو ویزەی هەنگ. پەروەردگار لێی پرسیار دەکا: ئەوە چیتە؟ دەڵێ خودایە! لەتۆوە ڕۆیشتم‌و بۆ لای تۆ دێمەوە، دەمخوێننەوە کارم پێ ناکەن. دەخوێندرێمەوە کارم پێ ناکەن[1].

## بەکورتی :

ئادەمیزاد لەم سەرزەوییە گەلێك زانیاری بەدەست هێناوە بەڵام لەئاستی مەسەلەی (روح)دا دەستەوەستانە، نازانێ چیە، لەکوێوە هاتووە، چۆن هاتووە، چۆن دەڕوا، بۆ کوێ دەچێ، مەگەر خودا شتێکی لەم بارەوە فێر بکا.

هەرچی لەقورئاندا هاتووە زانیاری ڕاست‌و دروستە چونکە لەخودای زاناو داناوە هاتووە، ئەگەر مەیلی بوایە بەرەی ئادەمیزادی لێ بێ بەش دەکرد، ئەو نیگایەی بۆ پێغەمبەری ناردوە دەیبردەوە بەڵام رەحمەت‌و فەضلی خودایە: کە شتی وای نەکردوە.

[1] تەفسیری قورطوبی ج٥/٢٠٢٠ لەوێدا حەدیثەکەی حوذەیفە دێنێ دەیکایەتە شایەد بۆ ئەم باسە. کەسێك دەیەوێ با بۆی بگەڕێ.

بەڵكوو قورئانی بۆ ناردون، دەیهێڵێتەوە، پارێزگاری دەكا، ئادەمیزاد بەهۆی ئەم قورئانەوە هەمیشە لەنیعەمەتو رەحمەتی خودادان. قورئان دیاری ئاسمانە بۆ زەوی، دیاری پەروەردگارە بۆ ئادەمیزاد، لەهیچ رویەكەوە بەتاڵ و پووچ توخنی ناكەوێ، زانیارییەكانی هەموو راستو حەقن، سەرچاوەی زانستو زانیارییە، نامەی هیدایەتو رێنموییی كردنی ئادەمیزادە.

جا وەكوو روح نهێنی یەكی خودایی یەو جگە لەخودا كەس پەی پێ نابـاو نازانێ چیە، قورئانیش كەلامی زاتی پەروەردگارەو كەس ناتوانێ كەلامی ئاوا بخاتە روو، ناتوانێ نموونەی ئەو قورئانە یان دە سورەتی تەنانـەت كورتترین سـورەتیش بێنێ: تەحەددایەكەو هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵە راگەیەنراوەو بەگوێچكەی ئادەمیزاددا دراوە، دەسەوەسان بوونو نەیانتوانیوە ئـەو تەحەددایـە لەسـەر خۆیـان لابەرن. ناشتوانن!

﴿قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَـذَا الْقُـرْآنِ لا يَـأْتُونَ بِمِثْلِـهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾ ئـەی پێغەمبـەر! بەتەحـەداوە بـەو موشـریكانە بڵێ: ئەگەر هەموو ئادەمیزادو جندۆكە كۆببنـەوە یـەك بگـرنو پشتگیری یـەكتر بكـەن، لەسەر ئەوەی وێنەی ئـەم قورئانـە بێننەكایـەوە، كـەلامێكی ئـاوا بـەلیغو فەصیحو رێكو پێك بێنن، نایهێنن، ناتوانن بیهێنن، بـا هـەموو ئـادەمیزادو جندۆكـە، هێـزو توانای خۆیان بخەنە گەڕو خەریك بن یارمەتی یەكتر بـدەن بـۆ هێنـانی كـەلامێكی ئاوا، بێگومان دەسەوەسان دەبنو بۆڕەخۆنو هیچیان بۆ ناكرێ.

ئەم قورئانـە وشـەو رسـتەیەكی ئاسـایی نیـە، جندۆكـەو ئـادەمیزادان بتـوانن لاسایی بكەنـەوە، بـەڵكوو ئەمـە شـاكاری دەسـتی پـەروەردگارە، ئـادەمیزادو غـەیری ئادەمیزاد ناتوانن لاسـایی بكەنـەوەو كتێبـی ئـاوا بخەنـە رو، ئـەمیش وەكـوو گیـان، كارێكە لەكاری خوداو مەخلووقات ناگەنە ئاستێك بتوانن نموونەی بهێنن، دەی جـا با عەلمانیو مولحیدو موشریكو هاوەڵانیان هەر لەورگی خۆیان بدەن، بـا هـەزارانی

وەکوو ئیبنو راوەنـدی‌و ئەوانـەی ئـەمڕۆ وەکـوو مـشکی خلەخانـەو جرجـی نـاو ژێرابەکان لـەژێر دروشمـی جۆراو جۆردا گـەزاف دەکێـشن‌و تانـەو تەشـەر دەگرنـە ئـایینی ئیـسلام‌و بەرنامەکـەی‌و دەیانــەوێ بەچـاوو راو، بــەفوو نــووری خــودا بکوژێننــەوە. بـا سـەری خۆیـان لەبـەردی رەق بـدەن، تەمـەنی خۆیـان بـەبێهوودە بەسەر بەرن!

خوێنەری هێژا! قورئان بەرنامەی ژیانـە، بەرنامەیـەکی بێ نموونـەی ژیانـە، بەرنامەیەکـە یاسـای سروشـتی تێـدا بەرچـاو گـیراوە، قـسە لەگـەڵ نەفـسی ئادەمیزادەکـان دەکـا، بـەکاری هـەموو بـارو زروفێکـی ئـادەمیزاد دێ. بـۆ هـەموو تەنگژەیەك حەلی شیاوی پێیە، یاسای سروشتی گونجاوی بـۆ هـەموو موشـکیلەیەك داناوە. بۆ هەموو دەردێك دەرمانی پێیە، دەرمـانی بنبڕکـەر! عیلاجـی شـافی، نـەك گولاجی کاتی! دەرمانەکانی عیلاجن کولاج نین!!

کـەوابێ ئیعجـازو سەرناسـایی قورئـان هـەر لـەبارەی نـەظـم‌و مـەعناوە نیـە بەڵکوو لەروی یاساو مەنهەجیشەوە سەرناسایە، لەهەموو روێیکەوە سەرناسایە!!!

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلاَّ كُفُوراً﴾

بێگومان لەم قورئانەدا هەموو مەثەلەیەکمان شەن‌و کەو کردوە، هـەموو مانایـەکی جوانمان بۆ هێناون کە لـەجوانی‌و نـاوازەیی دا وەکـوو پەنـد مـەثـەل وان بەهـەموو جۆرێك مەبەستەکانمان دووبارەو سێ بـارە کردوونـەوە، هـەر جارەو بەئوسـلوبێك بەشـێوەو شـێوازێك؛ جارێـك بـەکورتی‌و چـەلێك بەدرێـژی‌و دەمێـك بەشـێوەیەکی نەکورت‌و نەدرێژ، ئەو بەڵگەو نیشانانەمان بەگوێدا داون حەق‌و راستیمان بـۆ شـی کردوونــەوە، چـیرۆك‌و سەرگورشـتەی جیاجیامـان بـۆ گێڕاونــەوە، ترسـاندومانن هـەڵمان نـاون، فـەرمانمان پێکـردون، جڵـەوگیریمان ئاراسـتە کـردون، باسـی خۆشـی بەهەشت‌و ناخۆشی دۆزەخمان بۆ کردوون، قارو غەزەبی خودامان بۆ باس کـردون، بــۆ ئــەوەی بــەخۆتاندا بــچنەوە پەنــدو عیــبرەت وەربگــرن.

ـ کەچی وێڕای ئەوە ﴿فَـأَبَى أَكْثَـرُ النَّـاسِ إِلاَّ كُفُـوراً﴾ زۆربـەی موشـریکەکانی مەککەو هاو وێنەکانیان لەجیاتی ئەوەی پەند ئامێز بن‌و عیبرەت وەربگرن، زیاتر سوور دەبن لەسەر کوفرو بێدینی‌و ئینکاریکردنی حەق‌و ڕەتکردنەوەی ئایینی ڕاست‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر ﷺ.

## پێشنیارو پەڵپی موشریکەکان

﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٣﴾ ﴾

ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا: دەفەرموێ: پیاوماقوڵانی قوڕەیش لەلای کابە کۆبوونەوە، وتیان: بنێرن بەدوو موحەممەددا هەندێ مشت‌و مڕی لەگەڵدا بکەن، تا بیانووتان دەربارەی نەمێنێ، ناردیان بۆ لای وتیان: ئەوە

ریش سپیانی قورەیش گردبوونەوە بۆ ئەوەی هەندێك قسەت لەگەڵ بکەن، ئەویش تەشریفی بەگورجی هات وەیزانی گۆڕانکارییەك بەسەر هەڵوێستیاندا هاتووە!.

وتیان: ئەی موحەممەد! وەڵلاهی ئێمە نەمان بیستووەو نەمان دیوە کەس لەعەرەب وەکوو تۆ ئاوای لەگەڵ خۆی کردبێ، جنێو بەباوك و باپیران دەدەی، رەخنە لەئایینەکەیان دەگری، گاڵتە بەبیرو هۆشیان دەکەی، دووبەرەکیت تێدا ناوینەوە، یەکیەتی و تەبایی نێوانمان لێك پچڕاوە! ئێمە نازانین چیت دەوێ؟ ئەگەر مەبەستت ماڵ و سامانەو بۆ ئەوە وا دەکەی دەوڵەمەند ببی، ئەوە وەرە واز لەو هەڵوێستەی خۆت بێنە، هێندەت ماڵ و سامان دەدەینێ لەهەموومان دەوڵەمەندتر ببی.

ئەگەر داوای رێزو گەورەیی دەکەی دەتکەینە گەورەو سەرۆکی خۆمان.

ئەگەر ئەم حاڵەتەت لەئاکامی دەست لێوەشاندنی جندۆکەوە توش هاتووە، ئەوە ئامادەین چی ماڵ و سامانمان هەیە لەپێناو چارەسەرو چاکبوونەوەت لەو دەردە خەرج بکەین، پێغەمبەر ﷺ لەوەلامدا فەرمووی: نەخەیر ئەوەی ئێوە دەیڵێن هیچی وا نیە، من نەهاتووم داوای ماڵ و سامانتان لێ بکەم، نامەوێ بمکەنە پیاوماقوڵی خۆتان. شێتیش نیم، بەڵکوو خودای میهرەبان منی کردوە بەپێغەمبەرو بۆ سەر ئێوەی ناردووم، جا ئەگەر ئەو پەیامەی بۆم هێناون لاتان پەسندبێ و شوێنم بکەون ئەوە نیشانەی بەختەوەری دونیاو قیامەتتانە، خۆ ئەگەر پەیامەکەم رەت بکەنەوە، ئەوە من صەبر دەگرم و چاوەڕوانی بڕیاری پەروەردگارم لەنێوان من و ئێوەدا.

ئەمجار وتیان: ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ ئەم پێشنیارانەمان رەت بکەیەوەو سور بی لەسەرئەوەی کە تۆ رەوانەکراوی خودای، ئەوە داوایەکی ترمان هەیە، ئەویش ئەوەیە: بۆخۆت دەزانی وڵاتی ئێمە وڵاتێکی کوڕو تەنگەبەرە، وڵاتێکی شاخ و داخ و رەقەن و چەقەنە، گوزرەانمان گوزەرانێکی کەم و کورتە، کشت و کاڵ و

باخ‌و بێستانمان نیە، دەداوا لەخودای خۆت بکە ئەم کێوانەی دەوروبەرمان بۆ بگوێزێتەوە، ولاتمان بۆ ببێتە سارایەکی بەرفراوان، ئەمجار کانیاوو چۆم‌و جۆگەی تێدا بتەقن‌و جۆگەو جۆباری تێدا بکشێن‌و کشت‌و کاڵمانی پێ ئاو بدەین. هەروا داوا بکە ئەو باوك‌و باپیرانەی ئێمە: کە لەدونیا دەرچوون زیندویان بکاتەوە، بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکەین ئایا ئەوەی تۆ دەیڵێی راست‌و حەقە یان نا؟ هەروەها داوا لەخودات بکە باغ‌و باغاتت بۆ بەدی بێنێ، قەصرو باڵەخانەت لەزێڕو زی‌و بۆ دروست بکا، بۆ ئەوەی پێویستت بەئێمە نەبێ‌و تەماع نەکەیە ماڵ‌و سامانی ئێمە!

ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَقَالُوا لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الأَرْضِ يَنْبُوعاً﴾ی ناردە خوارێ[1].

بەڵێ بەو جۆرە بیرو بۆچونیان دەربارەی قورئان کورتی هێناو نەیانتوانی خۆیان بۆ وەرگرتنی قورئان ئامادە بکەن‌و لەئاسۆی ئیعجازیدا بکەونە پەروازی خەیاڵ‌و هەست‌و شعوریان بکەنە گوێچکەو تێی بگەن‌و وەری بگرن. دەستیان کرد بەپەلپ گرتنی نابەجێ‌و داواکردنی خاریقەی ماددی‌و پێشنیاری سەیرو سەمەرە، زوربەی پەلپەکانیان نیشانەی بێ عەقڵی‌و مندالبازاڕی‌و کەودەنی‌و نەفامییان بوو، بێ ئەدەبی‌و سەر رەقی تێدا بوو بەرامبەر زاتی پەروەردگار.

ئەوە بوو: دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی چەسپاند: کە قورئان موعجیزەو سەرئاسایە، چونکە کەلامی خودایە، هەر ئەوەش نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە ﷺ بەبەڵگە بۆڕی دان‌و وەلامی موقنیعیان پێ نەبوو، ئیتر سەرانی قورەیش (عوتبەو شەیبە: کوڕانی رەبیعە، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب‌و ئەبو جەهل‌و وەلیدی کوڕی موغەیرەو نەضری کوڕی حاریث‌و ئومەیەی کوڕی

[1] تەفسیری قورطوبی ج٥/٣٠٢٢.

خەلـەف) کەوتنـە چـاوو راوو پـەلّپ گـرتن داوای بـەدی هـاتنی یـەکێ لەشـەش نیشانەیان کرد:

١- ﴿وَقَالُوا لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى تَفْجُرَ لَنَا مِنْ الأَرْضِ يَنْبُوعاً﴾ وتیـان: ئێمـە ئیمانـت پێ ناهێنین، هەتا لەناخی مەککەدا کانیاومان بـۆ هەڵنـەقوڵێنی دەبـێ داوا لـەخوات بکەی ئاومان بۆ هەڵقوڵێو بەسەر زەویدا جاریی ببێ.

٢- ﴿أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِنْ نَخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الأَنهَارَ خِلالَهَا تَفْجِيراً﴾ یان دەبێ ئەتۆ باغێکت ببـێ لـەدار خورمـاو داری مێـوو درەختـی بـەری تـر، جۆگـەو چـەمو ئاوبارمیان بەخوڕڕەم تێدا هەڵڕژێتە خوارێ، بەو ئاوە کشتو کاڵو باغو بێستانمان ئاودێر بکەین. بۆ ئەوەی بەروبومیان زۆر ببێ.

٣- ﴿أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَـا كِـسَفاً﴾ یـان ئاسمـان پارچـە پارچـە ببێو بەسەرماندا بکەوێتە خوارێ، وەکوو بۆ خۆت دەڵێی خودای من ئەگەر مەیلی لێ بێ ئەوە دەکا! مەبەستیان ئایـەتی ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْـأَرْضَ أَوْ نُـسْقِطْ عَلَـيْهِمْ كِسَفاً مِّنَ السَّمَاءِ﴾سبأ/٩ بوو.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَـانَ هَــذَا هُـوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾الأنفال/٣٢.

ئـەی مـەحەممـەد! تـۆ هەرەشـەت لێ کـردین بـەوە رۆژی قیامـەت دێ ئاسمـان شەق دەبێ، پارچە پارچە دەکەوێتە خـوارێ. دەبـێ منـەت بـە بەپەلـە ئـەوەمان بـۆ بێنە دی، با ئاسمان پارچە پارچە ببێ بەسەرماندا بکەوێتە خوارێ.

٤- ﴿أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلائِكَةِ قَبِـيلاً﴾ یـان بەئاشـکرا ببینین خـوداو فریـشتەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بێن، پێمان بڵێن موحەممەد پێغەمبەرە، بەئاشکرا قسەمان لەگەڵدا بکەن، شایەتی بدەن بەوە کە تۆ پێغەمبەری خودایو لەخوداوە نێردراوی!

٥- ﴿أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِنْ زُخْرُفٍ﴾ یان دەبێ تۆ خانوو باڵەخانەیەکت لەئاڵتونو زێڕ هەبێ، چونکە تۆ هەتیوێکی هەژارو نەدارای، بەوحاڵەی ئێستات بەکەڵکی پێغەمبەرێتی نایەی.

٦- ﴿أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاءِ﴾ یان دەبێ بەچاوی خۆمان ببینین پەیژەیەك بەرەو ئاسمان هەڵ بنێیو بەپلیکانەکانی دا بەرەو ئاسمان سەربکەوی، ﴿وَلَنْ نُؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّى تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَاباً نَقْرَؤُهُ﴾ ئەوە بزانە ئێمە بڕوا بەبەرز بوونەوەکەت ناکەین هەتا کتێبێك؛ قەباڵە نامەیەك لەگەڵ خۆت نەهێنییە خوارێ بۆمان بخوێنیەوە. چوار فریشتەش لەگەڵ خۆت بێنیە خوارێ شایەتیت بۆ بدەن: کە هەرچی دەیلێی راست دەکەی!

﴿قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي﴾ ئەی موحەممەد! بەسەرسوڕمانەوە لەو پەلپو پێشنیارەیان، پێیان بڵێ: خودای من زۆر لەوە بەرزترە یەکێك بەخۆی رابپەرموێ: پەلپی ئاوای لێ بگرێو پێشنیاری بداتێ، ئەو بۆخۆی داناو زاناو لێزانو خاوەن دەسەڵاتو موڵكو مەلەکووتە، چی بوێو چۆنی بوێ ئەوە دەکاو ئاوا دەکا!

﴿هَلْ كُنتُ إِلاَّ بَشَراً رَسُولاً ؟﴾ ئایا من جگە لەوە: کە ئادەمیزادێکی رەوانەکراوم هیچی ترم؟! بێگومان من تەنها پێغەمبەرێکی ئادەمی سروشتم، وەکوو باقی پێغەمبەرانی پێشوو، پەیامی خودای خۆمتان پێ رادەگەیەنم، ئامۆژگاریتان دەکەم، ترسێنەرو موژدە دەرم، هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیەو ناتوانێ جگە لەوەی خودا لەسەر دەستیان دەری دەخا، شتی تر بێنێ، یان داوای بکا. خودا بەگوێرەی حیکمەتی خۆیو بەرژەوەندی ئادەمیزادان موعجیزە دەدا بەپێغەمبەرانی خۆی. ئیشی ئێوە دەربارەی پەلپو پێشنیارەکانتان عائید بەخودایە ئەگەر مەیلی لێ بوو وڵامتان دەداتەوە، مەیلیشی لێ نەبوو ئەوە هیچ. ئەوەی لەسەر من پێویست بوو ئەنجامم داوە، ئەرکی سەرشانم راگەیاندنو ترساندنو موژدەدانە، بەجێم هێناوە، ئێوەش کەیفی خۆتانە.

## شوبهەو گومانی موشریکەکان دەربارەی ئادەمیزادیەتی پێغەمبەران و ئینکاریکردنی زیندو بوونەوە

﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ

لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی موشریکەکان ئینکاری موعجیزەی قورئانیان کرد لەکاتێکدا قورئان زۆر لەو موعجیزانە گەورە ترە کە خۆیان داوای دەکەن، پەروەردگار هەواڵمان دەداتێ دەربارەی ئەو هۆکارە لاوازەی: کە ئەوان کردویانە بەبەربەست و بیانووی ئیمان نەهێنانیان، ئەویش ئەوەیە بەلایانەوە دوورو نەگونجاوە: کە پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ، فریشتە نەبێ، ئەمەش شتێکی تازە بابەت نیە، بەڵکوو ئەم شوبهەیە گەلە پێشینەکانیش بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان قوتیان کردۆتەوەو کرۆدویانە بەبیانووی ئیمان نەهێنانیان. ئەمجار شوبهەیەکی تریان باس دەکا ئەویش ئینکاریکردنی زیندوبوونەوەیە. جا کە ئینکاری زیندوبوونەوەیان کرد، پەروەردگار ئاگاداری کردنەوە بەوەی کە تواناو دەسەڵاتی خودا زۆر لەوە فراوانترە: کە ئەوان تەصەووری دەکەن. خودایەك بتوانێ ئەم زەوی ئاسمانانە دروست بکا بەئاسانی دەتوانێ پاش مردن ئێوە زیندو بکاتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمْ الْهُدَى إِلاَّ أَنْ قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَراً رَسُولاً ؟﴾ هیچ شتێك مەنعی ئادەمیزادی نەکردوە لەوەی ئیمان بێنن لەکاتێکدا پێغەمبەرو هیدایەتدەریان هاتۆتە ناو جگە لەوەی بەسەرسوڕمانەوە دەیانگوت: بۆچی خودا ئادەمیزاد دەکاتە پێغەمبەرو فروستادە؟ بەئادەمی دا پەیامی خۆی بۆ ئادەمیزادان دەنێری؟ واتە: نەخەیر شتی وا نابێ و ناگونجێ! هەرگیز پەروەردگار ئادەمیزاد ناکاتە فروستادەی خۆی! واتە: هیچکەیان

بەدەستەوە نەما بڕوبیانوویان دەهاتە سەر ئەوە چۆن دەبێ ئادەمیزاد ببێتە پێغەمبەر!؟ بەبیرو بۆچونی ئەوان دەبوایە فریشتە بکرێنە پێغەمبەر! بەڵام ئەوانە نەفامن، بێ ئاگان لەوەی فریشتە بەکەڵکی پێغەمبەرایەتی ئادەمیزاد نایە، ناشێ فریشتە لەسەر شێوەی خۆی پەیوەندی بەئادەمیزادەوە بکا، ناتوانن تێی بگەن! بەراستی ئەو بیرو بۆچونەی ئەوان شتێکی نەگونجاوو نەشیاوە، حوکمێکی فاسیدو خەیاڵێکی بێ سەروبەرە. دیارە ئەم جۆرە گومانەیان لەوەوە سەری هەڵداوە: کە نرخی خۆیان نازانن، نازانن ئادەمیزاد لای خودا چەند بەنرخە، هۆی ئەم نافامییەیانە، کە دەڵێن: نابێ پێغەمبەر لەئادەمیزاد بێ، ئەوانە بێ ئاگان لەیاسای کەون، بێ ئاگان لەسروشتی فریشتە. ئەوانە نازانن: کە فریشتە بەشێوەی فریشتەییان ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە لەسەر زەوی جێ نشین بن‌و ئێوە بیان بینن‌و لەشتی تر جیا بکرێنەوە!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە گومانیان بڕەوێنێتەوە، وڵامیان بداتەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ:﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ﴿لَوْ كَانَ فِي الأَرْضِ مَلائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِمْ مِنْ السَّمَاءِ مَلَكاً رَسُولاً﴾ ئەگەر لەسەر زەوی فریشتەی لێ بوونایەو هەڵس‌و کەوت‌و هاتوچۆیان وەکوو ئادەمیزاد بووایە، وەکوو ئادەمیزاد تێیدا نیشتەجێ بوونایەو پێویست بووایە پێغەمبەریان بۆسەر بنێرن، ئەوە لەئاسمانەوە فریشتەمان دەناردنە سەرو دەمانکردە فروستادەیان.

کەوابێ ئەی ئادەمیزادینە! ئێوە دەبێ پێغەمبەرتان لەرەگەزی خۆتان بۆ بێ، نەك فریشتە ببێتە پێغەمبەرتان. بەڵام وێ دەچێ‌و دەشێ ئادەمیزادی تایبەتی بێتە پێغەمبەری غەیری ئادەمیزادیش وەکوو پێغەمبەری ئیسلام کراوەتە پێغەمبەری ئادەمیزادو جندۆکە، چونکە جندۆکە دەتوانن ئامۆژگاری لەو جۆرە ئادەمیزادانە وەربگرن‌و لێی تێبگەن.

ئەگەر خودا وای تەقدیر بکردایە: کە فریشتە لەسەر زەوی نیشتەجێ بن، ئەوە لەشێوەی ئادەمیزاددا رەنگی دەرشتن، چونکە ئەو شێوەو روخسارە لەگەڵ یاسای بوونەوەرو سروشتی زەوی دەگونجێ.. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكاً لَّجَعَلْنَاهُ رَجُلاً وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ﴾الأنعام/٩. هەرچەندە پەروەردگار توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، وەلێ یاساو نیزامێکی بۆ ئەم بوونەوەرە داناوە، بەویستو ئیرادەی خۆی مەخلووقاتی خۆی بەگوێرەی ئەو یاسایە دروست کردوە، بڕیاری ئەوەشی داوە: کە ئەم یاسایە بەردەوام بێو گۆڕانی تێدا نەبێ و نەوەستێ، چونکە حیکمەتی خودای تێدا هاتۆتە جێ، وەلێ ئەو نەفامانە ئاگایان لێ نیە[1].

ئێستا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە خۆی دەنوێنێ، پرسیارەکەش ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ ئادەمیزاد بووە، ئەدی چۆن توانیویەتی نیگا لەجوبرائیلەوە وەربگرێ؟ لەوەڵامدا دەگوترێ: وەرگرتنی نیگا لەجوبرائیل ﷺ پێویستی بەئامادەباشییەکی تایبەتی هەبوە، جۆرێکە لەموعجیزە، ئەم ئامادەباشییە تایبەتییەو جۆرە موعجیزەیەکە بۆ پێغەمبەران دەستەبەر کراوەو خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی ئەم بەهرەیەی پێ بەخشیون، حەزرەتی موحەممەدیش ﷺ کە خاتەمو سەروەری پێغەمبەرانە هەڵبەتە لەهەموو پێغەمبەران باشتر ئەم موعجیزەیەی بۆ فەراهەم هێنراوە. پێغەمبەران هەڵبژاردەی پەروەردگارن نەفسو گیانێکی تایبەتیو پاڵفتەیان پێ بەخشراوە، خودا بەجۆرێکی دروست کردوون دوو سیفەتو باریان هەیە، بارو سیفەتی فریشتەییو بارو سیفەتی ئادەمی، بەصیفەتی فریشتەییان نیگا لەجوبرائیل وەردەگرن، بەصیفەتی ئادەمییان ئەوەی وەری دەگرن بەئادەمیزادانی رادەگەیەنن!

---

[1] فی ظلال القرآن ج٥/٣٦٠.

جا کە ئەوە دابو نەریتی خودا بێ لەبوونەوەرداو بەو شێوە بڕیاری دابێ، ئیتر فەرمان بە پێغەمبەر دەکا، کەواز لەموشریکەکان بێنێو چی دی مشتو مڕیان لەگەڵ نەکاو کۆتایی بەدەمە دەمێ بێنێ لەگەڵیاندا، ئیشی خۆیو کاری ئەوان حەواڵەی پەروەردگار بکا، دەفەرموێ: ﴿قُلْ:﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: قسەی کورتو موختەصەر بەڵگەی بەهێزو گورچکبڕ ئەوەیە: خودا شایەدەو ئاگاداری نێوان منو ئێوەیە، شایەتە بەسەر منو ئێوەشدا دادوەرە لەنێوانماندا، زانایە بەو پەیامەی هێناومە، دەزانێ چۆنم پێ ڕاگەیاندون، ئەگەر درۆ بکەم توندترین تۆڵەم لێ دەسێنێو سزام دەدا وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ﴾الحاقة/٤٤-٤٦. یان دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً﴾الأنعام/٢١.

﴿كَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيراً بَصِيراً﴾ بێگومان خودای تاکو تەنیاو باڵادەست ئاگادارە بەوەی کێ شیاوی هیدایەتەو کێ ئامادەباشی گومڕابوونی تێدایە، ئاگادارە بەوەی لەناو دڵیاندا حەشاریان داوە، ئەوان ئەو شوبهەو گومانانەیان لەڕوی حەسودیو کورسی پەرستی یەوەیە. ڕو لەحەق وەردەگێڕنو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەون. ئێمە زاناو بیناو شنەواین بەهەموو کارو کردەوەیەکی بەندەکانمان! هەڵبەتە ئایەتەکە بۆنی هەڕەشەی لێ دێ بۆ کافرەکانو دڵدانەوەی پێغەمبەریشی تێدایە. ئەمجار ئاکامی هەموو لایەك لەدیمەنێکی سامناکی ڕۆژی قیامەتدا وێنە دەکێشێو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي﴾ کەسێك خودا هیدایەتی بدا بۆ ئیمانهێنان ئەوە بەراستی هەر ئەو ڕێگای حەقی دۆزیوەتەوە ﴿وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِهِ﴾ کەسێکیش خودا گومڕای بکاو ئامادەباشی گومڕابوونی تێدابێ ئەوە تۆ دەستت ناکەوێ کەسێکی تر جگە لەخودا بیانخاتە سەر ڕێبازی حەقو ڕاست. هەروا بەگومڕایی

دەمێننەوەو نایەنە سەر ڕێبازی حەق.. کەوابێ تۆ خەفەتیان بۆ مەخۆ، بەهەڵوێستی نادروستیان دڵگران مەبە!!

مەبەست دڵدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ چونکە کەسێك لەبنەڕەتدا خودا بڕیاری دابێ ئیماندار‌بێ‌و هیدایەتدراوبێ ئەوە هەر دەبێ بەرەو ئەو ئاکامە بڕواو ئەو بەهرەیەی دەست بکەوێ‌و دەبێ موسوڵمان ببێ چونکە زانیاری خودا گۆڕانی بەسەردا نایە. کەسێکیش لەزانیاری خودادا بەگومڕاو کافر لەقەڵەم درابێ؛ بەم جۆرە خودا زانیبیەتی کە ئەو بەویستی خۆی ڕێگای گومڕایی ڕەچاو دەکاو سوور دەبێ لەسەر کوفرو بێدینی، ئەوە محاڵە لەو گومڕایی یە ڕزگاری ببێ‌و کەسێك هەبێ بتوانێ بیخاتە سەر ڕێبازی ڕاست. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيّاً مُّرْشِداً﴾الكهف/١٧.

بێگومان خودای زاناو داناو تاك‌و تەنیا، بۆ هیدایەت‌و گومڕابوون یاساو قانوونی داناون، ئادەمیزادانی سەربەست کردون بەگوێرەی ئەو یاساو قانوونانە هەڵس‌و کەوت بکەن، بەرپرسیاری ئاکامەکانیشی بن. بەشێك لەو یاسایانە ئەوەیە: ئادەمیزاد ئامادەباشی هیدایەت وەرگرتن‌و گومڕابوونی تێدایە، بۆ خۆی بەویستی خۆی لەڕێبازگەی ژیانی دا هەوڵی لایەکیان دەداو ڕێگایەکیان هەڵدەبژێرێ‌و پەیڕەوی دەکا، جا ئەو کەسەی بەهۆی هەوڵ‌و تێکۆشانی خۆیەوە لەئاکامی ڕوکردنە ڕێبازی حەقەوە، شیاوی هیدایەت بێ ئەوە هیدایەتدراوی بەڕاستی ئەوە، چونکە شوێنی هیدایەتی خودا کەوتووە، ئەوانەیش: کە بەهۆی ڕووەرگێڕانی خۆیان لەڕێبازی حەق‌و بەڵگەکانی هیدایەت شیاوی گومڕابوون بوون، ئەوە کەس ناتوانێ لەعەزابی خودا بیانپارێزێ.

هەبوونی زانیاری ئەزەلی‌و بڕیاری ئەزەلی خودا دەربارەی هیدایەت‌و گومڕایی ئادەمیزاد مانای ئەوە نیە زۆرە ملێ کردن بێ لەئادەمیزاد، بەوە ئیمان یان کوفر وەربگرن! چونکە ئادەمیزاد لەچوارچێوەی ئەوەی خودا بۆی هەڵبژاردوە ئازادو

سەربەستە! واتە: ئینسان بەئارەزۆی خۆی ڕێبازێك لەو دوو ڕێگایە هەڵدەبژێرێ، ئەگینا لەراستی دا ئادەمیزاد ویستو ئیرادەی نیە مەگەر ئەو شتەی خودا ویستو ئیرادەی لەسەرە.

جا ئەم مەشیئەتە گشتیو ڕەهایەی خودا ئازادی بۆ ئادەمیزاد دەستەبەر کردوە، بەجۆرێك دەتوانێ بەویستی خۆی ڕێبازی هیدایەت بگرێتە بەرو ئیمانو باوەڕی خۆی پتەو بکا. یان ڕێبازی گومڕایی بگرێتە بەرو خۆی بەدبەختو ماڵوێران بکا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً﴾الإنسان/٣.

ئەمجار سزای گومڕایان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْياً وَبُكْماً وَصُمّاً﴾ ئێمە دوای ئەوەی ڕۆژی قیامەت لەگۆڕەکانیان راستیان دەکەینەوە، ڕاکێشی دەشتی مەحشەریان دەکەین، بەسەر ڕوویاندا ڕایان دەکێشین، کوێرن هیچ نابینن، لاڵنو متەقیان بۆ ناکرێ، کەڕنو هیچ نابیسن. وەکوو چۆن لەدونیادا هەستەکانی خۆیان لەکار خستونو لەشوێنی شیاوی خۆیاندا بەکاریان نەهێناون (هەرچەندە بەرواڵەت بینەرو بیسەرو گفتو گۆیان هەبوە) جا لەتۆڵەی کردەوەی ناڵەباریان دا دەبێ لەقیامەتدا ڕێگەی ڕزگاربوون نەبینن چاویان پێی فێنك نەبێتەوە. قسەیەك نەکەن لێیان وەرگیرێ، شتێك نەبسین کەیفخۆشیان بکا. ئەوان لەجیهاندا لەئاستی حەق کوێر بوون دەبێ لەقیامەتدا کوێرتر بن! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَانَ فِي هَـذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾الاسراء/٧٣.

موسلیمو بوخاریو ئەحمەد لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: گوترا: ئەی ڕەوانەکراوی خودا چۆن ڕۆژی قیامەت ئادەمیزادان لەسەر ڕوکێش دەکرێنو کۆ دەکرێنەوە.؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (الذي أمشاهم على

أرجلهم قادر على أن يمشيهم على وجوههم) ئەو كەسەی لەسەر قاچ رۆیاندونی دەتوانێ لەسەر روو بیانرۆیەنی!!

تیرمیذی ریوایەتێكی هێناوە؛ دەفەرموێ: ئادەمیزادان لەسارای مەحشەردا دەبنە سێ تاقم، هەیە پێرۆیە هەیە ئەسپ سوارە، هەیە لەسەر رووانی رادەكێشرێ.

ئیمام ئەحمەد لەحوذەیفەی كوڕی ئوسەید ریوایەت دەكا؛ دەڵێ: ئەبو ذەڕ هەستا وتی: ئەی خێڵی غەففار! قسە بكەن‌و سوێند مەخۆن. راستگۆ بۆی گێڕامەوە فەرمووی: (ان الناس يحشرون على ثلاثة أفواج: فوج راكبين طاعمين كاسين، وفوج يمشون ويسعون، وفوج تسحبهم الملائكة على وجوههم وتحشرون الى النار). دەستەی سێهەم كە لەسەر رویان رادەكێشرێن هەر بەوەندە سزادانەكەیان كۆتایی نایە، ئەوە خۆیی كێشتیانە! ﴿مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ شوێن‌و جێگای حەوانەومیان بۆ هەتا هەتایە دۆزەخە، كە سارد نابێتەوە هەمیشە لەگڕو لرفەدایە ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيراً﴾ هەر كاتێ بڵێسەكەی دا بمركێ، بەم جۆرە پێست‌و گۆشتیان بسوتێ‌و ببرێتەوە ئیتر سەر لەنوێ پێست‌و گۆشتەكەیان بۆ نوێ دەكەینەوە گڕو بڵێسەی دۆزەخ بەو سوتەمەنییە نێڵە نێڵە دەدرێتەوە، ئاگرەكە زیاد دەكاتەوە پشكۆكانی باشتر دەگەشێنەوە ئاوا بەو جۆرە عەزابو سوتاندنیان دوبارەو سێبارە دەبێتەوە، بەراستی سەرەنجام‌و ئاكامێكی ترسناكە، عەزابێكی بەئێش‌و دژوارە، بەڵام ئەوە شیاوی خۆیانەو عەزابێكە پڕ بەپێستیانە ﴿ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا﴾ ئەو عەزابە بەئێشەیان بۆیەیە چونكە ئەوان لەجیهاندا بەئایەتەكانی ئێمە كافر بوون، ئینكاری زیندوبوونەوەیان كرد، نیشانەی هەبوونی خودایەكی تاك‌و تەنهاو خاوەن دەسەڵاتیان رەت دەكردنەوە، بەلایانەوە شتێكی دوورو نەگونجاو بوو زیندوبوونەوە هەبێ، ﴿وَقَالُوا﴾ دەیانگوت: ﴿أَئِذَا كُنَّا عِظَاماً وَرُفَاتاً أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقاً جَدِيداً﴾ چۆن دەگونجێ پاش ئەوەی ئێمە مردین‌و بوینە ئێسقانە رزیوو پۆڵكاین‌و بووینەوە

بـەگڵو خـۆڵ جـارێکی تـر سـەر لـەنوێ زینـدو بکرێینـەوە، ئایـا پـاش رزیـنو بڵاوبوونەوەی گڵو خۆڵەکانمان بەناو زەویدا جارێکی تر زیندو دەکرێینەوە؟؟

ئیتر پەروەردگار جارێکی تـر دەگەڕێتـەوە سەریان بـۆ ئـەوەی مشتو مڕیـان لەگەڵدا بکا بەمەنطیقی واقیعی، بەشتێك بۆڕیان بدا کـە هـەموویان دەیبینـن لێـی غافلن! بەڵگە لەسەر هاتنی رۆژی قیامـەتو زیندوبوونـەوە دێنێتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ ؟﴾ ئایـا نازانن، بیر لەوە ناکەنەوە کە ئـەو خودایـەی ئاسمانـەکانو زەوی بـەو شـێوە جوانـە بەدی هێناون، ئایا ناتوانێ جارێکی تر ئەوانە دروست بکاتەوە؟؟ زیندوکردنەوە بـۆ خودا کـەی کارێکی ئەستەمە؟؛ خـودا بەدیهێنـەری ئـەم بوونـەوەرە بەرفراوانەیـە، کەسـێك تـوانیبێتی ئـەم بونـەوەرە لەنـەبوەوە درسـت بکـا، بێگومـان دەتـوانێ پـاش مـردن ئێـوە سـەر لـەنوێ دروسـت بکاتـەوە. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾غـافر/٥٧. یـان دەفـەرموێ: ﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمِ السَّمَاء بَنَاهَا﴾النازعـات/٢٧. کـەوابێ دروسـت کردنـی ئـادەمیزادو سەرلەنوێ جارێکی تر زیندوکردنەوەی زۆر زۆر لەدروستکردنی ئاسمانـەکانو زەوی ئاسانترە، هەرچەندە بۆ خودا کاری ئاسانو کاری گران وەکوو یـەك وان، بەنیـسبەت خوداوە کاری ئاسانو کاری گران نیە هەموو کارێك بۆ خودا ئاسانە!

جا کە هاتنی قیامەتو زیندوبوونـەوە خـۆی لەخۆیدا کـارێکی مـومکین بـێ، دیارە بۆ پەیدابوونەکەی کاتێکی دیاریکراو هەیە، دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلاً لا رَيْبَ فِيهِ﴾ پەروەردگار بۆ هاتنی قیامەتو زیندوبوونەوەو راستبوونەوەی ئادەمیزاد لـەگۆڕەکانیان کـاتێکی دیـاریکراوو مەزنـدەکراوی هەیـەو هـەر خـودا خـۆی دەزانـێ کەیـە! ماوەیـەکی دیـاریکراو هەیـە دەبـێ ئـەو ماوەیـە تێپـەڕێ ئـەمجار قیامـەت رادەبـرێ، هـەر کـاتێ مـاوەی دیـاریکراو تێپـەڕی بەتەئکیـد قیامـەت هەڵدەسـتێو گومانی تێدا نیە.

وێڕای ئه‌و هه‌موو به‌ڵگه‌و نیشانانه که‌چی ﴿فَأَبَى الظَّالِمُونَ إِلاَّ كُفُوراً﴾ کافره سته‌مکاره‌کان بێجگه له‌گومڕایی‌و سه‌ر ره‌قی‌و ئینکاریکردنیان هیچی تر زیاد ناکه‌ن.

جا ئه‌وانه‌ی په‌لپ ده‌گرن‌و پێشنیاری جۆراو جۆر ده‌خه‌نه به‌رده‌م پێغه‌مبه‌رو ده‌مێك ده‌ڵێن: ده‌بێ خانووی له‌زێر دروستکراوت هه‌بێ، یان باخی داخورماو ترێت هه‌بێ کانی‌و کانیاویان تێدا هه‌ڵقوڵێن....هتد. هۆی قبوڵ نه‌کردنی پێشنیاره‌کانیان به‌خیلی‌و رژدییانه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ﴾ ئه‌ی موحه‌ممه‌د! به‌و موشریك‌و خاوه‌ن پێشنیارانه بڵێ: ﴿لَوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَائِنَ رَحْمَةِ رَبِّي إِذاً لأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ الإِنفَاقِ﴾ ئه‌گه‌ر ئێوه ته‌صه‌روفی هه‌موو گه‌نج‌و خه‌زینه‌ی خوداتان بکه‌وێته ژێر ده‌ست له‌سه‌ر حاڵه‌تی رژدی‌و چروکی خۆتان ده‌مێننه‌وه‌و له‌ترسی هه‌ژاری هیچتان لێ نه‌ده‌به‌خشی. له‌ترسی ئه‌وه‌ی بڕێته‌وه‌و نه‌مێنێ ده‌ستتان له‌ماڵبه‌خشین ده‌گرته‌وه. هه‌رچه‌ند گه‌نج‌و خه‌زێنه‌ی خودا بڕانه‌وه‌ی نیه. به‌ڵام رژدی‌و چروکی له‌گه‌ڵ سروشتتان تێکه‌ڵاو بووه. که‌وابێ وڵامی پێشنیاره‌کانتان نادرێته‌وه‌و په‌ڵپه‌کانتان جێ به‌جێ نابن.

﴿وَكَانَ الإنسَانُ قَتُوراً﴾ ئاده‌میزاد سروشتی وایه: به‌خیل و رژده، وه‌کوو له‌ئایه‌تێکی تردا ده‌فه‌رموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذاً لاَّ يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيراً﴾النساء/٥٣. واته: ئه‌گه‌ر ئه‌وانه به‌شێکیان له‌موڵکی خودا هه‌بوایه تۆزقاڵێکیان لێ نه‌ده‌دا به‌که‌س؛ ته‌نانه‌ت با به‌ئه‌ندازه‌ی ده‌زووله‌ی درزی ناوکه خورمایه‌کیش بێ.

## پوخته‌ی مانا :

خودا وڵامی موحه‌ممه‌دی نه‌دایه‌وه بۆ به‌جێ هێنانی پێشنیاره‌کانتان، نه‌ك له‌به‌ر ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری خۆی به‌لاوه که‌مبایه‌خ بێ، یان له‌به‌ر ئه‌وه بێ

موحەممەد پێغەمبەر نەبێ، یان لەبەر بەخیلی خودا بی، حاشا ئەمانە هیچیان نین. بەڵکوو کە وڵامتان ناداتەوە، چونکە زۆر جار عەطاو بەخششی زۆر دەبێتە هۆکاری بەڵاو موصیبەت بۆ خەڵك! بەنیسبەت ئێوەشەوە هۆیەکەی بەخیلیو رژدیتانە، ئەگەر لەفەرزێکدا خێرو بەرەکەتی ئاسمانو زەویتان بدرێتێ جگە لەرژدیو بەخیلی بەولاوە هیچی تر نازانن. بۆیە هەرگیز کلیلی خەزینەی خوداتان نادرێتە دەست، نەوەکوو بۆ خۆتانی قۆرغ بکەنو خەڵکی تر سودی لێ وەرنەگرێ.

ئایەتەکە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر رژدی ئادەمیزادو بەخشندەیی پەروەردگار. لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرمودەیەك هاتووە دەفەرموێ: (ید الله ملأی، لایغیضها نفقة، سخاء اللیل واالنهار، ارأیتم ماأنفق منذ خلق السموات والأرض، فانه لم یغض مافي یده) دەستی رەحمەتی خودا پڕە، لێ بەخشین کەمی ناکاتەوە، لێ بەخشین بەشەوو بەرۆژ لێی کەم ناکاتەوە، دەبێ لەوەتای ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوە چەندەی بەخشیبێ؟؟ بێگومان ئەو لێ بەخشینە هیچی لێ کەم نەکردۆتەوە.

## نۆ موعجیزەی حەزرەتی موساو صیفەتو چۆنیەتی نازڵکردنی قورئان

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۖ فَسْـَٔلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار سـەرڕەقی‌و ئینكـاری قوڕەیـشییەكانی گێڕایـەوە، بەربـەرەكانی‌و دژایـەتیكردنیان بـۆ پێغەمبـەرو پەیامەكـەی باسكرد، ئـەمجار دەس دەكـا بەدڵدانـەوەی پێغەمبـەر ﷺو هـەڵس‌و كـەوت‌و هەڵوێـستی فیرعـەون‌و دارو دەستـەكەی بەرامبـەر موسـاو پەیامەكـەی وەبیـر پێغەمبـەر دێنێتـەوە. ئـەوەتا: كـە موشریكەكانی مەككە داوای ئەوە دەكەن: كە خودا بێتە لایان، یان بەچاوی خۆیـان خودا ببینن، قەومی موساش وتیان: ئەی موسا! ﴿أَرِنَا اللَّهِ جَهْرَةً﴾ بەئاشكراخودامان

نیشان بده. ئەگەر موشریکەکانی مەککە پەلپی موعجیزەو خاریقەی ماددی جۆراو جۆرت لێ دەگرن ئەوەتا قەومی موساش داوای موعجیزەو خاریقەی مادی جۆراو جۆریان لەموسا کردوە. جا لەگەڵ ئەوەدا خودا نۆ خاریقەی ماددی بۆ موسا دەستەبەر کرد کەچی قەومی فیرعەون پەندئامێز نەبونو رویان لەگۆڕەپانی ئیمان نەکرد؛ ئەو هەموو خاریقە ماددیانە نەیانتوانی بیرو باوەڕ لەو دڵە رەقانەدا برووێنن!

ئەمجار دێتە سەر باسی چۆنیەتی نازڵکردنی قورئان وەجبە وەجبەو بەشبەشو ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەو کەلامە کەلامێکی حەقەو لەخوداوە نێردراوە.

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ بێگومان نۆ موعجیزەی ئاشکراو بەرچاومان دا بەموسی بۆ ئەوەی ببنە بەڵگە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی لەو کاتەدا کە ناردمان بۆ لای فیرعەونو دارو دەستەکەی، کەچی ئیمانیان پێ نەهێناو سوور بوون لەسەر کوفرو ملهوڕی خۆیان وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْماً مُّجْرِمِينَ﴾الأعراف/١٣٣. یان دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً﴾النمل/١٤.

**بێگومان لەقورئاندا پەروەردگار شانزە موعجیزەی حەزرەتی موسای باسکردون:**

١- لابردنی گرێی زوبانی ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي﴾

٢- بونی گۆچانەکەی بەمار.

٣- یەدی بەیضا.

٤- طۆفان.

٥- کولله.

٦- ئەسپێ.

٧- بۆق.

٨- خوێن.

٩- قوتدانی عەصاکەی بۆ مارە درۆزنەکانی ساحیرەکان.

١٠- دوو لەتبوونی دەریا.

١١- هەڵقوڵانی ئاو لەبەرد کە بەعەصاکەی لێ یدا.

١٢- بەرزبوونەوەی کێو بۆ سەر بەنوئیسرائیلی.

١٣- نازڵکردنی گەزۆو گۆشتی شێلاقە بۆ سەر گەلەکەی.

١٤- گرانی.

١٥- کەمبوونی بەروبوم.

١٦- پوچەڵکردنەوەی ماڵو گەنمو ئاردو خواردەمەنییان.

زانایانی تەفسیر راجیاییان تێدا پەیدا بووە دەربارەی دەست نیشانکردنی ئەم نۆ خاریقە ماددییانەی ئێرە.

عەبدوررەزاقو سەعیدی کوڕی مەنصورو ئیبنو جەریرو ئیبنولمونذیر لەچەند رێگەیەکەوە لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە فەرموویەتی: ئەو نۆ ئایەتە (عەصاو یەدی بەیضاو طۆفانو کوللەو ئەسپێو بۆقو خوێنو گرانیو کەمبوونی بەروبووم))بووە.

برێ لەراڤەکەرانی قورئان پێیان وایە: مەبەست بەنۆ ئایەتەکان ئەحکامە شەرعییەکانن: ئەحمەدو بەیهەقیو طەبەرانیو نەسائیو ئیبنو ماجە ریوایەتیان کردووەو دەڵێن: (دوو جولەکە بەکیان بەئەوی تریانی گوت: هەڵسە با بڕۆین بۆ لای ئەو پێغەمبەرە پرسیاری لێ بکەین، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لێ کرد

دەربارەی ئایەتی ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوەڵ بۆ خودا دامەنێن، زینا مەکەن، بەناحەق کەس مەکوژن، دزی مەکەن، جادوبازی مەکەن، سوود مەخۆن، بێ تاوان مەبەنە لای خاوەن دەسەڵات بۆ ئەوەی بیکوژێ، بوختان بەئافرەتی داوێنپاك مەکەن، ئێوە کۆمەڵی جولەکە بەتایبەتی نابێ لەشەممەدا سەرپێچی فەرمانی خودا بکەن خودا لەو رۆژەدا راوی ماسی لێ حەرام کردن، کەچی بەفێڵ دەچون راوەماسیتان دەکرد: ئیتر هەردوکیان دەستو قاچی پێغەمبەریان ماچ کردو وتیان: شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی چی ناهێڵێ ئێوە موسوڵمان بن؟ لەوەڵامدا وتیان: حەزرەتی داود لەخودا پاڕاوەتەوە کە لەوەچەو نەوەی ئەو، پێغەمبەر بەردەوام بن، ئێمە ترسی ئەوەمان هەیە ئەگەر ئیمانت پێ بهێنین جولەکە بمانکوژن![1]

﴿فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەی پێغەمبەر! پرسیار لەبەنو ئیسرائیلیەیە هاوچەرخەکانت بکە؛ ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوی، وەکوو عەبدوڵڵای کوڕی سەلامو هاوەڵانی. با ئەوانیش بۆت بگێڕنەوە دڵنیاییو یەقینت زیاد بکاو بزانی: کە ئەو مەسەلە لای ئەوان چەسپاوە.

﴿إِذْ جَاءَهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَى مَسْحُوراً﴾ واتە: پرسیاریان لێ بکە دەبارەی ئەو کاتەی موسا هاتە سەر باوكو باپیرانیانو ئەم ئایەتانەی بۆ هێنانو بەفیرعەونیشی راگەیاندن. ئیتر فیرعەون پێی گوت: من وا گومان دەبەم ئەی موسا! تۆ شێت بووی، عەقڵت تێك چووە. بۆیە ئەم قسە هەڵەقو مەڵەقانە دەکەی. دیارە سیحرو جادوبازییان لێ کردووی!

---

[1] تیرمذی لەباسی تەفسیر (باب ١٨) ژمارە (٣١٤٤)و نەسائی لەبابی تأویل قول الله جل ثناؤة (ولقد آتینا موسی تسع آیات بینات)داو ئیبنو ماجە لە (باب ١٦) ژمارە (٣٧٠٥) ریوایەتیان کردووە.

﴿قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَؤُلاء إِلاَّ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ بَصَائِرَ﴾ موسا لەولامدا بەفیرعەونی فەرموو: ئەتۆ دڵنیای لەوەی؛ کە ئەم نۆ ئایەتە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی بۆیەی نازڵ کردون ببنە شایەت لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی منو راستی ئەو پەیامەی پێم راگەیاندون، ئەم ئایەتانە ئادەمیزاد هیدایەت دەدەن بۆ رێبازی راستو رێنومایین بۆ کەسێك بیەوێ پێیان هیدایەت ئامێز بێ. هەر کەسێ تێیان بفکرێو لێیان ورد بێتەوە دەزانێ لەخوداوە هاتوون موعجیزەنو جگە لەخودا کەسی تر ناتوانێ موعجیزەی ئاوا بەدی بێنێ. ﴿وَإِنِّي لأَظُنُّكَ يَا فِرْعَونُ مَثْبُوراً﴾ ئەمن پێم وایە: ئەتۆ ئەی فیرعەون! لەحەق لاتداوەو سروشتت لەسەر شەڕ دامەزراوە. لەحەق وەرزیو حەزت لەشەڕە.

﴿فَأَرَادَ أَنْ يَسْتَفِزَّهُمْ مِنْ الأَرْضِ فَأَغْرَقْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ جَمِيعاً﴾ فیرعون ویستی موساو نەتەوەکەی لەئاخی میصر وەدەرنێ بەکوشتنو بەدەرکردن لەخاکی میصردا بنەبڕیان بکا، بەلام ویستەکەی نەهاتەدیو بەپێچەوانەوە هاتەوە؛ ئەوە بوو خۆیو قەومەکەیمان لەدەریادا خنکاندو بەو شێوە ترسناکە ئاسەوارمان بڕینەوە!

﴿وَقُلْنَا مِنْ بَعْدِهِ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ اسْكُنُوا الأَرْضَ﴾ واتە: موساو نەتەوەکەیمان لەو خنکانە رزگار کردو، پاش خنکانی فیرعەونو دارو دەستەکەی بەموساو بەنو ئیسرائیلی یەکانمان وت: نیشتەجێ بن لەو خاکە پیرۆزەدا: کە فیرعەون بەتەمابوو لێی وەدەرتان نێ، جا ئەو خاکە یا خاکی میصرە یا خاکی شامە. کە ئاخی میعادەو خاکی وادە پێدراوتانە.

جا ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الآخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفاً﴾ کە وەختی قیامەت هات ئێوەو ئەوان بەتێکەڵاوی راکێشی سارای مەحشەر دەکەین، حیسابو لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکەینو بڕیاری خۆمان دەربارەی ئێوەو ئەوان دەردەکەین، کامەرانو بەدبەختەکانتان لێك جیا دەکەینەوە.

ئەوە نموونەیەك بوو لەموعجیزە ماددییەكان، بڕوانن بەدرۆخەرەوەكان چۆن پێشوازییان لێ كردن، دابو نەریتی خودا چۆن جەرمیانی كردو چی بەسەر هێنان‌و چۆن ریشەكێشی كردن؟؟ جا ئێوەش ئەی موشریكەكانی مەككەو بێ باوەڕانی سەردەم! بەهۆش خۆتان بێنەوەو بەخۆتاندا بچنەوە، بزانن ئەگەر موحەممەد ئەو موعجیزە پێشنیار كراوانەی ئێوەی بنواندنایەو ئێوە یەكسەر ئیمانتان پێ نەهێنایە دەست بەجێ پەروەردگار عەزابی ریشەكێشكەری بۆ دەناردن‌و لەناوی دەبردن، بەڵام حیكمەتی خودا وا داخوازبوو: كە پێشنیارەكانتان قبوول نەكرێن‌و وڵامتان نەدرێتەوە، چونكە خودا بۆ خۆی دەیزانی كە بڕێك لەئێوە ئیمان دەهێنن‌و بڕێكتان ئیمان ناهێنن! ئەوانەشیان كە ئیمان ناهێنن وەچەونەوەكانیان موسوڵمان دەبن.

ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆ سەر باسی قورئان‌و چۆنیەتی نازڵبونی دەفەرموێ: ﴿وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ﴾ ئێمە قورئانمان بۆسەر نازڵ كردوی‌و حەق‌و راستی لەخۆگرتووە، فەرمان بەعەدالەتكاری‌و ویژدان بەخەرجدان‌و رەوشت جوانی دەكا، جڵەوگیری لەستەمكاری‌و كرداری ناشیرینی تر دەكا، بەلگەو نیشانەی یەكتاپەرستی‌و زیندوبوونەوەو پێویستی ئادەمیزادان بەپێغەمبەر بۆ سەر ناردن‌و پێغەمبەرایەتی لەخۆگرتووە.

﴿وَبِالْحَقِّ نَزَلَ﴾ ئەم قورئانە بۆ تۆ نێردراوە ئەی موحەممەد! بەپارێزراوی‌و پاك‌و خاوێنی، هیچی تێكەڵاو نەبوە، زیادو كەمی تێدا نیە، بەڵكوو بەهۆی حەقەوە: كە جوبرائیلەو مونەوەرێكی بەهێزو تواناو ئەمین‌و رێزدارە - نازڵمان كردوە. قورئانمان نازڵ كردوە بەو حیكمەت‌و لێزانیەی كە داخوازە بۆ هێنانە خوارەوەی. واتە: هەر بەشتی هەق‌و راست‌و دروستەوە نازلكراوەو هەرچی تێیدایە راست‌و حەقەو رەوایە!

دوای بەیانکردنی صیفەتی قورئان باسی ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ مُبَشِّراً وَنَذِيراً﴾ ئەی موحەممەد! ئێمە کە تۆمان کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەمان کردوی بۆیەمان رەوانە کردوی مژدەدەرو تَرسێنەربێ بۆ ئادەمیزادان؛ موژدەی بەهەشت بدەی بەوانەی ئیمانت پێ دەهێنن، ئەوانەی ئیمانت پێ ناهێنن بەئاگری دۆزەخ بیانترسێنی.

ئەمجار دێتەوە سەر بەیانکردنی نازڵکردنی قورئان وەجبە وەجبەو بەشبەش بەگوێرەی روداوو پێویستی رۆژگار. دەفەرموێ: ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً﴾ قورئانێکمان بۆ سەر نازڵ کردووی بەشێوەی بەشبەش‌و وەجبە وەجبە لەماوەی بیست‌و سێ ساڵدا بەگوێرەی پێویست‌و روداو بەو شێوەی بەرژەوەندی‌و حیکمەت داخوازیەتی سورەت سورەت‌و ئایەت ئایەت نازڵ کراوە.

هۆی نازڵکردنەکەی بەو شێوە پچڕ پچڕیە بۆ ئەوەیە بەکاڵەوخۆ بەسەر ئادەمیزادەکان دا بیخوێنیەوەو ئەوانیش وەری بگرن‌و لێی حاڵی بن.

چونکە ئەم قورئانە بۆیە نازڵکراوە گەل‌و ئوممەت دروست بکا نیظام‌و یاسایان بۆ دابنێ، گەلێك دابمەزرێنێ قورئانەکە هەزم بکەن‌و بەچوار دەوری جیهاندا بڵاوی بکەنەوە، ئادەمیزاد فێری یاساکانی بکەن‌و بەندەکانی بچەسپێنن، کاری پێ بکەن، بۆیە بەو شێوەو وەجبە وەجبە قورئان هاتۆتە خوارێ، بەگوێرەی پێویستی‌و بەدی هاتنی روداوەکان‌و تاقیکردنەوەیەکی عەمەلی هاتۆتە خوارێ. چینی موسوڵمانانی یەکەمیش بەوپەڕی ئامادەباشییەوە پێشوازییان لەفەرمان‌و نەهیەکانی، لەپەندو مەثەلەکانی لەچیرۆك‌و سەرگورشتەکانی دەکردو لەهەست‌و شعوری خۆیاندا لەهەڵوێست‌و هەڵس‌و کەوتیاندا رەنگی دەدایەوە. لەناو ماڵ‌و خێزانیاندا، لەبازاڕو لەمزگەوتدا لەگەڵ خۆیان‌و لەگەڵ خەڵکدا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە تەوجیهاتەکانی قورئانیان تەنفیذ کردوە..

ئیبنو مەسعود ﷺ دەفەرموێ: هەر یەکێ لەئێمە کە دە ئایەت فێر دەبوو وازی لێ نەدەهێنا هەتا باشباش فێری ماناکانیان دەبوو کاریشی پێ دەکردن.

**بەکورتی** :

قورئان بەحەق نازڵ بووە، بۆ چەسپاندنی حەق نازڵ بووە، لەخودایەکی حەق‌و بەتواناوە نازڵ بووە، حەق هێناویەتی‌و حەقی پێیە، پێغەمبەر ڕاگەیەنێری ئەو حەقەیە!

﴿قُلْ:﴾ ئەی موحەممەد بەو کەلامە حەقە وڵامیان بدەرەوەو بڵێ: ﴿آمِنُوا بِهِ أَوْ لا تُؤْمِنُوا﴾ جا ئێوەش ئەی موشریکەکان و پەڵپگرەکان! ئەی ئەوانەی دەڵێن: هەتا ئاخی مەککەمان بۆنەبێتە زەوی کشت‌و کاڵ‌و کانیاوی تێدا هەڵنەقوڵێن ئیمانت پێ ناهێنین! ئیمان بێنن بەقورئان یان ئیمانی پێ نەهێنن، ئەوە چون یەکە، قورئان بۆخۆی حەقەو خودا نازڵی کردوەو نامەیەکی ئاسمانە بۆ سەر زەوی، نامەیەکی نەمرەو بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤە. ئیمانی پێ بێنن یان بڕوام پێ نەکەن، ئەوە باش بزانن ئیمانهێنانتان هیچ لەملکی خودا زیاد ناکاو ئیمان نەهێنانیشتان هیچ لەملکی خودا کەم ناکاتەوە.

جا، کە ئێوە بەڕاستی نەزانن‌و ئیمانی پێ نەهێنن، ئەوە باش بزانن: کە ﴿إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّداً﴾ زانایانی ئەهلی کیتاب؛ ئەوانەی پیاوچاک‌و حەقانی بوون، پابەندی نامەی ئاسمانی خۆیان بوون‌و گۆڕانکارییان تێدا نەکردوە، هەر کاتێ ئەم قورئانەیان بەسەردا بخوێندرێتەوە یەکسەر دەچنە سوژدە؛ بەسەر ڕویاندا دەکەونە سەر زەوی لەبەر ئەوەی خودا بەگەورەو پیرۆز دەزانن، شوکرو سوپاسی پەروەردگار دەکەن لەسەر بەجێهێنانی وادەی خۆی. چونکە ئەوان لەکتێبی خۆیاندا مژدەی ڕەوانە کردنی تۆیان خوێندۆتەوەو بەخەڵکیان ڕاگەیاندوەو چاوەڕوانی ڕەوانە کردنی تۆو نازڵبوونی

قورئـان بـوون، جـا ئێـستا کـه ئـەو قورئانـە دەبیـسن سـوجدەی بەندایـەتیو سوپاسگوزاری بۆ خودا دەبەن، ﴿وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً﴾ لەسـوژدەکەیاندا پـاكو مونـەززەهی خـودا رادەگەیـەننو دەڵـێن: گـەورەییو شکۆمەندیی بۆ ئـەو خودایەیـە: کـە وادەی خـۆی بـەجێ هێنـاوە، بێگومـان وادەو بەڵێنی ئەو هەر دەبێ بێتەجێو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە.

﴿وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعاً﴾ ئەوانـە: کـە گوێیـان لـەقورئان دەبێ خۆیان پـێ نـاگیرێ بـەڵکوو بەسـەر رویانـدا دەکەونـە سـوجدە بـردنو دەسـت دەکەن بەگریان، بەدڵی پڕ لەترسو خشوعو بەندایەتی راگەیانـدنەوە، بەچـاوی پـڕ لەفرمێسکو گریانـەوە بـەرەو رودەکەونـە سـوژدە، ئـەم سـوژدەبردنەیان خـشوعو ئیمانیان بۆ زیاد دەکاو پتر خۆیان ئەسپەردەی یـەزدان دەکەن! وەکوو لەئایـەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾محمد/١٧.

بێگومـان گریـان لەترسـی خـودا نیـشانەی بـڕوا پتـەویو خـودا ناسـینی بەراسـتییە، لـەبارەی گریـان لەترسـی خـودا فـەرموودەی زۆر ریوایـەت کـراون، پێغەمبەر ﷺ زۆر پەسنی کردوە.

تیرمیذی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم ژنەوت: دەیفەرموو: (عينان لاتمسهما النار عين بكت من خشية الله تعالى، وعين باتت تحرس في سبيل الله) دوچاو ئـاگری دۆزەخ نایانـسوتێنێ: چـاوێك لەترسـی خـودا فرمێـسك بڕێژێ، چاوێك لەرێگای خودادا پارێزگاری بکا.

موسـلیمو نەسـائی لەئـەبو هورەیرەوە ریوایـەت دەکـەن دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: (لا يلج النـار رجـل بكـى مـن خشية الله حتـى يعـود اللـبن في الضـرع، ولا اجتمع على عبد غبار في سبيل الله ودخان جهنم) ناچێتە ناو دۆزەخـەوە کابرایـەك لەدونیادا لەترسی خودا چاوەکانی فرمێسکی رشتبێ مەگـەر شـیری دۆشـراو بێتـەوە

ناو گوانەکە!! هەرگیز تەپو تۆزی تێکۆشان لەرێگای خوداداو دوکەڵی دۆزەخ لەسەر بەندەیەك کۆنابنەوە.

## پاڕانەوە لەخودا لەناوە جوانەکانی

﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾ ﴾

ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن؛ دەفەرموێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەمەککە لەخودا پاڕایەوە، لەپاڕانەوەکەی دا فەرموی: (یا الله! یا رحمن!) موشریکەکانی مەککە وتیان: بڕواننە ئەم شێتە. جڵەوگیری ئەوەمان لێ دەکا هاوار لەدوو خودا بکەین! کەچی بۆ خۆی نزاو پاڕانەوەکەی ئاڕاستەی دوو خودا دەکا. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿قُلْ ادْعُوا اللَّـهَ أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَنَ...﴾ی نازڵ کرد.

مەیموونی کوڕی مەهران دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەرتای هەموو بەشێکی ئەو قورئانەی بەنیگا بۆی دەهات (بسمك اللهم)ی دەنووسی هەتا ئایەتی ﴿إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ نازڵ بوو. ئەمجار لەسەرەتاوە (بسم الله الرحمن الرحيم)ی دەنووسی. ئەمجار موشریکەکان وتیان: ئەم (الرحیم)ە دەزانین، ئەدی ئەم (الرحمن)ە چیە؟ ئیتر خودا ئەو ئایەتەی نازڵ کرد.

ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو تیرمیذیو هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە دەربارەی هۆی نازلبوونی ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا﴾ ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لەکاتێکدا نازڵ بوو، پێغەمبەر ﷺ لەمەککەدا موختەفی بوو، کافرەکان کە گوێیان لەقورئان دەبوو جنێویان بەقورئانو بەو کەسە دەدا کە ناردویەتیو ئەو کەسەی هێناویەتی ئیتر پەروەردگار نیگای بۆ پێغەمبەر کردو پێی فەرموو: ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾.

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە ئەوەیە: لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی چەسپاند: کە قورئانی بۆ سەر بەندەی خۆی ((موحەممەد)) نازڵ کردوە، عەرەبو غەیری عەرەب نەیانتوانیو ناتوانن بەربەرەکانی بکەن، ئایینی یەکتاپەرستی بۆ هێناون و فرەخودایی رەتکردەوە. ئەمجار رەدی موشریکەکان دەداتەوە لەوەدا کە دەیانگوت: چۆن موحەممەد بۆخۆی لافی یەکتاپەرستی لێدەداو کەچی هاوار دەکاتە چەند خودایەكو دەڵێ: (یاالله! یارحمان!) ئیتر پەروەردگار رەدی دانەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ ادْعُوا اللَّهَ أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيّاً مَا تَدْعُوا فَلَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: هاوار بکەنە (الله) یان (رحمن) بەهەر ناوێك بانگی لێ بکەن لەناوە جوانەکانی ئەوە ناوی جوانو بەرزو پیرۆزن، هەر ناوێك لەو ناوە جوانانەی لێ بنێن جێی خۆیەتی. هەموو ناوێك لەناوە جوانەکانی مانای رێزو تەقدیریان تێدایەو پیرۆزن!

ئەمجار پەروەردگار چۆنیەتی خوێندنی ناونوێژ فێری پێغەمبەر ﷺ دەکاو پێی دەفەرموێ: ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾ ئەتۆ لەنوێژدا زۆر دەنگ هەڵمەبڕە، بۆ ئەوەی موشریکەکان گوێیان لێ نەبێو جوێن بەقورئان بدەن؛ جنێو بەو کەسە بدەن ناردویەتیو ئەو کەسەی هێناویەتی. ئەوەندەش بەهێواشی مەیخوێنەوە هاوەڵانت گوێیان لێ نەبێ، هەوڵ بدە لەنێوان بەرزیو نزمی دا بەشێوەیەکی مام ناوەندی نوێژەکانت بخوێنە.

ریوایـەتکراوە دەڵێن: حـەزرەتی ئـەبو بـەکر بـەدەنگی نـزم ذیکـری دەکـردو قورئـانی دەخوێنـد، دەیفـەرموو: مـن لـەخودای خـۆم دەپاڕێمـەوە ئـەو بـۆ خـۆی پێویـستیاتی مـن دەزانـێ! حـەزرەتی عومـەر دەنگـی بـەرز دەکـردەوە، دەیفـەرموو: شەیتان دەردەکەم خەواڵوان بەئاگا دێنمەوە، جا کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی بەئـەبو بـەکر کـرد: کـە تۆزێـك دەنـگ بـەرز بکاتـەوە بەعومەریـشی فەرموو: هەندێ دەنگ نزم بکەرەوە.

ئـەمجار پـەروەردگار فێرمـان دەکـا چـۆن حەمـدو ثـەنـای خـودا بکـەین دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنْ الذُّلِّ﴾ بڵێ: حەمدو ثەنا شیاوی خودایـە، لەسـەر ئـەو هـەموو نـازو نیعمەتـەی بەبەنـدەکانی بەخـشیون. پـەروەردگار لێـرەدا سـێ صـیفەتی بـۆ خـۆی چەسپاندوە.

١- پەروەردگار منداڵی بۆ خۆی قەرار نـەداوە، چونکە کەسێك منـداڵی هـەبێ هەموو نازو نیعمەتێکی بۆ ئەو دەوێ، هەروەها منـداڵ دەبێتـە جـێ نـشینی بـاوکی دوای تەواو بوونی تەمەنی کەسێکیش ئاوا بێ شیاوی حەمدو سوپاس نیە.

٢- پـەروەردگار لـەموڵك‌و سـەڵتەنەتدا کـەس هاوبەشـی نیـە، چونکە ئەگـەر کەسێك شەریکی بوایە ئەو کاتـە نـەدەزانرا کامـەیان شـیاوی حەمـدن. ئەمـە ڕەددە لەســەر جولەکــەکان کــە دەیــانگوت: عــوزەیر کــوڕی خودایــە، هــەروا ڕەددی مەسیحییەکانیشە کە دەیانگوت: عیسا کوڕی خودایە.

٣- خـودا دامـاو نیـە پێویـستی بەیارمەتیـدەر بـێ، بـەڵکوو خـودا بـۆ خـۆی بەدیهێنەرو خاوەنی هەموو شتێکە، بـێ هاوتـاو هاوشـانە هـەموو شـتێك بەویـستی ئەو دێتە جێ.

﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيراً﴾ خودای خۆت بەگەورە بزانە، ئەوەی فەرمانمان پێ کردی پابەندی بەو ئەنجامیان بدە. زۆر بەدووری بگرە لەهەموو صیفەتێکی نەقص‌و نزمی. بەگەورەو پاك‌و مونەززەهی بزانە لەزات‌و صیفاتدا، وا بزانە (واجب الوجود)ە بوونەکەی زەرووری‌و پێویستە، شیاوی هەموو صیفەتێکی کەماڵە. هەموو کردەوەیەکی بەگوێرەی حیکمەت‌و دانایی یە. هەموو حوکمێکی ڕەوایە، فەرمان‌و جڵەوگیری، بەرزکردنەوەو نزم کردنەوە تایبەتی خۆیەتی. هەرچی بیەوێ دەیکا، شکۆمەندیی دەدابە هەندێ کەس‌و هەندێ کەس زەلیل‌و داماو دەکا.

بەرێزی بگرە لەناوەکانی دا، بەناوە پیرۆزەکانی نەبێ بانگی لێ مەکە، هەمیشە بەصیفاتە پیرۆزەکانی وەصفداری بکە.

**بەیارمەتی خودا سورەتی الإسراء تەواوبوو**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الكهف)

ئـەم سـورەتە نـاوی سـورەتی (الكهـف)ە چـونکە چـیرۆکی ئەصحابولکەهفی تێدایـە یەکێکـە لـەو پێـنج سـورەتەی بەرسـتەی (الحمـد لله) دەسـتیان پێکـراوە کـە ئەوانیش سورەتی (الفاتحة، الأنعام، الكهف، سبأ، فاطر)ن.. دەست پێ کردن بە(الحمد لله) ئامـاژەی بەندایـەتی ئـادەمیزادی بـۆ پـەروەردگار لـەخۆ گرتـووە، داننانـە بەگەورەیی‌و شکۆمەندیی پەروەردگار.

**موناسەبەی ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتی پێشوو:**

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی (الاسراو)وە لەچەند رویەکەوەیە:**

١- سـورەتی (الاسـراء) بـە (تەسـبیح) دەسـت پـێ دەکـا. ئـەم سـورەتەش بە(تەحمید) دەست پێ دەکا، تەسبیح‌و تەحمیدیش لەزۆر شوێنی قورئاندا خراونە پەنا یەکەوە. زوربـەی کاتیش مـادەی (سبح) پێش مـادەی (حمـد) خـراوە وەکـوو ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْـدِ رَبِّـكَ﴾الحجـر/٩٨. لەلایـەکی تـرەوە سـورەتی (الاسـراء) بـە(حمـد) کۆتایی هـاتووە. کەواتـە کۆتـایی سـورەتی (الاسـراء)و سـەرەتای سـورەتی (الكهـف) لەیەك دەچن.

٢- کـە جولەکـەکان داوایـان لەموشـریکەکان کـرد: پرسـیار لەپێغەمبـەر بکـەن دەربارەی سێ شت (روح، أصحاب الكهف، چیرۆکی ذیلقەرنـەین) لەسـورەتی پێـشوودا دەربـارەی گیـان وەڵامـی دانـەوە، لێـرەشدا لـەم سـورەتەدا وەڵامـی دوو پرسـیارەکەی تریان دەداتەوە. کەوابێ ئەمەش جۆرە پەیوەندییەکە!

٣- کە لەسورەتی (الاسراء)دا فەرموویـ: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ گونجاوبوو چیرۆکی حەزرەتی موسا لەگەڵ حەزرەتی خضردا وەکوو بەڵگەیەك لەسەر ئەوە باس بکا.

٤- لەسورەتی (الاسراء:١٠٤)دا فەرموویـ: ﴿فَإِذَا جَاء وَعْدُ الآخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفاً﴾ ئیتر لەسورەتی (الكهف) دا کەئەو حەقیقەتە رون دەکاتەوە دەفەرمویێ: ﴿فَإِذَا جَاء وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاء وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقّاً﴾ تا دەگاتە ئایەتی ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَافِرِينَ عَرْضاً (١٠٠)﴾.

ئەم سورەتە سەرگورشتەو پەندو ئامۆژگاری لەخۆ گرتوون. سەرەتا بەوەصفی قورئان دەست پێ دەکا: لەباس‌و پەسنی دا دەفەرمویێ: ئەم قورئانە کەلامێکی راست‌و حەق‌و روونە، دژایەتی لەنێوان وشەکانی‌و مەعناکانی دا نیە، بۆ مۆژدەدان بەبەهەشت‌و ترساندن لەدۆزەخ نێردراوە.

ئەمجار سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ وردبوونەوە لەزەوی‌و ئەوەی تێیدایە لەدیمەنی جوان‌و سەرسوڕهێنەر، بۆ ئەوەی بزانن: کە ئەو شتانە هەموویان نیشانەی قودرەت‌و دەسەڵاتی خودان.

ئەمجار سورەتەکە سێ چیرۆکی ناوازە دەگێڕێتەوە چیرۆکی (اصحاب الكهف)و چیرۆکی (حەزرەتی موسا لەگەڵ حەزرەتی خضردا)و چیرۆکی (ذیلقەرنەین).

وێڕای ئەوەش چەند پەندو ئامۆژگارییەك دێنێتەوە کە هەڵقوڵاوی واقیعین‌و ئەوە دەچەسپێنن: کە حەق پەیوەندە بەئیمانەوەو ئاوێتەی یەکترین‌و پێویستە موسوڵمانان پشت بەحەق ببەستن‌و بەبیرو باوەڕی راستی خۆیان بنازن‌و دەسەڵات‌و ماڵ‌و سامان لەخشتەیان نەبا. ئەوەتا لەئایەتی (٣٢ تا ٤٢) بەرامبەرییەك لەنێوان دەوڵەمەندی لەخۆبایی بوو بەماڵ‌و سامان‌و هەژاری پشت بەستوو بەئیمانی خۆی‌و حەق‌و راستی ساز دەکا.

یان لەئایەتەکانی ژمارە (٤٥و ٤٦) نموونەی ژیانی دونیا دەهێنێتەوە: چۆن خێر دەڕواو چەند زوو بەسەر دەچێ! ئەمجار چەند دیمەنێکی رۆژی قیامەت دەخاتە روو. چیرۆکی لەخۆبایی بوونی شەیتانو سوژدە نەبردنی ئەو نەگریسەمان بۆ دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هەمیشە لەحەزەردا بێو بزانێ ئەوە دوژمنیەتیو هەوڵی لەخشتەبردنی دەدا.

ئەوەش رون دەکاتەوە: کە قورئان پەندو مەثەل دێنێتەوە بۆ سود لێ وەرگرتنیانەو دەبێ پێیان پەند ئامێز ببین. کەوابوو جەمسەری سورەتەکە بۆ راستکردنەوەی عەقیدەیە بۆ رێکخستنی پەیڕەوو پرۆگرامی بیرکردنەوەو تێفکرینە، بۆ چاککردنو چاککردنەوەی بەها رەوشتییەکانە بەتەرازوی عەقیدە.

ئەوەش دەچەسپێنێ کە سیاسەتی یاسادانانو تەشریع دەبێ سەرچاوەکەیان رەحمەتو عەدالەت بێ، هەر شەریعەتێك لەم دوانەوە سەرچاوە نەگرێ بەکاری کارپێکردن نایەو لەبەرژەوەندی ئادەمیزاددا نیە.

دەربارەی فەضلو رێزی ئەم سورەتە گەلێ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ریوایەت کراون.

١- موسلیمو ئەبوداودو نەسائیو تیرمیذی لەئەبو دەرداوە لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکەن فەرموویەتی: (من حفظ عشر آیات من أول سورة الكهف، عصم من الدجال).

٢- ئیمام ئەحمەدو موسلیمو نەسائی لەئەبو دەرداوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت دەکا: کە فەرموویەتی: (من قرأ العشر الأواخر من سورة الكهف عصم من فتنة الدجال).

٣- نەسائی لەسونەنەکەیدا لەثەوبانەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت دەکا: کە دەفەرموێ: (من قرأ العشر الأواخر من سورة الكهف فانه عصمة له من الدجال).

٤- حـاکم فەرموودەیـەکی تـری ریوایـەت کـردوەو فەرموشـیەتی ئیـسنادەکەی راستە لەپێغەمبەرەوە فەرموویەتی: (من قرأ الكهف في يوم الجمعة أضاء له النور ما بين الجمعتين)[1].

## حەمدو ئەنای خوداو کاریگەری قورئان

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّـٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا

[1] تەفسیری قورطوبی ج٥/٢٠٤٥ هەروا چەند فەرموودەیەکی تریشی هێناون...

لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا﴾ حەمدو ثەنا بەبەردەوامی بۆ پەروەردگارێکە قورئانی نازڵ کردوە بۆ سەر بەندەی خۆشەویستی خۆی؛ (موحەممەد ﷺ) کە گەورەترین نیعمەتی خودایە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی. چونکە ئادەمیزادی لەخەوی نەزانی بەئاگا هێنایەوە، لەتاریکی گومڕایی رزگاری کردن خستنیە ژێر رۆشنایی ئایینەوە.

قورئانی نازڵ کردوە کردویەتی بەنامەیەکی رێكو پێكو بێ هەڵەو عەیبو کەمو کوڕی، هیچ لاری‌و چەوتی لەخۆ نەگرتووە. هیچ خواری‌و مەیل بۆ لای خراپەی تێدا نیە. بەڵکوو نامەی هیدایەتە بۆ رێبازی راستو حەق. راستی نامە ئاسمانیەکانی پێش خۆی دەچەسپێنێ، هەندێکی تەصدیقی هەندێکی دەکا، بێگومان پەروەردگار هەموو کاتێ سوپاسکراوە، هەندێ جار لەسەرەتای سورەتەکانو کۆتاییاندا سوپاسی نەفسی خۆی دەکا، بۆ ئەوەی بەندەکانی فێر بکا چۆن سوپاسی نیعمەتەکانی بکەن. مەبەست لەنازڵکردنی قورئان بەو شێوە پەسندییە ﴿قَيِّماً لِيُنذِرَ بَأْساً شَدِيداً مِنْ لَدُنْهُ﴾ بۆ ئەوەی بێ بڕوایان بترسێنێ لەعەزابێکی بەئێش‌و سامناك کە لەخوداوەیە، عەزابەکە دو جۆرە: عەزابی دەس لەجێو خێرا هاتوو: کە عەزابی دونیایە، عەزابی وەغراوو دوایی هاتوو: کە عەزابی دۆزەخە!

هەروەها ﴿وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ﴾ بەهۆی ئەم قورئانەوە مۆژدە بدا بەو موسوڵمانانەی کە ئیمانی خۆیان بەهۆی کردەوەی باشەوە بەهێز دەکەن، مژدەی ئەوەیان بداتێ ﴿أَنَّ لَهُمْ أَجْراً حَسَناً﴾ بەوەی کە باداشی باشیان هەیە

لەقیامەتدا: کە بەهەشتەو خودا وادەی ئەو بەهەشتەی بەتەقواکاران داوە، ﴿مَاكِثِينَ فِيهِ أَبَداً﴾ بۆ هەتا هەتایە لەو بەهەشتەدا دەمێننەوەو لێی دەرناچن نازو نیعمەتێکە بڕانەوەی نیە!

﴿وَيُنذِرَ الَّذِينَ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَداً﴾ هەروەها ئەو کافرانە بترسێنێ: کە پێیان وایە خودا منداڵی هەیە. وەکوو هەندێ لەموشریکەکانی عەرەب کە دەیانگوت: ئێمە فریشتە دەپەرستین چونکە کچی خودان. جولەکەکان: کە دەیانگوت عوزەیر کوڕی خودایە ئەو مەسیحیانەی کە دەیانگوت عیسا کوڕی خودایە، بۆیەش بەتایبەتی ناوی ئەم سێ جۆرە کافرانەی هێنایەوە، هەرچەندە ((انذار))ە گشتییەکەی پێشوو دەیانگرێتەوە. بۆ ئەوەی ئاماژەبێ کە هەڵوێستو بیروباوەڕی ئەوانە زۆر ناشیرینو نابەجێیەو لەهەموو کوفرێك کوفرترە. ﴿مَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ وَلا لآبَائِهِمْ﴾ ئەوانە کە ئەو بوختانە هەڵدەبەستنو نیسبەتی منداڵ وەپاڵ خودا دەدەن نەخۆیان نەباوكو باپیریان هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە، بەڵکوو قسەیەکە بەهەوانتە فڕێی دەدەنو هیچ بەڵگەو پشتگیرییەکی عەقڵیو نەقڵییان نیە، دەی خۆ عەقیدەو بیرو باوەڕ دەبێ لەسەر بناغەی زانستو زانیاری دابمەزرێو قەناعەتو دڵنیایی تێدا بێ.

﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ﴾ ئەم بوختانەیان بوختانێکی زۆر گەورەیەو کوفرێکی بێ ڕەزایە، کاشکێ ئەوان ئەو بوختانەیان هەر بەسەر دڵدا ڕابوردایەو نەیاندرکاندایە، ئەوانە هێندە بێ شەرمن بەزوبان ئاشکرای دەکەنو بێ شەرمانە بەناو خەڵکی دا بڵاوی دەکەنەوە. ﴿إِنْ يَقُولُونَ إِلاَّ كَذِباً﴾ ئەوان جگە لەدرۆو بوختان هیچی تر ناڵێن. هەرچی دەیڵێن درۆیەکی پەتەڕییەو ڕاستی تێدا نیە.

ئەمجار پەروەردگار تەسەللای دڵی پێغەمبەر دەداتەوە: کە غەم نەخوا بەوەی موشریکەکان ئیمانی پێ ناهێنن و پەیامەکەی رەتدەکەنەوە. دەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفاً﴾ ئەتۆ خەریکی لەداخا خۆت بکوژی و خۆت بەفتارە بەری لەخەفەتی ئەوەی: کە ئەوانە بڕوا بەم قورئانە ناکەن، وشەی (لعل) لێرەدا بۆ ئیستیفهامی ئینکارییەو مانای نەهی دەگەیەنێ، واتە: بەو ئەندازە داخ و خەفەت مەخۆ ئەوانە شیاوی ئەوە نین تۆ ئەوەندە مەراقیان بۆ بخۆی. لێیان گەڕێ، ئەوەندە بەهەڵوێستە نەفامەکانیان دڵگران مەبە، تۆ پێغەمبەری و تەنها راگەیاندنی پەیامەکەی خۆت لەسەر شانە، پەیامی خۆتیان پێ رابگەیەنە جا هەر کەسێك هیدایەتی وەرگرت ئەوە قازانجەکەی بۆ خۆیەتی و کەسێکیش لەسەر گومڕایی خۆی بەردەوام بوو زیانەکەی بۆ خۆیەتی و خۆی سزاکەی دەچێژێ..

نمونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێکی ترە وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾فاطر/٨. یان دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾الشعراء/٣. یان ﴿وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلاَ تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾النحل/١٢٧.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە دونیا خانووی مانەوە نیەو جێگای تاقیکردنەوەو کار کردنە، بۆ ئەوەیە چاکەکارو خراپەکار دەربکەون و دوایی هەر کەسە بەپێی کردەوەی خۆی پاداش و سزای دەدرێتەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە لەگیانلەبەرو درەخت و رووەك و کان و دیمەنەکانی کردومانن بەهۆی ئارایش و جوانی بۆ زەوی و دانیشتوانی سەری، کردومانن بەهۆی تاقیکردنەوە بۆیان، بۆ ئەوەی دەری بخەین کێ کردەوەی باش دەکاو شیاوی ئەو نیعمەتانەیە کە لەدونیاداو لەقیامەتدا پێی دەدرێ.

وەكوو دەبینین دەقە قورئانییەكە بێ دەنگ بووە لەوانەی خراپەكارن، باسی ئەوانی نەكردوە، چونكە ئاشكرایەو قەرینە ئاماژەی بۆ دەكا.

هەڵبەتە وەكوو دەگوترێ: دونیا مەزرەعەی قیامەتە؛ چی تێدا دەچێنی لەقیامەتدا ئەوە دەدرویەوە، یان دەگوترێ: دونیا پردە بۆ قیامەت.

ئیمامی موسلیم فەرموودەیەكی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت كردوە؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ان الدنيا حلوة خضرة، وان الله مستخلفكم فيها فينظر كيف تعملون) دونیا شیرینو خۆشو دلگیرە، خودای مەزن ئێوەی تێدا كردوە بەجێ نشین بەویستو ئیرادەی خۆتان تێیدا دێنو دەچن، دەروانێ ئێوە چۆن كاردەكەنو چی دەكەن، هەڵسو كەوتتان چۆنەو چیە؟ دوایی بەگوێرەی كردەوەكانتان پاداشتتان دەدرێتەوە.

هەڵبەتە خودا بۆ خۆی لەئەزەلەوە دەزانێ ئەوان چی دەكەنو چۆن دەكەن، ئەو ئاگاداری شێردراوەی ناو دڵەكانە، هەموو پەنامەكیەكی بوونەوەر دەزانێو ئاگای لێیەتی، پێویستی بەتاقیكردنەوە نیە. وەڵێ دابو نەرێتی وا هاتووە: پاداشو سزای بۆ بەندەكانی بەگوێرەی ئەو كردەوانەیان بێ: كە بەفیعلی دەیكەنو لەژیانی عەمەلییاندا ئەنجامی دەدەنو چۆن لەگەڵ نیعمەتەكانی خودادا هەڵسو كەوت دەكەن، واتە: دەبێ بەندەكانی ئەوەی خودا زانیویەتی دەربارەیان بەویستو خواهیشی خۆیان بەدی بێنن، كەوابوو تاقیكردنەوەكە بۆ زانینی بەندەكانە چی دەكەن دەیەوێ دەری بخا!!

﴿وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيداً جُرُزاً﴾ ئێمە ئەو زەوییە جوانو رەنگاو رەنگە تێك دەدەین، رۆژێك دێ هەرچی وا بەسەر ئەو زەوییەوەیە لەدارو درەختو گوڵو رووەكو جۆگاو كانیاو دیمەنی سەرنج راكێش هەمووی لەناو دەبەینو سەر زەوی دەكەینە خاكێكی سوتەمەرۆو دەشتێكی كاكی، بەكاكی بێ گیانلەبەرو ئاوو

سەوزاییـ!! وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَيَذَرُهَا قَاعاً صَفْصَفاً، لَا تَرَى فِيهَا عِوَجاً وَلَا أَمْتاً﴾طه/١٠٦-١٠٧.

ئایەتەكە دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایەو پێی دەفەرموێ: تۆ لەهەڵوێستی ئەوانە دڵگران مەبەو خەفەت مەخۆ، ئێمە چاریان دەكەین و تۆڵەیان لێ دەستێنین!.

## چیرۆكی ئەصحابولكەهف

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ

قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ﴿١٧﴾ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ

قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ
قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ
هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم
بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾
إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى
مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ
لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ
يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ
بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم
مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ
خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ
وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ

فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئەم چیرۆکە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: (النضر)ی کوڕی (الحارث) پیاوێکی زۆرزانی قورەیشییەکان بوو، شەیتانێك بوو بۆ خۆی. ئەم نەگریسە زۆر ئەزیەتی پێغەمبەری دەدا، بەهەموو جۆرێك دژایەتی دەکرد، لەرۆژگارێکدا چوبوە وڵاتی حیرەو فێری چیرۆکی روستەم و ئەسفندیار بوبوو، گەلێ سەرگورشتەو چیرۆکەکانی لەبەر کردبوون، جا کە پێغەمبەر ﷺ لەکۆڕو مەجلیسەکانی دا بانگەوازی خەڵکی دەکردو ناو بەناوە باسی بەسەرهاتی گەلە پێشینەکانی دەگێڕایەوە، (النضر) دەهات لەدوای پێغەمبەر دەستی دەکرد بەحیکایەت گێڕانەوەو بەسەر هاتی سەرنج راکێش دەربارەی پاشاکانی فارس. ئەمجار دەیگوت: ئەی هۆزی قورەیش! من زۆر لەموحەممەد باشتر دەزانم سەرگورشتە بگێڕمەوە!

ئەمجار قورەیشییەکان شاندێکیان پێك هێنا لە(النضر)و عوتبەی کوڕی ئەبو موعیەطو ناردیانن بۆ لای ماڵەکانی جولەکە لەمەدینە بۆ ئەوەی پرس‌و رایان پێ بکەن دەربارەی پێغەمبەر ﷺ پێیان گوتن: بچن پرسیار لەئەو ماڵانە بکەن دەربارەی موحەممەدو رەوشتەکانی، دەبارەی بانگەوازی‌و پەیامەکەی، ئەوانە خاوەن کتێبن‌و پێغەمبەریان هەبون‌و زانیارییان لەو بارەوە زۆرە. (النضر)و عتبە بەرەو مەدینە کەوتنە رێ‌و گەییشتن، چون دەربارەی وەزعی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لەماڵەکان کرد، ئەوانیش وتیان: کە چوونەوە دەربارەی سێ شت پرسیاری لێ بکەن:

١- دەربارەی ئەو کۆمەڵە گەنجەی لەرۆژگاری کۆندا ماڵ‌و حاڵی خۆیان بەجێ هێشت.

دەربارەی ئەو پیاوەی خۆرهەڵات‌و خۆرئاوای پشکنی‌و خستیە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، چی کردو چی بەسەر هات؟.

٣- دەربارەی گیان (الروح) لێی بپرسن چیەو چۆنە؟ جا ئەگەر وەڵامی دانەوە ئەوە پێغەمبەرە، ئەگینا جادوبازو درۆزنە.

جا کە نەضرو حاریث گەیشتنەوە مەککە وتیان وەڵامی یەکالاکەرەوەمان بۆ هێناونەوە، ئیتر راسپاردەی ماڵە جولەکەکانیان پێ راگەیاندن، ئەمجار قورەیشەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەرو پرسیاریان لێ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەیانی وەڵامی پرسیارەکانتان دەدەمەوە، هیچ ئەگەری دانەنا، ئینشائەڵڵای نەگوت: قورەیشییەکان رۆییشتن، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دوای ئەو وادەیە پانزە رۆژ مایەوە نیگای بۆ نەهات. قورەیشییەکان کەوتنە مقۆ مقۆ، وتیان: موحەممەد وادەی سبەینێی پێداین، ئەوە پانزەرۆژ تێپەڕی هیچ وەڵامی نەبوو، پێغەمبەر ﷺ بەمە زۆر دڵتەنگ بوو. ئەمجار جوبرائیل هات‌و لەخوداوە سورەتی (الكهف)ی بەنیگا بۆ

هێنا. کە سەرزەنشتێکی بۆ پێغەمبەر تێدا بوو، چیرۆکی ئەصحابولکەهف و چیرۆکی ذیلقەرنەینی تێدا بوو...

پەیوەندیی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهێ پێشەوە لەم رووەوەیە: کە لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەوەی کرد ئەو گوڵ و گوڵزارو دیمەنە جوانانەی سەرزەوی زۆر سەرسورهێنەرن و نیشانەی دەسەڵات و دانایی پەروەردگارن لەبوونەوەردا. ئەمجار لێرەشدا ئەوە روون دەکاتەوە: کە تەنها چیرۆکی ئەصحابولکەهف و رەقیم سەر سورهێنەر نین و بەس! بەڵکوو زیندوبوونەوەی زەوی و پێگەیشتنی روەك و گوڵ و گوڵزارو پشکوتنی دارو درەخت تێیدا زۆر لە روداوی ئەصحابولکەهف سەرسورهێنەر ترن.

دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَباً﴾ ئایا تۆ پێت وایە: هەر روداوی ئەصحابولکەهف و رەقیم لەناو ئەو هەموو ئایات و نیشانانەی ئێمەدا عەجایەب و سەرسورهێنەرن؟! وا مەزانە، بێگومان هەموو ئایاتی ئێمە سەرسورهێنەرن، تەنها چیرۆکی ئەصحابولکەهف و مانەوەیان بەنوستوویی ئەو هەموو ماوە دورو درێژە لەحاڵ و وەزعی جیهان سەرنج راکێشتر نیە، ئەوەتا جوانی زەوی و دیمەنە جۆراو جۆرەکانی زۆر عەجایەب ترو سەرسورهێنەر ترن لەچیرۆکی ئەصحابولکەهف! بێگومان کەسێك بتوانێ زەوی وا ئارایش بداو بیرازێنێتەوە، پاشان هەڵی پروکێنێ و بیکاتەوە پوش و پەڵاش. کەسێك بتوانێ ئاسمانەکان و زەوی ئاوا دروست بکا، توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هیچی لێ عاسی نابێ، کەوابوو دەتوانێ کۆمەڵێك ئادەمی بەبێ خواردن و خواردنەوە بۆ زەمانێکی دورو درێژ بهێڵێتەوە.

(رەقیم): یان ناوی سەگەکەیانە، یان ناوی ئەو کێوو کەژەیە کە لێی بوون، یان ناوی ئەو پارچە لەوحەیە کە ناوەکانیان لەسەری نووسراوە.

لەسەرەتاوە چیرۆکەکە بەکورتی دەهێنێ‌و هێڵە سەرەکییەکانی دەست نیشان دەکا، بەم جۆرە دەزانین: کە ئەصحابولکەهف کۆمەڵە گەنجێك بوون، ئیماندارو خاوەن باوەڕ رویان کردۆتە ئەشکەوتێك‌و چونە ناوی‌و چەند ساڵێك خەویان لێ کەوتووە، دوایی لەخەو راست کراونەوە، لەو رۆژگارەدا دو کۆمەڵ هەبوون دەربارەیان مقۆ مقۆیان بووە. ئەوان لەئەشکەوتەکەدا دەمێننەوە یەکێکیان دەنێرن کام تاقەو پێر باشتر حیسابیان راگرتووە، ئەم چیرۆکە هەرەچەندە سەرەنج راکێش بێ لەنیشانەکانی تری بوونەوەر عەجایەب تر نیە، دەفەرموێ: ﴿إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ﴾ ئەی موحەممەد! بیری ئەو کاتە بکەرەوە: کە ئەو کۆمەڵە گەنجە لەپیناو ئایینەکەیانداو لەترسی گەلەکەیان نەوەك لەبیرو باوەڕەکەیان ژێوانیان بکەنەوە پەنایان بۆ کونجی ئەشکەوت برد، بۆ ئەوەی خۆیانی تێدا بشارنەوەو گەلە بتپەرستەکەیان پێیان نەزانن.

جا کە چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە ﴿فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَداً﴾ وتیان: خودایە! لەلایەن خۆتەوە رەحمەت‌و بەزەیی خۆتمان بەسەردا بڕێژە، وا بکە گەلەکەمان پێمان نەزانن، سەرەنجاممان خێر بێ‌و بەرچاو رون‌و ئیمان پتەومان بکە، چاودێرمان بەو لەهەموو گومرایی‌و سەر لێ شێواوی‌یەك بمانپارێزە. ﴿فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَداً﴾ خەوێکی قورسمان بەسەردا هێنان‌و خەویان لێ کەوت بەجۆرێك کە هیچیان گوێ لێ نەبێ‌و بەهیچ دەنگێك خەبەریان نەبێتەوە چەند ساڵێکی ژمێرداو نوستن.

﴿ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَداً﴾ پاشان لەخەو بێدارمان کردنەوە، لەو خەوە گرانە درێژ خایەنە وەخەبەرمان هێنان بۆ ئەوەی دەری بخەین لەئەو دو کۆمەڵە وەکێشە هاتوە دەربارەیان، کامەیان ماوەی نووستنەکەیانی باشتر زانیوەو سەر ژمێریان کردوە. بزانن‌و بۆیان دەربکەوێ چەند عاجزو بێ

دەسەڵاتن. بزانن خودا چی لەگەڵ کردوون‌و دڵنیابن لەدەسەڵاتی خوداو بەتوانایی لەسەر زیندوکردنەوەو شتی تریش!!

ئەو دو حیزبەی بە(أي الحزبين) ئاماژەیان بۆ کراوە کێن؟

بەگوێرەی ئایەتەکە حیزبێکیان کۆمەڵە گەنجەکەن حیزبەکەی تریان دانیشتوی شارەکەن کە لەسەردەمی ئەواندا ئەمانە بەخەبەر هێنران، چونکە مێژووی بەسەرهاتی ئەو کۆمەڵە گەنجەیان لابوو. ئەمە رای زوربەی راڤەکەرانی قورئانە.

کۆمەڵێکی تر دەڵێن: ئەو دوو تاقمە دوو تاقمی کافرن، کە دەربارەی ئەصحابولکەهف کەوتوونە کێشەوە..

هەندێکی تر پێیان وایە دوو کۆمەڵی موسوڵمانن دەربارەی ژمارەو ماوەی نووستنی ئەصحابولکەهفەکان کەوتوونە مقۆ مقۆوە.

ئەمجار دوای رانواندنی پوختەی چیرۆکەکە، دەست دەکا بەدرێژەدان بەچیرۆکەکە، ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەوەی خودا لەم چیرۆکەدا دەیگێڕێتەوە یەکالاکەرەوەی کێشەی نێوان کێشەکەرانە. قسەی حەق‌و رای راست ئەوەیە: کە خودا دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئێمە لەو بارەوە هەواڵی راست‌و حەقت بۆ دەگێڕینەوە، راستی روداوەکە ئەوەیە: کە ئێمە بۆتۆی رون دەکەینەوە! ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە ئەو هەواڵانەی لەناو عەرەبەکاندا باو بووە دەربارەی ئەصحابولکەهف راست نین.

﴿إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ﴾ ئەوانە: کۆمەڵە گەنجێك بوون، ئیمانی راستەقینەیان بەخودای خۆیان هێنابوو، شایەتییان دەدا بەتاك‌و تەنهایی خودا ﴿وَزِدْنَاهُمْ هُدًى﴾ هیدایەت‌و رێنموییمان بۆ زیاد کردن، پتر لەسەر بیرو

باوەڕەكەيان سوور بونو زياتر رويان لەخودا كردو ئامادەباشييان بۆ كردەوەى چاكە زياتر بوو.

﴿وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ دلّمان لەسەر بيرو باوەڕەكەيان دامەزراندن، شانازى دەكەن بەئيمانەكەيان، پشت ئەستورن بەو بيرو باوەڕەى بۆ خۆيانيان هەڵبژاردوە.

ئايەتەكە ئاماژە بەوە دەكا: كە گەنج لەپير ئامادەباشى باشترى تێدايە بۆ روكردنە حەقو بەرەو رووچونو پێشوازى كردن لەبانگى حەقو راستى. ئەوەتا زوربەى ئەوانەى پێشوازييان لەئايينى ئيسلام كردو ئيمانيان هێنا گەنجەكان بوون، زوربەى پيرەكانى قورەيش لەسەر بيرو باوەڕە بتپەرستييەكەيان مانەوە. كەمێكيان نەبێ ئيمانيان نەهێنا.

ئيبنو عەبباس دەفەرموێ: خودا هيچ پێغەمبەرێكى نەناردوە ئيللا كە ناردويەتى بەگەنجى ناردوويەتى ئەمجار بۆ پاڵپشتى قسەكەى ئايەتى ﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ﴾الأنبياء/٦٠. و ئايەتى ﴿قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ﴾الكهف/٦٠. و ئايەتى ﴿انهم فيتية آمنوا بربهم﴾ى ئێرەى خوێندەوە.

رۆژگارى ئەصحابولكەهف:

هەندێك پێيان وايە ئەو كۆمەڵە گەنجە لەدواى رۆژگارى حەزرەتى عيسا بوونو لەسەر ئايينى ئەو بوون. وەڵێ ئيبنو كەثير تەرجيحى ئەوە دەدا: كە ئەصحابولكەهف زۆر پێش پەيدابوونى مەسيح بوبن. پێى وايە: ئەو موفەسسيرانەى، كە دەڵێن: دواى هاتنى حەزرەتى عيسا بون، بەهەڵە چوونو شوێن چيرۆك و عەنعەنەتانى عەرەبەكان كەوتوون، بەڵگەى ئيبنو كەثير ئەوەيە: كە سەر گورشتەى ئەصحابولكەهف لەلاى ماڵەكان باو بووەو زانيويانە. وەكوو لەوەپێش لەباسى هۆكارى نازڵبوونى سورەتەكەدا ئيبنو ئيسحاق فەرمووى. هەروەها بەگوێرەى ئەو فەرموودەيەى ئيبنو ئەبو شەيبەو ئيبنولونذيرو ئيبنو ئەبى

حاتـەم لـەئیبنو عەبباسـەوە ریوایـەتیان کـردوە، دەفـەرموێ: ئەصـحابولكەهف لەسەردەمی یەکێك لەپاشا ملهوڕە (الجبابرة)کاندا بوون: کە بانگەوازی بتپەرستیان دەکـرد، جـا کـە ئـەم کۆمەڵـە گەنجـە لەبارودۆخەکـە وردبوونـەوە هـەر کەسـەیان لەعاسـت خۆیـەوە لـەپیناو ئایینەکەیـدا بڕیاریـدا وەکێـوی بکـەوێ، بەرێکـەوت یەکدیگیر بـوون‌و هەرمیەکـەیان مەبەسـتی خـۆی لـەوی تریـان دەشـاردەوە، ئـەمجار کۆبوونـەوەو پـەیمان‌و وادەیـان لەیـەکتری وەرگـرت: کـە راسـتی لەیـەکتری نـەڵێن‌و یـەکتر بپـارێزن، دوایـی هـەموویان لەسـەر یـەك را رێـك کـەوتن‌و پـەیمانیان بەیەکتریدا، بڕیاریان دا شار بەجێ بێڵن‌و ژیانی خۆش‌و شارەستانی بـەلاوە بنـێن. ﴿إِذْ قَـامُوا﴾ ئـەو کاتـەی لـەژێر دەسـەڵاتی (مـەلیك دەقیـانووس) هەسـتان‌و بتپەرستییان رەتکردەوە. ﴿فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ وتیان: خـودای ئێمـە ئەم بتە داتاشراوانە نین، خـودای ئێمـە خـودای ئاسمانـەکان‌و زەوییـە، بەدیهێنـەری بوونەوەرە، ئێمە بەندایەتی هەر بۆ ئەو دەکەین‌و بەس ﴿ لَنْ نَدْعُوَ مِنْ دُونِهِ إِلَهاً﴾ ئێمە جگە لەزاتی پەروەردگار کەسی تر بەخودا ناناسین‌و نای پەرستین، کەسی تـر ناکەینە هاوەڵ‌و هاوشانی چونکە جگە لەپەروەردگار خوداو پەرستراوی تر نین.

بەرسـتەی یەکـەم کـە وتیـان: ﴿رَبُّنَـا رَبُّ الـسَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ خودایـەتی‌و بەدیهێنـەری خودایـان راگەیانـد، ئەمـەش مەسـەلەیەکە بتپەرسـتەکان دانـی پێـدا دەنـێن. بـە رسـتەی دووەمـیش: کـە دەفـەرموێ: ﴿لَـنْ نَـدْعُوَ مِـنْ دُونِـهِ إِلَهـاً﴾ یەکتاپەرستی رادەگەیەنن و، بتپەرستی رەت دەکەنەوە، بتپەرستەکان پێیـان وابـوو هەر خودا بەدیهێنەرەو کەسی تـر نـاتوانێ بوونـەوەر دروسـت بکـا، بـەڵام لەهـەمان کـاتدا لەتـەك خـودادا شـتی تریـان دەپەرسـت پێیـان وا بـوو: ئـەو پەرسـتراوانە لای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکەن. وەکوو قورئـان لەشـوێنێکی تـردا ئامـاژە بەمـە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّـنْ خَلَـقَ الـسَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضَ لَيَقُـولُنَّ اللَّـهُ﴾لقمـان/٢٥.

هـەروەها لەسـەر زوبـانی کافرکـان کـە پاسـاو دێننـەوە بـۆ بتپەرسـتییەکەیان دەفەرموێ: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾الزمر/٣.

کۆمەڵە گەنجەکە زۆر بوێرانـە بتپەرستییان رەت کـردەوە، وشـەی (لـن)یـان بـەکار هێنـا، کـە بـۆ تەئبیـدی نەفیـەو ئـەوە دەگەیـەنێ: کـە هـەرگیز ئامـادە نـین بتپەرستی ئەنجام بدەن، بەراشکاوی وتیان: ئەگەر ئێمـە بتپەرسـتی بکـەین کـارێکی بەتاڵ ئەنجام دەدەین. بۆیە پاساویان بۆ بیرو باوەڕەکەیان هێنایەوەو وتیـان: ﴿لَقَـدْ قُلْنَـا إِذاً شَـطَطاً﴾ ئەگـەر ئێمـە عیبـادەتی غـەیری خـودا بکـەین بێگومـان شـتێکی ناحەقمان ئەنجام داوە، سنوورمان بەزاندووە قسەیەکی ناحەق‌و بەتاڵمان گوتووە..

ئەمە ئاماژەی ئەوەی تیدایە: کە گەنجەکان بانگەوازی کراون بـۆ بتپەرسـتی‌و رەتیان کردۆتەوە، پاشای ملهوڕی ئـەو رۆژگـارە هەڕەشـەی لێ کـردون‌و سەرزەنـشتی کردون.

ئەمجار کۆمەڵە گەنجەکە رو دەکەنە یەکترو دەڵـێن: ﴿هَؤُلاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِـنْ دُونِهِ آلِهَةً لَوْلا يَأْتُونَ عَلَيْهِمْ بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ﴾ سەیرە ئەمانـەی قـەومی ئێمـە هەرچـەندە بەتەمـەن لەئێمـە دنیادیـدەترن، زۆر تـر بەئـەزمون‌و تاقیکردنـەوەی ژیـاندا تێپەڕیون، کەچی هاتوون هاوەڵیان بـۆ خـودا دانـاوە، دەی بۆچـی بەڵگەیـەکی حاشـا هەڵنەگر ناخەنە ڕو بەبەڵگە بیرو باوەڕی خۆیان ناچەسپێنن؟ بـۆ بەڵگـەی ئاشـکرا ناهێننەوە؟ وەکوو چۆن ئێمە بەڵگەی بـەهێزو پتـەومان لایـە لەسـەر بـیرو بـاوەڕی خۆمان! بێگومان ئەو نەتەوەیەی ئێمە: کە ئەوە بیرو باوەڕیانە تاقمێکی ستەمکارو ناحەقیکارن، ئـەگینا چۆن بـیرو بـاوەڕی ئـاوا رەچـاو دەکـەن؟ چۆن ئـەوە هـەڵس‌و کەوتیان دەبێ؟

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً﴾ جا بۆ کێ لەو کەسە ستەمکار ترە: کە درۆ لەسەر خودا هەڵدەبەستێ‌و هاوەڵی ومپاڵ دەدا؟

جا لوطفو رەحمەتی خودا وا بوو پاشا ملهوڕەکە دوا ئەوەی هەڕەشەی لێ کردنو سەرزەنشتی کردن پشوێکی پێدان بۆ ماوەیەك مۆڵەتی دان بیرێك لەسەرنجامی خۆیان بکەنەوە، لەئایینی خۆیان پەشیمان ببنەوە، ئیتر کۆمەڵە گەنجەکە ئەم مۆڵەتدانەیان بەهەل زانیو هەڵاتنو رویان لەکێوو کەژ کرد!!

ئەمجار هەندێکیان بەهەندێکیان گوت: ﴿وَإِذْ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ﴾ ئێوە مادام لەبیرو باوەڕدا لەوان جیابوونەوەو بەدڵو دەروون لەوان گۆشەگیر بوون، ئەوان بتپەرستو ئێوە خودا پەرست! ئێوە جگە لەخودا کەسی تر بەخودا نازانن و بۆ زاتی ئەو نەبێ بەندایەتی بۆ کەسی تر ناکەن، ﴿فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقاً﴾ دە بەجەستەش لێیان جیا ببنەوە، لەناو ئەواندا ژیان بەسەر مەبەن، رو بکەنە ئەشکەوتو شوێنێك بتوانن بەبێ ترسو بیم خوداپەرستی خۆتان بکەن! بێگومان ئێوە ئەگەر لەم بتپەرستانە جیا ببنەوەو لێیان گۆشەگیر بن، خودا رەحمەتو میهرەبانی خۆی دەرێژێ بەسەرتانداو سەرفرازی دونیاو قیامەت دەبن، رێگای رزگاربوونو ژیانی سەربەستیمان بۆ ئاسان دەکا، خودا کەریمی کارسازەو هەموو کارێك دەسازێنێ، باچی تر لەژێر چاودێری یاساوڵەکانی پاشادا نەمێنینەوەو ئەم چەوسانەوە قبوڵ نەکەین.[1]

---

[1] شایانی باسە تا ئێستا نازانرێ (اصحاب الكهف) لەچ نەتەوەو تیرەیەکن، لەچ رۆژگارێکدا بوون، لەچ وڵاتو هەرێمێك بوون، ئەو ئەشکەوتەی ئەوان پەنایان بۆ برد لەکوێیە؟
قورئان ئاماژە بەوە دەکا، کە ئەوانە کۆمەڵە گەنجێك بوون لەپێناو بڕوا بەخوداو ئایینەکەیاندا تووشی چەوسانەوەو ستەمکاری ستەمکاران بوون. ئەم کۆمەڵە گەنجەش نەیانتوانیوە ئەو چەوسانەوەیە قبوڵ بکەن، بۆیە شاریان بەجێ هێشتوەو رویان لەکێوو ئەشکەوت کردوە.

مێـژووی کـۆنیش ئامـاژە بەچـەند چەوسـاندنەوەیەکی ئـایینی دەکـا؛ کـە لـەرۆژگاری کـۆندا لەخۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت روی داوە. لێـرەدا باسـی دووجـار لـەو چەوسـاندنەوانە دەکـەین کـە یەکێکیان زۆر دەگونجێ لەگەڵ باردو دۆخی (اصحاب الكهف)دا.

١- لەسەردەمی پاشا (مەلیك)ی سلوقی ئەنتیوخۆسی چوارەم کە نازنـاوی (بنابیڤـانیس) بـووەو لەدەوروبەری ساڵی (١٧٦-١٨٤پـز)دا ژیاوە چەوسـاندنەوەیەکی ئـایینی زۆر بـەهێز روی داوە. ئـەوە بوو ئەم پاشا ملهوڕە کـە چووە سـەرتەختی پاشایەتی لەسـوریا، زۆر رۆچـوبوو لـەبیرو بـاوەڕو رۆشـنبیری ئیغـریقیـدا، زۆر شـانازی بـەژیارو شارەسـتانی ئیغریقـەکان دەکـرد. ئـیتر تینـی بـۆ جولەکەکانی دانیشتووی فەلەستین هێنا کە واز لەئایینی خۆیان بێنن‌و ئـایینی ئیغریقـی قبـوڵ بکەن. هەرچی یاساو شـەریعەتی جولەکـە هەیـە پوچـی کـردەوە، هەیکـەلی پـیرۆزی پـیس کـرد، پەیکەری (زوس) کە بتی ئیغریقەکان بوو خستیە سـەر شـانۆی پەرسـتش، فـەرمانی دا بـەرازی بۆ بکەنە قوربانی‌و هەرچی نووسراوی تەورات هەبوو هەمووی کۆکردەوەو سوتاندی.

جا لـەژێر رۆشـنایی ئـەم حەقیقەتـە مێـژوویـیـەدا دەتوانـدرێ بگـوترێ: ئـەم کۆمەڵـە گەنجـە لەنەتـەوەی جولەکـەبوون‌و شوێنەکەشـیان فەلەسـتین بـووە، بەگـشتی، یـان ئورشـەلیم بـووە بەتایبـەتی. ئـەو کاتـەش کـە لەخەوەکـەیان راسـت کراونـەوە سـاڵی (١٣٦ز) بـووە ئـەو کاتـە خۆرهـەڵات لـەژێر فـەرمانڕەوایی رۆمـەکاندا بـووە. واتـە: (٤٤٥) سـاڵ پـێش لـەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام بووە. کە رێکەوتی (٥٧١ز) بووە.

٢- چەوساندنەوەی جاری دووەمیش لەرۆژگاری ئیمپراطوری رۆمانی (هـادر یـانوس) سـاڵی (١١٧-١٣٨ز) ئـەم ئیمپراتـۆرەش چـی لەدەسـت هـات لەگـەڵ جولەکـەدا کـردی زۆر لـە(انتیوخـوس)ی ناوبراو ستەمکارتربوو. ئەوەبوو لەسەردەمی ئەمدا ساڵی (١٣٢ز) جولەکە لەئیمپراتۆری رۆمـانی یـاخی بـوون، هەرچی دام‌و دەزگـای دەسـەڵاتی رومـانی هـەبوو لەفەلەسـتیندا وەدەریـان نـاو ئۆرشەلیمیان خستە ژێر دەستی خۆیان، تەنانەت ئەوەندەیان دڵ بەم رزگـار بوونـە خـۆش بـوو پارەیـان بـەم نـاوە لـێ داو ئـەو سـاڵەیان کـردە سـاڵی رزگـاربون‌و لـەوەدوا یـادی ئـەو رۆژەیـان دەکـردەوە. مـاوەی سـێ سـاڵ بـەو جـۆرە مانـەوە، پاشـان (هادریـانوس) بەلەشـکرێکی گـەورەوە هێرشـی بـۆ هێنـان‌و فەلەسـتینی داگـیر کـردەوەو ئۆرشـەلیمی خـستەوە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی. قەڵاچۆی جولەکەکانی کردو ریشەکێشی کردن، هەرچی گـەورەو پیاوماقوڵیـان هـەبوو کـوژران

ئـەمجار قورئـان شـێوەی مانـەوەیان لەئەشـكەوتەكەدا دەسـت نیـشان دەكـاو دەفەرموێ: ﴿وَتَـرَى الـشَّمْسَ إِذَا طَلَعَـتْ تَـزَاوَرُ عَـنْ كَهْفِهِـمْ ذَاتَ الْـيَمِينِ﴾ تـۆ ئـەی موحەممـەد! یـان هـەر كەسـێك بـۆ خیطـاب لەگـەڵ كـردن بگـونجێ. ئەگـەر ئـەو ئەشكەوتەت دەبینی بەم شێوە دەتبینی، كاتێ كە خۆر هەڵدەهات هەتاوەكە بـەلای راسـتدا دەكشاو ئەو كۆمەڵە گەنجەی دەبواردو تیشكەكەی لێیان نەدەكەوت!

﴿وَإِذَا غَرَبَتْ تَقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ﴾ كـاتێ كـە خـۆر بـەرەو ئـاوابوون دەكـشا، تیشكەكەی بەلای چەپدا دەڕۆییشتو ئەوانی دەبواردو هەتاویان لێ نەدەدرا. ﴿وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِنْهُ﴾ وەلحاڵ ئەوان لەپانتاییـیـەكی نـاو ئەشـكەوتەكەدا بـوونو هەوایـەكی فێنكو خۆشو سازگار لێی دەدان. لەغازی ناو ئەشكەوتەكەو تیشكی خۆر پـارێزراو بوون. شوێنەكەیان وابوو تیشكی خۆر لێ ی نەدەدانو هەوای سازگاریان بۆ دەهات.

**بەكورتی :**

خودای پـەروەردگار رێنمـونی كـردن بـۆ ئەشـكەوتێك كـە روی لـەلای سـەروی زەویـیەوە بوو، رووەكەی بەرامبەر (بنات النعش) بەرەو بـاكور هەڵكـەوتبوو، دیـارە

---

ئـەوانی تـر كرانـە دیـلو لـەبازاڕدا وەكـوو ئـاژەڵ فرۆشـران، هەرچـی شـەعائیرو جـەژنو یـادو یادەوەری جولەكە هەبوو هەمووی یاساغ كراو ئایینو دابو نەریتی جولەكە ئاسەواریی نەما.
جـا بـەگوێرەی ئـەم روداوە مێـژوویـیـە دەگـونجێ ئـەو كۆمەڵـە گەنجـە جولەكـە بـوبنو شوێنەكەشـیان لەخۆرهـەڵاتدا بـوبێ یـان بەتایبـەتی لەئۆرشـەلیم بـوبن. سـاڵی بەخەبـەر هاتنەكەشیان ساڵی (٤٣٥ز) بووبێ. واتە: لەپێش لەدایكبوونی پێغەمبەر بە(١٣٠) ساڵ.
بەهەر حاڵ چەوساندنەوەی جاری یەكەم زیاتر وێ چووە لەگەڵ روداوی (أصحاب الكهف)دا.
نەوەشمان لەبیر نـەچێ چەوساندنەوەی مەسـیحیەكان هەرچـەندە ئەمـەش زۆر جـار رودی داوە بەڵام لەگەڵ ساڵی لەدایكبوونی پێغەمبەری ئیسلام رێك ناكەوێ.
هەندێ لەراڤەكەرانی قورئانو مێژوو نووسان پێیان وایە ئەو كۆمەڵە گەنجە دانیشتووی وڵاتـی نەینەوا بوون لەشیمالی عیراقو ئەشكەوتەكەش لەكوردستانی عێراق بووە.
هەندێكیش پێیان وایە لەباشووری توركیـای ئێستایە. بـەڵام تـا ئێـستا بەڵگەیـەكی ئـەوتۆ نیـە شوێنەكە دیاری بكا.

ئـەو کاتـە لـەهیچ وەرزێکـی سـاڵدا هـەتاو لەبۆشـایی نـاو ئەشـکەوتەکە ناکـەوێ، بەدرێژایی ساڵ نە لەکاتی هەڵهاتن داو نەلەکاتی ئاوا بووونداو نەلەکاتی تـری رۆژدا تیشکی هەتاو لێیـان نەدەکـەوت، بـەڵکوو لەدەوروبـەری قـاپی ئەشکەوتەکەی دەداو بەس! ئەوەش دەبوە هۆی پاك و خاوێن کردنی هەوای ناو ئەشکەوتەکە،

هەڵبەتە ئەگەر قاپی ئەشکەوتەکە روەو خـۆر هـەڵات بوایـە بەدرێـژایی سـاڵ لەکاتی هەڵهاتنی خۆردا تیـشکی هـەتاو لێ ی دەدان، خـۆ ئەگـەر ئەشـکەوتەکە روەو خۆرئاوا بوایە ئەوە بەدرێـژایی سـاڵ لـەئێوارانـدا تیـشکی هـەتاو لێـی دەدان، ئەگـەر روی لەلای خواروی زەوییـەوە بوایـە ئـەوە لـەوەرزی پـاییزو زسـتاندا تیـشکی خـۆر لێیان دەکەوت.

بەو جۆرە پەروەردگار هیدایەتی ئـەو کۆمەڵـە گەنجـەی دا کـە روبکەنـە ئـەو ئەشکەوتە ناوازە گونجاوە بۆ تێدامانەوەو خەولێکەوتن!

﴿ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ﴾ ئەوەی باسکرا لەحاڵو وەزعی ئەو کۆمەڵە گەنجە هەر لـەبیرو بـاوەڕی یەکتاپەرسـتییانەوەو رەتکردنـەوەی بتپەرسـتیو گۆشـەگیربوونیان لەنەتەوەکـەیان بـەدڵو بەجەسـتەو بەگژداچونەوەی پاشاکەیانو روکردنـە کـەژو حەوانـەوەیان لـەناو ئەشـکەوتەکەداو هەڵکـەوتنی ئـەو ئەشـکەوتە بـەجۆرێك کـە تیشکی خۆر نەکەوێتە نـاوی، گێرانـەوەی ئـەم چیرۆکە بـەو شـێوە سـەرنج راکێـشە بەشێکن لەنیشانەکانی خوداو گەواهی ئەوە دەدەن: کە خـودا خـاوەن دەسـەڵاتی بـێ سنوورەو هەرچی بیەوێ دەیکاو هیچ شتێك نیە بتـوانێ ببێتـە لەمپـەڕ لەبـەر دەم ویستەکانیدا.

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە کە روکردنە یەکتاپەرستی ئەو کۆمەڵە گەنجـەو هەموو ئادەمیزادێکی تر بەچاودێری خودای مەزنەو بـەبێ ویـستی ئـەو نایەتـەدی دەفەرموێ: ﴿مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي﴾ کەسێك خودا تـەوفیقی بدا بـۆ دۆزینـەوەی

ڕێگای ڕاستو ڕێنمویی بکا بۆ بەحەق گەیشتنو بەهرەمەند بوون ئەوە هەر ئەو بەراستی هێدایەتدراوو بەمرازگەیشتووە!

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە ئەصحابولکەهف ڕێگای ڕاستیان ڕەچاو کردوەو بەمراز گەیشتون.

﴿وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ وَلِيّاً مُرْشِداً﴾ کەسێك خودا بەهۆی خراپی ونەبوونی ئامادەباشییان بۆ ڕێبازی حەق گومڕایان بکا، بۆ خۆیان بەویستی خۆیان ڕێبازی ناحەق بگرنە بەر، ئەوە هەرگیز ئەتۆ کەسێکت دەست ناکەوێ (جگە لەخودا) دۆستو یارمەتیدەریان بێو لەگومڕایی ڕزگاریان بکا، چونکە هیدایەتدانو گومڕا کردن بەدەست خودایە!

ئەمەش دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایەو ڕێنمویی کردنیەتی بۆ ئەوەی بەهەڵوێستی نالەباری گەلەکەی دڵتەنگ نەبێ، چونکە ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئادەمیزادی دەخستە سەر ڕێگای ڕاستو خودا پەرستیو هەموویان ئیمانیان دەهێنا!

﴿وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظاً وَهُمْ رُقُودٌ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ چاوت پێ بکەوتنایە واتدەزانی بەخەبەرنو نوستوو نین، چونکە چاویان کراوە بوو، هەر کەسی چاوی پێ بکەوتنایە وای دەزانی ئەوان تەماشای دەکەن! هیچ دیاردەیەکی نوستنیان پێوە دیار نەبوو. ﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ﴾ ئەم دیوو ئەو دیومان دەکردن، لەسەر ئەم تەنیشت دەمانخستنە سەر تەنیشتی تریان، لەڕاستەوە بۆ چەپو لەچەپەوە بۆ ڕاست هەڵەوگێرمان دەکردن بۆ ئەوەی هەوا لەهەموو جەستەیان بداو ئەو بەشەی جەستەیان کە لەسەر زەوییە بەهۆی زۆر مانەوەیان نەڕزێ.

راجیایی هەیە دەربارەی ماوەی ئەم دیوو ئەو دیو کردنەکەیان هەندێ گوتوویانە: ساڵی دوو جار ئەم دیوو ئەو دیو کراون، هەندێکی تر دەڵێن: ساڵی جارێك هەڵەوگێر کراون. لەمبارەوە هیچیان بەڵگەیان بەدەستەوە نیە، قورئانیش ئاماژەی بۆ نەکردوە لەفەرموودەی پێغەمبەریشدا لەم بارەوە هیچ رایوایەت نەکراوە.

ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: ئەگەر ئەم دیوو ئەو دیو نەکرانایە زەوی دیرزاندن!

﴿وَكَلْبُهُمْ بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ﴾ ئەو سەگەی: کە لەسەرەتاوە لەشارەکەوە شوێنیان کەوتبوو لەقاپی ئەشکەوتەکەدا یان لەناویدا دوو چەپۆڵەی لەسەر زەوی راخستبوون، وەکوو ئەوە ئێشکیان لێ بگرێ وابوو، ئەویش بەهەمان شێوە خەوی لێ کەوتبوو! چاوی بزو زیت دەچون، وادەزاندرا بەئاگایە.

شایانی باسە قورئان باسی ئەم دیوو ئەو دیوکردنی جەستەی سەگەکە ناکاو لێی بێ دەنگە!!!

﴿لَوْ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَاراً وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْباً﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ لەکاتی نووستنەکەیاندا چاوت پێیان بکەوتایە خۆت پێ رانەدەگیراو یەکسەر هەڵدەهاتی، ترس و بیم دایدەگرتی و لێیان دەترسای، چونکە پەروەردگار سامو هەیبەتێکی وای خستبوە سەریان کەس نەیدەوێرا پڕ بەچاوان سەیریان بکا. هەر کەسێ چاوی پێیان بکەوتایە دەیقاچاند، هەتا ماوەی نووستنی مەزەندە بۆ کراویان تەواو بوو، ئەو حیکمەت و بەرژەوەندییەی خودا دەیزانی هاتە جێ و بەڵگەی مادی حیسسی لەسەر بەتوانایی خودا دەربارەی هەموو شتێك و زیندوبوونەوە بەتایبەتی نمایان بوو، نوستن و بەخەبەر هاتنەوەکەیان بوو بەپەندو عیبرەت بۆ کەسانێك بیانەوێ پەند وەربگرن!

ئەمجار پاش تێپەڕبوونی سێ سەدو نۆ ساڵ بەسەر نووستنەکەیاندا خودا بەخەبەریان دەهێنێ دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ﴾ واتە: وەکوو چۆن ئەو کۆمەڵە گەنجەمان هیدایەتدان‌و لەئەشکەوتەکەدا خەومان لێ خستن‌و جەستەمان لەرزین‌و پۆڵگان پاراستن‌و بەزیندویی بەبێ خواردن‌و خواردنەوە ئەو ماوە دورو درێژە هێشتماننەوە؛ هەر بەو جۆرە لەو خەوە دوروو درێژە وەخەبەرمان هێنانەوە، بۆ ئەوەی تواناو دەسەڵاتی خۆمانیان بۆ دەربخەین، بیر لەخۆیان بکەنەوەو لەناکاما بکەونە پرسیار کردن لەیەکتری!

﴿قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ؟؟﴾ یەکێکیان کەوتە پرسیار کردن‌و وتی: چەند ماونەوە بەنوستوویی؟ ئەو ماوەیەی خەومان لێ کەوتبوو چەند بوو؟ ئەوان لەخەو هەستاون‌و چاوی خۆیان دەگلۆفن‌و رودەکەنە یەکتری‌و پرسیار لەیەکتر دەکەن؛ چەند ماونەوە؟ وەکوو چۆن کەسێك لەخەوێکی درێژخایەن بەخەبەر بێ پرسار دەکا چەندە دەبێ نوستووە؟ دیارە بۆ خۆیان هەستیان بەدرێژی خەوەکەیان کردوە؛ ﴿قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ پرسیار لێکراوەکان وەڵامیان دانەوە وتیان: رۆژێك یان بەشێك لەرۆژێك بەنوستویی ماوینەوە، چونکە وایانزانی هەر ئەوەندە ماونەوەن چونکە باش بەئاگا نەهاتبوونەوەو خەو بەری نەدابوون‌و خەریکی چاو گلۆفین‌و خەو لەخۆرەواندن بون، هێشتا بەباشی سەیری دەوروبەری خۆیان نەکردبوو، لەدیمەنی دەورو پشتیان ورد نەبووبوونەوە.....!

زوربەی راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە سەرتای خۆرهەڵاتن چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەخەبەر هاتنەکەشیان دەمەو ئێوارە بووە. بۆیە ﴿أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ییان گوت. پاشان وایان بەباش زانی؛ کە واز لەو مقۆ مقۆیە بهێنن، بۆ کاتێکی تری هەڵبگرن، کاری لەوە گرنگتر هەیە پێویستە ئەوە ئەنجام بدەن، ئێستا ئەوان برسییانەو پارەی زیویان لایە، کاتی خۆی کە لەشار دەرچوو بوون لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، بۆیە مەوزوعی ماوەی مانەوەکەیان بەنووستویی، حەواڵەی خودا کردو

﴿قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ﴾ هەندێکیان بەهەندێکیان گوت: خودای ئێوە دەزانێ چەند ماونەوە، ئێوە هیچی لێ نازانن، خودا دەزانێ ماوەی نووستنەکەمان چەند بووە. واز لەوە بێنن و ئەو مەوزوعە وەلا بنێن، ﴿فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَاماً فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِنْهُ﴾ یەکێك بنێرن بۆ ناو شار بەم پارەیەی لامانە با بڕوانێ چ خواردەمەنی یەك باش و بەسودو هەرزانە هەندێکمان بۆ بێنێ؟ ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ﴾ ئەو کەسەی دەینێرین و دەچێ بۆ کڕینی خواردەمەنییەکە بابەوریایی و زیرەکانە بچێ، لەچوون و هاتنەوەیدا وریابێت، بەجۆرێ هەڵس و کەوت بکا هەستی پێ نەکرێ و نەناسرێ، ﴿وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَداً﴾ راستی ئێوە لەلای کەس نەدرکێنێ، کەس بەئێوە شارەزا نەکا، کارێکی وا نەکا پێمان بزانن، چونکە ﴿إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ﴾ دەستەو دائیرەی دەقیانووس و یاساوڵەکانی ئەگەر پێتان بزانن و شارەزای شوێنەکەتان بن بەبەردبارانکردن دەتانکوژن، بەیاخی بوو دەرچوو لەژێر دەسەڵاتی یاساتان حیساب دەکەن، تاوانی یەکتاپەرستیتان دەدەنە پاڵ، ئەوان بتپەرستن ناهێڵن ئێمە خوداپەرست و یەکتاپەرست بین. یان دەمانکوژن و بەبەردباران لەناومان دەبەن ﴿أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ﴾ یان بەزۆرە ملێ و زەخت دەمانخەنەوە سەر بتپەرستی و ئایینی پووچی خۆیان. جا: کە ئێوە واز لەیەکتاپەرستی بێنن و بچنەوە سەر ئایینی ئەوان (با بەزۆرە ملێش بێ) ئەوە خەسارەتمەند دەبین و ﴿وَلَن تُفْلِحُوا إِذاً أَبَداً﴾ ئیتر هەرگیزاو هەرگیز نەلەدونیاداو نەلەقیامەتدا رزگاربونتان نیە، کەسێك لەخودا پەرستییەوە بگەڕێتەوە بۆ بتپەرستی، گەورەترین خەساری لێ کەوتووە. ئابەو جۆرە دەبینین ئەو کۆمەڵە گەنجە تازە لەخەو هەڵساوە لەناو خۆیاندا چپە چپ و مقۆ مقیانە، برسیانە، پارەیان پێیەو خواردەمەنییان لێ نزیك نیە. دەیانەوێ یەکێك بنێرن بۆ شارو مەترسی ئەوەیان هەیە پێیان بزانرێ، وا دەزانن هێشتا مەلیك دەقیانووس ماوەو بتپەرستی باوە، بێ ئاگان لەوەی چەند چەرخێك تێپەڕیوەو چەند چین ئادەمیزاد

بەدوای یەکدا هاتونو رۆییشتوون، نەیانـدەزانی رەورەوەی رۆژگار چەند جار تێوەرسوڕاوەتەوەو دیاردەی شارەکەیان گۆڕاوەو دونیا دونیایەکی ترە، پاشای مڵهوڕو خوانەناسو دارو دەستە بتپەرستەکانی چوونە زبڵدانی مێژووەوە!

بێ ئاگا بوون لەوەی دەنگو باسی بەسەرهاتی خۆیان دەماودەمو چین لەدوای چین گێڕدراوەتەوەو بووەتە سەرگورشتەو چیرۆکی بەرئاگردانی خەڵكو روداوێکی مێژوویی‌و خەڵکی ئەم سەردەمە چەند رایەکیان دەربارەیان بۆ پەیدابووە. هەر یەکە رەمێکیان بۆ دەهاوێ!

جا لێرەدا قورئان پەردە بەسەر ئەو دیمەنەدا دەداتەوەو دیمەنی ناو ئەشکەوتیان دادەپۆشێ‌و پەردە لەسەر دیمەنێکی تر هەڵدەداتەوە، جوداوازی نێوان ئەو دیمەنەو ئەم دیمەنە عاسمانو رێسمانە، بەڵام بەزەقی پیشانی نادا، هەر تیلنیشانی بۆ دەکا. لەرانواندنی دیمەنی دووەمدا ئەوە روون دەبێتەوە: کە زوربەی دانیشتوانی شار لەم چەرخەدا ئیماندارو خوداپەرستن، زۆر بەسۆزو بەپەرۆشن بۆ بیستن و زانینی هەواڵی ئەم کۆمەڵە گەنجە: کە لەمەوپێش دەنگو باسیان لەناودا بووەو ئێستا بەهۆی ئەو یەکەیان کە هاتۆتە ناو شار بۆ شت کڕین پێیان زانراوە.

دەبێ کە ئەو کۆمەڵە لاوە ئەو هاوەڵەیان گەڕاوەتەوە بۆ لایانو هەواڵی ناو شاری بۆ گێڕاونەوەو پێی راگەیاندون: کە دامو دەزگا گۆڕاوەو شار شاری جاران نەماوەو رۆژگارێکی زۆرو ساڵو عەیامێکی دورو درێژ بەسەریان دا تێپەڕیوە، چ سەرسامی یەك گرتبنی؟ چ موفاجەئەو سەرسوڕمانێك تووشیان بووبێ؟

وەرە بۆ خۆت بیر لەو کۆمەڵە بکەرەوە، لەنکاوێك بەخۆیان دەزانن کەوتوونە رۆژگارێکەوە سەیرو سەمەرە، کەس ناناسنو کەس نایانناسێ، خزمی کەس نینو کەسیان خزم نیە، هیچ شتێك نیە بەو کۆمەڵو خەڵکەیان ببەستێتەوە، نەناسیاوی‌و دۆستی، نەخزمایەتی‌و کەسایەتی، نەدابو نەرێتو هەستو شعور هیچیان لەوان ناچێ، شتەکە تابڵێی سەیرو سەمەرەیە، چەند لاوێکی لەدایکبووی

سێ سەدو ئەوەندە ساڵە پێش ئێستا، لەنکاوێك بکەونە ناو گەلو جیهانێکی ئاوا نامۆو نەناسراو، بێگومان کۆمەڵە گەنجێکی ئاوا نامۆ ناتوانن بەئارامی ژیان بەسەر بەرن، بۆیە خودا رەحمیان پێ دەکاو دەیانمرێنێ.

ئێمە دەتوانین هەموو ئەم جۆرە شتانە بەبیری خۆماندا بێنین، هەرچەندە قورئان فەرامۆشی کردون، تەنها دیمەنی کۆتایی رادەنوێنێ، دیمەنی مردنەکەیان و کۆبوونەوەی خەڵکی لەدەوروبەری ئەشکەوتەکەیان، مقۆ مقۆی ئەوەیان ئەمانە کێن و چن و لەسەر چ ئایینێك بوون؟ چۆن وا بکەن نەمریان بکەن و لەبیرەوەری خۆیاندا بیانهێڵنەوەو چین لەدوای چین ئادەمیزادان بۆ یەکتری بگێڕنەوە.

﴿وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ وەکوو چۆن خەومان لێ خستن و پاشان زیندومان کردنەوە، هەر بەو جۆرە خەڵکیشمان بەسەردا ئاگادارکردنەوە، حاڵ و وەزعییەتی ئەم کۆمەڵە گەنجەمان بەدانیشتوی شارەکەو دەوروبەری زاناند! کردمانن بەبەڵگە لەسەر توانا و دەسەڵاتی خۆمان بۆ ئەوانەی گومانیان هەبوو لەزیندوبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت، ﴿وَأَنَّ السَّاعَةَ لا رَيْبَ فِيهَا﴾ کردمانن بەنیشانەی ئەوەی کە رۆژی قیامەت دێ و شك و گومانی تێدا نیە.

هەر کەسێك وەزع و حاڵی (أصحاب الكهف)ی ببینیبێ هیچ گومانی لەوەدا نیە کە وادەو بەڵێنی خودا دێنەجێ و قیامەت رادەبێ، چونکە حاڵی ئەو کۆمەڵە گەنجەی (أصحاب الكهف) لەحاڵی نووستویی و بەخەبەریدا وەکوو حاڵی کەسێك وایە بمرێ و دوایی زیندو بکرێتەوە.

﴿إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ﴾ واتە: خەڵکی ئەو چەرخ و رۆژگارەمان بەسەردا ئاگادار کردن، لەکاتێکدا خەڵکەکە بۆ خۆیان لەناو خۆیاندا مقۆ مقۆیان بوو دەربارەی قیامەت و زیندوبوونەوە، هەیانبوو دەیگوت: قیامەت نایەو زیندوبوونەوە نابێ، هەیانبوو بڕوای بەهاتنی رۆژی قیامەت هەبوو دەیگوت زیندوبوونەوە دەبێ،

جا ئاگاداربوونی ئەو كۆمەڵە ـ كە لەناوخۆیاندا كێشەیان هەبوو ـ بەسەر حاڵو وەزعی (أصحاب الكهف)دا بوو بەبەڵگە بۆ خاوەن باوەڕانو بۆڕدانی بێ باوەڕەكانو ئەوانیش موسوڵمان بوون، پاشای ئەو رۆژگارە؛ كە بۆ خۆی خودا پەرست بوو گەلەكەشی زۆر بەم روداوە كەیفخۆش بوون: كە بوو بەمایەی ئیمان پتەوی هەندێكیانو موسوڵمانبوونی هەندێكی تریانو نەمانی خیلافو راجیایی لەنێویان.

تەفسیری قورطوبی دەفەرموێ: پاشای سەردەمی وەخەبەر هاتنەكەیان پیاوێكی خوداپەرستو صالح بوو، دانیشتووی ولاتەكەی لەبارەی زیندوبوونەوەو حەشرو نەشرەوە كەوتنە كێشەو نیزاعەوە، هەندێ كەس گومانیان پەیدا بوو، وتیان: ئەگەر زیندوبوونەوە بشبێ هەر بۆ گیانە بۆ جەستە نیە، چونكە لاشە گڵ دیخوا، هەندێ وتیان: نەخەیر زیندوبوونەوە بۆ لاشەو گیانە پێكەوە. پاشا كەوتە دڵتەنگییەوە نەیدەزانی بڵێ چیو چی بكا.

رۆژێك پۆشاكێكی دەرۆێشانەی لەبەر كردو لەماڵ دەرچوو چووە گڵو خۆڵێكەوە دانیشتو دەستی كرد بەنزاو پاڕانەوەو لالانەوە، داوای كرد خودا نیشانەیەكی رونو ئاشكرای وا پیشان بدا بێ باوەڕەكان ئیمان بێنن، خودای خاوەن رەحمو بەزەیی دوعاكانی گیرا كردنو ئەو كۆمەڵە گەنجە خەوڵێ كەوتووەی خەبەر كردەوە، ئەوانیش یەكێكیان نارد بۆ شار بۆ كڕینی خواردەمەنی بەپارەیەكی زیو؛ كە كاتی خۆی لەگەڵ خۆیان بردبوویان بۆ ئەشكەوتەكە. پارەكە سكەی ئەو پادشا كافرە بوو كە لەمێژوودا بەدەقیانووس بەناوبانگە. كابرا كە هاتە ناو شارو چووە بازاڕ سەیری كرد كەس ناناسێو دانیشتوانی شار هەموویان نامۆن لای، لەلایەكی تریشەوە جادەو رێگاو بانەكانی دەناسیەوەو وەبیری دەهاتەوە، ئەوەشی بۆ دەركەوت كە دانیشتوانی شارەكە خوداپەرستو خاوەن باوەڕن، ئەمجار چووە دوكانێك خۆراكی لێ بكرێ، كە پارە زیوەكەی پێدا دوكاندار سەرسام ماو پارەی نەناسی، وتی: یان دەبێ چۆنیەتی ئەم پارەیەم پێ بڵێی، یان دەتبەمە لای پاشا!

ئەویش وتی: ئەمە سکەی فلان پاشایە، بۆ ئێستا پادشای ئێرە فلان نیە؟ کابرای دوکاندار وتی: نەخەیر ئێستا پاشا فلانی کوڕی فلانە، ئینجا خەڵکی لێ کۆبوەوەو بردیان بۆ لای پاشاو پاشا چاوی پێکەوتو پرسیاری لێ کرد، ئەویش هەواڵی خۆیانی بۆ گێڕایەوە، لەوەپێشیش پاشا هەواڵی بەسەرهاتی ئەم کۆمەڵە لاوەی بیستبوو، وتی: وێ دەچێ ئەم کوڕە لەو تاقمە بێ کە کاتی خۆی لەسەردەمی دەقیانووسدا وەکێوی کەوتوون، بێگومان من لەوەپێش لەخودا پاڕامەوە کە خودا نیشانەیەکی ئەوانەمان پیشان بدا، پرسیاری لەکوڕە لاوەکە کرد ئەویش بەکورتی هەواڵی خۆیانی بۆ پاشا گێڕایەوەو پاشا زۆر بەوە کەیف خۆش بوو ئەمجار پیاو ماقوڵی شارەکەی کۆ کردەوە، لەناویاندا پیاوێك ناوو نیشانی ئەو کۆمەڵەی تۆمار کرد بوو، کاتێ ناوەکانی بۆ کوڕە گەنجەکە گێڕایەوە، وتی: راستە ئەوانە ئێمە ین.

ئەمجار پاشا روی کردە خەڵکەکەو وتی: خەڵکینە! خودا ئەمانەی کردوە بەبەڵگەو نیشانەی قودرەتیو نیشانەو موعجیزەی پیشان ئێوە داوە، با لەگەڵ ئەم کوڕە گەنجەدا بڕۆین بۆ ئەشکەوتەکە، ئیتر خەڵکەکە راجمین لەخزمەت پاشادا بەڕێ کەوتن. کە نزیك ئەشکەوتەکە بوونەوە (کوڕە گەنجەکەی نێردرابوو بۆ خواردەمەنی کڕین) وتی: با من لەپێشدا بچمەوە لایانو حاڵو وەزعیان تێ بگەیەنم پێیان بڵێم ئێستا دانیشتووی شار پاشاو گەدایان موسوڵمانن.

جا پاشا چاوی پیکەوتن هەموویان دانیشتبوونو دەمو چاویان دەگەشایەوە، پێشوازییەکی باشیان لەپاشاو هاوەڵانی کرد چاكو چۆنیو ماچو مۆچیان کردو پاشا دەستی کردە ملیانو زۆر کەیف خۆش بوو پێیانو ئەوانیش سەرگورشتەی خۆیانیان بەدورو درێژی بۆ گێڕایەوە. ئەمجار دوعای تەمەندرێژیو بەردەوامی پاشایەتیو فرمانڕەواییان بۆ پاشا کرد. خودا حافیزییان لەپاشاو خەڵکەکە کردو گەڕانەوە جیگاکەی خۆیانو راکشانو گیانیان دەرچوو.[1]

---

([1]) تفسیر القرطبي ج٥/ ل٣٠٦٨-٣٠٦٩. چاپی دار الفکر/١٩٩٩.

دەڵێن: پاشا بەجل و بەرگی خۆی دایپۆشین و فەرمانی دا هەریەکیان بخرێنە ناو تابوتێکی زێڕینەوە، شەو چوونە خەوی پادشاو وتیان: کاری وا نەکەی و با هەر لەشوێنی خۆمان بین، ئێمە لەخاك دروست کراوین و دەبینەوە بەخاك، ئیتر پاشا رای هاتە سەر ئەوە هەریەکەیان بخاتە تابوتێکی دارینەوە لەبەردەم قاپی ئەشکەوتەکە نێژران. مزگەوتێکی لەسەر دروست کردن.

دەی با بزانین قورئانی پیرۆز چۆن باسی راجیایی خەڵکەکە دەکاو دەربارەی دفن کردن و شێوەی ئارامگایان چی دەفەرموێ: ﴿فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِمْ بُنْيَاناً﴾ خەڵکەکە راجیاییان تێکەوت: هەندێکیان وتیان: چەند خانوێکیان بەسەرەوە دەکەین، یان دەرگای ئەشکەوتەکەیان لەسەر قەپات دەکەین، لێیان دەگەڕێین وەکوو خۆیان بمێننەوە، ئەمجار لەسەر دەرگای ئەشکەوتەکە بینایەك دروست دەکەین ببێتە نیشانەی گۆڕەکانیان.

﴿رَبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ﴾ خودای خۆیان زاناترە بەحاڵ و وەزعیان، بەنەتەوەو رەچەڵەکیان، بەبیرو باوەڕو هەڵس و کەوتیان. بەناوو ژمارەو شۆرەتیان. ئەمە رستەیەکی تێهەڵکێشە وەکوو دەڵێن: (جوملەی موعتەرەضەیە) لەکەلامی پەروەردگارە رەددی ئەوانە دەداتەوە: کە دەربارەی (اصحاب الكهف) کێشەیانە جا کێشەکە هی ئەوانە بێ کە کاتی خۆی پێیان زانین و بینیویانن. یان کێشەی ئەو خاوەن نامانە بێ: کە لەسەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا دەربارەی ناوو رەچەڵەك و ژمارەیان مقۆ مقۆیان بوو!

﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِمْ مَسْجِداً﴾ ئەوانەی دەسەڵاتدار بوون لەو رۆژگارەدا: کە وا دیارە پاشاو دارو دەستەو زوربەی جەماوەرە موسوڵمانەکە بووبن، وتیان: پەرستگایەکیان لەسەر دروست دەکەین، خودا پەرستان نوێژی تێدا بکەن و شوێنەکەیان بەپیرۆز بزانن.

دروســتكردنی پەرســتگا دابو نــەریتێكی جولەكــەو مەســیحییەكانە، كــە پەرستگایان لەسـەر ئارامگـای پێغەمبـەرەكانیانو قەدیـسەكانیان دروسـت كـردوە، زوربەی كاتیش ئەمە سەردەكێشێ بۆ بتپەرستی. بەداخەوە زۆر لەمێژە ئـەم دەردە كەوتۆتــە نێـو موسـوڵمانانەوەو لـەزۆر شـوێن بەدڵـسۆزی لاسـایی گـاورو جولەكـە دەكەنەوەو بست بەبست شوێنیان كەوتوون!

بۆیــە بەپێویــستی دەزانم لــەم بــارەوە چــەند فەرموودەیــەكی پێغەمبــەر ﷺ لێرەدا تۆمار بكەمو بیانخەمە رو:

ئیمامی قورطوبـی لەتەفسیرەكەیدا دەفـەرموێ: لێـرەدا چـەند مەسـەلەیەك دێنە پێشەوە هەنـدێكیان دروسـتنو هەنـدێكیان یاساغو نـەی لێكـراون. یـەكێ لـەو مەسەلانە دروستكردنی مزگەوت لەسـەر گۆڕسـتانە، دروسـتكردنی مزگـەوت لەسـەر گۆڕو نوێژ كردن تێیدا، هەروا دروست كردنی بینا لەسەر گـۆڕو ئـەم جـۆرە شـتانە، یاسـاغنو پێغەمبــەر ﷺ جڵــەوگیری لێ كــردوە. ئــەبو داوودو تــیرمیــذی لــەئیبنو عەبباسەوە فەرموودەیـەك ریوایـەت دەكـەن دەفـەرموێ: (لعـن رسـول الله ﷺ زوارات القبور والمتخذين عليها المساجد والـسرج).[1] پێغەمبـەر ﷺ نـەفرینی لـەو ئافرەتانـە كـردوە: كـە دیـدەنی گۆڕسـتان دەكـەن هـەروا لـەو پیاوانـەش: كـە مزگـەوت لەسـەر گۆڕستان دروست دەكەنو چراو فانۆس هەڵدەكەن.

لەصــەحیحی بوخــاریو مەسـلیمدا هــاتووە: لــەخاتو عائیــشەوە دەفــەرموێ: نوممومحەبیبەو نوممومسەلە باسی كەنیـشتەیەكیان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ گێڕایـەوە كـە كـاتی خـۆی لـەولاتی حەبەشـە بینیبوویـان، هەنـدێ وێنـەو پەیكـەری تێـدا بـوون.

---

[1] تیرمیذی لە(أبـواب الـصلاة)دا (٣٢٠) (بـاب ١٢١)دا ریوایـەتی كـردوە. ئـەبو داود لـە(الجنـائز)دا ژمارە (٣٢٣٦) (باب ٨٢) ریوایەتی كردوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان أولئك اذا كان فيهم الرجل الصالح فمات بنوا على قبره مسجداً وصوروا فيه تلك الصور، أولئك شرار الخلق عند الله تعالى يوم القيامة).[٢]

زانایانی ئیسلام لەم فەرموده ئەوەیان وەرگرتووە: کە یاساغە لەسەر موسوڵمانان: کە گۆڕی پێغەمبەران و پاو چاکان بکەنە مزگەوت.

هەندێ لەزانایان لەئەبو مەرثەدی (الغنوی)یەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم زنەوت دەیفەرموو: ((لاتصلوا الى القبور ولا تجسلوا عليها)[١] واتە: لەکاتی نوێژ کردندا رو مەکەنە گۆڕو ئارامگا، هەروەها لەسەریشی نوێژ مەکەن، وەکوو جولەکەو نەصرانییەکان دەیکەن، ئەوەکوو سەر بکێشێ بۆ پەرستن و بەپیرۆز زانینی ئەوەی لەناو گۆڕەکەدایە. وەکوو چۆن لەبنەرەتیشدا بتپەرستی لەوەوە داهاتووە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی ترساندوە لەو جۆرە کردەوانەو هەموو رێگایەکی بەستووە کە سەر دەکێشێ بۆ بتپەرستی، بۆیە لەفەرموودەیەکی تری دا دەفەرموێ: (اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم وصالحيهم مساجد)[٢]

---

[2] (صحيح مسلم) لەباسی (المسجد ومواضع الصلاة) (٥٢٨) (باب ٣) (النهي عن بناء المساجد على القبور)دا ریوایەتی کردوە. بوخاریش لەباسی (الصلاة) (٤٣٤) (باب ٥٤) (الصلاة في البيعة)دا ریوایەتی کردوە.

[١] ئەمە لەفظی موسلیمە لەباسی (الجنائز) (٩٨/٩٧١) (باب ٣٣) (النهي عن الجلوس على القبور والصلاة عليه). ئەبو داود لە(الجنائز) (٣٢٢٩) (باب كراهية القعود على القبور) تیرمیذی لە(الجنائز) (١٠٥٠) باب (٥٧) (باب ما جاء في كراهية المشي على القبور والجلوس عليها). نسائی لە باسی (القبلة) (٦٧/٢) (باب النهي عن الصلاة الى القبر)ی‌دا ریوایەتیان کردوە.

[٢] ئەمە بەشێکە لەفەرموودەیەك ئیمامی مالیك لە(الموطأ)(٤١٦) لەباسی کورتکردنەوەی نوێژ (باب/٢٤)دا ریوایەتی کردوە.

لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرمودەکە لەعائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە بەم شێوەیە ریوایەت کراوە. (لعنة الله على اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[٣]

ئیمامی موسلیم لەجابیرەوە روایەت دەکا دەفەرموێ: (پێغەمبەر ﷺ جڵەوگیری لەوە کرد: کە گۆڕ دیواری گەچی لەسەر بکرێ، یان ئەم لاو ئەو لای گەچکاری بکرێ، یان لەسەری دانیشتن بکرێ [٤]

ئەبو داودو تیرمیذی دووبارە لەجابیرەوە ریوایەتێکیان هێناوە دەفەرموێ: (پێغەمبەر ﷺ جڵەوگیری لەگەچکاریکردنی گۆڕ کردوە هەروا نووسینو پێ لێنانو خاتوو لەسەر دروستکردنیشی یاساغ کردوە)[١]

ئەبول هەییاجی ئەلئەسەدی دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو طالیب پێی گوتم: ئەرێ بۆ نەتنێرم بۆ کارێك کە کاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ منی بۆ نارد. کارەکەش ئەوەیە: بچی هەرچی پەیکەرە نەیهێڵی، هەر گۆڕێکت بینی بەرز کرابوەوە لەگەڵ خاکدا یەکسانی بکەی، لەریوایەتێکدا هەر وێنەیەکت بینی لەناوی بەری.[٢] لەمەوە زانایانی ئیسلام فەرموویانە: ظاهیری فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنن: کە بەرز کردنەوەی گۆڕ حەرام بێ، هەندێ لەزانایانی ئیسلام بەلایانەوە حەرامە تمباری گۆڕ لەزەوی بەرز بێتەوە.

جەماوەری زانایان پێیان وایە: جڵەوگیرییەکە روودەکاتە گۆڕێك: کە زیاد لەتەسنیم بێ، ئەگینا بەرز کردنەوەی سەر گۆڕ تا ئەندازەی تەسنیم واتە: بستێك

---

[٣] بوخاری لەباسی نوێژ (٤٣٦) (باب ٥٥)دا ریوایەتی کردوە.

[٤] موسلیم لەباسی (الجنائز)دا (٩٧٠) (باب ٣٢). (النهي...الخ).

[١] تیرمیذی لەباسی (الجنائز) (١٠٥٢) (باب ٥٨) (ما جاء في.....الخ)

[٢] ئەبو داود لەباسی (الجنائز)دا (٣٢١٨) (باب ٧٢) تیرمیذی لە(الجنائز) (١٠٤٩) (باب ٥٦). موسلیم لاباسی (الجنائز)دا (٩٦٩) (باب٣١) ریوایەیتان کردوە.

لەزەوی بەرز بێتەوەو لای سەروی تەسك بكرێتەوە ئەوەندە بێ گۆڕەكەی پێ بناسرێ قەیناكا. چونكە شێوەی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و دوو هاوەڵەكانی: (ئەبو بەكرو عومەر) ئاوابووە، بەڵام دروستكردنی خانوو لەسەری‌و بەرز كردنەوەی گۆڕەكە زیاد لەئەندازە وەكوو ئەو جۆرەی لەسەردەمی جاهیلی دا دیانكرد ئەوە دەڕوخێندرێ. ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: ئەگەر سەر گۆڕەكە بەقوڕ سواغ درێ دروستە.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: گۆڕ هەڵبەستن‌و خانوكردن لەسەر گۆڕو كردنی سەر گۆڕ بەپەرستگا داب‌و نەریتێكی جولەكەو گاورەكانە گواستراوەتەوە بۆ ناو موسوڵمانان، موسوڵمانان وێڕای ئەو هەموو فەرمووده صەحیحانەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی جڵەوگیریكردن لەوەی خانوو گومبەز لەسەر گۆڕستان بكرێن، نەهی كرد لەوەی گۆڕەكان بكرێن بەشوێنی نوێژو مزگەوت! كەچی بەداخەوە ئەوەتا ئەم هەموو بیناو گومبەزو باڵە خانانە، ئەو هەموو خانوو كۆشكە گرینگانە بەسەر گۆڕی پیاوە گەورەكانەوە كراوە، مەرقەدو ئارامگایان بەگەچ‌و چیمەنتۆو بەردی مەڕمەڕو كەرەسەی بەنرخ رابەستراوە. ئەمجار خەڵكی نەفام‌و سافیلكە نوێژی تێدا دەكەن، لەگۆڕەكان دەپاڕێنەوە كە بەهانایانەوە بێن! زۆر كەسی نەشارەزا هەیە هەوڵ دەدا نوێژ لەناو ئەو جۆرە مەرقەدانەدا بكا، چونكە بەلایەوە لەمزگەوتەكان پیرۆزترن. بۆ نموونە هی وا هەیە دەچێتە مزگەوتی ئیمام ئەبو حەنیفە یان مزگەوتی گەیلانی یان شێخ مەعروفی كەرخی لە بەغداد یان مزگەوتی گەورەی سلێمانی....هتد هەوڵ دەدا بچێتە ئەو ژوورەی كە ئارامگای ئەبو حەنفەیە یان مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی یە، یان ئارامگای شێخ مەعروفی كەرخی یە، یان ژورەكەی كاكە ئەحمەدی شێخ لەوێدا نوێژەكەی بكا. لەكاتێكدا بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام بەفتوای زانایانی ئایینی ئیسلام نوێژ كردن لەو مەرقەدانەدا حەرامەو گوناهە. پێویستە وازی لێ بهێنرێ. چونكە چەند فەرموودەی صەحیحی

پێغەمبەر ﷺ هەیە بەروونی جلەوگیری لەو كارە دەكا لەوەپێش هەندێكمان لەو فەرموودانە تۆمار كردن.

لەلایەكی ترەوە هەندێ دابو نەریتی ناشیرینو ناشەرعی لەكاتی زیارەتكردنی ئەو گۆڕانەدا ئەنجام دەدرێ وكوو سوڕانەوە بەدەوری گۆڕەكاندا، ماچكردنی دارو بەردی گۆڕەكانو لستنەوەی دیوارەكانیو خۆتێهەڵسوین لەدارو بەردوویان، لەوەش ناشیرینترو ناشەرعی ترو گوناهتر ئەوەیە هەندێ لەو زیارەتكەرانە رودەكەنە گۆڕەكانو دەست بەرز دەكەنەوەو لەبەریان دەپاڕێنەوەو دەلالێنەوە داوای جێ بەجێ كردنی مرازەكانیان دەكەن!

لەراستیدا ئەمە بتپەرستییەو بەهیچ بڕو بیانوێك پێنەوپەڕۆ ناكرێو هیچ پاساوێكی نیە. بۆیە پێویستە موسوڵمانان بەخۆیاندا بچنەوەو واز لەو كارە ناشەرعییە بێننو تۆبە بكەنو لەتاوانی رابوردویان پەشیمان ببنەوە، بێگومان ئەوەش چەسپاوە كە لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا لەعێراق گۆڕی دانیال پێغەمبەر دۆزرایەوە، حەزرەتی عومەر یەكسەر فەرمانی دەركرد كە لەگەڵ زەویدا یەكسان بكرێ، ئەو نووسینەی لەگەڵ گۆڕەكەیدا دۆزراوەتەوە ژێر خاك بكرێ.[1]

پێویستە موسوڵمانانی رۆشنبیرو زانایانی ئایینی مامۆستایانی مزگەوت جلەوگیری لەو كارە ناشیرینە بكەنو ئەم ناشەرعییە بۆ موسوڵمانان شی بكەنەوە، لەتانەو لۆمەی ئەمو ئەو نەترسن، ئادابو شێوەی زیارەتی شەرعی فێری موسوڵمانان بكەن، چونكە بێگومان دیدەنی گۆڕستان بەگشتیو ئارامگای پیاوچاكان بەتایبەتی شتێكی رەواو شەرعییە بەلام بەمەرجێ بەشێوەی شەرعی ئەنجام بدرێ چەند فەرموودەی پێغەمبەر هەن موسوڵمانان هەڵدەنێن بۆ دیدەنی كردنی گۆڕستان چونكە دیدەنی گۆڕستان بەشێوەی شەرعی رۆژی دوایی بیر دەخاتەوە،

---

[1] تەفسیری مەراغی ج١٥/١٣٥.

بەتایبەتی دیدەنی گۆڕی پیاو چاكان خێرو بەرەكەتی هەیە، وەكوو دیدەنی كردنیان وایە لەكاتی زیندوویی دا.

بەكورتی دەبێ مامۆستایانی ئایینی، رۆشنبیرانی خواناس رێبازی مام ناوەندی بگرن، نەچن وەكوو هەندێ كەس تەقدیسو رێز لەگۆڕو ئارامگا بگرن بگاتە ئەندازەی بتپەرستیو دارو بەردی گۆڕەكان ماچ بكەینو خۆ لەدارو پەردوویان هەڵسوینو دوعاو پاڕانەوەیان ئاراستە بكەین. یان بەپێچەوانەوە نەچن وەكوو هەندێ كەس دیدەنی كردنی گۆڕستان بەرحەرام بزانین ج بایەخێكی پێ نەدەین. نەچین هێندە توندڕەوبین نوێژ كردن لەو مزگەوتانەی گۆڕی تێدایە بەحەرم بزانین، مزگەوتێك گۆڕی پیاو چاكێكی لەپاڵدا بێ بەڕەوای نەزانین نوێژی تێدا بكرێ. لەراستی دا ئەمەش توندڕەوییەو نارەوایەو پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین.

ئایینی ئیسلام ئایینی راستیو میانەڕەوییە، لەهەموو شتێكدا ناوە راستی گرتووە بەهەر لایەكدا كێش بكرێ لەجەمسەری ئایین دەردەچێ.

ئەمجار دێتە سەر باسی مقۆ مقۆی ئادەمیزادان لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ژمارەی ئەو كۆمەڵە لاوەو دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ برێ لەخاوەن نامەكان دەڵێن: ئەو كۆمەڵە گەنجە سێ كەس بوون، چوارەمیان سەگەكەیان بوو.

ریوایەتكراوە: ئەصارای نەجرانی هاتنە لای پێغەمبەرو لەم بارەوە دەستیان كرد بەگفتو گۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ. مەلكانییەكان وتیان: ئەصحابولكەهف سێ كەس بوونو چوارەمیان سەگەكەیان بووە ﴿وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ هەندێكی تر: كە یاقوبیەكانن دەڵێن: پێنج كەس بوون سەگەكەیان شەشەمیان بووە ﴿رَجْماً بِالْغَيْبِ﴾ ئەم دوو تاقمە هەر لەخۆیانەوە رمڵ دەهاوێژن، هەواڵێ دەدەن نهێنی یە لێیانو هیچی لێ نازانن كوێرانە قسە فڕێ دەدەن.

﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ هەندێکی تریان کە نەسطوریەکانن دەڵێن: حەوت کەسن‌و هەشتەمەکەیان سەگەکەیانە.

لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە فەرموویەتی: ئەم رایە حەق‌و راستە، چونکە پەروەردگار بۆ دوو رایەکەی تر فەرمووی کوێرانە رەمڵ دەهاوێژن‌و لەخۆیانەوە قسە فڕێ دەدەن، بەڵام بۆ رای سێهەم ئەو حوکمەی نەداو لێی بێ دەنگ بوو، ئەمە نیشانەی ئەوەیە: کە ئەو ژمارە راستەو هاوشانی حەقە.

ئەمجار پەروەردگار رێنموییمان دەکا: بۆ ئەم جۆرە شتانە لەخۆوە هەواڵ نەدەین‌و زانینەکەی حەواڵەی خودا بکەین. دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ﴿رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِمْ﴾ خودای من زاناترو ئاگادار ترە بەژمارەی ئەو کۆمەڵەو حاڵ‌و وەزعیان ﴿مَا يَعْلَمُهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ کەمێ لەخەڵکی نەبێ ژمارەیان نازانێ، ئەو ژمارە کەمەش ئەو کەسانەن کە لەکاتی خۆیدا روداوەکەیان بینیوەو چاویان بەو کۆمەڵە لاوە کەوتووە. هەروەها ئەوانەش کە لەسەرچاوەو رێگایەکی راستەوە ئەو هەواڵەیان زانیبێ.

ئیبو عەبباس دەفەرموێ: من لەو کەسانەم: کە خودا ئیستیثنای کردون، ئەو کۆمەڵە لاوە حەوت بوون، ئیبن‌و جەریریش هەر ئەم ژمارەیەی لەعەطاوە ریوایەت کردوە.

گرنگ زانینی ژمارەکەیان نیە، بەڵکوو گرنگ پەندو عیبرەت لەچیرۆکەکە وەرگیرێ‌و بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوە: کە خودا دەتوانێ پاش مردن ئادەمیزادەکان جارێکی تر زیندو بکاتەوە.

## تێبینی:

لێره سێ رسته ههن ﴿ثَلاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ ﴿خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ ﴿سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ لەدوو رستەی پێشەوەدا (واو) نیه لەرستەی سێیەمدا (واو) هەیە. ئەم جوداوازییە چی یە؟؟

زومەخشەری وڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوەو دەفەرموێ: ئەم (واو)ە دەچێتە سەر رستەیەك: کە ببێتە صیفەتی نەکیرە.

فائیدەی ئەو (واوە) جەخت کردنەوەی پەیوەندی نێوان صیفەتو مەوصووفە، نیشانەی ئەوەیە: کە ئەو وەصفە ثابیتو چەسپاوە بۆ مەوصووفەکە، واتە: ئەوانەی کە دەڵێن: ﴿سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ لەزانستو دڵنیایی یەوە ئەو قسەیان کردوە، لەخۆوە قسەکەیان فڕێ نەداوە.

﴿فَلا تُمَارِ فِيهِمْ إِلاَّ مِرَاءً ظَاهِراً﴾ ئەی موحەممەد! کێشە لەگەڵ خاوەن نامەکان مەکە دەربارەی (أصحاب الكهف) مەگەر کێشەیەکی کەم هەر ئەوەندەیان پێ بڵێ کە بەنیگا بۆت دێ، هیچی لێ زیاد مەکە، بەتوندو تیژی رەدیان مەدەرەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾النحل/١٢٥. یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾العنكبوت/٤٦.

کێشەیان لەگەڵ مەکەو زۆر لەگەڵیان پێدا مەچۆرەوە ئەو کێشەو دەمە دەمە دەربارەی ژمارەی ئەو کۆمەڵە لاوە چ سودێکی لێ پەیدا نابێ، ژمارەکەیان سێ بن یان پێنج بن یان حەوت بن یان زیاتر چون یەکە ژمارەکەیان چ دەورێکی نیە. ئیشی ئەوان لای خودایە، زانیاری دەربارەیان لای خودایەو لای کەمێك لەوانەیە بەچاوی خۆیان رووداوەکەیان دیوە، یان بەریوایەتی صەحیحو راست پێیان گەیشتووە، کەوابێ دەمە دەمێی زۆر دەربارەی ژمارەیان چ سودێکی تێدا نیە، پەند وەرگرتن لەکاری ئەوان کەم بن یا زۆر بن یەکسانە، بۆیە قورئان تەوجیهی

پێغەمبەر دەكا: كە لەم بارەوە واز لەجەدەلو كێشە بێنێ، وزەی عەقڵی خۆی لەو بارەوە بێهودە خەرج نەكا، بۆ ئەوەی موسوڵمانان شوێن شتێك نەكەون كە عیلمو زانیارییان دەربارەی نیە، ئەم روداوە رۆژگار لەگەڵ خۆی لوولی داوە بومتە نهێنی یەكی مێژوویی‌و عائید بەخودایەو حەواڵەی عیلمی خودای بكەن!

﴿وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِمْ مِنْهُمْ أَحَداً﴾ دەربارەی ئەو كۆمەڵە لاوە پرسیار لەخاوەن نامەكان مەكە، بەهیوای ئەوەی زانیارییان لێ وەرگری، چونكە ئەوان هیچی لێ نازانن‌و ئەوەی دەربارەیان دەیڵێن هیچی بەسەر هیچەوە نیە، لەلایەكی ترەوە ئەوەی لەقورئان‌دا هاتووە بەسە.

ئەمجار بەبۆنەی جڵەوگیری لەكێشەو جەدەل دەربارەی نهێنی رابوردو جڵەوگیری لەوە دەكا: كە دەربارەی غەیبی داهاتووش بڕیار نەداو لەخۆیەوە رەمڵ نەهاوێژێ، چونكە ئادەمیزاد نازانێ لەداهاتوودا چی رو دەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَداً، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّـهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! بۆ هەر كارێك بتەوێ لەداهاتوودا ئەنجامی بدەی بەراشكاوی مەڵێ سبەینێ من ئەوە دەكەم مەگەر رستەی (ئینشائەڵلا)ی لەگەڵدا بڵێی! بۆ هەموو كارێك كە دەتەوێ لەداهاتوودا ئەنجامی بدەی رستەی (ئەگەر خودا بیەوێ)ی لەگەڵدا بڵێ، هیچ وادەیەك مەدە بەبێ گوتنی (ئینشائەڵلا) لەگەڵی دا. هەر كارێكت ویست بیكەی بڵێ: (ان شاء الله) دەیكەم.

فەرموودەیەك لەصەحیحەین دا هەیە لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتكراوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: سولەیمانی كوڕی داود دروودی خودایان لێ بێ، وتی: ئەمشەو دەچمە لای حەفتا لەخێزانەكانم لەریوایەتێكدا صەد لەخێزانەكانم، هەر یەكەیان كوڕێكی ببێ‌و گەورە ببێ‌و پێ بگاو لەپیناو ئایینی خودادا جیهاد بكا، پێی گوترا بڵێ: (ان شاء الله) نەیگوت. ئەو شەوە چووە لای خێزانەكانی‌و ئافرەتێكیان نەبێ هیچیان سكی نەبوو، ئەو ژنەشی منداڵێكی

نیوەچڵی بوو.. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فوالذي نفسي بيده لو قال ان شاء الله لم يحنث، وكان دركا لحاجته) لەریوایەتێکی تردا (ولقاتلوا في سبيل الله أجمعون) لەوەپێش لەباسی هۆی نازڵبوونی ئەم ئایەتەدا ئاماژەی ئەوەمان کرد کە کافرەکان پرسیاریان لەپێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی گیانو ئەصحابەلکەهفو ذیلقەرنەین، پێغەمبەریش فەرمووی: بەیانی وڵامی پرسیارەکانتان دەدەمەوە، ئینشائەڵڵای نەکرد، ئیتر بۆ ماوەی پانزە رۆژ نیگای لێ بڕا، پێغەمبەر ﷺ بەمە زۆر تەنگەتاو بوو، ئیتر ئەم سورەتە وەکوو دەرگای رەحمەت لێکردنەوە نازڵ بووە سەری‌و فەرمانی پێ دەکا کە بۆ هەر شتێك بیەوێ بیکا، ئینشائەڵڵای لەگەڵدا بڵێ، بڕیاری هیچ شتێك نەدا تا بەویستی خوداوە پەیوەستی نەکا، بۆ هەموو شتێك کە بڕیاری کردنی دەدا ئینشائەڵلا بڵێ: بەراستی ئەمە ئەدەبێکی جوانە پەروەردگار فێری پێغەمبەری کرد، رێنمونیشە بۆ هەموو موسوڵمانێك‌و پێویستە بەجوانی پەیڕەوی ئەم ئەدەبە بکا، چونکە هیچ شتێك لەبوونەوەردا بەبێ ویستی خودا نایەتە دی، هەموو هەناسەیەکی گیانلەبەران، هەموو جم‌و جوڵێکی بوونەوەر هەر لەگەردیلەوە تا مەجەرە، هەموو تیکەو لێکەیەك بەستراوە بەویست‌و خوا هیشی پەروەردگارەوە، بەبێ ویستی ئەو هیچ شتێك نابێ، کەوابێ پێویستە ئێمەی ئادەمیزاد بەدڵ‌و بەزمان هەموو کارێکمان بەو مەشیئەتە رەهایەوە ببەستینەوە، هەروەها هەموو رووداوێکی لەمەودوا شتێکی پەنامەکی یەو لەئێمە غەیبی یە، کەوابێ پێویستە لەخۆوە بەبێ عیلم‌و زانین دەم‌و لەو شتانە نەکوتین.

لەلایەکی ترەوە خۆ راهێنان‌و پەیڕەوکردنی ئەم فەرمانە پەیوەندی ئادەمیزاد بەخوداوە پتەو دەکا، دەبێتە هۆی جێگیر بوونی یادی خودا لەدڵ‌و دەروونەدا، ئادەمیزاد وا لێ دەکا هەست بەتەنیایی‌و بێ پشتیوانی نەکا، هەست دەکا هێزێکی کاریگەری لەپشتە لەکاتی سەرکەوتندا لەخۆی بایی نابێ، بەتێشکان‌و ژێر کەوتن هیوا بڕاو نابێ، لەحاڵەتی خۆشی‌و ناخۆشی دا، دڵی بەخوداوە پەیوەستەو

گەشبینو بەرچاوو رونە، لەسەر خۆشی سوپاسگوزارە لەسەر ناخۆشی بەصەبرو ئارامە!!

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئادەمیزاد پاڵی لێ بداتەوە بیر لەداهاتوو نەکاتەوە پیلان بۆ داهاتوو دانەنێ، رابوردوو ئێستاو داهاتووی خۆی پێکەوە گرێ نەدا، نەخەیر ئەوە ناگەیەنێ، بەڵکوو مانای ئەوەیە ئادەمیزاد بۆ هەموو کارێك گرنگ بێ یان نا، کەم بێ یان زۆر حیسابی غەیب بکا، حیساب بۆ ویستو خواهیشی پەروەردگار بکا، حیساب بۆ ئەو مەشیئەتە بکا: کە هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، پەلاماری هەر شتێکی دا مەشیئەتو ئیرادەی خودا لەبەر چاو بگرێ، وا هەست بکا: کە قودرەتو دەسەڵاتی خودا لەژوور دەسەڵاتی خۆیەوەیە. نیازی کردنی هەر کارێکی کرد بەدووری نەزانێ: کە خودا ویستێکی تری هەبێ، جا ئەگەر خودا یارمەتی داو نیازەکەی بۆ هێنایە دی ئەوە باشە خۆ ئەگەر ویستی خودا بەپێچەوانەی نیازی ئەوەوە بوو، ئاواتەکەی نەهاتە دی، با پێی دڵتەنگ نەبێ، چونکە هەموو شتێك بەدەست خودایە، ویستی ئەو چۆنە هەر ئەوە دێتە دی.

کەوابێ با ئادەمیزاد بیر بکاتەوە، پیلان دانێ، بەڵام باوا هەست بکا: کە بیر کردنەوەو پیلاندانانی بۆ کارەکانی بەویستو خواهیشی خودا دەستەبەر دەبن. دڵنیابێ خودا چی لەچارە نووسیوە هەر ئەوە دێتە کایەوە، چی بڕیار داوە هەر ئەوە دەبێ، جا ئەگەر لەداهاتوودا پەردەی غەیب لەسەر شتێك لادراو تەگبیری خودا لەتەگبیری ئەو جیا بوو، با بەدڵێکی فراوانەوە قەزاو قەدەری خودا قبووڵ بکاو گەردنکەچی خواهیشی پەروەردگاری بێ، چونکە پێنووسی ئەزەڵ هەر ئەوەی بڕیار داوە، لەئەم نهێنی بووەو ئێستا هاتۆتە دی. ئا ئەمەیە ئەو پەیڕەوو پرۆگرامەی ئیسلام دڵی موسوڵمانی پێ پەروەردە کا، لەحاڵی بیرکردنەوەو تەگبیر کردن هەست ناکا بەتەنهایی و بێکەسی، لەحاڵی سەرکەوتنو رزگاربووندا هەست ناکا بەلەخۆبایی بوونو لوتبەرزی، لەحاڵی تێشکانو ژێرکەوتندا هەست

بەنائومێدیو هیوا بڕاوی ناکا، بەڵکوو لەهەموو حاڵەکانی دا دڵی پەیوەستە بەخوداوە، پشتی بەئەو قائیمەو سوپاسی نیعمەتەکانی دەکاو رازییە بەقەزاو قەدەری پەروەردگاری!

﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ هەر کاتێ بڕیارێکت داو نیازی کردنی کارێکت بوو لەبیرت چوو (ان شاء الله) بڵێی دوایی بیرت کەوتەوە خێرا بیڵێو فریای قسەکەی پێشووتی بخە، ئەو خێرو فەڕە لەکیس خۆت مەدە، هەرچەندە ماوەی زۆریشی بەسەردا تێپەڕی بێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: تا ساڵێکیش بێ هەر قەیناکا! واتە: ئەگەر کابرا بڕیارێکی داو پاش ساڵێك بیری کەوتەوە کە (ان شاء الله)ی بۆ ئەو کارو بڕیارەی نەگوتووە با بیڵێ.

بەڵام ئەوەمان لەبیر نەچێ بۆ ئەحکامی شەرعی ئیستثناء کاتێك دەوری هەیە کە بەشوێن موستەثنامنهودا بێو لێك دانەبڕێن.

﴿وَقُلْ عَسَى أَنْ يَهْدِيَنِي رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَدًا﴾ ئەی موحەممەد! بڵێ: ئومێدەوارم، چاوەڕوانم خودای خۆم شارەزاییم بکا بۆ شتێك خێرو بێری ئەوەی لەبیرم چووە بۆم پڕ بکاتەوە، فەڕو بەرەکەتی نزیکتر بێ. هیوادارم پەروەردگارم رێنموییم بکا بۆ شتێك بەڵگەو نیشانەی روونو راستی تری تێدابێ لەسەر پێغەمبەریەتیم. بەڵگەی وام نیشان بدا باشتر بچێتە دڵو دەروونەوە، زوتر لەدڵا جێگای بێتەوە، لەم بەڵگەیەی هەواڵی چیرۆکی ئەم کۆمەڵە لاوە بەسوود تربێ بۆ پەیامەکەم، چونکە عیلمو زانستی خودا رەهاو موطلەقە چەندێك خێرو فەڕی خۆی بڕژێنێ بەسەرەدا هێشتا چاکترو زورتری لا هەیە. بێگومان پەروەردگار وەکوو فەرمانی پێ کرد: کە داوای بەڵگەی رونو ئاشکراتر بکا، بۆیشی بەدی هێنا، ئەوەتا ئەو هەموو هەواڵو چیرۆکەی پێغەمبەرانی پێش خۆیو بەسەرهاتو

روداوی گەلە پێشینەکانی بەنیگا بۆ نارد کە رۆژگاریان لەهی (أصحاب الكهف) کۆنتربوو، هەروەها ئەو هەموو هەواڵە نهێنیانەی بۆ ئاشکرا کردو بەنیگا ئاگاداری کرد بەسەریاندا: کە هەندێکیان لەچەرخی خۆیداو ئەوانی تر دوا لەدونیا دەرچوونی یەك لەدوا یەك دێنە دیو تا رۆژی قیامەت بەرە بەرە دێنە جێ.

لەوانەش گرنگترو بەفەرتر ئەو شەریعەتو بەرنامەیەیە کە بەراستی بەرنامەی ژیانەو بۆ هەتا هەتایە گونجاوو لەبارە، بۆ هەموو گەلو چەرخو چینو توێژێك، بۆ هەموو وڵاتو ناوچەیەك دەگونجێو کورت ناهێنێ!! چارەسەری هەموو کێشەو گیروگرفتێکی تێدایە.

ئەمجار ماوەی نووستنەکەیان لەئەشکەوتەکەدا دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعاً﴾ ئەو کۆمەڵە لاوە لەئەشکەوتەکەیاندا سێ سەد ساڵ مانەوە بەحیسابی خاوەن نامەکان کە حیسابی خۆریی دەکەن ئەوانەی دەربارەی (أصحاب الكهف) پرسیاریان لێ کردی، نۆ ساڵیش زیاد بەحیسابی قورەیشییەکان، کە حیسابی مانگی دەکەن. واتە: ئەندازەی سێ سەد ساڵی شەمسی مانەوە کە دەکاتە سێ سەدو نۆ ساڵی مانگی.

بەراستی ئەمە موعجیزەیەکی رونو ئاشکرای پێغەمبەرە ﷺ ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە، نەحیسابی خوێندوە نەزانیاری هەندەسەو فەلەکی خوێندوە، چۆنی زانی هەموو سەد ساڵێکی خۆری سێ ساڵی مانگی زیاد دەکا، هەموو سیو سێ ساڵێکی خۆریی ساڵێکی مانگی زیاد دەکا، هەموو ساڵێکی خۆریی نزیکەی پانزە رۆژی لەساڵی مانگی زیاترە.

بێگومان خودای زاناو دانا بەنیگا ئاگاداری کردوە. زۆر شتی لەوە نهێنی ترو بەسوود تریشی فێر کردوە.

﴿قُلْ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا﴾ ئەگەر لێیان پرسی ئەندازەی مانەوەیان لەئەشکەوتەکەدا چەند بووە، تۆیش زانیاریت دەربارەی ماوەکە نەبوو، بڵێ: خودا شارەزاو ئاگادارە بەحاڵو وەزعیان، ماوەی مانەوەکەیانی بۆ رون کردییەوە، ئەوەی پێی راگەیاندی هەر ئەوە راستو حەقە، نەك ئەوەی ئەو خاوەن نامانە دەیڵێن. چونکە نهێنی زەویو ئاسمانەکان زانیارییەکە تایبەتە بەخۆیەوەو کەسی تر هیچی لێ نازانێ، مەگەر کەسانێك کە خودا بڕێك لەو نهێنی یانەی پێ بڵێ!

پەروەردگار بۆ خۆی داناو زانایە بەهەموو شتێك لەهەموو کەس باشتر ئەندازەی مانەوەی (أصحاب الكهف) دەزانێو ئەوا بۆ تۆشی رون کردۆتەوە.

فائیدەو نوکتەی دواخستنی ئەم رستەیە بۆ راگەیاندنی ئەوەیە: کە ئەو خاوەن نامانە دەربارەی ماوەی مانەوەی (أصحاب الكهف) لەئەشکەوتەکەدا راجیاییان هەیە وەکوو چۆن لەژمارەکەیاندا راجیاییو کێشەیان تێکەوتووە. جا لەوێ بۆ ژمارەکەیان کلکە (تەذییل)ێکی هێنا فەرموی: ﴿قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم﴾. لێرەشدا هەمان کلکەو تەذییلی هێناو فەرموی: ﴿قُلْ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا﴾.

بەکورتی دەفەرموێ: هەواڵی راستو دروست دەربارەی ژمارەی (أصحاب الكهف)و ئەندازەی مانەوەیان لەئەشکەوتەکەدا بەنووسراوی لای خودایە، چونکە هەر ئەو زاناو دانایە بەحەقیقەتی شتەکان. ئەوەی خەڵك دەیڵێن: رەملێ هاویشتنو شكو گومانە، قسەی بێ بەڵگەو دەلیلن.

﴿لَهُ غَيْبُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ﴾ ئای خودا چەند بینایەو چەند باش شتەکان دەزانێو چەند شنەوایە بەهەموو بیستراوێك هیچی لێ گوم نابێو هیچی لێ تێك ناچێ!

قەتادە دەفەرموێ: واتە: کەس بەئەندازەی خودا بیسەرو شنەوا نیە.

﴿مَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِـنْ وَلِـيٍّ﴾ نيـه بـۆ ئـادەميزاد بێجگه لـەخودا كەسێكی تـر بتوانێ كاروبارييان هەڵسوڕێنێ، بەراستی خودايەكی بێ هاوو وێنەو بێ نـەظيرو بـێ وەزيـره ﴿وَلا يُـشْرِكُ فِـي حُكْمِـهِ أَحَـدًا﴾ پـەروەردگار بڕيـارو بـەديهێنان بەدەست خۆيەتی، چی بڕياردا چۆنی بڕياردا هەڵوەشانەوەی نيەو كەس نيـه بتـوانێ دەست لەكاری خودا بدا. خودايەكی تاكو تەنهاو بێ وەزيرەو بێ راوێـژكارە تـاكو تـەنهای موطلەقە، حاكمی فەردو صەمەدە!

## ڕێنمويی كردنی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانان

﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ

مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ ﴾

دوای ئەوەی لەئایەتەکانی پێشوودا چیرۆکی ئەصحابولکەهفی گێڕایەوە کە لای زوربەی خەڵك نەزانراو بوو، کە ئەمە بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە قورئان نیگای پەروەردگارە، ئەمجار فەرمان بەپێغەمبەرو موسوڵمانان دەکا بەردەوام بن لەسەر خوێندنی قورئانو دانەبڕان لەو کۆڕو مەجلیسانەی قورئانی تێدا ڕاڤەدەکرێو دەخوێندرێتەوە. پاشان سزای کافرەکانو پاداشی خوداپەرستان دیاری دەکا.

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٢٨) ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ...الآيةَ﴾ سەلمانی فارسی دەفەرموێ: عویەینەی کوڕی حیصنو ئەقرەعی کوڕی حابیسو خزمەکانیان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ تازە موسوڵمانو دڵ دانەمەزراو بوون. وتیان: ئەی ڕەوانە کراوی خودا! ئەگەر تەشریفت لەسەروی مەجلیس دانیشی لەگەڵماندا و ئەم گەجەرو گوجەرانەت لەخۆت دوور خستایەوە (مەبەستیان سەلمانو ئەبو ذەرو موسوڵمانە هەژارەکان بوو) هەر یەکەیان جبەیەکی خوری لەبەردا بوو هیچی تریان نەبوو بیپۆشن، وتیان: ئەگەر تۆ ئەوانە لەخۆت دوور خەیەوە، ئێمە لەگەڵت

دادەنیشینو قسەو باست لەگەڵ دەکەینو ئایینت لێ فێر دەبین، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ كِتَابِ رَبِّكَ لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَلَنْ تَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَداً، وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ تا دەگاتە ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَاراً﴾ی نازڵ کرد. ئیتر پێغەمبەر ﷺ هەستا بۆ ئەوەی سەلمانو ئەبو زەرو موسوڵمانە هەژارەکانی دیو چاو پێ بکەوێ، تا لەلای پاشەوەی مزگەوت دۆزینیەوە خەریکی یادی خودا بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوپاس بۆ خودا کە نەیمراندم هەتا فەرمانی پێکردم کە بەصەبر بمو ژیان لەگەڵ چەند پیاوێکی ئۆمەتەکەم بەسەر بەرم، مردنو ژیانم لەگەڵ ئێوەیە.

لەریوایەتێکی تردا هاتووە، دەڵێ: عویەینەی کوڕی حیصن هێشتا ئیمانی نەهێنابوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا کۆمەڵێك لەموسوڵمانە هەژارەکان لەخزمەتی بوون، یەکێ لەوانە سەلمانی فارسی بوو کراسێکی فشو فۆڵی لەبەردا بوو، عارەقی تێدا کردبوو، چیلکە دارخورمایەکی بەدەستەوە بوو کراسەکەی پێ دەدڕیو پاشان دەیچنی یەوە. جا بەپێغەمبەریان گوت ئەرێ تۆ بەبۆگەنی ئەمانە نارەحەت نابێ؟؟ ئێمە پیاو ماقوڵی هۆزی موضەرینو شانو شکۆمەندیمان ئاشکراو نمایانە، ئەگەر ئێمە ئیمانت پێ بهێنین، هەموو کەس چاومان لێ دەکاو موسوڵمان دەبن، وەلێ ئێمە: کە ئیمانت پێ ناهێنین، لەبەر ئەمانە، ئەمانە دوور بخەرەوە تا ئێمە شوێنت بکەوین، یان کە هیچکە نەبێ مەجلیسێکی تایبەتیمان بۆ دیاری بکە، ئەوان کۆڕی خۆیان بەجیاو ئێمە مەجلیسی خۆمان بەجیا. ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ....الآية﴾ ئیبنو مەردەویهی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لەشانی ئومەیەی کوڕی خەلەفی جەمەحی نازڵ بووە، ئەوە بوو داوای لەپێغەمبەر ﷺ

كرد: كه موسوڵمانه هەژارەكان لەلای خۆی دەربكاو سەرانی قورەیش لەخۆی نزیك بكاتەوە ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ كِتَابِ رَبِّكَ لا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَلَنْ تَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَداً﴾ ئەی موحەممەد! ئەو قورئانەی بەنیگا بۆت نێردراوە بیخوێنەوە، پەیڕەوی فەرمانو نەهیەكانی بكە، دڵو گوێچكەتی بۆ بكەرەوەو تێی بگەو كاری پێ بكە، بێگومان هیچ كەس ناتوانێ وشەو كەلیماتی خودا ئاڵ گۆڕ بكا، هیچ كەس رایەی ناكەوێ، وادەو بەڵێنی خودا بۆ فەرمانبەرداران و هەڕەشەی لەیاخی بوان بگۆڕێ، جا ئەگەر تۆ ئەی موحەممەد! فەرمانبەرداری ئەم پەیامە نەبیو كاری پێ نەكەیو هەڕەشەی خودا گرتیتیەوەو تووشی دەردو مەینەتی بووی، ئیتر ئەو كاتە بێجگە لەخودا پەنایەكت دەست ناكەوێ هانای بۆ بەرێ، كەس نیە یارمەتیت بدا، چونكە دەسەڵاتو قودرەتی خودا هەموو بوونەوەری گرتۆتەوە، كەس ناتوانێ لەچنگ خودا را بكاو لەژێر دەسەڵاتی بچێتەوە دەرێ.

﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ بەصەبرو ئارام بەلەگەڵ هاوەڵانی هەژارتدا، خۆت رام بێنە لەسەر هەڵكردن لەگەڵ هەژارانی وەكوو عەمماری كوری یاسرو صوهەیبو بیلالو ئیبنو مەسعوودو هاو وێنەكانیان؛ لەوانەی ئێوارەو بەیانیو هەموو كاتو ساتێك سەرگەرمی خودا پەرستینو خەریكی ذیكرو یادی خودان! لەگەڵ ئەوان دانیشەو كۆڕو مەجلیس ببەستە! وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾الأنعام/٥٢ داواكاری قورەیشییە ملهوڕەكان دەق دەشوبهێتە قسەكەی گەلی نووح كە بەحەزرەتی نووحیان گوت: ﴿أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ﴾الشعراء/١١١.

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی پێشووی جەخت كردەوەو فەرمووی: ﴿وَلا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾ ئەی موحەممەد! چاو لەهاوەڵانت لامەدەو چاو مەبڕە لەكۆبونەوەو

مەجلیس گرتن لەگەڵ دەوڵەمەندە ملهوڕەكان، هەوڵو تەقەللای ئەوە مەدە: واز لەمان بێنیو ئەوان رازی بكەی! بەهیوای ئەوەی ئیمان بهێنن! جا كە ئەم ئایەتە نازڵ بوو (وەكوو لەپێشەوە باسمان كرد) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الحمد لله الذي جعل في أمتي من أمرت أن أصبر نفسي معه).

ئەمجار پەروەردگار ئەم نەهیە جەخت دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا﴾ وریابەو نەكەی ئیطاعەی ئەوانە بكەی: كە دڵیانمان غافڵ كردوە لەیادی خۆمان. نەكەی بەقسەی ئەوان، موسوڵمانە هەژارەكان تەرە بكەی! ئەوانە بەهۆی كردەوەی ناشیرینی خۆیانەوەو بەویستی خۆیان رێگای گومڕاییان گرتووەو سوورن لەسەر بەردەوام بوون لەسەری! بەهۆی دونیاوە ئاگایان لەئایینو خوداپەرستی نیە.

﴿وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾ زێدەڕەوی دەكەن لەكردەوەو هەڵسو كەوتیان، شوێن هەواو ئارەزۆی خۆیان كەوتوون، بەجوانیو رازاوەیی دونیا هەڵخەڵەتاون،ماڵو سامانو لەشساغیو قسە رۆیشتویی بۆغرای كردون!

ئەمجار دوای ئەوەی فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ كرد: كە بەگوێی ئەو دەوڵەمەندانە نەكا: كە دەڵێن: تۆ ئەگەر ئەو لاتو لەجەرانە لەخۆت دورخەیەوە ئێمە ئیمانت پێ دەهێنین، فەرمانێكی تری ئاراستە دەكات؛ پێی دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ ئەی موحەممەد! بەو خەڵكە بڵێ: ئەو پەیامەی من هێناومە لەخوداوە راستو حەقەو دروستە، شكو گومانی تێدا نیە، هەر ئەم ئایینە حەقەو پێویستە پەیڕەوی بكرێ، هەر ئەم ئایینە بەكەڵكی شوێن كەوتن دێ، جا كەسێك پێی خۆشە با ئیمان بێنێو بچێتە پێڕی موسوڵمانانەوە، بڕو بیانووی نامەعقوولو نەگونجاو نەگرێ، نەڵێ با موحەممەد ئەو هەژارانە لەخۆی دوور خاتەوە جا ئێمە ئیمانی پێ دەهێنین! كەسێكیش دەیەوێ بەكافری ژیان بەسەر بەرێو موسوڵمان نەبێ، با بەكافریو گومڕایی

بمێنێتەوە، ئەمن پێویستم بەئێوە نیە، کەسێك کردەوەی باش بکا سوودی بۆ خۆیەتی، کەسێکیش خراپەکاربێ زیانەکەی لەسەر خۆیەتی بۆخۆی زەرەر دەکا. پاشان ڕۆژی قیامەت خودا بەگوێرەی کردەوەکانتان سزاو پاداشتان دەداتەوە، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

ئەمەیە تەوجیهاتی قورئان دەرحەق بەچینی چەوساوەو هەژار، ئەمەیە تەرازوو تێڕوانینی بۆ هەڵسەنگاندنو بایەخ پێدان، دەبێ ئەوانەی ئیسلام تاوانبار دەکەن بەچەوسێنەرەوەو دەرەبەگایەتی، بەرامبەر ئەم جۆرە تەوجیهاتانە چی بڵێن؟! بێگومان شتێکی رونو ئاشکرایەو مێژوو شایەدە، دەقەکان بەئاشکرا هاوار دەکەن، بەشێوەی فیعلیو واقیعیو عەمەلی پێغەمبەرو هاوەڵانی پەیڕەوی ئەو دەقو تەوجیهاتانەیان کردووەو لەژیانی ڕۆژانەیاندا ڕەنگی داوەتەوە، شتێکی چەسپاوەو گومانی تێدا نیە: کە ئایینی ئیسلام ڕزگاریکەری ئادەمیزادە، ڕزگاریکەری چینی چەوساوەو هەژارە، یارمەتیدەری بێ نەواو توێژی ڕەنجبەرو زەحمەتکێشە، جا با زوڕنا ژەنان زوڕنای خۆیان بژەننو دەهۆڵی دڕاوی خۆیان بکوتن! پەتی درۆکورتەو چەواشەکاری تا سەر سەرناچێ، بەری خۆری ئیسلام بەبێژنگ ناگیرێو، بەحری ئیحسان بەدەمی سەگ گڵاو نابێ! ئەوە پەیڕەوو پرۆگرامو ئەوە یاساو شەریعەتو تەوجیهاتو ئامۆژگاری! ئەوەش شایەدی مێژوو کردەوەی فیعلی هەڵگرانی ئەم ئایینە!!

جا پاش ئەو سەرپشکی کردنەی بۆی دیاری کردن، هەڕەشەی خۆی ئاڕاستەی ئەوانە دەکا: کە لایەنی کوفرو بێدینی هەڵدەبژێرنو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَاراً أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ بێگومان ئێمە بۆ ئەوانەی ستەم لەخۆیان دەکەنو ڕوو لەئایینی حەق وەردەگێڕنو بڕوا بەپەیامی پێغەمبەری خودا ناکەن، ئاگرێکمان بۆ ئامادە کردون؛ کە بڵێسەکەی لەهەموو لایەکەوە دەوریان دەگرێو

رزگاربوونیـان لێـی نـابێ‌و چـی هـەوڵ‌و تەقـەڵلا بـدەن بـۆ خـۆ رزگـار کـردن لێـی، بێهودەیە.

﴿وَإِنْ یَسْتَغِیثُوا یُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ یَشْوِي الْوُجُوهَ﴾ ئەگـەر ئـەو کـافرە سـتەمکارانە لـەناو ئـاگردا داوای یارمـەتی‌و بەهاناچـوونەوە بکـەن داوای ئـاوی خواردنەوە بکەن بۆ شکاندنی تینوایەتییان وەکوو لەسورەتی (الأعـراف)دا لەسـەر زمانی ئەو ستەمکارانە دەفەرموێ: ﴿أَفِیضُواْ عَلَیْنَا مِنَ الْمَاء أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ﴾ کەمێك لەئاوی خواردنـەوەمان بەسـەردا برێـژن، یـان لەهەنـدێك لـەو نیعمەتانـەی خودا پێی داون بەشمان بدەن! بـەئاوێکی خەسـتی وەکوو خڵتـەی زەیـت، یـان رەش وەکوو خڵتەی زەیـت بەهانایانـەوە دێـن، هـەر کـە ئـەو کافرانـە ویـستیان بخۆنـەوە، لەدەمی خۆیـانی نزیـك دەکەنـەوە، دەم‌و چاویان دەبرژێنـێ‌و پێـستی دەم‌و چاویان دادەوەشێ‌و دەکەوێتە خوارێ! ئەی دەبێ حاڵی قوڕگ‌و ورگ‌و ریخۆڵەیان چۆن بێ؟؟

﴿بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقاً﴾ ئـەم شـەرابەی دەدرێ پێیـان شـەرابێکی زۆر خـراپ‌و بـێ سـودە، تینوایـەتی ناشـکێنێ هـاڵاوو گـەرمایی ئاگرەکـە کـەم ناکاتـەوە، بەڵکوو تینوایـەتی‌و گەرماکـەیان زیـدە تـر دەکـاو پـتر نارەحـەتیان دەکـا، بەراسـتی دۆزەخ پەناگایـەکی خـراپ‌و شـوێن حەوانەوەیـەکی ناپەسـەندە، وەکـوو لەشـوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا سَاءتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً﴾الفرقـان/٦٦. خودایـە ئـەو شـوێنەمان بەنسیب نەکەی‌و لێی پارێزراوبین.!!

جا کە ئەوە حاڵی ئەوانە بێ کە کوفرو گومڕاییيان هەڵبـژاردوە، دیـارە دەبـێ حاڵی ئەوانەی ئیمانیان هەڵبژاردوە بەپێچەوانەوە بێ! بەڵی هـەر وایـە: ﴿إِنَّ الَّذِینَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لا نُضِیعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایـان بـەخودا کـردوە، پێغەمبـەریان بەراست زانیـوە، بـەپیر بانگەوازییەکەیـەوە چـون‌و بەگوێرەی پـەیامی پێغەمبەرەکـەیان هـەڵس‌و کـەوتیان کـردوە، پابەنـدی فـەرمان‌و

نەهییەکانی بوون، ئێمە کردەوەی باشی ئەوان بەفیڕۆ نادەین ﴿أُوْلَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ﴾ ئەوانە لەناو بەهەشتی رازاوەدا ژیانی هەتا هەتاییيان بەسەر دەبەن، بەراستی بەهەشت شوێنی حەوانەوەو ژیان تێدا بەسەر بردنە، بەژێر قەصرو باڵەخانەکانی دا جۆگای ئاوی جوان دەکشێن، دیمەنەکانی جوانو رازاوەو قەشەنگن، هەوای پاكو خاوێنو ئاوی شیرینو گوارایە، هەر ئەوێ شوێنی حەوانەوەو ژیان تێدابەسەر بردنە! شوێنی خۆشیو رابواردنە، ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ﴾ دەرازێندرێنەوە بەشتی جوانو رازاوە، کە بڕێك لەرازانەوەکەیان بەبازنەو خڵخاڵی ئاڵتون دەبێ. بوخاریو موسلیم لەئەبو هورەیرەوە فەرموودەیەکیان ریوایەت کردوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (تبلغ الحلية حيث يبلغ الوضوء)[1] لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤاً وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾الحج/٢٣.

﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَاباً خُضْراً مِنْ سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ لەبەریان دەکرێ پۆشاکی رەنگ سەوز لەئاوریشمی تەنكو ئەستوور، واتە: لەهەموو جۆرەکانی ئاوریشمو مەخمەریان لەبەر دەکرێ. ﴿مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الأَرَائِكِ﴾ لەسەر قەرەوێڵەو کورسی پاڵ دەدەنەوەو ئارام دەگرن. ﴿نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقاً﴾ بەراستی ئەو پاداشەی دەدرێتەوە بەخواپەرستان پاداشێکی زۆر باشو بەهرەمەندییە، شوێنی حەوانەوەو مانەوەیان شوێنێکی باشو خۆشو دڵخۆشکەرەیە!

جا با هەر کەسە لەدونیادا بەویستی خۆی سەرپشك بێ، ئەوی حەزی لێیەتی با موسوڵمان بێ، ئەوی حەزی لێ یە با کافر بێ، ئەوی حەزی لێ یە با هاونشینی کۆمەڵی هەژاران بکا، ئەوی نایەوێ با هاونشینيیان نەکا، ئەوانەی نایانەوێ هاورێیەتی ئەوانە بکەن: کە هەژارنو دڵ پڕ لەئیمانو بۆنی ئارەقو چڵکیان لێ

[1] أخرجه مسلم في الطهارة (٢٥٠) باب (١٣).

دێ با خۆیان هەلگرن بۆ کێم و زوخاوی دۆزەخ ئەوی لەدونیادا رازی نیە هاونشینی ئەو خوداپەرستە هەژارانە بکا، با بزانێ: کەسزای قیامەتی دۆزەخەو چاوەڕوانی ئەو ناکامە بێ!

## چیرۆکی خاوەنی دوو باخەکەو نمونەی دەوڵەمەندی لەخۆبایی بوو هەژاری بڕوا قائم و پتەو

﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَـٰبٍ وَحَفَفْنَـٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَـٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَـٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَـٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّـٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ

أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾

**دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئەم ئایەتانە ڕاجیایی هەیە:**

**هەنـدێك دەڵـێن: دەرحـەق بـەدوو بـرا لـەخێڵی بـەنی مـەخزوم نـازڵ بـووە، یەكێكیان كافرەو ناوی: (الأسود بن عبد الأسود بن عبد ياليل) بـووە، ئـەوی تریـان، موسـوڵمانەو نـاوی (أبـو سـلمة عبـد الله بـن الأسـود)ە. ئـەم كابرایـە مێـردی ئوممەسەلەمە بووە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مارەی بكا.**

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: ئـەم دوو كابرایـە دوو بـرا بـوون لەنەتـەوەی ئیسرائیل، یـەكیان كـافر بـووە نـاوی فـەطووسـە. ئـەویتریان موسـوڵمان بـووە نـاوی یـەهوذا یـان قـیطفیرە. لەباوكیانـەوە هەشـت هـەزار دیناریـان بـەمیرات بـۆ مایـەوە، بەیەكسانی لـەناو خۆیـاندا بەشـیان كـرد، كافرەكـەیان چـوار هـەزار دینارەكـەی دا بـەزەویو زارو خانووبـەرە، ئـەوی موسوڵمانیـشیان پـارەو پولەكـەی خـۆی لـەبواری خێرو چاكەدا خەرج كرد، ئاكامیان بەو شێوە گەییشت كە قورئان باسی لێوە دەكا.

موقاتیلیش هەر پێی وایە لەنەتەوەی ئیسرائیل بوون، ئەو دوو كابرایەن كـە لەسورەتی (الصافات) ئایەتی (٥١)دا باسكراون كە دەفەرموێ: ﴿قَالَ قَائِـلٌ مِّنْهُمْ إِنِّـي كَانَ لِي قَرِينٌ﴾.

پەیوەندی ئەم كۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم رووەوەیە:

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبـەر ﷺ كـرد كـە هاونـشینی كۆمـەڵی هەژاران بكاو لەكۆڕو مەجلیسدا لەگەڵیان دابنیشێو بەقسەی موشـریكەكان نـەكاو موسوڵمانە هەژارەكان لەكۆڕو مەجلیسی خۆی دەرنـەكا، ئـەمجار لێـرەدا ئـەوە روون دەكاتـەوە: كـە مـاڵو سـامان هـی ئـەوە نیـە ئـادەمیزاد فیـزی پێـوە لێ دا بەهۆیـەوە لەخۆی بایی ببێ، چونكە زۆر جار هەژار هەیە دەوڵەمەند دەبێو دەوڵەمەند هەیە هەژار دەبێ، مـاڵو سامان مێشە هـەر رۆژە بەیەكێكـەوە دەنیـشێ. ئـەوەی جێگـای شـانازیو خـۆ هەڵنانەوەیـە، خوداپەرسـتی یـەو ئیمـانو بـاوەڕە، دەی هـەژارە موسوڵمانەكان ئەم بەهرەیەیان دەستبەر كـردوە. دەفـەرموێ: ﴿وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً رَّجُلَيْنِ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! بەنموونـەو مـەثـەل حـاڵو وەزعو سـەرەنجامی دو كـابرا بێنـەرەوە بـۆ ئـەو موشـریكانەی پێـشنیاری ئـەوەیان بـۆ كـردی: كـە موسـوڵمانە هەژارەكان لەكۆڕو مەجلیسی خۆت وەدەرنێی. چونكە بۆخۆیان فیزنو خۆبـەزلزان بوون بێزیان نەدەهات لەگەڵ ئەو موسوڵمان هەژارانە كۆببنەوەو بەلایانەوە نەنگی بوو لەمەجلیسو كۆڕیكا دابنیشن ئـەوانی لێ بـن، جـا ئـەی موحەممـەد! بـۆ ئەوانـە

حاڵو وەزعی دوو کابرا بە نموونە بێنەرەوە: کە ﴿جَعَلْنَا لأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعاً﴾ ئێمە دوو باخمان لەداری ترێی جۆراو جۆر دابوو بەیەکێکیان، بەدار خورما چواردەورەی باخەکانمان بۆ پەرژین کردبوو، لەنێوان باخەکاندا کشتو کاڵی جۆراو جۆرمان بۆ فەراهەم هێنا بوو! ئەم باڵاو کشتو کاڵە وەکوو دیمەنی جوانیان پێك هێنا بوو چاو لەتەماشا کردنیان تێر نەدەبوو هەموو میوەو بەرو بومێکیشیان لێ فەراهەم دەهات. سەرچاوەی بژێوو میوە بوون، درەختەکان تێك چرژابوونو کشتوکاڵەکە جوان ڕسکابوو دیمەنێکی دڵڕفێنو رازاوەو قەشەنگیان پێك هێنا بوو چاو لەتەماشاکردنیان تێر نەدەبوو!!

وەکوو لەوەپێش باسمان کرد ئەم دوو کابرایە دوو برابوون لەنەتەوەی ئیسرائیل یەکیان کافرو ئەویتریان خوداناس بوو لەباوکییانەوە هەشت هەزار دیناریان بۆ مابووەوە لەناو خۆیاندا بەشیان کرد، کابرای کافر بەبەشی خۆی زەویو زارێکی زۆری کڕی، کابرای خوداناسیش بەشەکەی خۆی لەبواری خێرو چاکەدا صەرف کرد سەرەنجامیان بەم جۆرە بوو کە خودا بۆمان دەگێڕێتەوە.

جا چیرۆکەکە راست بێو واقیعی بێ، یان هەر نەبوو بێ چوون یەکە، چونکە پەندو مەثەل پێویستی بەوە نیە رووداوەکە راستە یان نا!

بێگومان پەروەردگار ئەم پەندو مەثەلەی هیناوەتەوە: بۆ رونکردنەوەی حاڵو وەزعی دوو تاقمو گروی موسوڵمانو کافر، لەم روەوە کافرەکان وێڕای ئەوەی لەنازو نیعمەتدا دەتلێنەوە، کەچی لەخودا یاخی دەبنو سوپاسی نیعمەتەکانی ناکەن، موسوڵمانان وێڕای ئەوەی تووشی نارەحەتیو تەنگو چەڵەمە دەبن خۆڕاگرو فەرمانبەرداری خودای خۆیانن ﴿كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِمْ مِنْهُ شَيْئاً﴾ ئەو دوو باخانە میوەو بەروبوومی خۆیان بەتەواوی وەبەر دەهێناو هیچساڵێك کەمییان نەدەهێنا، بەپێچەوانەی باخو درەختی میوە: کە ساڵێك

بەروبوومیان باشە ساڵەکەی دوایی کەم دەهێنن! ئەم دوو باخە هەموو ساڵێك بەرو بوومی خۆیان بەتێرو پڕی فەراهەم دەهێنا!

﴿وَفَجَّرْنَا خِلالَهُمَا نَهَراً﴾ لەنێوان دوو باخەکە چۆمێکی گەورەمان هەڵقوڵاندبوو، لەم چۆمەوە جۆگا ئاوی زۆر هەڵگیرابوون بۆ ئاوەدانی باخەکان، بۆ ئەوەی بەگوێرەی پێویست ئاو بدرێن و بەروبوومیان قرچۆك و کوێرو قرپۆك و پوچەڵ نەبێ و درەختەکانی هەمیشە لەگەشەو نەشەدا بن و جوانی ببەخشن و سەوز بنوێنن!

﴿وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ﴾ هەبوو بۆ خاوەنی باخەکان ماڵ و سامانی تر لەزێڕو زیوو پێداویستی ژیان و جۆرەها سەرچاوەی ماڵ و سامانی جیا جیا، لەهەموو بوارێکدا خاوەنی دەسەڵات و ماڵ و سامان و کارەکەرو ڕەنجبەرو خزمەتکاربوو، هەموو خۆشی و کامەرانی ژیانی دونیای بۆ فەراهەم هاتبوو، ئیتر کابرا لەخۆی بایی بوو، هەستی بەلەخۆبایی کردو وەکوو کەڵەشێر خۆی فش کردەوەو طاوس ئاسا کەوتە خۆبادان و بەخۆنازین و بەفیزەوە ڕوی کردە هاوەڵە هەژارە خوداپەرستەکەو ﴿فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنْكَ مَالاً وَأَعَزُّ نَفَراً﴾ بەهاوڕێکەی وت: (لەکاتێکدا خەریکی گفت و گۆ کردن بوو لەگەڵیداو دەیەویست موسوڵمانی بکا) وتی: من لەتۆ خاوەن سامانترم و خزمەتکارو ڕەنجبەرو کارەکەرو دەست و پێوەندم لەتۆ زۆر ترە، هەرچی بمەوێ بۆم بەیدەست دەبێ و لەهیچم کەم نیە، هەموو کەس لێم دەترسێ و شا بەسەپانی خۆم نازانم، لەخۆبایی بون و فیزەونی بەتەواوی سەر ڕێژی کرد بەوە: کە بەبێ عەقڵی خۆی گومانی وا بوو ئەو ماڵ و سامانە هەرگیز لەبن نایەو بڕانەوەو لەناوچوونی بەسەردا نایە، بەئەوپەڕی لەخۆبایی بون و سەرکەشی یەوە هەڵس و کەوتی دەکرد.

﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ﴾ لەگەڵ هاوەڵە هەژارە خوداناسەکەیدا چووە ناو بەشێکی باخەکەیەوەو بەناویدا گەڕاو پیاسەیەکی بەناو درەختەکانی دا

کـردو سـەیری جۆگـاو جۆبارەکـانی نـاو باخـەکانی کـردو دیمەنـەکانی پیـشانی هاوەڵەکـەی دەدا لـەکاتێکدا: کـە سـتەمی لـەخۆی دەکـرد بـەوە: کـە لـەجیاتی ئیمانهێنـان کافر بـوو لـەجیاتی سوپاسگوزاری پـەروەردگاری سپڵەو پێنـەزان بـوو، بەدڵنیایی‌و فیزێکەوە ﴿قَالَ مَا أَظُنُّ أَنْ تَبِيدَ هَذِهِ أَبَداً﴾ وتی: من پـێم وا نیـە رۆژێـك بێ ئەم باخ‌و باخاتە بفەوتێ‌و وێران ببێ، من هەرگیز هەژاری‌و بـێ دەسـەڵاتی روم تێ ناکاو نەبوونی بەخۆمەوە نابینم!

﴿وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً﴾ هەرگیز من پێم وا نیە دونیا خـراپ ببـێ‌و قیامـەت رابێ، قەت شتی وا نابێ‌و عـەقڵ نـایگرێ، مـن بـڕوام بـەهاتنی قیامـەت نیـەو بیرو بۆچوونی ئێوەم بەلاوە هەڵەیەو تێی نەگەییشتوون! ﴿وَلَئِنْ رُدِدْتُ إِلَى رَبِّي لأَجِدَنَّ خَيْراً مِنْهَا مُنقَلَباً﴾ خۆ ئەگـەر لەفەرزێکدا هاتنی قیامـەت راست بـێ‌و وەکوو ئێوە دەڵێن وا دەرچـێ، ئـەوە مـن لـەوێشدا بەختـەوەر دەبم‌و لـەئێرەم خۆشـتر دەسـت دەکەوێ، چونکە من لای خودا رێـزدارم‌و نـازو قـەدرم هەیـە. ئەگـەر مـن لای خـودا رێزدار نەبوومایە لەدونیادا ئەم نازو سامانەی نـەدەدامێ! وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَى رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَى﴾فصلت/٥٠، مادام لـەدونیادا بەختـەوەرەو خـاوەن بـاخ‌و باخـات‌و مـاڵ‌و سـامانە دەبـێ جـەنابی لەقیامـەتیشدا بەختەوەر بێ!!؟

هاوەڵە موسوڵمانەکەی وەڵامی دایەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً﴾ هاوەڵـە خـودا ناسـەکەی لەحاڵـەتی گفـت‌و گـۆ لەگـەڵ کـردندا پێـی گـوت‌و ئامۆژگـاری کـردو سەرزەنشتی کرد وتی: ماڵوێران! تۆ بۆ واز لەو بیرو باوەڕە پوچەی خـۆت نـاهێنی‌و نایە سەر رێبازی هیدایەت‌و خوداپەرستی؟ ئەوە چۆن تۆ رێگە بەخۆت دەدەی بڕوا بەو خودایە نەکەی کە لەگڵ باوکی تۆی بەدیهێناوە؟ بنەمای ئێوە کـە بـاوە ئادەمـە لەگڵ دروستی کردوە، ئەمجار چین لەدوای چین ئادەمیزادی لێ کەوتوونەوە!

هەروەها خۆراکی ئێوەو ئاژەڵو گیانلەبەرانی بەگشتی لە دانەوێڵە پەیدا دەبێ، بژێوی درەختو روەکیش لەگڵو ئاو دەستەبەر دەبێ!

ئەمجار ئەم خۆراکە دەبێتە خوێنو بەشێکی دەبێتە تۆماوو منداڵی لێ بەدی دەهێنرێ، ئەمجار وردە وردە گەشەت پێ دەکا پێت دەگەیەنێ تا دەتکاتە پیاوێکی رێکو پێکو ئەندام تەواوو بێ عەیب. ئەم شێوە جوانەت پێ دەبەخشێ! دەی ئێوە چۆن ئینکاری هەبوونی خودایەك دەکەن کە بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئێوەیە؟ نیشانەکانی دروستبوونی ئێوە بەڵگەی هەبوونی ئەوە، هەر کەسێك بەوردی لەخۆیو ئادەمیزادانی تر ورد بێتەوە بەئاسانی خودای خۆی دەناسێو بڕوا بەهەبوونو بەدەسەڵاتو زانایی‌و دانایی ئەو زاتە دەکا.

تیبینی ئەوە دەکرێ: پیاوە لەخۆبایی بووەکە بڕوای بەخودا هەبوە وەکوو لەقسەکەی دەردەکەوێ: کە دەڵێ: ﴿وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي﴾ کەچی باوەڕەکەی بەکوفرو بێ باوەڕی دادەنرێ: لەم رووەوە: کە باوەڕی بەزیندووبوونەوەو هاتنی قیامەت نیە! چونکە باوەڕ نەبوون بەزیندوبونەوە باوەڕ نەبوونە بەدەسەڵاتو توانای خودا، ئەوەیش دەبێتە باوەڕ نەکردن بەخودا، هەروەها باوەڕ نەکردن بەهەر بەندێك لەبەندەکانی ئایین نیشانەی باوەڕ نەکردنە بەخودا!

﴿لَكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَداً﴾ بەڵام من بیرو باوەڕی تۆم نیە، بەڵکوو دان دەنێم بەتاكو تەنهایی خوداو بەتوانایی‌و دانایی‌و زانایی زاتی پاکی، کەس ناکەم بەشەریكو هاوەڵی، هەر (الله) خودای منەو بەخێوکەرو سەرپەرشتیاری منە. بێ هاوشانو بێ وێنەیە.

ئەمجار پەرە بەئامۆژگاری هاوەڵە کافرەکەی دەداو دەڵێ: ﴿وَلَوْلا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ ؟﴾ ئەوە بۆچی کاتێك چویە ناو باغەکەتەوەو لەدیمەنەکانت روانی سوپاسی خودات نەکرد؟ با ئەو کاتەی چویتە ناو باغەکەتەوە

بتگووتایە هەر شتێ خودا مەیلی لێ بێ هەر ئەوە دەبێو ئیش ئەوەیە خودا بیکا، هیچ هێزو توانایەك نیە جگە لەهێزو توانای خودا ... واتە: ئیعترافت بەوە بکردایە: کە هەرچی هەتە لەماڵو سامانو باخو کشتو کاڵی جوانو درەختی تێکچڕژاوو کانیاوو جۆگاو جۆبار، هەمووی لەخوداوەیەو ئەو پێی بەخشیویو سوپاست بکردایە؟!

هەندێ لەعولەمای سەلەف فەرموویانە هەر کەسێك شتێکی سەرنج ڕاکێشی لەخۆیو ماڵو منداڵی بینی با یەکسەر بڵێ (ما شاء الله لاقوة الا بالله).

فەرموودەیەکی مەرفووع هەیە ئەبو یەعلا لەئەنەسەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر ئادەمیزادێك خودا نیعمەتێکی پێدا لەماڵو سامانو بڵێ: (ما شاء الله لاقوة الا بالله) مردن نەبێ تووشی ئافەتی تر نابێ.

لەصەحیحی موسلیمدا لەئەبو موساوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: (الا ادلك على كنز من كنوز الجنة؟ لا حول ولا قوة الا بالله).

ئەمجار هاوەڵە موسوڵمانەکە دەربارەی شانازی کردنی کابرای کافر بەماڵو منداڵو خزمەتکارو دەستو پێوەندەکانی دەڵێ: ﴿إِنْ تُرَنِي أَنَا أَقَلَّ مِنْكَ مَالاً وَوَلَداً فَعَسَى رَبِّي أَنْ يُؤْتِيَنِي خَيْراً مِنْ جَنَّتِكَ﴾ ئەگەر تۆ دەڕوانییە منو پێت وایە، وەکوو تۆ ماڵو سامانم نیە، منداڵو نۆکەرو خزمەتچیو دەستو پێوەندم لەتۆ کەمترە، لەم دونیا بێ بایەخەدا، ئەوە من چاوەڕوانم لەقیامەتدا وەزعو حاڵ بگۆڕێو هیوادارم لەقیامەتدا خودا باخو باخاتی زۆر باشتر لەو باخانەی تۆم پێ ببەخشێ، لەهەمان کاتدا چاوەڕوانی ئەوەشم کە ﴿وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَاناً مِنَ السَّمَاءِ فَتُصْبِحَ صَعِيداً زَلَقاً﴾ پەروەردگار بەڵایەکی ئاسمانی بنێرێ بۆ سەر باخەکانت -(کەپێت وایە فەوتانیان بەسەردا نایە) تارومایان بکاو ئاداریان بەسەر پاداریانەوە نەمێنێ. وەکوو بارانێکی بەلێزمە بنێرێو لافاو هەڵستێو درەختو کشتو کاڵەکانیان لەبێخ دەربێنێ! یان

هەورە بروسکەی لێ بداو ئاگری تێ بەربێ، زەویەکی رەش‌و روتت بۆ بمێنێتەوە، کوردی گوتەنی (گوێ درێژ لێی بکەوی ددانی بشکێ!).

﴿أَوْ يُصْبِحَ مَاؤُهَا غَوْراً فَلَنْ تَسْتَطِيعَ لَهُ طَلَباً﴾ یان ئاوی باخەکانت رۆبچێ‌و نەتوانی بەدی بێنیەوەو بیخەیەوە سەر زەوی‌و بەتەواوی لێی دیدار ئاخیرەت بێ!

بێگومان ئەوەی کابرای موسوڵمان چاوەڕانی بوو هاتە دی، باخی کابرا لەحاڵەتی گەشەو نەش‌و نمادا کەوتە حاڵەتی وێرانی‌و بەربادبوون ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَى مَا أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَداً﴾ بەڵایەکی سامناك لەباخ‌و ماڵ‌و سامانی دا، هەرچی هیواو ئاواتی بەخەیاڵ لەسەر بەروبوومی باخەکانی هەڵبەست بوو بوونە بڵقی سەر ئاوو باخ‌و کشت‌و کاڵ‌و کانیاوو جۆو جۆباری تێك‌و پێك چوو، ئاداری بەسەر پاداریەوە نەما! ماڵ‌و حاڵی وێران بوو! هیچی بەدەستەوە نەما، پەشیمان‌و خەمبارو دڵتەنگ بوو لەسەر لەکیس چوونی ماڵ‌و سامان‌و ئەو هەموو ئەو خەرجی‌و مەسرەفەی لەپێکهێنانیاندا ئەنجامی دا بوو، ﴿فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَى مَا أَنفَقَ﴾ وای لێ هات هەردوو لەپی دەستی ئەم دیوو ئەو دیو پێ دەکرد، وەکوو چۆن ئەو کەسانەی تووشی زیانی سەخت‌و خەساری گەورە دەبن لەپێ دەستیان ئەم دیوو ئەو دیو دەکەن! واتە: داخ‌و کەسەرو پەشیمانی دایگرت لەسەر ئەو هەموو پارەو پوولەی خەرجی کردبوو لەبەرهەم هێنان‌و بەخێوکردنی باخەکانی دا، ﴿وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا﴾ وەلحاڵ دارمێوەکانی بەسەر کەپرەکانی کەوتبوون‌و ئەو هەموو میوەو ترێ‌و دارە بەردارانە بەمەل یەکدا رۆیشتبوون‌و هەمووی بەسەر یەکدا ترشابوون، ئەو باغەی کە کاتی خۆی دەیگوت هەرگیز ئەم باخە نافەوتێ‌و وێران نابێ! تێی دەڕوانی درەختەکانی لەبێخ دەرهێنراون دار مێوەکانی بەسەر کەپرەکانیان دارمباون‌و بەخەیاڵیش ئاوەدان ناکرێتەوە ئاواتەخوازی ئەوە بوو کاتی خۆی بەگوێی ئامۆژگاری هاوەڵەکەی بکردایەو ﴿وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَداً﴾ پڕ

بەدەم هاوارى دەكردو دەيگوت خۆزگا من هاوەڵم بۆ خودا دانەنايەو كەسم نەكردايە بەشەريكى پەروەردگارم!

خۆزگا من هەر خودام بپەرستايەو رێبازى ئايينى ئەوم پەيڕەو بكردايە.

ديمەنەكە سەرنج راكێشو تێرو تەسەلە: ميوەو بەروبووم لەهەموو لايەكەوە تێك ترشاوە، كەپرو درەختەكان بەسەريەكدا روخاون، خاوەنەكە بەهەر دوو چەپۆكانى بەخۆى دەكێشێو خەمو خەفەتى ماڵو سامانى لەكيس چووى دەچێژێو بۆ رەنج بەخەسارى خۆى ئاخو ئۆفيەتى، پەشيمانە: كە هاوەڵى بۆ خودا داناوە، ئێستا دان بەخودايەتى پەروەردگاردا دەنێ، ئێستا بەبرينى خۆى زانيوە. بەڵام تازە چ سوود؟؟

﴿وَلَمْ تَكُنْ لَهُ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِراً﴾ هيچ تاقمو گرۆهێك نەبوو جگە لەخودا يارمەتى بدەن، كوڕو خزمەتكارو هۆزو دەستو پێوەند بەفرياى نەكەوتن، وەكوو بەتەمابوو وا دەرنەچوو، كەس بەهانايەوە نەهات، كەس نەبوو نەهێڵێ باخەكانى وێران ببن! بۆخۆشى دەسەڵاتى ئەوەى نەبوو تۆڵەى خودا بگێڕێتەوەو بەرگرى لەخۆى بكات.

﴿هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ﴾ لەئەو كاتو شوێنانەدا هەر خودا دەتوانێ بەهاناى ئادەميزادەوە بێ، هەر (الله) دەتوانێ يارمەتى بداو ناخۆشى لابەرێو خۆشى بێنێ! هيچ كەسێكى تر داراى ئەوە نيە، ئاشكراشە خودا يارمەتى ئەوانە دەدا: كە ئيمانيان پێى هەيە پەرستشى بۆ ئەنجام دەدەن! ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَاباً وَخَيْرٌ عُقْباً﴾ هەڵبەتە خودا لەهەموو كەس باشترە لەبابەت پاداشدانەوەى خۆشەويستانى خۆى، لەهەموو كەس باشترە بۆ پاداش دانەوەى دوارۆژو بەمرازگەياندنى دۆستانى خۆى، تەعويضى لەكيس چوونى ماڵى دونيايان دەداتەوە. پاداشى خودا بۆ ئەو كەسانەى پابەندى فەرمانو نەهيەكانى دەبن لەپاداشى هەموو كەس باشترو بەسوود ترە،

چونکە خودا پاداشی بۆ ئیمانداران لەهەموو کەس باشترە. پاشە رۆژی باش دەدا بەوانەی ئیمانیان پێیەتیو هیواو رەجایان لێیەتی...

## نموونەی ژیانی دونیا

﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ ﴾

قورئانی پیرۆز پەردەی بەسەر دیمەنی پێشوودا دادایەوە، باخەکان تێک روخانو خاوەنەکەیان هەردو لەپی دەستی ئەم دیوو ئەو دیو دەکا. خەمبارو رەنج بەخەسارە.

دوا بەدوای ئەو دیمەنە نموونەیەکی تر بۆ ژیانی دونیا دەهێنێتەوە، حاڵی ژیانی دونیاو هیچ و پوچیو سەرەنجامی هەموو جوانیو رازاوەیەکی رون دەکاتەوە! ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەم ژیانە شتێکی بێ بایەخەو دانەمەزراوو کەمخایەنە، هەمووی گرۆکفێکە دێو دەڕوا، شایانی ئەوە نیە پشتی پێ ببەسترێو دڵی پێ خۆش بکرێ، هەر کەسێ پشتی پێ ببەستێ هەڵخەڵەتاوەو وەکوو خاوەنی ئەم باخانەی باسکرا رەنج بەخەسارەو دوا رۆژی رەشەو بەخیلی پێ نابرێ.

ئـەمجار، كـە ئـەوەى راگەيانـد: كـە دونيـا گرۆكفێكـەو سێبەرى بـەقاى نيـە، ئەوەش رون دەكاتەوە: كە ماڵو كورو كچ هۆكارى رازاندنەوەى ژيانى جيهانن، هەر شتێكيش هۆكارى رازاندنـەوەى جيهـان بـن زوو بەسـەر دەچـنو نـامێنن، كـەوابێ ئادەميزادى عاقڵو ژير شانازى بـەماڵو كـورو كـچ ناكـاو پێيـان كـەيفخۆش نـابێو بـەهۆى ئـەو شـتانەوە خۆيـان بەسـەر هـەژاراندا هەڵنانێنـەوە. ئـەمجار باسـى ئـەوە دەكـا: كـە ئيمـانو كـردەوە باشـەكانى موسـوڵمانە هـەژارەكان پاسـاوى زۆرى هەيـە بەسەر ئەو شتانەدا: كە كافرەكان پێى دڵخۆشن!

دەفەرموێ: ﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنْ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيماً تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ﴾ ئـەى موحەممـەد! بەنموونـەو مـەثـەل پەندێكى تر بۆ موشريكەكانى قورەيشو خەڵكانى تريش لێ بدە، پەندو مەثەل بۆ ئەوانە بێنەرەوە: كە شانازى بەماڵو منداڵو عەشـيرەتو بنەماڵەى خۆيـان بەسـەر موسوڵمان هـەژارەكاندا دەكـەن، نموونەيـەكيان بـۆ بێنـەرەوە هـيچو پوچـى دونيـاو كەمخايەنىو زوو بەسەرچوونى روون بكاتەوە، پەنـدو مـەثـەل بەشتێك بێنـەرەوە وەكوو ژيانى دونيا جوانو شيرينو كەمخايەن بێ، ئەو نموونەو مـەثـەلـەش وەكـوو شێوەى بارانێك وەهايە لەبەرزايى يـەوە دەينێرينـە خـوارێ، پاش ماوەيـەك ئـەو هـەموو روەكو گژوگيايـەى زەوى پـێ دەروێو تێـك دەچـرژێ ديمـەنێكى جـوانو قەشەنگ پێك دەهێنن، ئەمجار زۆر بەخێرايى ئەو هەموو گياو گژو روەكە ناسكو جـوانو شـيرينو رازاوانـە دەبنــە پـوشو پـەلاشو وشـك هەڵدەگـەرێن، دەبنــە قانگەلاشكو پلو پوشو با بلاويان دەكاتەوە.

بێگومـان ژيـانى دونيـا لەشـيرينىو جـوانى دا پاشـان لـەخێرا بەسەرچـونو تێپەربوونى دا دەق دەشوبهێتە حاڵو وەزعى ئەو گياو گژو روەكە جوانو ناسكو دڵگيرانە: كە بەهۆى بارينى بارانو تێكەڵبوونى بەگڵو خۆڵى زەوى دەرسكێنو شين

دەبن‌و گەشە دەکەن‌و تێك دەچرژێن‌و پاشان بەگڕو گفێك خێرا دەبنە پوش‌و پەڵاش و باوو بۆران بەملاو بەولادا بڵاویان دەکاتەوە.

﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِراً﴾ پەروەردگار بەتواناو دەسەڵاتە بۆ بەدی هێنان‌و فەوتاندن، دەتوانێ هەموو حاڵێك بخولقێنێ، حاڵەتی سەوزی و گەشی بۆ گیاو گژو روەك. هەروا حاڵەتی وشك کردن‌و لەناوبردنی ئەو دیمەنە جوانە!

کەواتە کەسێك ژیر بێ نابێ بەروتێکردنی دونیا بۆی لەخۆی بایی ببێ، شانازی بکاو خۆی بەزل بزانێ!

لەچەند شوێنێکی تردا قورئانی پیرۆز ژیانی دونیا دەشوبهێنێ بەسەوزایی گیاو گژو دیمەنی جوان‌و رازاوەی سروشت لەکاتی شین بون‌و گەشەکردنی رواودا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالأَنْعَامُ﴾يونس/٢٤. يان دەفەرموێ: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ﴾الحديد/٢٠.

ئەمجار دەست نیشانی ئەو شتانە دەکا: کە پێویستە گرنگیان پێ نەدرێ‌و پشتیان پێ نەبەسترێ بەدوا ئەوەدا ئەو شتانەی گرنگن‌و پێویستە گرنگیان پێ بدرێ دەیانخاتە روو دەفەرموێ: ﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ماڵ‌و سامان‌و کوڕو نەوە زینەت‌و جوانی ژیانی دونیان‌و زینەت‌و شەوکەتی ژیانی قیامەت نین، ژیانی دونیا کەمخایەن‌و زوو بەسەرچووە، کەواتە مافی ئەوەیان نیە بکرێنە ئامانج‌و مەبەست‌و پشتیان پێ ببەسترێ بەغایەو ئاکام حسێب بکرێن! هەرچەندە ئایینی ئیسلام جڵەوگیری لەوە ناکات کە لەچوار چێوەی راست‌و رەوادا خۆش بویسترێن‌و گرنگیان پێ بدرێ، وەڵێ هەرشتێ بەردەوام نەبێ‌و زوو بەسەر بچێ‌و بەزوویی تێپەڕێ نابێ گرنگی پێ بدرێ‌و بکرێتە مەبەست‌و ئامانجی سەرەکی!

﴿وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَاباً وَخَيْرٌ أَمَلاً﴾ ئەو كردەوانەی باشنو پەسندنو پاداشتو بەرهەمیان دەمێنێتەوەو بۆ هەتا هەتایە سوودبەخشن ئەوانە لای خودا باشنو لەرۆژی دوایی دا پاداشتیان هەیە، ئەوانە شوێنی هیوانو خاوەنەكانیان سودیان لێ دەبینن، چونكە ئەوەی لەدونیادا چاوەڕوانییان لەم كردەوانەیان كردوە لەو دونیادا پاداشیان دەست دەكەوێو پێیان بەهرەمەند دەبن، بەلام ماڵو سامانو كوڕو نەوە بەو جۆرە نین، ئەگەر نەكرێنە هۆكارو ئامێری كردەوەی باشو زیاد لەنرخی خۆیان گرنگیان پێ بدرێ دەبنە مایەی پەشیمانی رۆژی دوایی. باری گرانی رۆژی قیامەتن.

دەربارەی مانای ﴿وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ﴾ چەند مانایەك لەفەرمودەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەست نیشان كراوە ئیمامی تیرمیذی ریوایەتێكی هێناوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لقيت ابراهيم ليلة أسرى بي، فقال يا محمد! أقرئ امتك مني السلام وأخبرهم أن الجنة طيبة التربة عذبة الماء وانها قيعان وان غراسها سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر) شەوی میعراج تووشی حەزرەتی ئیبراهیم بووم، وتی: ئەی موحەممەد! سەلامی من بەئوممەتەكەت بگەیەنەو پێیان بڵێ: بەهەشت خاكی پاكەو ئاوی شیرینو گەوارایە، چەند زەویو زارێكە نەمام نێژەكان (سبحان الله)و (الحمد لله)و (لا اله الا الله)و (الله أكبر)ن.

سەعیدی كوڕی مونصورو ئەحمەدو ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەویهیو حاكم لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەكەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الباقيات الصالحات) زۆر ئەنجام بدەن. گوترا ئەی رەوانەكراوی خودا! (الباقيات الصالحات) چین؟؟ فەرمووی: (التكبير والتهليل والتسبيح والتحميد ولاحول ولا قوة الا بالله)ن!

طـەبـەرانىو ئیبنـو مـەردەویەیى لەئـەبو دەرداوە ریوایـەت دەكـەن دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (سبحان الله والحمد لله ولا الـه الا الله والله أكبر ولاحول ولا قوة الا بالله هن الباقيات الصالحات، وهن يحططن الخطاياكما تحط الشجرة ورقها، وهن من كنوز الجنة).

## بەگەڕ خستنى كێوەكانو كۆكردنەوەى ئادەمیزادو رانواندنى نامەى كردەوەكانیان لەرۆژى قیامەتدا

﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾

دواى ئـەوەى پـەروەردگار هـیچو پوچـى ژیـانى دونیـاى رانوانـدو گرنگـىو شەرەفو بەردەوامى ژیانى قیامەتى رونكردەوە، ئەوەى راگەیاند: كـە شـانازیكردنو خۆ هەڵنانەوە بەماڵو سامانو منداڵ پەسـند نیـە، بـەڵكوو كـردەوەى بـاش شانازى

پێوە دەکرێ‌و دڵی پێ خۆش دەکرێ‌و جێگای هومێدە بۆ ژیانی قیامەت. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەحواڵی قیامەت‌و تەنگ‌و چەڵەمەو دیمەنەکانی رادەنوێنێ.

دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ﴾ ئەی پێغەمبەر! باسی ئەو رۆژە بۆ ئادەمیزاد بکە: کە ئێمە هەموو کێوو شاخ‌و تەپۆڵکەو بەرزایی درەختەکان لەشوێنی خۆیان هەڵدەکەنین‌و بەرزیان دەکەینەوە بۆ حەواو وەکوو هەور دەیانخەینە گەڕان‌و جونبوش‌و بەیەکیان دادەین‌و وردو هاڕیان دەکەین‌و دەیانکەینە تەپو تۆز! ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ دەبینی زەوی سارایەکی کاکی بەکاکییەو لەهەموو لاو گۆشەیەکیەوە دەبیندرێ‌و هیچ پەناپاسارو شیوو دۆڵ‌و چاڵ‌و چۆڵی تێدا نەماوە، هیچ چیاو کەژو دارو درەخت‌و قەصرو باڵەخانەی بەپێوە نەماوە، لەهەر لایەکیەوە بڕوانی هەمووی دیارەو شوێنێك نیە خەڵك خۆی تێدا حەشار بدەن، بەڵکوو هەموو ئادەمیزاد لەدەشتی مەحشەردا ریزیان بەستووەو لەبەردەم پەروەردگاری خۆیاندا راوەستاون‌و هیچ شتێ لەخودا پەنامەکی نیە، وەکوو لەئایەتێکی تردا لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿فَيَذَرُهَا قَاعاً صَفْصَفاً، لَا تَرَى فِيهَا عِوَجاً وَلَا أَمْتاً﴾طه/١٠٦-١٠٧.

﴿وَحَشَرْنَاهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَداً﴾ هەموو ئادەمیزاد بەزیندوویی کۆدەکەینەوە، هەر لەو کاتەوە ئادەمیزاد دروست بووە لەسەر روی زەوی تا ئەو کاتەی کۆتایی بەژیانی دونیا هاتووە، ئەو هەموو خەڵکە: کە هەر خودا ژمارەو ئەندازەیان دەزانێ، هەموویان زیندو دەکەینەوەو کێشی دەشتی مەحشەیان دەکەین‌و بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوە رایان دەگرین‌و کەسیان پاشگوێ ناخەین، گەورەو بچوکیان فەرامۆش ناکەین! واز لەهیچیان ناهێنین‌و کەسیان جێ ناهێڵین ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفّاً﴾ هەموویان بەرێز ئامادەو حازر دەکرێن‌و بەسەر خودای تۆدا رادەنوێندرێن‌و رادەگیرێن بۆ ئەوەی فەرمانیان دەربارە دەرکاو بڕیاری خۆی رابگەیەنێ! بەراستی دیمەنێکی سامناکەو هەتا لێ ی ورد ببێەوە زیاتر بەسام

دەبێ‌و پتر هەست دەهەژێنێ، تۆ بەخەیاڵ بیهێنە بەرچاوی خۆت، ئەو هەموو کێوو کەژانە لەبێخ هەڵکەندرێن‌و بەرز بکرێنەوە بۆ حەوا، ئەو هەموو قەبارە زەبەللاحانە بکەونە هاتووچۆو جونبوش‌و بەیەکابدەن‌و ببنە تۆزو خۆڵ، سەرزەوی هەموو ببێتە دەشتێکی کاکی بەکاکی‌و هیچی تێدا شارەوە نەبێ، جا کە ئەمە حاڵی کێوو چیاکان بێ، دەبێ دڵەکان چۆن بکەونە لەرزەو حاڵیان چۆن بێ، ئەگەر زەوی هیچ شیوو دۆڵ‌و پەناگاو پەناپاساری تێدا نەمێنێ، ئەدی دڵەکان چۆن دەتوانن نهێنی ناو خۆیان بەشێردراوەیی بێڵنەوە؟؟ دیارە چی لەناو دڵ‌و دەروونەدایە ئاشکرادەبێ‌و هیچ شتێك لەخودا نهێنی نیەو نابێ!

ئەم حەشرە گشتی یەی: کە کەس پاش نادرێ، کەس ناشاردرێتەوە هەموو لەدەشتێکی سافی بێ چاڵ‌و کەندولەندا بەرێزکراوی بەبێ دەسەڵاتی رادەنوێندرێن بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش دانەوە. بەراستی دیمەنەکە تا خەیاڵ بڕ بکاو پەرواز بێ ئەوەندەو سەد ئەوەندەو زیاتریش سەرەنج راکێشەو هەست بزوێنە. هەر دەڵێی دیمەنەکە لەبەرچاوەو رووداوەکانی زیندوو بینراوو بیستراون! ریسوایی‌و رووڕەشی بەسەر روخساری ئەوانەوە دیارە: کە ئینکاری ئەو رۆژەیان کردوە، بۆیە سیاقەکە لەشێوەی وەصف‌و هەواڵەوە دەگۆڕێ بەخیطابی رو بەڕوو بوونەوەو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ بێگومان ئەوا هاتنەوە بۆ لامان ئەی ئادەمیزادینە! هەمووتان بەزیندویی، یەکەمجار چۆنمان دروست کردبوون لەدونیادا ئاوا زیندومان کردنەوە، هاتنەوە بۆ لامان بەروت‌و قوتی بەسەری روت‌و پێ خواسی. بێ ماڵ‌و منداڵ‌و خێزان‌و کەس‌و کار، هاتنەوە بۆ لامان هیچ کامێ لەو شتانەتان پێ نیە: کە لەدونیادا پۆزتان پێوە لێدەداو شانازیتان پێوە دەکردن! کەشخەتان پێوە دەکردن بەسەر خەڵك‌و وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاء ظُهُورِكُمْ﴾الأنعام/٩٤.

ئەم وەرچەرخانە لەحاڵەتی وەصف کردنەوە بۆ حاڵەتی خیطاب دیمەنەکە دەکاتە دیمەنێکی زیندووی بەرچاو، هەر دەڵێی ئێستا حازرەو لەئارایەدایە، چونکە لەهەمبانەی غەیبدا رابوردوو حاڵو داهاتوو چون یەکن‌و زەمان چ رۆڵێکی نیە تێیدا.

تەنانەت ئێمە کە بەوردی ئایەتەکە بخوێنینەوە، دیمەنەکە هێندە زیندوە، خەریکە رورەشی‌و ریسوایی ئەو بێ بڕوایانە هەست پێ بکەین‌و، دەنگی سەرزەنشتکردن‌و لۆمەکردنی پەروەردگار بۆ ئەو بێ بڕوایانە ببیسین.. دەی ئەوا ئێوەمان سەر لەنوێ زیندو کردەوە، لەسەرتای ژیانی دونیاتان چۆنمان دروست کردبوون ئاوا هێنانمانەوە دی، سەر لەنوێ دروستمان کردنەوە، ئێوە پێتان وابوو ئەو زیندوکردنەوە نابێ، ﴿بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّنْ نَجْعَلَ لَكُمْ مَوْعِداً﴾ بەڵکوو ئێوە لەدونیادا پێتان وابوو: کە هەرگیز ئێمە کاتێك دیاری ناکەین‌و رۆژێك ناهێنینەکایەوە ئەو وادەو بەڵێنانەی پێمان داون، ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیەی لێمان کردبوون لەسەر زمانی پێغەمبەر بێنەدی!

بەڵێ پێتان وا نەبوو ئەم رۆژە ببینن‌و هاتنی رۆژی قیامەتتان بەلاوە ئەفسانە بوو، بەڵام وا بەچاوی خۆتان ئەم رۆژەتان بینی‌و ریسوایی‌و روڕەشی خۆتان لێ عەیانەو ناتوانن بیشارنەوە.

﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ﴾ دەفتەرو نامەی کردەوەکانتان بەسەردا دابەش دەکرێ‌و ئەوی خواپەرست‌و کردار باش بووە نامەی عەمەلی دەخرێتە دەستی راستییەوە، ئەوی بێدین‌و کافریش بوو بێ نامەکەی دەخرێتە دەستی چەپیەوە، چیبیان کردوە لەچاکەو خراپە لەکردەوەی گەورەو پچوك دێتەوە رێگایان‌و بەچاوی خۆیان ئاکامی کردارەکانیان دەبینن!

﴿فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ﴾ ئەتۆ دەبینی تاوانبارەکان دەترسن لەوەی نووسراوە لەنامەکانیانداو بەترس و لەرزەوە سەیری دەکەن و بەناچاری دەیخوێننەوە، ﴿وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا﴾ هاواریان لێ هەڵدەستێ و دەڵێن: ئەی هاوار بۆ خۆمان و ماڵوێران خۆمان ﴿مَالِ هَذَا الْكِتَابِ﴾ ئەوە چیە ئەم کتێبە!؟ ئەم دەفتەرو نامەی عەمەلە ﴿لا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا﴾ هیچ تاوانێکی گەورەو بچوکی پاشگوێ نەخستووە، هیچ کردارێکی دونیای ئێمەی نەبواردوە، هەموویانی تۆمار کردوە! هەرچی گوتوومانە، هەرچی کردوومانە تێیدا نووسراوەو شی کراوەتەوە.

﴿وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِراً﴾ هەرچی لەدونیادا کردویانە بەوردو درشتی یەوە لەنامەکەدا لەبەردەمیاندا ئامادەو حازرە، کەس ناتوانێ ئینکاریان لێ بکا، کەس ئەملاو ئەولای بۆ ناکرێ، ددان بەتاوانەکانیاندا دەنێن و سزای عادڵانەی کردەوەکانیان پڕاو پڕ وەردەگرنەوە ﴿وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً﴾ خودای تۆ ستەم لەکەس ناکا، هەموو کەس بەپێی کردەوەکانیان سزاو پاداشیان دەدرێتەوە! حوکم و بڕیاری پەروەردگار هیچ ستەمێکی تێدا نیە، چونکە مەبدەئی ثەواب و عیقاب شتێکە عەدالەتی پەروەردگار داخوازییەتی، بۆ ئەوەی چاکەکار چاکەی خۆی بدرێتەوەو خراپەکار سزای خراپەی خۆی لێ بسێندرێتەوە بەڵکوو خودای میهرەبان بەرەحمەت و لوطفی خۆی لەزۆر تاوان چاوپۆشی دەکاو خۆش دەبێ، لێخۆشبوون و رەحمەت زۆر لەسزادان و غەزەبی فراوانترە، جا بەگوێرەی توانا و دانایی و عەدالەتکاریی خۆی هەندێ لەبەندە تاوانبارەکانی بۆ ماوەیەك سزا دەداو پاشان رزگاریان دەکا. کافرەکان لەدۆزەخ دا بۆ هەتا هەتایە دەهێڵێتەوە، لەهەموو حاڵ و وەزعێکدا حوکم و بڕیارەکانی رەنگدانەوەی عەدالەتکارین! بێگومان پەروەردگار زوڵم و ستەم ناکا، هیچ شتێك بەناحەق لەسەر ئادەمیزاد تۆمار ناکا،

ئینسان شتێك نەكا لەسەری نانووسیٚ، هەروەها سزای تاوانبارانیش بەگوێرەی تاوانەكانیان دەداتەوە زێدە تۆڵەیان لیٚ ناستیٚنیٚ، بەبیٚ تاوان كەس سزا نادا.

وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا﴾النساء/٤٠، یان دەفەرمویٚ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾الأنبياء/٤٧.

## چیرۆكی كڕنووش بردن بۆ ئادەم عليه السلام

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴿٥١﴾ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾ ﴾

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە، لەم روەوەیە: کە لێکچونێك هەیە لەنێوان کردەوەو هەڵوێستی موشریکەکانو شانازی کردن بەماڵو سامانیان بەسەر موسوڵمانە هەژارەکانداو کردەوەو هەڵوێستی شەیتانی نەفرین لێکراو: کە شانازی بەسەر ئادەمدا کرد، ئەوە بوو: شەیتان شانازی کرد بەبنەچەو ئەصلی خۆی، وتی: چۆن کڕنووش بۆ ئادەم بەرم منت لەئاگر دروست کردوەو ئادەمت لەقوڕ دروست کردوە، ئەمن لەئەصلو بناغەدا لەئادەم رێزدارترم.

موشریکەکانیش دەیانگوت: چۆن دەبێ ئێمە لەگەڵ ئەو هەژارە بۆن ئارەقاویو جل شڕو روتو رەجاڵانەدا کۆببینەوە، ئێمە لەچینی پیاو ماقوڵانو ئەوان لەچینی نزمو هەژارانن، ئێمەی خاوەن ماڵو سامانو ئەوانی روتو هەژار چۆن لەکۆڕو مەجلیسدا کۆببینەوە.

جا بۆیە چیرۆکی کڕنوش نەبردنی شەیتانی لێرەدا هێنا، چونکە لێکچونێك هەیە لەنێوان کردەوەو هەڵوێستی کافرەکانو هی شەیتاندا. دوبارە کردنەوەی چیرۆکی شەیتان لەقورئاندا لەچەند شوێنێکدا بۆ مەبەست پێکانو سود گەیاندنە، لەهەر شوێنێکدا ئەم چیرۆکە دوبارە کرابێتەوە بۆ مەبەستێکی تایبەتیو مانایەکی تازەیە جوداوازە لەمەبەستەکانی تر.

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوە بۆ گەلەکەت باس بکەو بۆیان بگێڕەوە: کە ئێمە بەفریشتەکانمان گوت: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، هەموویان یەکسەر کەوتنە کڕنووش بردنو خێرا فەرمانەکەیان جێ بەجێ کرد، بێجگە لەشەیتان، ئەو کڕنووشی نەبرد.

لەوەپێش لەکاتی تەفسیر کردنی سورەتی (البقرة)دا ئایەتی (٢٤) ئاماژەمان بەوە کرد: کە فریشتە عالەمێکی نهێنینو ئێمە حەقیقەتیان نازانین، قورئانی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکا: کە فریشتەکان تاقم تاقمو گرۆ گرۆن. هەر کۆمەڵەو کارێکی تایبەتی خۆی هەیەو ئەرکێکی پێ سپێردراوە، هەندێکیان سەفیرو

راسپادەی پەروەردگارن، ئیلهامی حەق‌و خێر بەئادەمیزادان رادەگەیەنن. وەکوو لەچیرۆکی حەزرەتی مەریەم‌و چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم‌و باقی پێغەمبەرانی تردا. درودی خودایان لەسەر بێ بۆمان دەردەکەوێ.

فریشتەو شەیاتینی چەند گیانێکن پەیوەندییان بەگیانی ئادەمیزادەوە هەیە، بەجۆرێك: کە ئێمە حەقیقەتەکەی نازانین، بەڵکوو ئیمانمان پێی هەیەو چۆن لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە ئاوا باوەڕی پێ دەکەین‌و هیچی لێ زیاد ناکەین!

هەرمیەکێ لەئێمە کاتێك دەمانەوێ کارێك بکەین لایەنێکی حەق‌و خێری تێدا بێ، یان لایەنێکی بەتاڵ‌و شەڕ ئامێزی لێ چاوەڕوان بکرێ: دەبینین لەناخی دەروونماندا جۆرە نیزاعێك پەیدا دەبێ، هاجیسێك هەیە دەڵێ بیکە، هاجیسێکی تر هەیە دەڵێ: مەیکە. هەتا بەلایەکدا دەکەوێ‌و یەکیان بەسەر ئەوی تریاندا زاڵ دەبێ، ئا ئەم حاڵەتە: کە لەدەروونەدایە پێی دەڵێن: هێزو هۆش‌و بیر، خۆ ئەگەر بەو هاجیسەی داخوازی خێرەو فەرمان بەکردنی لایەنە خێرەکە دەکا، بڵێن فریشتەیە شتێکی گونجاوە، هەروەها ئەو هاجیسەی کە داخوازی لایەنە شەڕەکەیە دەتوانین بڵێن: شەیتانە!

بەکوردی دەتوانین بڵێین: هەر دەنە دەنەیەك کە لەدەروونەدایە بۆ ئەنجامدانی کاری خێر ئیلهامی فریشتەیە. هەر دەنە دەنەیەك بۆ کاری شەڕ بێ، وەسوەسەی شەیتانە.

شەیتان: کە سەرپێچی فەرمانی خودای کردو کڕنووشی ڕێزو تەقدیری بۆ ئادەم نەبرد، بەهۆی ئەوەوە بوو: کە ﴿كَانَ مِنْ الْجِنِّ﴾ ئەو لەتیرەی جندۆکە بوو نەك فریشتە. بەڵام لەنێو فریشتەدا ژیاوەو ڕەوشتی ئەوانی وەرگرتووە. ئەگینا بۆ خۆی لەرەگەزی جندۆکە بووە بەبەڵگەی ئەوەی: کە وتی: ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ص/٧٦.

هەروەها لەم ئایەتەدا پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە شەیتان وەچەو نەوەو زرۆیتی هەیە، دەی خۆ فریشتە زاووزێیان نیە، هەروەها فریشتە تەکەبوورو خۆبەزلزانییان نیە، بەلام شەیتان خۆی بەزل زانیو تەکەببوری کرد.

هەندێك لەزانایانی ئیسلام پێیان وایە: شەیتان لەپێری فریشتە بووە، چونکە: کە پەروەردگار فەرمانی کرنووش بردنی ئاراستەی فریشتەکان کرد شەیتانیشی گرتەوە. هەروەها پەروەردگار وەصفی فریشتەی بەوە کردووە: کە سەرپێچی فەرمانی خودا ناکەن، دەی ئەمە خۆی لەخۆیدا بەلگەیە لەسەر ئەوە کە سەرپێچی کردنیان لێ چاوەڕوان دەکرێ، ئەگەر وانەبێ وەصفیان بەوە نەدەکرا.

وەلێ ئەوەندە هەیە: فەرمانبەرداری لەفریشتەدا سروشتی یەو سەرپێچی کردن تێیاندا ئەرك و تەکەلوفە، بەپێچەوانەوە فەرمانبەرداری فەرمانی خودا لەئادەمیزادا ئەرك و تەکەللوفە شوێنکەوتنیان بۆ هەواو هەوەسی خۆیان سروشتی یە. زیاد لەوەش ئێمە هیچ بەلگەیەکی وامان بەدەستەوە نیە: کە جوداوازی بنەڕەتی لەنێوان فریشتەو جینیی دا بکەین. بەلکوو جوداوازی لەصیفاتدا هەیە نەك لەماهییەت و جەوهەردا، هەردوو رەگەزەکە (فریشتەو جینی) جۆرێکن لەعالەمی غەیب و ئێمە حەقیقەتەکەیان نازانین. ناشتوانین بەبێ هەبوونی دەقێکی بڕوا پێ کراو چییان دەرباره بلێین.

فەرموودەیەکی مەرفووع هەیە لەعائیشەوە ریوایەت کراوە ئیمامی موسلیم لەصەحیحی خۆیدا چەسپاندویەتی. فەرموودەکە دەفەرموێ: (خلقت الملائكة من نور، وخلق ابليس من مارج من نار، وخلق آدم مما وصف لكم). فریشتە لەنوورو روناکی دروستکراون، شەیتان لەبلێسەی ئاگر دروست کراوە، ئادەمیش دروست کراوە لەو شتەی بۆتان باس کرا.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: چاو تروكاندنێك شەیتان لەپێری فریشتە نەبوە، بەڵكوو ئەو كانو بنەمای جندۆكەیەو بەبابە گەورەیان دەژمێردرێ، وەكوو چۆن ئادەم بابە گەورەی ئادەمیزادە.

چونكە لەرەگەزی جندۆكە بوو ﴿فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾ لەفەرمانی خودای خۆی دەرچوو، فاسیقیو سەرپێچی كردنەكەی بەهۆی ئەوە بوو: كە لەتیرەی جینی بوو، جندۆكـەو شـەیاتینی سروشـتیان پـاخی بـونو سەرپێـچیكردنە، چـونكە جەوهەرەكەیان پیسو خراپە.

پیتی (ف) لە(ففسق)دا (فیٚ)ی سەبەبییەیە. ئەوە دەگەیەنێ كە بوونی شەیتان لەتیرەی جندۆكە هۆكاری فاسق بوونەكەیەتی، چونكە ئەگەر لەتیرەی فریشتە بوایە فەرمانی خودای نەدەشكاند كڕنووشی دەبرد، لەم رووەوە: كە فریشتە بێ تاوانو هەرگیز سەرپێچی فەرمانی خودا ناكەن، بەپێچەوانەی ئادەمیزادو جندۆكەوە.

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزادان دەترسێنێ لەوەی: كە شوێن شەیتانو نەوەكانی بكەون. دەفەرموێ: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ ؟﴾ ئەی ئادەمیزادینە! ئایا دوای ئەوەی كە زانیتان شەیتان چەند تاوانبارو خراپەكارە، خۆیو نەوەكانی دەكەنە دۆستو خۆشەویستی خۆتان؟ لەحاڵێكدا ئەوان دوژمنی سەرسەختی ئێوەن؟! واتە: نابێ ئێوە پاش ئەوەی بۆتان دەركەوت شەیتانو نەوەكانی چەند سروشت پیسو خراپەكارن، بیانكەنە گەورەو دۆستو خۆشەویستی خۆتان. بەم جۆرە پەروەردگار تەعەجوبی خۆی دەردەبڕێ لەو كەسانەی ئیطاعەی شەیتانو دارو دەستەكەی دەكەنو شوێنیان دەكەون لەكوفرو تاوانكاریدا، سەرزەنشتیان دەكا لەسەر ئەوە: كە شەیتانو دارودەستەكەی دەكەنە دۆستی خۆیانو پشت لەخودا هەڵدەكەنو ئەو سروشت پیسانە دەكەنە وەلیو پشت

پێ بەستراوی خۆیان. لەجیاتی ئەوەی شوێن فەرمانی خودا بکەون شوێن فەرمانی شەیتان دەکەون!!

﴿بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلاً﴾خراپ بەدەل و جێنیشنێکن کافرو ستەمکارەکان لەجیاتی خودا بۆ خۆیان داناوون، شتێکی خراپو قێزەونە کە ئەو ستەمکارانە لەباتی گوێڕایەڵی بۆ خودا، گوێڕایەڵی بۆ شەیتان و نەوەو شوێنکەوتووەکانی دەکەن! لەکاتێکا شەیتان و شوێنکەوتووەکانی شایانی ئەوە نین گوێڕایەڵیان بکرێ، ﴿مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ﴾ شەیتان و نەوەکانی کە ئێوەی ئادەمیزاد کردوتانن بەوەلی و سەرپەرشتیاری خۆتان، من حازری دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویم نەکردون، هەروەها هەندێکیانم لەخۆیان حازری دروستکردنی هەندێکی تریانم نەکردوە، ئاگاداری هیچ شتێك نین چ لەغەیب و چۆنیەتی دروستکردنی ئاسمان و زەوی و بەدیهێنانی خۆیان نازانن، یان ئامادەم نەکردون بۆ ئەوەی یارمەتیم بدەن! ئەوانیش بەندەیەکی دروستکراون وەکوو ئێوەو دەسەڵاتی هیچیان نیە، لەکاتی دروستکردنی ئاسمان و زەویشدا ئەوان نەبوون!

## بەکورتی:

کەسێك شیاوی گوێڕایەڵی کردن و پەرستنە: کە زانیارییەکی باڵای هەبێ، وەکوو خودا داناو زانا بێ، یان هاوبەشی کردبێ لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا، دەستی هەبووبێ لەبەدیهێنانی خەڵکدا، یارمەتی خودای دابێ!

دەی من ئەوانم ئاگادار نەکردوە بەسەر نهێنی تەکویندا، تایبەتمەندییەکی وام پێ نەبەخشیون شایانی ئەوەبن خەڵك شوێنیان بکەون، من بۆخۆم خودام و بەدیهێنەرم، کەس وەزیرو هاوبەشم نیە لەخودایەتی و بەدیهێناندا، لەبەڕێوەبردن و ئەنجامدانی کارەکانم دا ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُداً﴾ من

هـــەرگیز شـــەیتانو نـــەوەكانی كـــە گومڕاكـــەری ئـــادەمیزادن- نـــەم گێـــڕاون بەیارمەتیدەری خۆمو پشتم پێ نەبەستوون، ئاتاجیم پێیان نەبوەو نابێ...

كەواتە: ئەی پێغەمبەر! ئەی بیسەر! دروست نیەو ڕەوا نیە، كە تۆ پشت بەوانە ببەستیو بیانكەیە وەلیو سەرپەرشتیاری خۆت، ناگونجێ هەوڵ بدەی ئەوان یارمەتیت بدەن، چونكە ئەوان: كە نەگونجێن بیانكەمە كۆمەكیكار بۆ بەدیهێنانی ئاسمانـــەكانو زەویو مـــەخلووقاتی تـــر، چـــۆن ئێـــوە دەیانكەنـــە هاوبەشـــی مـــن لەپەرستشو عیبادەتدا؟؟

## تێبینی:

ئایا كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُداً﴾ مـەفهوومی موخـالیفی هەیـە: واتـە: دەگـونجێ خـودا ناگومڕاكـەران بكاتـە یارمەتیـدەری خـۆی؟! لـەوەلامدا دەڵێین: نەخەیر، مەفهوومی موخالیفی نیە، خودا پێویستی بەهیچ كـەسو بـەهیچ شتێ نیە، هەر چۆنێك بێ خودا شەیتانو دارو دەستەكانی ناكاتە یارمەتیـدەری خۆیو پێویستی بەكەس نیە!

وەلێ لێرەدا مەبەست لەكەدار كردنو لاقرتێ كردنە بـەكافرو شوێنكەوتوانی شەیتان، گاڵتەیان پێ دەكا: كە ئەوەندە نەفامن شتی وا ئاشكراو نمایان نازانن!

هـەروەها مەبەسـت لێكۆڵینـەوەو موجاراتكردنـە لەگـەڵ ئـەو تـاقمو گرۆهـە بتپەرستو شەیتانپەرستانەی: كە پێیـان وابـوو شـەیتان جـۆرە زانینێكی تایبـەتی هەیەو ئاگاداری هەندێ نهێنیو پەنامەكییەو هێزو توانایـەكی تایبـەتی هەیـە، جا لێرەدا قورئان موجاراتی موشـریكەكان دەكـاو بـەگوێرەی فامو تێگەیـشتنی خۆیـان لەگـەڵیان دەدوێو بەپەرچـییان دەداتـەوەو بۆڕیـان دەدا، واتـە: خـودا گومڕاكـەرو گـومڕاكراوانی نـاخۆش دەوێـنو قـاری لێیانـە خـۆ ئەگـەر لەفـەرزی مـەحاڵدا

کۆمەکیکارو یارمەتیدەر بۆخۆی بەرەوا بزانێ لەپێرو تاقمی گومراکەران داوای یارمەتی ناکا!!

ئەمجار دیمەنێکی تری قیامەت رادەنوێنێو سەرەنجامی موشریکەکانو تاوانباران روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا شُرَكَائِيَ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەو رۆژە بۆ موشریکەکان باس بکە: کە رۆژی حەشرو زیندوبوونەوەیە. ئەو رۆژەی پەروەردگار لەروی سەرزەنشتکردنو لێ توورە بوونەوە بەکافرەکان دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی لەدونیادا هاوەڵتان بۆ من دادەناو لەجیاتی من شتی ترتان دەپەرستن، دە بانگی ئەو شەریکانەم بکەن: کە پێتان وابوو هاوبەشی منن لەخودایەتی دا، هاواریان لێ بکەن، با فریاتان بکەونو لەو حاڵەی تێیدان رزگارتان بکەن. ئەوانیش لەبەر پەشۆکاوی‌و شڵەژاوی لەبیریان چۆتەوە: کە لەرۆژی قیامەتدان ﴿فَدَعَوْهُمْ﴾ هاوار دەکەنە خودادرۆزنەکانیانو بەهیوان فریایان بکەون، لەو حاڵەی تێیدان رزگارتان بکەن. ﴿فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ﴾ بەلاّم پەرستراوەکانیان وەلاّمیان نادەنەوە، چۆن وەلاّمیان بدەنەوە ئەوانیش بەشێکن لەو مەخلوقاتانەی: کە دەسەلاّتی هیچیان نیە نەبۆ خۆیان نەبۆ غەیری خۆیان!

﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ مَوْبِقاً﴾ ئێمە گێڕاومانە لەنێوان موشریکەکانو خودا درۆزنەکانیاندا، شوێنێك بۆ بەهیلاکچونو بەفتارەچون، ئەویش ئاگری دۆزەخە، یا شیوێکە لەدۆزەخ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (الموبق) بەمانا پەردەو ناوەندە.

ئیبنولئەعرابی دەڵێ: هەر شتێك کەوتە نێوان دوو شتەوە ئەوە (موبق)ە.

واتە: پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە هیچ رێگاچارەیەك نیە بۆ ئەو موشریکانەو چ فریاکەوتنو بەهانا هاتنێك نیە لەئەو خودا درۆزنانەوە کە پێیان

وابــوو خــودانو رۆژى قيامــەت بــەفريايان دەكــەونو شــەفاعەتيان بــۆ دەكــەن! پــەروەردگار لــەو رۆژەدا لــەنێوان ئــەو موشــريكانەو خوداكانيــان پــەردە دادەنــێ، بەڵكوو لەنێوانياندا شوێنى بەهيلاكچون كە دۆزەخە دەرەخسێنێ!

﴿وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّارَ فَظَنُّوا أَنَّهُمْ مُوَاقِعُوهَا﴾ جـا تاوانبـاران دۆزەخ دەبيـنـنو چاويان بەناگرى بـێ ئامـانى دەكـەوێ، دڵنيـا دەبـن لـەوەى: كـە دەچـنە نـاوى‌و تێـى دەكەونو ﴿وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفاً﴾ رێگايـەكيان دەسـت ناكـەوێ پێيـدا هـەڵێنو خۆيـان رزگـار بكـەن، پەنايـەكيان نـابێ خـۆى تێـدا حەشـار بـدەنو رزگاريـان بـێ! چونكە لەهەموو لايەكەوە ئاگر دەوريان دەداو دەراوى رونيان نامێنێ!

ئيبنو جەرير لەئەبو سەعيدەوە ريوايەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (موشريك‌و كـافر لـەدوورى چـوار سـەد ساڵە رێگـاوە ئـاگرى دۆزەخ دەبينـێ‌و دڵنيـا دەبێ: كە تێى دەكەوێ).

بێگومـان ئـەوان هـەليان بـۆ هەڵكـەوتبوو لـەكيس خۆيـاندا، ئەگـەر ئـەوان لـەژيانى دونيـادا دڵيـان بـۆ قورئـان بكردايـەوەو پابەنـدى فـەرمانو نەهيـەكانى بوونايە، بەربەرەكانى حەق‌و راستيان نەكردايە، تووشى ئەو رۆژە رەشە نەدەهاتن!

## شيكردنەوەى قورئانو ئەركى پێغەمبەرانو ستەمكارى ئەوانەى روو لەئيمانهێنان وەردەگێڕن، هۆى دوا كەوتنى سزاى سەرپێچيكەران بۆ كاتێكى ديارىكراو

﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن

يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّهُمۡ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمۡ
سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ قُبُلٗا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرۡسِلُ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا
﴿٥٦﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا وَنَسِيَ مَا
قَدَّمَتۡ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ
ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۖ وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا
﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ
لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ
مَوۡئِلٗا ﴿٥٨﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا
لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا ﴿٥٩﴾

**دوای ئەوەی پەروەردگار شوبهەو گومانی کافرەکانی باس کردن‌و بەبەڵگەی گورچکبڕ ڕەددی دانەوە، بەشوێن ئەوەدا باسی ئەوەی کرد: کە قورئان پڕە لەپەندو**

مەثەلی بتمانە پێکراوو هەر کەسێ بیر بکاتەوەو گوێی بۆ بگرێو دڵ بداتە پەندو ئامۆژگاریەکانی قورئان، ڕێگای ڕزگار بوونو بەمرازگەیشتن دەدۆزێتەوە، بەڵام دڵی ئەو کافرانە ڕەق بووەو دەروونیان ژەنگی هێناوە، بیر خستنەوەو ئامۆژگاری کاریان تێ ناکاو پەند ئامێز نابن. خۆ ئەگەر خودا بەکردەوەی خۆیانیان لەگەڵ بکا. زوو بەزوو سزای ڕیشەکێشەری بۆ دەناردنو تاقەواری لێ دەبڕین، بەڵام خودا لێخۆشبوو خاوەن بەزەیی یە، زوو بەهیلاکیان ناباو بۆ کاتێکی دیاریکراو دوای خستون، بۆ ئەوەی بیرێك لەخۆیان بکەنەوە، بەخۆیاندا بچنەوەو واز لەسەرپێچیو گومڕایی خۆیان بێنن.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ﴾ بێگومان ئێمە بۆ ئادەمیزادمان ڕون کردۆتەوە، لەم قورئانەدا هەموو پەندو مەثەلێك، هەرچی پێویستیاتی دینو دونیایانە بۆمان شی کردونەوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی حەقو هیدایەت بزانن و لەجادەی حەق لانەدەن، واز لەبتپەرستیو هاوەڵ دانان بۆ خودا بهێنن، بەڵام ئەوان بەهۆی سەرڕەقیو گومڕایی خۆیانەوە، بەهۆی لەخۆبایی بوون خۆ بەزلزانییەوە پشتیان لەبانگەوازیی قورئان هەڵکردو قبووڵی ئەو پەیامە پیرۆزەیان نەکرد.

﴿وَكَانَ الإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً﴾ وێڕای ئەم ڕونکردنەوە تێرو تەسەلە ئادەمیزاد بەهۆی سروشتی خۆی لەهەموو زیندەوەرێك زیاتر ئامادەباشی تێدایە بۆ کێشەو جەدەلو بەرەنگاریکردنی حەقو ڕاستی، ئەوەتا بەرپەرچی پێغەمبەری ئیسلامیان دەدایەوە دەیانگوت: دەبێ پێغەمبەر فریشتە بێ، ئەم موحەممەدە: کە لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدا ئادەمیزادێکە وەکوو ئێمەو چی لەئێمە زیاتر نیە، وەکوو ئێمە خواردنو خۆراك دەخواو ئاوو شلەمەنی دەخواتەوەو بەناو شەقامو جادەدا دەڕوا!

**بەكورتی:**

ئادەمیزاد لەهەموو گیانلەبەرێكی تر زیاتر كێشەكارو بەجەدەلە، چونكە فرتو فێڵاویو خاوەن هەوەسو ئارەزۆیە، ئەگەر روبكاتە خێرو چاكەو حەزی لەكرداری باش بێ، وێ دەچێ بگاتە پلەو پایەی فریشتەو ببێتە بەندەیەكی راستاڵی خودا پەرستی سروشت پاكی فریشتە ئاسا!

هەر وەكوو چۆن ئەگەر روبكاتە خراپەكاریو تاوانكردن دەبێتە ئاژەڵێكی درندەی دووپێو كاری وای لێ دەوەشێتەوە هیچ ئاژەڵێكی درندە نایكا!!

جا هەرچەندە قورئان هیدایەتدەرو رونكەرەوەی رێگای حەقو راستی یە، كافرو موشریكەكان بەزۆری بەڵگەو دەلیلی ئاشكرا دەبینن‌و ئەو راستییەیان بۆ دەردەكەوێ، كەچی زیاتر سوور دەبن لەسەر بێدینیو یاخی بوون، ئەمەش دیاردەیەكە بەدرێژایی مێژوو درێژەی هەیەو رۆژ دوای رۆژ دووبارە دەبێتەوەو خۆی دەنوێنێ! دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمْ الْهُدَى وَيَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ إِلاَّ أَنْ تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمْ الْعَذَابُ قُبُلاً﴾ هیچ شتێك نیە جڵەوگیری لەو موشریكانە بكا لەوەی: كە ئیمان بەخودا بهێنن، ئەو كاتەی رێنمونیو هیدایەتیان بۆ هات، كە بریتی بوو لەپێغەمبەرو قورئانی پیرۆز، هیچ شتێك جڵەوگیری لێ نەكردون‌و لەوەی ئیمان بهێنن‌و داوای لێ بوردن بكەن جگە لەسەررەقیو سووربونیان لەسەر كوفر: كەوای لێكردن داوا لەپێغەمبەر بكەن یەكێ لەم دوو شتەیان بۆ برەخسێنێ:

١- سزای ریشەكێشیان بێتە سەرو دابو نەرێتی خودایان تێدا بەتاقی بكرێتەوەو لەناو ببرێن. وەكوو ئەو گەلەی بەپێغەمبەری خۆیان گوت: ﴿ائْتِنَا بِعَذَابِ اللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾العنكبوت/٢٩. هەر وەكوو چۆن قورەیشییەكان

وتیان: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾الأنفال/٣٢.

٢- یـان بەچـاوی خۆیـان عـەزابی سـەختی خـودا ببینـن، واتـە: ئەوانـە واز لەكوفرو بێدینی خۆیان ناهێنن، روو ناكەنە پەروەردگار؛ مەگەر لەكاتی نازڵبوونی عەزابی ریشەكێشكەرو بەهیلاكبەر یان سزای جۆراو جۆرو بەڵاو ناخۆشی یەك بەدوای یەكدا بێنە سەریان ئەو كاتە ئیمان دەهێنن.

یان داوای ئەوە دەكەن: كە سزای رۆژی قیامەتیان بۆ بیێو بەچاوی خۆیـان ببینـن! ئـیتر ئـەو كاتـە بـڕوا دەكـەنو خـودا دەناسـن.. واتـە: بـەهۆی سـەرڕەقیو گومڕایی خۆیانەوە هەرچەندە ڕێگای راستیان بۆ روون كرابێتەوەو ئەوانە بـڕوا ناكەنو ئیمان ناهێننو پەڵپو بیانوو دەگرنو داوای هاتنی یەكێ لەم دوو جۆرە عەزابە دەكەن. ئاشكراشە هاتنی عەزاب بەدەست خودایەو لەدەسەڵاتی پێغەمبەردا نیە، ئـەركی سەرشانی پێغەمبـەران بریتییـە لەترسـاندنو مـوژدەدان، ترسـاندنی ئادەمیزادان لەسزای دۆزەخو مـژدەدان بەوانـەی خوداپەرستی دەكـەن بەبەهەشتی رازاوەو جوانو بەرین. بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان كە ناردووە بۆیەمان ناردوون موژدەی بەهەشت بدەن بەخوداپەرسـتانو سەرپێـچیكاران لەسـزای دۆزەخ بترسـێنن، پـەروەردگار پێغەمبـەرانی نـاردوون بـۆ ئـەوەی مـوژدەی بەهەشـت بـدەن بەوانـەی بـەهیر بانگەوازییەكەیانەوە دێن. بۆ ئەوەی نەناردوون سەر رەقو موشریكەكان پێشنیاری ئەم موعجیزەو ئەو موعجیزەیەیان بۆ بكەن، پەڵپو بیانووی جۆراو جۆریان لێ بگرن!

جـا هەرچـەندە ئـەوە واقیعـی حاڵـە كەچـی ئـەو كافرانـە جـەدەلو كێشەی بێهـودە ئـەنجام دەدەن، هـەردەم خـەریكی جـەدەلن بـۆ پوچـاندنەوەی حـەق كوژاندنەوەی نووری خوداو ئایینی حەق، وەكوو پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ:

﴿وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ﴾ ئەو كافرانە بەشێوەیەكی بەتاڵو ناحەق كێشەو جیدال ئەنجام دەدەن، مەبەستیان ئەوە نیە بگەنە حەقیقەتو راستییان بۆ دەربكەوێ دەیانەوێ ئەو حەقو راستییەی پێغەمبەران هێناویانە پوچی بكەنەوە، لەخەڵكی چەواشە بكەن، بۆشیان ناكرێ، ئەوانە پەڵپو بیانوو دەگرن، پێشنیازی ئەوە دەكەن وێڕای موعجیزەی قورئانو موعجیزەكانی تری پێغەمبەر ﷺ نیشانەو خاریقەی تریان بۆ بێ، دەڵێن: ﴿مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاء اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾المؤمنون/٢٤. لە موعجیزەی قورئان تێنافكرن، لەرەوشتی پێغەمبەر وردنابنەوە، داوای موعجیزەی نەگونجاو دەكەن، پەڵپی ئەوە دەگرن، فریشتە لەئاسمانەوە بێتە سەریان، ﴿وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَمَا أُنذِرُوا هُزُواً﴾ قورئانو موعجیزەكانی تری پێغەمبەری ئیسلام هەروا موعجیزەی پێغەمبەرەكانی تر، بەگاڵتەو سوكایەتی سەیر دەكەن، گوێیان نەدا بە ترساندنو هەڕەشانەی پێغەمبەران: كە ئاراستەی ئادەمیزادیان كردوە، هاتنی رۆژی قیامەتو ئاگری دۆزەخیان بەدرۆ زانیوە، ئەمە هەموو نیشانەی ئەوەیە: ئەو موشریكانە نەزانیو دڵرەقی بووەتە سروشتو خوو لێیانو لەگەڵ خوێنو ئێسقانیان تێكەڵاو بووە!

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار باسی كێشەو جیدالی كافرەكانی كرد: كە بەناحەقو بەتاڵ بەربەرەكانی ئایینی خودایان كردووەو دەكەن، هەندێ وەصفیان باس دەكا: كە داخوازی ریسوایيو سەرشۆڕییانەو دەفەرموێ:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ﴾ كێ لەو كەسە ستەمكار ترە، كە بەئایاتی خودا پەندو ئامۆژگاری دەكرێ، قورئان دەكرێتە رێنمونيو رێ نیشاندەری، بەڵگەو دەلیلی ئاشكرای نیشان دەدرێ بۆ ئەوەی رێگای هیدایەت بگرێتە بەر، كەچی ﴿فَأَعْرَضَ عَنْهَا﴾ پشتی تێ كردو رووی لێ وەرگێڕا، گوێی بۆ نەگرتو دڵی بۆ نەكردەوە: بزانێ چی تێدایەو چی پێ دەڵێ: ﴿وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ؟﴾ لەبیری

چۆتەوە لەوەپێش چی کردوە، چەند تاوانی ئەنجام داوە، چەندە کافرو یاخی بووە، بیری لەسەرەنجامی کوفرو بێدینی خۆی نەکردۆتەوە، تۆبەی نەکردو بۆ لای خودا نەگەڕاوەتەوە.

ئەمجار بایسی ئەو پشت هەڵکردنو لەبیرچونەوە دێنێتەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً وَإِنْ تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَى فَلَنْ يَهْتَدُوا إِذاً أَبَداً﴾ واتە: ئەو پشت هەڵکردنو رو وەرگێڕانو لەبیر چوونەوەیان بەهۆی ئەوەوەیە: ئێمە چەند پەردەیەکمان گێڕاوە بەسەر دڵیاندا، بۆ ئەوەی لەقورئان نەگەنو پێی پەند ئامێز نەبن، هەروەها جۆرە گوێ گرانیەکی مەعنەویمان بەسەر گوێچکەدا هێناون، بۆ ئەوەی قورئان نەبیسن، ئامۆژگاریو قسەی حەقیان بەگوێچکەدا نەچێ! چەندێك قورئانیان بەسەردا بخوێندرێتەوە هیچی لێ حاڵی نابن! چونکە ئامادەباشی ئەوەیان تێدا نیە گوێ بۆ شتی بەسوود بگرن، ئەوەندەیان تاوان ئەنجام داوە هێندەیان کوفرو بێدینی کردوە دڵو دەروونیان ژەنگی گرتووە، بەجۆرێك: کە لەنێوان ئەوانو بیستنی حەقو راستی دا پەردەی ئەستوورو پتەو دروست بووە، هیچیان بەگوێدا ناچێ، دڵیان هیچ وەرناگرێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾المطففين/١٤. یان دەفەرموێ: ﴿خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾البقرة/٧. هەڵبەتە ئەم ئایەتانە دەربارەی تاقمو گرۆیەکن: کە لەزانستی خودادا وا چەسپاوە: کە ئەوانە بەکافری دەمرنو ئیمان ناهێنن وەکوو موشریکەکانی قورەیش!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە بەپەلە عەزابو سزای خۆی نانێرێ بۆ سەر ئەوانەی کافرو بێدینو تاوان ئەنجام دەدەن؛ بەهومێدی ئەوەی بەخۆیان دا بچنەوەو لەهەڵوێستی ستەمکارانەی خۆیان بێنە خوارێو بۆ لای خودا بگەڕێنەوە. دەفەرموێ: ﴿وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ لَوْ يُؤَاخِذُهُمْ بِمَا كَسَبُوا لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ﴾

خودای تۆ ئەی موحەممەد! لێخۆشبوو لێبوردوە، تاوانپۆشەو خاوەنی رەحمەتو بەزەیی بەرفراوانە، ئەگەر بەپەلەو دەست لەعاست ئادەمیزادە ستەمکارەکانی بەسزای ریشەکێش کاری خۆی بگرتایەو بەگوێرەی کردەوەی خۆیانی لەگەڵ بکردنایە، هەر لەدونیادا زوو رەچەڵەکی دەبڕینەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ﴾فاطر/٤٥. یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ﴾رعد/٦.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە سزا نەدانی ئەو تاوانبارانە (موشریکەکانی مەککە) بەپەلەو دەست لەعاست پاشگوێ خستن نیە، بەڵکوو مۆڵەتدانە بۆ کاتێکی دیاریکراو، دەفەرموێ: ﴿بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِ مَوْئِلاً﴾ واتە: خودا ویستی وابووەو وای بڕیار داوە: کە عەزابی کافرە قورەیشییەکان دوا بخا بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئەو کاتەش یان رۆژی قیامەتە، یان لەدونیادایە، وەکوو رۆژی بەدرو رۆژی رزگارکردنی مەککەو رۆژی جەنگە یەکالاکەرەوەکانی تر! جا هەر کاتێ کاتی سزادانیان هات ئەوە عەزابی بێ ئامانی خودا دەوریان دەدا رزگاربوونیان نیە، بەکورتی دواخستنی سزاو تۆڵە مۆڵەتدانە پاشگوێ خستن نیە. ئەمەش شتێکی بەڵگە نەویستەو پەیوەندی بەدابو نەرێتی خوداوە هەیەو جۆرێکە لەحیکمەتی یەزدانی، بێ هودە نیە، بەڵگەی ئەم راستیانەش ئەوەتا: ﴿وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِداً﴾ دانیشتوانی ئەو هەموو شارو شاروچکانەی گەلی عادو ئەموود ئەصحابولئەیکە: کە لەپێش کافرە قورەیشییەکانەوە بوون، کاتێک ستەمکارییان ئەنجام داو موعجیزەی پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستەوە، کاتێکی دیاریکراومان بۆ لەناو بردنیان دیاری کرد، هەر لەگەڵ کاتی لەناو بردنەکەیان هات ئیتر بێ سێو دوو لێ کردن، لەناومان بردن، هەر بەو شێوەیە کاتێکمان دیاری کردوە بۆ ئەو موشریکانەی گەلەکەی تۆ

ئەی موحەممەد! هەر لەگەڵ وەختی هات ئیتر بەبست بەقەرزیان نادەین، خێرا بەعەزابی سامناکی خۆمان دەیانگرینو لەناویان دەبەین، واتە: با ئەوانە وا نەزانن پاشگوێمان خستوونو وازیان لێ دێنین، بەڵکوو مۆڵەتمان داون بۆ ماوەیەك بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو تۆ بە بکەن!

## چیرۆکی حەزرەتی موسا لەگەڵ حەزرەتی خضردا

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن

تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْـَٔلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ۖ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾

لەوەپێش پەروەردگار چیرۆکی ئەصحابولکەهفی بۆ گێڕاینەوە بۆ ئەوەی دەسەڵات و توانای خۆی بەسەر زیندوبوونەوەدا بچەسپێنێ، ئەمجار سێ نموونەی هێنایەوە بۆ سەلماندنی راستی ئەوە: کە عیززەت و شکۆمەندی بەماڵ و دەسەڵات

نیە بەڵكوو بەعەقیدەو بیرو باوەڕە، بۆ ئەوەی موشریكەكانی مەككە: كە شانازییان بەسەر هەژارە موسوڵمانەكاندا كرد ئەم راستی یە بزانن‌و بەخۆیاندا بچنەوە.

ئەنجار چیرۆكێكی تر ئاڕاستە دەكا؛ ئەویش چیرۆكی حەزرەتی موسایە لەگەڵ حەزرەتی (خضر)دا ﷺ چیرۆكەكە لەچوارچێوەی ئەوەدا دەخولێتەوە: كە هەنگاو بەهەنگاو حەزرەتی موسا لەحەزرەتی خدرەوە فێری زانیاری دەبێ ئەو مامۆستایە دەرزی‌دا دەدا. گێڕانەوەی ئەم چیرۆكەش لێرەدا بۆ ئەوەیە: موشریكەكانی مەككە تێبگەن: كە هەرەچەندە حەزرەتی موسا پێغەمبەرەو ئاخاوتنی لەگەڵ خودادا كردوەو خاوەنی زانیاری‌و كرداری باشەو یەكێكە لەپێغەمبەرە (أولو العزم)ەكان، كەچی فەرمانی پێكراوە زانیاری لەپیاوچاكێك فێر ببێ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە: كە تەواضوع‌و خۆبەكەم زانین لەتەكەبوورو خۆبەزلزانین باشترە.

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُباً﴾ ئەی موحەممەد! یادی ئەوە بكەو ئەو چیرۆكە بۆ گەلەكەت بگێڕەوە: كە موسا بەپیاوە خزمەتچییەكەی خۆی گوت: من بڕیارم داوە دەبێ بكەومە ڕێگاو رانەوستم تا دەگەمە ئەو شوێنەی دوو دەریاكان تێكەڵ بەیەكتر دەبنەوە، تەنانەت ئەگەر گەشتەكەم چەند ساڵێكیش درێژە بكێشێ تانەگەمە ئەو شوێنە رانەوەستم!

هەڵبەتە مەبەست بەموسا، موسای كوڕی عیمرانە: كە پێغەمبەری نەتەوەی ئیسرائیل بووەو خاوەنی موعجیزەی (عصا)و یەدی بەیضاو چەندەها موعجیزەی تریش بووە. مەبەست بە(فەتا)كەی یوشعی كوڕی نوونی كوڕی (ئەفرائیم)ی كوڕی یوسف بووە.

ئەم بەشەی چیرۆكی حەزرەتی موسا تەنیا لەم سورەتەدا باس كراوە، لەهیچ شوێنێكی تری قورئاندا دوبارە نەبۆتەوە، ئەوەی تێبینی دەكرێ قورئان شوێنی

روداوەکانی ئـەم چـیرۆکە دیـاری ناکـا، جگـە لـەوەی کـە نـاوی (مجمـع البحـرين)ی هێناوە. هەروەها ئەوەش روون ناکاتەوە لەچ سەردەمێکی ژیـانی موسـادا بـووە، ئایـا ئەم روداوە لەمیصر بووە پێش ئـەوەی نەتـەوەی ئیـسرائیل لێـی بڕۆنـە دەرێ، یـان دوای دەرچوونیان بـووە لـەوێ، ئـەمجار ئەگـەر دوای دەرچـوونیان بـووبێ لەمیـصر، ئایا پێش ئەوە بووە: کە بچنە ناو خاکی پیرۆزەوە، یان دوای ئـەوە بـووە: کـە موسـا نەتەوەکەی بەرەو خاکی پیرۆز بردوە لەدەروازەی شارەکە نەچوونە ژوورێ چونکە گەلێکی تێدا بوو هەموویان کەتەو چوارشانەو بەسامو هەیبەت بوونو جولەکەکان نەوێران بچنە ناویو وتیان: تا ئەوانی تێدابن ئێمە ناوێرین بچینە ناوی. یان دوای ئەوە بوو کە لەدەشتەکەدا سەریان لێ شێواو پەرتەوازە بوون، هەروەها قورئان هیچ شتێك دەربارەی بەندەی صالحو خودا پەرست باس ناکا: کە موسا بـوو بـەهاوڕێیو ماوەیـەك بەیەکـەوە گەشـتیان کـرد. پێمـان نـالێ کـێ بـووە، نـاوی چـی بـووە، ئایـا پێغەمبەر بووە یان زاناو پیاوچاك بووە. هیچ لایـەنێك لـەم لایانانـە دەست نیـشان ناکا!

ئیمـامی بوخـاریو موسـلیم لەئوبـەی کـوڕی کەعبـەوە ﷺ لەپێغەمبـەرەوە فەرموودەیـەك ریوایـەت دەکـەن دەفـەرموێ: (رۆژێـك حـەزرەتی موسـا وتـاری بـۆ قەومەکـەی دەدا، پرسـیاری لێ کـرا کـێ لەهـەموو ئـادەمیزادان زانـاترە؟ حـەزرەتی موسا وتی: من، ئیتر خودا عیتابی لێ گرت، چونکە زانیـاری ئـەوەی حەواڵـەی خـودا نەکرد، ئەوەبوو پەروەردگار نیگای بۆ کرد: پێی فەرموو: بەندەیەکی من هەیە لای ئـەو شـوێنەیە کـە دوو دەریاکـان لێـك دەدەنـەوە، ئـەو بەندەیـە لـەتۆ زانـاترە. حەزرەتی موسا وتی: خودایە! چۆن بـێ بەخزمـەتی بگـەم؟ پـەروەردگار نیگـای بـۆ کرد فەرمووی: ماسییەك بکەرە زەمبیلەیەکەوە ((کوندەیەکەوە)) بکەوەڕێ، لەهـەر شوێنێك ماسییەکەت لێ گوم بـوو ئـەوە بەنـدە راستاڵەکە لەوێیـە. حـەزرەتی موسـا کەوتە ڕێو خزمەتکارەکەی خۆی لەگەڵدا بـوو، کـە نـاوی یوشـعی کـوڕی نـون بـوو،

ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای بەردەکە، لەوێ لایاندا بۆ پشوودانو ئیسراحەت کردنو خەویان لێ کەوت، ماسییەکە لەکونەکە دەرچوو خۆی فڕێدایە ناو دەریاوە).

رای پەسند ئەوەیە: کە (مجمع البحرین) ئەو شوێنە بێ کە دەریای سورو دەریای سپی ناوەڕاست بەیەك دەگەن لەو ناوچەیەی کە پێی دەڵێن: ناوچەی دەریاچە تاڵەکانو دەریاچەی تیمساح، یان ئەو شوێنەیە کە خلیجی عەقەبەو خلیجی سویس لەدەریای سووردا بەیەك دەگەن، چونکە زەوربەی ڕووداوەکانی بەنوئیسرائیل دوای دەرچوونیان لەوڵاتی میصر لەم ناوچەیە بووە.

جا ﴿فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَباً﴾ کاتێ حەزرەتی موساو خزمەتچییەکەی گەیشتنە ئەو شوێنەی دەریاکان بەیەك دەگەیشتنو ئەو شوێنە بوو: کە خودا وادەی گەیشتن بەبەندە صالحەکەی پێ دابوونو نیازیان وابوو لەوێ بیبینن، زۆر ماندو شەکەت بوون لێی نووستن، یوشع زوو بەخەبەر هات هێشتا حەزرەتی موسا هەر لەخەودا بوو، بەقودرەتی خودا ماسی زیندوبووەوەو خۆی فڕێدایە ناو دەریاوەو ڕێگەی خۆی لەدەریادا گرتەبەرو کەوتەڕێ. یوشع ئاگاداری ئەم روداوە بوو بەبەرچاوی خۆیەوە هاتەدی. کە حەزرەتی موسا لەخەو هەڵسا لەبیری چوو دەربارەی ماسییەکەیان پرسیار لەیوشع بکا، حەزرەتی یوشعیش لەبیری چوو بەسەرهاتی ماسییەکە بۆ حەزرەتی موسا بگێڕێتەوە ماسی لەدەریاکەدا کەوتە هاتوچۆو ئاوەکەی کون دەکردو دەڕۆیی ئاوەکە وێك نەدەکەوتەوە، ڕێگاکەی وەکوو تاقو کونێکی درێژ وەهابوو؛

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: رای پەسند ئەوەیە: کە دەڵێن: ماسییەکە برژاوبووە، زیندو بوونەوەیی و ئاو کون کردنەکەی جۆرێك بووە لەموعجیزەو نیشانە، پەروەردگار بەخشیویەتی بەحەزرەتی موسا، بۆ ئەوەی مەوعیدەکەی خۆیانی پێ بزانن. بەڵگە لەسەر ئەوە: کە ماسییەکە برژاوبووە سەرسوڕمانی

حەزرەتی یوشعە، چونکە ئەگەر ماسییەکە زیندوبووبێ‌و خۆی فڕێ دابێتە ناو دەریاوەو ڕۆیشتبێ چ جێگای سەرسوڕمان نیە.

هەر کەسێك بیرو باوەڕی تەواو بێ نابێ لەم جۆرە شتانە ڕەخنە بگرێ‌و بڵێ: چۆن دەبێ ماسی برژاو زیندو بێتەوە، یان ئاو کە لەت بوو وێك نەکەوێتەوە؟! چونکە ئەمە جۆرێك بووە لەموعجیزەو پەروەردگاریش هەرچی بیەوێ بیکا دەیکاو هیچی لێ عاسی نابێ!

بەڵێ حەزرەتی موساو حەزرەتی یوشع لەوێ هەستان‌و کەوتنەڕێ ﴿فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَباً﴾ جا کە ئەو شوێنەیان جێ هێشت‌و نزیکەی شەوو ڕۆژێ ڕۆیشتن‌و ماندوبوون، بۆ ڕۆژی دوایی لەچێشتەنگاودا حەزرەتی موسا بەخزمەتکارەکەی خۆی فەرموو: برا! کوا خواردنەمەنی‌و قاوڵتیەکەمان بێنە پێشەوە با بیخۆین، بەراستی ئێمە لەم سەفەرو گەشتەماندا تووشی ماندوبون‌و شەکەتیەکی زۆر بوین!

جا وەکوو لەمەوەپێش ئامازەمان پێ کرد، حەزرەتی موسا لەلایەن خوداوە فەرمانی پێ کرا: کە ماسییەکی خوێ پێکراوی برژاو لەگەڵ خۆیدا بەرێ‌و بیکاتە توێشووی ڕێگای، پێشی گوترا: بەندەیەکی خودا هەیە لەلای (مجمع البحرين) چاوت پێ دەکەوێ، زانیاری وای لا هەیە تۆ تا ئێستا پەییت پێ نەبردوە، حەزرەتی موسا کەڵکەڵەی سەفەری کەوتە سەرەوەو خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو، هەروەها هەواڵی ئەوەشی پێ درا: کە هەر کاتێ ماسییەکەی لەگەڵ خۆتی دەبەی لێت گووم بوو، ئەوە لەو شوێنەدا بەندە صالحەکەی ئێمەت چاوپێ دەکەوێ. حەزرەتی موساو خزمەتچییەکەی کەوتنە ڕێ تا گەیشتنە (مجمع البحرين) حەزرەتی موسا لەخەودا بوو یوشع بەخەبەر بوو، ماسییەکە لەزەمبیلەیەکدابوو بەقودرەتی خودا زیندو بووەو لەپێش چاوی یوشع خۆی فڕێدایە ناو دەریاوەو کەوتە گەڕان‌و هاتووچۆ!

بێگومـان زیندوبوونـەوەی ماسـی یەکـە مـوعجیزە بـوو بـۆ موسـاو نیـشانەی دۆزینـەوەی شـوێنی حـەزرەتی خـضر بـوو. حـەزرەتی خـضر: ئـەو بەنـدە خـودا پەرستە صالّحە بوو: کە پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی موسا کرد لێیـەوە فێـری زانیاری ببێ. وەکوو لەتەفسیرە کۆنەکاندا نووسـراوە نـاوی (بـەلیای کـوڕی مـەلکان) بووە. رای پەسندو صەحیح ئەومیە: پێغەمبەر نەبوە.[1]

جا کە حـەزرەتی موسـا داوای قـاوەڵتی یەکـەی کـردو قاوەڵتییەکـەش بریتـی بوو لەماسیەیە برژاوەکە: کە لـەبیریان چـووبو، نەحـەزرەتی موسـا بەسـەرهاتەکەی دەزانیو نەیوشعیش لەبیری بوو ئەم هەواڵە بەحەزرەتی موسا بدا، ئیتر لەو کاتەدا خزمەتچییەکەی بەسەرهاتی ماسی یەکەی بیر کەوتەوە ﴿قَـالَ أَرَأَيْـتَ إِذْ أَوَيْنَـا إِلَـى الـصَّخْرَةِ﴾ بەحـەزرەتی موسـای گـوت: تـۆ دەزانـیو ئاگاداری کـاتێ لامـان دایـە لای بەردەکە چـی رویـدا! ئـەمجار بەسـەرهاتەکەی بـۆ گێڕایـەوەو وتـی: ﴿فَـإِنِّي نَـسِيتُ الْحُـوتَ﴾ بەراسـتی مـن ماسـییەکەم لـەبیر چـوو! واتـە: لـەیادم چـوو بەسـەرهاتو

---

[1] تەفسیری مونیر ج١٥/٢٩٣ ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ: بەلای جەماوەری زانایانەوە حەزرەتی خضر پێغەمبەر بووە تەفسیری قورطوبی ج٥/٣٦١.

شێخی مەراغی دەفەرموێ: زوربەی زانایان پێیان وایە حەزرەتی خضر پێغەمبـەر بـووە، چوار بەڵگەیان لەسەر رایەکەی خۆیان هێناوەتەوە:

أ- قورئان دەفـەرموێ: ﴿آتيناه رحمة من عنـدنا﴾ وشـەی (رحمـة) لێـرەدا بـەمانا پێغەمبەرێتییـە ئاماژە بەوە کە خودا دەفەرموێ: ﴿أهم يقسمون رحمة ربك﴾.

ب- ئایەتی ﴿وعلمناه مـن لـدنا علمـا﴾ ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ پـەروەردگار بـەبێ ناوەنـد فێـری زانیاری کردبێ، کەسێك ئاوا بێ پێغەمبەرە.

ج- حەزرەتی موسا داوای لێ کرد فێری شتی بکا، دەی پێغەمبەر نابێ لەناپێغەمبـەر فێـری شت ببێ.

د- خضر دەفەرموێ: ﴿وما فعلته عن أمري﴾ لەخۆمەوە ئەو ئیشانەم نـەکردن بـەڵکوو بـەنیگای خودایی کردومن. تەفسیری مەراغی ج١٥/١٧٢/١٧٣.

روداوی ماسییەکەت بۆ بگێڕمەوە ﴿وَمَا أَنْسَانِي إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ﴾ جگە لەشەیتان هیچ کەسی تر ئەوەی لەبیر نەبردمەوە، شەیتان بەوەسوەسە دڵی مەشغووڵ کردمو لەبیرم چوو بۆت باس بکەم.

هەڵبەتە بەلای ئەهلی سوننەو جەماعەتەوە خودا بەدیهێنەری کردەوەی بەندەکانیەتیو هەموو شتێك بەدەست ئەوە، وەڵێ کاری خراپ وەپاڵ شەیتان دەدرێ چونکە بەهۆی ئەوەوە ئەنجام دەدرێ بەختوکەو وەسوەسەی ئەو فەراهەم دەهێندرێ، بۆیە هەموو کارێکی خراپە بەکردەوەی شەیتان دادەنرێ، لەلایەکی ترەوە دەبێ شەرم بکەین کە کاری خراپو ناپەسند پاڵ خودا بدەین. لەبیر چوونەوەکەش کارێکی خراپ بوو چونکە بووە هۆی ئەو هەموو گەڕانو ماندوبوونەوەی حەزرەتی موسا تێپەڕبوونی ئەو هەموو کاتە بەبێ هودە. هەروەها لەبیرچوونەوەکە پێچەوانەی فەرمانی حەزرەتی موسا بوو، چونکە حەزرەتی موسا لەسەرەتای گەشتەکەدا بەیوشعی فەرموو: هەر کاتێ ئەو ماسییەت لەدەست چوو هەواڵم بدەرێ، تەنانەت پێی فەرموو من هیچم لەتۆ ناوێ ئەوە نەبێ!

دەشگونجێ هۆکاری لەبیرچوونەوەکە عیتابی خودابێ لەحەزرەتی موساو لەخزمەتچیەکەی. چونکە موسا پشتی بەخزمەتکارەکەی بەستو دڵنیابوو: کە هەواڵی دەداتێ. خزمەتکارەکەشی کە ئەو فەرمانەی پێ کرا ئینشائەڵڵای نەکرد. بەڵکوو وتی: ئەوە کارێکی ئاسانەو بەسەرچاو هەر کە ماسییەکەم لێ گووم بوو هەواڵت دەدەمێ.

﴿وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَباً﴾ من لەبیرم چوو باسی ماسی یەکەت بۆ بکەم، ئەو کاتەی تەشریفت لەشیرین خەودا بووی ماسی یەکە زیندوبووەو خۆی فڕێدایە ناو دەریاوەو بەناو دەریادا کەوتە گەڕانو ئەو ڕێگایەی پێیدا دەڕۆیشت دەبوو بەنەفەقێكو ئاوەکە وێك نەدەکەوتەوە، بەراستی دیمەنەکە جێگای سەر سوڕمان

بوو منی سەرسام کرد، کەچی کە لەخەو هەستای لەبیرم چوو بۆت بگێڕمەوەو شەیتان لەبیری بردمەوە!

﴿قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ﴾ حەزرەتی موسا فەرمووی: ئەوەی گێڕاتەوە دەربارەی روداوی ماسی یەکە، ئەو شتەیە: کە ئێمە بەشوێنی دا دەگەڕێینو بەدوایدا وێڵین، ئەوە نیشانەی ئەوەیە: کە ئەو پیاوە صاڵحەی ئێمە دەمانەوێ چاومان پێ بکەوێ لەو شوێنە تووشمان دەبێ! ئیتر ﴿فَارْتَدَّا عَلَىٰ آثَارِهِمَا قَصَصًا﴾ راستەو راست بەرێگای خۆیاندا گەڕانەوە تا گەیشتنەوە ئەو بەردەی کە لەو سەرەوە لایان دابووە لایو پشوویان دابوو ماوەیەك خەویان لێ کەوتبوو ﴿فَوَجَدَا عَبْداً مِنْ عِبَادِنَا﴾ ئیتر لەو شوێنەدا بەندەیەك لەبەندە راستاڵەکانی ئێمەیان بینی: کە ﴿آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا﴾ لەلایەن خۆمانەوە رەحمەتێك، واتە: پلەو پایەی پێغەمبەرێتیمان پێ بەخشیبوو.

﴿وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْماً﴾ لەلایەن خۆمانەوە زانیاری تایبەتیمان فێر کردبوو، زانیارییەکی وەهبی: کە هیچ کەس بەهەوڵو تێکۆشانی خۆی فێری نابێ، واتە: زانیارییەکی پەنامەکیو غەیبیمان فێر کردبوو!

ئیمامی قورطوبی لەبوخارییەوە ئەمەی راگوێزاوەو دەفەرموێ: کە حەزرەتی موساو یوشع گەڕانەوە بۆ لای بەردەکە، پیاوێکیان بینی لەسەر طینفیسەیەکی سەوز راکشاوەو داپۆشراوە، بەشتێ بەشێکی خستۆتە ژێر هەردوو قاچیەوەو بەشێکی تری خستوتە ژێر سەری، حەزرەتی موسا سەلامی لێ کردو ئەویش پەردەکەی لەسەر دەمو چاوی خۆی لاداو وتی: لەوڵاتی ئێوەدا ئاشتی هەیە؟! ئەتۆ کێی؟ وتی من موسام. وتی: موسای پێغەمبەری بەنوئیسرائیل؟ وتی: بەڵێ. ئەمجار وتی: ئیشت چیەو چیت لەمن دەوێ؟ حەزرەتی موسا وتی: هاتووم فێری هەندێ لەو زانیارییانەم بکەی کە زانیاری تایبەتینو ناوازەن.

زوربـەی زانایـان پێیـان وایـە ئـەو بەنـدە صـالحە حـەزرەتی (خـضرە)و ناوەڕاستەقینەکەی (بەلیای کوڕی مەلکانە) ئەو پیاوە پیرۆزە بەرای زوربەی زانایان پێغەمبـەر بـووە، بەلگـەو نیشانە لەسـەر پێغەمبـەرێتی ئـەم زاتـە زۆر زەبەنـدەن‌و هەندێ لەو بەلگانەمان لەوەپێش تۆمار کردوون.

بێگومان خضر پێغەمبەر بووبێ یان پێغەمبەر نەبووبێ پلەو پایەی لـەخوار حەزرەتی موسـاوەیە، زانـین‌و ئاگـادار بـوونی خـضر بەسـەر هەنـدێ زایناریـدا: کـە حـەزرەتی موسـا نـەیزانیوە لەپلـەو پایـەی حـەزرەتی موسا کـەم ناکاتـەوەو نابێتـە بەلگـە لەسـەر ئـەوە: کـە حـەزرەتی خـضر لەحـەزرەتی موسـا گـەورەتر بـووبێ. هەروەکوو چۆن مامۆستایی حەزرەتی جوبرائیل بۆ پێغەمبەر نابێتە بەلگە لەسـەر ئەوە: کە جوبرائیل لەپێغەمبەر گەورەتر بێ. راجیـایی هەیـە دەربـارەی ئـەوە ئایـا حەزرەتی خضر ئێستا لـەژیاندایـە یـان نـا؛ هەنـدێ لـەزانایانی ئیـسلام پێیـان وایـە خضر نەمردوەو تا نزیك دونیا خراپ بوون نامرێ.

هەنـدێکی تـر لـەزانایان پێیـان وایـە (خـضر) مـردوەو نـەماوە، لـەم بـارەوە لەکتێبەکانی عەقائیدو کتێبـەکانی تەفـسیردا دەمـە دەمـێ‌و کێـشەیەکی زۆر هەیـە، هەر تاقمەو کۆمەڵێك بەلگە دێنێتەوە لەسـەر رایەکـەی خـۆی. بەپێویـستم نـەزانی ئەو هەموو (حەنەحەبەشییە) راگوێزی ئێرەی بکەم!

بەلێ حەزرەتی موسا بەهۆی ئەو نیشانەو بەلگانەی خودا بۆی دانابوو بەندە صالحەکەی دۆزییەوەو بەیەك گەییشتن!

مامۆسـتا سـەیید دەفـەرموێ: وا پـێ دەچـێ مەبەسـت لـەو گەشـت‌و بـەدوادا گەڕانە نهێنی یەك بووبێ لـەنێوان پـەروەردگارو موسـادا خزمەتـچیەکەی ئاگـاداری ئـەو نهێنـی یـە نـەبووبێ، بۆیـە لێـرە بـەولاوە لـەڕوداوی چیرۆکەکەدا نـاوی یوشـع

نـامێنیّو هـەر نـاوی موسـاو پیـاو چـاکەکە دەهێنـدریّ! خۆیـان دەبنـە ئەکتـەری چیرۆکەکە.

﴿قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْـتَ رُشْـدًا﴾ حـەزرەتی موسـا بەحـەزرەتی خضری فـەرموو: رازی دەبـی هاورێیـت بکـەم بـۆ ئـەوەی هەنـدیّ لـەو زانیاریەی خودا فێری کردووی فێـرم بکـەی؟! واتـە: بـا هاورێییـت بکـەم بـۆ فێـر بوونی ئەو زانستە پیرۆزەی کە تۆ فێر کـراوی. بـەڵکوو بیکەمـە بەرنامـەی ژیـانم‌و لەکردارو هەڵوێستمدا سوودی لیّ ببینم!

سەیر بکـەن حـەزرەتی موسا بـەچ ئـەدەب‌و حیشمەتێکەوە، بـەچ شـێوەیەکی شـیرین‌و شـەرمەوە داوای فێربـوونی زانـست لەحـەزرەتی خـضر دەکـا! بەشـێوەی پرسیار داوای فێر کردنی زانستی بەسوود دەکا لەو بەندە صاڵحە!

بـەڵام پێویـستە ئامـاژە بـەوە بکـەین: کـە زانیـاری حـەزرەتی خـضر جـۆرە زانینێکـی تایبـەتی بـوو، کـەوابیّ ئـەو زانینـەی موسـا داوای کـرد خـضر فێـری بکـا لـەبارەی ئـایین‌و شـەریعەتەوە نـەبوو، زانینـی زانیـاری پەنامـەکی‌و غـەیبی بـوو، زانیارییـەکی تایبـەتی بـوو (علمـی لـدنی) پـیّ دەڵـێن‌و پـەروەردگار هەنـدیّ لەبەندەکانی خۆی بەسەردا ئاگادار دەکا، زانیارییەکی (وەهبی)یە زانیاری (کەسبی) نیـە، دوورە لەتێگەییـشتنی خـەڵکی‌و پـەروەردگار لەتاکتاکـەی بەنـدەکانی نـەبیّ ئاشکرای ناکا. لەبەر حیکمـەتێك: کـە هـەرخۆی دەیزانـیّ حـەزرەتی خـضری فێـری هەندیّ لەو جۆرە زانینە کردوە.

جا بەو پێیە: کە زۆر روداو هەیە بەدیمـەن‌و رواڵـەت دژایـەتی هەیـە لەگـەڵ ژیری‌و زانینی رواڵەتی ئادەمیزاد، بەڵام بەگوێرەی ئەو زانینە پەنامەکییـە راسـت‌و حەقە، بۆیە حەزرەتی خـضر مەترسـی ئـەوەی کـرد: کـە حـەزرەتی موسـا نـەتوانیّ هاورێیەتی بکا، چـونکە لێـی نمایـان بـوو: تووشـی روداوی وا دەبـن حـەزرەتی موسـا

لەبەرامبەریاندا خۆی پێ ناگیرێو رەخنە لەهەڵوێستو کردەوەکانی دەگرێ، بۆیە حەزرەتی خضر ﴿قَالَ﴾ بەموسای فەرموو: ﴿إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْراً﴾ ئەتۆ ناتوانی لەگەڵ مندا هەڵبکەی، رووداوی وا دەبینی لەمنەوە خۆت پێ ناگیرێو رەخنە دەگری!! بەمەش ئێمە لێك دەدابڕێینو من هاوڕێیەتیت ناکەم.

ئەمجار هۆی خۆنەگرتنەکەشی بۆ روون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْراً﴾ تۆ چۆن دەتوانی بێ دەنگ بی لەکردارێکی من بەدیمەنو رواڵەت نارەواو ستەمە، ئاگاداری لایەنە نهێنییەکەی نیتو نازانی کە لەدیوی ناوەوەیدا کارێکی باشو روایە. تۆ رواڵەت بینیو بەظاهیر دەڕوانی یە رووداوەکەو، تەنیا ئاگات لەباری شەرعیو خراپەکەی هەیە، پێغەمبەرێتیو ئەرکی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەت لەسەر شانە، بەهیچ کلۆجێ بێ دەنگ نابی لەکردەوەیەك کە بەلاتەوە خراپو نارەوایە، کەوابێ ناتوانی بێدەنگ بی لەئاست هەڵوێستو کردەوەکانی منو هاوڕێیەتی منت پێ ناکرێ! بەکورتی دڵنیام لەوەی خۆت پێ ناگیرێ لەبەرامبەر ئەو کردەوانەی لەمن دەیانبینی!

حەزرەتی موسا لەدڵی خۆیدا بڕیاری خۆڕاگریو گوێڕایەڵی داو ﴿قَالَ:﴾ بەحەزرەتی خضری فەرموو: ﴿سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِراً﴾ ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ منت دەست دەکەوێ بەهاوڕێیەکی خاوەن صەبرو ئارامو هەرچی کردەوەیەکت لێ ببینم رەخنەت لێ ناگرم، دان بەخۆمدا دەگرمو چاوەڕوانی ئاکامەکەی دەکەم، ﴿وَلا أَعْصِي لَكَ أَمْراً﴾ بەهیچ کلۆجێ سەرپێچی فەرمانو ئامۆژگاریەکانت ناکەم بەمەرجێ سەرپێچی فەرمانی خودای تێدا نەبێ!

ئەمجار حەزرەتی خضر زیاتر مەرجی بەهاوڕێ بوونی بۆ رون کردەوەو پێش دەست پێکردنی گەشتەکەیان مەرجێکی یەکلاکەرەوەی بەموسا راگەیاند ﴿قَالَ﴾ بەموسای گوت: ﴿فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْراً﴾

ئەگەر بویت بەهاورێی سەفەرم، نابێ لەهیچ شتێك پرسیارم لێ بكەی هەتا بۆخۆم بۆت رون دەكەمەوە، هەر شتێكت بینی لەمن‌و بەرواڵەت بەدڵت نەبوو نەڵێی ئەوە بۆچی وات كرد؟ بۆ وات نەكرد، نەكەی رەخنەم لێ بگری! دان بەخۆتا بگرە هەتاكوو بۆخۆم لەكاتی پێویستدا لەلایەن خۆمەوە بۆت روون دەكەمەوە، بەبێ ئەوەی پرسیارم لێ بكەی! حەزرەتی موسا رەزامەندی خۆی نیشانداو مەرجەكانی حەزرەتی خضری قبووڵ كردن.

﴿فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا﴾ حەزرەتی موساو حەزرەتی خضر گەشتەكەیان دەست پێ كردو بەقەراخی بەحردا كەوتنەرێ‌و عەودالی كەشتییەك بوون سواری بن‌و زوو بگەنە شوێنی مەبەستیان، هێندەی پێ نەچوو كەشتییەك هاتوو دەستییان لێ راگرت‌و لەنزیكیانەوە لەنگەری گرت‌و ئەمانیش داوایان لێ كردن سواریان بكەن، خاوەن كەشتی‌و كەشتییەوانەكان حەزرەتی خضریان ناسی‌و بێ كرێ سواریان كردن، كەشتی وەگەڕكەوت‌و چووە ناوەڕاستی دەریاوە بەرەو قوناغو شوێنی مەبەست كەوتەرێ، لەكاتێكدا لەناو شەپۆلی سامناكی دەریادا كەشتی رێگای خۆی دەبڕی، حەزرەتی خضر تاوێدایە پاچێك‌و تەختەیەك یان دوو تەختەی لەكەشتیی یەكە كێشایەوەو كەشتی كون كردو ئەمجار پێنەی كردەوە[1] بەجۆرێك: كە كەشتیەكەی عەیبدار كردو بەئاشكرا عەیبەكەی دەبیندرا!

حەزرەتی موسا: كە ئەمەی بینی خۆی پێ نەگیراو هاواری لێ هەڵسا ﴿قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئاً إِمْراً﴾ وتی: ئەوە كەشتییەكەت كون تێكرت بۆ ئەوەی سەرنشینەكانی نقوومی ناو دەریابن‌و بخنكێن! بەراستی كارێكی ناشیرینت كردو تاوانێكی گەورەت ئەنجام دا! ئای كە كارێكی خراپت ئەنجام دا!

---

[1] تەفسیری مونیر ج١٥/٢٩٥.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: بێگومان حەزرەتی موسا وادەو بەڵێنی خۆی کە لەسەرەتاوە دای بەحەزرەتی خضر لەیادی چوونەوە، هەڵس‌و کەوتەکەی خضر هێندە کاری تێکرد خۆی پێ نەگیراو لێی وەدەنگ هات! حەزرەتی موسا لەبەرامبەر ئەم کارەی حەزرەتی خضردا: کە لەروانگەی عەقڵ‌و مەنطیقەوە هیچ پاساوێکی بۆ ناهێندرێتەوە رەخنەی گرت‌و نارەزایی دەربڕی!

ئینسان جاری وا هەیە مانایەکی کوللی مەزندە دەکا، بەڵام: کە بەواقیعی عەمەلی دەکەوێتە جێ بەجێ کردنی ئەو مانا نەظەرییە کوللییە، دیدو بۆچونێکی تری بۆ پەیدا دەبێ‌و تاقیکردنەوە عەمەلییەکە بارودۆخێکی تر بۆ ئینسانەکە دەخوڵقێنێ زۆر جوداوازە لەگەڵ تەصەووڕە نەظەرییەکە. ئەوەتا حەزرەتی موسا لەوەپێش حەزرەتی خضر ئاگاداری کردەوە: کە تۆ ناتوانی خۆ بگری لەبەرامبەر ئەو هەڵس‌و کەوت‌و کردەوانەی کە لەگەشتەکەماندا لەمنیان دەبینی! بەڵام حەزرەتی موسا پابەندبوونی خۆی بەخۆگری‌و ئارام گرتن راگەیاندو وادەو بەڵێنی داو مەرجەکانی حەزرەتی خضری قبووڵ کردن، بەڵام: کە بەواقیعی‌و عەمەلی رووبەڕووی روداوەکان بووەوە وادەو بەڵێنەکانی لەبیرچوونەوەو نەیتوانی لەئاست کردەوە بەرواڵەت نارەوایەکانی حەزرەتی خضر بێدەنگ بێ بەڵکوو هاواری لێ هەڵساو رەخنەی گرت!

بەڵێ سروشت‌و میزاجی حەزرەتی موسا جۆرە سروشتێکی مەیلەو توندو تووڕە بووە، هەڵس‌وکەوتەکانی گەواهی ئەم راستیەن، ئەوەتا هەر لەسەرەتای ژیانیەوە: کە بەهانای کابرای بەنوئیسرائیلی یەوە چوو ئینفیعال گرتی‌و مستەکۆڵەی لەکابرای قیبطی‌داو کوشتی‌و دوایی تۆبەی کردو لەخودا پاڕایەوە: کە لێی ببورێ، بۆ رۆژی دوایی هەمان کابرای بەنوئیسرائیلی لەگەڵ یەکێکی تر شەڕیەتی‌و داوای یارمەتیدانی لەحەزرەتی موسا کردو ئەویش ویستی پەلاماری کابرای بەشەڕهاتو لەگەڵ کابرای بەنوئیسرائیلی بدا، کابرای بەنوئیسرائیلی

وەیزانی پەلاماری ئەو دەدا، هاواری کردو کوژراوەکەی رۆژی پێشووشی لێ ئاشکرا کرد. کە لەئاکامدا ناچاربوو ولات بەجێ بێڵێو روبکاتە ولاتی مەدیەن!

بەڵێ ئەوە حەزرەتی موسایەو خودا سروشتی وا دارشتووە، بۆیە کە هەڵسو کەوتەکەی حەزرەتی خضری بینی تاوی داوەتە تەشوێیەك کەشتی کون دەکا، نەیتوانی وادەکەی بەرێتە سەرو پابەندی بەڵێنەکانی بێ، چونکە سروشتی ئادەمیزاد هەموویان لەوەدا یەکدەگرنەوە کە ئەزموونی عەمەلیو تەصەوری نەظەرییان لێك جوداوازە!

جا کە حەزرەتی موسا رەخنەی ئاراستەی حەزرەتی خضر کرد لەسەر ئەو کارە بەرواڵەت ناشیرینەیو نارەزایی خۆی دەربری حەزرەتی خضر بەشێوەیەکی هێدیو هێمنی وادەو بەڵێنەکانی پێشووی وەبیر هێنایەوە ﴿قَالَ:﴾ بەحەزرەتی موسای فەرموو: ﴿أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْراً﴾ ئەی لەهەوەڵەوە پێم نەگوتی ئەتۆ ناتوانی لەگەڵ مندا هەڵبکەی و هاورێتی منت پێ ناکرێ؟! ئەتۆ لای خۆی وادەو بەڵێنت پێ دامو مەرجەکانی منت قبووڵ کردن!؟

﴿قَالَ لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْراً﴾ حەزرەتی موسا عوزری بۆ دێنێتەوەو دەفەرموێ: ئەوەم لەبیرچوبووەوەو تکایە عوزرم هەیەو عوزرەکەم لێ وەربگرە، تکایە لەم گەشتەماندا ئەرکی قورس مەخەرە سەرشانم. تەنگەتاوم مەکە بەوە کە عوزرم لێ وەرنەگریو چاوپۆشیم لێ نەکەی، لەکاتێکدا کە لەبیرم چوو بێ! حەزرەتی خضر عوزرەکەی لێ وەرگرتو ﴿فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلاماً فَقَتَلَهُ﴾ لەکەشتییەکە دابەزینو بەقەراخ دەریادا درێژەیان بەگەشتەکەیان دا، لەرێگەیاندا گەییشتن بەمنداڵێکی تازە پێگەییشتوو لەناو منداڵاندا یاری دەکرد، حەزرەتی خضر هەر چاوی بەمنداڵەکە کەوت، بێ پرسیارو ولام پەلاماری منداڵەکەیداو سەری کێشا بەدیوارێکداو کوشتی. حەزرەتی مووسا هەرچەندکردی

نـەیتوانی لەمـە بێـدەنگ بـێ. چـونکە جـاری پێـشوو کـە کـونێکی لەکەشـتییەکە کردبوو مەزنـدە کـرا ببێتـە هـۆی خنکـانی سەرنـشینانیو رودانـی خنکانەکـە سـەد دەرسـەد نـەبوو، بـەڵام ئـەمجارە کوشـتنی ئـادەمیزادێکی بێتاوانـە، کوشـتنی دەسـت ئەنقەستەو هیچی تێدا نەماوە، تاوانێکی گەورەیە ئەنجام دراوە، منداڵێکی بێ تاوان بەناحەق کوژراوە، بۆیە هەرچەندە حەزرەتی مووسا وادەو بەڵێنەکانی لەبیر بوون، مەرج و، ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی خضری لەگوێچکەدا دەزرنگانـەوە بـەڵام خـۆی پێ نەگیراو نەیتوانی بێدەنگ بێ! ﴿قَـالَ أَقَتَلْـتَ نَفْـساً زَكِيَّـةً بِغَيْـرِ نَفْـسٍ ؟﴾ وتـی: ماڵوێران! ئەوە تۆ چۆن رێگەت بەخۆت دا ئادەمیزادێکی بێتـاوان بکوژی؟ گیـانێکی بێ تاوانی پاکی بێ گوناهت بـۆ فەوتانـد! خـۆ حـەقی کەسـی لەسـەر نـەبوو، کەسـی نەکوشـتبوو! ﴿لَقَدْ جِئْتَ شَـيْئاً نُكْـراً﴾ بەراسـتی کارێکی ناشـیرینت کـردو تـاوانێکی گەورەت ئەنجام دا، حەزرەتی موسا ئـەمجار رەخنەگرتنەکەیو وەدەنـگ هاتنەکـەی رەنگدانــەوەی بــیرو بــاوەڕێکی بنــەڕەتی بــوو، روداوەکــە لەناخــەوە هەژانــدی، هەرچەندە لەدڵی خۆیدا لێکی دایەوە نەیتوانی پاساوێك بدۆزێتـەوە بـۆ کـردەوەی حەزرەتی خضر، ئەو منداڵە کوژراوە لەدیـدی موسـادا منـداڵێکی بـێ تاوانـە، هـیچ شـتێکی وای نـەکردوە لەسـەری بکـوژرێ، منداڵـەو هێـشتا بـاڵغ نـەبووە، لەسـەر کـردەوەی بـەرپرس نیـە، هەرچـەندە کـردیو کروانـدیو لێکـی دایـەوە پاسـاوی بـۆ نەدۆزرایەوە!

**بەیارمەتی خودا لێرەدا کۆتایی بەجزمی پانزە هات**

**خودا پشتیوانمان بێ بۆ تەواو کردنی جزمەکانی تر**